# سُنَنُ ابن ماجه

## به كوردی

لِلإمَامِ أبِي عَبدِاللهِ مُحَمَّدِ بن يَزيدِ ابنِ مَاجَه القَزوينيّ



به‌رگی سێیه‌م



وه‌رگێڕانی

محمد أحمد گرده شێخانی

حوكمی فه‌رموده‌كان وه‌رگیراوه‌ له‌

الشيخ محمد صبحي بن حسن حلاق

پرۆژەی پیت

بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە



ڕێکخراوی پیت

بۆ پەروەردە و توێژینەوەی زانستی

# سُنَن ابن مَاجَه

## بەکوردی


**نووسینی: الإمام أبي عبد الله محمد بن يزيد ابن ماجه القزويني**

**وەرگێڕانـــی : محمد أحمد گردەشێخاڵی**

**دیزاینی ناوەوە : ستافی پیت**

**خـەتی بـەرگ : ستافی پیت**



**چـاپـی یەکـەم : ١٤٤٤ك - ٢٠٢٢ز**

**٦٣٦ لاپـــــەڕە**

**٢٤ × ١٧ ســــم**

**بابـەت : ئـایینی**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ١١٥ )ـی ساڵی ٢٠٢٢ پێدراوە


















# سُنَنُ ابن مَاجَه

## بەکوردی




نووسینی

الإمام أبي عبد الله محمد بن يزيد ابن ماجه القزويني

(209 هـ - 273هـ)

وەرگێڕان

محمد أحمد گردەشێخاڵی




## بابەت: دەرچوون بۆ حەج

٢٨٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَابِ، يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ نَوْمَهُ، وَطَعَامَهُ، وَشَرَابَهُ، فَإِذَا قَضَى أَحَدُكُمْ نَهْمَتَهُ مِنْ سَفَرِهِ، فَلْيُعَجِّلِ الرُّجُوعَ إِلَى أَهْلِهِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەشت بەشێکە لە سزا، چونکە خەوو خواردن و خواردنەوەتان لێ دەبڕێ، جا هەر کاتێک یەکێکتان لە گەشتەکەیدا پێویستیتان تەواو بوو، ئەوە با پەلە بکات لە گەڕانەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵەکەی.

٢٨٨٢م- حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ حُمَيْدِ بْنِ كَاسِبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ سُهَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ[٢].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

٢٨٨٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ الْفَضْلِ ﷺ، أَوْ أَحَدِهِمَا عَنِ الْآخَرِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَرَادَ الْحَجَّ، فَلْيَتَعَجَّلْ، فَإِنَّهُ قَدْ يَمْرَضُ الْمَرِيضُ، وَتَضِلُّ الضَّالَّةُ، وَتَعْرِضُ الْحَاجَةُ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ لە فەزڵ ﷺ دەگێڕێتەوە، یان یەکێکیان لەویتر دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ویستی و توانای حەجی هەبوو با پەلە بکات، چونکە بۆی هەیە تووشی نەخۆشی ببێ، یان تووشی سەر لێشێوان ببێ و پێداویستی بێتە پێش (حەجەکەی بۆ نەکرێ).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٠٤، ومسلم: ١٩٢٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٠٤، ومسلم: ١٩٢٧

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ١٧٣٢.



## بابەت: فەرزبوونی حەج

**٢٨٨٤-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۝٩٧﴾ آل عمران، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ الْحَجُّ فِي كُلِّ عَامٍ؟ فَسَكَتَ، ثُمَّ قَالُوا: أَفِي كُلِّ عَامٍ؟ فَقَالَ: «لَا، وَلَوْ قُلْتُ: نَعَمْ، لَوَجَبَتْ»، فَنَزَلَتْ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ۝١٠١﴾ المائدة[1].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: کاتێک ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۝٩٧﴾ آل عمران، (واتە: خوا حەجی ماڵەکەی خۆی فەرز کردووە لەسەر خەڵکی، لەسەر هەر کەسێک کە توانای گەیشتن (و ڕۆیشتنی) هەبێ بۆی)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ساڵێ جارێک حەج واجبە؟ ئەویش بێدەنگ بوو، دیسان گوتیان: ئایا هەموو ساڵێ جارێک؟ ئنجا فەرمووی: نەخێر، خۆ ئەگەر بمگوتبا: بەڵێ، ئەوە لەسەرتان پێویست دەبوو، ئنجا ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ۝١٠١﴾ المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە پرسیار مەکەن لە شتانێک ئەگەر ئاشکرا بکرێن بۆتان ناخۆش و خراپ دەبێ بۆتان.

**٢٨٨٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ الْحَجُّ فِي كُلِّ عَامٍ قَالَ: «لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَوْ وَجَبَتْ، لَمْ تَقُومُوا بِهَا، وَلَوْ لَمْ تَقُومُوا بِهَا، عُذِّبْتُمْ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە هەموو ساڵێکدا حەج فەرزە؟ فەرمووی: ئەگەر بمگوتبا: بەڵێ، ئەوە فەرز دەبوو، خۆ ئەگەر فەرزیش بووایە لەسەرتان (هەموو ساڵێ جارێک) ئەوە نەتان دەکرد، خۆ ئەگەر نەشتانکردبایە ئەوە لەسەری سزا دەدران.

**٢٨٨٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ، سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ الْحَجُّ فِي كُلِّ سَنَةٍ، أَوْ مَرَّةً وَاحِدَةً؟ قَالَ: «بَلْ مَرَّةً وَاحِدَةً، فَمَنْ زَادَ، فَتَطَوَّعَ»[3].

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٨١٤ و ٣٠٥٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٢١، والنسائي: ٢٦٢٠.




واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، کە ئەقرەعی کوڕی حابیس پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردووە گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا حەج لە هەموو ساڵێکدا فەرزە یان تەنها یەک جارە؟ فەرمووی: بەڵکو یەک جار فەرزە و ئەوەشی لە توانایدا هەبوو (زیاتر) ئەوە خۆبەخشی و زیادە خێرە.

## بابەت: گەورەیی حەج و عومرە

**٢٨٨٧-** عَنْ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تَابِعُوا بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَإِنَّ الْمُتَابَعَةَ بَيْنَهُمَا، تَنْفِي الْفَقْرَ وَالذُّنُوبَ، كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ، خَبَثَ الْحَدِيدِ»(١).

واتە: عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەج و عومرە بە دوای یەکدا بکەن (واتە: ئەگەر حەجتان کرد عومرەش بە دوایدا بکەن و ئەگەر عومرەتان کرد حەجیش بە دواید بکەن)، چونکە حەج و عومرە کردن بە دوای یەکدا هەژاری و تاوان ناهێڵێ هەروەکو چۆن کورە پیسی و چڵکی ئاسن ناهێڵێ.

**٢٨٨٧م-** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ(٢).

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

**٢٨٨٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ، كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ، لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ، إِلَّا الْجَنَّةُ»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەنجامدانی عومرە بۆ عومرەیەکی دیکە دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهەکانی نێوانیان، وە حەجێکیش کە وەرگیراو بێ (لەلایەن خواوە) ئەوە پاداشتەکەی تەنها بەهەشتە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٧٣، ومسلم: ١٣٤٩، والترمذي: ٩٣٣، والنسائي: ٢٦٢٢ و ٢٦٢٣.



٢٨٨٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَجَّ هَذَا الْبَيْتَ، فَلَمْ يَرْفُثْ، وَلَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»[١].

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک حەجی ئەو ماڵەی خوا بکات و قسەی پڕ و پووچ نەکات (لە کاتی ئیحرامدا لەگەڵ هاوسەری جووت نەبێ)، سەرپێچی و گوناهان ئەنجام نەدات، ئەوە وەک ئەو ڕۆژەی لێدێتەوە کە تێیدا لە دایک بووە (گوناهی پێوە نامێنن).

## بابەت: حەجکردن بە سواری

٢٨٩٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: حَجَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رَحْلٍ رَثٍّ، وَقَطِيفَةٍ تُسَاوِي أَرْبَعَةَ دَرَاهِمَ، أَوْ لَا تُسَاوِي، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ حَجَّةٌ لَا رِيَاءَ فِيهَا وَلَا سُمْعَةَ»[٢].

واته: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەسەر پشتی وشترێکەوە کە کورتانێکی کۆنی پێوە بوو حەجی کرد، وە پارچە پۆشاکێکی قەدیفەی لەبەردا بوو کە نرخەکەی دەگەیشتە چوار درهەم، یان نەدەگەیشتە ئەو نرخەش (وەکو خۆ بە کەم نواندنێک لە بەرانبەر خوا لە ماڵی خوا)، ئەوجار فەرمووی: خوایە حەجەکەمان بە جۆرێک بێت و بە جۆرێک لێمان وەرگرە کە ڕیاو ڕووپامایی تێدا نەبێ و بۆ ناو و ناوبانگ نەبێ.

٢٨٩١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ، فَمَرَرْنَا بِوَادٍ فَقَالَ: «أَيُّ وَادٍ هَذَا» قَالُوا: وَادِي الْأَزْرَقِ قَالَ: «كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى مُوسَى ﷺ» فَذَكَرَ مِنْ طُولِ شَعَرِهِ شَيْئًا - لَا يَحْفَظُهُ دَاوُدُ - «وَاضِعًا إِصْبَعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ، لَهُ جُؤَارٌ إِلَى اللَّهِ بِالتَّلْبِيَةِ، مَارًّا بِهَذَا الْوَادِي» قَالَ: ثُمَّ سِرْنَا حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى ثَنِيَّةٍ، فَقَالَ: «أَيُّ ثَنِيَّةٍ هَذِهِ؟» قَالُوا: ثَنِيَّةُ هَرْشَى أَوْ لَفْتٍ قَالَ: «كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى يُونُسَ، عَلَى نَاقَةٍ حَمْرَاءَ، عَلَيْهِ جُبَّةُ صُوفٍ، وَخِطَامُ نَاقَتِهِ، خُلْبَةٌ، مَارًّا بِهَذَا الْوَادِي مُلَبِّيًا»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٢١، ومسلم: ١٣٥٠، والترمذي: ٨١١، والنسائي: ٢٧٢٧.

(٢) أخرجه البخاري: ١٥١٧ بنحوه.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٦/٦٩.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە نێوانی مەککەو مەدینەدا، جا بە شیوێکدا ڕەت بووین و فەرمووی: ئەو شیوە چ شیوێکە؟ گوتیان: شیوی ئەزرەقە، فەرمووی: وەکو ئێستا لەبەر چاومە کە موسا - جا باسی ئەوەی کرد کە هەندێک پرچی درێژ بووەو ڕاوی بەبیری نەماوە - پەنجەکانی دەخاتە ناو گوێی و بە دەنگێکی بەرز بۆ خوا تەلبیە دەکات، بەو شیوەدا ڕەت دەبێ، پاشان ڕۆیشتین تاکو هاتینە لای تەپۆلکەیەک، یان کێوێک و فەرمووی: ئەو کێوە کوێیە؟ گوتیان: کێوی هەرشایە (لەسەر ڕێگای مەدینەیە) یان کێوی لەفتە، فەرمووی: وەکو ئێستا تەماشای یونس بکەم بە سواری وشترێکی سورەوە کە جوبەیەکی خوری لەبەردایەو، ڕیشمەی وشترەکەشی لە ڕیشاڵی دار خورمایەو، بەو شیوەدا ڕێدەکات و تەلبیە دەکات.

## بابەت: گەورەیی پاڕانەوە و دوعای حاجی

٢٨٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «الْحُجَّاجُ وَالْعُمَّارُ، وَفْدُ اللَّهِ إِنْ دَعَوْهُ أَجَابَهُمْ، وَإِنِ اسْتَغْفَرُوهُ غَفَرَ لَهُمْ»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حاجی و عومرەکارەکان وەفد و میوانی خوان، جا ئەگەر داوای لێبکەن وەڵامیان دەداتەوەو، ئەگەر داوای لێ خۆش بوونی لێبکەن لێیان خۆش دەبێ.

٢٨٩٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْغَازِي فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالْحَاجُّ وَالْمُعْتَمِرُ، وَفْدُ اللَّهِ، دَعَاهُمْ، فَأَجَابُوهُ، وَسَأَلُوهُ، فَأَعْطَاهُمْ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە پێناوی خوادا چۆتە غەزا و حاجی و عومرەکار وەفدی خوای گەورەن، خوا بانگهێشتی کردوون و ئەوانیش وەڵامیان داوەتەوە، وە ئەوانیش داوایان لە خوا کردو خوا پێی بەخشین.

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن لغيره.





**٢٨٩٤-** عَنْ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ النَّبِيَّ ﷺ فِي الْعُمْرَةِ، فَأَذِنَ لَهُ، وَقَالَ لَهُ «يَا أُخَيَّ أَشْرِكْنَا فِي شَيْءٍ مِنْ دُعَائِكَ، وَلَا تَنْسَنَا»[١].

واته: عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، کە داوای مۆڵەتی کردوە لە پێغەمبەر ﷺ بۆ عومرە، ئەویش مۆڵەتی داوەو پێی فەرمووە: براکەم لە بەشێک لە دوعاکانت بەشدارمان بکە و لەبیرمان مەکە.

**٢٨٩٥-** عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَفْوَانَ ﷺ، قَالَ: وَكَانَتْ تَحْتَهُ ابْنَةُ أَبِي الدَّرْدَاءِ فَأَتَاهَا، فَوَجَدَ أُمَّ الدَّرْدَاءِ وَلَمْ يَجِدْ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَقَالَتْ لَهُ: تُرِيدُ الْحَجَّ، الْعَامَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَتْ: فَادْعُ اللَّهَ لَنَا بِخَيْرٍ، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «إِنَّ دَعْوَةَ الْمَرْءِ مُسْتَجَابَةٌ لِأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ، عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ يُؤَمِّنُ عَلَى دُعَائِهِ، كُلَّمَا دَعَا لَهُ بِخَيْرٍ، قَالَ: آمِينَ، وَلَكَ بِمِثْلٍ» قَالَ: ثُمَّ خَرَجْتُ إِلَى السُّوقِ فَلَقِيتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَحَدَّثَنِي عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِ ذَلِكَ[٢].

واته: صەفوانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی صەفوان ﷺ کە کچی ئەبو دەرداء خێزانی بوو دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: هاتە لای خێزانەکەی و ئوممو دەردائی بینیی بەڵام ئەبو دەردائی نەبینی، جا بە صەفوانی گوت: ئەو ساڵ دەچیتە حەج؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: دوعای خێرمان بۆ بکە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: دوعای مرۆڤ بۆ براکەی لە پاشەملە گیرا دەبێت، لەلای سەرییەوە مەلائیکەیەک هەیە لەگەڵ دوعاکانی دەڵێ: ئامین، هەر جار دوعای بۆ بکات دەڵێ: خوایە لێی وەرگرە، تۆش بەر هەمان دوعا دەکەوی، گوتی: پاشان چوومە بازاڕ بە ئەبو دەرداء گەیشتم، ئەویش هەمان شتی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ گێڕامەوە.

## بابەت: ئەوەی کە حەج پێویست دەکات

**٢٨٩٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَامَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا يُوجِبُ الْحَجَّ؟ قَالَ: «الزَّادُ وَالرَّاحِلَةُ» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَمَا الْحَاجُّ؟ قَالَ: «الشَّعِثُ، التَّفِلُ» وَقَامَ آخَرُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْحَجُّ؟ قَالَ: «الْعَجُّ، وَالثَّجُّ» قَالَ وَكِيعٌ: يَعْنِي بِالْعَجِّ: الْعَجِيجَ بِالتَّلْبِيَةِ، وَالثَّجُّ: نَحْرُ الْبُدْنِ[٣].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٤٩٨، والترمذي: ٣٥٦٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٣٣.

(٣) ضعيف جداً، لكن جملة: «الْعَجُّ وَالثَّجُّ» ثبتت في حديث آخر. أخرجه الترمذي: ٨١٣ و ٢٩٩٨.

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پیاوێک هەڵسا چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ حەج بە چی فەڕز دەبێ؟ فەرمووی: بە توێشو و وڵاخی سەفەر، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ حاجی دەبێ چۆن بێ کاتێک دەچێتە حەج؟ فەرمووی: قژی سەری ئاڵۆزەو بۆنی ناخۆشە، (چونکە بۆنی خۆش لە خۆی نادات و ماندووش دەبێ)، ئنجا ئەویتر هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خودی حەج چییە؟ فەرمووی: تەلبیە کردنە بە دەنگی بەرز و حەیوان سەربڕینە.

٢٨٩٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الزَّادُ، وَالرَّاحِلَةُ» يَعْنِي قَوْلَهُ: ﴿مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ ﴿٩٧﴾﴾ آل عمران[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: توێشو و وڵاخی سواری (بۆ سەفەری حەج) مانای فەرمایشتەکەی خوایە کە دەفەرموێ: ﴿مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ ﴿٩٧﴾﴾ آل عمران، واتە: لەسەر هەر کەسێک کە توانای گەیشتن و (ڕۆیشتنی) هەبێ بۆی.

## بابەت: حەجکردنی ئافرەت بە بێ مەحڕەم

٢٨٩٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُسَافِرُ الْمَرْأَةُ سَفَرَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، فَصَاعِدًا، إِلَّا مَعَ أَبِيهَا أَوْ أَخِيهَا، أَوِ ابْنِهَا، أَوْ زَوْجِهَا، أَوْ ذِي مَحْرَمٍ»[2].

واتە: ئەبو سەعید ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت نابێ سێ ڕۆژ زیاتر سەفەر بکات، مەگەر لەگەڵ باوکی، یان برای، یان کوڕەکەی، یان مێردەکەی، یان مەحڕەمێکی خۆی لەگەڵ بێ.

٢٨٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، أَنْ تُسَافِرَ مَسِيرَةَ يَوْمٍ وَاحِدٍ، لَيْسَ لَهَا ذُو حُرْمَةٍ»[3].

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٩٧ بنحوه، ومسلم: ١٣٤٠، وأبو داود: ٧٢٦، والترمذي: ١١٦٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٨٨، ومسلم: ١٣٣٩، وأبو داود: ١٧٢٣، والترمذي: ١١٧٠.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ و دروست نیە بۆ ئافرەتێک کە بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێ کە بۆ ماوەی ڕۆژەڕێیەک سەفەر بکات و مەحرەمێکی لەگەڵدا نەبێت.

**٢٩٠٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي اكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا، وَامْرَأَتِي حَاجَّةٌ، قَالَ: «فَارْجِعْ مَعَهَا»**[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: دەشتەکییەک هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و گوتی: من ناوم نوسراوە بۆ غەزای فڵان و فڵان، وە خێزانەکەشم دەچێتە حەج، فەرمووی: بگەڕێوە لەگەڵ خێزانەکەت بە.

## بابەت: ئەوەی کە حەج جیهادە بۆ ئافرەتان

**٢٩٠١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلَى النِّسَاءِ جِهَادٌ؟ قَالَ: «نَعَمْ، عَلَيْهِنَّ جِهَادٌ، لَا قِتَالَ فِيهِ: الْحَجُّ وَالْعُمْرَةُ»**[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئافرەتان جیهادیان لەسەر واجبە؟ فەرمووی: بەڵێ، جیهادێکیان لەسەر پێویست کراوە کە شەڕ و کوشتاری تێدانیە (ئەویش) حەج و عومرەیە.

**٢٩٠٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْحَجُّ جِهَادُ، كُلِّ ضَعِيفٍ»**[3].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: حەج بۆ هەر کەسێک کە توانای جیهادی نەبێ و لاواز بێ وەکو جیهاد وایە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٦١، ومسلم: ١٣٤١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٢٠، والنسائي: ٢٦٢٨.

(٣) ضعيف.





## بابەت: حەجکردن لە بری کەسی مردوو

**٢٩٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَمِعَ رَجُلًا يَقُولُ: لَبَّيْكَ، عَنْ شُبْرُمَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ شُبْرُمَةُ» قَالَ: قَرِيبٌ لِي، قَالَ: «هَلْ حَجَجْتَ قَطُّ؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «فَاجْعَلْ هَذِهِ عَنْ نَفْسِكَ، ثُمَّ احْجُجْ عَنْ شُبْرُمَةَ»[١].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێک بوو دەیگوت: ئەو ئیحرامە لە بری شوبرومە دەبەستم و گوتی: لبیک لە بری شوبرومە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شوبرومە کێیە؟ گوتی: کەسێکی نزیکی خۆمە، فەرمووی: بۆ خۆت هیچ جار حەجت کردوە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: ئەو حەجەیان بۆ خۆت بکە و پاشان حەج بۆ شوبرومە بکە.

**٢٩٠٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَحُجُّ عَنْ أَبِي؟ قَالَ: «نَعَمْ حُجَّ عَنْ أَبِيكَ، فَإِنْ لَمْ تَزِدْهُ خَيْرًا، لَمْ تَزِدْهُ شَرًّا»[٢].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و، گوتی: ئایا دەکرێ لەبری باوکم حەج بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، لە بری باوکت حەج بکە، خۆ ئەگەر چاکەشی بۆ زیاد نەکەی (بە چاکەکانی خۆت) ئەوە خراپەی بۆ زیاد ناکەی (واتە: خێرە بۆی بکە).

**٢٩٠٥- عَنْ أَبِي الْغَوْثِ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ - رَجُلٌ مِنَ الْفُرْعِ - أَنَّهُ اسْتَفْتَى النَّبِيَّ ﷺ عَنْ حَجَّةٍ كَانَتْ عَلَى أَبِيهِ مَاتَ، وَلَمْ يَحُجَّ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «حُجَّ عَنْ أَبِيكَ» وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَكَذَلِكَ الصِّيَامُ فِي النَّذْرِ، يُقْضَى عَنْهُ»[٣].**

واتە: ئەبو غەوسی کوڕی حوصەین ﷺ کە پیاوێک بوو لە ئەهلی فورع (شوێنێکە لە نێوان مەککە و مەدینە) دەگێڕێتەوە، داوای فەتوای لە پێغەمبەر ﷺ کردوە دەربارەی حەجکردن لەبری باوکی لە کاتێکدا کە باوکی مردووە و حەجی لەسەر

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨١١.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) ضعيف. انفرد به ابن ماجه، وانظر: ٢٩٠٩.





بووەو نەیکردوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەبری باوکت حەجەکە بکە، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە هەمان شێوە ڕۆژوویەک کە نەزر بێ دەتوانرێ لەبری ئەو ڕۆژووەکە بگیرێتەوە.

## بابەت: حەجکردن لەبری کەسێک کە لە ژیاندا بێ، بەڵام بۆ خۆی توانای حەجکردنی نەبێ

٢٩٠٦- عَنْ أَبِي رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ ﷺ، أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ، لَا يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ، وَلَا الْعُمْرَةَ، وَلَا الظَّعْنَ قَالَ: «حُجَّ عَنْ أَبِيكَ، وَاعْتَمِرْ»[١].

واتە: ئەبو ڕەزینی عوقەیلیی ﷺ دەگێڕێتەوە، هاتۆتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکم پیرێکی بە تەمەنە، توانای حەجکردن و عومرەکردن و سواربوونی وڵاخی نیە، فەرمووی: لەبری باوکت حەج و عومرەی بکە.

٢٩٠٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً، مِنْ خَثْعَمٍ جَاءَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ، قَدْ أَفْنَدَ وَأَدْرَكَتْهُ فَرِيضَةُ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي الْحَجِّ، وَلَا يَسْتَطِيعُ أَدَاءَهَا فَهَلْ يُجْزِئُ عَنْهُ، أَنْ أُؤَدِّيَهَا عَنْهُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَعَمْ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، کە ئافرەتێک لە هۆزی خەثعەم هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاستیدا باوکم پیرێکی بە تەمەنەو خەڵەفاوە، یەکێک لە فەڕزەکانی کە خوا لەسەر بەندەکانی پێویست کردوە کە حەجە، پێی ڕاگەیشتوە، ناشتوانێ جێبەجێی بکات، جا ئایا دروستە من لەبری ئەو حەجەکەی بۆ بکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

٢٩٠٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: أَخْبَرَنِي حُصَيْنُ بْنُ عَوْفٍ، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي أَدْرَكَهُ الْحَجُّ، وَلَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَحُجَّ، إِلَّا مُعْتَرِضًا، فَصَمَتَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: «حُجَّ عَنْ أَبِيكَ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨١٠، والترمذي: ٩٣٠، والنسائي: ٢٦٣٧.

(٢) حسن. وانظر البخاري: ١٥١٣، ومسلم: ١٣٣٤، وأبو داود: ١٨٠٩، والترمذي: ٩٢٨ و ٢٦٤٠_٢٦٤٣، والنسائي: ٢٦٣٤ و ٢٦٣٥ و ٥٣٨٩_٥٣٩٢.

(٣) ضعيف الإسناد.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: حوصەینی کوڕی عەوف هەواڵی پێدام و گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاستیدا باوکم حەجی لەسەر فەرز بووەو، ناشتوانێ جێبەجێی بکات، مەگەر بە پشتی وڵاخەوە بیبەستین، ئنجا پێغەمبەر ﷺ کەمێک بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: تۆ لەبری باوکت حەجەکەی بۆ بکە.

**٢٩٠٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنْ أَخِيهِ الْفَضْلِ، أَنَّهُ كَانَ رِدْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَدَاةَ النَّحْرِ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ فِي الْحَجِّ عَلَى عِبَادِهِ، أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا، لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَرْكَبَ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ، فَإِنَّهُ لَوْ كَانَ عَلَى أَبِيكِ دَيْنٌ، قَضَيْتِهِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، لە فەزڵی برایەوە گێڕاویەتەوە کە بەیانی ڕۆژی قوربانی لەسەر پشتی وشترەکە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووەو، ئافرەتێک لە هۆزی خەثعەم هاتۆتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو، گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ حەج کە فەرزێکی خوایە لەسەر بەندەکانی پێویست بووە لەسەر باوکم کە پیر و بە تەمەنە و توانای نیە کە سواری وڵاخ بێ (بۆ ئەوەی بێ بۆ حەج)، جا ئایا دەکرێ من لەبری ئەو حەجەکەی بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، چونکە ئەگەر باوکت قەرزدار بێ، دەکرێ قەرزەکەی بۆ بدەیتەوە.

## بابەت: حەجکردنی منداڵ

**٢٩١٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: رَفَعَتِ امْرَأَةٌ صَبِيًّا لَهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي حَجَّتِهِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: «نَعَمْ وَلَكِ أَجْرٌ»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئافرەتێک منداڵەکەی بەرزکردەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە حەجدا، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەوە (منداڵەکە) حەجی بۆ دەنوسرێ؟ فەرمووی: بەڵێ، تۆش لەسەری پاداشت وەردەگری.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥١٣، ومسلم: ١٣٣٤، وأبو داود: ١٨٠٩، والترمذي: ٩٢٨ و ٢٦٤٠_٢٦٤٣، والنسائي: ٢٦٣٤ و ٢٦٣٥ و ٥٣٨٩_٥٣٩٢.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٩٢٤ و ٩٢٦.

## بابەت: ئەو ئافرەتانەی تووشی زەیستانی و سوڕی مانگانە دەبن و نیەتی حەج دێنن

**٢٩١١- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: نُفِسَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ بِالشَّجَرَةِ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَبَا بَكْرٍ أَنْ «يَأْمُرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ، وَتُهِلَّ»[١].**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئەسمائی کچی عومەیس لەلای دارەکەی «ذو الحليفة» منداڵی بوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە ئەبو بەکر کرد کە فەرمانی پێبکات خۆی بشۆرێ و، ئیحرامی حەج ببەستێ.

**٢٩١٢- عَنْ أَبِي بَكْرٍ ﵁، أَنَّهُ خَرَجَ حَاجًّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَمَعَهُ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ، فَوَلَدَتْ بِالشَّجَرَةِ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَتَى أَبُو بَكْرٍ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَخْبَرَهُ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَنْ يَأْمُرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ، ثُمَّ تُهِلَّ بِالْحَجِّ، وَتَصْنَعَ مَا يَصْنَعُ النَّاسُ، إِلَّا أَنَّهَا، لَا تَطُوفُ بِالْبَيْتِ»[٢].**

واتە: ئەبو بەکر ﵁ دەگێڕێتەوە، کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ حەج دەرچووە، ئەسمائی کچی عومەیسیشی لەگەڵ بووە، ئنجا (ئەسماء) لەلای دارەکە موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری بوو، جا ئەبو بەکر هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەی پێدا، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد کە بە ئەسماء بڵێ کەوا خۆی بشۆرێ، پاشان ئیحرام بۆ حەج ببەستێت و ئەوەی خەڵک دەیکات (لە مەڕاسیمی حەج) ئەویش بیکات، تەنها تەوافی کەعبە نەکات.

**٢٩١٣- عَنْ جَابِرٍ ﵁، قَالَ: نُفِسَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ بِمُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ فَأَرْسَلَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ «فَأَمَرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ، وَتَسْتَثْفِرَ بِثَوْبٍ، وَتُهِلَّ»[٣].**

واتە: جابیر ﵁ دەڵێ: ئەسمائی کچی عومەیس تووشی زەیستانی بوو بە هۆی لە دایک بوونی موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکر، جا (ئەسماء) کەسێکی نارد بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمانی پێکرد کە خۆی بشۆرێ و ناوقەدی ببەستێ و، شوێنی خوێنەکە پارچە لۆکەیەکی لەسەر دابنێ و ئیحرامی حەج ببەستێ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٠٩، وأبو داود: ١٧٤٣.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه النسائي: ٢٢٦٤.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١١٠، والنسائي: ٢٧٦١ و ٢٧٦٢.

## بابەت: شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی شوێنە جیاوازەکان

**٢٩١٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَأَهْلُ الشَّامِ مِنَ الْجُحْفَةِ وَأَهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ» فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَمَّا هَذِهِ الثَّلَاثَةُ، فَقَدْ سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَبَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: وَيُهِلُّ أَهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ»[١].**

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی مەدینە لە (ذو الحليفة)ـدا ئیحرامی حەج دەبەستن، وە خەڵکی شامیش لە جوحفە و، خەڵکی نەجدیش لە قەڕن ئیحرام دەبەستن، جا عەبدوڵڵا گوتی: ئەو سێ شوێنەم بۆ خۆم لە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێم لێبووە، بەڵام لە پێغەمبەری خواوە ﷺ پێم گەیشتووەو، بۆیان گێڕاومەوە کە فەرموویەتی: خەڵکی یەمەن لە یەلەملەم ئیحرام دەبەستن.

**٢٩١٥- عَنْ جَابِرٍ ﵁، قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مُهَلُّ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَمُهَلُّ أَهْلِ الشَّامِ، مِنَ الْجُحْفَةِ، وَمُهَلُّ أَهْلِ الْيَمَنِ، مِنْ يَلَمْلَمَ، وَمُهَلُّ أَهْلِ نَجْدٍ، مِنْ قَرْنٍ، وَمُهَلُّ أَهْلِ الْمَشْرِقِ مِنْ ذَاتِ عِرْقٍ» ثُمَّ أَقْبَلَ بِوَجْهِهِ لِلْأُفُقِ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَقْبِلْ بِقُلُوبِهِمْ»[٢].**

واتە: جابیر ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و فەرمووی: شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی مەدینە «ذو الحليفة»یە، وە شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی شام لە جوحفەیە و شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی یەمەن لە یەلەملەمە و شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی نەجد لە قەڕنە و شوێنی ئیحرام بەستنی خەڵکی ڕۆژهەڵات لە «ذات العرق»ـە، پاشان ڕووی کردە ڕۆژهەڵات و فەرمووی: خودایە دڵی خەڵکی ڕۆژهەڵات بۆ لای دینەکەی خۆت کەمەندکێش بکەی.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٣ و ١٥٢٥، ومسلم: ١١٨٢، وأبو داود: ١٧٣٧، والترمذي: ٨٣١، والنسائي: ٢٦٥١ و ٢٦٥٢ و ٢٦٥٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٨٣ ما عدا قوله: «اللَّهُمَّ أَقْبِلْ بِقُلُوبِهِمْ».




## بابەت: ئیحرام

**٢٩١٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ «إِذَا أَدْخَلَ رِجْلَهُ فِي الْغَرْزِ وَاسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ، أَهَلَّ مِنْ عِنْدِ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ»[١].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک سواری وشترەکە دەبوو، پێی دەخستە نێو ئاوزەنگی وشترەکەو ڕاست دەبۆوە لەلای مزگەوتی «ذو الحليفة» تەلبییەی دەکرد.

**تێبینی:** ئاوزەنگ ئەو شتەیە کە پێی دەخرێتە ناوی بۆ چوونە سەر وڵاخەکە.

**٢٩١٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: إِنِّي عِنْدَ ثَفِنَاتِ نَاقَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، عِنْدَ الشَّجَرَةِ، فَلَمَّا اسْتَوَتْ بِهِ قَائِمَةً، قَالَ: «لَبَّيْكَ بِعُمْرَةٍ وَحِجَّةٍ مَعًا» وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ[٢].

**واتە:** ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: من لەلای ئەژنۆکانی وشتری پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لەلای دارەکەی «ذو الحليفة»، جا کاتێک پێغەمبەر ﷺ لەسەر پشتی وشترەکە بوو وشترەکەش هەڵسایەوەو ڕاست بۆوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «لَبَّيْكَ بِعُمْرَةٍ وَحِجَّةٍ مَعًا» واتە: ئیحرامی عومرەو حەجی بە یەکەوە بەست، ئەوەش لە حەجیماڵئاوایی بوو.

## بابەت: تەلبییە کردن (گوتنی: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ .....)

**٢٩١٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: تَلَقَّفْتُ التَّلْبِيَةَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَقُولُ: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ، لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ» قَالَ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَزِيدُ فِيهَا: لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ لَبَّيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥١٤، ومسلم: ١١٨٧.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٤٩، ومسلم: ١١٨٤، وأبو داود: ١٨١٢، والترمذي: ٨٢٥، والنسائي: ٢٧٤٧_٢٧٥٠.




واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: تەلبیە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فێربووم و وەرمگرتووە، کە دەیفەرموو: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ، لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ»، ڕاوی دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ ئەوەشی لێ زیاد دەکرد: «لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ لَبَّيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ».

٢٩١٩- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: كَانَتْ تَلْبِيَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: تەلبیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە بوو: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ».

٢٩٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فِي تَلْبِيَتِهِ «لَبَّيْكَ إِلَهَ الْحَقِّ، لَبَّيْكَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەلبیەکەیدا دەیفەرموو: «لَبَّيْكَ إِلَهَ الْحَقِّ، لَبَّيْكَ».

٢٩٢١- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ مُلَبٍّ يُلَبِّي، إِلَّا لَبَّى، مَا عَنْ يَمِينِهِ وَشِمَالِهِ، مِنْ حَجَرٍ، أَوْ شَجَرٍ، أَوْ مَدَرٍ، حَتَّى تَنْقَطِعَ الْأَرْضُ مِنْ هَاهُنَا وَهَاهُنَا»[٣].

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کە تەلبییە دەکات ئەوە لەوکاتەدا هەرچی لەلای ڕاست و چەپیەتی لە بەرد و، دار و، کەستەکە قوڕ، هەتا کۆتایی زەوی هەمووی لەگەڵ ئەو تەلبییە دەکات (لە خۆرهەڵات بۆ خۆرئاوا).

## بابەت: دەنگ بەرزکردنەوە لە کاتی تەلبیەکردن

٢٩٢٢- عَنْ خَلَّادِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَتَانِي جِبْرِيلُ، فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالْإِهْلَالِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨١٣. وانظر مسلم: ١٢١٦.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٧٥٢.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٨٢٨.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨١٤، والترمذي: ٨٢٩، والنسائي: ٢٧٥٣.




واتە: خەلادی کوڕی سائیب لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جیبریل هاتە لام و فەرمانی پێکردم کە فەرمان بە هاوەڵانم بکەم، دەنگیان بەرزبکەنەوە لە کاتی گوتنی تەلبیەدا.

**٢٩٢٣**- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «جَاءَنِي جِبْرِيلُ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، مُرْ أَصْحَابَكَ فَلْيَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالتَّلْبِيَةِ، فَإِنَّهَا مِنْ شِعَارِ الْحَجِّ»[1].

واتە: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جیبریل هاتە لام و گوتی: ئەی موحەممەدﷺ فەرمان بە هاوەڵانت بکە لە کاتی تەلبیە کردندا دەنگیان بەرزبکەنەوە، چونکە بێگومان یەکێکە لە دروشمەکانی حەج.

**٢٩٢٤**- عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ، أَيُّ الْأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «الْعَجُّ، وَالثَّجُّ»[2].

واتە: ئەبو بەکری صدیق ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی باشترین کردەوە، فەرمووی: دەنگ بەرزکردنەوە لە کاتی تەلبیەداو سەربڕینی ئاژەڵ.

## بابەت: بەردەوام بوون لە تەلبیە کردندا

**٢٩٢٥**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ مُحْرِمٍ يَضْحَى لِلَّهِ يَوْمَهُ، يُلَبِّي، حَتَّى تَغِيبَ الشَّمْسُ، إِلَّا غَابَتْ بِذُنُوبِهِ، فَعَادَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»[3].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر ئیحرام پۆشێک لە چێشتەنگاوەوە لەبەر خاتری خوا ئەو ڕۆژەی تەلبیە بکات، هەتاکو ڕۆژ ئاوا دەبێ، ئەوە بێگومان لەگەڵ ئاوابوونی ڕۆژ گوناهەکانی ئاوا دەبن و نامێنن وەکو ئەو ڕۆژە پاک دەبێتەوە کە تێیدا لە دایک بووە.

---

(١) صحيح.

(٢) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٨٢٧.

(٣) ضعيف.

## بابەت: خۆ بۆنخۆش كردن لە ئیحرامدا

**٢٩٢٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: «طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، لِإِحْرَامِهِ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ، وَلِحِلِّهِ، قَبْلَ أَنْ يُفِيضَ» قَالَ سُفْيَانُ: بِيَدَيَّ هَاتَيْنِ**[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: خۆم پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش كرد بۆ ئیحرام بەستنەكەی پێش ئەوەی ئیحرام ببەستێ، وە بۆ ئیحرام شكاندنەكەی پێش ئەوەی تەواف بكات. سوفیان گوتی: ئا بەو دوو دەستانەی خۆم (واتە: عائیشە ﵂ وای گوتووە).

**٢٩٢٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الطِّيبِ فِي مَفَارِقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ يُلَبِّي»**[2].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لە پێش چاومە وەک ئەوەی تەماشای بریقە و درەوشانەوەی بۆنە خۆشەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ بكەم لەو شوێنەی سەری كە لە كاتی شانەكردندا لە یەكی جیادەكردەوە، لە كاتێكدا كە ئەو لە ئیحرامدا بوو.

**٢٩٢٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَأَنِّي أَرَى وَبِيصَ الطِّيبِ فِي مَفْرِقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ ثَلَاثَةٍ، وَهُوَ مُحْرِمٌ»**[3].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: وەک ئێستا لەبەر چاومە درەوشانەوە و شوێنەواری بۆنێكی خۆش لە شوێنی جیاكردنەوەی پرچەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ دوای سێ ڕۆژ، لە كاتێكدا كە لە ئیحرامدا بوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٣٩، ومسلم: ١١٨٩ و ١١٩١، وأبو داود: ١٧٤٥، والترمذي: ٩١٧، والنسائي: ٢٦٨٤_٢٦٩٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧١، ومسلم: ١١٩٠، وأبو داود: ١٧٤٦، والنسائي: ٢٦٩٣_٢٦٩٩.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٧٠٣.

## بابەت: چ پۆشاکێک دەپۆشرێ بۆ ئیحرام

**٢٩٢٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَلْبَسُ الْقُمُصَ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ وَلَا الْبَرَانِسَ، وَلَا الْخِفَافَ، إِلَّا أَنْ لَا يَجِدَ نَعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ، أَوِ الْوَرْسُ»[1].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، (گوتی:) کەسێک لە ئیحرامدا بێ دەبێ چی لەبەر بکات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نابێ کراس و مێزەر و شەڕواڵ و ئەو پۆشاکانەشی کە کڵاوەکەی بەخۆیەوەیەتی لەبەر بکات، وە نابێ خوف لەپێ بکات، مەگەر کەسێک کە جووتە نەعلێکی دەست نەکەوێ ئەوە با دوو خوفەکە لەپێ بکات و تاکو خوار قولە پێیەکانی بیانبڕێ، وە هەر پۆشاکێک ڕەنگ کرابێ بە زەعفەران، یان وەڕس لەبەری مەکەن.

**زەعفەران و وەڕس:** دوو ڕووەکی بۆن خۆشن و بۆ ڕەنگکردنی پۆشاکیش کەڵکیان لێ وەرگیراوە.

**٢٩٣٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَلْبَسَ الْمُحْرِمُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا، بِوَرْسٍ، أَوْ زَعْفَرَانٍ»[2].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە کەسێک لە ئیحرامدا بێ پۆشاکێک لەبەر بکات کە بە زەعفەران و وەڕس ڕەنگ کرابێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٤٢، ومسلم: ١١٧٧، وأبو داود: ١٨٢٤، والترمذي: ٨٣٣، والنسائي: ٢٦٦٩ و ٢٦٧٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٧٧/٣، والنسائي: ٢٦٦٦.

## بابەت: کەسێک کە کراس و نەعلی ئیحرامی دەست نەکەوێ جگە لە شەڕواڵ و خوف

**٢٩٣١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ - قَالَ هِشَامٌ: عَلَى الْمِنْبَرِ - فَقَالَ: «مَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَارًا، فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ» وَقَالَ هِشَامٌ فِي حَدِيثِهِ «فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ، إِلَّا أَنْ يَفْقِدَ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو کە وتاری دەدا - هیشام گوتی: لەسەر دوانگە - جا فەرمووی: هەر کەسێک پۆشاکی ئیحرامی دەست نەکەوت با شەڕواڵ لەبەر بکات، وە هەر کەسێک جووتێک نەعلی دەست نەکەوت با جووتێک خوف لەپێ بکات. وە هیشام لە گێڕانەوەکەی خۆیدا گوتی: با شەڕواڵ لەپێ بکات بەڵام تەنها کاتێک کە پۆشاکی ئیحرامی دەست نەکەوت.

**إزار:** بەرکۆش، ئەو پۆشاکەیە کە حاجییەکان لەبەری دەکەن و خوارەوەی جەستە دادەپۆشێ.

**٢٩٣٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَجِدْ نَعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نەعلی دەست نەکەوت با خوف لەپێ بکات، وە تاکو خوار قولەپێیەکانی بیانبڕێ و کورتیان بکاتەوە.

## بابەت: خۆپاراستن لە هەندێ شت لە کاتی ئیحرامدا

**٢٩٣٣-** عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْعَرْجِ، نَزَلْنَا، فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعَائِشَةُ إِلَى جَنْبِهِ، وَأَنَا إِلَى جَنْبِ أَبِي، وَكَانَتْ زِمَالَتُنَا وَزِمَالَةُ أَبِي بَكْرٍ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٤١، ومسلم: ١١٧٨، وأبو داود: ١٨٢٩، والترمذي: ٨٢٤، والنسائي: ٢٦٧١ و ٢٦٧٢ و ٢٦٧٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٤٢ و ٥٨٠٣ و ٥٨٠٥ و ٥٨٠٦، ومسلم: ١١٧٧.

وَاحِدَةٌ، مَعَ غُلَامِ أَبِي بَكْرٍ، قَالَ: فَطَلَعَ الْغُلَامُ وَلَيْسَ مَعَهُ بَعِيرُهُ، فَقَالَ لَهُ: أَيْنَ بَعِيرُكَ؟ قَالَ أَضْلَلْتُهُ الْبَارِحَةَ، قَالَ: مَعَكَ بَعِيرٌ وَاحِدٌ تُضِلُّهُ؟ قَالَ: فَطَفِقَ يَضْرِبُهُ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «انْظُرُوا إِلَى هَذَا الْمُحْرِمِ، مَا يَصْنَعُ»[1].

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین (بۆ حەج)، تا گەیشتینە عەرج، لەوێ دابەزین، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت و عائیشەش لە تەنیشتی دانیشت، منیش لەلای باوکمەوە (ئەبو بەکر) دانیشتم، جا کەل و پەلی سەفەری ئێمە و ئەبو بەکر بەیەکەوە بو و بە غوڵامێک بوو کە هی ئەبو بەکر بوو، دەڵێ: غوڵامەکە دەرکەوت و هات وشترەکەی پێ نەبوو، پێی گوت: کوا وشترەکە؟ گوتی: دوێنێ ونم کرد، گوتی: وشترێکت پێبوو ئەویشت ون کرد؟ دەڵێ: دەستی بە لێدانی کردو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: تەماشای ئەوە بکەن لە ئیحرام دایە و کەچی چ کارێک دەکات!!

## بابەت: کەسێک لە ئیحرامدا بێت و سەری بشۆرێ

٢٩٣٤- عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُنَيْنٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ، وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ، اخْتَلَفَا بِالْأَبْوَاءِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ: يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، وَقَالَ الْمِسْوَرُ: لَا يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، فَأَرْسَلَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ إِلَى أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ أَسْأَلُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ بَيْنَ الْقَرْنَيْنِ، وَهُوَ يَسْتَتِرُ بِثَوْبٍ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا قُلْتُ أَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُنَيْنٍ أَرْسَلَنِي إِلَيْكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ أَسْأَلُكَ كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَغْسِلُ رَأْسَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ، قَالَ: فَوَضَعَ أَبُو أَيُّوبَ يَدَهُ عَلَى الثَّوْبِ فَطَأْطَأَهُ، حَتَّى بَدَا لِي رَأْسُهُ، ثُمَّ قَالَ: لِإِنْسَانٍ يَصُبُّ عَلَيْهِ: اصْبُبْ فَصَبَّ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ حَرَّكَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ، فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُهُ ﷺ يَفْعَلُ»[2].

واتە: ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حونەین لە باوکییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و میسوەری کوڕی مەخرەمە لە «الأبواء» (شوێنێکە لە نزیک مەککە) ڕاجیاییان لێ پەیدابوو، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتی: ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە بۆی هەیە سەری بشوات، میسوەریش گوتی: کەسێک لە

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٨١٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٤٠، ومسلم: ١٢٠٥، وأبو داود: ١٨٤٠، والنسائي: ٢٦٦٥.




ئیحرامدا بێ بۆی نیە سەری بشوات، (عەبدوڵڵای کوڕی حونەین دەڵێ:) جا ئیبنو عەبباس منی نارد بۆ لای ئەبو ئەییوبی ئەنصاڕی تاکو لەو بارەوە پرسیاری لێبکەم، کە چووم بینیم لە نێوان دوو شاخەی چەرخی بیرەکەدا خۆی دەشوات، وە بە پۆشاکێک پەردەیان بۆ گرتبوو، منیش سەلامم لێی کرد، ئەویش گوتی: ئەوە کێیە؟ گوتم: منم عەبدوڵڵای کوڕی حونەین، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس منی ناردووە بۆ لای تۆ تاکو پرسیارت لێبکەم کە کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئیحرامدا بوو چۆن چۆنی سەری دەشۆرد؟ گوتی: جا ئەبو ئەییوب دەستی خستە سەر ئەو پۆشاکەی کرابووە پەردە و دایبەزاند هەتا وایلێهات سەری لەلای منەوە دەرکەوت، پاشان بەو کەسەی گوت کە ئاوی پێدا دەرکرد: ئاوم بەسەردا بکە، ئەویش ئاوی بەسەر سەریدا کرد، پاشان بە دەستی سەری دەجوڵاند و دەستەکانی بۆ پێشەوەو بۆ دواوە دەبرد، پاشان گوتی: بینیم (پێغەمبەر ﷺ) ئا بەو جۆرەی دەکرد.

## بابەت: ئافرەتێک کە لە ئیحرامدا بێ ڕوخساری دادەپۆشێ

**٢٩٣٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، وَنَحْنُ مُحْرِمُونَ، فَإِذَا لَقِيَنَا الرَّاكِبُ أَسْدَلْنَا ثِيَابَنَا، مِنْ فَوْقِ رُءُوسِنَا، فَإِذَا جَاوَزَنَا، رَفَعْنَاهَا»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئێمە لە ئیحرامدا بووین لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ جا کاتێک سوارەکان پێیان دەگەیشتن و بەلاماندا تێدەپەڕین ئەوە پۆشاکەکانمان کە لە سەرمان بوون بەرمان دەدایەوەو، ڕوخسارمان دادەپۆشی، جا کاتێک کە تێدەپەڕین پۆشاکی سەر ڕوخسارمان هەڵدەدایەوە.

**٢٩٣٥م-** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ إِدْرِيسَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ[٢].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٨٣٣.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٨٣٣.

## بابەت: مەرج دانان لە حەجکردندا

**٢٩٣٦-** عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﵁، عَنْ جَدَّتِهِ قَالَ: لَا أَدْرِي أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ أَوْ سُعْدَى بِنْتِ عَوْفٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَى ضُبَاعَةَ بِنْتِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَقَالَ: «مَا يَمْنَعُكِ، يَا عَمَّتَاهُ مِنَ الْحَجِّ؟ فَقَالَتْ: أَنَا امْرَأَةٌ سَقِيمَةٌ، وَأَنَا أَخَافُ الْحَبْسَ، قَالَ: «فَأَحْرِمِي وَاشْتَرِطِي، أَنَّ مَحِلَّكِ، حَيْثُ حُبِسْتِ»[١].

**واتە:** ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر﵁ لە نەنکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: نازانم لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکرەوە، یان لە سوعدای کچی عەوفەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای زوباعەی کچی عەبدولموتەڵیب و فەرمووی: پوری خۆم چ شتێک بۆتە ڕێگرت لە حەجکردندا؟ ئەویش گوتی: من ئافرەتێکی دەردەدارو نەخۆشم دەترسم لە مەڕاسیمی حەجدا پەکم بکەوێت و بۆم تەواو نەکرێ، فەرمووی: تۆ ئیحرام ببەستە و مەرج دابنێ لە کوێ و کەی پەکت کەوت ئیحرام بشکێنی.

**٢٩٣٧-** عَنْ ضُبَاعَةَ ﵂، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا شَاكِيَةٌ، فَقَالَ: «أَمَا تُرِيدِينَ الْحَجَّ، الْعَامَ؟» قُلْتُ: إِنِّي لَعَلِيلَةٌ، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ «حُجِّي وَقُولِي: مَحِلِّي، حَيْثُ تَحْبِسُنِي»[٢].

**واتە:** زوباعە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆلام، لەوکاتەدا منیش سکاڵام دەرکرد بە دەست نەخۆشییەوە، جا فەرمووی: ناتهەوێ ئەو ساڵ حەج بکەی؟ گوتم: لە ڕاستیدا نەخۆشم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئیحرام ببەستە بۆ حەج و بڵێ: لەو شوێنەی پەکم کەوت ئیحرام دەشکێنم.

**٢٩٣٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: جَاءَتْ ضُبَاعَةُ بِنْتُ الزُّبَيْرِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: إِنِّي امْرَأَةٌ ثَقِيلَةٌ، وَإِنِّي أُرِيدُ الْحَجَّ، فَكَيْفَ أُهِلُّ؟ قَالَ: «أَهِلِّي، وَاشْتَرِطِي أَنَّ مَحِلِّي، حَيْثُ حَبَسْتَنِي»[٣].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٠٨، وأبو داود: ١٧٧٦، والترمذي: ٩٤١، والنسائي: ٢٧٦٦ و ٢٧٦٧.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: زوباعەی کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموتەڵیب هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: من ئافرەتێکی قورسم و لە ڕاستیدا دەمەوێ حەج بکەم، جا چۆن ئیحرام ببەستم؟ فەرمووی: ئیحرام ببەستە و مەرج دابنێ کە لەو شوێنەی پەکت کەوت ئیحرام بشکێنی.

## بابەت: چوونە ناو حەڕەم

**٢٩٣٩**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَتِ الْأَنْبِيَاءُ ﷺ تَدْخُلُ الْحَرَمَ، مُشَاةً حُفَاةً، وَيَطُوفُونَ بِالْبَيْتِ، وَيَقْضُونَ الْمَنَاسِكَ، حُفَاةً مُشَاةً»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەران ﷺ بە پیادە و پێی پەتی دەچوونە ناو حەڕەم و تەوافیان بە دەوری کەعبەدا دەکرد، وە ڕێ و ڕەسمی حەجیان بە پیادە و پێخواسی بەجێ دەگەیاند.

## بابەت: چوونە ناو مەککە

**٢٩٤٠**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يَدْخُلُ مَكَّةَ، مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا، وَإِذَا خَرَجَ خَرَجَ، مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە «الثنية العليا» وە (کە ڕێگایەکە لە سەرووی مەککەوە) دەچوو بۆناو مەککە و کاتێک لە مەککە دەرچووبا لە «الثنية السفلى» وە (کە ڕێگای خوارەوەی مەککەیە) دەردەچوو.

**٢٩٤١**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «دَخَلَ مَكَّةَ نَهَارًا»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە ڕۆژ چوو بۆ ناو مەککە.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٧٥، ومسلم: ١٢٥٧، وأبو داود: ١٨٦٦، والنسائي: ٢٨٦٥.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٨٥٤. وانظر البخاري: ١٥٧٤، ومسلم: ١٢٥٩.



**٢٩٤٢-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﵁، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيْنَ تَنْزِلُ غَدًا؟ وَذَلِكَ فِي حَجَّتِهِ، قَالَ: «وَهَلْ تَرَكَ لَنَا عَقِيلٌ مَنْزِلًا؟» ثُمَّ قَالَ: «نَحْنُ نَازِلُونَ غَدًا بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَةَ - يَعْنِي الْمُحَصَّبَ - حَيْثُ قَاسَمَتْ قُرَيْشٌ عَلَى الْكُفْرِ، وَذَلِكَ أَنَّ بَنِي كِنَانَةَ، حَالَفَتْ قُرَيْشًا عَلَى بَنِي هَاشِمٍ، أَنْ لَا يُنَاكِحُوهُمْ، وَلَا يُبَايِعُوهُمْ» قَالَ مَعْمَرٌ: قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَالْخَيْفُ الْوَادِي[1].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﵁ دەڵێ: لە حەجەکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی لەکوێ دادەبەزی؟ فەرمووی: جا عەقیل هیچ خانو و ماڵێکی بۆ ئێمە داناوە؟ پاشان فەرمووی: ئێمە بەیانی لە شیوی بەنو کینانە دادەبەزین -واتە: لە میحصەب، ئەو شوێنەی قورەیش سوێندی خوارد لەسەر بێ بڕوایی-، کە بەنو کینانە هاوپەیمانی قورەیش بوون لەسەر ئەوەی کە ژن و ژنخوازی لەگەڵ بەنو هاشم نەکەن و کڕین و فرۆشنیان لەگەڵ نەکەن. مەعمەڕ گوتی: زوهری گوتی: «الخیف» واتە: شیو.

## بابەت: دەستدان لە بەردە ڕەشەکە

**٢٩٤٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ ﵁، قَالَ: رَأَيْتُ الْأُصَيْلِعَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يُقَبِّلُ الْحَجَرَ وَيَقُولُ: «إِنِّي لَأُقَبِّلُكَ، وَإِنِّي لَأَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لَا تَضُرُّ وَلَا تَنْفَعُ، وَلَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُقَبِّلُكَ، مَا قَبَّلْتُكَ»[2].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی سەرجیس ﵁ دەڵێ: سەر ڕووتاوە عومەری کوڕی خەتتابم بینی کە بەردە ڕەشەکەی ماچ دەکرد و دەیگوت: بێگومان ماچت دەکەم، وە بە دڵنیایی دەزانم کە تۆ تەنها بەردێکی و نە توانای زەرەر و نە توانای سودگەیاندنت نیە، خۆ ئەگەر نەمدیتبا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی دەکردی ئەوە ماچم نەدەکردی.

**٢٩٤٤-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيَأْتِيَنَّ هَذَا الْحَجَرُ، يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا، وَلِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ، يَشْهَدُ عَلَى مَنْ يَسْتَلِمُهُ، بِحَقٍّ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٨٨ و ٣٠٥٨ و ٤٢٨٢، ومسلم: ١٣٥١، وأبو داود: ٢٠١٠ و ٢٩١٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٩٧، ومسلم: ١٢٧٠_١٢٧١، وأبو داود: ١٨٧٣، والترمذي: ٨٦٠، والنسائي: ٢٩٣٦_٢٩٣٨.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٩٦١.

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی دواییدا ئەو بەردە ڕەشە دێنن، لە کاتێکدا کە دێ دوو چاوی هەیە کە پێیان دەبینێ و، زمانیشی هەیە قسەی پێدەکات، گەواهی و شاهیدی دەدات بۆ هەر کەسێک کە دەستی پێداهێنابێ بە هەق و ڕاستی.

**٢٩٤٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: اسْتَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْحَجَرَ، ثُمَّ وَضَعَ شَفَتَيْهِ عَلَيْهِ، يَبْكِي طَوِيلًا، ثُمَّ الْتَفَتَ، فَإِذَا هُوَ بِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ يَبْكِي، فَقَالَ يَا عُمَرُ: «هَاهُنَا تُسْكَبُ الْعَبَرَاتُ»**[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی کردە لای بەردە ڕەشەکە، پاشان دوو لێوی خۆی لەسەر دانا و گریانێکی درێژ گریا، پاشان ئاوڕی دایەوە لەودەمەدا عومەری کوڕی خەتتاب لەوێ بوو دەگریا، ئەویش فەرمووی: ئەی عومەر ئا لێرە فرمێسکەکان دەڕژێن (لە ترس و شەرمی خوا).

**٢٩٤٦- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: «لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْتَلِمُ مِنْ أَرْكَانِ الْبَيْتِ، إِلَّا الرُّكْنَ الْأَسْوَدَ، وَالَّذِي يَلِيهِ مِنْ نَحْوِ دُورِ الْجُمَحِيِّينَ»**[2].

واتە: سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بە هیچ لە گۆشەکانی کەعبەدا نەدەهێنا جگە لە گۆشەی بەردە ڕەشەکە و ئەو گۆشەی دوای ئەو (کە ڕوکنی یەمانی پێدەڵێن) لەڕوویماڵەکانی جومەحییەکان.

## بابەت: ئەوەی گۆچان لە بەردەکە بدات لە جیاتی دەست لێدان

**٢٩٤٧- عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ ﷺ، قَالَتْ: لَمَّا اطْمَأَنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ «طَافَ عَلَى بَعِيرٍ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ، بِمِحْجَنٍ بِيَدِهِ، ثُمَّ دَخَلَ الْكَعْبَةَ، فَوَجَدَ فِيهَا حَمَامَةَ عَيْدَانٍ، فَكَسَرَهَا، ثُمَّ قَامَ عَلَى بَابِ الْكَعْبَةِ، فَرَمَى بِهَا، وَأَنَا أَنْظُرُ»**[3].

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٦٧/٢٤٣، والنسائي: ٢٩٥١. وانظر البخاري: ١٦٦، وأبو داود: ١٨٧٤ و ١٨٧٦، والترمذي: ٨٦١.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ١٨٧٨.




واتە: صەفیەی کچی شەیبە ﵂ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ دڵنیا بوو لە ساڵی ڕزگارکردنی مەککەدا، بە سواری وشترەکەی تەوافی کرد و گۆچانەکەی دەستی بە بەردەکەدا دەهێنا، پاشان ڕۆیشتە ناو کەعبە و بینی لەوێدا وێنەیەک هەیە وەکو وێنەی کۆتر کە لە داری خورما دروست کرابوو، ئنجا شکاندی، پاشان لەسەر دەرگای کەعبە ڕاوەستا و فڕێیدا، وە منیش سەیرم دەکرد.

٢٩٤٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «طَافَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، عَلَى بَعِيرٍ، يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ، بِمِحْجَنٍ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا بەسەر وشترەکەیەوە تەوافی کرد، گۆچانەکەشی بە بەردەکە دادەهێنا (لە جیاتی دەست لێدان).

٢٩٤٩- عَنْ مَعْرُوفُ بْنُ خَرَّبُوذَ الْمَكِّيُّ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الطُّفَيْلِ عَامِرَ بْنَ وَاثِلَةَ، قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، عَلَى رَاحِلَتِهِ، يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنِهِ، وَيُقَبِّلُ الْمِحْجَنَ»[2].

واتە: مەعروفی کوڕی خەڕەبوزی مەککیی ﵁ دەڵێ: گوێم لە ئەبو توفەیل عامیری کوڕی واسیلە بوو کە گوتی: پێغەمبەرم ﷺ بینی کە بەسەر وشترەکەیەوە تەوافی کەعبەی دەکرد و، گۆچانەکەی بە بەردەکە دادەهێنا و، گۆچانەکەی ماچ دەکرد.

## بابەت: خێرا ڕۆیشتن لە دەوری کەعبە

٢٩٥٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ «إِذَا طَافَ بِالْبَيْتِ الطَّوَافَ الْأَوَّلَ، رَمَلَ ثَلَاثَةً، وَمَشَى أَرْبَعَةً، مِنَ الْحِجْرِ إِلَى الْحِجْرِ» وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ[3].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک تەوافی یەکەمی کرد بە دەوری کەعبەدا، سێ جار بە هەروەلە تەوافی کرد و چوار جاریش بە ڕۆیشتنی ئاسایی، لە گۆشەوە بۆ گۆشە (واتە: دەوری تەواو). (ڕاوی دەڵێ:) وە ئیبنو عومەریش بەو شێوەیەی دەکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٠٧، ومسلم: ١٢٧٢، وأبو داود: ١٨٧٧ و ١٨٨١، والترمذي: ٨٦٥، والنسائي: ٧١٣ و ٢٩٥٤.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه مسلم: ١٢٧٥، وأبو داود: ١٨٧٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦١٦، ومسلم: ١٢٦١، وأبو داود: ١٨٩٣، والنسائي: ٢٩٤١.

**٢٩٥١-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «رَمَلَ مِنَ الْحِجْرِ إِلَى الْحِجْرِ ثَلَاثًا، وَمَشَى أَرْبَعًا»[1].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە گۆشەوە بۆ گۆشە سێ جار بە هەروەلە تەوافی دەکرد و، چوار جاریش بە ڕۆیشتنی ئاسایی.

**٢٩٥٢-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ، يَقُولُ: «فِيمَ الرَّمَلَانُ الْآنَ؟ وَقَدْ أَطَّأَ اللَّهُ الْإِسْلَامَ، وَنَفَى الْكُفْرَ وَأَهْلَهُ، وَايْمُ اللَّهِ، مَا نَدَعُ شَيْئًا، كُنَّا نَفْعَلُهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[2].

واتە: زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە عومەر بوو دەیگوت: باشە لە ئێستادا و لە تەوافدا و لە سەعی نێوان صەفا و مەڕوەدا هەروەلە بۆچی؟ لەکاتێکدا کە خوا ئیسلامی جێگیر کردوە و بەهێزە، وە کوفر و ئەهلی کوفری قەدەغە کردوە، سوێند بە خوا هەر شتێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کردبێتمان وازی لێناهێنین.

**٢٩٥٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِأَصْحَابِهِ حِينَ أَرَادُوا دُخُولَ مَكَّةَ فِي عُمْرَتِهِ بَعْدَ الْحُدَيْبِيَةِ، «إِنَّ قَوْمَكُمْ غَدًا سَيَرَوْنَكُمْ، فَلَيَرَوُنَّكُمْ جُلْدًا» فَلَمَّا دَخَلُوا الْمَسْجِدَ، اسْتَلَمُوا الرُّكْنَ وَرَمَلُوا وَالنَّبِيُّ ﷺ مَعَهُمْ، حَتَّى إِذَا بَلَغُوا الرُّكْنَ الْيَمَانِيَ، مَشَوْا إِلَى الرُّكْنِ الْأَسْوَدِ، ثُمَّ رَمَلُوا، حَتَّى بَلَغُوا الرُّكْنَ الْيَمَانِيَ، ثُمَّ مَشَوْا إِلَى الرُّكْنِ الْأَسْوَدِ، فَفَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ مَشَى الْأَرْبَعَ[3].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: کاتێک هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ویستیان بچنە ناو مەککە بۆ عومرەی دوای حودەیبیە پێغەمبەر ﷺ پێیانی فەرموو: بەیانی خزمەکانتان دەتانبینن جا با بە توند و تۆڵی و بەهێزی بتانبینن، جا کاتێک چوونە ناو مزگەوت دەستیان لە بەردە ڕەشەکە داو، بە هەڕوەلە ڕۆیشتن و پێغەمبەریشیان ﷺ لەگەڵ بوو، هەتاکو گەیشتنە ڕوکنی یەمانی، ئەوجار بە ئاسایی ڕۆیشتن تاکو بەردە ڕەشەکە، جا سێ جار بەو شێوەیە تەوافی کرد، پاشان چوار جار بە ڕۆیشتنی ئاسایی تەوافی کرد.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢١٨، والترمذي: ٨٥٦ و ٨٥٧، والنسائي: ٢٩٣٩ و ٢٩٤٤ و ٢٩٦١_٢٩٦٣ و ٢٩٧٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري بإثر: ١٦٠٥، وأبو داود: ١٨٨٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٠٢، ومسلم: ١٢٦٤ و ١٢٦٦، وأبو داود: ١٨٨٥ و ١٨٨٩ و ١٨٩٠.





## بابەت: سەرشان ڕووتکردن

**٢٩٥٤-** عَنْ ابْنِ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ أَبِيهِ يَعْلَى ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «طَافَ مُضْطَبِعًا» قَالَ قَبِيصَةُ: وَعَلَيْهِ بُرْدٌ[١].

**واتە: ئیبنو یەعلای کوڕی ئومەییە لە یەعلای باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ تەوافی کرد لەکاتێکدا کە شانی ڕاستی ڕووت بوو (دیار بوو). قەبیصە گوتی: عەبایەکی بەسەر شانەوە بوو.**

## بابەت: تەواف بە دەوری حیجردا (حیجری ئیسماعیل)

**٢٩٥٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْحِجْرِ، فَقَالَ: «هُوَ مِنَ الْبَيْتِ» قُلْتُ: مَا مَنَعَهُمْ أَنْ يُدْخِلُوهُ فِيهِ؟ قَالَ: «عَجَزَتْ بِهِمُ النَّفَقَةُ» قُلْتُ: فَمَا شَأْنُ بَابِهِ مُرْتَفِعًا، لَا يُصْعَدُ إِلَيْهِ، إِلَّا بِسُلَّمٍ؟ قَالَ: «ذَلِكَ فِعْلُ قَوْمِكِ، لِيُدْخِلُوهُ مَنْ شَاءُوا، وَيَمْنَعُوهُ مَنْ شَاءُوا، وَلَوْلَا أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُ عَهْدٍ بِكُفْرٍ، مَخَافَةَ أَنْ تَنْفِرَ قُلُوبُهُمْ، لَنَظَرْتُ هَلْ أُغَيِّرُهُ، فَأُدْخِلَ فِيهِ مَا انْتَقَصَ مِنْهُ، وَجَعَلْتُ بَابَهُ بِالْأَرْضِ»[٢].

**واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پرسیم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی حیجر، ئەویش فەرمووی: حیجر بەشێکە لە بەیت، گوتم: ئەی چ ڕێگرییەک هەبووە ڕێی پێنەداون لەگەڵ بەیتی بخەنەوە؟ فەرمووی: تێچوونی تەواویان نەبووە، گوتم: ئەی بۆ دەرگاکەی ئاوا بەرزە کە بەبێ پەیژە ناتوانرێ سەرکەوی بۆ دەرگاکە؟ فەرمووی: ئەوە ئیشی خزمەکانتە بۆئەوە وایان کردوە تاکو کێیان پێ خۆش بوو ڕێی چوونە ژوورەوەی بدەن و کێشیان پێ خۆش نەبوو ڕێگری لێبکەن، خۆ ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە هۆزەکەت تازە بە تازە لە کوفر دەرهاتوون و لە ترسی ئەوە نەبێ دڵیان بگۆڕێ ئەوە بیرم لە گۆڕانکاری دەکردەوە کە ئەوەی لێی بەجێماوە لەگەڵی بخەمەوەو دەرگاکەشم لەسەر زەوییەوە دادەنا.**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨٨٣، والترمذي: ٨٥٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٨٤، ومسلم: ١٣٣٣/٤٠٥.

## بابەت: گەورەیی تەواف

٢٩٥٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، كَانَ كَعِتْقِ رَقَبَةٍ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک تەوافی بەیت بکات و، دوو ڕکات نوێژ بکات، وەکو ئەوە وایە بەندەیەکی ئازاد کردبێت.

٢٩٥٧- عَنْ حُمَيْدُ بْنُ أَبِي سَوِيَّةَ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ هِشَامٍ، يَسْأَلُ عَطَاءَ بْنَ أَبِي رَبَاحٍ عَنِ الرُّكْنِ الْيَمَانِي، وَهُوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، فَقَالَ عَطَاءٌ: حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «وُكِلَ بِهِ سَبْعُونَ مَلَكًا، فَمَنْ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، قَالُوا: آمِينَ» فَلَمَّا بَلَغَ الرُّكْنَ الْأَسْوَدِ، قَالَ يَا أَبَا مُحَمَّدٍ مَا بَلَغَكَ فِي هَذَا الرُّكْنِ الْأَسْوَدِ؟ فَقَالَ عَطَاءٌ: حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ فَاوَضَهُ، فَإِنَّمَا يُفَاوِضُ يَدَ الرَّحْمَنِ» قَالَ لَهُ ابْنُ هِشَامٍ: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ فَالطَّوَافُ؟ قَالَ عَطَاءٌ: حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعًا وَلَا يَتَكَلَّمُ، إِلَّا بِسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ، إِلَّا بِاللَّهِ، مُحِيَتْ عَنْهُ عَشْرُ سَيِّئَاتٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ، وَرُفِعَ لَهُ بِهَا عَشَرَةُ دَرَجَاتٍ، وَمَنْ طَافَ، فَتَكَلَّمَ وَهُوَ فِي تِلْكَ الْحَالِ، خَاضَ فِي الرَّحْمَةِ بِرِجْلَيْهِ، كَخَائِضِ الْمَاءِ بِرِجْلَيْهِ»[٢].

واتە: حومەیدی کوڕی ئەبو سەوییە ﵁ دەڵێ: گوێم لە ئیبنو هیشام ﵁ بوو پرسیاری لە عەتائی کوڕی ئەبو ڕەباح دەکرد لەلای ڕوکنی یەمانی، لەوکاتەدا کە تەوافی بەیتی دەکرد، جا عەتاء گوتی: ئەبو هوڕەیرە بۆی گێڕاومەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەفتا فریشتە ڕاسپێردراون لەلای ڕوکنی یەمانی کە هەر کەسێک بڵێت: خودایە داوای لێخۆشبوون و لەشساغیت لێدەکەم لە دونیا و قیامەت، پەروەردگارا لە دونیا چاکە بکە بەشمان و لە دوارۆژیشدا لە قیامەت چاکە و خێرمان پێبدە و لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە، ئەوە فریشتەکان دەڵێن: ئامین، جا کاتێک گەیشتە گۆشەی بەردە

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٩٥٩، والنسائي: ٢٩١٩.

(٢) ضعيف.

ڕەشەکە گوتی: ئەی باوکی موحەممەد چیت پێ گەیشتووە دەربارەی ئەو گۆشەیە؟ عەتائیش گوتی: ئەبو هورەیرە بۆی گێڕاومەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک بەرەوڕوو ڕووی تێبکات ئەوە ڕووی کردۆتە ڕەحمەتی خوا، ئیبنو هیشام گوتی: ئەی باوکی موحەممەد ئەی تەواف؟ عەتائیش گوتی: ئەبو هورەیرە بۆی گێڕاومەوە کە لە پێغەمبەری خواوەﷺ بیستوویەتی کە فەرموویەتی: هەر کەسێک حەوت جار تەوافی بەیت بکات و قسەی دونیایی نەکات، تەنها بڵێت: «سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ، إِلَّا بِاللَّهِ»، ئەوە دە خراپەی لەسەر دەسڕێتەوە و دە چاکەی بۆ دەنوسرێ و دە پلە بەرز دەکرێتەوە، وە هەر کەس تەواف بکات و قسەش بکات و لەو حاڵەش دابێ (لە تەوافدا)، ئەوە هەردوو پێیەکانی لەناو ڕەحمەت دایە هەروەکو کەسێک کە پێیەکانی لەناو ئاودا بێ (بەڵام بەشەکانی تری جەستەی نا).

## بابەت: دوو ڕکاتی دوای تەواف

٢٩٥٨- عَنِ الْمُطَّلِبِ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «إِذَا فَرَغَ مِنْ سَبْعِهِ جَاءَ، حَتَّى يُحَاذِيَ بِالرُّكْنِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ فِي حَاشِيَةِ الْمَطَافِ، وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الطُّوَّافِ أَحَدٌ» قَالَ ابْنُ مَاجَةَ: هَذَا بِمَكَّةَ خَاصَّةً[١].

واتە: موتەڵیب ﷺ دەڵێ: بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک لە حەوت تەوافەکە بۆوە هات بەرانبەری ڕوکن دوو ڕکات نوێژی کرد لەلایەکی کەعبە و هیچ کەسێک لەبەینی ئەو و تەوافکارەکاندا نەبوو (واتە: سوترەی لە نێوان خۆی و تەوافکارەکان دانەنابوو). ئیبنو ماجە گوتی: ئەو سوترە دانەنانە تایبەتە بە مەککە.

٢٩٥٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «قَدِمَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعًا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ - قَالَ وَكِيعٌ: يَعْنِي عِنْدَ الْمَقَامِ - ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّفَا»[٢].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٠١٦ بمعناه، والنسائي: ٧٥٨ و ٢٩٥٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٥، ومسلم: ١٢٣٤، والنسائي: ٢٩٣٠ و ٢٩٦٠ و ٢٩٦٦.

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هات و حەوت جار تەوافی بەیتی کرد، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، وەکیع گوتی: واتە: لەلای مەقامی ئیبڕاهیم، پاشان دەرچوو بۆ صەفا.

**٢٩٦٠-** عَنْ جَابِرٍ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: «لَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ طَوَافِ الْبَيْتِ أَتَى مَقَامَ إِبْرَاهِيمَ» فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا مَقَامُ أَبِينَا إِبْرَاهِيمَ، الَّذِي قَالَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ ۝١٢٥﴾ البقرة، قَالَ الْوَلِيدُ: فَقُلْتُ لِمَالِكٍ: هَكَذَا قَرَأَهَا: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ ۝١٢٥﴾ البقرة؟ قَالَ: نَعَمْ[1].

واتە: جابیر ﵁ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەوافی بەیت بۆوە، هات بۆ مەقامی ئیبڕاهیم، جا عومەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئا ئەوە مەقام و شوێنی باوکمان ئیبڕاهیمە ئەوەی کە خوای پاک و بێگەرد فەرموویەتی: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ ۝١٢٥﴾ البقرة، واتە: شوێنی ئەو بەردەی ئیبڕاهیم ﵇ لە سەری ڕادەوەستا (کاتی دروست کردنی کەعبە) بکەنە جێگای نوێژ. وەلید گوتی: بە مالیکم گوت: بەو جۆرە خوێندیەوە: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ ۝١٢٥﴾ البقرة؟ گوتی: بەڵێ.

## بابەت: تەوافی نەخۆش بە سواری

**٢٩٦١-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، أَنَّهَا مَرِضَتْ «فَأَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تَطُوفَ مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ، وَهِيَ رَاكِبَةٌ» قَالَتْ: «فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي إِلَى الْبَيْتِ، وَهُوَ يَقْرَأُ وَالطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ» قَالَ ابْنُ مَاجَةَ: هَذَا حَدِيثُ أَبِي بَكْرٍ[2].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە، کە نەخۆش کەوتووە (لە حەجدا)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوە کە لە دواوەی خەڵک تەواف بکات بە سواری وڵاخ، گوتی: جا بینیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەرەو بەیت دەکرد و سووڕەتی «الطور»ـی دەخوێند. ئیبنو ماجە گوتی: ئەوە فەرموودەی ئەبو بەکر (ی ئیبنو شەیبە)یە.

---

(١) ضعيف منكر بهذا اللفظ. وانظر: مسلم: ١٢١٨، وأبو داود: ١٩٠٥، وابن ماجه: ٢٩٥١، والنسائي: ٢٩٣٩ و ٢٩٤٤ و ٢٩٦١_٢٩٧٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٦٤، ومسلم: ١٢٧٦، وأبو داود: ١٨٨٢، والنسائي: ٢٩٢٥ و ٢٩٢٧.




## بابەت: شوێنێک کە پێی دەڵێن: (الملتزم) (نێوانی بەردە ڕەشەکە و دەرگای کەعبە)

٢٩٦٢- عَنْ عَمْرُو بْنُ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: طُفْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، فَلَمَّا فَرَغْنَا مِنَ السَّبْعِ، رَكَعْنَا فِي دُبُرِ الْكَعْبَةِ فَقُلْتُ: أَلَا نَتَعَوَّذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ، قَالَ: «أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ» قَالَ: ثُمَّ مَضَى، فَاسْتَلَمَ الرُّكْنَ، ثُمَّ قَامَ بَيْنَ الْحَجَرِ، وَالْبَابِ، فَأَلْصَقَ صَدْرَهُ، وَيَدَيْهِ، وَخَدَّهُ إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ»[١].

واتە: عەمرى کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عەمر تەوافم کرد، جا کاتێک حەوت تەوافەکەمان تەواوکرد لە پشتەوەی کەعبە نوێژمان کرد، ئنجا گوتم: ئایا پەنا بە خوا نەگرین لە ئاگر؟ گوتی: پەنا دەگرم بە خوا لە ئاگری دۆزەخ، پاشان ڕۆیشت دەستیدا لە بەردەکە، پاشان لە نێوانی بەردە ڕەشەکە و دەرگاکە (کە پێی دەڵێن: «الملتزم») ڕاوەستا، ئنجا سنگ و دەستەکانی و لاچاوی بە دیوارەکەوە نوساند، پاشان گوتی: ئا بەو شێوەیە بینیومە کە پێغەمبەری خوا ﷺ وایکردوە.

## بابەت: ئافرەتێک کە لە سوڕی مانگانەدا بێ هەموو مەڕاسیمەکان دەکات جگە لە تەواف

٢٩٦٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَا نَرَى إِلَّا الْحَجَّ، فَلَمَّا كُنَّا بِسَرِفَ، أَوْ قَرِيبًا مِنْ سَرِفَ، حِضْتُ فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَا أَبْكِي، فَقَالَ: «مَا لَكِ أَنُفِسْتِ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «إِنَّ هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ، عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَاقْضِي الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا، غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ» قَالَتْ: «وَضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نِسَائِهِ، بِالْبَقَرِ»[٢].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٨٩٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٤، ومسلم: ١٢١١، وأبو داود: ١٧٧٨ و ١٧٨١ و ١٧٨٢، والترمذي: ٩٤٥، والنسائي: ٢٧٤١ و ٢٧٦٣.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین، کە دەرچوونەکەمان تەنها بۆ حەج کردن بوو، جا کاتێک گەیشتینە سەریف (شوێنێکە لە دەوری مەککە) یان نزیکی سەریف بووین، تووشی سوڕی مانگانە بووم، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلام و لەوکاتەدا من دەگریام، ئەویش فەرمووی: چیتە؟ عادە بوویتە؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: ئەوە شتێکە کە خوا بۆ ئافرەتانی نەوەی ئادەمی داناوە (واتە: دڵی دایەوە تا دڵ تەنگ نەبێت)، بۆیە هەموو ڕێ و ڕەسمەکانی حەج بکە تەنها تەوافی کەعبە مەکە، (عائیشە) گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ مانگایەکی کردە قوربانی بۆ خێزانەکانی.

## بابەت: ئیحرام بەستن تەنها بۆ حەج

**٢٩٦٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَفْرَدَ الْحَجَّ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە جیا ئیحرامی بۆ حەج بەستووە.

**٢٩٦٥-** عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَفْرَدَ الْحَجَّ»[٢].

واتە: عائیشەی دایکی ئیمانداران ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە جیا ئیحرامی بۆ حەج بەستووە.

**٢٩٦٦-** عَنْ جَابِرٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَفْرَدَ الْحَجَّ»[٣].

واتە: جابیر ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە جیا ئیحرامی بۆ حەج بەستووە.

**٢٩٦٧-** عَنْ جَابِرٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ ﵃ «أَفْرَدُوا الْحَجَّ»[٤].

واتە: جابیر ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان ﵃ بە جیا ئیحرامیان بۆ حەج بەستووە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢١١/١٢٢، وأبو داود: ١٧٧٧، والترمذي: ٨٢٠، والنسائي: ٢٧١٥ و ٢٧١٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢١١/١٢٢، وأبو داود: ١٧٧٧، والترمذي: ٨٢٠، والنسائي: ٢٧١٥ و ٢٧١٦.

(٣) صحيح. وانظر مسلم: ١٢١٦.

(٤) ضعيف الإسناد.





## بابەت: کەسێک کە ئیحرام بۆ حەج و عومرە پێکەوە ببەستێ

**٢٩٦٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى مَكَّةَ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «لَبَّيْكَ عُمْرَةً، وَحِجَّةً»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ مەککە، جا گوێم لێبوو (پێغەمبەر ﷺ) دەیفەرموو: «لبيك عمرة وحجة»، واتە: تەلبیەی عومرەو حەجی پێکەوە کرد.**

**٢٩٦٩-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَبَّيْكَ بِعُمْرَةٍ، وَحِجَّةٍ»[٢].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «لبيك بعمرة وحجة»، واتە: تەلبیەی عومرەو حەجی بەیەکەوە کرد.**

**٢٩٧٠-** عَنْ عَبْدَةَ بْنِ أَبِي لُبَابَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا وَائِلٍ شَقِيقَ بْنَ سَلَمَةَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ الصُّبَيَّ بْنَ مَعْبَدٍ، يَقُولُ: كُنْتُ رَجُلًا نَصْرَانِيًّا، فَأَسْلَمْتُ، فَأَهْلَلْتُ بِالْحَجِّ، وَالْعُمْرَةِ، فَسَمِعَنِي سَلْمَانُ بْنُ رَبِيعَةَ، وَزَيْدُ بْنُ صُوحَانَ وَأَنَا أُهِلُّ بِهِمَا جَمِيعًا بِالْقَادِسِيَّةِ، فَقَالَا: لَهَذَا أَضَلُّ مِنْ بَعِيرِهِ، فَكَأَنَّمَا حَمَلَا عَلَيَّ جَبَلًا بِكَلِمَتِهِمَا، فَقَدِمْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَأَقْبَلَ عَلَيْهِمَا، فَلَامَهُمَا، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيَّ، فَقَالَ: «هُدِيتَ لِسُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، هُدِيتَ لِسُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ» قَالَ هِشَامٌ: فِي حَدِيثِهِ قَالَ شَقِيقٌ: فَكَثِيرًا مَا ذَهَبْتُ أَنَا وَمَسْرُوقٌ نَسْأَلُهُ عَنْهُ[٣].

**واتە: عەبدەی کوڕی ئەبو لوبابە ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەبو وائیل کە شەقیقی کوڕی سەلەمە بوو دەیگوت: گوێم لە صوبەییەی کوڕی مەعبەد بوو دەیگوت: من پیاوێکی نەصڕانی بووم و مسوڵمان بووم، ئنجا بە نیەتی حەج و عومرە ئیحرامم بەست، جا سەلمانی کوڕی ڕەبیعە و زەیدی کوڕی صوحان گوێیان لێم بوو کە من بە نیەتی هەردووکیان ئیحرام دەبەستم لە قادسیە، بۆیە گوتیان: ئا ئەوە لە وشترەکەی نەشارەزاترە، منیش**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٥١، ومسلم: ١٢٣٢ و ١٢٥١، وأبو داود: ١٧٩٥ و ١٧٩٦، والترمذي: ٨١٨، والنسائي: ٢٧٢٩_٢٧٣١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٥١، ومسلم: ١٢٣٢ و ١٢٥١، وأبو داود: ١٧٩٥ و ١٧٩٦، والترمذي: ٨١٨، والنسائي: ٢٧٢٩_٢٧٣١.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٩٨ مختصراً و ١٧٩٩، والنسائي: ٢٧١٩ و ٢٧٢٠ و ٢٧٢١.

وەک ئەوەی کێوێک بخەنە سەر پشتم بەو قسەیان (هێندەم پێ ناخۆش بوو)، بۆیە هاتمە لای عومەری کوڕی خەتتاب، ئنجا باسەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش ڕووی تێکردن و لۆمە و سەرزەنشتی کردن، پاشان ڕووی لە من کردو، گوتی: لەسەر ڕێباز و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ڕێنوێنی کراوی، لەسەر ڕێباز و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ڕێنوێنی کراوی. هیشام لە گێڕانەوەکەی خۆیدا گوتی: شەقیق گوتی: من و مەسڕوق زۆر جار دەچووین پرسیارمان دەربارەی لێدەکرد.

**٢٩٧٠م**- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، وَأَبُو مُعَاوِيَةَ وَخَالِي يَعْلَى قَالُوا: حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنِ الصُّبَيِّ بْنِ مَعْبَدٍ قَالَ: كُنْتُ حَدِيثَ عَهْدٍ بِنَصْرَانِيَّةٍ، فَأَسْلَمْتُ، فَلَمْ آلُ أَنْ أَجْتَهِدَ فَأَهْلَلْتُ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ[١].

واتە: صبی کوڕی مەعبەد دەڵێ: تازە بەتازە لە گاورییەوە موسوڵمان ببووم، هیچ دوو دڵ نەبووم لە جیهادو تێکۆشان، - کاتی حەج و عومرە هات- منیش ئیحرامم بە حەج و عومرە بە یەکەوە بەست، ئیتر بەشێوەی فەرموودەی پێشوو گێڕایەوەو باسی کرد.

**٢٩٧١**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو طَلْحَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «قَرَنَ الْحَجَّ، وَالْعُمْرَةَ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: ئەبو تەڵحە هەواڵی پێدام کە پێغەمبەری خوا ﷺ حەج و عومرەی بەیەکەوە کۆکردۆتەوە.

## بابەت: تەوافی کەسێک کە حەج و عومرە بەیەکەوە بکات

**٢٩٧٢**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، وَابْنِ عُمَرَ وَابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهم، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «لَمْ يَطُفْ هُوَ وَأَصْحَابُهُ، لِعُمْرَتِهِمْ وَحَجَّتِهِمْ، حِينَ قَدِمُوا، إِلَّا طَوَافًا وَاحِدًا»[٣].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا و ئیبنو عومەر و ئیبنو عەبباس رضي الله عنهم دەگێڕنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی کاتێ هاتن بۆ حەج و عومرەکەیان تەنها یەک تەوافیان کرد.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٩٨ مختصراً و ١٧٩٩، والنسائي: ٢٧١٩ و ٢٧٢٠ و ٢٧٢١.

(٢) صحيح. انفرد به ابن ماجه.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢١٥ و ١٢٧٩، وأبو داود: ١٨٩٥، والترمذي: ٩٤٧، والنسائي: ٢٩٨٦.

**٢٩٧٣-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «طَافَ لِلْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، طَوَافًا وَاحِدًا»[١].

**واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بۆ حەج و عومرە یەک تەوافی کردوە (نەک بۆ هەر یەکەیان تەوافی بە جیا).**

**٢٩٧٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، «أَنَّهُ قَدِمَ قَارِنًا، فَطَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعًا، وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا، وَالْمَرْوَةِ» ثُمَّ قَالَ: «هَكَذَا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، کە هات حەج و عومرەی بەیەکەوە کرد، ئنجا حەوت جار تەوافی کەعبەی کرد و سەعی (ڕۆیشتنی) نێوان صەفا و مەڕوەی کرد، پاشان گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوازەی کردوە.**

**٢٩٧٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَحْرَمَ بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، كَفَى لَهُمَا طَوَافٌ وَاحِدٌ، وَلَمْ يَحِلَّ، حَتَّى يَقْضِيَ حَجَّهُ، وَيَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعًا»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە نیەتی حەج و عومرە ئیحرامی بەست ئەوە یەک تەواف تەواوە بۆ هەردووکیان، وە نابێ ئیحرام بشکێنێ تا حەجەکەی تەواو دەبێ و ئیحرام شکاندنەکەی هەردووکیان دەبێ بەیەکەوە بێت.**

**٢٩٧٦-** عَنْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: وَهُوَ بِالْعَقِيقِ «أَتَانِي آتٍ مِنْ رَبِّي، فَقَالَ: صَلِّ فِي هَذَا الْوَادِي الْمُبَارَكِ، وَقُلْ: عُمْرَةٌ فِي حَجَّةٍ» وَاللَّفْظُ لِدُحَيْمٍ[٤].

**واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە لە عەقیق بوو دەیفەرموو: کەسێک هاتە لام لەلایەن پەروەردگارمەوە، گوتی: لەو شیوە پیرۆزە نوێژ بکە و بڵێ: عومرە دەچێتە ناو حەج (واتە: نیەتی حەج و عومرە بەیەکەوە بێنە).**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢١٥ و ١٢٧٩، وأبو داود: ١٨٩٥، والترمذي: ٩٤٧، والنسائي: ٢٩٨٦.

(٢) صحيح. انظر البخاري: ٣٩٥ و ١٦١٧ و ١٦٩١ و ١٢٣٤ و ١٢٦١.

(٣) صحيح موقوفاً. أخرجه البخاري: ١٦٣٩، ومسلم: ١٢٣٠، والترمذي: ٩٥٨، والنسائي: ٢٧٤٦ و ٢٩٣٣. البخاري، مسلم، النسائي أخرجوه مطولاً.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٣٤، وأبو داود: ١٨٠٠.




**٢٩٧٧- عَنْ سُرَاقَةَ بْنِ جُعْشُمٍ ﷺ، قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، خَطِيبًا فِي هَذَا الْوَادِي، فَقَالَ: «أَلَا إِنَّ الْعُمْرَةَ، قَدْ دَخَلَتْ فِي الْحَجِّ، إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[١].**

واتە: سوڕاقەی کوڕی جوعشوم ﷺ دەڵێ: ئا لەم شیوەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بۆ وتاردان و فەرمووی: ئاگاداربن عومرە چۆتە ناو حەج تا ڕۆژی قیامەت (واتە: بەیەکەوە دەکرێن و بەیەکەوە نیەتیان بۆ دەهێنرێ).

**٢٩٧٨- عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ ﷺ، قَالَ: قَالَ لِي عِمْرَانُ بْنُ الْحُصَيْنِ: إِنِّي أُحَدِّثُكَ حَدِيثًا، لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَنْفَعَكَ بِهِ بَعْدَ الْيَوْمِ، اعْلَمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «قَدِ اعْتَمَرَ طَائِفَةٌ مِنْ أَهْلِهِ فِي الْعَشْرِ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ، فَلَمْ يَنْهَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَمْ يَنْزِلْ نَسْخُهُ» قَالَ فِي ذَلِكَ بَعْدُ رَجُلٌ بِرَأْيِهِ مَا شَاءَ، أَنْ يَقُولَ[٢].**

واتە: موتەڕیفی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی شیخیر ﷺ دەڵێ: عیمڕانی کوڕی حوصەین پێی گوتم: هەواڵێکت پێدەدەم کە بەڵکو خوا بیکاتە مایەی سوودگەیاندن پێ لە ئەمڕۆ بەدواوە، بزانە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ لە خانەوادەکەی لە دەی «ذو الحجة»ـدا عومرەیان کرد و پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەشی نەکردن، وە هیچ شتێکیش دانەبەزیوە ئەم بڕیارە هەڵبوەشێنێتەوە، ئیتر لێرە بەدوا هەر کەس لەسەر ئەم مەسەلەیە هەر شتێک بڵێ ئەوە بە ڕای خۆی دەیڵێ.

**٢٩٧٩- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يُفْتِي بِالْمُتْعَةِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: رُوَيْدَكَ بَعْضَ فُتْيَاكَ، فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي، مَا أَحْدَثَ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ فِي النُّسُكِ بَعْدَكَ، حَتَّى لَقِيتُهُ بَعْدُ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ عُمَرُ: «قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَعَلَهُ وَأَصْحَابُهُ، وَلَكِنِّي كَرِهْتُ أَنْ يَظَلُّوا بِهِنَّ مُعْرِسِينَ تَحْتَ الْأَرَاكِ، ثُمَّ يَرُوحُونَ بِالْحَجِّ تَقْطُرُ رُءُوسُهُمْ»[٣].**

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ﷺ دەگێڕنەوە، کە فەتوای دەدا بەوەی کە حەج و عومرە دەکرێ لە یەک جیابکرێنەوە، جا پیاوێک پێی گوت: لە فەتواکەت هێواش بە، بێگومان تۆ نازانی کە ئەمیری بڕواداران چ بڕیارێکی داوە بۆ حەج لە دوای تۆ،

---

(١) صحيح لغيره. النسائي: ٢٨٠٦ و ٢٨٠٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥١٨، ومسلم: ١٢٢٦/١٧٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٢٢، والنسائي: ٢٧٣٥.

هەتا دواتر پێی گەیشتم و لەوبارەیەوە لێم پرسی، عومەریش گوتی: بێگومان زانیومە کە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی ئەو جۆرە حەج و عومرەیان کردوە، بەڵام من پێم ناخۆش بوو کە خەڵکی لە ئەڕاک (شوێنێکە لە نزیک کێوی عەرەفات) سەرقاڵ بن لەگەڵ خێزانەکانیان، پاشان دەربچن بۆ حەج لەکاتێکدا کە ئاو لە سەریان دەتکێ (واتە: مافی تەواوی حەج نادەن و کەمتەرخەم دەبن).

## بابەت: هەڵوەشاندنەوەی حەج

٢٩٨٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: أَهْلَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالْحَجِّ خَالِصًا، لَا نَخْلِطُهُ بِعُمْرَةٍ، فَقَدِمْنَا مَكَّةَ، لِأَرْبَعِ لَيَالٍ خَلَوْنَ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ، فَلَمَّا طُفْنَا بِالْبَيْتِ، وَسَعَيْنَا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَجْعَلَهَا عُمْرَةً، وَأَنْ نَحِلَّ إِلَى النِّسَاءِ» فَقُلْنَا مَا بَيْنَنَا: لَيْسَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ عَرَفَةَ، إِلَّا خَمْسٌ، فَنَخْرُجُ إِلَيْهَا، وَمَذَاكِيرُنَا تَقْطُرُ مَنِيًّا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَبَرُّكُمْ وَأَصْدَقُكُمْ، وَلَوْلَا الْهَدْيُ، لَأَحْلَلْتُ» فَقَالَ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكٍ: أَمُتْعَتُنَا هَذِهِ، لِعَامِنَا هَذَا، أَمْ لِأَبَدٍ؟ فَقَالَ: «لَا، بَلْ لِأَبَدِ الْأَبَدِ»[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ئیحرامان تایبەت بۆ حەج بەست، کە عومرەی لەگەڵ تێکەڵ نەکەین، جا هاتین بۆ مەککە کە چوار ڕۆژ لە «ذو الحجة» تێپەڕی بوو، جا کاتێک تەوافی کەعبەمان کرد و هاتووچۆی نێوان صەفا و مەڕوەمان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین کە حەجەکەمان بکەین بە عومرەو خێزانەکانمان بۆ حەڵاڵ ببن (واتە: ئیحرام بشکێنن)، ئێمەش گوتمان: ئەوەندەی نەماوە، ماوەی ئێمە لە ئێستادا لەگەڵ ڕۆژی عەرەفات پێنج ڕۆژ ماوە، جا دەکرێ دەرچین بۆ عەرەفات و تازەش لەگەڵ خێزانەکانمان بووبین؟ ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە دڵنیایی من لە هەمووتان باشترم و ڕاستگۆتریشم، خۆ ئەگەر دیاری ماڵی خوام لەگەڵ خۆم نەهێنابا، ئەوە منیش ئیحرامم دەشکاند، جا سوڕاقەی کوڕی مالیک گوتی: ئایا ئەو تەمەتوعە تەنها بۆ ئەو ساڵە، یان بۆ هەتا هەتایە وادەبێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، بەڵکو بۆ هەتا هەتایە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٨٥ و ٧٣٦٧، ومسلم: ١٢١٦، وأبو داود: ١٧٨٧ و ١٧٨٩، والنسائي: ٢٨٠٥.




**٢٩٨١-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِخَمْسٍ بَقِينَ مِنْ ذِي الْقَعْدَةِ، لَا نُرَى إِلَّا الْحَجَّ، حَتَّى إِذَا قَدِمْنَا وَدَنَوْنَا «أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ أَنْ يَحِلَّ» فَحَلَّ النَّاسُ كُلُّهُمْ، إِلَّا مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ، «دُخِلَ عَلَيْنَا بِلَحْمِ بَقَرٍ، فَقِيلَ ذَبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَزْوَاجِهِ»[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین کە پێنج ڕۆژی مابوو لە مانگی «ذو القعدة»، کە تەنها مەبەستمان حەج کردن بوو، هەتا هاتین و نزیک بووینەوە، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بەوانە کرد کە دیاری ماڵی خوایان لەگەڵ خۆیان نەهێناوە ئیحرام بشکێنن، ئنجا خەڵکەکە جگە لەوانەی دیارییان هێنابوو هەموویان ئیحرامیان شکاند، جا لە کاتی ڕۆژی قوربانی کردندا یەکێک هات بۆ لامان و گۆشتی مانگای هێنابوو، جا گوترا کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خێزانەکانی مانگای سەربڕیوەو کردۆتە قوربانی.

**٢٩٨٢-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، قَالَ خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ، فَأَحْرَمْنَا بِالْحَجِّ، فَلَمَّا قَدِمْنَا مَكَّةَ قَالَ: «اجْعَلُوا حِجَّتَكُمْ، عُمْرَةً» فَقَالَ النَّاسُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ أَحْرَمْنَا بِالْحَجِّ، فَكَيْفَ نَجْعَلُهَا عُمْرَةً؟ قَالَ: «انْظُرُوا مَا آمُرُكُمْ بِهِ، فَافْعَلُوا» فَرَدُّوا عَلَيْهِ الْقَوْلَ، فَغَضِبَ فَانْطَلَقَ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ غَضْبَانَ، فَرَأَتِ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَتْ: مَنْ أَغْضَبَكَ؟ أَغْضَبَهُ اللَّهُ قَالَ: «وَمَا لِي لَا أَغْضَبُ، وَأَنَا آمُرُ أَمْرًا، فَلَا أُتْبَعُ»[٢].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی لەگەڵمان دەرچوو، ئنجا ئیحرامان بۆ حەج بەست، جا کاتێ هاتینە مەککە فەرمووی: حەجەکەتان بکەن بە عومرە (واتە: ئیحرام بشکێنن)، خەڵکەکەش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان ئێمە ئیحرامان بۆ حەج بەستووە، جا چۆن بیکەینە عومرە؟ فەرمووی: ئەوەی فەرمانتان پێ دەکەم ئەوەیان بکەن، ئەوانیش قسەکەی خۆیان دووبارە کردەوە، پێغەمبەریش ﷺ تووڕە بو و ڕۆیشت، پاشان بە تووڕەییەوە چوو بۆ لای عائیشە، عائیشەش تووڕە بوونەکەی پێوە بینی و گوتی: کێ تووڕەی

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٤، ومسلم: ١٢١١، والنسائي: ٢٦٥٠.

(٢) ضعيف.




کردووی خوا سزای بدات؟ فەرمووی: چۆن توورە نەبم لە کاتێکدا من فەرمانی شتێکیان پێدەکەم و ئەوانیش یەکسەر جێبەجێی ناکەن.

**٢٩٨٣-** عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄، قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُحْرِمِينَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلْيُقِمْ عَلَى إِحْرَامِهِ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلْيَحْلِلْ» قَالَتْ: وَلَمْ يَكُنْ مَعِي هَدْيٌ، فَأَحْلَلْتُ، وَكَانَ مَعَ الزُّبَيْرِ، هَدْيٌ، فَلَمْ يَحِلَّ، فَلَبِسْتُ ثِيَابِي، وَجِئْتُ إِلَى الزُّبَيْرِ، فَقَالَ: قُومِي عَنِّي، فَقُلْتُ: أَتَخْشَى أَنْ أَثِبَ عَلَيْكَ؟[1].

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێ: ئیحرامیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەستبو و دەرچووین، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک دیاری لەگەڵ خۆی هێناوە با بە ئیحرامەوە بمێنێتەوە، ئەوەشی کە دیاری نەهێناوە لەگەڵ خۆی با ئیحرام بشکێنێ، گوتی: من دیاریم نەهێنابوو بۆیە ئیحرامم شکاند، بەڵام زوبەیر دیاری هێنابوو ئیحرامی نەشکاند، ئنجا منیش پۆشاکم لەبەرکرد و هاتم بۆ لای زوبەیر (کە هاوسەریەتی)، گوتی: لێم دوور بکەوە (چونکە لە ئیحرامدا بووە)، دەڵێ: منیش گوتم: ئایا دەترسێی تووشی شتێکت بکەم؟

## بابەت: ئەوانەی کە دەڵێن هەڵوەشاندنەوەی حەج تایبەت بووە بە ئەوان

**٢٩٨٤-** عَنِ الْحَارِثِ بْنِ بِلَالِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ فَسْخَ الْحَجِّ فِي الْعُمْرَةِ، لَنَا خَاصَّةً؟ أَمْ لِلنَّاسِ عَامَّةً؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «بَلْ لَنَا خَاصَّةً»[2].

واتە: حاریسی کوڕی بیلالی کوڕی حاریس لە باوکییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ ئاخۆ هەڵوەشاندنەوەی حەج بۆ عومرە تایبەتە بە ئێمە؟ یان هەموو خەڵکی بۆیان هەیە بە گشتی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵکو تایبەتە بە ئێمە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٣٦، والنسائي: ٢٩٩٢.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٨٠٨، والنسائي: ٢٨٠٨.

**٢٩٨٥-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: «كَانَتِ الْمُتْعَةُ فِي الْحَجِّ لِأَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ خَاصَّةً»[١].

**واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: هەڵوەشاندنەوەی حەج بۆ عومرە تایبەت بووە بە هاوەڵانی موحەممەد ﷺ.**

## بابەت: هاتووچۆی صەفا و مەڕوە

**٢٩٨٦-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ ﷺ، قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: مَا أَرَى عَلَيَّ جُنَاحًا، أَنْ لَا أَطَّوَّفَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، قَالَتْ: «إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴿١٥٨﴾﴾ البقرة، وَلَوْ كَانَ كَمَا تَقُولُ: لَكَانَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ، لَا يَطَّوَّفَ بِهِمَا، إِنَّمَا أُنْزِلَ هَذَا فِي نَاسٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، كَانُوا إِذَا أَهَلُّوا، أَهَلُّوا لِمَنَاةَ، فَلَا يَحِلُّ لَهُمْ أَنْ يَطَّوَّفُوا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَلَمَّا قَدِمُوا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْحَجِّ، ذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ، فَأَنْزَلَهَا اللَّهُ، فَلَعَمْرِي مَا أَتَمَّ اللَّهُ ﷻ، حَجَّ، مَنْ لَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا، وَالْمَرْوَةِ»[٢].

**واتە: هیشامی کوڕی عوروە ﷺ دەڵێ: باوکم پێی ڕاگەیاندم و گوتی: بە عائیشەم گوت: ئەگەر (لە حەجدا) هاتووچۆی نێوان صەفاو مەڕوە نەکەم پێموایە کە هیچم ناکەوێتە سەر، گوتی: بێگومان خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ﴿١٥٨﴾﴾ البقرة، واتە: بەڕاستی صەفاو مەڕوە لە دروشمەکانی (ئاینی) خوان، جا هەر کەسێک حەجی ماڵی خوای کرد، یان عومرەی کرد هیچ خراپەو تاوانی ناگات کە هاتوچۆ وسەعی نێوان صەفاو مەڕوە بکات. (واتە: ئەگەر چی کاتی خۆیشی هاوبەشدانەرەکان سەعی ئەو جێگایەیان کردبێ و دەستیان بە بتەکاندا هێنابێ و ماچیان کردبن، ئەمڕۆ بە فەرمانی خوا بۆ ئێوە ڕەوایە تەوافیان بکەن). خۆ ئەگەر بەو جۆرە بایە کە تۆ دەڵێی ئەوە ئایەتەکە ئاواهی دەبوو: هیچ گوناهی لەسەر نیە ئەگەر هاتووچۆی صەفا و مەڕوە نەکات، ئنجا بێگومان ئەو ئایەتە لەسەر خەڵکێک دابەزی لەسەر ئەنصارییەکان، کاتێک کە ئیحرامیان دەبەست ئیحرامیان بۆ مەنات (کە بتێک بوو) دەبەست، جا بۆیان حەڵاڵ نەبوو کە صەفا و**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٢٤، وأبوداود: ١٨٠٧، والنسائي: ٢٨٠٩_٢٨١٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٤٣، ومسلم: ١٢٧٧، وأبو داود: ١٩٠١، والترمذي: ٢٩٦٥، والنسائي: ٢٩٦٧ و ٢٩٦٨.




مەڕوە بکەن، جا کاتێک کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هاتن بۆ حەج ئەوەیان بۆ باسکرد، ئنجا خوای ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاند، سوێند بێ بە خوا حەجی کەسێک بە تەواو دانانرێت و وەرناگیرێ کە هاتووچۆی نێوان صەفا و مەڕوە نەکات.

**٢٩٨٧-** عَنْ أُمِّ وَلَدٍ لِشَيْبَةَ ﵁، قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا، وَالْمَرْوَةِ وَهُوَ يَقُولُ: «لَا يُقْطَعُ الْأَبْطَحُ، إِلَّا شَدًّا»[1].

**واتە:** ئوممو وەلەدی شەیبە ﵁ دەڵێ: بینیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووچۆی نێوان صەفا و مەڕوەی دەکرد و دەیفەرموو: ئەو شوێنە بە خێرایی ڕۆشتن نەبێ نابڕدرێ.

**٢٩٨٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: إِنْ أَسْعَ بَيْنَ الصَّفَا، وَالْمَرْوَةِ، فَقَدْ «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسْعَى وَإِنْ أَمْشِ، فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمْشِي، وَأَنَا شَيْخٌ كَبِيرٌ»[2].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: ئەگەر بە خێرایی هاتووچۆی نێوان صەفا و مەڕوە بکەم، ئەوە بێگومان پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە بە خێرایی صەفا و مەڕوەی دەکرد، وە ئەگەر بە ڕۆیشتنی ئاسایی بڕۆم، ئەوە بینیومە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاسایی دەڕۆیی، منیش پیر و بە تەمەنم.

## بابەت: عومرە

**٢٩٨٩-** عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ ﵁، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْحَجُّ جِهَادٌ، وَالْعُمْرَةُ تَطَوُّعٌ»[3].

**واتە:** تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا ﵁ دەگێڕێتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دەیفەرموو: حەج جیهادەو عومڕەش سوننەت و زێدە چاکەیە.

**٢٩٩٠-** عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى ﵄، يَقُولُ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ «اعْتَمَرَ، فَطَافَ وَطُفْنَا مَعَهُ، وَصَلَّى وَصَلَّيْنَا مَعَهُ، وَكُنَّا نَسْتُرُهُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، لَا يُصِيبُهُ أَحَدٌ بِشَيْءٍ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٩٨٠.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٠٤، والترمذي: ٨٦٤، والنسائي: ٢٩٧٦.

(٣) ضعيف.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٠٠ و ١٧٩١، وأبو داود: ١٩٠٢ و ١٩٠٣.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین کاتێک کە عومرەی کرد، ئنجا تەوافی کردو، ئێمەش لەگەڵ ئەو تەوافمان کرد، وە نوێژی کردو، ئێمەش نوێژمان لەگەڵی کرد، وە ئێمە لە خەڵکی مەککە دەمانپاراست نەوەک کەسێک تووشی شتێکی بکات (زیانی پێبگەیەنن).

## بابەت: عومرە لە ڕەمەزاندا

**٢٩٩١-** عَنْ وَهْبِ بْنِ خَنْبَشٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ، تَعْدِلُ حَجَّةً»(١).

واتە: وەهبی کوڕی خەنبەش ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرەیەک کە لە ڕەمەزاندا بکرێ (خێر و پاداشتەکەی) بەرانبەرە بە حەجێک.

**٢٩٩٢-** عَنْ هَرِمِ بْنِ خَنْبَشٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ، تَعْدِلُ حَجَّةً»(٢).

واتە: هەریمی کوڕی خەنبەش ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرەیەک کە لە ڕەمەزاندا بکرێ (خێر و پاداشتەکەی) بەرانبەرە بە حەجێک.

**٢٩٩٣-** عَنْ أَبِي مَعْقِلٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ، تَعْدِلُ حَجَّةً»(٣).

واتە: ئەبو مەعقیل ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: عومرەیەک کە لە ڕەمەزاندا بکرێ (خێر و پاداشتەکەی) بەرانبەرە بە حەجێک.

**٢٩٩٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ، تَعْدِلُ حَجَّةً»(٤).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرەیەک کە لە ڕەمەزاندا بکرێ (خێر و پاداشتەکەی) بەرانبەرە بە حەجێک.

**٢٩٩٥-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ، تَعْدِلُ حَجَّةً»(٥).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. انظر أبو داود: ١٩٨٨، والترمذي: ٩٣٩.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٨٢، ومسلم: ١٢٥٦، والنسائي: ٢١١٠.

(٥) صحيح.





واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: عومرەیەک کە لە ڕەمەزاندا بکرێ (خێر و پاداشتەکەی) بەرانبەرە بە حەجێک.

## بابەت: عومرە لە مانگی (ذو القعدة)

**٢٩٩٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «لَمْ يَعْتَمِرْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِلَّا فِي ذِي الْقَعْدَةِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها لە مانگی «ذو القعدة» دا عومرەی کردوە.

**٢٩٩٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «لَمْ يَعْتَمِرْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عُمْرَةً، إِلَّا فِي ذِي الْقَعْدَةِ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها لە مانگی «ذو القعدة» دا عومرەی کردوە.

## بابەت: عومرە لە مانگی ڕەجەبدا

**٢٩٩٨-** عَنْ عُرْوَةَ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ فِي أَيِّ شَهْرٍ اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «فِي رَجَبٍ» فَقَالَتْ عَائِشَةُ: «مَا اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي رَجَبٍ قَطُّ، وَمَا اعْتَمَرَ إِلَّا وَهُوَ مَعَهُ» تَعْنِي ابْنَ عُمَرَ[٣].

واتە: عوڕوە ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە ئیبنو عومەر ﷺ کە ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە چ مانگێکدا عومرەی کردوە؟ گوتی: لە مانگی ڕەجەبدا، جا عائیشە ﷺ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کات لە ڕەجەبدا عومرەی نەکردوە، هیچ عومرەیەکیشی نەکردوە مەگەر ئیبنو عومەر ﷺ هەر لەگەڵی بووە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٩١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٧٦، ومسلم: ١٢٥٥، والترمذي: ٩٣٦.

## بابەت: ئیحرامی عومرە لە تەنعیم

٢٩٩٩- عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «أَمَرَهُ أَنْ يُرْدِفَ عَائِشَةَ، فَيُعْمِرَهَا مِنَ التَّنْعِيمِ»[١].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردوە لەگەڵ عائیشە (کە خوشکی عەبدوڕڕەحمان بووە) بچێت و بیبات بۆ تەنعیم (شوێنێکە لە دەرەوەی حەڕەمی مەککە) لەوێ ئیحرامی عومرە ببەستێ.

٣٠٠٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ نُوَافِي هِلَالَ ذِي الْحِجَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَرَادَ مِنْكُمْ، أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ، فَلْيُهْلِلْ، فَلَوْلَا أَنِّي أَهْدَيْتُ، لَأَهْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ» قَالَتْ: فَكَانَ مِنَ الْقَوْمِ مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَمِنْهُمْ مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ، فَكُنْتُ أَنَا مِمَّنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، قَالَتْ: فَخَرَجْنَا حَتَّى قَدِمْنَا مَكَّةَ، فَأَدْرَكَنِي يَوْمُ عَرَفَةَ، وَأَنَا حَائِضٌ، لَمْ أَحِلَّ مِنْ عُمْرَتِي، فَشَكَوْتُ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «دَعِي عُمْرَتَكِ، وَانْقُضِي رَأْسَكِ، وَامْتَشِطِي، وَأَهِلِّي بِالْحَجِّ» قَالَتْ: فَفَعَلْتُ، فَلَمَّا كَانَتْ لَيْلَةُ الْحَصْبَةِ، وَقَدْ قَضَى اللَّهُ حَجَّنَا، أَرْسَلَ مَعِي عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَرْدَفَنِي وَخَرَجَ إِلَى التَّنْعِيمِ، فَأَحْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ، فَقَضَى اللَّهُ حَجَّنَا وَعُمْرَتَنَا، وَلَمْ يَكُنْ فِي ذَلِكَ هَدْيٌ، وَلَا صَدَقَةٌ، وَلَا صَوْمٌ[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: لە نزیکی مانگی «ذو الحجة»دا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە حەجیماڵئاواییدا، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەس دەیەوێ ئیحرامی عومرە ببەستێ با بیبەستێ، خۆ ئەگەر من دیاری ماڵی خوام پێنەبایە، ئەوە ئیحرامم بە عومرە دەبەست، جا عائیشە ﷺ دەڵێ: جا هەندێک لە خەڵکەکە ئیحرامی عومرەیان بەست، وە هەندێکیشیان ئیحرامی حەجیان بەست، وە من یەکێک بووم لەوانەی ئیحرامی عومرەیان بەستبوو، دەڵێ: ڕۆیشتین تاکو گەیشتینە مەککە، ئیتر کەوتمە ناو ڕۆژی عەرەفەوەو تووشی سوڕی مانگانە بووم، ئیحرامی عومرەم نەشکاند، چوومە لای پێغەمبەر ﷺ و شتەکەم بۆی باسکرد، ئەویش فەرمووی: واز لە عومرەکەت بێنە و سەر و پرچت بکەوەو، شانەی بکە (مەبەستی خۆشوشتن

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٨٤، ومسلم: ١٢١٢، وأبو داود: ١٩٩٥، والترمذي: ٩٣٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٤ و ١٧٨٣، ومسلم: ١٢١١.

بوو)، وە ئیحرامی حەج ببەستە، گوتی: منیش وامکرد، جا کە شەوی حەصبە هات (حەصبە شوێنێکە شەو لێی دەمانەوە) وە خوا حەجەکەمانی تەواو کرد، پێغەمبەر ﷺ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکری لەگەڵ ناردم، لەگەڵم هات بۆ تەنعیم، ئنجا لەوێ ئیحرامی عومرەم بەست، خوا حەج و عومرەکەی کردە بەشمان، لەسەر ئەوە نە دیاری و، فیدیە و، صەدەقە هەبوو، نە ڕۆژووگرتن.

## بابەت: کەسێک ئیحرام ببەستێ لە بەیتولمەقدیس

٣٠٠١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ مِنْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، غُفِرَ لَهُ»[1].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە بەیتولمەقدیس ئیحرامی عومرە ببەستێ، لە گوناهەکانی دەبوردرێ.

٣٠٠٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ مِنْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، كَانَتْ لَهُ كَفَّارَةً، لِمَا قَبْلَهَا مِنَ الذُّنُوبِ» قَالَتْ: فَخَرَجَتْ أُمِّي مِنْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ بِعُمْرَةٍ[2].

واتە: ئوممو سەلەمەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە بەیتولمەقدیسەوە ئیحرامی عومرە ببەستێ، ئەوە بۆی دەبێتە هۆی داپۆشینی گوناهەکانی پێشووی، گوتی: جا دایکم چوو لە «بيت المقدس»ەوە ئیحرامی بەست.

## بابەت: پێغەمبەر ﷺ چەند عومرەی ئەنجامداوە

٣٠٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَرْبَعَ عُمَرٍ: عُمْرَةَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَعُمْرَةَ الْقَضَاءِ مِنْ قَابِلٍ، وَالثَّالِثَةَ مِنَ الْجِعْرَانَةِ، وَالرَّابِعَةَ الَّتِي مَعَ حَجَّتِهِ»[3].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٧١٤.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٧١٤

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٩٣، والترمذي: ٨١٦.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷻ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چوار عومرەی کردوە: یەکەمیان عومرەی حودەیبییە، دووەمیان عومرەی قەزا کە ساڵی داهاتوو بوو، سێیەمیان ئەو عومرەی کە لە جیعرانیە ئیحرامی بۆ بەست، چوارەمیان ئەو عومرەی کە لەگەڵ حەجەکەیدا کردی.

## بابەت: دەرچوون بۆ مینا (شوێنێکە، حاجی سێ ڕۆژو شەو دەمێننەوە)

٣٠٠٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷻ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «صَلَّى بِمِنًى يَوْمَ التَّرْوِيَةِ، الظُّهْرَ، وَالْعَصْرَ، وَالْمَغْرِبَ، وَالْعِشَاءَ، وَالْفَجْرَ، ثُمَّ غَدَا إِلَى عَرَفَةَ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷻ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی تەرویەدا لە مینا نوێژی کرد، نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و، شێوان و خەوتنان و بەیانی لەوێ کرد، پاشان بەیانی چوو بۆ عەرەفە.

٣٠٠٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷻ، أَنَّهُ كَانَ «يُصَلِّي الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ بِمِنًى، ثُمَّ يُخْبِرُهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عومەر ﷻ گێڕدراوەتەوە، کە هەر پێنج نوێژە فەرزەکەی لە مینا دەکرد، پاشان پێی ڕادەگەیاندن کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای دەکرد.

## بابەت: مانەوە و دابەزین لە مینا

٣٠٠٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷻ، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَا نَبْنِي لَكَ بِمِنًى بَيْتًا؟ قَالَ: «لَا مِنًى، مُنَاخُ مَنْ سَبَقَ»[٣].

واتە: عائیشە ﷻ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی لە مینا خانویەکت بۆ دروست نەکەین؟ فەرمووی: نەخێر، مینا شوێنی حەوانەوەی ئەو کەسەیە کە زووتر پێی بگات.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩١١، والترمذي: ٨٧٩ و ٨٨٠.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٠١٩، والترمذي: ٨٨١.

٣٠٠٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَا نَبْنِي لَكَ بِمِنًى بَيْتًا يُظِلُّكَ؟ قَالَ: «لَا مِنًى، مُنَاخُ مَنْ سَبَقَ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی لە مینا خانویەکت بۆ دروست نەکەین بۆ ئەوەی سێبەرت لێ بکات (گەرمات نەبێ)؟ فەرمووی: نەخێر، مینا شوێنی حەوانەوەی ئەو کەسەیە کە زووتر پێی بگات.

## بابەت: ڕۆیشتن لە میناوە بۆ عەرەفات

٣٠٠٨- عَنْ أَنَسٍ ﵁، قَالَ: «غَدَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي هَذَا الْيَوْمِ مِنْ مِنًى، إِلَى عَرَفَةَ، فَمِنَّا مَنْ يُكَبِّرُ، وَمِنَّا مَنْ يُهِلُّ، فَلَمْ يَعِبْ هَذَا عَلَى هَذَا، وَلَا هَذَا عَلَى هَذَا» وَرُبَّمَا قَالَ: هَؤُلَاءِ عَلَى هَؤُلَاءِ، وَلَا هَؤُلَاءِ عَلَى هَؤُلَاءِ[٢].

واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: لەو ڕۆژەدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەیانییەک لە میناوە بەڕێ کەوتین بۆ عەرەفات، جا هەندێکمان ئەڵڵاهو ئەکبەرمان دەکردو، هەندێکمان تەهلیلە «لا إله إلا الله»مان دەکردو، هیچ یەکێک لەوانە لۆمەی ئەویتری نەدەکرد لەسەر ئەوەی کە دەیگوت.

## بابەت: دابەزین لە عەرەفات

٣٠٠٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ «يَنْزِلُ بِعَرَفَةَ فِي وَادِي نَمِرَةَ» قَالَ: فَلَمَّا قَتَلَ الْحَجَّاجُ ابْنَ الزُّبَيْرِ، أَرْسَلَ إِلَى ابْنِ عُمَرَ: أَيَّ سَاعَةٍ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، يَرُوحُ فِي هَذَا الْيَوْمِ؟ قَالَ: إِذَا كَانَ ذَلِكَ رُحْنَا، فَأَرْسَلَ الْحَجَّاجُ رَجُلًا يَنْظُرُ أَيَّ سَاعَةٍ، يَرْتَحِلُ، فَلَمَّا أَرَادَ ابْنُ عُمَرَ أَنْ يَرْتَحِلَ قَالَ: «أَزَاغَتِ الشَّمْسُ؟» قَالُوا: لَمْ تَزِغْ بَعْدُ، «فَجَلَسَ» ثُمَّ قَالَ: «أَزَاغَتِ الشَّمْسُ؟» قَالُوا: لَمْ تَزِغْ بَعْدُ، «فَجَلَسَ»، ثُمَّ قَالَ: «أَزَاغَتِ الشَّمْسُ؟» قَالُوا: لَمْ تَزِغْ بَعْدُ، «فَجَلَسَ»، ثُمَّ قَالَ: «أَزَاغَتِ الشَّمْسُ؟» قَالُوا: نَعَمْ، فَلَمَّا قَالُوا: قَدْ زَاغَتْ، «ارْتَحَلَ» قَالَ وَكِيعٌ: يَعْنِي رَاحَ[٣].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٠١٩، والترمذي: ٨٨١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٧٠ و ١٦٥٩، ومسلم: ١٢٨٥، والنسائي: ٣٠٠٠ و ٣٠٠١.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٩١٤.




واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفات لە شیوی نەمیرە دادەبەزی، (ڕاوی) گوتی: جا کاتێک حەجاج ئیبنو زوبەیری کوشت کەسێکی نارد بۆ لای ئیبنو عومەر (لێی بپرسێ): چ کات و ساتێک پێغەمبەر ﷺ لەو ڕۆژەدا بەڕێ دەکەوت؟ گوتی: کاتێ کە ئەوە دەبوو بەڕێ دەکەوتین، جا حەجاج پیاوێکی نارد تەماشا بکات و چاوەڕێی ئەو کاتە بکات کە بەڕێ دەکەوێ، کاتێ ئیبنو عومەر ویستی بەڕێ بکەوێ، گوتی: ئایا خۆرهەڵاتووە؟ گوتیان: جارێ هەڵنەهاتووە، ئنجا دانیشتەوە، پاشان گوتی: خۆرهەڵاتووە؟ گوتیان: جارێ هەڵنەهاتووە، دانیشتەوە، پاشان گوتی: ئایا خۆرهەڵاتووە؟ گوتیان: بەڵێ، جا کە گوتیان: خۆرهەڵاتووە، بەڕێکەوت. وەکیع دەڵێ: واتە: ڕۆیشت.

## بابەت: وەستان لە عەرەفات

**٣٠١٠-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: وَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعَرَفَةَ، فَقَالَ: «هَذَا الْمَوْقِفُ، وَعَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ»[١].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر کێوی عەرەفات وەستاو، فەرمووی: ئەوە شوێنی ڕاوەستانە و عەرەفات هەمووی شوێنی ڕاوەستانە.

**٣٠١١-** عَنْ يَزِيدَ بْنِ شَيْبَانَ ﷺ، قَالَ: كُنَّا وُقُوفًا فِي مَكَانٍ تُبَاعِدُهُ مِنَ الْمَوْقِفِ، فَأَتَانَا ابْنُ مِرْبَعٍ فَقَالَ: إِنِّي رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَيْكُمْ يَقُولُ: «كُونُوا عَلَى مَشَاعِرِكُمْ، فَإِنَّكُمْ الْيَوْمَ عَلَى إِرْثٍ، مِنْ إِرْثِ إِبْرَاهِيمَ»[٢].

واتە: یەزیدی کوڕی شەیبان ﷺ دەڵێ: ئێمە لە شوێنێک ڕاوەستابووین کە شوێنەکەت پێ دوور بوو (لەو شوێنەی کە پێغەمبەر ﷺ لێی وەستابوو)، جا ئیبنو میربەع هاتە لامان و گوتی: من نێردراوی پێغەمبەری خوامﷺ بۆ لای ئێوە ناردوومی و دەفەرموێ: لەسەر پەرستشەکانتان بمێنن، چونکە بێگومان ئێوە ئەمڕۆ لەسەر میراتێکن کە میراتی ئیبراهیمە.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٩٣٥، والترمذي: ٨٨٥ مطولًا.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩١٩، والترمذي: ٨٨٣، والنسائي: ٣٠١٤.

**٣٠١٢-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ عَرَفَةَ مَوْقِفٌ، وَارْتَفِعُوا عَنْ بَطْنِ عُرَنَةَ، وَكُلُّ الْمُزْدَلِفَةِ مَوْقِفٌ، وَارْتَفِعُوا عَنْ بَطْنِ مُحَسِّرٍ، وَكُلُّ مِنًى مَنْحَرٌ، إِلَّا مَا وَرَاءَ الْعَقَبَةِ»[١].

**واتە:** جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو کێوی عەرەفە شوێنی وەستانە، بۆیە لە ناوەڕاستی عوڕەنە مەوەستن، وە هەموو موزدەلیفە شوێنی وەستانە، بۆیە لە ناوەڕاستی موحەسسیر مەوەستن، وە هەموو مینا شوێنی قوربانی سەربڕینە، تەنها ئەوە نەبێ کە دەکەوێتە دوای عەقەبە.

**عُرَنَة:** شیوێکە دەکەوێتە نێوانی میناو عەرەفات.

**مُحَسِّر:** شوێنێکە دەکەوێتە نێوان میناو موزدەلیفە.

## بابەت: دوعاکردن لە عەرەفە

**٣٠١٣-** عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ كِنَانَةَ بْنِ عَبَّاسِ بْنِ مِرْدَاسٍ السُّلَمِيُّ، أَنَّ أَبَاهُ، أَخْبَرَهُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «دَعَا لِأُمَّتِهِ عَشِيَّةَ عَرَفَةَ، بِالْمَغْفِرَةِ» فَأُجِيبَ: «إِنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ، مَا خَلَا الظَّالِمَ، فَإِنِّي آخُذُ لِلْمَظْلُومِ مِنْهُ» قَالَ: «أَيْ رَبِّ إِنْ شِئْتَ أَعْطَيْتَ الْمَظْلُومَ مِنَ الْجَنَّةِ، وَغَفَرْتَ لِلظَّالِمِ» فَلَمْ يُجَبْ عَشِيَّتَهُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ بِالْمُزْدَلِفَةِ، أَعَادَ الدُّعَاءَ، فَأُجِيبَ إِلَى مَا سَأَلَ، قَالَ: فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَوْ قَالَ تَبَسَّمَ، فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي إِنَّ هَذِهِ لَسَاعَةٌ مَا كُنْتَ تَضْحَكُ فِيهَا، فَمَا الَّذِي أَضْحَكَكَ؟ أَضْحَكَ اللَّهُ سِنَّكَ قَالَ: «إِنَّ عَدُوَّ اللَّهِ إِبْلِيسَ، لَمَّا عَلِمَ أَنَّ اللَّهَ ﷻ، قَدِ اسْتَجَابَ دُعَائِي، وَغَفَرَ لِأُمَّتِي أَخَذَ التُّرَابَ، فَجَعَلَ يَحْثُوهُ عَلَى رَأْسِهِ، وَيَدْعُو بِالْوَيْلِ وَالثُّبُورِ، فَأَضْحَكَنِي مَا رَأَيْتُ مِنْ جَزَعِهِ»[٢].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی کینانەی کوڕی عەبباسی کوڕی میرداسی سولەمیی دەگێڕێتەوە، کە باوکی لە باوکییەوە ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ئێوارەی ڕۆژی عەرەفەدا دوعای کرد بۆ ئوممەتەکەی کە خوا لە ئوممەتەکەی خۆش بێت، خوا دوعاکەی گیرا کردو، فەرمووی: کە بێگومان لێیان خۆش بووم، جگە لە کەسی

---

(١) ضعيف. «إلا مَا وَرَاءَ الْعَقَبَةِ»..

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٥٢٣٤.




ستەمكار، چونكە بێگومان مافی ستەملێكراو لە ستەمكار وەردەگرمەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی پەروەردگارا، ئەگەر بتەوێ بەهەشت دەدەیتە ستەملێكراوو لە ستەمكاریش خۆش دەبی، ئەو دوعایەی لەو ئێوارەیەدا گیرا نەكرد، جا بەیانییەكەی لە موزدەلیفە دوعایەكەی دووبارە كردەوەو ئەوەی داوایكرد وەڵامی دراوە و دوعاكەی گیرا بوو، (ڕاوی) دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێكەنی یان زەردەخەنی هاتێ، ئەبو بەكر و عومەر گوتیان: بە دایک و باوكەوە بە فیدات بین ئەو كاتە كاتێک نیە تۆ تێیدا پێبكەنی، ئەوە چی بوو كە تۆی خستە پێكەنین خوا دڵخۆشیت بەردەوام بكات؟ فەرمووی: دوژمنی خوا ئیبلیس كاتێ زانی كە خوای ﷻ نزاكەمی گیرا كردو داواكەمی وەرگرت، وە لە ئوممەتەكەم خۆش بوو، خۆڵی هەڵگرت و كردی بەسەری خۆیدا و هاواری سزا و لەناوچوونی لەخۆی دەكرد، جا بەو ناڕەحەتی و ئازار چەشتنەی ئەو پێكەنینم هات.

٣٠١٤- عَنِ ابْنِ الْمُسَيِّبِ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ، أَنْ يُعْتِقَ اللَّهُ ﷻ فِيهِ، عَبْدًا مِنَ النَّارِ، مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَإِنَّهُ لَيَدْنُو ﷻ، ثُمَّ يُبَاهِي بِهِمُ الْمَلَائِكَةَ، فَيَقُولُ: مَا أَرَادَ هَؤُلَاءِ»[١].

واتە: ئیبنو موسەییب دەڵێ: عائیشە ﵂ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ ڕۆژێک نیە كە بە ئەندازەی ڕۆژی عەرەفە خوای ﷻ بەندەكانی تێدا ئازاد بكات لە ئاگر، وە خوا ﷻ نزیک دەبێتەوە، پاشان دەیانكاتە جێگای شانازی لەلای فریشتەكان، دەفەرموێ: ئەوانە چییان دەوێ.

## بابەت: كەسێک شەوی موزدەلیفە پێشنوێژی بەیانی بچێتە عەرەفە

٣٠١٥- عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَطَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ يَعْمَرَ الدِّيلِيَّ ﵁، قَالَ: شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ وَاقِفٌ بِعَرَفَةَ، وَأَتَاهُ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ الْحَجُّ؟ قَالَ: «الْحَجُّ عَرَفَةُ، فَمَنْ جَاءَ قَبْلَ صَلَاةِ الْفَجْرِ، لَيْلَةَ جَمْعٍ، فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ، أَيَّامُ مِنًى ثَلَاثَةٌ، فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ، فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ، وَمَنْ تَأَخَّرَ، فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَرْدَفَ رَجُلًا خَلْفَهُ، فَجَعَلَ يُنَادِي بِهِنَّ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٤٨، والنسائي: ٣٠٠٣.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٤٩، والترمذي: ٨٨٩ و ٢٩٧٥، والنسائي: ٣٠٤٤.





واتە: بوکەیری کوڕی عەتاء دەڵێ: گوێم لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەعمەری دیلیی ﷺ بوو، دەیگوت: ئاگام لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە ڕاوەستابوو، وە کۆمەڵە خەڵکێک لە خەڵکی نەجد هاتنە خزمەتی و گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ حەج چۆن چۆنییە؟ فەرمووی: حەج بریتیە لە عەرەفە (واتە: ئەگەر فریای ڕۆژی عەرەفە نەکەوی حەجەکە دروست نیە)، جا هەر کەسێک شەوی موزدەلیفە پێش نوێژی بەیانی بێتە عەرەفە ئەوە حەجەکەی تەواوە، ڕۆژانی میناش سێ ڕۆژن، جا هەر کەسێک پەلە بکات لە دوو ڕۆژدا (بەردبارانی جەمرە) تەواوی بکات هیچ گوناهبار نابێ، ئەوەشی دوای بخات و بە سێ ڕۆژ تەواوی بکات هیچ گوناهبار نابێ، پاشان پیاوێکی لەگەڵ خۆی خست و بەو جۆرە ڕوونکردنەوەیە (لە ناو خەڵکدا) جاڕی دەدا.

**٣٠١٥م-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَنْبَأَنَا الثَّوْرِيُّ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ عَطَاءٍ اللَّيْثِيِّ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَعْمَرَ الدِّيلِيِّ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِعَرَفَةَ، فَجَاءَهُ نَفَرٌ مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى: مَا أَرَى لِلثَّوْرِيِّ حَدِيثًا أَشْرَفَ مِنْهُ[١].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودەیە گێڕدراوەتەوە.

**٣٠١٦-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ مُضَرِّسٍ الطَّائِيِّ ﷺ، أَنَّهُ حَجَّ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمْ يُدْرِكِ النَّاسَ، إِلَّا وَهُمْ بِجَمْعٍ، قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَنْضَيْتُ رَاحِلَتِي، وَأَتْعَبْتُ نَفْسِي، وَاللَّهِ إِنْ تَرَكْتُ مِنْ حَبْلٍ، إِلَّا وَقَفْتُ عَلَيْهِ، فَهَلْ لِي مِنْ حَجٍّ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ شَهِدَ مَعَنَا الصَّلَاةَ، وَأَفَاضَ مِنْ عَرَفَاتٍ لَيْلًا أَوْ نَهَارًا، فَقَدْ قَضَى تَفَثَهُ، وَتَمَّ حَجُّهُ»[٢].

واتە: عوروەی کوڕی موزەڕیسی تائیی ﷺ دەگێڕێتەوە، لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ حەجی کردوە، جا کاتێک چووە بۆ حەج بە خەڵکەکە نەگەیشتووە تا کاتێک لە موزدەلیفە پێیان گەیشتووە، دەڵێ: منیش هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من وڵاخەکەم بە هیلاک بردو، خۆشم زۆر ماندوو کرد، سوێند بە خوا هەر گرد و تەپۆلکەیەک کە پێی گەیشتبم هەر لەسەری وەستاوم، جا ئایا من

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٤٩، والترمذي: ٨٨٩ و ٢٩٧٥، والنسائي: ٣٠٤٤.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٥٠، والترمذي: ٨٩١، والنسائي: ٣٠٣٩_٣٠٤٣.

حەجەکەم بەردەکەوێ؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک فریای نوێژ بکەوێ لەگەڵ ئێمە (نوێژی بەیانی ڕۆژی عەرەفە)، وە بگاتە عەرەفات و بوەستێ، وە بە شەو، یان بە ڕۆژ بگەڕێتەوە، ئەوە بێگومان چڵک و نینۆک و پیسی لە خۆی دەکاتەوە و حەجەکەی تەواوە.

## بابەت: گەڕانەوە لە عەرەفە

**٣٠١٧-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّهُ سُئِلَ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسِيرُ حِينَ دَفَعَ مِنْ عَرَفَةَ؟ قَالَ: «كَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ، فَإِذَا وَجَدَ فَجْوَةً، نَصَّ» قَالَ وَكِيعٌ: يَعْنِي فَوْقَ الْعَنَقِ[١].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پرسیاری لێکراوە: پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەڕۆیشت کاتێک لە عەرەفە دەهات خوارێ و دەگەڕایەوە؟ گوتی: ڕۆشتنێکی مامناوەند بوو، جا ئەگەر ڕێگایەکی دەستکەوتبا بواری هەبووایە ئەوە بە خێرایی لێی دەخوڕی.

**٣٠١٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «قَالَتْ قُرَيْشٌ: نَحْنُ قَوَاطِنُ الْبَيْتِ، لَا نُجَاوِزُ الْحَرَمَ، فَقَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴿١٩٩﴾ ﴾ البقرة»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: قورەیش گوتیان: ئێمە دانیشتووی دەوری بەیتین (کەعبە) لە حەرەم و سنوری بەیت دەرناچین (واتە: ناچینە عەرەفە بۆ وەستان، چونکە پێشتر عادەتیان وابوو)، ئنجا خوای ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴿١٩٩﴾ ﴾ البقرة، واتە: لە پاشان بگەڕێنەوە لەو شوێنەی خەڵکی لێی دەگەڕێتەوە. (واتە: ئێوە ئەی قورەیش و دەوڵەمەندەکان خۆتان لەو خەڵکە جیامەکەنەوە، با هەمووتان یەکسان بن و خۆ بە گەورە مەزانن، گشت پێکەوە ئاداب و پایەکانی حەج جێبەجێ بکەن).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٦٦، ومسلم: ١٢٨٦، والنسائي: ٣٠٢٣ و ٣٠٥١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٦٥ و ٤٥٢٠، ومسلم: ١٢١٩، وأبو داود: ١٩١٠، والترمذي: ٨٨٤، والنسائي: ٣٠١٢.

## بابەت: دابەزین لە نێوان عەرەفە و موزدەلیفە بۆ پێویستی

٣٠١٩- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، قَالَ: أَفَضْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا بَلَغَ الشِّعْبَ، الَّذِي يَنْزِلُ عِنْدَهُ الْأُمَرَاءُ، نَزَلَ، فَبَالَ، فَتَوَضَّأَ، قُلْتُ: الصَّلَاةَ قَالَ: «الصَّلَاةُ أَمَامَكَ» فَلَمَّا انْتَهَى إِلَى جَمْعٍ، أَذَّنَ، وَأَقَامَ، ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ، ثُمَّ لَمْ يَحِلَّ أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ، حَتَّى قَامَ، فَصَلَّى الْعِشَاءَ»[1].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە عەرەفات گەڕاینەوە، جا کاتێک گەیشتینە ئەو شوێنەی (ڕێگایەی) کە خەڵکی لێی دادەبەزن، (پێغەمبەر ﷺ) دابەزی سەرئاوی کردو دەستنوێژی شۆرد، گوتم: نوێژەکەش، فەرمووی: لە پێش خۆتەوە نوێژەکە دەکەین (لە موزدەلیفە)، جا کاتێک گەیشتە موزدەلیفە بانگدرا و قامەتکرا و نوێژی شێوانی کرد، پاشان کەس لە خەڵکەکە بارەکەیان نەخست، هەتاکو هەڵسان و نوێژی خەوتنانیشیان کرد.

## بابەت: کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە موزدەلیفە

٣٠٢٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ الْخَطْمِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيَّ، يَقُولُ: «صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْمُزْدَلِفَةِ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدی خەتمیی ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوێی لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ بووە دەیگوت: لە حەجی ماڵئاواییدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە موزدەلیفە نوێژی شێوان و خەوتنانم بەیەکەوە کرد.

٣٠٢١- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «صَلَّى الْمَغْرِبَ بِالْمُزْدَلِفَةِ» فَلَمَّا أَنَخْنَا قَالَ: «الصَّلَاةُ، بِإِقَامَةٍ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٩، ومسلم بإثر: ١٢٨٥، وأبو داود: ١٩٢١، والنسائي: ٣٠٣١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٧٤ و ٤٤٧٤، ومسلم: ١٢٨٧، والنسائي: ٦٠٥ و ٣٠٢٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٧٣، ومسلم: ١٢٨٨، وأبو داود: ١٩٢٦_١٩٣٣، والترمذي: ٨٨٧ و ٨٨٨، والنسائي: ٦٠٦_٦٠٨ و ٣٠٢٨ و ٣٠٣٠ و ٣٠٣٨ وبعضهم يذكر فيه إقامتين، وهو المحفوظ.



واتە: سالیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی شێوانی لە موزدەلیفە کرد، جا کاتێک بار و بارگەمان خست، فەرمووی: قامەت بکەن بۆ نوێژ (بۆ نوێژی خەوتنان، واتە: تەنها قامەتی بۆ کردو بانگی دووبارە نەکردەوە).

## بابەت: مانەوە لە موزدەلیفە

٣٠٢٢- عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ ﷺ، قَالَ: حَجَجْنَا مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فَلَمَّا أَرَدْنَا أَنْ نُفِيضَ مِنَ الْمُزْدَلِفَةِ، قَالَ: إِنَّ الْمُشْرِكِينَ كَانُوا يَقُولُونَ: أَشْرِقْ ثَبِيرُ، كَيْمَا نُغِيرُ، وَكَانُوا لَا يُفِيضُونَ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَخَالَفَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «فَأَفَاضَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ»[1].

واتە: عەمری کوڕی مەیمون ﷺ دەڵێ: لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتابدا ڕۆیشتم بۆ حەج، جا کاتێ ویستمان لە موزدەلیفە بەڕێ بکەوین گوتی: هاوبەشدانەران کاتی خۆی دەیانگوت: با لە کێوی «ثَبیر»ەوە خۆرت لێ بدات بۆ ئەوەی خێرا دەرچین، وە هەتاکو خۆرهەڵنەهاتبایە بەڕێ نەدەکەوتن، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێچەوانەی ئەوانی کرد، بۆیە لە پێش خۆر هەڵاتن بەڕێ کەوت.

٣٠٢٣- قَالَ جَابِرٌ ﷺ: أَفَاضَ النَّبِيُّ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، وَعَلَيْهِ السَّكِينَةُ، وَأَمَرَهُمْ بِالسَّكِينَةِ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَرْمُوا بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ، وَأَوْضَعَ فِي وَادِي مُحَسِّرٍ، وَقَالَ: «لِتَأْخُذْ أُمَّتِي نُسُكَهَا، فَإِنِّي لَا أَدْرِي لَعَلِّي لَا أَلْقَاهُمْ بَعْدَ عَامِي هَذَا»[2].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا، بە هێمنی و لەسەرخۆیی گەڕایەوەو، فەرمانیشی کرد کە هێمن و لەسەرخۆ بین، وە فەرمانی کرد کە بە بەردی گچکە کە بتوانرێ بە پەنجەکان بهاوێژرێ ڕەجمی شەیتانی پێ بکەن، وە لە شیوی موحەسیر (لە نێوان مینا و موزدەلیفەدا) خێراتر ڕۆیشت و فەرمووی: با خەڵکی ڕێوڕەسمی حەج لە من وەربگرن، چونکە بێگومان نازانم، لەوانەیە لە دوای ئەم ساڵ بەیەکتر نەگەینەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٨٤ و ٣٨٣٨، وأبو داود: ١٩٣٨، والترمذي: ٨٩٦، والنسائي: ٣٠٤٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢١٨ بطوله و ١٢٩٩، وأبو داود: ١٩٠٥ و ١٩٤٤، والترمذي: ٨٨٦، والنسائي: ٣٠٥٤ و ٣٠٧٤_٣٠٧٦.

**٣٠٢٤-** عَنْ بِلَالِ بْنِ رَبَاحٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: غَدَاةَ جَمْعٍ «يَا بِلَالُ أَسْكِتِ النَّاسَ»، أَوْ «أَنْصِتِ النَّاسَ» ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ تَطَوَّلَ عَلَيْكُمْ فِي جَمْعِكُمْ هَذَا، فَوَهَبَ مُسِيئَكُمْ لِمُحْسِنِكُمْ، وَأَعْطَى مُحْسِنَكُمْ مَا سَأَلَ ادْفَعُوا بِاسْمِ اللَّهِ»[1].

**واته: بیلالی کوڕی ڕەباح ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە بەیانی ڕۆژی موزدەلیفەدا پێی فەرموو: ئەی بیلال خەڵکەکە بێدەنگ بکە، پاشان فەرمووی: خوا چاکە و فەزڵی لەگەڵتان کردوە لەو ڕۆژەدا کە بە هۆی دوعای چاکەکارەکانتان لە تاوانی ئەوانیتر خۆش دەبێ، وە ئەوەی چاکەکارەکانتان داوای بکەن پێیان دەبەخشێ، بە ناوی خواوە بەڕێ بکەون.**

## بابەت: پێشڕەوی کردن بۆ مینا بۆ ڕەجمی شەیتان

**٣٠٢٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَدِمْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أُغَيْلِمَةَ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، عَلَى حُمُرَاتٍ لَنَا مِنْ جَمْعٍ، فَجَعَلَ يَلْطَحُ، أَفْخَاذَنَا وَيَقُولُ: «أُبَيْنِيَّ لَا تَرْمُوا الْجَمْرَةَ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ» زَادَ سُفْيَانُ فِيهِ «وَلَا إِخَالُ أَحَدًا يَرْمِيهَا، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ»[2].

**واته: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: من یەکێک بووم لە مێردمنداڵەکانی نەوەی عەبدولموتەڵیب لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە موزدەلیفە کە بە سواری گوێدرێژەوە بووین، جا (پێغەمبەر ﷺ) بە هێواشی لە ڕانەکانمانی دەدا و دەیفەرموو: ڕۆڵەکانم شەیتان ڕەجم مەکەن تاوەکو خۆرهەڵدێت. سوفیان لە گێڕانەوەکەیدا ئەوەشی زیاد کردوە: وە پێم وانییە کەس ڕەجمی بکات تاوەکو خۆرهەڵنەیەت.**

**٣٠٢٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «كُنْتُ فِيمَنْ قَدِمَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي ضَعَفَةِ أَهْلِهِ»[3].

**واته: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: من یەکێک بووم لە کەس و کارە لاوازەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە موزدەلیفەوە ناردینی بۆ مینا.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٤٠ و ١٩٤١، والترمذي: ٨٩٣، والنسائي: ٣٠٦٤ و ٣٠٦٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٧٧، ومسلم: ١٢٩٣ و ١٢٩٤، وأبو داود: ١٩٣٩، والترمذي: ٨٩٢، والنسائي: ٣٠٣٢ و ٣٠٣٣ و ٣٠٤٨.

تێبینی: دوای تەواو بوون لە عەرەفەو مانەوە تاکو پێش مەغریب حاجیانی ماڵی خوا بەڕێ دەکەون بۆ موزدەلیفەو شەو لەوێ دەمێننەوە، دوای نوێژی بەیانی دەردەچن بۆ مینا، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی ئەو ئافرەت و منداڵانەی داوە کە لەبەر بێهێزی نەیانتوانیوە شەو لە موزدەلیفە بمێننەوە، بەڵکو هەر ئەم شەوە بەڕێ بکەون بۆ مینا.

**٣٠٢٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ، كَانَتِ امْرَأَةً ثَبْطَةً، فَاسْتَأْذَنَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنْ تَدْفَعَ مِنْ جَمْعٍ، قَبْلَ دَفْعَةِ النَّاسِ، «فَأَذِنَ لَهَا»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، کە سەودەی کچی زەمعە ژنێکی سست و هێواش و قورس بوو لە ڕۆیشتن، جا داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە مۆڵەتی بدات ئەو لە پێش بە ڕێکەوتنی خەڵک لە موزدەلیفەوە بڕوات بۆ مینا، ئنجا پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی پێدا.

## بابەت: ئەندازەی بەردی ڕەجمی شەیتان

**٣٠٢٨-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْأَحْوَصِ ﵁، عَنْ أُمِّهِ، قَالَتْ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يَوْمَ النَّحْرِ، عِنْدَ جَمْرَةِ الْعَقَبَةِ، وَهُوَ رَاكِبٌ عَلَى بَغْلَةٍ، فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِذَا رَمَيْتُمُ الْجَمْرَةَ، فَارْمُوا، بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ»[٢].

واتە: سولەیمانی کوڕی عەمڕی کوڕی ئەحوەص ﵁ لە دایکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە ڕۆژی قوربانیدا پێغەمبەرم ﷺ بینی لەلای جەمرەتولعەقەبە کە بە سواری وڵاخەکەی بوو، جا فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئەگەر شەیتانتان ڕەجم کرد، ئەوە بە بەردی گچکەو ورد ڕەجمی بکەن (بۆ ئەوەی ئازار بە یەکتر نەگەیەنن).

**٣٠٢٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: غَدَاةَ الْعَقَبَةِ وَهُوَ عَلَى نَاقَتِهِ «الْقُطْ لِي حَصًى» فَلَقَطْتُ لَهُ سَبْعَ حَصَيَاتٍ، هُنَّ حَصَى الْخَذْفِ، فَجَعَلَ يَنْفُضُهُنَّ فِي كَفِّهِ وَيَقُولُ «أَمْثَالَ هَؤُلَاءِ، فَارْمُوا» ثُمَّ قَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ، فَإِنَّهُ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمُ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٨٠ و ١٦٨١، ومسلم: ١٢٩٠، والنسائي: ٣٠٣٧ و ٣٠٤٩.

(٢) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٩٦٦ و ١٩٦٨.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٣٠٥٧ و ٣٠٥٩.




واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەیانی ڕۆژی عەقەبە لەسەر وشترەکەیەوە فەرمووی: هەندێک بەردوچکەم (بەردی گچکە) بۆ کۆبکەوە، منیش حەوت بەردوچکەم بۆ کۆکردەوە کە بەردی گچکە بوون وەکو دەنکە نۆک، جا دەستی کرد بە هاویشتنیان و دەیفەرموو: لەو جۆرە بەردانە بەکاربێنن بۆ ڕەجمی شەیتان، پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە زێدەڕۆیی نەکەن لە دیندا، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە بە هۆی زێدەڕۆییان لە دیندا لەناوچوون.

## بابەت: ئەوەی لە کوێوە شەیتان ڕەجم دەکرێ

**٣٠٣٠-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيد ﷺ، قَالَ: لَمَّا أَتَى عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، اسْتَبْطَنَ الْوَادِيَ، وَاسْتَقْبَلَ الْكَعْبَةَ، وَجَعَلَ الْجَمْرَةَ عَلَى حَاجِبِهِ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ رَمَى بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، ثُمَّ قَالَ: «مِنْ هَاهُنَا، وَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ رَمَى الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ»[1].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید ﷺ دەڵێ: کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ هات بۆ ڕەجمی شەیتان لە عەقەبە، لە ناو شیوەکەوە ڕووی کردە قیبلە و جەمرەی عەقەبە کەوتە لای ڕاستی، پاشان بە حەوت بەردووچکە ڕەجمی کرد و لەگەڵ هەر بەردێک ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، پاشان گوتی: سوێند بەو زاتەی کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە، جگە لەو، ئەو کەسەی کە سووڕەتی بەقەڕەی بۆ دابەزی (کە پێغەمبەرە ﷺ) ئا لێرەوە ڕەجمی شەیتانی کرد.

**٣٠٣١-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْأَحْوَصِ ﷺ، عَنْ أُمِّهِ، قَالَتْ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ «يَوْمَ النَّحْرِ عِنْدَ جَمْرَةِ الْعَقَبَةِ، اسْتَبْطَنَ الْوَادِيَ، فَرَمَى الْجَمْرَةَ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، ثُمَّ انْصَرَفَ»[2].

واتە: سولەیمانی کوڕی عەمری کوڕی ئەحوەص ﷺ لە دایکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە ڕۆژی قوربانیدا لەلای جەمرەی عەقەبە پێغەمبەرم ﷺ بینی لە ناو شیوەکەوە بوو حەوت بەردووچکەی هاویشت بۆ ڕەجمی شەیتان، لەگەڵ هەر بەردێک ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، پاشان تێپەڕی و ڕۆیشت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٤٧_١٧٥٠، ومسلم: ١٢٩٦، وأبو داود: ١٩٧٤، والترمذي: ٩٠١، والنسائي: ٣٠٧٠_٣٠٧٣.

(٢) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٩٦٦ و ١٩٦٨.

**٣٠٣١م-** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحِيمِ بْنُ سُلَيْمَانَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْأَحْوَصِ، عَنْ أُمِّ جُنْدَبٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ[١].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودەیە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: حاجی دوای ڕەجمی شەیتان لە شوێنەکە ڕاناوەستێ

**٣٠٣٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّهُ «رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، وَلَمْ يَقِفْ عِنْدَهَا، وَذَكَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، کە شەیتانی ڕەجم کرد (جەمرەی عەقەبە)و، لەوێ ڕانەوەستاو باسی ئەوەی کرد کە پێغەمبەریش ﷺ ئاوای کردوە.

**٣٠٣٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ مَضَى، وَلَمْ يَقِفْ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە جەمرەی عەقەبە ڕەجمی شەیتانی دەکرد تێدەپەڕی و ڕانەدەوەستا.

## بابەت: ڕەجم کردن بە سواری

**٣٠٣٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «رَمَى الْجَمْرَةَ، عَلَى رَاحِلَتِهِ»[٤].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە سواری وڵاخەکەیەوە ڕەجمی شەیتانی کردوە.

**٣٠٣٥-** عَنْ قُدَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْعَامِرِيِّ ﵁، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «رَمَى الْجَمْرَةَ يَوْمَ النَّحْرِ، عَلَى نَاقَةٍ لَهُ صَهْبَاءَ، لَا ضَرْبَ وَلَا طَرْدَ، وَلَا إِلَيْكَ إِلَيْكَ»[٥].

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٩٦٦ و ١٩٦٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٥١ و ١٧٥٢ و ١٧٥٣ تعليقاً، والنسائي: ٣٠٨٣.

(٣) حسن لغيره.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ٨٩٩.

(٥) صحيح. أخرجه الترمذي: ٩٠٣، والنسائي: ٣٠٦١.

واتە: قودامەی کوڕی عەبدوڵڵای عامیریی ﷺ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی قورباندا ڕەجمی شەیتانی کرد بەسەر وشترەکەیەوە کە سور و سپی تێکەڵ بوو، بەبێ لێدان و پاڵدان و دەرکردن و بێ ئەوەی بە کەس بڵێ ڕێگام بۆ چۆڵ بکە.

## بابەت: دواخستنی ڕەجمی شەیتان بە بیانوی گونجاو

**٣٠٣٦-** عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «رَخَّصَ لِلرِّعَاءِ، أَنْ يَرْمُوا يَوْمًا، وَيَدَعُوا يَوْمًا»[١].

واتە: ئەبو بەدداحی کوڕی عاصیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی داوە بەوانەی کە وشترەوانن (شوانی وشترن) ڕۆژێک نا ڕۆژێک ڕەجمی شەیتان بکەن.

**٣٠٣٧-** عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: «رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِرِعَاءِ الْإِبِلِ فِي الْبَيْتُوتَةِ، أَنْ يَرْمُوا يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ يَجْمَعُوا رَمْيَ يَوْمَيْنِ بَعْدَ النَّحْرِ، فَيَرْمُونَهُ فِي أَحَدِهِمَا - قَالَ مَالِكٌ: ظَنَنْتُ أَنَّهُ قَالَ: فِي الْأَوَّلِ مِنْهُمَا - ثُمَّ يَرْمُونَ يَوْمَ النَّفْرِ»[٢].

واتە: ئەبو بەدداحی کوڕی عاصیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی بە شوانی وشترەکاندا کە لە موزدەلیفە دەمانەوە کەوا ڕۆژی یەکەمی قوربان ڕەجمی شەیتان بکەن، پاشان ڕەجمی دوو ڕۆژەکە کۆبکەنەوە بۆ دوای یەکەم ڕۆژ و لە یەکێک لە دوو ڕۆژەکەدا جێبەجێی بکەن. مالیک دەڵێ: پێم وابێ فەرموویەتی: ڕۆژی یەکەمی دوو ڕۆژەکان، پاشان ڕۆژی گەڕانەوەو دەرچوونیش ڕەجمی شەیتان بکەن.

## بابەت: ڕەجم کردن لە جیاتی منداڵان

**٣٠٣٨-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «حَجَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَمَعَنَا النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ، فَلَبَّيْنَا عَنِ الصِّبْيَانِ، وَرَمَيْنَا عَنْهُمْ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٧٦، والترمذي: ٩٥٤، والنسائي: ٣٠٦٨.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٩٧٥، والترمذي: ٩٥٥، والنسائي: ٣٠٦٩.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٩٢٧.

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ حەجمان کرد، ژن و منداڵیشمان لەگەڵدا بوو، جا لەجیاتی منداڵەکان «لبيك اللهم لبيك»مان دەکردو، ڕەجمی شەیتانیشمان لە جیاتی ئەوان دەکرد.

## بابەت: حاجی چ کاتێک کۆتایی بە تەلبییە دێنێ

٣٠٣٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «لَبَّى حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ هەتاکو ڕەجمی جەمرەی عەقەبەی کردوە، «لبيك اللهم لبيك» (تەلبیە)ـی کردوە.

٣٠٤٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ: «كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ ﷺ، فَمَا زِلْتُ أَسْمَعُهُ يُلَبِّي، حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، فَلَمَّا رَمَاهَا، قَطَعَ التَّلْبِيَةَ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: فەزڵی کوڕی عەبباس گوتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم لەسەر پشتی وڵاخەکەی، جا بەردەوام گوێم لێ بوو تەلبیەی دەکرد، هەتا ڕەجمی جەمرەی عەقەبەی کرد، جا کاتێک ئەوی ڕەجم کرد کۆتایی بە گوتنی تەلبیە هێنا.

## بابەت: ئەو شتانەی بۆ پیاو حەڵاڵ دەبێ، کاتێک ڕەجمی جەمرەی عەقەبەی کردوە

٣٠٤١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «إِذَا رَمَيْتُمُ الْجَمْرَةَ، فَقَدْ حَلَّ لَكُمْ كُلُّ شَيْءٍ، إِلَّا النِّسَاءَ» فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ وَالطِّيبُ؟ فَقَالَ: «أَمَّا أَنَا، فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُضَمِّخُ رَأْسَهُ بِالْمِسْكِ، أَفَطِيبٌ ذَلِكَ، أَمْ لَا»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٣٠٥٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٤٣ و ١٥٤٤، ومسلم: ١٢٨١ و ١٢٨٢، وأبو داود: ١٨١٥، والترمذي: ٩١٨، والنسائي: ٣٠٢٠ و ٣٠٥٥ و ٣٠٧٩_٣٠٨٢.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه النسائي: ٣٠٨٤.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: هەر کاتێک ڕەجمی جەمرەی عەقەبەتان کرد، ئەوە هەموو شتێکتان بۆ حەڵاڵ دەبێتەوە، جگە لە خێزانەکانتان، جا پیاوێک پێی گوت: ئەی ئیبنو عەبباس بۆنی خۆشیش؟ ئەویش گوتی: بێگومان من بینیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ میسکی لە سەری خۆی هەڵدەسو، جا ئەوە خۆ بۆنخۆشکردنە، یان نا؟!

**٣٠٤٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، لِإِحْرَامِهِ حِينَ أَحْرَمَ، وَلِإِحْلَالِهِ حِينَ أَحَلَّ»[1].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بۆن خۆش دەکرد و بۆنی خۆشم لێدەدا بۆ ئیحرام بەستنەکەی پێش ئیحرام بەستن، وە بۆ ئیحرام شکاندنەکەی دوای ئیحرام شکاندن.

## بابەت: سەر تاشین

**٣٠٤٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالْمُقَصِّرِينَ؟ قَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ» ثَلَاثًا قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالْمُقَصِّرِينَ، قَالَ: «وَالْمُقَصِّرِينَ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خودایە لەوانە خۆش بە کە سەریان دەتاشن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەشی کە کورتی دەکەنەوە، فەرمووی: خودایە لەوانە خۆش بە کە سەریان دەتاشن، سێ جار ئاوای فەرموو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەشی کە کورتی دەکەنەوە، فەرمووی: ئەوانەشی کە کورتی دەکەنەوە.

**٣٠٤٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «رَحِمَ اللَّهُ الْمُحَلِّقِينَ» قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «رَحِمَ اللَّهُ الْمُحَلِّقِينَ» قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «رَحِمَ اللَّهُ الْمُحَلِّقِينَ» قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «وَالْمُقَصِّرِينَ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٣٩، ومسلم: ١١٨٩ و ١١٩١، وأبو داود: ١٧٤٥، والترمذي: ٩١٧، والنسائي: ٢٦٨٤_٢٦٩٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٢٨، ومسلم: ١٣٠٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٢٦ و ١٧٢٧، ومسلم: ١٣٠١ و ١٣٠٤، وأبو داود: ١٩٧٩ و ١٩٨٠.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سۆز و بەزەیی خوا بۆ ئەوانەی کە سەریان تاشیوە، گوتیان: ئەوانەی کورتیشیان کردۆتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ڕەحمەت و میهرەبانی خوا لەوانەی سەریان تاشیوە، گوتیان: ئەوانەشی کە کورتیان کردۆتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ڕەحمەت و بەزەیی خوا لەوانەی تاشیویانە، گوتیان: ئەوانەشی کە کورتیان کردۆتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەوانەشی کورتیان کردۆتەوە.

**٣٠٤٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لِمَ ظَاهَرْتَ لِلْمُحَلِّقِينَ ثَلَاثًا، وَلِلْمُقَصِّرِينَ وَاحِدَةً؟ قَالَ: «إِنَّهُمْ لَمْ يَشُكُّوا»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی بۆ ئەوانەی سەریان تاشیوە سێ جار دوعات کرد و بۆ ئەوانەشی کورتیان کردۆتەوە یەک جار؟ فەرمووی: ئاخر ئەوان (ئەوانەی سەریان تاشیوە) بە بێ ئەوەی شک و گومان بکەن شوێن باشترینەکە کەوتوون (چونکە لە ئایەتەکەشدا سەرتاشین پێش خراوە).

## بابەت: پێچانی پرچی سەر

**٣٠٤٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ حَفْصَةَ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا شَأْنُ النَّاسِ حَلُّوا، وَلَمْ تَحِلَّ أَنْتَ مِنْ عُمْرَتِكَ؟ قَالَ: «إِنِّي لَبَّدْتُ رَأْسِي، وَقَلَّدْتُ هَدْيِي، فَلَا أَحِلُّ، حَتَّى أَنْحَرَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، کە حەفصەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵک چییانە کە ئیحرامیان شکاندووە لە کاتێکدا تۆ ئیحرامی عومرەت نەشکاندووە؟ فەرمووی: لە ڕاستیدا من پرچی سەرم پێچاوەو دیاری ماڵی خوام ڕێشمە کردوەو لەگەڵ خۆم هێناوە، بۆیە ئیحرام ناشکێنم هەتا قوربانیەکەم نەکەم.

**٣٠٤٧-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «يُهِلُّ مُلَبِّدًا»[٣].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٦٦، ومسلم: ١٢٢٩، وأبو داود: ١٨٠٦، والنسائي: ٢٦٨٢ و ٢٧٨١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٤٠ و ٥٩١٥ مطولًا، ومسلم: ١١٨٤ مطولًا، وأبو داود: ١٧٤٧، والنسائي: ٢٦٨٣.



واتە: سالیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو تەلبیەی «لبيك اللهم لبيك»ـی دەکرد و پرچی سەریشی پێچابوو.

**ملبدا:** واتە: پێچانی مووی سەر، جا یان بە کەتیرە، یان هەنگوینی تێدەدەن بۆ ئەوەی مووەکانی بەیەکەوە بنوسێن و هەڵنەوەرن و تەپ و تۆز نەچێتە ناوی.

## بابەت: سەربڕینی ئاژەڵی قوربانی

**٣٠٤٨-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِنًى كُلُّهَا مَنْحَرٌ، وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ، طَرِيقٌ وَمَنْحَرٌ، وَكُلُّ عَرَفَةَ مَوْقِفٌ، وَكُلُّ الْمُزْدَلِفَةِ مَوْقِفٌ»[1].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو شوێنێکی مینا جێگای کوشتنەوەی قوربانییە و هەموو دەرچەکانی مەککە ڕێگا و شوێنی قوربانی سەربڕینن، وە هەموو شوێنەکانی عەرەفە جێگای ڕاوەستانە و هەموو موزدەلیفەش شوێنی ڕاوەستان و مانەوەیە.

## بابەت: پێشخستنی واجبێک بەسەر واجبێکدا لە ڕێ و ڕەسمی حەجدا

**٣٠٤٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: مَا سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَمَّنْ قَدَّمَ شَيْئًا، قَبْلَ شَيْءٍ، إِلَّا يُلْقِي بِيَدَيْهِ كِلْتَيْهِمَا «لَا حَرَجَ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: هەر پرسیارێک لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرابێ دەربارەی پێشخستنی شتێک بەسەر شتێکدا، ئەوە بێگومان بە دەستەکانی ئاماژەی دەکرد کە هیچ تاوانی لەسەر نیە.

**٣٠٥٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسْأَلُ يَوْمَ مِنًى فَيَقُولُ: «لَا حَرَجَ، لَا حَرَجَ» فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ، قَالَ: «لَا حَرَجَ» قَالَ: رَمَيْتُ بَعْدَ مَا أَمْسَيْتُ قَالَ: «لَا حَرَجَ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢١٨/١٤٩، وأبو داود: ١٩٠٧ و ١٩٣٦، والنسائي: مختصراً ٣٠١٥ و ٣٠٤٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٤، ومسلم: ١٣٠٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٢٣ و ١٧٣٥، ومسلم: ١٣٠٧، وأبو داود: ١٩٨٣، والنسائي: ٣٠٦٧.





واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرا لە پاش و پێشخستنی کار وبارەکانی ڕۆژی جەژن لە مینادا، دەیفەرموو: قەیناکات هیچی لەسەر نیە، جا پیاوێک هاتە خزمەتی و گوتی: سەرم تاشیوە پێش ئەوەی قوربانییەکەم سەربڕم، فەرمووی: قەیناکات، گوتی: دوای ئەوەی کە ئێوارەم بەسەردا هات ڕەجمی شەیتانم کرد، فەرمووی: قەیناکات.

٣٠٥١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَمَّنْ ذَبَحَ، قَبْلَ أَنْ يَحْلِقَ، أَوْ حَلَقَ، قَبْلَ أَنْ يَذْبَحَ قَالَ: «لَا حَرَجَ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەگێڕێتەوە، پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی کەسێک کە پێش ئەوەی سەری بتاشێ قوربانییەکەی سەربڕیبێ، یان سەری تاشیبێ، جا قوربانییەکەی سەربڕیبێ، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: کێشەی نیە و قەیناکات.

٣٠٥٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ قَعَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِنًى يَوْمَ النَّحْرِ لِلنَّاسِ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ؟ قَالَ: «لَا حَرَجَ» ثُمَّ جَاءَهُ آخَرُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي نَحَرْتُ، قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ قَالَ: «لَا حَرَجَ» فَمَا سُئِلَ يَوْمَئِذٍ عَنْ شَيْءٍ، قُدِّمَ قَبْلَ شَيْءٍ، إِلَّا قَالَ: «لَا حَرَجَ»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ڕۆژی جەژنی قوربان پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر خاتری خەڵکەکە لە مینا دانیشت، جا پیاوێک هاتە خزمەتی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانییەکەم سەرببڕم، فەرمووی: کێشەی نیە قەیناکات، پاشان یەکێکی تر هاتە خزمەتی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ڕەجمی شەیتان قوربانییەکەم سەربڕی، فەرمووی: قەیناکات، جا هەر پرسیارێکی لێکرا لەو ڕۆژەدا کە شتێک پێش شتێک کرابێ، هەر دەیفەرموو: قەیناکات.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٣، ومسلم: ١٣٠٦، وأبو داود: ٢٠١٤، والترمذي: ٩١٦.

(٢) حسن صحيح.




## بابەت: شەیتان ڕەجم كردن لە ڕۆژەكانی جەژندا

**٣٠٥٣-** عَنْ جَابِرٍ ﵁، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ ضُحًى، وَأَمَّا بَعْدَ ذَلِكَ، فَبَعْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ»(١).

**واتە: جابیر ﵁ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ جەمرەی عەقەبەی لە چێشتەنگاودا ڕەجم كرد، دوای ئەوە لە دوای نیوەڕۆ ڕەجمی كرد.**

**٣٠٥٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ «يَرْمِي الْجِمَارَ، إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، قَدْرَ مَا إِذَا فَرَغَ مِنْ رَمْيِهِ، صَلَّى الظُّهْرَ»(٢).

**واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای ئەوەی كە خۆر لایدەدا ڕەجمی شەیتانی دەكرد، بە ئەندازەی ئەوەی كە لە ڕەجمەكە تەواو دەبوو، نوێژی نیوەڕۆی دەكرد.**

## بابەت: وتاری ڕۆژی جەژنی قوربان

**٣٠٥٥-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَلَا أَيُّ يَوْمٍ أَحْرَمُ؟» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالُوا: يَوْمُ الْحَجِّ الْأَكْبَرِ، قَالَ: «فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ، وَأَمْوَالَكُمْ، وَأَعْرَاضَكُمْ بَيْنَكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلَا لَا يَجْنِي جَانٍ إِلَّا عَلَى نَفْسِهِ، وَلَا يَجْنِي وَالِدٌ عَلَى وَلَدِهِ، وَلَا مَوْلُودٌ عَلَى وَالِدِهِ، أَلَا إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ أَيِسَ أَنْ يُعْبَدَ فِي بَلَدِكُمْ هَذَا أَبَدًا، وَلَكِنْ سَيَكُونُ لَهُ طَاعَةٌ فِي بَعْضِ مَا تَحْتَقِرُونَ مِنْ أَعْمَالِكُمْ، فَيَرْضَى بِهَا، أَلَا وَكُلُّ دَمٍ مِنْ دِمَاءِ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، وَأَوَّلُ مَا أَضَعُ مِنْهَا دَمُ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ - كَانَ مُسْتَرْضِعًا فِي بَنِي لَيْثٍ، فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ - أَلَا وَإِنَّ كُلَّ رِبًا مِنْ رِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، لَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ، لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ، أَلَا يَا أُمَّتَاهُ هَلْ بَلَّغْتُ؟» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «اللَّهُمَّ اشْهَدْ» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٩٩، وأبو داود: ١٩٧١، والترمذي: ٨٩٤، والنسائي: ٣٠٦٣.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٨٩٨.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٣٤، والترمذي: ٢١٥٩ و ٣٠٨٧.

واتە: سولەیمانی کوڕی عەمری کوڕی ئەحوەص لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە حەجیماڵئاواییدا گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو، دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە کامە ڕۆژە بەڕێزترینە و تاوان کردن تێیدا گەورەو توندە؟ سێ جار ئەوەی فەرموو، گوتیان: ڕۆژی حەجی گەورە (ڕۆژی جەژنی قوربان)، فەرمووی: بێگومان خوێن و ماڵ و ناموستان لە یەکتر قەدەغەیە وەکو شکاندنی ڕێزی ئەو ڕۆژەتان لەو مانگەتان (کە -ذي الحجة- یە) لە شارەکەتان (مەککە)، ئاگاداربن کەسێک تاوان دەکات تەنها خۆی دەگرێتەوە و ناتەنێتەوە بۆ کەس و کاری، تاوانی باوک بۆ سەر منداڵەکەی ناگوازرێتەوەو تاوانی منداڵیش بۆ سەر باوکی ناگوازرێتەوە، ئاگاداربن بەڕاستی شەیتان بێ هیوا بووە کە هەرگیز لەو شارەتان ناپەرسترێ، بەڵام لە هەندێک شت کە ئێوە بە کەمی دەزانن گوێڕایەڵی دەکەن و، شەیتانیش پێی ڕازییە، ئاگاداربن هەموو خوێنێکی سەردەمی نەفامی پوچ و بەتاڵە، وە یەکەم خوێنێک کە بەتاڵی دەکەمەوە خوێنی حاریسی کوڕی عەبدولموتەڵیبە کە لەلای هۆزی «بنو لیث» شیرەخۆرە بو و هۆزی «هذيل» کوشتیان، وە ئاگاداربن هەموو سو و ڕیبایەکی سەردەمی نەفامی بەتاڵ و پوچە و دەسمایەکەتان هەیە و هیچی تر، نە ستەم بکەن و نە ستەمتان لێ بکرێ، ئاگاداربن ئەی خەڵکینە ئایا پێم ڕاگەیاندن؟ سێ جار ئەوەی فەرموو، گوتیان: بەڵێ، سێ جار فەرمووی: خودایە شاهید بە.

**٣٠٥٦-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْخَيْفِ مِنْ مِنًى، فَقَالَ: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مَقَالَتِي، فَبَلَّغَهَا، فَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ، غَيْرُ فَقِيهٍ، وَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ إِلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ، ثَلَاثٌ لَا يُغِلُّ عَلَيْهِنَّ قَلْبُ مُؤْمِنٍ: إِخْلَاصُ الْعَمَلِ لِلَّهِ، وَالنَّصِيحَةُ لِوُلَاةِ الْمُسْلِمِينَ، وَلُزُومُ جَمَاعَتِهِمْ، فَإِنَّ دَعْوَتَهُمْ، تُحِيطُ مِنْ وَرَائِهِمْ»(١).

واتە: موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مینا لە خەیف هەستا (وتاریدا) و فەرمووی: خوا ڕووی ئەو کەسە سپی و درەوشاوە بکات کە فەرموودەیەک لە من دەبیستێ و دەیگەیەنێ بەوانیتر، چونکە هەندێ کەس کە زانستەکەیان پێیە تێیناگەن، وە هەندێک کەس کە زانستەکەیان پێیە دەیگەیەنن بەوانەی کە لە ئەوان باشتر تێیدەگەن، سێ شت

---

(١) صحيح لغيره.

**هەیە کە دڵی بڕوادار ناپاکی تێدا ناکات: بە دڵسۆزی و نیەت پاکی کارکردن لە پێناو خوادا، وە ئامۆژگاری و دڵسۆزی بۆ پێشەوای مسوڵمانان، وە پابەندبوون بە کۆمەڵی مسوڵمانانەوە، چونکە بانگەواز بە پشتیوانی ئەوانەوە دەکرێ.**

**٣٠٥٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ عَلَى نَاقَتِهِ الْمُخَضْرَمَةِ بِعَرَفَاتٍ فَقَالَ: «أَتَدْرُونَ أَيُّ يَوْمٍ هَذَا، وَأَيُّ شَهْرٍ هَذَا، وَأَيُّ بَلَدٍ هَذَا؟» قَالُوا: هَذَا بَلَدٌ حَرَامٌ، وَشَهْرٌ حَرَامٌ، وَيَوْمٌ حَرَامٌ قَالَ: «أَلَا وَإِنَّ أَمْوَالَكُمْ، وَدِمَاءَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، فِي يَوْمِكُمْ هَذَا، أَلَا وَإِنِّي فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ، وَأُكَاثِرُ بِكُمُ الْأُمَمَ، فَلَا تُسَوِّدُوا وَجْهِي، أَلَا وَإِنِّي مُسْتَنْقِذٌ أُنَاسًا، وَمُسْتَنْقَذٌ مِنِّي أُنَاسٌ، فَأَقُولُ: يَا رَبِّ أُصَيْحَابِي؟ فَيَقُولُ: إِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ»[(١)].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفات لەسەر وشترەکەی بوو کە وشترەکەی لاگوێی بڕدرابوو، فەرمووی: ئایا دەزانن ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە و، ئەو مانگە چ مانگێکە و، ئەو شارە چ شارێکە؟ گوتیان: ئەو شارەیە کە شەڕی تێدا حەڕامە، مانگێکە کە شەڕی تێدا حەڕامە، ڕۆژێکە کە خاوەنی ڕێز و شکۆیە و شکاندنی ئەو ڕێزەی حەڕامە، فەرمووی: ئاگاداربن ماڵ و سامانتان و خوێنتان لەسەر یەکتر حەڕامە، وەکو حەڕامی ئەو مانگە لە شارەکەتاندا و لەو ڕۆژەتاندا، ئاگاداربن بێگومان لەسەر حەوزی کەوسەر ئامادەکاریتان بۆ دەکەم و شانازی بە زۆریتانەوە دەکەم لەناو ئوممەتەکانی دیکەدا، جا کاری خراپ مەکەن و کارێک مەکەن نەتوانم شانازیتان پێوە بکەم، ئاگاداربن بێگومان من بەدواتاندا دەگەڕێم و تکاتان بۆ دەکەم هەندێ خەڵکی ڕزگار دەکەم و هەندێکیشی لێم دوور دەکەوێتەوە و سزا دەدرێ، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگارا ئەوانە هاوەڵە ئازیزەکانمن، خواش دەفەرموێ: بێگومان تۆ نازانی و ئاگادار نەبووی ئەوانە چ داهێنانێکی ناڕەوایان داهێناوە لە دیندا لە دوای تۆ.**

---

(١) صحیح.





**٣٠٥٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭬ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَقَفَ يَوْمَ النَّحْرِ بَيْنَ الْجَمَرَاتِ فِي الْحَجَّةِ الَّتِي حَجَّ فِيهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟» قَالُوا: يَوْمُ النَّحْرِ، قَالَ: «فَأَيُّ بَلَدٍ هَذَا؟» قَالُوا: هَذَا بَلَدُ اللَّهِ الْحَرَامُ، قَالَ: «فَأَيُّ شَهْرٍ هَذَا؟»، قَالُوا: شَهْرُ اللَّهِ الْحَرَامُ، قَالَ: «هَذَا يَوْمُ الْحَجِّ الْأَكْبَرِ، وَدِمَاؤُكُمْ، وَأَمْوَالُكُمْ، وَأَعْرَاضُكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ هَذَا الْبَلَدِ فِـي هَذَا الشَّهْرِ فِـي هَذَا الْيَوْمِ» ثُمَّ قَالَ: «هَلْ بَلَّغْتُ؟» قَالُوا: نَعَمْ، فَطَفِقَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ اشْهَدْ» ثُمَّ وَدَّعَ النَّاسَ، فَقَالُوا: هَذِهِ حَجَّةُ الْوَدَاعِ[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قوربان لەنێوان ئەو بەردانەی کە حاجییەکان بەردیان تێدەگرن ڕاوەستابوو، لەو حەجەیدا کە پێغەمبەر ﷺ حەجی کرد، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ گوتیان: ڕۆژی جەژنی قوربانە، فەرمووی: ئەو شارە چ شارێکە؟ گوتیان: شار و زەمینی خوایە کە شەڕ تێیدا حەڕامە، فەرمووی: ئەوڕۆ ڕۆژی حەجی گەورەیە، وە خوێن و سامان و ناموستان لە یەکتر حەڕامە، وەکو حەڕامی ئەو شارە لەو مانگەدا و لەو ڕۆژەدا، پاشان فەرمووی: ئایا ڕامگەیاند؟ گوتیان: بەڵێ، ئنجا پێغەمبەر ﷺ دەستی پێکرد و فەمووی: خودایە شاهێد بە، پاشان خواحافیزی و ماڵئاوایی لە خەڵکەکە کرد، بۆیە گوتیان: ئا ئەوە حەجی ماڵئاواییە.

## بابەت: سەردانی ماڵی خوا

**٣٠٥٩-** عَنْ عَائِشَةَ، وَابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «أَخَّرَ طَوَافَ الزِّيَارَةِ إِلَى اللَّيْلِ»[2].

واتە: عائیشەو ئیبنو عەبباس ﭭ دەگێڕنەوە، پێغەمبەر ﷺ تەوافی سەردانی دواخست بۆ شەو.

**٣٠٦٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «لَمْ يَرْمُلْ فِي السَّبْعِ، الَّذِي أَفَاضَ فِيهِ» قَالَ عَطَاءٌ: وَلَا رَمَلَ فِيهِ[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٤٢ معلقاً، وأبو داود: ١٩٤٥.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٠٠٠، والترمذي: ٩٢٠.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٠١.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە حەوت سوڕانەوەکەی تەوافی ئیفازەبە خێرایی نەڕۆیشت (بەڵکو ڕۆیشتنی ئاسایی بوو)، عەتاء گوتی: ڕۆیشتنی خێرای تێدانیە.

## بابەت: خواردنەوەی ئاوی زەمزەم

٣٠٦١- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ جَالِسًا، فَجَاءَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ جِئْتَ؟ قَالَ: مِنْ زَمْزَمَ، قَالَ: فَشَرِبْتَ مِنْهَا، كَمَا يَنْبَغِي؟ قَالَ: وَكَيْفَ؟ قَالَ: إِذَا شَرِبْتَ مِنْهَا، فَاسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ، وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ، وَتَنَفَّسْ ثَلَاثًا، وَتَضَلَّعْ مِنْهَا، فَإِذَا فَرَغْتَ، فَاحْمَدِ اللَّهَ ﷻ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ آيَةَ مَا بَيْنَنَا، وَبَيْنَ الْمُنَافِقِينَ، إِنَّهُمْ لَا يَتَضَلَّعُونَ، مِنْ زَمْزَمَ»[(١)].

واتە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: لەلای ئیبنو عەبباس دانیشتبووم، لەوکاتەدا پیاوێک هاتە لای، جا (ئیبنو عەبباس) گوتی: لە کوێوە هاتی؟ گوتی: لەسەر ئاوی زەمزەمەوە، گوتی: جا بەو جۆرەی کە پێویستە لێت خواردەوە؟ گوتی: چۆن؟ گوتی: هەرکاتێک لە ئاوی زەمزەمت خواردەوە ڕوو بکە قیبلە و ناوی خوا بێنە و بە سێ نەفەس بیخۆوە و خۆتی لێ تێر ئاو بکە، ئنجا کە لێ بوویەوە سوپاسی خوای ﷻ بکە، چونکە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نیشانەی نێوانی ئێمە و دوو ڕووەکان ئەوەیە کە ئەوان خۆیان تێر ئاو و پاراو ناکەن لە ئاوی زەمزەم.

٣٠٦٢- جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَاءُ زَمْزَمَ، لِمَا شُرِبَ لَهُ»[(٢)].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: ئاوی زەمزەم بۆ ئەو شتەیە کە لە پێناویدا بخورێتەوە.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.

## بابەت: چوونە ناو کەعبە

**٣٠٦٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ، قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْفَتْحِ، الْكَعْبَةَ، وَمَعَهُ بِلَالٌ، وَعُثْمَانُ بْنُ شَيْبَةَ، فَأَغْلَقُوهَا عَلَيْهِمْ مِنْ دَاخِلٍ، فَلَمَّا خَرَجُوا سَأَلْتُ بِلَالًا: أَيْنَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ فَأَخْبَرَنِي أَنَّهُ «صَلَّى عَلَى وَجْهِهِ، حِينَ دَخَلَ بَيْنَ الْعَمُودَيْنِ، عَنْ يَمِينِهِ» ثُمَّ لُمْتُ نَفْسِي، أَنْ لَا أَكُونَ سَأَلْتُهُ: كَمْ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟[١].

**واتە: ئیبنو عومەر ﭭ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا چوو بۆ ناو کەعبە بیلال و عوسمانی کوڕی شەیبەش لە خزمەتیدابوون، جا لە ژوورەوە دەرگاکەی بەسەرەوە داخستن (تا خەڵکی نەیەنە ژوور و ئارام بێت)، جا کاتێک هاتنە دەرەوە پرسیارم لە بیلال کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوێ نوێژی کرد؟ ئەویش پێی ڕاگەیاندم کە لەو ڕووەی کە چووە ژوورەوە نوێژی کرد لە نێوان دوو پایەکاندا لەلای ڕاست، پاشان سەرزەنشتی خۆم کرد کە بۆ پرسیارم لێی نەکرد کە پێغەمبەری خوا چەند نوێژی کرد.**

**٣٠٦٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﭬ، قَالَتْ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ عِنْدِي، وَهُوَ قَرِيرُ الْعَيْنِ، طَيِّبُ النَّفْسِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَيَّ وَهُوَ حَزِينٌ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ خَرَجْتَ مِنْ عِنْدِي، وَأَنْتَ قَرِيرُ الْعَيْنِ، وَرَجَعْتَ وَأَنْتَ حَزِينٌ؟ فَقَالَ: «إِنِّي دَخَلْتُ الْكَعْبَةَ، وَوَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ فَعَلْتُ، إِنِّي أَخَافُ أَنْ أَكُونَ، أَتْعَبْتُ أُمَّتِي مِنْ بَعْدِي»[٢].

**واتە: عائیشە ﭬ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو لای من، دڵ خۆش و ڕوو خۆش بوو، پاشان کە گەڕایەوە بۆ لام خەمبار بوو، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک لەلای من دەرچووی دڵ خۆش بووی، کەچی گەڕایتەوە و خەمباریت؟ ئەویش فەرمووی: لە ڕاستیدا من چوومە ناو کەعبە، وە بەڕاستی پێم خۆش بوو ئەو کارەم نەکردبایە، بێگومان دەترسم کە ئوممەتەکەم تووشی ماندوو بوون و ناڕەحەتی کردبێ بۆ دوای خۆم (چونکە ئەوانیش دەچنە ناو کەعبە).**

---

(١) صحيح. أخرجه حديث ابن عمر عن بلال بنحوه عند البخاري: ٣٩٧، ومسلم: ١٣٢٩، وأبو داود: ٢٠٢٣، والترمذي: ٨٧٤، والنسائي: ٦٩٢ و ٧٤٩ و ٢٩٠٥_٢٩٠٨. وحديث ابن عباس عند البخاري: ٣٩٨، ومسلم: ١٣٣٠ و ١٣٣١، وأبو داود: ٢٠٢٧.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٠٢٩، والترمذي: ٨٧٣.

## بابەت: شەو مانەوەی شەوانی مینا لە مەککەدا

**٣٠٦٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭬ، قَالَ: «اسْتَأْذَنَ الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ، أَيَّامَ مِنًى، مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ، فَأَذِنَ لَهُ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﭬ دەڵێ: عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تاکو شەو لە مەککە بمێنێتەوە لە ڕۆژەکانی مینادا، بۆ ئەوەی ئاو بدات بە حاجییەکان، ئەویش مۆڵەتی پێدا.

**٣٠٦٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ، قَالَ: «لَمْ يُرَخِّصِ النَّبِيُّ ﷺ لِأَحَدٍ، يَبِيتُ بِمَكَّةَ، إِلَّا لِلْعَبَّاسِ، مِنْ أَجْلِ السِّقَايَةِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی هیچ کەسێکی نەدا کە شەو لە مەککە بمێنێتەوە تەنها عەبباس نەبێ، ئەویش لەبەرئەوەی ئاوی دەدا بە حاجییەکان.

## بابەت: دابەزین لە موحەصصەب

**٣٠٦٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﭬ، قَالَتْ: «إِنَّ نُزُولَ الْأَبْطَحِ لَيْسَ بِسُنَّةٍ، إِنَّمَا نَزَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، لِيَكُونَ أَسْمَحَ، لِخُرُوجِهِ»[٣].

واتە: عائیشە ﭬ دەڵێ: مەنزڵ دانان لە ئەبتەح سوننەت نیە، لەڕاستیدا دابەزینی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو شوێنە تەنها بۆ ئاسانکاری بوو، بۆ دەرچوونی و گەڕانەوەی بۆ مەدینە.

**المحصب و الأبطح و خيف بنو كنانة:** هەموویان یەک شوێنن، دەکەوێتە نێوان مەککەو مەدینە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٣٤، ومسلم: ١٣١٥، وأبو داود: ١٩٥٩.

(٢) صحيح بما قبله.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٦٥، ومسلم: ١٣١١، وأبو داود: ٢٠٠٨، والترمذي: ٩٢٣.

**٣٠٦٨- عَنْ عَائِشَةَ ، قَالَتْ: «ادَّلَجَ النَّبِيُّ ﷺ لَيْلَةَ النَّفْرِ، مِنَ الْبَطْحَاءِ ادِّلَاجًا»[١].**

**واتە: عائیشە  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوی دووەمی جەژن لە بەتحاء لە کۆتایی شەودا گەڕاوەتەوە.**

**٣٠٦٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ  يَنْزِلُونَ بِالْأَبْطَحِ»[٢].**

**واتە: ئیبنو عومەر  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان  لە ئەبتەح دادەبەزین.**

## بابەت: تەوافی ماڵئاوایی

**٣٠٧٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَنْصَرِفُونَ كُلَّ وَجْهٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ، حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ»[٣].**

**واتە: ئیبنو عەبباس  دەڵێ: خەڵکی (دوای تەواوبوونی حەج) لە هەر لایەکەوە بووایە دەردەچوون، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ کەسێک دەرنەچێت و نەگەڕێتەوە، وە با کۆتا شوێن کە بۆی دەچێ (تەوافی ماڵئاوایی) کەعبە بێ.**

**٣٠٧١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنْ يَنْفِرَ الرَّجُلُ، حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ»[٤].**

**واتە: ئیبنو عومەر  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە پیاو بگەڕێتەوە هەتا کۆتا شوێن کە بۆی دەچێ دەبێ (تەوافی ماڵئاوایی) کەعبە بێ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣١٠، والترمذي: ٩٢١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٥٥، ومسلم: ١٣٢٨، وأبو داود: ٢٠٠٢.

(٤) ضعيف جداً. أخرجه الترمذي: ٩٤٤ وزاد «وَرَخَّصَ لَهُنَّ - أي للحيض - رَسُولُ اللَّهِ ﷺ» واقترح البخاري: ١٧٦١ علي مازاده الترمذي.




## بابەت: ئافرەتێک کە بکەوێتە سوڕی مانگانە تەوافیماڵئاوایی لەسەر نیە

**٣٠٧٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: حَاضَتْ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ بَعْدَ مَا أَفَاضَتْ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «أَحَابِسَتُنَا هِيَ؟» فَقُلْتُ: إِنَّهَا قَدْ أَفَاضَتْ، ثُمَّ حَاضَتْ بَعْدَ ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَلْتَنْفِرْ»(١).

**واتە:** عائیشە ﵂ دەڵێ: صەفیەی کچی حویەی کەوتە سوڕی مانگانە دوای ئەوەی تەوافی زیارەتی کردبوو، عائیشە گوتی: جا ئەوەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوەو، ئەویش فەرمووی: کەواتە گیرمان دەدا لە گەڕانەوەدا؟ منیش گوتم: ئەو تەوافی ئیفازەی کردوەو دوای ئەوە تووشی بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەوابوو با بەڕێبکەوێ و دەربچێ (چونکە تەوافی ماڵئاوایی لەسەر نیە و قەیناکات).

**٣٠٧٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَفِيَّةَ فَقُلْنَا: قَدْ حَاضَتْ فَقَالَ: «عَقْرَى حَلْقَى مَا أُرَاهَا، إِلَّا حَابِسَتَنَا» فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهَا قَدْ طَافَتْ يَوْمَ النَّحْرِ، قَالَ: «فَلَا، إِذَنْ، مُرُوهَا، فَلْتَنْفِرْ»(٢).

**واتە:** عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی صەفیەی کرد، ئێمەش گوتمان: لەڕاستیدا کەوتۆتە سوڕی مانگانەوە، ئەویش وەک بڵێی دوعای لێکردوە فەرمووی: پێموایە گیرمان دەکات لە گەڕانەوەدا، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان ئەو لە ڕۆژی جەژندا تەوافی کردوە، فەرمووی: کەواتە نەخێر دوامان ناخات، فەرمانی پێبکەن بگەڕێتەوە.

**عَقْرَى:** واتە: دوابڕاو.

**حلقى:** واتە: سەر تاشراو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٨، ومسلم بإثر: ١٣٢٨، وأبو داود: ٢٠٠٣، والترمذي: ٩٤٣، والنسائي: ٣٩١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٨، ومسلم بإثر: ١٣٢٨، وأبو داود: ٢٠٠٣، والترمذي: ٩٤٣، والنسائي: ٣٩١.

## بابەت: حەجی ماڵئاوایی پێغەمبەری خوا ﷺ

**٣٠٧٤-** عَنْ جَعْفَرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَيْهِ سَأَلَ عَنِ الْقَوْمِ، حَتَّى انْتَهَى إِلَيَّ، فَقُلْتُ: أَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ الْحُسَيْنِ، فَأَهْوَى بِيَدِهِ إِلَى رَأْسِي، فَحَلَّ زِرِّي الْأَعْلَى، ثُمَّ حَلَّ زِرِّي الْأَسْفَلَ. ثُمَّ وَضَعَ كَفَّهُ، بَيْنَ ثَدْيَيَّ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ غُلَامٌ شَابٌّ، فَقَالَ: مَرْحَبًا بِكَ، سَلْ عَمَّا شِئْتَ، فَسَأَلْتُهُ، وَهُوَ أَعْمَى، فَجَاءَ وَقْتُ الصَّلَاةِ، فَقَامَ فِي نِسَاجَةٍ مُلْتَحِفًا بِهَا، كُلَّمَا وَضَعَهَا عَلَى مَنْكِبَيْهِ، رَجَعَ طَرَفَاهَا إِلَيْهِ، مِنْ صِغَرِهَا، وَرِدَاؤُهُ إِلَى جَانِبِهِ عَلَى الْمِشْجَبِ، فَصَلَّى بِنَا، فَقُلْتُ: أَخْبِرْنَا عَنْ حَجَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: بِيَدِهِ، فَعَقَدَ تِسْعًا وَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَكَثَ تِسْعَ سِنِينَ لَمْ يَحُجَّ، فَأَذَّنَ فِي النَّاسِ فِي الْعَاشِرَةِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَاجٌّ، فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ بَشَرٌ كَثِيرٌ، كُلُّهُمْ يَلْتَمِسُ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَيَعْمَلَ مِثْلَ عَمَلِهِ، فَخَرَجَ وَخَرَجْنَا مَعَهُ، فَأَتَيْنَا ذَا الْحُلَيْفَةِ، فَوَلَدَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: كَيْفَ أَصْنَعُ؟ قَالَ: «اغْتَسِلِي، وَاسْتَثْفِرِي بِثَوْبٍ، وَأَحْرِمِي» فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ، حَتَّى إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ نَاقَتُهُ عَلَى الْبَيْدَاءِ قَالَ جَابِرٌ: نَظَرْتُ إِلَى مَدِّ بَصَرِي مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ، بَيْنَ رَاكِبٍ وَمَاشٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَعَنْ يَسَارِهِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَمِنْ خَلْفِهِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَظْهُرِنَا، وَعَلَيْهِ يَنْزِلُ الْقُرْآنُ، وَهُوَ يَعْرِفُ تَأْوِيلَهُ، مَا عَمِلَ بِهِ مِنْ شَيْءٍ عَمِلْنَا بِهِ، فَأَهَلَّ بِالتَّوْحِيدِ «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ» وَأَهَلَّ النَّاسُ بِهَذَا الَّذِي يُهِلُّونَ بِهِ، فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَيْهِمْ شَيْئًا مِنْهُ، وَلَزِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَلْبِيَتَهُ، قَالَ جَابِرٌ: لَسْنَا نَنْوِي إِلَّا الْحَجَّ، لَسْنَا نَعْرِفُ الْعُمْرَةَ، حَتَّى إِذَا أَتَيْنَا الْبَيْتَ مَعَهُ اسْتَلَمَ الرُّكْنَ، فَرَمَلَ ثَلَاثًا، وَمَشَى أَرْبَعًا، ثُمَّ قَامَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ فَقَالَ: «﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴿١٢٥﴾﴾ البقرة»، فَجَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ، فَكَانَ أَبِي يَقُولُ: - وَلَا أَعْلَمُهُ، إِلَّا ذَكَرَهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ - إِنَّهُ كَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١﴾﴾ وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾﴾، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الْبَيْتِ، فَاسْتَلَمَ الرُّكْنَ، ثُمَّ خَرَجَ مِنَ الْبَابِ إِلَى الصَّفَا، حَتَّى إِذَا دَنَا مِنَ الصَّفَا قَرَأَ: «﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾﴾ البقرة، نَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ» فَبَدَأَ بِالصَّفَا فَرَقِيَ عَلَيْهِ، حَتَّى رَأَى الْبَيْتَ، فَكَبَّرَ اللَّهَ وَهَلَّلَهُ وَحَمِدَهُ، وَقَالَ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ» ثُمَّ دَعَا بَيْنَ ذَلِكَ وَقَالَ مِثْلَ هَذَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ نَزَلَ إِلَى الْمَرْوَةِ فَمَشَى، حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ، رَمَلَ فِي بَطْنِ الْوَادِي، حَتَّى إِذَا

صَعِدَتَا - يَعْنِي قَدَمَاهُ - مَشَى، حَتَّى أَتَى الْمَرْوَةَ، فَفَعَلَ عَلَى الْمَرْوَةِ، كَمَا فَعَلَ عَلَى الصَّفَا، فَلَمَّا كَانَ آخِرُ طَوَافِهِ عَلَى الْمَرْوَةِ قَالَ: «لَوْ أَنِّي اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ، لَمْ أَسُقِ الْهَدْيَ، وَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً، فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ لَيْسَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلْيَحْلِلْ، وَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً» فَحَلَّ النَّاسُ كُلُّهُمْ، وَقَصَّرُوا، إِلَّا النَّبِيَّ ﷺ وَمَنْ كَانَ مَعَهُ الْهَدْيُ، فَقَامَ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِعَامِنَا هَذَا أَمْ لِأَبَدٍ؟ قَالَ: فَشَبَّكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَصَابِعَهُ فِي الْأُخْرَى، وَقَالَ: دَخَلَتِ الْعُمْرَةُ فِي الْحَجِّ هَكَذَا، مَرَّتَيْنِ «لَا، بَلْ لِأَبَدِ أَبَدٍ» قَالَ: وَقَدِمَ عَلِيٌّ بِبُدْنِ النَّبِيِّ ﷺ، فَوَجَدَ فَاطِمَةَ مِمَّنْ حَلَّ، وَلَبِسَتْ ثِيَابًا صَبِيغًا، وَاكْتَحَلَتْ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عَلَيْهَا عَلِيٌّ، فَقَالَتْ: أَمَرَنِي أَبِي بِهَذَا، فَكَانَ عَلِيٌّ يَقُولُ بِالْعِرَاقِ: فَذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُحَرِّشًا عَلَى فَاطِمَةَ فِي الَّذِي صَنَعَتْهُ، مُسْتَفْتِيًا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي الَّذِي ذَكَرَتْ عَنْهُ، وَأَنْكَرْتُ ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: «صَدَقَتْ، صَدَقَتْ، مَاذَا قُلْتَ حِينَ فَرَضْتَ الْحَجَّ؟» قَالَ: قُلْتُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أُهِلُّ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُكَ ﷺ، قَالَ: فَإِنَّ مَعِي الْهَدْيَ فَلَا تَحِلُّ» قَالَ: فَكَانَ جَمَاعَةُ الْهَدْيِ الَّذِي جَاءَ بِهِ عَلِيٌّ مِنَ الْيَمَنِ، وَالَّذِي أَتَى بِهِ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ مِائَةً، ثُمَّ حَلَّ النَّاسُ كُلُّهُمْ، وَقَصَّرُوا، إِلَّا النَّبِيَّ ﷺ وَمَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ، وَتَوَجَّهُوا إِلَى مِنًى، أَهَلُّوا بِالْحَجِّ، فَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى بِمِنًى الظُّهْرَ، وَالْعَصْرَ، وَالْمَغْرِبَ، وَالْعِشَاءَ، وَالصُّبْحَ، ثُمَّ مَكَثَ قَلِيلًا حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، وَأَمَرَ بِقُبَّةٍ مِنْ شَعَرٍ، فَضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةَ، فَسَارَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا تَشُكُّ قُرَيْشٌ، إِلَّا أَنَّهُ وَاقِفٌ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ، أَوِ الْمُزْدَلِفَةِ، كَمَا كَانَتْ قُرَيْشٌ تَصْنَعُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَجَازَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ، فَوَجَدَ الْقُبَّةَ، قَدْ ضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةَ، فَنَزَلَ بِهَا، حَتَّى إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ، أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ، فَرُحِلَتْ لَهُ، فَرَكِبَ، حَتَّى أَتَى بَطْنَ الْوَادِي، فَخَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: «إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلَا وَإِنَّ كُلَّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ، مَوْضُوعٌ تَحْتَ قَدَمَيَّ هَاتَيْنِ، وَدِمَاءُ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ، وَأَوَّلُ دَمٍ أَضَعُهُ دَمُ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ - كَانَ مُسْتَرْضِعًا فِي بَنِي سَعْدٍ، فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ - وَرِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، وَأَوَّلُ رِبًا أَضَعُهُ رِبَانَا، رِبَا الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ، فَاتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ، بِأَمَانَةِ اللَّهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ، وَإِنَّ لَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لَا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ، فَإِنْ فَعَلْنَ ذَلِكَ فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ، وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ، وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَقَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ مَا لَمْ تَضِلُّوا إِنِ اعْتَصَمْتُمْ بِهِ، كِتَابَ اللَّهِ، وَأَنْتُمْ مَسْئُولُونَ عَنِّي، فَمَا أَنْتُمْ قَائِلُونَ؟» قَالُوا: نَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ وَأَدَّيْتَ وَنَصَحْتَ، فَقَالَ: بِإِصْبَعِهِ السَّبَّابَةِ إِلَى السَّمَاءِ، وَيَنْكُتُهَا إِلَى النَّاسِ «اللَّهُمَّ اشْهَدْ، اللَّهُمَّ اشْهَدْ» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَذَّنَ بِلَالٌ، ثُمَّ أَقَامَ، فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ، فَصَلَّى الْعَصْرَ، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا، ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى




أَتَى الْمَوْقِفَ، فَجَعَلَ بَطْنَ نَاقَتِهِ، إِلَى الصَّخَرَاتِ، وَجَعَلَ حَبْلَ الْمُشَاةِ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا، حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَذَهَبَتِ الصُّفْرَةُ قَلِيلًا، حَتَّى غَابَ الْقُرْصُ، وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ خَلْفَهُ، فَدَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقَدْ شَنَقَ الْقَصْوَاءَ بِالزِّمَامِ، حَتَّى إِنَّ رَأْسَهَا، لَيُصِيبُ مَوْرِكَ رَحْلِهِ، وَيَقُولُ بِيَدِهِ الْيُمْنَى «أَيُّهَا النَّاسُ السَّكِينَةَ، السَّكِينَةَ» كُلَّمَا أَتَى حَبْلًا مِنَ الْحِبَالِ أَرْخَى لَهَا قَلِيلًا، حَتَّى تَصْعَدَ، ثُمَّ أَتَى الْمُزْدَلِفَةَ، فَصَلَّى بِهَا الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ، بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا، ثُمَّ اضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، فَصَلَّى الْفَجْرَ، حِينَ تَبَيَّنَ لَهُ الصُّبْحُ، بِأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ، ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ، حَتَّى أَتَى الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ، فَرَقِيَ عَلَيْهِ، فَحَمِدَ اللَّهَ، وَكَبَّرَهُ، وَهَلَّلَهُ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا، حَتَّى أَسْفَرَ جِدًّا، ثُمَّ دَفَعَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَأَرْدَفَ الْفَضْلَ بْنَ الْعَبَّاسِ، وَكَانَ رَجُلًا حَسَنَ الشَّعْرِ، أَبْيَضَ وَسِيمًا، فَلَمَّا دَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مَرَّ الظُّعُنُ يَجْرِينَ، فَطَفِقَ يَنْظُرُ إِلَيْهِنَّ الْفَضْلُ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ مِنَ الشِّقِّ الْآخَرِ، فَصَرَفَ الْفَضْلُ وَجْهَهُ مِنَ الشِّقِّ الْآخَرِ يَنْظُرُ، حَتَّى أَتَى مُحَسِّرًا، حَرَّكَ قَلِيلًا، ثُمَّ سَلَكَ الطَّرِيقَ الْوُسْطَى، الَّتِي تُخْرِجُكَ إِلَى الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى، حَتَّى أَتَى الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الشَّجَرَةِ، فَرَمَى بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ مِنْهَا، مِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ، وَرَمَى مِنْ بَطْنِ الْوَادِي، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمَنْحَرِ، فَنَحَرَ ثَلَاثًا وَسِتِّينَ بَدَنَةً بِيَدِهِ، وَأَعْطَى عَلِيًّا، فَنَحَرَ مَا غَبَرَ، وَأَشْرَكَهُ فِي هَدْيِهِ، ثُمَّ أَمَرَ مِنْ كُلِّ بَدَنَةٍ بِبَضْعَةٍ، فَجُعِلَتْ فِي قِدْرٍ، فَطُبِخَتْ، فَأَكَلَا مِنْ لَحْمِهَا وَشَرِبَا مِنْ مَرَقِهَا، ثُمَّ أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْبَيْتِ، فَصَلَّى بِمَكَّةَ الظُّهْرَ، فَأَتَى بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَهُمْ يَسْقُونَ عَلَى زَمْزَمَ، فَقَالَ: «انْزِعُوا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ لَوْلَا أَنْ يَغْلِبَكُمُ النَّاسُ عَلَى سِقَايَتِكُمْ، لَنَزَعْتُ مَعَكُمْ» فَنَاوَلُوهُ دَلْوًا، فَشَرِبَ مِنْهُ[1].

واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: چووین بۆ لای جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ، کاتێک گەیشتینە لای یەک یەک لە خەڵکەکەی دەپرسی تا گەیشتە من، منیش گوتم: من موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینم، ئنجا دەستی بە سەرمدا هێنا، پاشان دوگمەی سەرو خوارووی کردمەوە، پاشان دەستی خستە سەر سینگم ئەو کات گەنجێکی تازە پێگەشتوو بووم، ئنجا گوتی: بەخێر بێی، دەربارەی هەر شتێک حەز دەکەی پرسیار بکە، منیش پرسیارم لێی کرد، ئەو چاوەکانی کزو نابینا ببوون، ئیتر کاتی نوێژ هات، ئەویش هەڵسا بۆ نوێژ پۆشاکێکی چنراوی لەبەر بوو، هەر جارێک بەشانی خۆی دادەدا لەبەر گچکەیی

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢١٨ و ١٢١٦، وأبو داود: ١٩٠٥، والترمذي: مختصراً ٨٩٧، والنسائي: ٣٠٥٤ و ٣٠٧٤_٣٠٧٦.

ئەولاو لاکەی بۆلای دەهاتنەوە، عەباکەشی لە تەنیشتی بەسەر سێپاکەوە بوو، ئیتر بەرنوێژی بۆ کردین، ئەوجار گوتم: بۆمان باسی حەجەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکە، ئەویش بە پەنجەکانی دەستی هەتا نۆی ژماردو گوتی: نۆ ساڵ مایەوەو حەجی تێدا نەکرد، لە ساڵی دەیەمدا جاڕی خەڵکی دا کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ حەج دەکات، خەڵکێکی زۆر هات بۆ مەدینە، هەموویان دەیانویست لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بچن بۆ حەج، وە بەهەمان شێوەی ئەو بکەن لە حەجدا، ئەویش دەرچوو ئێمەش لە خزمەتیدا لەگەڵی دەرچووین، ئیتر گەشتینە «ذو الحليفة»، لەوێ ئەسمائی کچی عومەیس موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری بوو، ئەویش ناردی بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا چی بکەم لەوحاڵەدا، فەرمووی: خۆت بشۆو بە پارچەیەک خۆت ببەستەو ئیحرام ببەستە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا نوێژی کرد، پاشان سواری وشترەکەی بوو (کە ناوی قەصوء بوو) هەتاکو سەرکەوتە سەر کێوی بەیدء، جابیر گوتی: تا چاو بڕدەکات ڕوانیم خەڵکی لە پیادەو سوار لە دەوری پێغەمبەری خوایە ﷺ، لای ڕاستیشی وابوو، وە لە لای چەپیشی بە هەمان شێوە، لە لای پشتەوەشی بە هەمان شێوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناوماندابوو قورئانیشی بۆ سەر دادەبەزی، کە بێگومان خۆی تەفسیرەکەی دەزانی، کاری بە هەرچی بکردبایە ئێمەش کارمان پێدەکرد، ئنجا تەلبیەی کرد بە یەکتاپەرستی و فەرمووی: «لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، إن الحمد والنعمة لك والملك لا شريك لك»، خەڵکیش بەو تەلبییەی دەیانکرد خەریک بوون و پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ ڕەدی نەدانەوەو بە تەلبییەی خۆی خەریک بوو، جابیر گوتی: ئێمە تەنها نیەتی حەجمان هێنابوو، شارەزای عومرە نەبووین، هات لە خزمەتیدا گەیشتینە ماڵی خوا، دەستی لە گۆشەی بەردە ڕەشکە داو ئنجا سێجار بە خێرایی بە دەوری کەعبەدا سوڕایەوەو چوار جاریش بە ڕۆشتنی ئاسایی، پاشان چوو بۆ مقامی ئیبڕاهیم و ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ١٢٥﴾ البقرة، واتە: شوێنی ئەو بەردەی ئیبراهیم عليه السلام لە سەری ڕادەوەستا (کاتی دروست کردنی کەعبە) بکەنە جێگای نوێژ. نوێژو تاعەت بکەن. ئنجا مەقامی ئیبڕاهیمی خستە نێوان خۆیی و کەعبە، موحەممەد کوڕی جەعفەر دەڵێ: باوکم کە پێموایە لە پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕاوە دەیگوت: لە دوو ڕکاتەکەدا: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا

ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾﴾ی خوێند، پاشان گەڕایەوە بۆ کەعبەو دەستی لە گۆشەی بەردەکە دا، پاشان لە دەرگاکەوە چوو بۆ بۆ کێوی صەفاو لێی نزیک بۆوەو ئەو ئایەتەی خوێند: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ﴿١٥٨﴾﴾ البقرة، واتە: بەڕاستی صەفاو مەڕوە لە دروشمەکانی (ئاینی) خوان. فەرمووی: بەو شوێنە دەست پێدەکەین کە خوا لە ئایەتەکەدا دەستی پێکردوە، بۆیە لە صەفاوە دەستی پێکرد، بە صەفادا سەرکەوت تاکو کەعبەی لێ بەدەرکەوت، ئنجا «الله أكبر»و «لا إله إلا الله»و «الحمدلله»ـی کردو فەرمووی: «لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد يحي ويميت وهو على كل شيء قدير، لا إله إلا الله وحده لا شريك له، أنجز وعده ونصر عبده وهزم الأحزاب وحده»، پاشان لە نێوان ئەو زیکرانە کە سێجار دووبارەی کردەوە دوعای دەکرد، ئنجا بەرەو مەڕوە هاتە خوارێ تاکو پێیەکانی گەشتە ناو شیوەکەو لەوێوە بە خێرایی ڕۆشت هەتاکو گەیشتە مەڕوە، جا ئەوەی لە صەفا کردی هەمان شتیشی لە مەڕوە جێبەجێکرد، جا کاتێک کۆتا هاتوچۆی صەفاو مەڕوەی تەواو کرد فەرمووی: ئەوەی ئێستای دەزانم پێشتر بمزانیبا دیاری ماڵی خوام لەگەڵ خۆم نەدەهێناو دەمکرد بە عومرە، جا ئەوەتان کە دیاری ماڵی خوای نەهێناوە با ئیحرام بشکێنێ و بیکاتە عومرە، ئیتر خەڵکی ئیحرامیان شکاندو پرچیان کورت کردەوە، تەنها پێغەمبەر ﷺ نەبێ لەگەڵ ئەوانەی کە دیارییان هێنابوو، سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوم هەستاو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە تەنها بۆ ئەو ساڵە یان بۆ هەتا هەتایە؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەی دەستەکانی خستە ناو یەکترو فەرمووی: بەو جۆرە عومرە لەگەڵ حەجدا تێکەڵ بوو، دوو جار فەرمووی: نا بەڵکو بۆ هەتا هەتایە، ئنجا عەلی وشتری قوربانی پێغەمبەری ﷺ هێنان، ئنجا عەلی فاتیمەی بینی کە ئیحرامی شکاندووەو پۆشاکی ڕەنگکراوی پۆشیوەو چاوی ڕشتووە، بۆیە عەلی ئەو کارەی نکوڵی لێکرد، فاتیمەش گوتی: باوکم فەرمانی پێکردووم، جا عەلی کاتێ لە عێراق بوو گێڕایەوەو گوتی: ڕۆشتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ تا ئەوەی پێ بڵێم کە فاتیمە کردوویەتی، ئەوەشی لێ بپرسم کە فاتیمە بە زوبان ئەوەوە پێی گوتم، وە ئەوەش کە نکوڵیم لە کارەکەی فاتیمە کردوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ڕاستی گوتووە ڕاستی گوتووە، تۆ چیت گوتووە کاتێ ئیحرامت بەست؟ گوتی:





گوتوومە: خودایە بەو جۆرە ئیحرام دەبەستم کە پێغەمبەرەکەت ﷺ بەستوویەتی، فەرمووی: من ئاژەڵی قوربانیم لەگەڵ خۆم هێناوە، بۆیە تۆش ئیحرام مەشکێنە، ڕاوی گوتی: ژمارەی ئەو ماڵاتی قوربانییەی عەلی لە یەمەن هێنابوونی لەگەڵ ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە هێنابوونی سەد دانە بوون، پاشان هەموو خەڵکەکە ئیحرامیان شکاندو پرچیان کورت کردەوە جگە لە پێغەمبەر ﷺو ئەوانە نەبێ کە قوربانیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، جا کاتێک ڕۆژی تەڕوییە هات و ڕوویان کردە مینا، ئیتر بە حەج ئیحرامیان بەست و پێغەمبەری خوا ﷺ بە سواری بەڕێکەوت، لە مینا نوێژی نیوەڕۆو عەسرو شێوان و خەوتنان و بەیانی کرد، پاشان تاکو کەمێک خۆرهەڵات مایەوەو فەرمانی کرد چادرێکی لە موو دروستکراوی بۆ هەڵبدەن لە نەمیرە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕێکەوت لەوکاتەدا قوڕەیش هیچ گومانیان نەبوو کە پێغەمبەر ﷺ لە مەشعەرولحەرام، یان موزدەلیفە لادەدات، هەروەکو چۆن قوڕەیش لە سەردەمی نەفامیدا وایان دەکرد، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوێی تێپەڕاند تاکو گەیشتە عەڕەفە، بینی کە چادرەکەیان لە نەمیرە بۆ هەڵداوە بۆیە لەوێ دابەزی، هەتاکو خۆر لایدا بەرەو ئاوا بوون ئیتر فەرمانیکرد وشترەکەی کە ناوی قەصوا بوو بۆیان ئامادە کرد، ئنجا سوار بوو تا گەیشتە ناوەڕاستی شیوەکە، ئنجا وتاری بۆ خەڵکی فەرموو، لە وتارەکەدا فەرمووی: بێگومان خوێن و ماڵتان لە یەکتری حەڕام و قدەغەیە وەکو حەڕامی ئەمڕۆتان و ئەو مانگەتان و ئەو شارەتان، ئاگاداربن هەرچی شتی سەردەمی نەفامییە لە ژێر ئەو دوو پێیەمدایە، وە هەموو خوێنێکی سەردەمی نەفامی هەڵدەوەشێنمەوەو حیسابی بۆ ناکرێ و یەکەم خوێنیش کە هەڵیدەوەشێنمەوە هی بنەماڵەکەی خۆمە هی ڕەبیعەی کوڕی حاریس (لای هۆزی بەنو سەعد بە دایەن درابوو هۆزی هوزەیل کوشتبوویان)، هەروەها سوو (ڕیبا)ـی سەردەمی نەفامی هەڵگیراوە، یەکەم سووش کە بەتاڵی دەکەمەوە سوو ڕیبای کەسی خۆمە ڕیبای عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب، ئەو ڕیبایە هەمووی هەڵوەشایەوەو بەتاڵ بۆوە، دەربارەی ئافرەتان لە خوا بترسێن، چونکە ئەوان ئەمانەتی خوان لای ئێوەن، وە لەسەر فەرموودەی خوا بۆتان حەڵاڵ کراون، وە مافی ئێوەیە بەسەر ئەوانەوە کە ڕێگا نەدەن کەسێک ئێوە ڕقتان لێیە، یان خۆشتان ناوێ بێتە ماڵەکانتان، خۆ ئەگەر ئەو




پێشێلیەیان کرد ئەوە لێدانێکی سوک لێیان بدەن کە برینداریان نەکەن، وە مافی ئەوانە لەسەرتان کە ڕزق و ڕۆزیان بۆ پەیدا بکەن و بەرگ و پۆشاکیان بۆ فەراهەم بێنن، ئەوەش بە پێی عورف و عادەت (بە شێوازێکی شەرعی)، وە شتێکم لە ناوتاندا جێهێشتووە کە ئەگەر دەستی پێوە بگرن هەرگیز سەرتان لێ ناشێوێ، ئەویش کیتابەکەی خوایە کە قورئانە، وە ئێوەش دەربارەی گەیاندنی من پرسیارتان لێدەکرێ ئێوە وەڵامتان چی دەبێ؟ گوتیان: ئێمە شاهیدیت بۆ دەدەین کە پەیامەکەت گەیاندووەو ئەرکی خۆت بەجێگەیاندووەو ئامۆژگاریت کردوە، ئەویش بە ئاماژەی پەنجەی شایەتمان کە بەرەو ئاسمان بەرزی کردەوەو بەرەو خەڵکەکە هێنایە خوارەوە سێ جار فەرمووی: خودایە خۆت شاهید بە، خودایە خۆت شاهیدبە، پاشان بیلال بانگیداو قامەتی کردو نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن، پاشان قامەتی کردو نوێژی عەسریشی بۆ کردن، لە نێوانی ئەو دوو نوێژەدا هیچ نوێژێکی نەکرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ سواری وشترەکەی بوو هەتا گەیشتە عەرەفە، ڕووی وشترەکەی کردە بەردەڵانەکەو خەڵکەکەش لە دەوری بوون، هەروەها ڕووی کردە قیبلەو بەردەوام بوو لە ڕاوەستان هەتا ڕۆژ ئاوابوو زەردە نەمان، تاکو بازنەی خۆرئاوابوو، ئوسامەی کوڕی زەیدی لە پشتیەوە سوار کرد، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕێکەوت و جڵەوی وشترەکەی بە جۆرێک توند کردبوو تا خەڵکی ئازار نەدات کە سەری وشترەکە گەیشتبووە ئاوزەنگەکانی، بەدەستی ڕاستی ئاماژەی بۆ خەڵکی دەکردو دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە ئارام بن، ئارام بن، هەرجارێکیش دەگەشتە تەپۆلکە خۆڵەکان جڵەوی بۆ وشترەکە کەمێک شل دەکرد تاکو سەرکەوێ، پاشان هاتە موزدەلیفەو نوێژی شێوان و خەوتنانی بە بانگێک و دوو قامەت بۆ خەڵکەکە کرد، لە نێوانی دوو نوێژەکەش هیچ نوێژێکیتری نەکرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ نووست تاکو بەیانی بۆوە، کاتێک زانی نوێژ بووە ئیتر نوێژی بەیانی بۆ کردن، بە بانگ و قامەتێک، پاشان سواری وشترەکەی بوو، تاکو گەیشتە مەشعەرولحەرام، پێیدا سەرکەوت و «الحمدلله»و «الله أكبر»و «لا إله إلا الله»ـی کرد، بەردەوام بوو لە ڕاوەستان تاکو بەتەواوی دنیا ڕووناک بوو، پاشان پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ بەڕێکەوت و فەزلی کوڕی عەبباسی لەگەڵ بوو، فەزل پیاوێکی پرچ جوانی سپیلکەلانەی ڕوو گەشاوە بوو، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتەڕێ،




کۆمەڵە ئافرەتێک ڕابردن، فەزلیش تەماشای دەکردن، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستە سەر لاکەیتر، فەزلیش ڕووی بە لایەکەیتردا وەرگێڕاو تەماشای دەکردن، تاکو گەیشتە موحەسیر (لە نێوان میناو موزدەلیفەیە) لەوێ کەمێک خێرا لێیخوڕی، پاشان ڕێگای ناوەڕاستی گرتەبەر کە دەچێتەوە بۆ لای جەمرەی گەورە، تاکو گەیشتە ئەو جەمرەیەی لەلای دارەکەیە، ئیتر بە حەوت بەرد کە بە ئەندازەی بەردی پەلاپیتکە بوون ڕەجمی کردو لەگەڵ هەر بەردێک «الله أكبر»ـی دەکرد، لە ناوەڕاستی شیوەکەوە بەردەکانی دەهاویشتن، پاشان چوو بۆ شوێنی قوربانیکردنەکەو شەست و سێ وشتری بە دەستی خۆی کردە قوربانی و ئەوجار تیغەکەی بە عەلی داو ئەوانیتری کردە قوربانی، وە عەلی لە قوربانییەکە خۆی کردە هاوبەش، پاشان فەرمانیکرد لە هەر قوربانییەک پارچە گۆشتێک بخەنە مەنجەڵەوەو کوڵاندیان، ئنجا لە گۆشت و گۆشتاوەکەیان خوارد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی «الإفاضة»ـی کردو نوێژی نیوەڕۆی لە مەککەدا کرد، ئەوجار هات بۆلای نەوەی عەبدولموتەڵیب کە ئاوی زەمزەمیان بۆ خەڵکی هەڵدەهێنجا، بۆیە فەرمووی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ خەڵکی بەسەرتان دەگەڕێ ئەوە ئاوم لەگەڵ هەڵدەهێنجان، ئنجا ئەوانیش دۆلکەیەک ئاوی زەمزەمیان بۆ هێناو ئەویش لێی خواردەوە.

**٣٠٧٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِلْحَجِّ عَلَى أَنْوَاعٍ ثَلَاثَةٍ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ مَعًا، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ مُفْرَدٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ مُفْرَدَةٍ، فَمَنْ كَانَ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ مَعًا، لَمْ يَحْلِلْ مِنْ شَيْءٍ، مِمَّا حَرُمَ مِنْهُ، حَتَّى يَقْضِيَ مَنَاسِكَ الْحَجِّ، وَمَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ مُفْرَدًا، لَمْ يَحْلِلْ مِنْ شَيْءٍ، مِمَّا حَرُمَ مِنْهُ، حَتَّى يَقْضِيَ مَنَاسِكَ الْحَجِّ، وَمَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ مُفْرَدَةٍ، فَطَافَ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، حَلَّ مِمَّا حَرُمَ عَنْهُ، حَتَّى يَسْتَقْبِلَ حَجًّا»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ حەج دەرچووین کە خەڵکەکە سێ جۆر بوو: هەندێکمان ئیحرامی حەج و عومرەی بەیەکەوە بەست، هەندێکمان تەنها ئیحرامی حەجی بەست، هەندێکیشمان تەنها ئیحرامی عومرەی بەست، جا ئەوەی کە ئیحرامی حەج و عومرەی بەیەکەوە بەستبوو هیچ شتێکی لەو شتانەی کە لێی حەرام و قەدەغە کرابوو بۆی حەڵاڵ نەبوو هەتا هەموو مەڕاسیمی حەجی

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٩ بنحوه، ومسلم: ١٢١١، وأبو داود: ١٧٧٩_١٧٨١، والنسائي: ٢٧١٧ و ٢٧٦٤.

تەواوکرد، ئەوەشی کە ئیحرامی تەنها بۆ حەج بەستبوو هیچ شتێکی لەو شتانەی لێی قەدەغە کرابوو بۆی حەڵاڵ نەبوو هەتا حەجی تەواوکرد، وە ئەوەشی تەنها بۆ عومرە ئیحرامی بەستبوو تەوافی کەعبەی کردو، هاتوچۆی نێوان صەفا و مەڕوەی کرد و ئیتر ئەوەی لێی حەرام کرابوو بۆی حەڵاڵ بوو هەتاکو کاتی دەسپێکردنی حەج هات و دەستی کرد بە حەج.

**٣٠٧٦-** عَنْ سُفْيَان ﷺ، قَالَ: حَجَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثَ حَجَّاتٍ، حَجَّتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُهَاجِرَ، وَحَجَّةً بَعْدَ مَا هَاجَرَ مِنَ الْمَدِينَةِ، وَقَرَنَ مَعَ حَجَّتِهِ عُمْرَةً، وَاجْتَمَعَ مَا جَاءَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، وَمَا جَاءَ بِهِ عَلِيٌّ مِائَةَ بَدَنَةٍ، مِنْهَا جَمَلٌ لِأَبِي جَهْلٍ، فِي أَنْفِهِ بُرَةٌ مِنْ فِضَّةٍ، فَنَحَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ ثَلَاثًا وَسِتِّينَ، وَنَحَرَ عَلِيٌّ مَا غَبَرَ قِيلَ لَهُ: مَنْ ذَكَرَهُ؟ قَالَ: جَعْفَرٌ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَابِرٍ، وَابْنُ أَبِي لَيْلَى، عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ مِقْسَمٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ[١].

واتە: سوفیان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار حەجی کردوە: دوو جار پێش ئەوەی کۆچ بکات، وە حەجێکیشیان دوای کۆچکردن لە مەدینەوە حەجی کرد، وە لەگەڵ حەجەکەی عومرەشی کرد، جا ئەو وشترانەی کە پێغەمبەر ﷺ هێنابوونی لەگەڵ ئەوانەی عەلی هێنابوونی کۆکرانەوە بوونە سەد وشتر، لەناویاندا وشترێکی نێری ئەبو جەهل هەبوو کە ئاڵقەیەکی زیوی لە لوتدا بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ شەست و سێ دانەی بە دەستی خۆی سەربڕی و ئەوانەی مانەوە عەلی سەری بڕین. بە (ڕاوی) گوترا: کێ ئەوەی باسکردوە؟ گوتی: جەعفەر لە باوکییەوە لە جابیرەوە، وە ئیبنو ئەبو لەیلا لە حەکەمەوە، لە میقسەمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە.

## بابەت: ڕێ لێگران لە حەج

**٣٠٧٧-** عَنْ حَجَّاجِ بْنِ أَبِي عُثْمَانَ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عِكْرِمَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي الْحَجَّاجُ بْنُ عَمْرٍو الْأَنْصَارِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ كُسِرَ، أَوْ عَرَجَ، فَقَدْ حَلَّ، وَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى» فَحَدَّثْتُ بِهِ ابْنَ عَبَّاسٍ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ فَقَالَا: صَدَقَ[٢].

---

(١) صحيح دون الحجتين وجمل أبي جهل. أخرجه الترمذي: ٨١٥.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨٦٢ و ١٨٦٣، والترمذي: ٩٤٠، والنسائي: ٢٨٦٠ و ٢٨٦١.




واتە: حەجاجی کوڕی عەمری ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک شوێنێکی شکا، یان تووشی شەلین بوو (وە بوو بەهۆی ئەوەی نەتوانێ واجبەکانی حەج جێبەجێ بکات)، ئەوە بێگومان با ئیحرامەکەی بشکێنێ و لەسەریەتی حەجێکی دیکە بکات (لە ساڵانی داهاتوودا). ڕاوی دەڵێ: ئەو فەرموودەیەم بۆ ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرە گێڕایەوە، ئەوانیش گوتیان: ڕاست دەکات.

**٣٠٧٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ رَافِعٍ ﷺ، مَوْلَى أُمِّ سَلَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ الْحَجَّاجَ بْنَ عَمْرٍو، عَنْ حَبْسِ الْمُحْرِمِ فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كُسِرَ أَوْ مَرِضَ أَوْ عَرَجَ، فَقَدْ حَلَّ، وَعَلَيْهِ الْحَجُّ مِنْ قَابِلٍ» قَالَ عِكْرِمَةُ: فَحَدَّثْتُ بِهِ ابْنَ عَبَّاسٍ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ فَقَالَا: صَدَقَ.[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ڕافیعی ﷺ خزمەتکاری ئوممو سەلەمە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پرسیارم لە حەجاجی کوڕی عەمر کرد دەربارەی کەسێک ڕێگرییەکی بێتە پێش لە کاتێکدا ئیحرامی بەستوە؟ ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک تووشی شکان، یان نەخۆشی، یان شەلین بوو، ئەوە با ئیحرام بشکێنێ و ساڵی داهاتوو لەسەریەتی حەجەکە دووبارە بکاتەوە (کە توانای هەبوو). عیکریمە گوتی: ئەم فەرموودەیەم بۆ ئیبنو عەبباس و ئەبو هورەیرە گێڕایەوە، ئەوانیش گوتیان: ڕاست دەکات.

## بابەت: فیدیەی کەسێک نەتوانێ بەردەوام بێ لە دروشمەکانی حەج

**٣٠٧٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَعْقِلٍ ﷺ، قَالَ: قَعَدْتُ إِلَى كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ فِي الْمَسْجِدِ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ﴿١٩٦﴾﴾ البقرة، قَالَ كَعْبٌ: فِيَّ أُنْزِلَتْ كَانَ بِي أَذًى مِنْ رَأْسِي، فَحُمِلْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهِي، فَقَالَ: «مَا كُنْتُ أُرَى الْجُهْدَ بَلَغَ بِكَ مَا أَرَى، أَتَجِدُ شَاةً؟» قُلْتُ: لَا، قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ﴿١٩٦﴾﴾ البقرة، قَالَ: «فَالصَّوْمُ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، وَالصَّدَقَةُ عَلَى سِتَّةِ مَسَاكِينَ، لِكُلِّ مِسْكِينٍ نِصْفُ صَاعٍ مِنْ طَعَامٍ، وَالنُّسُكُ شَاةٌ»[2].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨١٤، ومسلم: ١٢٠١، وأبو داود: ١٨٥٦_١٨٦٠، والترمذي: ٩٥٣ و ٢٩٧٣ و ٢٩٧٤، والنسائي: ٢٨٥١ و ٢٨٥٢.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەعقیل ﷺ دەڵێ: لە مزگەوت لەلای کەعبی کوڕی عوجرە دانیشتم، منیش دەربارەی ئەو ئایەتە پرسیارم لێکرد: ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ١٩٦﴾ البقرة، واتە: بریتیەک بدات کە ڕۆژووی (سێ ڕۆژە) یان خێرێک یان قوربانیەک بکات، واتە: ئەگەر کەسێک پێش ئەوە قوربانییەکەی بگاتە جێگەی خۆی، ویستی سەری بتاشێ، دەبێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ، یان خێرێک بکات (کە خۆراکی شەش هەژارە)، وە یان مەڕێک یان بزنێک بکاتە خێر هەر لەوێدا. کەعب دەڵێ: دەربارەی من ئەم ئایەتە دابەزی، سەرم ئازار و ئێشی هەبوو، چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەکاتێکدا کە ئەسپێ ی سەرم بەسەر دەم و چاومدا دەهاتنە خوار و بڵاودەبوونەوە، ئەویش فەرمووی: نەمزانیبوو کە ئەو ئازار و ناڕەحەتییەت پێ گەیشتووە کە ئێستا دەیبینم، ئایا مەڕێکت دەست دەکەوێ؟ گوتم: نەخێر، گوتی: ئنجا ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ١٩٦﴾ البقرة، گوتی: ڕۆژووەکان سێ ڕۆژوون، بەخشینەکە بۆ شەش هەژارە هەریەکی نیو صاع خواردن، قوربانییەکەش مەڕێکە.

٣٠٨٠- عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، قَالَ: «أَمَرَنِي النَّبِيُّ ﷺ، حِينَ آذَانِي الْقَمْلُ، أَنْ أَحْلِقَ رَأْسِي، وَأَصُومَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ أَوْ أُطْعِمَ سِتَّةَ مَسَاكِينَ، وَقَدْ عَلِمَ أَنْ لَيْسَ عِنْدِي مَا أَنْسُكُ»(١).

واتە: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ دەڵێ: ئەو کاتەی کە ئەسپێیەکانی سەرم ناڕەحەتیان کردبووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم سەرم بتاشم و، سێ ڕۆژ بەڕۆژووبم، یان خواردنی شەش هەژار بدەم، دەشیزانی هیچی ئاوام پێ نیە کە سەری ببڕم (لە ئاژەڵ).

## بابەت: کەڵەشاخ گرتنی کەسێک کە لە ئیحرامدا بێت

٣٠٨١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «احْتَجَمَ، وَهُوَ صَائِمٌ مُحْرِمٌ»(٢).

---

(١) حسن. أخرجه البخاري: ١٨١٤، ومسلم: ١٢٠١، وأبو داود: ١٨٥٦_١٨٦٠، والترمذي: ٩٥٣ و ٢٩٧٣ و ٢٩٧٤، والنسائي: ٢٨٥١ و ٢٨٥٢

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٣٧٣، والترمذي: ٧٧٥ و ٧٧٧. وانظر: البخاري: ١٩٣٨، ومسلم: ١٢٠٢، وأبو داود: ١٨٣٥ و ١٨٣٦، والترمذي: ٨٣٩، والنسائي: ٢٨٤٥_٢٨٤٧.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵەشاخی کردوە لەکاتێکدا کە بەڕۆژوو بووە و لە ئیحرامدا بووە.

**٣٠٨٢-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «احْتَجَمَ، وَهُوَ مُحْرِمٌ عَنْ رَهْصَةٍ أَخَذَتْهُ»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخی گرتووە لە خۆی لەبەر ئازارێک کە بەهۆی خلیسکانەوە تووشی هاتووە و لە ئیحرامیشدا بووە.

## بابەت: ئەو شتەی کەسی ئیحرام بەستوو سەری پێ چەور دەکات

**٣٠٨٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «كَانَ يَدَّهِنُ رَأْسَهُ بِالزَّيْتِ، وَهُوَ مُحْرِمٌ، غَيْرَ الْمُقَتَّتِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ئیحرامدا سەری بە ڕۆنی زەیتون چەور دەکرد، بەبێ بۆنی خۆش.

## بابەت: ئەو کەسەی ئیحرامی بەستووە و دەمرێ

**٣٠٨٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا أَوْقَصَتْهُ رَاحِلَتُهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ، وَلَا تُخَمِّرُوا وَجْهَهُ وَلَا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا» حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، مِثْلَهُ إِلَّا أَنَّهُ قَالَ أَعْقَصَتْهُ رَاحِلَتُهُ وَقَالَ: «لَا تُقَرِّبُوهُ طِيبًا، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک بە هۆی وڵاخەکەیەوە ملی شکاو مرد، لە کاتێکدا کە لە ئیحرامدا بوو، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە ئاوو سیدر بیشۆن و، لە دوو پارچە پۆشاکەکەی خۆیدا کفنی بکەن و، سەر و ڕوخساری دامەپۆشن، چونکە بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا بە ئیحرامەوە هەڵدەستێتەوە و تەلبیە دەکات.

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٨٤٨.

(٢) ضعيف الإسناد. أخرجه الترمذي: ٩٦٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٦٥، ومسلم: ١٢٠٦، وأبو داود: ٣٢٣٨ و ٣٢٤١، والترمذي: ٩٥١، والنسائي: ١٩٠٤ و ٢٨٥٤_٢٨٥٨.

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا ئەوەش هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆنی خۆشی لێ مەدەن، چونکە لە ڕۆژی قیامەت بە ئیحرامەوە زیندوو دەبێتەوە و تەلبیە دەکات.

**٣٠٨٤م-** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، مِثْلَهُ إِلَّا أَنَّهُ قَالَ أَعْقَصَتْهُ رَاحِلَتُهُ وَقَالَ: «لَا تُقَرِّبُوهُ طِيبًا، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا»[١].

واتە: (لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا ئەوەش هاتووە) کە وڵاخەی خستییە خوارەوەو ملی شکا و مرد، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆنی خۆشی لێ مەدەن، چونکە لە ڕۆژی قیامەت زیندوو دەبێتەوەو تەلبیە دەکات.

## بابەت: فیدیەی ئەو شتانەی کە لە ئیحرامدا ڕاویان بکەن

**٣٠٨٥-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الضَّبُعِ يُصِيبُهُ الْمُحْرِمُ، كَبْشًا، وَجَعَلَهُ مِنَ الصَّيْدِ»[٢].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەرانبەر بە کەمتیارێک کە کەسێک لە ئیحرامدا ڕاوی بکات بەرانێکی بە فیدیە داناوەو لە نێچیرەکانیش هەژماری کردوە.

**٣٠٨٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فِي بَيْضِ النَّعَامِ، يُصِيبُهُ الْمُحْرِمُ، ثَمَنُهُ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک لە ئیحرامدا بێت و هێلکەیەکی نەعامە بشکێنێ، یان بە هەر جۆرێک بیفەوتێنێ، ئەوە نرخەکەی دەکەوێتە سەر کە بە فیدیە بیدات.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٦٥، ومسلم: ١٢٠٦، وأبو داود: ٣٢٣٨ و ٣٢٤١، والترمذي: ٩٥١، والنسائي: ١٩٠٤ و ٢٨٥٤_٢٨٥٨.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٠١، والترمذي: ٨٥١ و ١٧٩٢، والنسائي: ٢٨٣٦ و ٤٣٢٣.

(٣) ضعيف.





## بابەت: ئەو شتانەی کە لە ئیحرامیشدا دەکوژرێن

**٣٠٨٧**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «خَمْسٌ فَوَاسِقُ، يُقْتَلْنَ فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ: الْحَيَّةُ، وَالْغُرَابُ الْأَبْقَعُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ، وَالْحِدَأَةُ»(١).

**واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پێنج ژیانداری بەدکار هەن کە لەناو حەرەم و دەرەوەی حەرەمیشدا دەبێ بکوژرێن: مار و قەلەڕەش و مشک و سەگی هارو کۆلارە (سوورە داڵ).**

**٣٠٨٨**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ، لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ قَتَلَهُنَّ - أَوْ قَالَ فِي قَتْلِهِنَّ - وَهُوَ حَرَامٌ: الْعَقْرَبُ، وَالْغُرَابُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ»(٢).

**واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج ژیاندار هەن لەسەر کوشتنەکەیان (کوژەر) گوناهی نیە، یان فەرمووی: کە کوشتنیان گوناهی نیە لە کاتی ئیحرامیشدابێ: دووپشک و قەلەڕەش و کۆلارەو مشک و سەگی هار.**

**٣٠٨٩**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «يَقْتُلُ الْمُحْرِمُ، الْحَيَّةَ، وَالْعَقْرَبَ، وَالسَّبُعَ الْعَادِيَ، وَالْكَلْبَ الْعَقُورَ، وَالْفَأْرَةَ الْفُوَيْسِقَةَ» فَقِيلَ لَهُ: لِمَ قِيلَ لَهَا الْفُوَيْسِقَةُ؟ قَالَ: لِأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَيْقَظَ لَهَا، وَقَدْ أَخَذَتِ الْفَتِيلَةَ، لِتُحْرِقَ بِهَا الْبَيْتَ(٣).

**واتە: ئەبو سەعید ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەسێک کە لە ئیحرامدا بێ بۆی هەیە مار و دووپشک و دڕندە و سەگی هار و مشکی بەدکار بکوژێت، پێی گوترا: بۆچی پێی گوت: بەدکار؟ ڕاوی دەڵێ: چونکە کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاگا هاتووە مشک خۆی لە فەتیلەکە داوەو خەریک بووە ماڵەکە بسوتێنێ.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٢٩، ومسلم: ١١٩٨، والترمذي: ٨٣٨، والنسائي: ٢٨٨١ و ٢٨٨٢ و ٢٨٨٧ و ٢٨٩١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣١٥، ومسلم: ١١٩٩، وأبو داود: ١٨٤٦، والنسائي: ٢٨٢٨ و ٢٨٣٠ و ٢٨٣٢_٢٨٣٥.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٨٤٨، والترمذي: ٨٣٨.




## بابەت: ئەو نێچیرانەی قەدەغە کراون لە ئیحرام پۆش

**٣٠٩٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ، قَالَ: أَنْبَأَنَا صَعْبُ بْنُ جَثَّامَةَ، قَالَ: مَرَّ بِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا بِالْأَبْوَاءِ، أَوْ بِوَدَّانَ، فَأَهْدَيْتُ لَهُ حِمَارَ وَحْشٍ، فَرَدَّهُ عَلَيَّ، فَلَمَّا رَأَى فِي وَجْهِيَ الْكَرَاهِيَةَ قَالَ: «إِنَّهُ لَيْسَ بِنَا رَدٌّ عَلَيْكَ، وَلَكِنَّا حُرُمٌ»[١].

**واتە:** ئیبنو عەبباس ﭭ دەڵێ: صەعبی کوڕی جەسامە هەواڵی پێداین و گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای مندا تێپەڕی کە لە «الأبواء» یان «وَدَّان» بووم (کە شوێنێکە)، منیش کەرەکێوییەکم پێبەخشی، ئەویش بۆی گێڕامەوەو وەرینەگرت، جا کاتێک بینی نیگەرانی بە ڕوخسارمەوە دیارە فەرمووی: لەڕاستیدا بۆمان نیە ڕەتی بکەینەوە بۆت، بەڵام ئێمە لە ئیحرامداین.

**٣٠٩١-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﭬ، قَالَ: «أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِلَحْمِ صَيْدٍ، وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَلَمْ يَأْكُلْهُ»[٢].

**واتە:** عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﭬ دەڵێ: گۆشتی نێچیرێکیان هێنا بۆ پێغەمبەرﷺ، ئەو کاتە لە ئیحرامدا بوو، بۆیە لێی نەخوارد.

## بابەت: ڕێگەپێدان بۆ خواردنی نێچیری ڕاوکراو بە مەرجێک بۆ ئەو ڕاونەکرابێ

**٣٠٩٢-** عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ ﭬ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «أَعْطَاهُ حِمَارَ وَحْشٍ، وَأَمَرَهُ أَنْ يُفَرِّقَهُ فِي الرِّفَاقِ، وَهُمْ مُحْرِمُونَ»[٣].

**واتە:** تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کەرەکێوییەکی پێداوەو فەرمانی پێکردوە کە لە نێو هاوەڵەکانیدا دابەشی بکات، لە کاتێکدا کە ئەوان لە ئیحرامدا بوون.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٢٥، ومسلم: ١١٩٣، والترمذي: ٨٤٩، والنسائي: ٢٨١٩ و ٢٨٢٠ و ٢٨٢٣.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح.




٣٠٩٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ، فَأَحْرَمَ أَصْحَابُهُ، وَلَمْ أُحْرِمْ، فَرَأَيْتُ حِمَارًا، فَحَمَلْتُ عَلَيْهِ وَاصْطَدْتُهُ، فَذَكَرْتُ شَأْنَهُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَذَكَرْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ أَحْرَمْتُ، وَأَنِّي إِنَّمَا اصْطَدْتُهُ لَكَ، «فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَصْحَابَهُ أَنْ يَأْكُلُوهُ، وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ، حِينَ أَخْبَرْتُهُ أَنِّي اصْطَدْتُهُ لَهُ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە کاتی ڕێککەوتنی حودەیبیەدا لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتم، جا هاوەڵەکانی ئیحرامیان بەست و من ئیحرامم نەبەست، ئنجا کەرەکێوییەکم بینی و بۆی چووم و ڕاوم کرد، جا باس و خواسەکەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوەو بۆشیم باسکرد کە من ئیحرامم نەبەستووە، وە بێگومان من بۆ تۆ ڕاوم کردوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە هاوەڵانی کرد کە بیخۆن و بۆخۆی لێی نەخوارد کاتێک پێمگوت: بۆ تۆ ڕاوم کردوە.

## بابەت: نیشانە کردنی ئاژەڵی قوربانی

٣٠٩٤- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، وَعَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُهْدِي مِنَ الْمَدِينَةِ، فَأَفْتِلُ قَلَائِدَ هَدْيِهِ، ثُمَّ لَا يَجْتَنِبُ شَيْئًا، مِمَّا يَجْتَنِبُ الْمُحْرِمُ»[2].

واتە: عوروەی کوڕی زوبەیر و عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەگێڕنەوە، کە عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە ئاژەڵی قوربانی دیاری کرد، منیش ئاڵقە و ملوانەکەی هەدیەکانم دەهۆنیەوە، پاشان لە هیچ شتێک خۆی بەدوور نەدەگرت کە کەسی ئیحرام پۆش خۆی لێ بەدوور دەگرێت.

٣٠٩٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: «كُنْتُ أَفْتِلُ الْقَلَائِدَ، لِهَدْيِ النَّبِيِّ ﷺ، فَيُقَلِّدُ هَدْيَهُ، ثُمَّ يَبْعَثُ بِهِ، ثُمَّ يُقِيمُ لَا يَجْتَنِبُ شَيْئًا، مِمَّا يَجْتَنِبُهُ الْمُحْرِمُ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٢١، ومسلم: ١١٩٦، وأبو داود: ١٨٥٢، والترمذي: ٨٤٧، والنسائي: ٢٨١٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٩٦، ومسلم: ١٣٢١، وأبو داود: ١٧٥٧_١٧٥٩، والترمذي: ٩٠٨، والنسائي: ٢٧٧٥_٢٧٨٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٠٢، ومسلم: ١٣٢١، والترمذي: ٩٠٩، والنسائي: ٢٧٧٥ و ٢٧٧٦.





واتە: عائیشەی ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: من خۆم ملوانکەی ئاژەڵە دیاریکراوەکانی پێغەمبەری خوام ﷺ دەهۆنیەوەو نیشانە دەکردن، پاشان دەیناردن (بۆ مەککە)، پاشان دەمایەوەو لە هیچ شتێک خۆی بەدوور نەدەگرت، کە کەسی ئیحرام پۆش خۆی لێ بەدوور دەگرێ (ئیحرامی نەدەبەست).

## بابەت: نیشانەکردنی مەڕ و بزن

٣٠٩٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «أَهْدَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَرَّةً غَنَمًا إِلَى الْبَيْتِ فَقَلَّدَهَا»[1].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: جارێک پێغەمبەری خوا ﷺ مەڕێکی کردە دیاری بۆ قوربانی جا نیشانەی کرد.

## بابەت: نیشانەکردنی وشتر

٣٠٩٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «أَشْعَرَ الْهَدْيَ فِي السَّنَامِ الْأَيْمَنِ، وَأَمَاطَ عَنْهُ الدَّمَ» وَقَالَ عَلِيٌّ فِي حَدِيثِهِ: بِذِي الْحُلَيْفَةِ، وَقَلَّدَ نَعْلَيْنِ[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ وشترێکی قوربانی نیشانەکرد بە شێوەی برین کە بە تیغێک لای ڕاستی کۆپارەکەی بڕی و خوێنەکەی لابرد، عەلی لە گێڕانەوەکەیدا گوتی: لە «ذو الحليفة» بوو، دوو نەعلیشی کردە ملی وشترەکە.

٣٠٩٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «قَلَّدَ، وَأَشْعَرَ وَأَرْسَلَ بِهَا، وَلَمْ يَجْتَنِبْ، مَا يَجْتَنِبُ الْمُحْرِمُ»[3].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ وشترێکی نیشانەکردو برینی کردو ناردی، وە لە هیچ لەو شتانە خۆی نەدەپاراست، کە کەسی ئیحرام پۆش خۆی لێ دەپارێزێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٠١_١٧٠٣، ومسلم: ١٣٢١، وأبو داود: ١٧٥٥، والترمذي: ٩٠٩، والنسائي: ٢٧٨٥ و ٢٧٨٧ و ٢٧٨٩.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٤٣، وأبو داود: ١٧٥٢، والترمذي: ٩٠٦، والنسائي: ٢٧٧٣ و ٢٧٧٤ و ٢٧٨٢ و ٢٧٩١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٩٦، ومسلم: ١٣٢١، وأبو داود: ١٧٥٧_١٧٥٩، والترمذي: ٩٠٨، والنسائي: ٢٧٧٥_٢٧٨٠.

## بابەت: دابەشكردنی گۆشتی وشتری قوربانی

**٣٠٩٩-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ، وَأَنْ أَقْسِمَ جِلَالَهَا وَجُلُودَهَا، وَأَنْ لَا أُعْطِيَ الْجَازِرَ مِنْهَا شَيْئًا، وَقَالَ: «نَحْنُ نُعْطِيهِ»[١].

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردم کە من هەڵسم بە ئەنجامدانی قوربانیەکەی، داپۆشەری وشترەکە و گۆشت و پێستەکەشی دابەش بکەم، وە هیچ شتێک (وەک کرێ) لە وشترەکە نەدەم بە قەسابەکە و فەرمووی: ئێمە خۆمان (کرێی) دەیدەینێ.**

## بابەت: قوربانی ئاژەڵی نێر و مێ

**٣١٠٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «أَهْدَى فِي بُدْنِهِ، جَمَلًا لِأَبِي جَهْلٍ، بُرَتُهُ مِنْ فِضَّةٍ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەو وشترانەی بۆ قوربانی دیاری کردبوون، وشترێکی نێری تێدابوو هی ئەبو جەهل بوو، ئاڵقەکەی لە زیو بوو.**

**٣١٠١-** عَنْ إِيَاسِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ فِي بُدْنِهِ جَمَلٌ»[٣].

**واتە: ئیباسی کوڕی سەلەمە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، وشترەکانی پێغەمبەر ﷺ (کە بۆ قوربانی دیاری کردبوون) وشتری نێری تێدابوو.**

## بابەت: دیاری قوربانی لە غەیری میقاتیشەوە دەهێنرێ

**٣١٠٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «اشْتَرَى هَدْيَهُ، مِنْ قُدَيْدٍ»[٤].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دیاری قوربانی لە قودەید کڕی (کە دەکەوێتە نێوان مەککە و مەدینە).**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٠٧، ومسلم: ١٣١٧، وأبو داود: ١٧٦٩.

(٢) حسن بطرقة. أخرجه أبو داود: ١٧٤٩.

(٣) حسن بما قبله.

(٤) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٩٠٧.

## بابەت: سواربوونی وشتری دیاریکراو بۆ قوربانی

٣١٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى رَجُلًا يَسُوقُ بَدَنَةً فَقَالَ: «ارْكَبْهَا» قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ قَالَ: «ارْكَبْهَا وَيْحَكَ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی وشتری قوربانی پێ بوو لێی دەخوڕی، بۆیە پێی فەرموو: سواری وشترەکە ببە، گوتی: ئاخر ئەوە وشتری قوربانییە، فەرمووی: سواری بە بەستە زمان.

**ویح:** ئەو وشەیە زۆر جار بۆ بەزەیی پێدا هاتنەوە بەکاردێ، دەگوترێ: بە مانای (ویل) یش دێ، (ویل) واتە: سزا و ئازار.

٣١٠٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مُرَّ عَلَيْهِ بِبَدَنَةٍ فَقَالَ: «ارْكَبْهَا» قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ قَالَ: «ارْكَبْهَا» قَالَ: فَرَأَيْتُهُ رَاكِبَهَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فِي عُنُقِهَا نَعْلٌ(٢).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، کەسێک بە وشتری قوربانییەوە بەلای پێغەمبەردا ﷺ ڕەت بوو، جا فەرمووی: سواری وشترەکە بە، گوتی: ئەوە وشتری قوربانییە، فەرمووی: سواری بە، دەڵێ: جا بینیم کە سواری وشترەکە بوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، کە وشترەکە نەعلێکی لە مل بوو.

## بابەت: وشتری قوربانی کاتێک کە پەکی دەکەوێ

٣١٠٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ ذُؤَيْبًا الْخُزَاعِيَّ، حَدَّثَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَبْعَثُ مَعَهُ، بِالْبُدْنِ، ثُمَّ يَقُولُ: «إِذَا عَطِبَ مِنْهَا شَيْءٌ، فَخَشِيتَ عَلَيْهِ مَوْتًا، فَانْحَرْهَا، ثُمَّ اغْمِسْ نَعْلَهَا فِي دَمِهَا، ثُمَّ اضْرِبْ صَفْحَتَهَا، وَلَا تَطْعَمْ مِنْهَا، أَنْتَ وَلَا أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ رُفْقَتِكَ»(٣).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، زوئەیبی خوزاعی گێڕاویەتەوە، پێغەمبەر ﷺ وشتری قوربانی پێدا دەنارد و دەیفەرموو: هەر یەکێکیان پەکی کەوت و ترست لێی هەبوو بمرێ ئەوە بیکوژەوە، پاشان ئەو نەعلەی کە بۆ نیشانە لە ملی کراوە لە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٨٩، ومسلم: ١٣٢٢، وأبو داود: ١٧٦٠، والنسائي: ٣٧٩٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٩٠، ومسلم: ١٣٢٣، والترمذي: ٩١١، والنسائي: ٢٨٠٠ و ٢٨٠١.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٢٦.

خوێنەکەیدا نقومی بکە، پاشان بە لاملی یان لایەکی کۆپارەی وشترەکەیدا بێنە (تا خەڵکی بزانن وشتری قوربانییە و لێی بخۆن)، خۆت و هاوەڵەکانت لێی مەخۆن.

**٣١٠٦-** عَنْ نَاجِيَةَ الْخُزَاعِيِّ ﷺ - قَالَ عَمْرٌو فِي حَدِيثِهِ: وَكَانَ صَاحِبَ بُدْنِ النَّبِيِّ ﷺ - قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ أَصْنَعُ بِمَا عَطِبَ مِنَ الْبُدْنِ؟ قَالَ: «انْحَرْهُ، وَاغْمِسْ نَعْلَهُ فِي دَمِهِ، ثُمَّ اضْرِبْ صَفْحَتَهُ، وَخَلِّ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّاسِ، فَلْيَأْكُلُوهُ»[١].

**واتە: ناجیەی خوزاعیی ﷺ دەگێڕێتەوە، عەمرۆ لە گێڕانەوەکەیدا گوتوویەتی: کە لەگەڵ وشترەکانی پێغەمبەر ﷺ بوو کە بۆ قوربانی دەبردن، گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو وشترەی کە پەکی کەوت چی لێ بکەم؟ فەرمووی: بیکوژەوە و نەعلی نیشانەکەی لە خوێنەکەیدا نقوم بکە، پاشان خوێنی نەعلەکە لە لاملی وشترەکە بدە و لێی بگەڕێ بۆ خەڵکی، با لێی بخۆن.**

## بابەت: کرێی خانووەکانی مەککە

**٣١٠٧-** عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ نَضْلَةَ ﷺ، قَالَ: «تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَمَا تُدْعَى رِبَاعُ مَكَّةَ، إِلَّا السَّوَائِبَ، مَنِ احْتَاجَ سَكَنَ، وَمَنِ اسْتَغْنَى أَسْكَنَ»[٢].

**واتە: عەلقەمەی کوڕی نەزلە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر ﷺ و عومەر ﷺ وەفاتیان کرد خانو و زەوی مەککە بۆ ئەو کەسە بوو کە بەکاری بێنێ بۆ حەوانەوە، جا هەر کەس پێویستی پێی هەبووایە لە خانووەکەدا دەمایەوە، ئەوەی دەوڵەمەندیش بووایە و ئیشی پێ نەبووایە بەبێ کرێ دەیدا بە خەڵکی.**

## بابەت: گەورەیی مەککە

**٣١٠٨-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مُسْلِمٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَدِيِّ بْنِ الْحَمْرَاءِ، قَالَ لَهُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ عَلَى نَاقَتِهِ، وَاقِفٌ بِالْحَزْوَرَةِ يَقُولُ: «وَاللَّهِ إِنَّكِ، لَخَيْرُ أَرْضِ اللَّهِ، وَأَحَبُّ أَرْضِ اللَّهِ إِلَيَّ، وَاللَّهِ لَوْلَا أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ، مَا خَرَجْتُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٦٢، والترمذي: ٩١٠.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٩٢٥.

واتە: موحەممەدی کوڕی موسلیم ﷺ دەڵێ: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف هەواڵی پێداوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەدی کوڕی حەمراء پێی گوتووە: بینیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە سواری وشترەکەیەوە لە حەزوەرە (شوێنێکە لە مەککە) ڕاوەستابو و، دەیفەرموو: سوێند بە خوا (ئەی مەککە) گومانی تێدانیە کە باشترین زەوی خوای، وە خۆشەویستترین زەوی خوای لەلای من، سوێند بە خوا ئەگەر دەرنەکرابام ئەوە هەرگیز نەدەڕۆیشتم (بەجێم نەدەهێشتی).

٣١٠٩- عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ ﵂، قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ عَامَ الْفَتْحِ، فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ مَكَّةَ، يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ، فَهِيَ حَرَامٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، لَا يُعْضَدُ شَجَرُهَا، وَلَا يُنَفَّرُ صَيْدُهَا، وَلَا يَأْخُذُ لُقَطَتَهَا إِلَّا مُنْشِدٌ» فَقَالَ الْعَبَّاسُ: إِلَّا الْإِذْخِرَ، فَإِنَّهُ لِلْبُيُوتِ وَالْقُبُورِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِلَّا الْإِذْخِرَ»[١].

واتە: صەفیەی کچی شەیبە ﵂ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا لە ساڵی ڕزگارکردنی مەککەدا گوێم لێبوو کە فەرمووی: ئەی خەڵکینە، خوا ڕێز و قەدری داناوە بۆ مەککە هەر لەو ڕۆژەیەوە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوە، جا مەککە خاوەنی ڕێزە و نابێ ڕێزی بشکێنرێ و حەرامە هەتا ڕۆژی قیامەت، دار و درەخت و ڕووەکی نابێ ببڕن و نابێ نێچیر و باڵندەکانی ڕاوبکرێن و ڕاوبنرێن، وە نابێ شتی ونبووی هەڵبگیرێتەوە مەگەر کەسێک بانگەوازی بۆ بکات، جا عەبباس گوتی: تەنها ڕووەکی «الإذخر» نەبێ، چونکە بێگومان ئەو ڕووەکە (بۆنی خۆشە و) بۆ سەقفی خانو و و گۆڕەکان بەکاری دێنن، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تەنها «الإذخر» نەبێ (کە هەڵکەندن و بەکارهێنانی دروستە بۆ پێویستی).

٣١١٠- عَنْ عَيَّاشِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ الْمَخْزُومِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَزَالُ هَذِهِ الْأُمَّةُ بِخَيْرٍ، مَا عَظَّمُوا هَذِهِ الْحُرْمَةَ، حَقَّ تَعْظِيمِهَا، فَإِذَا ضَيَّعُوا ذَلِكَ، هَلَكُوا»[٢].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) ضعيف.





واتە: عەیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعەی مەخزومیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە بەردەوامی ئەو ئوممەتە لەسەر خێر و چاکە دەمێنێتەوە هەتاکو ڕێز و حورمەتی مەککە وەکو پێویست بگرن، جا هەرکات ئەو ڕێز و حورمەتەیان بەزایەدا ئەوە بەرەو لەناوچوون دەچن.

## بابەت: گەورەیی مەدینە

٣١١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْإِيمَانَ لَيَأْرِزُ إِلَى الْمَدِينَةِ، كَمَا تَأْرِزُ الْحَيَّةُ إِلَى جُحْرِهَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئیمان و ئیسلام دەکشێتەوەو دەچێتەوە ناو مەدینە هەروەکو چۆن مار (ئەگەر تینی بۆ هات) دەچێتەوە ناو کونەکەیەوە پێچ دەخوات.

٣١١٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَمُوتَ بِالْمَدِينَةِ، فَلْيَفْعَلْ، فَإِنِّي أَشْهَدُ لِمَنْ مَاتَ بِهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە ئێوە ئەگەر توانای هەبوو با لە مەدینە بمێنێتەوە تاکو دەمرێ لێی دەرنەچێ، چونکە شاهێدی (بە چاکە) بۆ ئەو کەسانە دەدەم کە لە مەدینەدا دەمرن.

٣١١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلُكَ وَنَبِيُّكَ، وَإِنَّكَ حَرَّمْتَ مَكَّةَ عَلَى لِسَانِ إِبْرَاهِيمَ، اللَّهُمَّ وَأَنَا عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَإِنِّي أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا» قَالَ أَبُو مَرْوَانَ: لَابَتَيْهَا، حَرَّتَيِ الْمَدِينَةِ[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٧٦، ومسلم: ١٤٧.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٩١٧.

(٣) حسن. أخرجه مسلم: ١٣٧٣ بنحوه.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خودایە بێگومان ئیبراهیم ﷺ خۆشەویست و پێغەمبەری تۆیە، وە بێگومان تۆ مەککەت ڕێزدارکرد لەسەر زمانی ئیبراهیم، خودایە دەسا منیش بەندە و پێغەمبەری تۆم، بێگومان منیش ئەوەی لەملا ولای مەدینە دایە ڕێزداری دەکەم و ڕێزی دەگرم و حەرامی دەکەم.

**٣١١٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَرَادَ أَهْلَ الْمَدِينَةِ بِسُوءٍ، أَذَابَهُ اللَّهُ، كَمَا يَذُوبُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بیەوێ کە خراپە بەرانبەر بە خەڵکی مەدینە بکات، ئەوە خوا بیتوێنێتەوەو، لەناوی بەرێ هەروەکو چۆن خوێ لەناو ئاودا دەتوێتەوە.

**٣١١٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مِكْنَفٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أُحُدًا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ، وَهُوَ عَلَى تُرْعَةٍ مِنْ تُرَعِ الْجَنَّةِ، وَعَيْرٌ عَلَى تُرْعَةٍ مِنْ تُرَعِ النَّارِ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی میکنەف ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ بوو کە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئوحود کێوێکە ئێمەی خۆشدەوێ و ئێمەش خۆشمان دەوێ، وە ئوحود باغێکە لە باغەکانی بەهەشت، وە کێوی عەیر پارچەیەکە لە پارچەکانی دۆزەخ.

## بابەت: ماڵ و سامانی کەعبە

**٣١١٦-** عَنْ شَقِيقٍ ﷺ، قَالَ: بَعَثَ رَجُلٌ مَعِيَ بِدَرَاهِمَ هَدِيَّةً إِلَى الْبَيْتِ، قَالَ: فَدَخَلْتُ الْبَيْتَ وَشَيْبَةُ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ، فَنَاوَلْتُهُ إِيَّاهَا، فَقَالَ: أَلَكَ هَذِهِ؟ قُلْتُ: لَا، وَلَوْ كَانَتْ لِي، لَمْ آتِكَ بِهَا، قَالَ: أَمَا لَئِنْ قُلْتَ ذَلِكَ، لَقَدْ جَلَسَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ مَجْلِسَكَ الَّذِي جَلَسْتَ فِيهِ، فَقَالَ: «لَا أَخْرُجُ، حَتَّى أَقْسِمَ مَالَ الْكَعْبَةِ بَيْنَ فُقَرَاءِ الْمُسْلِمِينَ» قُلْتُ: مَا أَنْتَ فَاعِلٌ، قَالَ: لَأَفْعَلَنَّ، قَالَ: وَلِمَ ذَاكَ؟ قُلْتُ: «لِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ رَأَى مَكَانَهُ، وَأَبُو بَكْرٍ وَهُمَا أَحْوَجُ مِنْكَ إِلَى الْمَالِ، فَلَمْ يُحَرِّكَاهُ، فَقَامَ كَمَا هُوَ، فَخَرَجَ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٨٦.

(٢) ضعيف جداً ماعدا «إِنَّ أُحُدًا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ» فهي صحيحة. أخرجه البخاري: ٢٨٨٩، ومسلم: ١٣٩٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٩٤، وأبو داود: ٢٠٣١.

واتە: شەقیق ﷺ دەڵێ: پیاوێک هەندێک درهەمی بە دیاری پێدا ناردم بۆ کەعبە، منیش چوومە ناو کەعبە لەوکاتەدا شەیبە لەسەر کورسییەک دانیشتبوو، منیش درهەمەکانم پێدا، ئەویش پێی گوتم: ئەو درهەمانە هی خۆتن؟ گوتم: نەخێر، خۆ ئەگەر هی خۆم بوونایە بۆ تۆم نەدەهێنان، گوتی: ئەگەر ئاوات بگوتبا، بێگومان عومەری کوڕی خەتتاب لەو شوێنە دانیشتبوو کە تۆ لێی دانیشتووی، جا گوتی: لە کەعبە ناچمە دەر هەتاکو ماڵ و سامانی ناو کەعبە بەسەر هەژارانی مسوڵمانانندا دابەش نەکەم، گوتم: تۆ ئەو کارە ناکەی، گوتی: بێگومان دەیکەم، بۆچی ئەوە دەڵێی؟ گوتم: چونکە بێگومان پێغەمبەر ﷺ شوێنی ئەو ماڵ و سامانەی زانیوە هەروەها ئەبو بەکریش، وە ئەوانیش لە تۆ زیاتر پێویستییان پێی بووە، بەڵام نەشیان جوڵاندووە لە شوێنی خۆی، ئەویش وەکو خۆی هەڵساو چووە دەرێ.

## بابەت: ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان لە مەککەدا

**٣١١٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَدْرَكَ رَمَضَانَ بِمَكَّةَ، فَصَامَهُ، وَقَامَ مِنْهُ مَا تَيَسَّرَ لَهُ، كَتَبَ اللَّهُ لَهُ مِائَةَ أَلْفِ شَهْرِ رَمَضَانَ، فِيمَا سِوَاهَا، وَكَتَبَ اللَّهُ لَهُ، بِكُلِّ يَوْمٍ عِتْقَ رَقَبَةٍ، وَكُلِّ لَيْلَةٍ عِتْقَ رَقَبَةٍ، وَكُلِّ يَوْمٍ حُمْلَانَ فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَفِي كُلِّ يَوْمٍ حَسَنَةً، وَفِي كُلِّ لَيْلَةٍ حَسَنَةً»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە مەککە بێت و ڕەمەزانی بەسەردا بێت و بەڕۆژوو بێت و ئەوەندەی بۆی کرا شەوەکانی زیندوو بکاتەوە، ئەوە خوا پاداشتی سەد هەزار مانگی ڕەمەزانی بۆ دەنوسێ لە غەیری ئەو ڕەمەزانەی ناو مەککە، وە خوا بۆ هەر ڕۆژێک پاداشتی ئازادکردنی کۆیلەیەکی بۆ دەنوسێ، بۆ هەر شەوێک پاداشتی ئازادکردنی کۆیلەیەکی بۆ دەنوسێ، بۆ هەر ڕۆژێک پاداشتی دوو باری ئەسپ لە خێر لە پێناو خوادا بۆ دەنوسرێ، وە لە هەر ڕۆژێک چاکەیەکی بۆ دەنوسرێ و بۆ هەر شەوێکیش چاکەیەک.

---

(١) ضعيف.

## بابەت: تەواف لە باراندا

**٣١١٨-** عَنْ دَاوُدُ بْنُ عَجْلَانَ ﷺ، قَالَ: طُفْنَا مَعَ أَبِي عِقَالٍ، فِي مَطَرٍ، فَلَمَّا قَضَيْنَا طَوَافَنَا، أَتَيْنَا خَلْفَ الْمَقَامِ، فَقَالَ: طُفْتُ مَعَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ فِي مَطَرٍ، فَلَمَّا قَضَيْنَا الطَّوَافَ، أَتَيْنَا الْمَقَامَ، فَصَلَّيْنَا رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ لَنَا أَنَسٌ: «ائْتَنِفُوا الْعَمَلَ، فَقَدْ غُفِرَ لَكُمْ، هَكَذَا قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَطُفْنَا مَعَهُ فِي مَطَرٍ»[1].

**واتە:** داودی کوڕی عەجلان ﷺ دەڵێ: لەگەڵ ئەبو عیقال لە بارانەدا تەوافمان کرد، جا کاتێک لە تەوافەکە بووینەوە هاتینە پشتی مەقام، جا گوتی: لەگەڵ ئەنەسی کوڕی مالیک لە بارانەدا تەوافم کرد، جا کاتێک لە تەواف بووینەوە هاتینە لای مەقام دوو ڕکات نوێژمان کرد، ئەنەس گوتی: لەسەرەتاوە دەست بە کار وکردەوە بکەنەوە، بێگومان خوا لێتان خۆش بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئا بەو شێوەیە بە ئێمەی فەرموو، کاتێک کە لە بارانەدا لە خزمەت ئەودا تەوافمان کرد.

## بابەت: حەج کردن بە پیادە

**٣١١٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: حَجَّ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ مُشَاةً مِنَ الْمَدِينَةِ، إِلَى مَكَّةَ وَقَالَ: «ارْبُطُوا أَوْسَاطَكُمْ بِأُزُرِكُمْ، وَمَشَى خِلْطَ الْهَرْوَلَةِ»[2].

**واتە:** ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی بە پیادە حەجیان کرد لە مەدینەوە بۆ مەککە و فەرمووی: خۆتان بە پۆشاکەکانتان توند بکەن (پشتێن ببەستن)، بە ڕۆیشتنێک ڕۆیشت کە تێکەڵ بوو لە ڕۆیشتنی خێرا و ئاسایی.



---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

## بابەت: قوربانییەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ

**٣١٢٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، وَيُسَمِّي، وَيُكَبِّرُ، وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَذْبَحُ بِيَدِهِ وَاضِعًا قَدَمَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا»[١].

**واتە:** ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەرانی سپی و کەمێک ڕەش و شاخداری دەکردە قوربانی و ناوی خوای لێ دێنان و «الله أکبر»ـی دەکرد، وە بێگومان دیتومە کە بە دەستی خۆی سەری دەبڕین و پێی لەسەر لاملی قوربانییەکە دادەنا (لە کاتی کوشتنەوەدا).

**٣١٢١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: ضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ عِيدٍ، بِكَبْشَيْنِ فَقَالَ: حِينَ وَجَّهَهُمَا «إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا، وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلَاتِي، وَنُسُكِي، وَمَحْيَايَ، وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لَا شَرِيكَ لَهُ، وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ، وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ، اللَّهُمَّ مِنْكَ، وَلَكَ عَنْ مُحَمَّدٍ وَأُمَّتِهِ»[٢].

**واتە:** جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی جەژنی قورباندا پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوو بەران قوربانی کردو لەکاتی سەربڕینیاندا فەرمووی: دڵنیابن وا من ڕوومکردە ڕووی پیرۆزی ئەو زاتە کە ئاسمانەکان و زەویی بەدیهێناوە، لە هەموو شیرک و کارێکی پڕو پووچ و بەتاڵیش لامداو ڕووم تەنها لە زاتی پاکی بێخەوشی ئەو کرد، وە لەو کەسانەش نیم هاوبەشی بۆ دادەنێن، بەڕاستی نوێژو حەج و قوربانی و ژیان و مردنم گشت هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکانە کە هیچ هاوەڵێکی بۆ نیە، هەر بەوەش فەرمانم پێدراوە، دەبێ هەر بۆ خوا بژیم و بمرم، دیارە کە یەکەم کەسیشم لە ڕیزی مسوڵمانانی ئەم ئوممەتەدا، خودایە لە تۆوەیەو هەر بۆ تۆیە لە موحەممەد ﷺو ئوممەتەکەیەوەیە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٥٨، ومسلم: ١٩٦٦، وأبو داود: ٢٧٩٤، والترمذي: ١٤٩٤، والنسائي: ٤٣٨٧.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٧٩٥.



٣١٢٢- عَنْ عَائِشَةَ ، أَوْ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ «إِذَا أَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ، اشْتَرَى كَبْشَيْنِ عَظِيمَيْنِ، سَمِينَيْنِ، أَقْرَنَيْنِ، أَمْلَحَيْنِ مَوْجُوءَيْنِ، فَذَبَحَ أَحَدَهُمَا عَنْ أُمَّتِهِ، لِمَنْ شَهِدَ لِلَّهِ، بِالتَّوْحِيدِ، وَشَهِدَ لَهُ بِالْبَلَاغِ، وَذَبَحَ الْآخَرَ عَنْ مُحَمَّدٍ، وَعَنْ آلِ مُحَمَّدٍ ﷺ»[1].

واتە: عائیشە  یان ئەبو هورەیرە  دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بیویستبا قوربانی بکات، ئەوە دوو بەرانی گەورەی قەڵەوی شاخداری سپی و ڕەشی خەسیوی دەکڕین، ئنجا یەکێکی لەبری ئەوانە دەکردە قوربانی کە شایەتمانیان بە یەکتاپەرستی خوا هێناوە لە ئوممەتەکەی و شاهێدیان بۆ پێغەمبەر ﷺ داوە کە پەیامەکەی گەیاندووە، ئەویتریشی دەکردە قوربانی لەبری موحەممەد ﷺو خانەوادەی موحەممەد ﷺ.

## بابەت: قوربانی، ئایا واجبە یان نا؟

٣١٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ لَهُ سَعَةٌ، وَلَمْ يُضَحِّ، فَلَا يَقْرَبَنَّ مُصَلَّانَا»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک توانای قوربانی هەیەو قوربانیش ناکات، ئەوە با نزیکی نوێژگەکەمان نەکەوێتەوە.

٣١٢٤- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ ، قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ  عَنِ الضَّحَايَا، أَوَاجِبَةٌ هِيَ؟ قَالَ: «ضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَالْمُسْلِمُونَ مِنْ بَعْدِهِ، وَجَرَتْ بِهِ السُّنَّةُ»[3].

واتە: موحەممەدی کوڕی سیرین دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیبنو عومەر  دەربارەی قوربانی ئاخۆ واجبە یان نا؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانی کردوەو مسوڵمانانیش دوای ئەو قوربانیان کردوەو، ئیتر ڕێبازو سوننەتەکە بەو جۆرە هاتووە.

٣١٢٤م- حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عَمَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ عَيَّاشٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَجَّاجُ بْنُ أَرْطَاةَ قَالَ: حَدَّثَنَا جَبَلَةُ بْنُ سُحَيْمٍ، قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ فَذَكَرَ مِثْلَهُ سَوَاءً[4].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرمووده هاتوە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) حسن.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٥٠٦.

(٤) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٥٠٦.




٣١٢٥- عَنْ مِخْنَفِ بْنِ سُلَيْمٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا وُقُوفًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ بِعَرَفَةَ فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ عَلَى كُلِّ أَهْلِ بَيْتٍ فِي كُلِّ عَامٍ أُضْحِيَّةً وَعَتِيرَةً، أَتَدْرُونَ مَا الْعَتِيرَةُ؟ هِيَ الَّتِي يُسَمِّيهَا النَّاسُ الرَّجَبِيَّةَ»(١).

واتە: میخنەفی کوڕی سولەیم ﷺ دەڵێ: ئێمە لە عەرەفە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ڕاوەستابووین، جا فەرمووی: ئەی خەڵکینە، بێگومان لەسەر هەر خانەوادەیەک پێویستە کە هەموو ساڵێ قوربانییەک و عەتیرەیەک بکات، ئایا دەزانن عەتیرە چییە؟ عەتیرە ئەوەیە کە خەڵکی پێی دەڵێن: ڕەجەبییە.

تێبینی: عەتیرە ئەوە بوو لە مانگی ڕەجەبدا حەیوانێکیان سەربڕیوەو، پێیان گوتووە: ڕەجەبییە.

## بابەت: پاداشتی قوربانی

٣١٢٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَا عَمِلَ ابْنُ آدَمَ يَوْمَ النَّحْرِ عَمَلًا أَحَبَّ إِلَى اللَّهِ ﷻ، مِنْ هِرَاقَةِ دَمٍ، وَإِنَّهُ لَيَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، بِقُرُونِهَا، وَأَظْلَافِهَا، وَأَشْعَارِهَا، وَإِنَّ الدَّمَ، لَيَقَعُ مِنَ اللَّهِ ﷻ، بِمَكَانٍ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ، فَطِيبُوا بِهَا نَفْسًا»(٢).

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کردەوەیەکی نەوەی ئادەم کە لە ڕۆژی قوربانیدا دەیکات خۆشەویستر نیە لەلای خوای ﷻ لە ڕشتنی خوێنی قوربانی و قوربانی کردن، بۆیە ئەو قوربانییە لە ڕۆژی قیامەتدا دێتەوە ڕێگای بە شاخەکانی و نینۆک و سمەکانی و مووەکانیشیەوە، قوربانییەکە لە لای خوای ﷻ وەردەگیرێ و جێ دەگرێ پێش ئەوەی خوێنەکەی بکەوێتە سەر زەوی، بۆیە بە دڵخۆشی و پێخۆشبوونەوە قوربانی بکەن.

٣١٢٧- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ، قَالَ: قَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا هَذِهِ الْأَضَاحِيُّ؟ قَالَ: «سُنَّةُ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ» قَالُوا: فَمَا لَنَا فِيهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «بِكُلِّ شَعَرَةٍ، حَسَنَةٌ» قَالُوا: فَالصُّوفُ؟ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «بِكُلِّ شَعَرَةٍ مِنَ الصُّوفِ، حَسَنَةٌ»(٣).

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٧٨٨، والترمذي: ١٥١٨، والنسائي: ٤٢٢٤.

(٢) ضعيف جداً. أخرجه الترمذي: ١٤٩٣.

(٣) ضعيف جداً.

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو قوربانییە چییە؟ فەرمووی: ئەوە لە سوننەت و ڕێبازی ئیبراهیمی باوکتانەوەیە، گوتیان: ئەی پاداشتی ئێمە لە قوربانیدا چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بە هەر موویەک کە بە قوربانیەکەوەیە چاکەیەکتان بۆ دەنوسرێ، گوتیان: جا خورییەکەشی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: هەر موویەک لە خوری و توکەکەی چاکەیەکە.

## بابەت: سوننەتەکانی قوربانی سەربڕین

**٣١٢٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: «ضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بِكَبْشٍ أَقْرَنَ فَحِيلٍ، يَأْكُلُ فِي سَوَادٍ، وَيَمْشِي فِي سَوَادٍ، وَيَنْظُرُ فِي سَوَادٍ»(١).

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەرانێکی شاخداری نەخەسێنراوی بەرسک ڕەشی پێچکە ڕەشی چاو ڕەشی کردە قوربانی.

**٣١٢٩-** عَنْ يُونُسُ بْنُ مَيْسَرَةَ بْنِ حَلْبَسٍ ﷺ، قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ أَبِي سَعِيدٍ الزُّرَقِيِّ، صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى شِرَاءِ الضَّحَايَا، قَالَ يُونُسُ: فَأَشَارَ أَبُو سَعِيدٍ إِلَى كَبْشٍ أَدْغَمَ، لَيْسَ بِالْمُرْتَفِعِ، وَلَا الْمُتَّضِعِ فِي جِسْمِهِ، فَقَالَ لِي: «اشْتَرِ لِي هَذَا، كَأَنَّهُ شَبَّهَهُ، بِكَبْشِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»(٢).

واتە: یونوسی کوڕی مەیسەرەی کوڕی حەلبەس ﷺ دەڵێ: لەگەڵ ئەبو سەعیدی زوڕەقی کە هاوەڵێکی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەرچووم بۆ کڕینی ئاژەڵی قوربانی، یونوس گوتی: ئەبو سەعید ئاماژەی کرد بۆ بەرانێکی بناگوێ و ژێر چەنەگە ڕەش کە نە زۆر نزم بوو نە زۆر بەرز بوو لە هەیکەلدا، پێی گوتم: ئا ئەوەم بۆ بکڕە، وەک بڵێی بە بەرانەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ چواند.

**٣١٣٠-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ الْكَفَنِ الْحُلَّةُ، وَخَيْرُ الضَّحَايَا الْكَبْشُ الْأَقْرَنُ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٧٩٦، والترمذي: ١٤٩٦، والنسائي: ٤٣٩٠.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٥١٧.

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین کفن قوماشی حوللەیە (کە لە دوو پارچە پێکهاتوە)، وە باشترین ئاژەڵی قوربانی بەرانی شاخدارە.

**الحلة:** پۆشاکێکی یەمەنییە کە لە دوو پارچە پێکهاتووە.

## بابەت: بەشەکانی وشترو ڕەشەوڵاخ (مانگا)

**٣١٣١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَحَضَرَ الْأَضْحَى، فَاشْتَرَكْنَا فِي الْجَزُورِ، عَنْ عَشَرَةٍ، وَالْبَقَرَةِ، عَنْ سَبْعَةٍ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەفەرێکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادەبووین، جا قوربانی هاتە پێشەوە، ئێمەش بە دە کەس وشترێکمان دەکردە قوربانی و بە حەوت کەسیش مانگایەک.

## بابەت: وشتر بۆ حەوت کەس و ڕەشە وڵاخیش بۆ حەوت کەس دەکرێتە قوربانی

**٣١٣٢-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «نَحَرْنَا بِالْحُدَيْبِيَةِ، مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، الْبَدَنَةَ، عَنْ سَبْعَةٍ، وَالْبَقَرَةَ، عَنْ سَبْعَةٍ»[2].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ لە حودەیبیە قوربانیمان سەربڕی، وشترێک بۆ حەوت کەس و، ڕەشە وڵاخیش (مانگا) بۆ حەوت کەس.

**٣١٣٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «ذَبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَمَّنِ اعْتَمَرَ مِنْ نِسَائِهِ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بَقَرَةً بَيْنَهُنَّ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو عومرەیەی کە لەگەڵ خێزانەکانی بوو لە حەجیماڵئاواییدا مانگایەکی کردە قوربانی بۆ خێزانەکانی.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٩٠٥ و ١٥٠١، والنسائي: ٤٣٩٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣١٨، وأبو داود: ٢٨٠٧_٢٨٠٩، والترمذي: ٩٠٤ و ١٥٠٢، والنسائي: ٤٣٩٣.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٥١.

٣١٣٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «قَلَّتِ الْإِبِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَنْحَرُوا الْبَقَرَ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ وشتر کەمیکرد، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردن کە مانگا بکەنە قوربانی.

٣١٣٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَحَرَ عَنْ آلِ مُحَمَّدٍ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بَقَرَةً وَاحِدَةً»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا یەک دانە مانگای کردە قوربانی لەبری خانەوادەکەی.

## بابەت: بارتەقای وشتر بە مەڕ

٣١٣٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، أَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّ عَلَيَّ بَدَنَةً، وَأَنَا مُوسِرٌ بِهَا، وَلَا أَجِدُهَا، فَأَشْتَرِيَهَا «فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَبْتَاعَ، سَبْعَ شِيَاهٍ، فَيَذْبَحَهُنَّ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، کەوا پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: من وشترێکم لەسەر ماڵە کە بیکەمە قوربانی، وە من دەتوانم بیکڕم و توانام هەیە، بەڵام دەستم ناکەوێ بیکڕم، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد لەبری وشترەکە حەوت سەر مەڕ بکڕێ و بیانکاتە قوربانی.

٣١٣٧- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ بِذِي الْحُلَيْفَةِ مِنْ تِهَامَةَ، فَأَصَبْنَا إِبِلًا وَغَنَمًا، فَعَجِلَ الْقَوْمُ، فَأَغْلَيْنَا الْقُدُورَ قَبْلَ أَنْ تُقْسَمَ، فَأَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «فَأَمَرَ بِهَا، فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ عَدَلَ الْجَزُورَ، بِعَشَرَةٍ مِنَ الْغَنَمِ»[٤].

واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: لە «ذو الحليفة» لە «تهامة» لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، دەسکەوتیشمان وشترو مەڕ بوو، جا هەندێک لە خەڵکەکە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٥٠. وانظر البخاري: ٢٩٤، ومسلم: ١٢١١.

(٣) ضعيف.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٨٨، ومسلم: ١٩٦٨، وأبو داود: ٢٨٢١، والترمذي: ١٦٠٠، والنسائي: ٤٢٩٧.

پەلەیان کردو پێش ئەوەی دەسکەوتەکە دابەش بکرێ مەنجەڵیان بەسەر ئاگرنا، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان و فەرمانی کرد مەنجەڵەکانیان وەرگێڕا (تا دابەشکردنی دەسکەوتەکە)، پاشان بارتەقای هەر وشترێکی بە دە مەڕ دانا.

## بابەت: ئەو ئاژەڵانەی کە دروستن بۆ قوربانی

**٣١٣٨- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَعْطَاهُ غَنَمًا، فَقَسَمَهَا عَلَى أَصْحَابِهِ ضَحَايَا، فَبَقِيَ عَتُودٌ، فَذَكَرَهُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «ضَحِّ بِهِ أَنْتَ»[1].**

واتە: عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ مەڕو بزنی پێدا، جا دابەشیکرد بەسەر هاوڕێکانیدا بۆ قوربانی کردن و تەنها گیسکێک مایەوە، ئەوەشی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، ئەویش فەرمووی: تۆش ئەویان بکە قوربانی.

**گیسک:** بێچووی یەک ساڵەی بزنە، وە زانایان دەڵێن: ئەو قوربانییە تایبەت بووە بە عوقبە ﷺ.

**٣١٣٩- عَنْ أُمِّ بِلَالٍ بِنْتُ هِلَالٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَجُوزُ الْجَذَعُ مِنَ الضَّأْنِ أُضْحِيَّةً»[2].**

واتە: ئوممو بیلالی کچی هیلال ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێچووی یەک ساڵەی مەڕ بۆ قوربانی دروستەو شیاوە (واتە: ساڵێکی تەواو کردبێ و پێی نابێتە ساڵی دووهەم، لای خۆمان پێی دەڵێن: کاوڕ).

**٣١٤٠- عَنْ عَاصِمِ بْنِ كُلَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يُقَالُ لَهُ مُجَاشِعٌ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ، فَعَزَّتِ الْغَنَمُ، فَأَمَرَ مُنَادِيًا، فَنَادَى أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «إِنَّ الْجَذَعَ يُوفِي، مِمَّا تُوفِي مِنْهُ الثَّنِيَّةُ»[3].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٠٠، ومسلم: ١٩٦٥، والترمذي: ١٥٠٠، والنسائي: ٤٣٧٩_٤٣٨١.

(٢) حسن لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٧٩٩، والنسائي: ٤٣٨٣.

واتە: عاصیمی کوڕی کولەیب لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لەگەڵ پیاوێک بووین کە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پێیان دەگوت: موجاشیع کە لە هۆزی بەنو سولەیم بوو، جا مەڕی دوو ساڵەو گەورەتر کەم بو و دەستنەدەکەوت، جا فەرمانی کرد کە جاڕچییەک جاڕ بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بێچووی یەک ساڵەی مەڕ هەر وەکو مەڕی دوو ساڵە وایە بۆ قوربانی.

**٣١٤١-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَذْبَحُوا إِلَّا مُسِنَّةً، إِلَّا أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ، فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ماڵاتی سەرەو گەورە نەبێ مەیکەنە قوربانی مەگەر دەستتان نەکەوێ، ئەوکات بێچووی یەک ساڵەی مەڕ (کاوڕ) سەرببڕن.

## بابەت: ئەو شتانەی ناپەسەندن بۆ قوربانی

**٣١٤٢-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُضَحَّى بِمُقَابَلَةٍ، أَوْ مُدَابَرَةٍ، أَوْ شَرْقَاءَ، أَوْ خَرْقَاءَ، أَوْ جَدْعَاءَ»[٢].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی کە ئەو ئاژەڵانە بکرێنە قوربانی: ئاژەڵێ گوێی لەلای پێشەوە لێی بڕدرابێ، یان لەدواوە لێی بڕدرابێ، یان گوێی دوو کەرت کرابێ، یان درووێشم کرابێ و گوێی کون کرابێ، یان لووت و لێوو گوێی بڕدرابێ.

**٣١٤٣-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَسْتَشْرِفَ الْعَيْنَ، وَالْأُذُنَ»[٣].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووین کە (کاتێک ئاژەڵێک بۆ قوربانی کردن دەکڕین) زۆرباش لێی ورد بینەوەو سەرنجی چاوو گوێچکەی بدەین (بۆ ئەوەی دڵنیابین کە چاوو گوێچکەی ساغە).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٦٣، وأبو داود: ٢٧٩٧، والنسائي: ٤٣٧٨.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٨٠٤، والترمذي: ١٤٩٨، والنسائي: ٤٣٧٢ و ٤٣٧٦.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ١٥٠٣ مطولًا.




**٣١٤٤-** عَنْ سُلَيْمَان بْن عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: سَمِعْتُ عُبَيْدَ بْنَ فَيْرُوزَ، قَالَ: قُلْتُ لِلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ: حَدِّثْنِي بِمَا كَرِهَ، أَوْ نَهَى عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْأَضَاحِيِّ فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: هَكَذَا بِيَدِهِ، وَيَدِي أَقْصَرُ مِنْ يَدِهِ «أَرْبَعٌ لَا تُجْزِئُ فِي الْأَضَاحِيِّ: الْعَوْرَاءُ، الْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْمَرِيضَةُ، الْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَرْجَاءُ، الْبَيِّنُ ظَلْعُهَا، وَالْكَسِيرَةُ، الَّتِي لَا تُنْقِي». قَالَ: فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَكُونَ نَقْصٌ فِي الْأُذُنِ، قَالَ: فَمَا كَرِهْتَ مِنْهُ، فَدَعْهُ، وَلَا تُحَرِّمْهُ عَلَى أَحَدٍ[١].

**واتە: سولەیمانی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: گوێم لە عوبەیدی کوڕی فەیروز بوو کە گوتی: بە بەڕائی کوڕی عازەبم ﷺ گوت: پێم بڵێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ قوربانی کردن نەهی لە چی کردوەو چی پێناخۆش بووە؟ ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئا بەو جۆرە بە دەستی ڕوونی کردەوە، کە دەستی من لە هی ئەو کورتترە، فەرمووی: چوار جۆر بۆ قوربانی ناشێن: ئاژەڵێکی کوێر کە کوێرییەکەی ڕوون و ئاشکرا بێ، وە ئاژەڵێکی نەخۆش کە نەخۆشییەکەی ديارو ڕوون بێ، وە ئاژەڵێکی شەل کە شەلییەکەی ديارو ڕوون بێ، وە ئاژەڵێک کە ئێسکی شکابێ، یان لەبەر لاوازی و نەخۆشی مۆخی ئێسقانی نەمابێ، ڕاوی گوتی: من پێم ناخۆشە کە گوێچکەکانیشی کەموکوڕییان هەبێ، (بەڕاء) گوتی: ئەوەی بۆخۆت پێ ناخۆشە وازی لێبێنەو لە خەڵکی حەڕام مەکە.**

**٣١٤٥-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «نَهَى أَنْ يُضَحَّى بِأَعْضَبِ الْقَرْنِ، وَالْأُذُنِ»[٢].

**واتە: عەلی ﷺ گێڕاویەتەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە ئاژەڵی شاخ شکاو، یان گوێ قرتاو، بکرێتە قوربانی.**

## بابەت: کەسێک ماڵاتێکی ساغ بۆ قوربانی بکڕێ و، دواتر لەلای خۆی تووشی شتێک ببێ

**٣١٤٦-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: ابْتَعْنَا كَبْشًا نُضَحِّي بِهِ، فَأَصَابَ الذِّئْبُ مِنْ أَلْيَتِهِ، أَوْ أُذُنِهِ، فَسَأَلْنَا النَّبِيَّ ﷺ «فَأَمَرَنَا، أَنْ نُضَحِّيَ بِهِ»[٣].

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٨٠٢، والترمذي: ١٤٩٧، والنسائي: ٤٣٦٩_٤٣٧١.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٨٠٥، والترمذي: ١٥٠٤، والنسائي: ٤٣٧٧.

(٣) ضعيف الإسناد جداً.

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: بەرانێکمان کڕی بۆ ئەوەی بیکەینە قوربانی، جا گورگ زەرەری بە پاشڵی، یان گوێچکەی گەیاند، ئێمەش پرسیارمان لەوبارەوە کرد لە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمانی پێکردین کەوا قوربانی پێبکەین.

## بابەت: کەسێک کە بە مەڕێک لەبری خانەوادەکەی قوربانی بکات

**٣١٤٧- عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيَّ ﷺ: كَيْفَ كَانَتِ الضَّحَايَا فِيكُمْ، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «كَانَ الرَّجُلُ فِي عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، يُضَحِّي بِالشَّاةِ عَنْهُ، وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ، فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ، ثُمَّ تَبَاهَى النَّاسُ، فَصَارَ كَمَا تَرَى»[1].**

واتە: عەتائی کوڕی یەسار ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ قوربانی کردن لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ چۆن بووە؟ گوتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاو هەبوو لەبری خۆی و خانەوادەکەی مەڕێکی دەکردە قوربانی و لێشیان دەخواردو لێشیان دەبەخشی بە خەڵکی، پاشان خەڵکی لاف و گەزافیان بە قوربانی کردنەوە لێدا هەروەکو دەبینی بەو جۆرەی لێهات.

**٣١٤٨- عَنْ أَبِي سَرِيحَةَ ﷺ، قَالَ: «حَمَلَنِي أَهْلِي عَلَى الْجَفَاءِ بَعْدَ مَا عَلِمْتُ مِنَ السُّنَّةِ، كَانَ أَهْلُ الْبَيْتِ يُضَحُّونَ، بِالشَّاةِ وَالشَّاتَيْنِ، وَالْآنَ يُبَخِّلُنَا جِيرَانُنَا»[2].**

واتە: ئەبو سەریحە ﷺ دەڵێ: خانەوادەو نزیکەکانم بە لادەرو عەیبداریان دەزانیم لە دوای ئەوەشی کە من شارەزای سوننەتم کە خێزانی ماڵێک بە یەک مەڕ، یان دوو مەڕ قوربانییان دەکردو، ئێستاش دراوسێکانمان بە چرووکمان دەزانن.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٥٠٥.

(٢) صحيح الإسناد.

## بابەت: کەسێک بیەوێ قوربانی بکات، لە دە ڕۆژەکاندا دەستکاری موو و نینۆکی نەکات

٣١٤٩- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ، وَأَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يُضَحِّيَ، فَلَا يَمَسَّ مِنْ شَعَرِهِ، وَلَا بَشَرِهِ شَيْئًا»[1].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دە ڕۆژەی «ذي الحجة» هات، یەکێکیشتان ویستی قوربانی بکات، ئەوە با هیچ دەستکاری موو و پێستی نەکات (واتە: دەستکاری هیچ جێیەکی جەستەی نەکات هەتا نینۆکیشی!).

٣١٥٠- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ رَأَى مِنْكُمْ هِلَالَ ذِي الْحِجَّةِ، فَأَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ، فَلَا يَقْرَبَنَّ لَهُ شَعَرًا، وَلَا ظُفُرًا»[2].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە کە مانگی تازەبووی «ذي الحجة»ـی بینی و ویستی قوربانی بکات، ئەوە با نزیکی موو و نینۆکی نەکەوێ (واتە: با دەستکاریان نەکات).

## بابەت: نەهی کردن لە قوربانی کردن لەپێش نوێژی جەژندا

٣١٥١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، «أَنَّ رَجُلًا ذَبَحَ يَوْمَ النَّحْرِ، يَعْنِي قَبْلَ الصَّلَاةِ،» فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُعِيدَ»[3].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە، پیاوێک لە ڕۆژی جەژنی قورباندا قوربانییەکەی پێش نوێژی جەژن سەربڕی بوو، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد کە دووبارەی بکاتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٧٧، وأبو داود: ٢٧٩١، والترمذي: ١٥٢٣، والنسائي: ٤٣٦١ و ٤٣٦٢ و ٤٣٦٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٧٧، وأبو داود: ٢٧٩١، والترمذي: ١٥٢٣، والنسائي: ٤٣٦١ و ٤٣٦٢ و ٤٣٦٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٤٥، ومسلم: ١٩٦٢، والنسائي: ٤٣٩٦.





**٣١٥٢-** عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ ﷺ، عَنْ جُنْدُبٍ الْبَجَلِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: شَهِدْتُ الْأَضْحَى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَبَحَ أُنَاسٌ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «مَنْ كَانَ ذَبَحَ مِنْكُمْ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَلْيُعِدْ أُضْحِيَّتَهُ، وَمَنْ لَا، فَلْيَذْبَحْ عَلَى اسْمِ اللَّهِ»[1].

**واتە:** ئەسوەدی کوڕی قەیس ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە جوندوبی بەجەلی ﷺ بوو دەیگوت: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادەی قوربانی کردن بووم، جا هەندێک لە خەڵکەکە پێش نوێژکردن قوربانییەکەیان سەربڕی، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر یەکێکتان ئەگەر لە پێش نوێژکردندا قوربانییەکەی سەربڕیوە ئەوە با دووبارەی بکاتەوە (بەرنەکەوتووە)، ئەوەشی ئەو کارەی نەکردوە ئەوە (دوای نوێژ) با ناوی خوای لەسەر بێنێ و سەری ببڕێ.

**٣١٥٣-** عَنْ عُوَيْمِرِ بْنِ أَشْقَرَ ﷺ، أَنَّهُ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «أَعِدْ أُضْحِيَّتَكَ»[2].

**واتە:** عوەیمیری کوڕی ئەشقەر ﷺ دەگێڕێتەوە، لە پێش نوێژی جەژندا قوربانییەکەی سەربڕیوە، جا بۆ پێغەمبەری ﷺ باسکردوە، ئەویش فەرموویەتی: قوربانییەکەت دووبارە بکەوە.

**٣١٥٤-** عَنْ أَبِي زَيْدٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِدَارٍ مِنْ دُورِ الْأَنْصَارِ، فَوَجَدَ رِيحَ قُتَارٍ، فَقَالَ: «مَنْ هَذَا الَّذِي ذَبَحَ؟» فَخَرَجَ إِلَيْهِ رَجُلٌ مِنَّا، فَقَالَ: أَنَا، يَا رَسُولَ اللَّهِ ذَبَحْتُ قَبْلَ أَنْ أُصَلِّيَ، لِأُطْعِمَ أَهْلِي وَجِيرَانِي، «فَأَمَرَهُ أَنْ يُعِيدَ» فَقَالَ: لَا، وَاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، مَا عِنْدِي، إِلَّا جَذَعٌ، أَوْ حَمَلٌ مِنَ الضَّأْنِ، قَالَ: «فَاذْبَحْهَا، وَلَنْ تُجْزِئَ جَذَعَةٌ، عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ»[3].

**واتە:** ئەبو زەیدی ئەنصاڕیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ماڵێک لە ماڵی ئەنصاڕییەکاندا ڕەت بوو، جا بۆنی گۆشتی برژاوی کرد، فەرمووی: ئەوە کێیە قوربانییەکەی سەربڕیوە؟ جا پیاوێک لە ئێمە هاتە دەرێ و گوتی: ئەمن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆیە پێش ئەوەی نوێژ بکەم کوشتمەوە هەتاکو ماڵ و منداڵەکەم و جیرانەکانم لێی بخۆن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێکرد قوربانییەکەی دووبارە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٨٥، ومسلم: ١٩٦٠، والنسائي: ٤٣٦٨.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح لغيره.




بکاتەوە، ئەویش گوتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەو خوایەی کە تەنها خۆی شایستەی پەرستنە هیچ شتێکم نیە جگە لە کاوڕێکی یەک ساڵە یان ساوایەکی مەڕ نەبێ، فەرمووی: بیکوژەوە بۆ قوربانی، وە کاوڕ لە دوای تۆ بۆ کەسیتر دروست نیە بیکاتە قوربانی.

## بابەت: کەسێک کە ئاژەڵی قوربانییەکەی بە دەستی خۆی سەرببڕێ

**٣١٥٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «يَذْبَحُ أُضْحِيَّتَهُ بِيَدِهِ وَاضِعًا قَدَمَهُ عَلَى صِفَاحِهَا»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: بە دڵنیایی بینیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستەکانی خۆی قوربانییەکەی خۆی کوشتەوە، پێی لەسەر لاملی قوربانییەکە دانا (بۆ ئەوەی هەم کوشتنەوەکە ئاسان بێ و هەمیش ئاژەڵەکە ئازاری زۆری پێنەگات).

**٣١٥٦-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَعْدِ بْنِ عَمَّارِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، مُؤَذِّنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «ذَبَحَ أُضْحِيَّتَهُ، عِنْدَ طَرَفِ الزُّقَاقِ، طَرِيقِ بَنِي زُرَيْقٍ بِيَدِهِ، بِشَفْرَةٍ»[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەعدی کوڕی عەمماڕی کوڕی سەعد ﷺ بانگبێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: باوکم لە باوکییەوە لە باپیریەوە بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانییەکەی خۆی بە دەستی خۆی بە تیغێک سەربڕی لەلای زوقاق کە ڕێگای هۆزی زوڕەیق بوو.

## بابەت: پێستەی قوربانییەکان

**٣١٥٧-** عَنْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي لَيْلَى، أَخْبَرَهُ أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَمَرَهُ أَنْ يَقْسِمَ بُدْنَهُ كُلَّهَا لُحُومَهَا وَجُلُودَهَا وَجِلَالَهَا لِلْمَسَاكِينِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٥٨، ومسلم: ١٩٦٦، وأبو داود: ٢٧٩٤، والترمذي: ١٤٩٤، والنسائي: ٤٣٨٧.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٠٧، ومسلم: ١٣١٧، وأبو داود: ١٧٦٩.

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا دەگێڕێتەوە، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ هەواڵی پێداوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوە کەوا هەموو وشترەکەی دابەش بکات بەسەر هەژاراندا، گۆشتەکەیی و پێستەکەیی و ئەو جل و جۆڕەش کە دەخرێتە سەر پشتی وشترەکە.

## بابەت: خواردن لە گۆشتی قوربانی

**٣١٥٨-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَمَرَ مِنْ كُلِّ جَزُورٍ بِبَضْعَةٍ، فَجُعِلَتْ فِي قِدْرٍ، فَأَكَلُوا مِنَ اللَّحْمِ، وَحَسَوْا مِنَ الْمَرَقِ»[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە لە هەر وشترێکی قوربانی کە کوژراوەتەوە پارچە گۆشتێکی لێ بکرێتە ناو مەنجەڵ، ئنجا لە گۆشتەکەیان خواردو لە گۆشتاوەکەیان خواردەوە.

## بابەت: هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی

**٣١٥٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: إِنَّمَا «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ، لِجَهْدِ النَّاسِ، ثُمَّ رَخَّصَ فِيهَا»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە نەهی کرد لە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی، چونکە خەڵکی برسی بوون و پێویستییان پێی بوو، پاشان مۆڵەتی دا (بە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی).

**٣١٦٠-** عَنْ نُبَيْشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ، فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، فَكُلُوا، وَادَّخِرُوا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٢٣ و ٥٥٧٠، ومسلم: ١٩٧١، وأبو داود: ٢٨١٢، والترمذي: ١٥١١، والنسائي: ٤٤٣٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨١٣، والنسائي: ٤٢٣٠.

واتە: نوبەیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من نەهیم لێکردن کە گۆشتی قوربانی زیاتر لە بەشی سێ ڕۆژ هەڵبگرن، ئیتر (لێرە بەدواوە) بیشیخۆن و پاشەکەوتیشی بکەن.

## بابەت: سەربڕینی ئاژەڵ لە نوێژگە

٣١٦١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَذْبَحُ بِالْمُصَلَّى[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ قوربانی لە نوێژگە سەردەبڕی.

* * *

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٨٢، وأبو داود: ٢٨١١، والنسائي: ٤٣٦٦.




## بابەت: مەڕە منداڵ (گوێزەبان، حەوتوو)

**٣١٦٢-** عَنْ أُمِّ كُرْزٍ ، قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «عَنِ الْغُلَامِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ»[1].

**واتە: ئوممو کوڕز  دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: لەبری کوڕ دوو مەڕی وەکو یەک بکەنە گوێزەبانە، وە بۆ کچیش یەک مەڕ.**

**٣١٦٣-** عَنْ عَائِشَةَ ، قَالَتْ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنْ نَعُقَّ عَنِ الْغُلَامِ شَاتَيْنِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةً»[2].

**واتە: عائیشە  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووین بۆ کوڕ دوو مەڕ بکەینە حەوتوو، بۆ کچیش یەک مەڕ.**

**٣١٦٤-** عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ مَعَ الْغُلَامِ عَقِيقَةً، فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا، وَأَمِيطُوا عَنْهُ الْأَذَى»[3].

**واتە: سەلمانی کوڕی عامیر  دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە دەیفەرموو: لەگەڵ هەر منداڵێک (کچ بێ یان کوڕ) مەڕە منداڵە هەیە، جا خوێنیان بۆ بڕێژن بە کوشتنەوەی ئاژەڵ و پیسی و چەپەڵییان لێ لابدەن.**

**أميطوا عنه الأذى: واتە: مووی سەریان بتاشن و خاوێنیان بکەنەوە لە دوای حەوت ڕۆژەکە.**

**٣١٦٥-** عَنْ سَمُرَةَ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ غُلَامٍ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ، تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِ، وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ، وَيُسَمَّى»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٣٤_٢٨٣٦، والترمذي: ١٥١٦، والنسائي: ٤٢١٥_٤٢١٨.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٥١٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٧٢، وأبو داود: ٢٨٣٩، والترمذي: ١٥١٥، والنسائي: ٤٢١٤.

(٤) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٨٣٧ و ٢٨٣٨، والترمذي: ١٥٢٢، والنسائي: ٤٢٢٠. وانظر البخاري: ٥٤٧٢.

واتە: سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو منداڵێک گیرۆدەیە بە مەڕە منداڵەوەو بارمتەیەتی، لە ڕۆژی حەوتەمی لە دایک بوونیەوە مەڕە منداڵەی بۆ سەرببڕن و، سەری بۆ بتاشن و ناوی لێ بنێن.

**مرتهن:** چەند مانایەکی هەیە: یان ئەوەیە کە ئەگەر منداڵەکە بمرێ و مەڕە منداڵەی بۆ نەکرێ، ئەوە شەفاعەت بۆ دایک و باوکی ناکات، یان چاکەو باشەی ئەو منداڵە بەندە بەو مەڕە منداڵەوە، یان ئەو منداڵە سوودی لێ نابینرێ هەتاکو مەڕە منداڵەکەی بۆ نەکرێ.

**٣١٦٦-** عَنْ يَزِيدَ بْنَ عَبْدٍ الْمُزَنِيِّ ﷺ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «يُعَقُّ عَنِ الْغُلَامِ، وَلَا يُمَسُّ رَأْسُهُ بِدَمٍ»[1].

واتە: یەزیدی کوڕی عەبدی موزەنیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: منداڵ مەڕە منداڵەی بۆ دەکرێ و نابێ خوێنی مەڕەکە لەسەری منداڵەکە بدرێ (کە پێشتر وا باو بووە لە سەردەمی نەفامیدا).

## بابەت: فەرەعەو عەتیرە

**٣١٦٧-** عَنْ نُبَيْشَةَ ﷺ، قَالَ: نَادَى رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا نَعْتِرُ عَتِيرَةً فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فِي رَجَبٍ، فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: «اذْبَحُوا لِلَّهِ ﷻ فِي أَيِّ شَهْرٍ كَانَ، وَبَرُّوا لِلَّهِ، وَأَطْعِمُوا» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا نُفْرِعُ فَرَعًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَمَا تَأْمُرُنَا بِهِ؟ قَالَ: «فِي كُلِّ سَائِمَةٍ فَرَعٌ، تَغْذُوهُ مَاشِيَتُكَ، حَتَّى إِذَا اسْتَحْمَلَ ذَبَحْتَهُ، فَتَصَدَّقْتَ بِلَحْمِهِ - أُرَاهُ قَالَ: عَلَى ابْنِ السَّبِيلِ - فَإِنَّ ذَلِكَ هُوَ خَيْرٌ»[2].

واتە: نوبەیشە ﷺ دەڵێ: پیاوێک بانگی پێغەمبەری خوای ﷺ کردو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا لە مانگی ڕەجەبدا ئاژەڵێکمان سەردەبڕی (عەتیرەمان دەکرد)، ئێستا فەرمانی چیمان پێدەکەی؟ فەرمووی: لەپێناو خوای ﷻ ئاژەڵ سەرببڕن، لە هەر مانگێکدا بێ و چاکە بکەن لەبەر خاتری خواو لێی ببخەشن و بیدەن بە خەڵکی تا لێی بخۆن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لە سەردەمی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٣٠، والنسائي: ٤٢٢٩ و ٤٢٣١ و ٤٢٣٢.

نەفامیدا نۆبەرەی ئاژەڵمان سەردەبڕی، جا فەرمانی چیمان پێدەکەی؟ فەرمووی: نۆبەرەی هەر ماڵاتێک کە لە دایک دەبێ خواردن و ئالفی پێبدەن هەروەکو چۆن ئالف دەدەن بە وڵاخی سواریتان هەتاکو گەورە دەبێ و بەربار دەبێ (ئەگەر وشتر بێت)، جا بیکوژەوەو گۆشتەکەی بکە بە خێر، ڕاوی دەڵێ: پێم وابێ فەرمووی: بیدە بە ڕێبواران، کە بێگومان ئەوە چاکەو خێرە.

**الفرعة:** نۆبەرەی ئاژەڵە، وەکو: وشترو مانگاو مەڕو بزن، کاتی خۆی سەریان بڕیوە بە نیەتی بەرەکەت.

**العتيرة:** سەربڕینی ئاژەڵ بووە لە مانگی ڕەجەبدا.

٣١٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا فَرَعَةَ، وَلَا عَتِيرَةَ» قَالَ هِشَامٌ فِي حَدِيثِهِ: وَالْفَرَعَةُ: أَوَّلُ النَّتَاجِ، وَالْعَتِيرَةُ: الشَّاةُ يَذْبَحُهَا أَهْلُ الْبَيْتِ فِي رَجَبٍ[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نە نۆبەرە سەربڕین هەیەو، نە ئاژەڵ سەربڕینی مانگی ڕەجەب. هیشام لە گێڕانەوەکەیدا دەڵێ: «الفرعة» بریتیە لە یەکەم بێچووی ئاژەڵ کە لە دایک دەبێ، وە «العتيرة» ئەو مەڕەیە کە خانەوادەیەک لە مانگی ڕەجەبدا دەیکوژنەوە.

٣١٦٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «لَا فَرَعَةَ، وَلَا عَتِيرَةَ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نۆبەرە سەربڕین و کوشتنەوەی ئاژەڵ بە ناوی مانگی ڕەجەبەوە نیە.

## بابەت: ئەگەر ئاژەڵتان کوشتەوە، بە باشترین شێوە بیکوژنەوە

٣١٧٠- عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ، فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ، فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٧٣، ومسلم: ١٩٧٦، وأبو داود: ٢٨٣١، والترمذي: ١٥١٢، والنسائي: ٤٢٢٢_٤٢٢٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٥٥، وأبو داود: ٢٨١٥، والترمذي: ١٤٠٩، والنسائي: ٤٤٠٥ و ٤٤١١_٤٤١٤.




واتە: شەددادی کوڕی ئەوس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوای ﷻ چاکەکاری لەسەر هەموو شتێک نووسیوە، جا ئەگەر کوشتنێکتان (لەسەر هەق) ئەنجامدا ئەوە بە باشترین شێوە ئەنجامی بدەن (جەستەکە مەشێوێنن و ئازاری مەدەن)، وە ئەگەر ئاژەڵێکتان سەربڕی ئەوە بە باشترین و شایستەترین شێوە سەری ببڕن، وە با (ئەو کەسەی سەربڕینەکە ئەنجام دەدات) تیغەکەی تیژ بکات و ئەو ئاژەڵەی دەیکوژێتەوە بە شێوەیەکی ئاسودە ئامادەی بکات ( وە خێرا بیکوژێتەوە).

**٣١٧١-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِرَجُلٍ، وَهُوَ يَجُرُّ شَاةً بِأُذُنِهَا، فَقَالَ: «دَعْ أُذُنَهَا، وَخُذْ بِسَالِفَتِهَا»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای پیاوێکدا ڕەت بوو کە پیاوەکە مەڕێکی پێبو و خەریک بوو بە گوێ ڕایدەکێشا، جا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: واز لە گوێچکەی بێنە، لامل و ئەستۆی بگرە (بۆ ئەوەی ئازاری پێنەگات).

**٣١٧٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِحَدِّ الشِّفَارِ، وَأَنْ تُوَارَى عَنِ الْبَهَائِمِ» وَقَالَ: «إِذَا ذَبَحَ أَحَدُكُمْ، فَلْيُجْهِزْ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بەوەی کە تیغی (ئاژەڵ کوشتنەوە) تیژ بێ و لەبەرچاوی ئاژەڵان بشاردرێتەوەو نەیبینن، وە فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان ئاژەڵێکی سەربڕی با پەلەی لێبکات و زوو سەری ببڕێ (نەک بە خاوە خاوو لەسەرخۆ، چونکە ئاژەڵەکە ئازاری پێدەگات ئەگەر بە خێرایی نەبێ).

**٣١٧٢م-** حَدَّثَنَا جَعْفَرُ بْنُ مُسَافِرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الْأَسْوَدِ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ[٣].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ضعيف الإسناد جداً.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.

## بابەت: ناوی خوا هێنان لە کاتی سەربڕینی ئاژەڵدا

٣١٧٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ ١٢١﴾ الأنعام، قَالَ: «كَانُوا يَقُولُونَ: مَا ذُكِرَ عَلَيْهِ اسْمُ اللَّهِ، فَلَا تَأْكُلُوا، وَمَا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ، فَكُلُوهُ» فَقَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ ١٢١﴾ الأنعام[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ ١٢١﴾ الأنعام، واتە: وە بێگومان شەیتانەکان بە نهێنی شت بە دۆستانیان دەڵێن. گوتوویەتی: دەیانگوت: هەر شتێک (لە کاتی سەربڕیندا) ناوی خوای لەسەر هێنرابێ مەیخۆن، ئەوەشی ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە بیخۆن، ئنجا خوای ﷻ فەرمووی: ﴿وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ ١٢١﴾ الأنعام، واتە: لەو (سەربڕاوە) مەخۆن کە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە (لە کاتی سەربڕیندا).

٣١٧٤- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، أَنَّ قَوْمًا قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ قَوْمًا يَأْتُونَا بِلَحْمٍ لَا نَدْرِي ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا؟ قَالَ: «سَمُّوا أَنْتُمْ وَكُلُوا» وَكَانُوا حَدِيثَ عَهْدٍ بِالْكُفْرِ[٢].

واتە: عائیشەی دایکی ئیمانداران ﷺ دەگێڕێتەوە، خەڵکانێک گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵکانێک گۆشتمان بۆ دێنن، جا نازانین ناوی خوای لەسەر هێنراوە (لە کاتی سەربڕیندا) یاخود نا؟ فەرمووی: بۆ خۆتان ناوی خوای لێ بێنن و بیخۆن. وە ئەوان لەسەردەمی کوفرو نەزانی نزیک بوون.

## بابەت: ئەو شتانەی کە دەتوانرێ و دروستە ئاژەڵیان پێ بکوژرێتەوە

٣١٧٥- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ صَيْفِيٍّ ﷺ، قَالَ: ذَبَحْتُ أَرْنَبَيْنِ بِمَرْوَةٍ، فَأَتَيْتُ بِهِمَا النَّبِيَّ ﷺ، «فَأَمَرَنِي بِأَكْلِهِمَا»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٥٧ و ٥٥٠٧ و ٧٣٩٨، وأبو داود: ٢٨٢٩، والنسائي: ٤٤٣٦.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٢٢، والترمذي: ١٤٧٢، والنسائي: ٤٣١٣ و ٤٣٩٩.

واتە: موحەممەدی کوڕی صەیفیی ﷺ دەڵێ: دوو کەروێشکم بە بەردێکی سپی تیژ کوشتنەوە، جا هەردووکیانم هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمانی پێکردم کە بیانخۆم.

٣١٧٦- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّ ذِئْبًا نَيَّبَ فِي شَاةٍ، فَذَبَحُوهَا بِمَرْوَةٍ «فَرَخَّصَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي أَكْلِهَا»[1].

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە، گورگێک کەڵبەی لە مەڕێکدا، جا بە بەردێکی تیژی سپی کوشتیانەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پێدان لە گۆشتی مەڕەکە بخۆن.

٣١٧٧- عَنْ عَدِيِّ ابْنِ حَاتِمٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَصِيدُ الصَّيْدَ، فَلَا نَجِدُ سِكِّينًا، إِلَّا الظِّرَارَةَ، وَشِقَّةَ الْعَصَا، قَالَ: «أَمْرِرِ الدَّمَ بِمَا شِئْتَ، وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ»[2].

واتە: عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە ڕاوی نێچیر دەکەین و چەقۆشمان دەستناکەوێ، جگە لە بەردی پتەوی تیژو لێواری گۆچانەکان، فەرمووی: بە هەر شتێک پێت خۆشە خوێنەکەی دەربکەو ناوی خوای لەسەر بێنە.

٣١٧٨- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَكُونُ فِي الْمَغَازِي، فَلَا يَكُونُ مَعَنَا مُدًى، فَقَالَ: «مَا أَنْهَرَ الدَّمَ، وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ، فَكُلْ غَيْرَ السِّنِّ، وَالظُّفْرِ، فَإِنَّ السِّنَّ عَظْمٌ، وَالظُّفْرَ، مُدَى الْحَبَشَةِ»[3].

واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەر بووین، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان جار هەیە ئێمە لە غەزاین، وە چەقۆشمان پێ نیە، فەرمووی: هەر شتێک خوێنەکە دەرکات و ناوی خوای لەسەر بهێنرێ ئەوە بیخۆ، جگە لە ددان و نینۆک نەبێ (بۆ پێ کوشتنەوە نابن)، چونکە ددان ئێسقانەو کوڵە، نینۆکیش چەقۆی حەبەشییەکانە (خۆ چواندنە بە ئەوان).

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه النسائي: ٤٤٠٠ و ٤٤٠٧.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٢٤ بنحوه، والنسائي: ٤٣٠٤ و ٤٤٠١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٨٨، ومسلم: ١٩٦٨، وأبو داود: ٢٨٢١، والترمذي: ١٤٩١، والنسائي: ٤٤٠٣ و ٤٤٠٤ و ٤٤٠٩.

## بابەت: کەوڵ کردنی ئاژەڵ (بە کوژراویی)

٣١٧٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِغُلَامٍ يَسْلُخُ شَاةً، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَنَحَّ، حَتَّى أُرِيَكَ» فَأَدْخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ بَيْنَ الْجِلْدِ وَاللَّحْمِ، فَدَحَسَ بِهَا، حَتَّى تَوَارَتْ إِلَى الْإِبِطِ وَقَالَ: «يَا غُلَامُ هَكَذَا فَاسْلُخْ» ثُمَّ مَضَى وَصَلَّى لِلنَّاسِ، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای کوڕێکدا ڕەت بوو کە مەڕی کەوڵ دەکرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: بەولاوە برۆ با فێرت بکەم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بردە نێوان گۆشت و پێستی مەڕەکەو کەوڵی کرد تاکو دەستی تا بن باڵی ون بوو، وە فەرمووی: ئەی ڕۆڵە ئا بەو شێوەیە کەوڵی بکە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشت و پێشنوێژی بۆ خەڵک کرد و دەستنوێژی نەگرتەوە.

## بابەت: نەهی کردن لە کوشتنەوەی ماڵاتی شیردەر

٣١٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَى رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ، فَأَخَذَ الشَّفْرَةَ، لِيَذْبَحَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكَ، وَالْحَلُوبَ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای پیاوێکی ئەنصاڕی، ئەویش تیغێکی هەڵگرت بۆ ئەوەی ماڵاتێک بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێتەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئاگاداربە ماڵاتی شیردەر نەکوژییەوە.

٣١٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي قُحَافَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهُ وَلِعُمَرَ: «انْطَلِقَا بِنَا إِلَى الْوَاقِفِيِّ» قَالَ: فَانْطَلَقْنَا فِي الْقَمَرِ، حَتَّى أَتَيْنَا الْحَائِطَ، فَقَالَ: مَرْحَبًا وَأَهْلًا، ثُمَّ أَخَذَ الشَّفْرَةَ، ثُمَّ جَالَ فِي الْغَنَمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكَ، وَالْحَلُوبَ» أَوْ قَالَ «ذَاتَ الدَّرِّ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکری کوڕی ئەبو قوحافە ﷺ بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەو و عومەری فەرموو: لەگەڵم وەرن بچین بۆ لای واقیفی،

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٣٨ ضمن حديث طويل.

(٣) ضعيف جداً.

گوتی: ئێمەش لە مانگەشەودا بەڕێکەوتین، هەتا هاتین و گەیشتینە ناو باخەکە، جا خاوەنی باخەکە بەخێرهاتنی کردن و گوتی: بەخێربێن، پاشان چەقۆ (تیغ)ێکی هەڵگرت، دواتر چوو بۆ ناو مەڕەکانی، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاگاداری ماڵاتی شیردەر بە.

## بابەت: حوکمی ئەو ئاژەڵەی کە ئافرەت دەیکوژێتەوە

**٣١٨٢- عَنِ ابْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً ذَبَحَتْ شَاةً بِحَجَرٍ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ «فَلَمْ يَرَ، بِهِ بَأْسًا»[١].**

واتە: ئیبنو کەعبی کوڕی مالیک لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک مەڕێکی بە بەرد کوشتبۆوە، جا ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد (تا حوکمەکەی بزانن حەڵاڵە یان حەرامە؟)، ئەویش بە ئاسایی بینی، (واتە: بە شتێکی ئاسایی وەریگرت، پێی دروست بوو).

## بابەت: چۆنیەتی کوشتنەوەی ماڵاتێک کە هەڵدێ و ناگیرێتەوە

**٣١٨٣- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَنَدَّ بَعِيرٌ، فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ لَهَا أَوَابِدَ - أَحْسَبُهُ قَالَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ - فَمَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا، فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا»[٢].**

واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەرێک بووین، لەوکاتەدا وشترێک ڕایکرد، جا پیاوێک تیرێکی تێگرت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو وشترە جۆرە هارییەکی تێدایە، وەکو ئاژەڵی دڕندە یاخی دەبێ، جا هەر ماڵاتێک ئاوای بەسەرهێنان و، لە دەستتان ڕایکرد ئێوەش ئاوای لێبکەن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٠٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٨٨، ومسلم: ١٩٦٨، وأبو داود: ٢٨٢١، والترمذي: ١٤٩٢، والنسائي: ٤٢٩٧ و ٤٤٠٩ و ٤٤١٠.

٣١٨٤- عَنْ أَبِي الْعُشَرَاءِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تَكُونُ الذَّكَاةُ، إِلَّا فِي الْحَلْقِ، وَاللَّبَّةِ قَالَ: «لَوْ طَعَنْتَ فِي فَخِذِهَا لَأَجْزَأَكَ»[١].

واتە: ئەبو عوشەڕاء لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا کوشتنەوەی ئاژەڵ تەنها لە ئەستۆو قوڕقوڕاگەوەیە؟ فەرمووی: ئەگەر بتوانی لە ڕانیشی بدەی و برینداری بکەی بۆت دروستە (زانایان دەڵێن: ئەوە تایبەتە بە ئاژەڵێک کە هەڵدێرێ بۆ جێگایەکی تەنگ و دوورە دەست).

## بابەت: نەهی کردن لە شێواندنی لاشەی ئاژەڵ و کردنی بە نیشانە بۆ تیرەندازی

٣١٨٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنْ يُمَثَّلَ، بِالْبَهَائِمِ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کەوا لاشەی ئاژەڵەکان بشێوێنرێ (وەکو بڕینی بەشێک، یان ئەندامێکی بە زیندوویی).

٣١٨٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنْ صَبْرِ الْبَهَائِمِ»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە ئاژەڵەکان بکرێتە نیشانە (تیر یان هەر شتێکی تری لێ بدرێ).

٣١٨٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَتَّخِذُوا شَيْئًا فِيهِ الرُّوحُ غَرَضًا»[٤].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر شتێک ژیاندارو ڕووح لەبەر بێ مەیکەن بە نیشانە.

٣١٨٨- عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُقْتَلَ شَيْءٌ مِنَ الدَّوَابِّ صَبْرًا[٥].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٨٢٥، والترمذي: ١٤٨١، والنسائي: ٤٤٠٨.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥١٣، ومسلم: ١٩٥٦، وأبو داود: ٢٨١٦، والنسائي: ٤٤٣٩.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٥٧، والترمذي: ١٤٧٥، والنسائي: ٤٤٤٣ و ٤٤٤٤.

(٥) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٥٩.

واتە: ئەبو زوبەیر دەگێڕێتەوە، گوێی لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لەوەی هیچ ئاژەڵێک بە نیشانە دانان بکوژرێ.

## بابەت: قەدەغەکردنی گۆشتی ماڵاتی پیس خۆر

٣١٨٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُحُومِ الْجَلَّالَةِ وَأَلْبَانِهَا»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە خواردنی گۆشت و شیری ماڵاتی پیس خۆر.

## بابەت: خواردنی گۆشتی ئەسپ

٣١٩٠- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، قَالَتْ: «نَحَرْنَا فَرَسًا، فَأَكَلْنَا مِنْ لَحْمِهِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: ئەسپێکمان کوشتەوە، لە گۆشتەکەیان خوارد لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

٣١٩١- عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «أَكَلْنَا زَمَنَ خَيْبَرَ الْخَيْلَ وَحُمُرَ الْوَحْشِ»[٣].

واتە: ئەبو زوبەیر دەگێڕێتەوە، گوێی لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ بوو دەیگوت: لە سەردەمی خەیبەردا ئەسپ و کەرەکێویان خوارد.

## بابەت: گۆشتی کەرەکێوی

٣١٩٢- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ الشَّيْبَانِيِّ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ، فَقَالَ: أَصَابَتْنَا مَجَاعَةٌ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَنَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، وَقَدْ أَصَابَ الْقَوْمُ حُمُرًا خَارِجًا مِنَ

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٧٨٥ و ٣٧٨٧، والترمذي: ١٨٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥١٠، ومسلم: ١٩٤٢، والنسائي: ٤٤٠٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢١٩، ومسلم: ١٩٤١، وأبو داود: ٣٧٨٨ و ٣٧٨٩ و ٣٨٠٨، والترمذي: ١٧٩٣، والنسائي: ٤٣٢٧_٤٣٣٠ و ٤٣٤٣.

الْمَدِينَةِ، فَنَحَرْنَاهَا وَإِنَّ قُدُورَنَا لَتَغْلِي، إِذْ نَادَى مُنَادِي النَّبِيِّ ﷺ أَنْ: «اكْفَئُوا الْقُدُورَ، وَلَا تَطْعَمُوا مِنْ لُحُومِ الْحُمُرِ شَيْئًا» فَأَكْفَأْنَاهَا، فَقُلْتُ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى حَرَّمَهَا تَحْرِيمًا قَالَ: تَحَدَّثْنَا أَنَّمَا حَرَّمَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْبَتَّةَ، مِنْ أَجْلِ أَنَّهَا، تَأْكُلُ الْعَذِرَةَ[1].

واتە: ئەبو ئیسحاقی شەیبانیی دەڵێ: پرسیارم کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا رضي الله عنهما دەربارەی (خواردنی) گۆشتی کەری ماڵی، ئەویش گوتی: لە ڕۆژی خەیبەردا تووشی برسیەتییەکی توند هاتین[2]، وە ئێمەش لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، خەڵکیش ئەو گوێدرێژەی کە لە مەدینە هاتبووە دەر گرتبووەوە و کوشتمانەوە، وە مەنجەڵەکانمان دەکوڵین، لەوکاتەدا جارچییەکی پێغەمبەر ﷺ جاڕیدا کە مەنجەڵەکانتان وەرگێڕن و هیچ شتێک لە گۆشتی کەرەکان نەخۆن، ئێمەش وەرمانگێڕان، منیش بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفاوم گوت: هەر بە حەڕام کردن حەڕامی کردن؟ گوتی: باسمان کرد کە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ بە یەکجاری حەڕامی کرد، چونکە شتی پیس دەخوات (وەکو پاشەڕۆ).

**٣١٩٣-** عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ الْكِنْدِيِّ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «حَرَّمَ أَشْيَاءَ، حَتَّى ذَكَرَ الْحُمُرَ الْإِنْسِيَّةَ»[3].

واتە: میقدامی کوڕی مەعدی کەریبی کیندیی رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چەند شتێکی حەڕام کرد، (لە ناویاندا) هەتا باسی کەری ماڵیشی کرد.

**٣١٩٤-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنه، قَالَ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نُلْقِيَ لُحُومَ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ، نِيئَةً، وَنَضِيجَةً، ثُمَّ لَمْ يَأْمُرْنَا بِهِ بَعْدُ»[4].

واتە: بەرائی کوڕی عازیب رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین بە فڕێدان و ڕشتنی گۆشتی کەری ماڵی جا کاڵ بێ، یان کوڵیو، ئیتر لەمەودوا فەرمانی پێنەکردینەوە (بە خواردنی).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٥٥، ومسلم: ١٩٣٧، والنسائي: ٤٣٣٩.

(٢) بەهۆی درێژەکێشان و بەردەوامی گەمارۆدانی خەیبەر.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢٢٦، ومسلم: ١٩٣٨، والنسائي: ٤٣٣٨.

**٣١٩٥- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ، قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَزْوَةَ خَيْبَرَ، فَأَمْسَى النَّاسُ، قَدْ أَوْقَدُوا النِّيرَانَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَامَ تُوقِدُونَ؟» قَالُوا: عَلَى لُحُومِ الْحُمُرِ الْإِنْسِيَّةِ فَقَالَ: «أَهْرِيقُوا مَا فِيهَا وَاكْسِرُوهَا» فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَوْ نُهَرِيقُ مَا فِيهَا وَنَغْسِلُهَا؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَوْ ذَاكَ»[١].**

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ لە غەزای خەیبەر بووین، جا خەڵکی ئێوارەیان بەسەردا هات و ئاگریان کردەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چی بەسەر ئاگرەکە دەنێن؟ گوتیان: گۆشتی کەریماڵی، فەرمووی: ئەوەی تێیدایە بیڕێژن و بیبانشکێنن، ئنجا پیاوێک لە خەڵکەکە گوتی: یان بیڕێژین و قاپ و قاچاغەکە بشۆینەوە؟ ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: یان ئەوە بکەن.

**٣١٩٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ مُنَادِيَ النَّبِيِّ ﷺ: نَادَى «إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يَنْهَيَانِكُمْ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ، فَإِنَّهَا رِجْسٌ»[٢].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، جاڕچییەکی پێغەمبەر ﷺ جاڕیدا (گوتی): بێگومان خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ نەهیتان لێدەکەن لە (خواردنی) گۆشتی کەری ماڵی، چونکە بێگومان پیسە.

## بابەت: گۆشتی ئێستر (هێستر)

**٣١٩٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا نَأْكُلُ لُحُومَ الْخَيْلِ» قُلْتُ: فَالْبِغَالُ، قَالَ: «لَا»[٣].**

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە گۆشتی ئەسپمان دەخوارد، (ڕاوی دەڵێ:) گوتم: هی ئێستریش؟ گوتی: نەخێر.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٧٧، ومسلم: ١٨٠٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٩١ مطولًا و ٤١٩٨ مطولًا، ومسلم: ١٩٤٠، والنسائي: ٦٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢١٩، ومسلم: ١٩٤١ بنحوه، وأبو داود: ٣٧٨٨_٣٧٨٩ و ٣٨٠٨، والترمذي: ١٤٧٨ مطولًا، والنسائي: ٤٣٢٧_٤٣٢٩ و ٤٣٤٣.

٣١٩٨- عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُحُومِ الْخَيْلِ، وَالْبِغَالِ، وَالْحَمِيرِ»[١].

واتە: خالیدی کوڕی وەلید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی ئەسپ و ئێسترو گوێ درێژی قەدەغە کردوە.

## بابەت: کوشتنەوەی ئاژەڵ بە بری بێچووی ناوسکی ئاژەڵەکە دەکەوێ

٣١٩٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْجَنِينِ فَقَالَ: «كُلُوهُ إِنْ شِئْتُمْ، فَإِنَّ ذَكَاتَهُ، ذَكَاةُ أُمِّهِ»[٢].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: دەربارەی بێچووی ناوسکی ئاژەڵ پرسیارمان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: ئەگەر حەزتان لێبوو بیخۆن، چونکە کوشتنەوەی دایکەکەی بە بری کوشتنەوەی ئەویش دەکەوێ.

* * *

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٧٩٠، والنسائي: ٤٣٣١ و ٤٣٣٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٢٧، والترمذي: ١٤٧٦.

## بابەت: کوشتنی سەگ، جگە لە سەگی ڕاو یان پاسەوانی

٣٢٠٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «أَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلَابِ» ثُمَّ قَالَ: «مَا لَهُمْ، وَلِلْكِلَابِ؟» ثُمَّ رَخَّصَ لَهُمْ فِي كَلْبِ الصَّيْدِ[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بە کوشتنی سەگەکان، پاشان فەرمووی: چییان بەسەر سەگەکانەوەیە (واتە: ئیشی چیتان پێیە)؟ پاشان مۆڵەتی فەرموو بە ڕاگرتنی سەگی ڕاوکردن.

٣٢٠١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «أَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلَابِ» ثُمَّ قَالَ: «مَا لَهُمْ وَلِلْكِلَابِ؟» ثُمَّ رَخَّصَ لَهُمْ فِي كَلْبِ الزَّرْعِ، وَكَلْبِ الْعِينِ قَالَ بُنْدَارٌ: الْعِينُ حِيطَانُ الْمَدِينَةِ[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بە کوشتنی سەگەکان، پاشان فەرمووی: چ کارێکیان بەسەر سەگەکانەوە هەیە؟ پاشان مۆڵەتی فەرموو بە ڕاگرتنی سەگی پاسەوانی بۆ کشتوکاڵ و پاسەوانی باغ و باغاتەکانی مەدینە.

٣٢٠٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِقَتْلِ الْكِلَابِ[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بە کوشتنی سەگەکان.

٣٢٠٣- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: رَافِعًا صَوْتَهُ، «يَأْمُرُ بِقَتْلِ الْكِلَابِ، وَكَانَتِ الْكِلَابُ، تُقْتَلُ، إِلَّا كَلْبَ صَيْدٍ، أَوْ مَاشِيَةٍ»[٤].

واتە: سالیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دەنگی بەرز کردبۆوەو فەرمانی دەکرد بە کوشتنی سەگەکان، وە ئیتر سەگەکان دەکوژران (واتە: دەیانکوشتن) جگە لە سەگی ڕاو یان سەگێک کە پاسەوانی مەڕو ماڵات بکات.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٠ و ١٥٧٣، وأبو داود: ٧٤، والنسائي: ٣٣٦ و ٣٣٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٠ و ١٥٧٣، وأبو داود: ٧٤، والنسائي: ٣٣٦ و ٣٣٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٢٣، ومسلم: ١٥٧٠، والنسائي: ٤٢٧٧.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٨٠، ومسلم: ١٥٧٤، والترمذي: ١٤٨٧ و ١٤٨٨، والنسائي: ٤٢٧٨.

## بابەت: قەدەغەکردنی ڕاگرتنی سەگ، جگە لە سەگی ڕاوو پاسەوانی

**٣٢٠٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا، فَإِنَّهُ يَنْقُصُ مِنْ عَمَلِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ، إِلَّا كَلْبَ حَرْثٍ أَوْ مَاشِيَةٍ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سەگ ڕابگرێ ئەوە هەموو ڕۆژێک «قیراط»ێک لە کردەوەکانی کەم دەبێتەوە، جگە لە سەگێک کە بە مەبەستی پاسەوانی کشتوکاڵ یان پاسەوانی مەڕو ماڵات ڕابگیرێ.

**قیراط:** بە ئەندازەی کێوێکی گەورەیە.

**٣٢٠٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْلَا أَنَّ الْكِلَابَ أُمَّةٌ مِنَ الْأُمَمِ، لَأَمَرْتُ بِقَتْلِهَا، فَاقْتُلُوا مِنْهَا، الْأَسْوَدَ الْبَهِيمَ، وَمَا مِنْ قَوْمٍ اتَّخَذُوا كَلْبًا، إِلَّا كَلْبَ مَاشِيَةٍ، أَوْ كَلْبَ صَيْدٍ، أَوْ كَلْبَ حَرْثٍ، إِلَّا نَقَصَ مِنْ أُجُورِهِمْ، كُلَّ يَوْمٍ، قِيرَاطَانِ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سەگەکانیش یەکێک نەبوونایە لە ئوممەتەکان ئەوە فەرمانم دەکرد بە کوشتنیان، جا ئەو سەگەی کە ڕەشێکی زۆر تێرە لە ڕەشیدا بیکوژن، وە بێگومان هەر هۆزو قەومێک سەگ ڕابگرێ، جگە لە سەگی پاسەوانی مەڕو ماڵات یان سەگێک کە فێری ڕاو کرابێ یان پاسەوانی کشتوکاڵی پێبکرێ، ئەوە بە دڵنیایی هەموو ڕۆژێک دوو «قیراط» لە پاداشتییان کەم دەبێتەوە.

**٣٢٠٦-** عَنْ سُفْيَانَ بْنِ أَبِي زُهَيْرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا، لَا يُغْنِي عَنْهُ زَرْعًا، وَلَا ضَرْعًا، نَقَصَ مِنْ عَمَلِهِ، كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ» فَقِيلَ لَهُ: أَنْتَ سَمِعْتَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: إِيْ. وَرَبِّ هَذَا الْمَسْجِدِ[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٢٢، ومسلم: ١٥٧٥ و ١٥٧٦، وأبو داود: ٢٨٤٤، والترمذي: ١٤٩٠، والنسائي: ٤٢٨٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٤٥، والترمذي: ١٤٨٦ و ١٤٨٩، والنسائي: ٤٢٨٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٢٣، ومسلم: ١٥٧٦، والنسائي: ٤٢٨٥.

واتە: سوفیانی کوڕی ئەبو زوهەیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک سەگێک ڕابگرێ کە نە بۆ پاسەوانی کشتوکاڵ و نە بۆ پاسەوانی مەڕو ماڵات ئیشی پێ نەبێ، ئەوە هەموو ڕۆژێک قیراتێک لە کردەوە باشەکانی کەم دەبێتەوە، بە سوفیان گوترا: تۆ لە پێغەمبەرت ﷺ بیست؟ گوتی: ئەرێ بە پەروەردگاری ئەو مزگەوتە.

## بابەت: ڕاوی سەگ

**٣٢٠٧-** عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا بِأَرْضِ أَهْلِ كِتَابٍ، نَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ، وَبِأَرْضِ صَيْدٍ، أَصِيدُ بِقَوْسِي، وَأَصِيدُ بِكَلْبِي الْمُعَلَّمِ، وَأَصِيدُ بِكَلْبِي الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَّا مَا ذَكَرْتَ أَنَّكُمْ فِي أَرْضِ أَهْلِ كِتَابٍ، فَلَا تَأْكُلُوا فِي آنِيَتِهِمْ، إِلَّا أَنْ لَا تَجِدُوا مِنْهَا بُدًّا، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مِنْهَا بُدًّا، فَاغْسِلُوهَا وَكُلُوا فِيهَا، وَأَمَّا مَا ذَكَرْتَ، مِنْ أَمْرِ الصَّيْدِ، فَمَا أَصَبْتَ بِقَوْسِكَ، فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ وَكُلْ، وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ، فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ وَكُلْ، وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ، فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ، فَكُلْ»[1].

واتە: ئەبو سەعلەبەی خوشەنیی ﷺ دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لە شوێنێکین کە ئەهلی کیتاب (جولەکە یان گاور) تێیدا دەژین، لە قاپ و قاچاغەکەیاندا دەخۆین، وە لە شوێنی ڕاوو شکارین، بە تیر وکەوانەکەم و سەگە ڕاهێنراوەکەم و سەگە ڕانەهێنراوەکەشم ڕاو دەکەم، گوتی: جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵام ئەوەی کە باست کرد لە وڵاتی ئەهلی کیتابن ئەوە لە قاپ و قاچاغەکانیان شت مەخۆن، مەگەر هییی دیکەتان دەست نەکەوێ جگە لە هی وان، جا ئەگەر جگە لە هی ئەوان دەستتانکەوت ئەوە بیشۆنەوەو پێی بخۆن، بەڵام ئەوەی کە باسی ڕاوت کرد، ئەوە هەر شتێک بە تیر وکەوانی خۆت پێکات، ئەوە ناوی خوای لەسەر بێنەو بیخۆ، ئەوەشی بە سەگە ڕاهێنراوەکەت ڕاوت کرد ئەوە ناوی خوای لەسەر بێنەو بیخۆ، ئەوەشی کە بە سەگە ڕانەهێنراوەکەت ڕاوت کردو پێڕاگەشتی بیکوژیەوەو مردار نەببوو ئەوە بیخۆ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٧٨، ومسلم: ١٩٣٠، وأبو داود: ٢٨٥٢ و ٢٨٥٥ و ٢٨٥٦ و ٣٨٣٩، والترمذي: ١٤٦٤ و ١٧٩٧، والنسائي: ٤٢٦٦.





**٣٢٠٨-** عَنْ عَدِيِّ ابْنِ حَاتِمٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: إِنَّا قَوْمٌ نَصِيدُ، بِهَذِهِ الْكِلَابِ قَالَ: «إِذَا أَرْسَلْتَ كِلَابَكَ الْمُعَلَّمَةَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا، فَكُلْ مَا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ، إِنْ قَتَلْنَ، إِلَّا أَنْ يَأْكُلَ الْكَلْبُ، فَإِنْ أَكَلَ الْكَلْبُ، فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ إِنَّمَا أَمْسَكَ، عَلَى نَفْسِهِ، وَإِنْ خَالَطَهَا كِلَابٌ أُخَرُ، فَلَا تَأْكُلْ» قَالَ ابْنُ مَاجَةَ سَمِعْتُهُ، يَعْنِي عَلِيَّ بْنَ الْمُنْذِرِ يَقُولُ: حَجَجْتُ ثَمَانِيَةً وَخَمْسِينَ حِجَّةً، أَكْثَرُهَا رَاجِلٌ[١].

واتە: عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردو گوتم: ئێمە قەومێکین کە بەو سەگانە ڕاو دەکەین، فەرمووی: ئەگەر سەگە ڕاهێنراوەکانت بەرهەڵدا کرد، ناوی خوات لەسەر هێنا ئەوە ئەو شتەی بۆتی ڕاوکردوە لێی بخۆ ئەگەر بیشیکوژن، ئیللا مەگەر سەگەکە لێی بخوات، جا ئەگەر سەگەکە لێی خوارد، ئەوە تۆ لێی مەخۆ، چونکە ترسی ئەوەم هەیە سەگەکە بۆخۆی گرتبێ نەک بۆ تۆ، وە ئەگەر سەگی دیکەشی لەگەڵدا تێکەڵ بوون بۆ ڕاوەکە ئەوە هەر لێی مەخۆ. ئیبنو ماجە دەڵێ: لە عەلی کوڕی مونزیرم بیست دەیگوت: پەنجاو هەشت حەجم کردوە زۆربەیان بە پیادە ڕۆیشتووم.

## بابەت: نێچیری سەگی ئاگر پەرستان و، سەگی ڕەشی تێر

**٣٢٠٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «نُهِينَا عَنْ صَيْدِ كَلْبِهِمْ، وَطَائِرِهِمْ، يَعْنِي الْمَجُوسَ»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئەو نێچیرەی کە سەگی مەجوسەکان یان تەیرو باڵندەی مەجوسەکان ڕاوی دەکات لێمان قەدەغەکراوە (بۆمان حەڵاڵ نیە).

**٣٢١٠-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْكَلْبِ الْأَسْوَدِ الْبَهِيمِ، فَقَالَ: «شَيْطَانٌ»[٣].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی سەگی ڕەشی زۆر ڕەش، فەرمووی: (سەگی ڕەش) شەیتانە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٧٥، ومسلم: ١٩٢٩، وأبو داود: ٢٨٤٧_٢٨٤٩ و ٢٨٥٤، والترمذي: ١٤٧٠، والنسائي: ٤٢٦٣ و ٤٢٦٤ و ٤٢٧٤ و ٤٢٧٥.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٤٦٦.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٥١٠، وأبو داود: ٧٠٢، والترمذي: ٣٣٨، والنسائي: ٧٥٠.

## بابەت: ڕاوو نێچیری تیروکەوان

٣٢١١- عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «كُلْ مَا رَدَّتْ عَلَيْكَ قَوْسُكَ»[١].

واتە: ئەبو سەعلەبەی خوشەنیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی کە بە تیر وکەوانەکەت ڕاوت کرد بیخۆ.

٣٢١٢- عَنْ عَدِيِّ ابْنِ حَاتِمٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا قَوْمٌ نَرْمِي، قَالَ: «إِذَا رَمَيْتَ وَخَزَقْتَ فَكُلْ مَا خَزَقْتَ»[٢].

واتە: عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە قەومێکین ڕاو بە تیروکەوان دەکەین، فەرمووی: هەرکات تیرت هاویشت و لە نێچیرەکەتداو بریندارت کرد ئەوە ئەو نێچیرە بخۆ.

## بابەت: نێچیرێکی ڕاوکراو کە شەوێک دیار نامێنێ

٣٢١٣- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرْمِي الصَّيْدَ، فَيَغِيبُ عَنِّي لَيْلَةً؟ قَالَ: «إِذَا وَجَدْتَ فِيهِ سَهْمَكَ، وَلَمْ تَجِدْ فِيهِ شَيْئًا غَيْرَهُ، فَكُلْهُ»[٣].

واتە: عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تیر دەگرمە نێچیرو جار هەیە شەوێک تێدەپەڕێ لێم ونە؟ فەرمووی: ئەگەر بینیتەوەو تیری تۆی پێوەبوو هیچ شتێکی تری پێوەنەبوو (هۆی کوشتنی بێ) ئەوە بیخۆ.

## بابەت: ڕاوی گۆپاڵ و گۆپاڵ کە پارچە ئاسنێکی تیژیان پێوەبێت

٣٢١٤- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّيْدِ بِالْمِعْرَاضِ قَالَ: «مَا أَصَبْتَ بِحَدِّهِ، فَكُلْ، وَمَا أَصَبْتَ بِعَرْضِهِ، فَهُوَ وَقِيذٌ»[٤].

---

(١) صحيح. انظر البخاري: ٥٤٧٨، ومسلم: ١٩٣٠.

(٢) صحيح. انظر حديث: (٣٢١٤ و ٣٢١٥).

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٨٤، ومسلم: ٦ و ١٩٢٩/٧، وأبو داود: ٢٨٤٩، والترمذي: ١٤٦٩، والنسائي: ٤٢٦٣ و ٤٢٦٨ و ٤٢٩٨ و ٤٢٩٩.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٧٥، ومسلم: ١٩٢٩/٣، وأبو داود: ٢٨٤٧ و ٢٨٥٤، والترمذي: ١٤٧١، والنسائي: ٤٢٧٤.

واتە: عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ڕاوکردن بە گۆپاڵێک کە ئاسن، یان شتێکی وەکو ئاسن بە سەرەکەیەوە بێ؟ فەرمووی: ئەوەی کە بە باری تیژییەکەی پێت ڕاوکردوە بیخۆ، بەڵام ئەوەی بە باری پانی گۆپاڵەکە ڕاوت کردوە ئەوە مردارەوە بووە (خواردنی حەڕامە).

**٣٢١٥-** عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمِعْرَاضِ، فَقَالَ: «لَا تَأْكُلْ، إِلَّا أَنْ يَخْزِقَ»[١].

واتە: عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕاوکردن بە گۆپاڵ و دارتەختە؟ فەرمووی: لێی مەخۆ، مەگەر نێچیرەکەت بریندار کردبێ (ئەوکات حەڵاڵە).

## بابەت: لێکردنەوەی پارچەیەک لە ئاژەڵ بە زیندوویی

**٣٢١٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ، فَمَا قُطِعَ مِنْهَا، فَهُوَ مَيْتَةٌ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر شتێک و پارچەیەک لە ئاژەڵ لێبکرێتەوە بە زیندوویی ئەوە ئەو پارچەیە مردارەوەبوویە (خواردنی حەڕامە).

**٣٢١٧-** عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ، قَوْمٌ يَجُبُّونَ أَسْنِمَةَ الْإِبِلِ، وَيَقْطَعُونَ أَذْنَابَ الْغَنَمِ، أَلَا، فَمَا قُطِعَ مِنْ حَيٍّ، فَهُوَ مَيِّتٌ»[٣].

واتە: تەمیمی داریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کۆتایی زەماندا کەسانێک دێن کە لە کۆپانەی وشترو لە پاشەڵی مەڕ بە زیندوویی لێ دەکەنەوە، ئاگاداربن هەر شتێک لە ئاژەڵی زیندوو لێبکرێتەوە ئەوە ئەو پارچە بڕدراوە مردارە (خواردنی حەڕامە).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٧٧، ومسلم: ١٩٢٩، وأبو داود: ٤٨٤٧، والترمذي: ١٤٦٥، والنسائي: ٤٢٦٥ و ٤٢٦٧.

(٢) صحيح لغيره. انظر أبو داود: ٢٨٥٨، والترمذي: ١٤٨٠.

(٣) ضعيف جداً.

## بابەت: ڕاوکردنی ماسی و کولله

**٣٢١٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ: الْحُوتُ، وَالْجَرَادُ»(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو شت بە مرداری بۆ ئێمە حەڵاڵ کراون: ماسی و کولله.

**٣٢١٩-** عَنْ سَلْمَانَ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْجَرَادِ؟ فَقَالَ: «أَكْثَرُ جُنُودِ اللَّهِ، لَا آكُلُهُ، وَلَا أُحَرِّمُهُ»(٢).

واتە: سەلمان ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی کولله؟ فەرمووی: زۆرترین سەربازی خوا کوللەیە، نایخۆم و حەڕامیشی ناکەم.

**٣٢٢٠-** عَنْ أَبِي سَعْدٍ الْبَقَّالِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ: «كُنَّ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺ يَتَهَادَيْنَ الْجَرَادَ، عَلَى الْأَطْبَاقِ»(٣).

واتە: ئەبو سەعدی بەققال دەگێڕێتەوە، گوێی لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ بوو، دەیگوت: خێزانەکای پێغەمبەر ﷺ کوللەیان بە دیاری بۆ یەکتری دەنارد لەسەر دەوری و قاپ و سینی.

**٣٢٢١-** عَنْ جَابِرٍ، وَأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: كَانَ إِذَا دَعَا عَلَى الْجَرَادِ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَهْلِكْ كِبَارَهُ، وَاقْتُلْ صِغَارَهُ، وَأَفْسِدْ بَيْضَهُ، وَاقْطَعْ دَابِرَهُ، وَخُذْ بِأَفْوَاهِهَا، عَنْ مَعَايِشِنَا وَأَرْزَاقِنَا، إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ» فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ تَدْعُو عَلَى جُنْدٍ مِنْ أَجْنَادِ اللَّهِ بِقَطْعِ دَابِرِهِ قَالَ: «إِنَّ الْجَرَادَ نَثْرَةُ الْحُوتِ فِي الْبَحْرِ» قَالَ هَاشِمٌ: قَالَ زِيَادٌ: فَحَدَّثَنِي مَنْ رَأَى الْحُوتَ يَنْثُرُهُ(٤).

واتە: جابیر و ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێک دوعای لە کولله بکردایە دەیفەرموو: خوایە گەورەکانیان لەناوبەرەو گچکەکانیان بکوژەو هێلکەکانیان خراپ بکەو کۆتاییان پێ بێنە، وە لە ئاستی ڕزق و ڕۆزیان دەمیان

---

(١) حسن.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٨١٣ و ٣٨١٤.

(٣) ضعيف الإسناد.

(٤) موضوع. أخرجه الترمذي: ١٨٢٣.

ببەستە، بێگومان تۆ بیسەری گشت دوعاکانی، جا پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دوعا لە سەربازێک لە سەربازەکانی خوا دەکەی بەوەی کە کۆتاییان پێ بێنێ؟ فەرمووی: کوللە لە پژمەی نەهەنگی ناو دەریاوە بڵاوبوونەوە. هاشیم گوتی: زیاد گوتی: ئەو کەسەی بینیویەتی کە لە پژمەی نەهەنگ کوللە بڵاودەبێتەوە بۆی گێڕاومەوە.

**٣٢٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَجَّةٍ، أَوْ عُمْرَةٍ، فَاسْتَقْبَلَنَا رِجْلٌ مِنْ جَرَادٍ، أَوْ ضَرْبٌ مِنْ جَرَادٍ، فَجَعَلْنَا نَضْرِبُهُنَّ بِأَسْوَاطِنَا، وَنِعَالِنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «كُلُوهُ، فَإِنَّهُ مِنْ صَيْدِ الْبَحْرِ»**[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بۆ حەجێک یان عومرەیەک دەرچووین، تووشی جۆرە کوللەیەکی زۆر بووین، ئێمەش بە قامچی و نەعلەکانمان لێیاندان، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیانخۆن، چونکە بێگومان ئەوانە نێچیری دەریان.

## بابەت: ئەو شتانەی کوشتنیان قەدەغەکراوە

**٣٢٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ قَتْلِ الصُّرَدِ، وَالضِّفْدَعِ، وَالنَّمْلَةِ، وَالْهُدْهُدِ»**[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە کوشتنی ئەو باڵندەیەی کە جرِوجانەوەری ورد دەخوات (الصرد) و کوشتنی بۆق و مێرووله و هودهود (پەپوسلێمانە).

**٣٢٢٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنَ الدَّوَابِّ، النَّمْلَةِ، وَالنَّحْلَةِ، وَالْهُدْهُدِ، وَالصُّرَدِ»**[3].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٨٥٤، والترمذي: ٨٥٠.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٢٦٧.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە کوشتنی چوار جانەوەر: مێرووولە، هەنگ، هودهود (پەپوسلێمانە)، ئەو باڵندەیەی کە جرِو جانەوەری ورد دەخوات.

**٣٢٢٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ نَبِيًّا مِنَ الْأَنْبِيَاءِ قَرَصَتْهُ نَمْلَةٌ، فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ، فَأُحْرِقَتْ، فَأَوْحَى اللَّهُ ﷻ إِلَيْهِ: أَفِي أَنْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ، أَهْلَكْتَ أُمَّةً مِنَ الْأُمَمِ، تُسَبِّحُ»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێک لە پێغەمبەرەکانی خوا مێروولەیەک پێوەیدا (گەستی)، ئەویش فەرمانی کردو شارە مێرووولەکە سوتێنرا، ئنجا خوای ﷻ وەحی بۆ نارد بەوەی کە: مێروولەیەک تۆی گەست، کە چی ئوممەتێکت لەو ئوممەتانە لەناوبرد کە تەسبیحات دەکەن (خوا بە پاک دەگرن)؟!

**٣٢٢٥م-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، بِإِسْنَادِهِ نَحْوَهُ وَقَالَ: قَرَصَتْ[٢].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە، تەنها ئەوە نەبێ گوتوویەتی: (قَرَصَتْ) واتە: گەستی.

## بابەت: نەهی کردن لە بەردووچکە هاویشتن بە نێوانی دوو پەنجە

**٣٢٢٦-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ ﷺ، أَنَّ قَرِيبًا لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ خَذَفَ، فَنَهَاهُ، وَقَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ: نَهَى عَنِ الْخَذْفِ وَقَالَ: «إِنَّهَا لَا تَصِيدُ صَيْدًا، وَلَا تَنْكَأُ عَدُوًّا، وَلَكِنَّهَا تَكْسِرُ السِّنَّ، وَتَفْقَأُ الْعَيْنَ» قَالَ: فَعَادَ، فَقَالَ: أُحَدِّثُكَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْهُ، ثُمَّ عُدْتَ، لَا أُكَلِّمُكَ أَبَدًا[٣].

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر ﷺ دەگێڕێتەوە، کە خزمێکی نزیکی عەبدڵڵای کوڕی موغەففەل لە تەنیشتی دانیشتبوو، بە پەنجەکانی (پەنجەی شایەتمان لە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠١٩، ومسلم: ٢٢٤١، وأبو داود: ٥٢٦٦، والنسائي: ٤٣٥٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠١٩، ومسلم: ٢٢٤١، وأبو داود: ٥٢٦٦، والنسائي: ٤٣٥٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨٤١ و ٥٤٧٩ و ٦٢٢٠، ومسلم: ١٩٥٤ وانظر: ٣٢٢٧، وأبو داود: ٥٢٧٠، والنسائي: ٤٧/٨.

دەستی ڕاست و هەمان پەنجەی بەرانبەری لە دەستی چەپی) بەردی دەخستە ناویان و بەردەکەی دەهاویشت، جا عەبدوڵڵا ڕێگری لێکردو گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوەو فەرموویەتی: (ئەو جۆرە بەرد هاویشتنە) هیچ نێچیرێک ڕاو ناکات، وە ئازار بە دووژمن ناگەیەنێ، (بەڵکو) ئەو کارە دەبێتە هۆی ددان شکاندن و، چاوکوێر کردن، سەعید دەڵێ: دوای ئەوە جارێکیتر برازاکەی هەمان ڕەفتاری ئەنجام دایەوە! عەبدوڵڵاش پێی گوت: من دەڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارەی قەدەغە کردوە، کەچی تۆ دووبارەت کردەوە؟ کەواتە هەرگیز قسەت لەگەڵدا ناکەمەوە.

**٣٢٢٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْخَذْفِ، وَقَالَ: «إِنَّهَا لَا تَقْتُلُ الصَّيْدَ، وَلَا تَنْكِي الْعَدُوَّ، وَلَكِنَّهَا تَفْقَأُ الْعَيْنَ، وَتَكْسِرُ السِّنَّ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە بەردووچکە هاویشتن بە نێوانی پەنجەکان و فەرموویەتی: ئەو جۆرە بەردووچکە هاویشتنە نە نێچیر ڕاودەکات، نە دوژمن دەترسێنێ و دەبەزێنێ، بەڵام چاو کوێر دەکات و ددان دەشکێنێ.

## بابەت: کوشتنی شەوگەرد (مارمێلکە)

**٣٢٢٨-** عَنْ أُمِّ شَرِيكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «أَمَرَهَا بِقَتْلِ الْأَوْزَاغِ»[2].

واتە: ئوممو شەریک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە بە کوشتنی شەوگەردەکان.

**٣٢٢٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَتَلَ وَزَغًا فِي أَوَّلِ ضَرْبَةٍ، فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً، وَمَنْ قَتَلَهَا فِي الثَّانِيَةِ، فَلَهُ كَذَا وَكَذَا، أَدْنَى مِنَ الْأُولَى، وَمَنْ قَتَلَهَا فِي الضَّرْبَةِ الثَّالِثَةِ، فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً، أَدْنَى مِنَ الَّذِي ذَكَرَهُ فِي الْمَرَّةِ الثَّانِيَةِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٢٠، ومسلم: ١٩٥٤، والنسائي: ٤٨١٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٠٧ و ٣٣٥٩، ومسلم: ٢٢٣٧، والنسائي: ٢٨٨٥.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٤٠، وأبو داود: ٥٢٦٣، والترمذي: ١٤٨٢.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە یەکەم لێدان شەوگەردێک بکوژێ، ئەوەندەو ئەوەندە چاکەی بۆ هەیە، وە هەر کەس بە دووەم لێدان بیکوژێ، ئەوەندەو ئەوەندە چاکەی بۆ هەیە لە هی یەکەم کەمتر، وە هەر کەس بە سێیەم لێدان بیکوژێ، ئەوەندەو ئەوەندە چاکەی بۆ هەیە، لە هی دووەم کەمتر کە باسی چاکەو پاداشتەکەی کرد.

**٣٢٣٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لِلْوَزَغِ الْفُوَيْسِقَةُ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی شەوگەرد فەرموویەتی: ئەوە بەدکارە (یان: بەدکارۆکەیە).

**٣٢٣١-** عَنْ سَائِبَةَ مَوْلَاةِ الْفَاكِهِ بْنِ الْمُغِيرَةِ، أَنَّهَا دَخَلَتْ عَلَى عَائِشَةَ ﵂ فَرَأَتْ فِي بَيْتِهَا رُمْحًا مَوْضُوعًا، فَقَالَتْ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ مَا تَصْنَعِينَ بِهَذَا؟ قَالَتْ: نَقْتُلُ بِهِ هَذِهِ الْأَوْزَاغَ، فَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ أَخْبَرَنَا: «أَنَّ إِبْرَاهِيمَ لَمَّا أُلْقِيَ فِي النَّارِ، لَمْ تَكُنْ فِي الْأَرْضِ دَابَّةٌ، إِلَّا أَطْفَأَتِ النَّارَ، غَيْرَ الْوَزَغِ، فَإِنَّهَا كَانَتْ تَنْفُخُ عَلَيْهِ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِقَتْلِهِ»[٢].

واتە: سائیبە خزمەتکاری فاکیهەی کوڕی موغیرە دەگێڕێتەوە، چوو بۆ لای عائیشە ﵂، جا بینی ڕمێک لە ماڵەکەیدا دانراوە، ئەویش گوتی: ئەی دایکی بڕواداران بەو ڕمە چی دەکەن؟ گوتی: ئەو شەوگەردانەی پێ دەکوژین، چونکە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕاگەیاندووین کاتێک ئیبڕاهیم دەخرێتە ناو ئاگر هەرچی جڕوجانەوەری زەوی هەیە خەریکی کوژاندنەوەی ئاگرەکە بووە جگە لە شەوگەرد، ئەو فووی لێکردوە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بە کوشتنی شەوگەرد.

## بابەت: خواردنی دڕندە چڕنووکدارەکان

**٣٢٣٢-** عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «نَهَى عَنْ أَكْلِ، كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ» قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَلَمْ أَسْمَعْ بِهَذَا، حَتَّى دَخَلْتُ الشَّامَ[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٣١، ومسلم: ٢٢٣٩، والنسائي: ٢٨٨٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٣٠ و ٥٧٨٠، ومسلم: ١٩٣٢، وأبو داود: ٣٨٠٢، والترمذي: ١٤٧٧، والنسائي: ٤٣٢٥ و ٤٣٢٦ و ٤٣٤٢.

واتە: ئەبو سەعلەبەی خوشەنیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە خواردنی هەرچی ئاژەڵی دڕندەی کەڵبەدارە. زوهری گوتوویەتی: تاکو نەچوومە شام ئەوەم نەبیستبوو.

**٣٢٣٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَكْلُ، كُلِّ ذِي نَابٍ، مِنَ السِّبَاعِ، حَرَامٌ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خواردنی هەموو ئاژەڵێکی کەڵبەداری دڕندە حەرامە.

**٣٢٣٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَوْمَ خَيْبَرَ، عَنْ أَكْلِ، كُلِّ ذِي نَابٍ، مِنَ السِّبَاعِ، وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ، مِنَ الطَّيْرِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا نەهی کرد لە خواردنی هەموو کەڵبەدارێک لە ئاژەڵە دڕندەکان و هەموو باڵندە چڕنووکدارەکان.

## بابەت: گورگ و ڕێوی

**٣٢٣٥-** عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ جَزْءٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ جِئْتُكَ لِأَسْأَلَكَ عَنْ أَحْنَاشِ الْأَرْضِ، مَا تَقُولُ فِي الثَّعْلَبِ قَالَ: «وَمَنْ يَأْكُلُ الثَّعْلَبَ؟» قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تَقُولُ فِي الذِّئْبِ؟ قَالَ: «وَيَأْكُلُ الذِّئْبَ أَحَدٌ فِيهِ خَيْرٌ؟»[٣].

واتە: خوزەیمەی کوڕی جەزء ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا هاتوومە خزمەتت دەربارەی جڕوجانەوەرو ئاژەڵی کێوی پرسیارت لێ بکەم، چی دەفەرمووی دەربارەی ڕێوی؟ فەرمووی: جا کێ هەیە ڕێوی بخوات؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەفەرمووی دەربارەی گورگ؟ فەرمووی: جا کەسێک خێرو بێری تێدا بێ گورگ دەخوات؟!

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٣٣، والترمذي: ١٤٧٩ و ١٧٩٦، والنسائي: ٤٣٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٣٤، وأبو داود: ٣٨٠٥، والنسائي: ٤٣٤٨.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٧٩٢ مقتصراً علي الجملة الأخيرة.

## بابەت: کەمتیار

**٣٢٣٦- عَنِ ابْنِ أَبِي عَمَّارٍ وَهُوَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ، قَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ الضَّبُعِ أَصَيْدٌ هُوَ، قَالَ: «نَعَمْ» قُلْتُ: آكُلُهَا، قَالَ: «نَعَمْ»، قُلْتُ: أَشَيْءٌ سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «نَعَمْ»[1].**

واتە: ئیبنو ئەبو عەممارِ کە (ناوی) عەبدوڕڕەحمانە دەڵێ: پرسیارم لە جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ ئایا کەمتیار لە نێچیرەکانە؟ گوتی: بەڵێ، گوتم: بیخۆم؟ گوتی: بەڵێ، گوتم: ئایا ئەوەت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە؟ گوتی: بەڵێ.

**٣٢٣٧- عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ جَزْءٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تَقُولُ فِي الضَّبُعِ؟ قَالَ: «وَمَنْ يَأْكُلُ الضَّبُعَ؟»[2].**

واتە: خوزەیمەی کوڕی جەزء ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەفەرمووی دەربارەی کەمتیار؟ فەرمووی: جا کێ کەمتیار دەخوات؟

## بابەت: بزنمژە

**٣٢٣٨- عَنْ ثَابِتِ بْنِ يَزِيدَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَصَابَ النَّاسُ ضِبَابًا، فَاشْتَوَوْهَا، فَأَكَلُوا مِنْهَا، فَأَصَبْتُ مِنْهَا ضَبًّا، فَشَوَيْتُهُ، ثُمَّ أَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَخَذَ جَرِيدَةً، فَجَعَلَ يَعُدُّ بِهَا أَصَابِعَهُ فَقَالَ: «إِنَّ أُمَّةً مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ مُسِخَتْ دَوَابَّ فِي الْأَرْضِ، وَإِنِّي لَا أَدْرِي لَعَلَّهَا هِيَ» فَقُلْتُ: إِنَّ النَّاسَ، قَدِ اشْتَوَوْهَا فَأَكَلُوهَا، فَلَمْ يَأْكُلْ، وَلَمْ يَنْهَ[3].**

واتە: سابیتی کوڕی یەزیدی ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، جا خەڵکی هەندێک بزنمژەیان دەستکەوت، ئنجا برژاندیانن و لێیان خوارد، منیش دانەیەکم دەستکەوت برژاندم و هێنام بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش چیلکەیەکی هەڵگرت و پەنجەی بزنمژەکەی پێ ئەژماردو فەرمووی: خوا لە نەوەکانی

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٠١، والترمذي: ٨٥١ و ١٧٩٢، والنسائي: ٢٨٣٦ و ٤٣٢٣.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٧٩٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٧٩٥، والنسائي: ٤٣٢٠.

بەنو ئیسرائیل گەلێکی مەسخ کردەوە و کردی بە ئاژەڵ، وە بێگومان منیش نازانم لەوانەیە ئەو بێ، منیش گوتم: خەڵکی برژاندیانن و خواردوویانە، ئەویش نەیخواردو قەدەغەشی نەکرد.

**٣٢٣٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «لَمْ يُحَرِّمِ الضَّبَّ، وَلَكِنْ قَذِرَهُ، وَإِنَّهُ لَطَعَامُ عَامَّةِ الرِّعَاءِ، وَإِنَّ اللَّهَ ﷻ لَيَنْفَعُ بِهِ غَيْرَ وَاحِدٍ، وَلَوْ كَانَ عِنْدِي لَأَكَلْتُهُ»[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بزنمژەی حەڕام نەکردوە، بەڵام حەزی لێ نەبووە بیخوات وەکو سروشت و ئارەزوو (نەک وەکو شەرع)، وە بزنمژە خواردنی هەموو ئەوانەیە کە وشتر دەلەوەڕێنن و ئاوی دەدەن، وە بێگومان خوای ﷻ سودی گەیاندووە بە زیاتر لە کەسێک بەو بزنمژەیە، خۆ ئەگەر لەلای من هەبووایە دەمخوارد.

**٣٢٣٩م-** حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ يَحْيَى بْنُ خَلَفٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْأَعْلَى قَالَ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ جَابِرٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، نَحْوَهُ[2].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

**٣٢٤٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: نَادَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الصُّفَّةِ، حِينَ انْصَرَفَ مِنَ الصَّلَاةِ، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِنَّ أَرْضَنَا أَرْضٌ مَضَبَّةٌ، فَمَا تَرَى فِي الضِّبَابِ قَالَ: «بَلَغَنِي أَنَّهُ أُمَّةٌ مُسِخَتْ» فَلَمْ يَأْمُرْ بِهِ، وَلَمْ يَنْهَ عَنْهُ[3].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە ئەهلی صووفە (ئەوانەی کە لە مزگەوت دەمانەوەو شوێنێکیان لە نێو مزگەوت هەبوو) دوای ئەوەی لە نوێژ تەواوبوو، بانگی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد، جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنەکەی ئێمە بزنمژەی زۆرە، جا چی دەربارەی بزنمژە دەفەرموون؟ فەرمووی: بەوجۆرە بە من گەیشتووە کە ئەوان گەلێکن کە مەسخ کراون، جا فەرمانی نەکرد بە خواردنی و نەهیشی لێ نەکرد.

---

(١) صحيح. انظر مسلم: ١٩٥٠.

(٢) صحيح. انظر مسلم: ١٩٥٠.

(٣) صحيح. انظر مسلم: ١٩٥١.

**٣٢٤١-** عَنْ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِضَبٍّ مَشْوِيٍّ، فَقُرِّبَ إِلَيْهِ، فَأَهْوَى بِيَدِهِ، لِيَأْكُلَ مِنْهُ، فَقَالَ لَهُ مَنْ حَضَرَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ لَحْمُ ضَبٍّ، فَرَفَعَ يَدَهُ عَنْهُ، فَقَالَ لَهُ خَالِدٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحَرَامٌ الضَّبُّ قَالَ: «لَا وَلَكِنَّهُ، لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ» قَالَ: فَأَهْوَى خَالِدٌ إِلَى الضَّبِّ، فَأَكَلَ مِنْهُ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْظُرُ إِلَيْهِ[١].

واتە: خالیدی کوڕی وەلید ﷺ دەگێڕێتەوە، بزنمژەیەکی برژاویان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، جا بردیانە بەردەمی، ئنجا بە دەستی دایهاتێ لێی بخوات، ئنجا ئەوەی کە ئامادەی کردبوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە گۆشتی بزنمژەیە، ئەویش دەستی گێڕایەوە، جا خالید گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بزنمژە حەڕامە؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام چونکە لە وڵاتی خۆم لێی نیە حەزم پێنایەت و بێزی لێدەکەم، ڕاوی گوتی: جا خالید دایهاتێ و لێی خوارد، وە پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای دەکرد.

**٣٢٤٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا أُحَرِّمُ» يَعْنِي الضَّبَّ[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من حەڕامی ناکەم. واتە: بزنمژە.

## بابەت: کەروێشک

**٣٢٤٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «مَرَرْنَا بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَأَنْفَجْنَا أَرْنَبًا، فَسَعَوْا عَلَيْهَا، فَلَغَبُوا، فَسَعَيْتُ، حَتَّى أَدْرَكْتُهَا، فَأَتَيْتُ بِهَا أَبَا طَلْحَةَ، فَذَبَحَهَا، فَبَعَثَ بِعَجُزِهَا، وَوَرِكِهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَبِلَهَا»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: بە «مر الظهران»ـدا (کە شیوێکە لە نزیک مەککە) تێپەڕین، جا لەوکاتەدا کەروێشکێکمان ڕاونا، هەوڵیاندا بیگرن، ئیتر ماندوو بوون، منیش هەوڵمدا تا گرتم، جا هێنام بۆ لای ئەبو تەڵحەو کوشتیەوە، ئنجا ڕان و پاشڵەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ نارد، ئەویش وەریگرت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٩١ و ٥٤٠٠ و ٥٥٣٧، ومسلم: ١٩٤٦، وأبو داود: ٣٧٩٤، والنسائي: ٤٣١٦ و ٤٣١٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٣٦، ومسلم: ١٩٤٣، والترمذي: ١٧٩٠، والنسائي: ٤٣١٤ و ٤٣١٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٧٢، ومسلم: ١٩٥٣، وأبو داود: ٣٧٩١، والترمذي: ١٧٨٩، والنسائي: ٤٣١٢.

٣٢٤٤- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ صَفْوَانَ ﷺ، أَنَّهُ مَرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِأَرْنَبَيْنِ، مُعَلِّقَهُمَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَصَبْتُ هَذَيْنِ الْأَرْنَبَيْنِ، فَلَمْ أَجِدْ حَدِيدَةً أُذَكِّيهِمَا بِهَا، فَذَكَّيْتُهُمَا بِمَرْوَةٍ، أَفَآكُلُ قَالَ: «كُلْ»[1].

واتە: موحەممەدی کوڕی صەفوان ﷺ دەگێڕێتەوە، بەدوو کەروێشکەوە کە هەڵیواسیبوون بە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕی، ئنجا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕاستیدا ئەو دوو کەروێشکەم دەستکەوتن، هیچ ئاستێکی تیژم دەستنەکەوت پێی بکوژمەوە، منیش بە مەڕوە (بەردێکی سپی تیژە) کوشتمنەوە، ئایا بیانخۆم؟ فەرمووی: بیخۆ.

٣٢٤٥- عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ جَزْءٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ جِئْتُكَ لِأَسْأَلَكَ عَنْ أَحْنَاشِ الْأَرْضِ؟ مَا تَقُولُ فِي الضَّبِّ؟ قَالَ: «لَا آكُلُهُ، وَلَا أُحَرِّمُهُ» قَالَ: قُلْتُ: فَإِنِّي آكُلُ مِمَّا لَمْ تُحَرِّمْ، وَلِمَ؟ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «فُقِدَتْ أُمَّةٌ مِنَ الْأُمَمِ، وَرَأَيْتُ خَلْقًا رَابَنِي» قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تَقُولُ فِي الْأَرْنَبِ؟ قَالَ: «لَا آكُلُهُ، وَلَا أُحَرِّمُهُ»، قُلْتُ: فَإِنِّي آكُلُ مِمَّا لَمْ تُحَرِّمْ، وَلِمَ؟ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «نُبِّئْتُ أَنَّهَا تَدْمَى»[2].

واتە: خوزەیمەی کوڕی جەزء ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوومە خزمەتت کە دەربارەی ئاژەڵ و جڕو جانەوەری زەوی پرسیارت لێ بکەم، دەربارەی بزنمژە چی دەفەرموون؟ فەرمووی: نایخۆم و بە حەرامیشی دانانێم، گوتم: شتێک بە حەرامی دانەنێی دەیخۆم، بەڵام بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: گەلێک لە گەلەکان نەماون گومان دەکەم لە شێوەی مرۆڤ بوون، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی کەروێشک چی دەفەرمووی؟ فەرمووی: نایخۆم و حەڕامیشی ناکەم، گوتم: شتێک حەڕام نەکەی دەیخۆم، بەڵام بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: هەواڵیان پێداوم کە دەکەوێتە حەیزەوە.

## بابەت: نێچیری دەریا کاتێک سەرئاو دەکەوێ

٣٢٤٦- عَنْ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْبَحْرُ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحِلُّ مَيْتَتُهُ» قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: بَلَغَنِي عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ الْجَوَادِ أَنَّهُ قَالَ: «هَذَا نِصْفُ الْعِلْمِ، لِأَنَّ الدُّنْيَا بَرٌّ وَبَحْرٌ، فَقَدْ أَفْتَاكَ فِي الْبَحْرِ وَبَقِيَ الْبَرُّ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٢٢، والترمذي: ١٤٧٢، والنسائي: ٤٣١٣ و ٤٣٩٩.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٧٩٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٨٣، والترمذي: ٦٩، والنسائي: ٣٣٢ و ٤٣٥٠.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەریا ئاوەکەی پاکەو مردارەوەبووەکەشی حەڵاڵە. ئەبو عەبدوڵڵا گوتی: ئەبو عوبەیدەی جەواد گوتوویەتی: ئەو فەرموودە نیوەی زانستە، چونکە دونیا دەریاو وشکانییە، دەربارەی دەریا فەتوای بۆ داوی تەنها وشکانی ماوە.

٣٢٤٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَلْقَى الْبَحْرُ، أَوْ جَزَرَ عَنْهُ، فَكُلُوهُ، وَمَا مَاتَ فِيهِ فَطَفَا، فَلَا تَأْكُلُوهُ»[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی کە دەریا فڕێی بداتە کەناری دەریا یان ئەوەی کە بەهۆی گەڕانەوەی ئاو دەردەکەوێ ئەوە حەڵاڵەو بیخۆن، بەڵام ئەوەی کە دوای مردنی سەرئاو کەوتووە مەیخۆن.

## بابەت: قەلەڕەش

٣٢٤٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «مَنْ يَأْكُلُ الْغُرَابَ؟ وَقَدْ سَمَّاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَاسِقًا، وَاللَّهِ مَا هُوَ مِنَ الطَّيِّبَاتِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: کێ هەیە قەلەڕەش بخوات؟ لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە زیانبەخش و بەدکار ناوی بردووە، سوێند بە خوا قەلەڕەش لەو پاکانە نیە (کە بۆ خواردن دەشێ).

٣٢٤٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْحَيَّةُ فَاسِقَةٌ، وَالْعَقْرَبُ فَاسِقَةٌ، وَالْفَأْرَةُ فَاسِقَةٌ، وَالْغُرَابُ فَاسِقٌ» فَقِيلَ لِلْقَاسِمِ: أَيُؤْكَلُ الْغُرَابُ قَالَ: «مَنْ يَأْكُلُهُ؟ بَعْدَ قَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَاسِقًا»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مار زیانبەخشە، دووپشک زیانبەخشە، مشک زیانبەخشە، قەلەڕەش زیانبەخشە، جا بە قاسم (ڕاوی فەرموودەکە) گوترا: ئایا قەلەڕەش دەخورێ؟ گوتی: جا کێ دەیخوات؟ لەدوای فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: زیانبەخش و بەدکارە.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٨١٥.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

## بابەت: پشیلە

**٣٢٥٠-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنْ أَكْلِ الْهِرَّةِ، وَثَمَنِهَا»[1].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە خواردنی گۆشتی پشیلەو نرخەکەشی.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٨٠، والترمذي: ١٢٨٠.

## بابەت: خواردن دان بە خەڵک

٣٢٥١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ، انْجَفَلَ النَّاسُ قِبَلَهُ، وَقِيلَ: قَدْ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَدْ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ، قَدْ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ثَلَاثًا، فَجِئْتُ فِي النَّاسِ، لِأَنْظُرَ، فَلَمَّا تَبَيَّنْتُ وَجْهَهُ، عَرَفْتُ أَنَّ وَجْهَهُ لَيْسَ بِوَجْهِ كَذَّابٍ، فَكَانَ أَوَّلُ شَيْءٍ سَمِعْتُهُ تَكَلَّمَ بِهِ، أَنْ قَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَفْشُوا السَّلَامَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَصِلُوا الْأَرْحَامَ، وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ، وَالنَّاسُ نِيَامٌ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلَامٍ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ﷺ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ مەدینە خەڵکی بە ڕاکردن و خێرایی ڕۆیشتن بە پیریەوە، سێجار گوترا: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ هات، بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ هات، بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ هات، منیش هاتمە ناو خەڵکەکە تاکو تەماشای بکەم، جا کاتێک ڕوخساری لێم دەرکەوت، زانیم کە بێگومان ڕوخساری لە ڕوخساری درۆزنان ناچێ، جا یەکەم قسەیەک کە لێم بیست ئەوە بوو فەرمووی: ئەی خەڵکینە سەلامکردن لەناو یەکتردا بڵاوبکەنەوە، وە خواردن ببەخشن، پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بگەیەنن، بە شەو کاتێک خەڵکی نوستووە ئێوە شەونوێژ بکەن، ئەوکات دەچنە بەهەشت بە سەلامەتی.

٣٢٥٢- عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ، كَانَ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «أَفْشُوا السَّلَامَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَكُونُوا إِخْوَانًا، كَمَا أَمَرَكُمُ اللَّهُ ﷻ»[٢].

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەلام کردن بڵاوبکەنەوە، خواردن ببەخشن، هەروەکو خوای ﷻ فەرمانی پێکردوون ببن بە برای یەکتری.

٣٢٥٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الْإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلَامَ، عَلَى مَنْ عَرَفْتَ، وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٤٨٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢، ومسلم: ٣٩، وأبو داود: ٥١٩٤، والنسائي: ٥٠٠٠.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا باشترین جۆری ئیسلامەتی کامەیە؟ فەرمووی: خواردن ببەخشی، سەلام بکەی لە کەسێک بیناسی یان نەیناسی.

## بابەت: خواردنی کەسێک بەشی دوو کەس دەکات

**٣٢٥٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «طَعَامُ الْوَاحِدِ، يَكْفِي الِاثْنَيْنِ، وَطَعَامُ الِاثْنَيْنِ، يَكْفِي الْأَرْبَعَةَ، وَطَعَامُ الْأَرْبَعَةِ، يَكْفِي الثَّمَانِيَةَ»[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خواردنی یەکێک بەشی دوو کەس دەبێ، وە خواردنێک بۆ دوو کەس ئامادە کرابێ بەشی چوار کەس دەکات، وە خواردنی چوار کەس بەشی هەشت کەس دەکات.

**٣٢٥٥-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ طَعَامَ الْوَاحِدِ، يَكْفِي الِاثْنَيْنِ، وَإِنَّ طَعَامَ الِاثْنَيْنِ، يَكْفِي الثَّلَاثَةَ وَالْأَرْبَعَةَ، وَإِنَّ طَعَامَ الْأَرْبَعَةِ، يَكْفِي الْخَمْسَةَ وَالسِّتَّةَ»[2].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خواردنی یەک کەس بەشی دوو کەس دەبێ، وە خواردنی دوو کەس بەشی سێ چوار کەس دەبێ، وە خواردنی چوار کەس بەشی پێنج شەش کەس دەبێ.

## بابەت: کەم خۆری بڕوادارو زۆر خۆری بێبڕوا

**٣٢٥٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار (بە بەراورد لەگەڵ بێبڕوا) وەک ئەوە وایە بە یەک گەدە نان بخوات، وە بێبڕوایش وەک ئەوە وایە بە حەوت گەدە نان بخوات.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٥٩، والترمذي بإثر: ١٨٢٠.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٩٦ و ٥٣٩٧، ومسلم: ٢٠٦٣، والترمذي: ١٨١٩.

**٣٢٥٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «الْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ، وَالْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ»[١].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێبڕوا پڕی حەوت گەدە نان دەخوات و بڕواداریش بە قەدەر یەک گەدە نان دەخوات.

**٣٢٥٨-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ»[٢].

**واتە:** ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار بە یەک گەدە نان دەخوات و بێبڕوایش بە حەوت گەدە نان دەخوات.

## بابەت: نەهی کردن لە عەیب گرتن لە خواردن

**٣٢٥٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «مَا عَابَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ طَعَامًا قَطُّ، إِنْ رَضِيَهُ، أَكَلَهُ، وَإِلَّا تَرَكَهُ»[٣].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز عەیبی لە خواردن نەگرتووە، ئەگەر بە دڵی بووایە دەیخوارد، ئەگەرنا وازی لێ دەهێنا.

**٣٢٥٩م-** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي يَحْيَى عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ. قَالَ: أَبُو بَكْرٍ نُخَالِفُ فِيهِ يَقُولُونَ عَنْ أَبِي حَازِمٍ[٤].

**واتە:** ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش هاتوە.

## بابەت: دەست شۆردن بۆ نان خواردن

**٣٢٦٠-** عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُكْثِرَ اللَّهُ خَيْرَ بَيْتِهِ، فَلْيَتَوَضَّأْ إِذَا حَضَرَ غَدَاؤُهُ، وَإِذَا رُفِعَ»[٥].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٩٣، ومسلم: ٢٠٦٠، والترمذي: ١٨١٨.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٦٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٦٣، ومسلم: ٢٠٦٤، وأبو داود: ٣٧٦٣، والترمذي: ٢٠٣١.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٦٣، ومسلم: ٢٠٦٤، وأبو داود: ٣٧٦٣، والترمذي: ٢٠٣١.

(٥) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٧٦١، والترمذي: ١٨٤٦.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پێی خۆشە خوا خێرو فەڕ بخاتە ماڵەکەیەوە ئەوە با کاتێک نانی بەیانی ئامادە دەبێ دەستی بشۆرێ، وە کاتێکیش نان هەڵدەگیرێتەوە دەستی بشۆرێ.

**٣٢٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّهُ خَرَجَ مِنَ الْغَائِطِ، فَأُتِيَ بِطَعَامٍ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا آتِيكَ بِوَضُوءٍ قَالَ: «أَأُرِيدُ الصَّلَاةَ؟»**[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرئاو هاتەوە، جا خواردنیان بۆ هێنا، پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئاوی دەستنوێژ گرتنت بۆ نەهێنم؟ فەرمووی: بۆ مەگەر دەمەوێ نوێژ بکەم.

**تێبینی:** لێرە مەبەست دەستنوێژگرتنە، نەک دەست شۆردن، واتە: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەستنوێژی هەڵنەگرتووە بۆ نان خواردن، نەک بەڵگە بێ بۆ ئەوەی کە دوای سەرئاوکردن دەستی نەشۆردبێ!

## بابەت: خواردن بە پاڵکەوتوویی

**٣٢٦٢- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا آكُلُ مُتَّكِئًا»**[٢].

واتە: ئەبو جوحەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من خواردن بە پاڵکەوتوویی ناخۆم.

**٣٢٦٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ ﷺ، قَالَ: أَهْدَيْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ شَاةً، فَجَثَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى رُكْبَتَيْهِ يَأْكُلُ، فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: مَا هَذِهِ الْجِلْسَةُ؟ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ جَعَلَنِي عَبْدًا كَرِيمًا، وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا عَنِيدًا»**[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوسر ﷺ دەڵێ: مەڕێکم بە دیاری برد بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەژنۆکانی دانیشتبوو نانی دەخوارد، ئیتر دەشتەکییەک گوتی: ئەو دانیشتنە چییە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: خوا منی کردۆتە بەندەیەکی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٩٨، وأبو داود: ٣٧٦٩، والترمذي: ١٨٣٠.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٧٧٣.

ڕێزدارو بەڕێزو نەیکردووم بە پاشایەکی ملهوڕی سەرەڕۆی یاخی (دەشتەکییەکە مەبەستی ئەوە بووە کە دەبوو پێغەمبەر، وەکو پاشاکان دانیشتبا بە خۆبەزل زانینەوە، پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی ڕەت کردۆتەوە).

## بابەت: ناوی خوا هێنان لە کاتی نان خواردندا

٣٢٦٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَأْكُلُ طَعَامًا فِي سِتَّةِ نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ، فَأَكَلَهُ بِلُقْمَتَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَا أَنَّهُ لَوْ كَانَ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ لَكَفَاكُمْ، فَإِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا، فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللَّهِ، فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَقُولَ: بِسْمِ اللَّهِ فِي أَوَّلِهِ، فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللَّهِ فِي أَوَّلِهِ وَآخِرِهِ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ شەش کەس لە هاوەڵانی نانی دەخوارد، جا لەوکاتەدا دەشتەکییەک هات هەموو خواردنەکەی بە دوو پاروو خوارد، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆ ئەگەر ئەو بیگوتبایە: بە ناوی خوا (بسم الله) ئەوە خواردنەکەتان بەش دەبوو، جا ئەگەر یەکێکتان خواردنی خوارد با بڵێ: بە ناوی خوا، ئەگەر سەرەتا لەبیری چوو بڵێ: بە ناوی خوا، ئەوە با بڵێ: بە ناوی خوا لە سەرەتاو لە کۆتاییەوە.

٣٢٦٥- عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ ﵄، قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا آكُلُ: «سَمِّ اللَّهَ ﷻ»[٢].

واتە: عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ﵄ دەڵێ: لە کاتێکدا کە نانم دەخوارد پێغەمبەر ﷺ پێمی فەرموو: ناوی خوای ﷻ بێنە.

## بابەت: خواردن بە دەستی ڕاست

٣٢٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لِيَأْكُلْ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ، وَلْيَشْرَبْ بِيَمِينِهِ، وَلْيَأْخُذْ بِيَمِينِهِ، وَلْيُعْطِ بِيَمِينِهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ، وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ، وَيُعْطِي بِشِمَالِهِ، وَيَأْخُذُ بِشِمَالِهِ»[٣].

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٧٦٧، والترمذي: ١٨٥٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٧٦، ومسلم: ٢٠٢٢، والترمذي: ١٨٥٧.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه مسلم: ٢٠٢٠، وأبو داود: ٣٧٧٦، والترمذي: ١٧٩٩.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با هەر یەکێکتان بە دەستی ڕاستی بخوات، وە بە دەستی ڕاستی ئاو بخواتەوە، وە بە دەستی ڕاستی شت وەرگرێ، وە بە دەستی ڕاستی ببەخشێ، چونکە بێگومان شەیتان بە دەستی چەپی دەخوات و بە دەستی چەپی دەخواتەوەو بە دەستی چەپی پێدەدات و بە دەستی چەپ وەردەگرێ.

**٣٢٦٧-** عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ غُلَامًا فِي حِجْرِ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي: «يَا غُلَامُ سَمِّ اللَّهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ»[١].

واتە: عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ﷺ دەڵێ: منداڵێک بووم لە باوەشی پێغەمبەر ﷺ، منیش (لە کاتی نان خواردندا) دەستم دەگێڕا بە ناو قاپەکەدا، ئنجا پێغەمبەر ﷺ پێمی فەرموو: ڕۆڵە گیان ناوی خوا بێنەو، بە دەستی ڕاست بخۆ، وە لەبەردەمی خۆشتەوە بخۆ.

**٣٢٦٨-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَأْكُلُوا بِالشِّمَالِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ، يَأْكُلُ بِالشِّمَالِ»[٢].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دەستی چەپ مەخۆن، چونکە شەیتان بە دەستی چەپی دەخوات.

## بابەت: لێستنەوەی پەنجەکان

**٣٢٦٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا، فَلَا يَمْسَحْ يَدَهُ، حَتَّى يَلْعَقَهَا أَوْ يُلْعِقَهَا» قَالَ: سُفْيَانُ، سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ قَيْسٍ، يَسْأَلُ عَمْرَو بْنَ دِينَارٍ، أَرَأَيْتَ حَدِيثَ عَطَاءٍ: «لَا يَمْسَحْ أَحَدُكُمْ يَدَهُ، حَتَّى يَلْعَقَهَا أَوْ يُلْعِقَهَا» عَمَّنْ هُوَ؟ قَالَ: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: فَإِنَّهُ حُدِّثْنَاهُ عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: حَفِظْنَاهُ مِنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَبْلَ أَنْ يَقْدَمَ جَابِرٌ عَلَيْنَا، وَإِنَّمَا لَقِيَ عَطَاءٌ جَابِرًا فِي سَنَةٍ جَاوَرَ فِيهَا بِمَكَّةَ[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٧٦، ومسلم: ٢٠٢٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠١٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٥٦، ومسلم: ٢٠٣١، وأبو داود: ٣٨٤٧ من حديث ابن عباس. أما حديث جابر، فقد انفرد به ابن ماجه.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان خواردنی خوارد با دەستی نەسڕێتەوە (بە خاولی یان دەستەسڕ) هەتا دەیانلێسیتەوە یان بۆی دەلێسنەوە، سوفیان گوتی: گوێم لە عومەری کوڕی قەیس بوو، پرسیاری لە عەمری کوڕی دینار دەکرد: ئایا تۆ گێڕانەوەکەی عەتاء کە دەفەرمووێ: هیچ یەکێکتان دەستی نەسڕێتەوە تا دەیانلێسێتەوە، یان بۆی دەلێسنەوە، دەزانی لە کێوەیە؟ گوتی لە ئیبنو عەبباسەوەیە، گوتی: بەڵام لە جابیر بۆمان گێڕدراوەتەوە، گوتی: ئێمە لە عەتائەوە لە ئیبنو عەبباسەوە وەرمانگرتووە پێش ئەوەی جابیر بێتە لامان، بێگومان عەتاء ئەو ساڵەی بە جابیر گەیشت کە لە مەککە بوو.

**٣٢٧٠-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَمْسَحْ أَحَدُكُمْ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَهَا، فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي فِي أَيِّ طَعَامِهِ الْبَرَكَةُ»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێکتان (دوای نان خواردن) با دەستی نەسڕێتەوە هەتا دەیانلێسێتەوە، چونکە نازانی ئاخۆ بەرەکەتەکە بە کامە خواردنەوەیە.

## بابەت: خاوێنکردنەوەی قاپی خواردن

**٣٢٧١-** عَنْ أُمِّ عَاصِمٍ ﷺ، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا نُبَيْشَةُ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ نَأْكُلُ فِي قَصْعَةٍ، فَقَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ أَكَلَ فِي قَصْعَةٍ، فَلَحِسَهَا، اسْتَغْفَرَتْ لَهُ الْقَصْعَةُ»[٢].

واتە: ئوممو عاصیم ﷺ دەڵێ: نوبەیشەی ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلامان و لەوکاتەدا لە دەفرێکدا نانمان دەخوارد، ئەویش گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک لە لەگەنێکدا (دەفرێکدا) نان بخوات و ئنجا جوان دایلێسێ و ئەوەی تێیدایە بیخوات، ئەوە خودی دەفرەکە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکات.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٣٣.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٨٠٤.




**٣٢٧٢- عَنِ الْمُعَلَّى بْنِ رَاشِدٍ أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: حَدَّثَتْنِي جَدَّتِي، عَنْ رَجُلٍ، مِنْ هُذَيْلٍ، يُقَالُ لَهُ: نُبَيْشَةُ الْخَيْرِ ﷺ، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا نُبَيْشَةُ، وَنَحْنُ نَأْكُلُ فِي قَصْعَةٍ لَنَا، فَقَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَكَلَ فِي قَصْعَةٍ ثُمَّ لَحِسَهَا اسْتَغْفَرَتْ لَهُ الْقَصْعَةُ»**[1].

واتە: موعەللای کوڕی ڕاشید ئەبولیەمان دەڵێ: نەنکم لە پیاوێک لە هۆزی «هذیل» کە پێی دەگوترا: نوبەیشەی خەیر ﷺ، بۆی گێڕامەوەو گوتی: نوبەیشە هاتە لامان و ئێمەش لە دەفرێکدا نانمان دەخوارد، ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باسکردین و فەرمووی: هەرکەسێک لە دەفرێکدا نان بخوات، پاشان دایلێسێ و هیچی پێوە نەهێڵێ، ئەوە ئەو دەفرە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکات.

## بابەت: خواردن لەبەردەم خۆتەوە

**٣٢٧٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وُضِعَتِ الْمَائِدَةُ، فَلْيَأْكُلْ مِمَّا يَلِيهِ، وَلَا يَتَنَاوَلْ مِنْ بَيْنِ يَدَيْ جَلِيسِهِ»**[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک سفرە دانرا با هەرکەس لەبەردەم خۆیەوە بخوات، دەست نەبات بۆ ئەو خواردنەی لەبەر دەست و لەلای ئەوانی دیکەیە لەسەر خوانەکە.

**٣٢٧٤- عَنْ عِكْرَاشِ بْنِ ذُؤَيْبٍ ﷺ، قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِجَفْنَةٍ كَثِيرَةِ الثَّرِيدِ وَالْوَدَكِ، فَأَقْبَلْنَا نَأْكُلُ مِنْهَا، فَخَبَطْتُ يَدِي فِي نَوَاحِيهَا، فَقَالَ: «يَا عِكْرَاشُ كُلْ مِنْ مَوْضِعٍ وَاحِدٍ، فَإِنَّهُ طَعَامٌ وَاحِدٌ» ثُمَّ أُتِينَا بِطَبَقٍ فِيهِ أَلْوَانٌ مِنَ الرُّطَبِ، فَجَالَتْ يَدُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الطَّبَقِ، وَقَالَ: «يَا عِكْرَاشُ كُلْ مِنْ حَيْثُ شِئْتَ، فَإِنَّهُ غَيْرُ لَوْنٍ وَاحِدٍ»**[3].

واتە: عیکڕاشی کوڕی زوئەیب ﷺ دەڵێ: لەگەنێک (دەفرێک) گۆشت و گۆشتاوو تێکۆشیویان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا، لێی چووینە پێش بۆ خواردن، منیش دەستم دەگێڕا بە چواردەوری دەفرەکەدا بۆ خواردن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عیکڕاش لە یەک

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٨٠٤.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٨٤٨.

شوێن بخۆ، چونکە هەمووی یەک جۆر خواردنە، پاشان تەبەقەیەک خورمای جۆراو جۆریان بۆ هێناین، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دەگێڕا بەناو خورماکاندا، فەرمووی: ئەی عیکڕاش لە کامە لاوە پێت خۆشە بخۆ، چونکە (خورماکان) یەک جۆر نین.

## بابەت: نەهی کردن لە خواردنی ناوەڕاستی دەفرو لەگەندا

**٣٢٧٥- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُسْرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أُتِيَ بِقَصْعَةٍ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُوا مِنْ جَوَانِبِهَا، وَدَعُوا ذُرْوَتَهَا، يُبَارَكْ فِيهَا»**(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوسر ﷺ دەگێڕێتەوە، دەفرێک خواردنیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە چواردەوری لەگەنەکە بخۆن و جارێ ناوەڕاستەکە واز لێ بێنن، چونکە بەرەکەتەکە لەوێدایەو بە بەرەکەت دەبێ (گەر لە چواردەوری بخۆن و ناوەڕاستەکە دواتر بخۆن).

**٣٢٧٦- عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ اللَّيْثِيِّ ﷺ، قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِرَأْسِ الثَّرِيدِ، فَقَالَ: «كُلُوا بِسْمِ اللَّهِ مِنْ حَوَالَيْهَا، وَاعْفُوا رَأْسَهَا، فَإِنَّ الْبَرَكَةَ، تَأْتِيهَا مِنْ فَوْقِهَا»**(٢).

واتە: واسیلەی کوڕی ئەسقەعی لەیسیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی موبارەکی لای سەرەوەو ناوەڕاستی گۆشت و گۆشتاوەکەی گرت و فەرمووی: بە ناوی خوا دەست بە خواردن بکەن لە چوار دەورییەوەو واز لەلای سەرووی بێنن، چونکە بەرەکەتی خواردن بەلای سەرەوەیدا دێت.

**٣٢٧٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وُضِعَ الطَّعَامُ، فَخُذُوا مِنْ حَافَتِهِ، وَذَرُوا وَسَطَهُ، فَإِنَّ الْبَرَكَةَ، تَنْزِلُ فِي وَسَطِهِ»**(٣).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکاتێک خواردن دانرا، ئەوە لە چواردەوری خواردنەکە بخۆن و، واز لە ناوەڕاستەکەی بێنن، چونکە بەرەکەت لە ناوەڕاستەوە دێت.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٧٧٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٧٧٢، والترمذي: ١٨٠٥.




## بابەت: ئەگەر پارووپەک کەوتە خوارەوە

**٣٢٧٨-** عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، قَالَ: بَيْنَمَا هُوَ يَتَغَدَّى، إِذْ سَقَطَتْ مِنْهُ لُقْمَةٌ، فَتَنَاوَلَهَا، فَأَمَاطَ، مَا كَانَ فِيهَا مِنْ أَذًى، فَأَكَلَهَا، فَتَغَامَزَ بِهِ الدَّهَاقِينُ، فَقِيلَ: أَصْلَحَ اللَّهُ الْأَمِيرَ، إِنَّ هَؤُلَاءِ الدَّهَاقِينَ يَتَغَامَزُونَ، مِنْ أَخْذِكَ اللُّقْمَةَ، وَبَيْنَ يَدَيْكَ هَذَا الطَّعَامُ، قَالَ: إِنِّي لَمْ أَكُنْ لِأَدَعَ، مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: لِهَذِهِ الْأَعَاجِمِ «إِنَّا كُنَّا يُؤْمَرُ أَحَدُنَا، إِذَا سَقَطَتْ لُقْمَتُهُ، أَنْ يَأْخُذَهَا، فَيُمِيطَ، مَا كَانَ فِيهَا مِنْ أَذًى وَيَأْكُلَهَا، وَلَا يَدَعَهَا لِلشَّيْطَانِ»[١].

واتە: مەعقیلی کوڕی یەسار ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا کە ئەو نانی دەخوارد، پارووپەکی لە دەست کەوتە خوارێ، ئەویش پارووەکەی هەڵگرتەوە، ئەوەی کە لێی پیس بوو لێی کردەوەو ئەویتریشی خوارد، لە هەمان کاتدا خەڵکی دەوروبەری کە غەیرە عەرەب بوون بە ئاماژە لۆمەیان کرد، جا پێی گوترا: خوا چاکە بۆ فەرمانڕەوا بکات، ئەو خەڵکە بەوەی کە پارووەکەت هەڵگرتەوە گاڵتەت پێدەکەن، لەکاتێکدا کە ئەو خواردنەت لەبەردەست دایە، گوتی: واز لە شتێک ناهێنم کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومە بۆ ئەو عەجەمانە، بێگومان هەر یەکێک لە ئێمە فەرمانمان پێکراوە کە کاتێک پارووەکەی دەکەوێتە خوارێ هەڵیبگرێتەوەو ئەو پیسیەی کە پێوەی نوساوە لێی بکاتەوەو بیخوات و بۆ شەیتانی لێ نەگەڕێ.

**الأعجم:** واتە: غەیری عەرەب، جگە لە عەرەب بە هەموو نەتەوەکانیتر دەگوترێ: عەجەم لە لای عەرەب.

**٣٢٧٩-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وَقَعَتِ اللُّقْمَةُ مِنْ يَدِ أَحَدِكُمْ، فَلْيَمْسَحْ مَا عَلَيْهَا مِنَ الْأَذَى، وَلْيَأْكُلْهَا»[٢].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکات پارووی دەستی یەکێکتان بەربۆوە با ئەو پیسیەی پێوەی لکاوە لێی بکاتەوەو بیخوات.

---

(١) ضعيف الإسناد. والمرفوع منه صحيح من حديث جابر، وأنس.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٣٣/١٣٥، والترمذي: ١٨٠٢.

## بابەت: گەورەیی تێگوشیوی گۆشتا و بەسەر خواردنەكاندا

٣٢٨٠- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كَمَلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ، وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَاءِ، إِلَّا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَآسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ، وَإِنَّ فَضْلَ، عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ، كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ»[1].

واتە: ئەبو موسای ئەشعەریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زۆر لە پیاوان كامڵ و تەواو بوون، بەڵام لە ئافرەتان تەنها مەریەمی كچی عیمڕان و ئاسیەی خێزانی فیرعەون كامڵ وتەواو بوون، وە بێگومان فەزڵ و گەورەیی عائیشە بەسەر ئافرەتاندا وەكو فەزڵ و گەورەیی تێگوشیوی گۆشتاو وایە بەسەر تەواوی خواردنەكاندا (ئەوەش لەبەر ئەوەی كە تێگوشیوی گۆشتاو لە خواردنە هەرە خۆش و بەتامەكان بووە لەلای پێغەمبەر ﷺ).

٣٢٨١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ، كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ»[2].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەزڵ و گەورەیی عائیشە بەسەر ئافرەتانیتردا، وەكو فەزڵ و گەورەیی تێگوشیوی گۆشتاو وایە بەسەر تەواوی خواردنەكاندا.

## بابەت: دەست سڕینەوە لە دوای نان خواردن

٣٢٨٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا زَمَانَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «وَقَلِيلٌ مَا نَجِدُ الطَّعَامَ، فَإِذَا نَحْنُ وَجَدْنَاهُ، لَمْ يَكُنْ لَنَا مَنَادِيلُ إِلَّا أَكُفُّنَا، وَسَوَاعِدُنَا وَأَقْدَامُنَا، ثُمَّ نُصَلِّي، وَلَا نَتَوَضَّأُ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤١١، ومسلم: ٢٤٣١، والترمذي: ١٨٣٤، والنسائي: ٣٩٤٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٧٠، ومسلم: ٢٤٤٦، والترمذي: ٣٩٤٧.

(٣) ضعيف. أخرجه البخاري: ٥٤٥٧.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ کەم وا هەبوو خواردنمان دەستبکەوێ، خۆ ئەگەر بە دەستیشمان بکەوتبایە جگە لە دەست و باسک و پێیەکان دەسڕەو خاولیمان نەبوو (کە دەستی پێ بسڕین)، پاشان نوێژمان دەکردو، دەستنوێژیشمان هەڵنەدەگرتەوە.

## بابەت: دوعای دوای نان خواردن

**٣٢٨٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ: إِذَا أَكَلَ طَعَامًا قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَجَعَلَنَا مُسْلِمِينَ»[١].**

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێک نانی دەخواردو لێدەبووەوە دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا، وَسَقَانَا وَجَعَلَنَا مُسْلِمِينَ»، واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خواردن و خواردنەوەی پێداوین و ئێمەی کردوە بە مسوڵمان.

**٣٢٨٤- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ، إِذَا رُفِعَ طَعَامُهُ أَوْ مَا بَيْنَ يَدَيْهِ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا، طَيِّبًا مُبَارَكًا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلَا مُوَدَّعٍ، وَلَا مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا»[٢].**

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلیی ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە خواردن دەبووەوە یان خواردنی بەردەستی هەڵدەگیرایەوە دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا، طَيِّبًا مُبَارَكًا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلَا مُوَدَّعٍ، وَلَا مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا»، واتە: سوپاس بۆ خوا سوپاسێکی زۆرو بەردەوام و پاک و پیرۆز، کە هەرگیز تەواو نابێ، لەسەریشی بەردەوام دەبین و، لێشی بێنیاز نین ئەی پەروەردگارمان.

**٣٢٨٥- عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ الْجُهَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ أَكَلَ طَعَامًا فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا، وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي، وَلَا قُوَّةٍ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٣].**

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٨٥٠، والترمذي: ٣٤٥٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٥٨، وأبو داود: ٣٨٤٩، والترمذي: ٣٤٥٦.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٠٢٣ بزيادة، والترمذي: ٣٤٥٨.

واتە: سەهلی کوڕی موعازی کوڕی ئەنەسی جوهەنیی لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نانی خواردو گوتی: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا، وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي، وَلَا قُوَّةٍ»، واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەو خواردنەی پێدام و، ڕۆزی دام بەبێ هەوڵ و هێزی خۆم، ئەوە لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبوردرێ.

## بابەت: کۆبوونەوە بۆ نان خواردن

**٣٢٨٦-** عَنْ وَحْشِيِّ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ وَحْشِيٍّ ﷺ، أَنَّهُمْ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَأْكُلُ، وَلَا نَشْبَعُ، قَالَ: «فَلَعَلَّكُمْ تَأْكُلُونَ مُتَفَرِّقِينَ؟» قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «فَاجْتَمِعُوا عَلَى طَعَامِكُمْ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ، يُبَارَكْ لَكُمْ فِيهِ»[1].

واتە: وەحشیی کوڕی حەرب لە باوکییەوە، لە وەحشی باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویانە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕاستیدا ئێمە دەخۆین، بەڵام تێر نابین، فەرمووی: لەوانەیە بەجیا نان بخۆن؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: لەسەر سفرەی نان خواردن پێکەوە کۆببنەوەو ناوی خوا بێنن، خوا بەرەکەتتان بۆ تێدەخات.

**٣٢٨٧-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي، يَقُولُ، سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُوا جَمِيعًا، وَلَا تَفَرَّقُوا، فَإِنَّ الْبَرَكَةَ مَعَ الْجَمَاعَةِ»[2].

واتە: سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: گوێم لە باوکم بوو دەیگوت: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب بوو، دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەمووتان پێکەوە کۆببنەوەو نان بخۆن و، جیامەبنەوە، چونکە بێگومان بەرەکەت لەگەڵ پێکەوەبوون دایە.

---

(١) حسن بشواهده. أخرجه أبو داود: ٣٧٦٤.

(٢) حسن بسابقه وشواهده.

## بابەت: فووکردن لە خواردن

**٣٢٨٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَنْفُخُ فِي طَعَامٍ، وَلَا شَرَابٍ، وَلَا يَتَنَفَّسُ فِي الْإِنَاءِ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ فووی لە خواردن و خواردنەوە نەکردوە، لە ناو دەفرو قاپدا هەناسەشی تێدا نەداوە.

## بابەت: خواردندان بەو خزمەتکارەی کە خواردنەکە ئامادە دەکات و دەیهێنێ

**٣٢٨٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ، فَلْيُجْلِسْهُ، فَلْيَأْكُلْ مَعَهُ، فَإِنْ أَبِي، فَلْيُنَاوِلْهُ مِنْهُ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان خزمەتکارەکەی خواردنی هێنا، با داینیشێنێ و لەگەڵی بخوات، جا ئەگەر خزمەتکارەکە ڕازی نەبوو (لەگەڵی دانیشێ)، ئەوە با هەرچۆنێک بێ لە خواردنەکەی پێبدات.

**٣٢٩٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَحَدُكُمْ قَرَّبَ إِلَيْهِ مَمْلُوكُهُ طَعَامًا، قَدْ كَفَاهُ عَنَاءَهُ وَحَرَّهُ، فَلْيَدْعُهُ، فَلْيَأْكُلْ مَعَهُ، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ، فَلْيَأْخُذْ لُقْمَةً، فَلْيَجْعَلْهَا فِي يَدِهِ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان خزمەتکارەکەی خواردنی بۆ هێنا کە ئامادەی کردوەو، ماندوو بووە پێوەیی و، گەرمای بووە، ئەوە با بانگی بکات و لەگەڵیدا بخوات، جا ئەگەر ئەوەی نەکرد، ئەوە با پاروویەکی بۆ بکات و بیخاتە دەستییەوە.

**٣٢٩١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا جَاءَ خَادِمُ أَحَدِكُمْ بِطَعَامِهِ، فَلْيُقْعِدْهُ مَعَهُ، أَوْ لِيُنَاوِلْهُ مِنْهُ، فَإِنَّهُ هُوَ الَّذِي وَلِيَ حَرَّهُ وَدُخَانَهُ»[4].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٧٢٨، والترمذي: ١٨٨٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٥٧، ومسلم: ١٦٦٣، وأبو داود: ٣٨٤٦، والترمذي: ١٨٥٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٥٧، ومسلم: ١٦٦٣، وأبو داود: ٣٨٤٦، والترمذي: ١٨٥٣.

(٤) صحيح لغيره.




واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خزمەتکاری یەکێکتان خواردنی بۆ هێنان با لەگەڵ خۆی دابنیشێنێ، یان لە خواردنەکەی پێبدات، چونکە خزمەتکارەکە گەرمای ئامادەکردنەکەی پێکەوتوەو، دوکەڵەکەی بەسەر ڕووخساریدا ڕۆشتووە.

## بابەت: خواردن لەسەر سفرە

**٣٢٩٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: مَا أَكَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى خِوَانٍ، وَلَا فِي سُكُرُّجَةٍ، قَالَ: فَعَلَامَ كَانُوا يَأْكُلُونَ، قَالَ «عَلَى السُّفَرِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەر ﷺ لەسەر مێزو سوکوڕجەدا نانی نەخواردووە، ڕاوی گوتی: ئەی لەسەر چی نانیان دەخوارد؟ گوتی: لەسەر سفرە.

سکرجة: قاپێکی گچکە بووە، بۆ ئیشتیها خواردنیان تێکردوە.

**٣٢٩٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَكَلَ عَلَى خِوَانٍ، حَتَّى مَاتَ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: هەرگیز نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مێز (و کورسی) نان بخوات، هەتا وەفاتیشی کرد.

## بابەت: هەڵنەستان لەکاتی نان خواردن، هەتا سفرە هەڵدەگیرێتەوە، یان خەڵکەکە هەمووی دەست هەڵدەگرن

**٣٢٩٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «نَهَى أَنْ يُقَامَ عَنِ الطَّعَامِ، حَتَّى يُرْفَعَ»[3].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی کە لەسەر نان خواردن هەڵبستێ، هەتا نان هەڵدەگیرێتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٨٦، والترمذي: ١٧٨٨ و ٢٣٦٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٨٦، والترمذي: ١٧٨٨ و ٢٣٦٣.

(٣) ضعيف جداً.

**٣٢٩٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وُضِعَتِ الْمَائِدَةُ فَلَا يَقُومُ رَجُلٌ حَتَّى تُرْفَعَ الْمَائِدَةُ، وَلَا يَرْفَعُ يَدَهُ، وَإِنْ شَبِعَ، حَتَّى يَفْرُغَ الْقَوْمُ، وَلْيُعْذِرْ، فَإِنَّ الرَّجُلَ يُخْجِلُ جَلِيسَهُ، فَيَقْبِضُ يَدَهُ، وَعَسَى أَنْ يَكُونَ لَهُ فِي الطَّعَامِ حَاجَةٌ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکاتێک سفرە داخرا با کەس هەڵنەستێ هەتا سفرە هەڵدەگیرێتەوە، وە با هەتا خەڵکەکە تەواو دەبن و لێدەبنەوە دەست هەڵنەگرێ ئەگەر تێریشی خواردبێ، ئەگەر تێری خوارد با بەهانەیەکی گونجاو بێنێتەوە (بۆ دەست هەڵگرتن)، چونکە مرۆڤ لەوکاتەدا شەرم دەکات لە دەوروبەرەکەی و دەست دەکێشێتەوە لە خواردن، وە بۆیشی هەیە کە (لەگەڵ ئەوەی لە شەرمان دەست هەڵدەگرێ) پێویستی بە خواردنی دیکە مابێت.

## بابەت: کەسێک بخەوێ و دەستی چەور بێ و نەیشۆردبێ بۆنی خواردنەکەی پێوە مابێ

**٣٢٩٦-** عَنْ فَاطِمَةَ ﵂ ابْنَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا لَا يَلُومَنَّ امْرُؤٌ، إِلَّا نَفْسَهُ، يَبِيتُ وَفِي يَدِهِ رِيحُ غَمَرٍ»[2].

واتە: فاتیمەی ﵂ کچی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاگاداربن با مرۆڤ (کە تووشی هەر شتێک بوو) لۆمەو سەرزەنشتی کەس نەکات تەنها خۆی نەبێ، کاتێک شەو دەخەوێ و دەستی بۆنی چەوری گۆشتی لێدێت.

**٣٢٩٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا نَامَ أَحَدُكُمْ، وَفِي يَدِهِ رِيحُ غَمَرٍ، فَلَمْ يَغْسِلْ يَدَهُ، فَأَصَابَهُ شَيْءٌ، فَلَا يَلُومَنَّ، إِلَّا نَفْسَهُ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکات یەکێکتان خەوت و بۆنی چەوری لە دەستەکانی هات، نەیشۆردەوەو تووشی شتێک بوو، ئەوە با گلەیی لە کەس نەکات جگە لە خۆی.

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٥٢، والترمذي: ١٨٦٠.

## بابەت: فەرمووکردن بۆ نان خواردن

٣٢٩٨- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ ﵂، قَالَتْ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ: بِطَعَامٍ، فَعَرَضَ عَلَيْنَا، فَقُلْنَا لَا نَشْتَهِيهِ فَقَالَ: «لَا تَجْمَعْنَ جُوعًا، وَكَذِبًا»[(١)].

واتە: ئەسمائی کچی یەزید ﵂ دەڵێ: هەندێک خواردنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا، ئەویش فەرمووی لێکردین بۆ خواردن، ئێمەش گوتمان: حەزمان لێ نیە، ئەویش فەرمووی: برسێتی و ناڕاستی بەیەکەوە کۆمەکەنەوە (واتە: برسیتانە).

٣٢٩٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ - رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ - قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ: وَهُوَ يَتَغَدَّى فَقَالَ: «ادْنُ فَكُلْ» فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، فَيَا لَهْفَ نَفْسِي هَلَّا كُنْتُ طَعِمْتُ مِنْ طَعَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[(٢)].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ کە پیاوێک بوو لە هۆزی بەنولئەشهەل (ئەو ئەنەسە نیە کە خزمەتی پێغەمبەری ﷺ کردوە) دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە لەوکاتەدا نانی دەخوارد، جا فەرمووی: نزیک بەوەو بفەرموو بخۆ، منیش گوتم: لەڕاستیدا من بەڕۆژووم، بەڵام زۆر بەداخەوەم بۆخۆم ئاخر نەدەکرا کە لە خواردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بمخواردبایە! (واتە: خۆزگە نانم لەگەڵ دەخوارد).

## بابەت: خواردن لەناو مزگەوتدا

٣٣٠٠- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ الزُّبَيْدِيَّ ﵁، يَقُولُ: «كُنَّا نَأْكُلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ الْخُبْزَ وَاللَّحْمَ»[(٣)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی جەزئی زوبەیدیی ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە ناو مزگەوتدا نان و گۆشتمان دەخوارد.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٠٨، والترمذي: ٧١٥، والنسائي: ٢٢٧٤ و ٢٢٧٦ و ٢٣١٥.

(٣) صحيح.

## بابەت: خواردن بەپێوە

**٣٣٠١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: «كُنَّا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: نَأْكُلُ وَنَحْنُ نَمْشِي، وَنَشْرَبُ، وَنَحْنُ قِيَامٌ»[1].

**واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خواردنمان بە دەم ڕێگا ڕۆیشتنەوە دەخواردو، خواردنەوەمان بە پێوە دەخواردەوە.**

## بابەت: كولەكە

**٣٣٠٢-** عَنْ أَنَسٍ ﵁، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ: «يُحِبُّ الْقَرْعَ»[2].

**واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كولەكەی پێ خۆش بوو.**

**٣٣٠٣-** عَنْ أَنَسٍ ﵁، قَالَ: بَعَثَتْ مَعِي أُمُّ سُلَيْمٍ، بِمِكْتَلٍ فِيهِ رُطَبٌ، إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمْ أَجِدْهُ، وَخَرَجَ قَرِيبًا إِلَى مَوْلًى لَهُ، دَعَاهُ، فَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا، فَأَتَيْتُهُ وَهُوَ يَأْكُلُ، قَالَ: فَدَعَانِي لِآكُلَ مَعَهُ، قَالَ: وَصَنَعَ ثَرِيدَةً بِلَحْمٍ وَقَرْعٍ، قَالَ: فَإِذَا هُوَ يُعْجِبُهُ الْقَرْعُ، قَالَ: «فَجَعَلْتُ أَجْمَعُهُ، فَأُدْنِيهِ مِنْهُ، فَلَمَّا طَعِمْنَا مِنْهُ، رَجَعَ إِلَى مَنْزِلِهِ، وَوَضَعْتُ الْمِكْتَلَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَجَعَلَ يَأْكُلُ وَيَقْسِمُ، حَتَّى فَرَغَ مِنْ آخِرِهِ»[3].

**واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: ئوممو سولەیم سەبەتەیەک خورمای پێدا ناردم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش نەمدۆزیەوە، ڕۆیشتبوو بۆ لای خزمەتكارێكی كە لێی نزیک بوو میوانداری كردبوو، خواردنی بۆ ئامادەكردبوو، منیش لەوكاتەدا كە نانی دەخوارد چوومە خزمەتی، دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ) بانگی كردم كە لەگەڵی بخۆم، گوتی: خواردنەكە لە تیكوشیوی گۆشت و كولەكە سازكرابوو، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كولەكەكەی پێ خۆش بوو، دەڵێ: منیش بۆم كۆدەكردەوەو دەمخستە بەردەستی، جا**

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ١٨٨١.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٨٤٩ بنحوه.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٣٦، ومسلم: ٢٠٤١، وأبو داود: ٣٧٨٢، والترمذي: ١٨٥٠ جميعهم بلفظ مقارب للفظ ابن ماجه.

کاتێک نانمان خوارد گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، سەبەتە خورماکەم لەبەر دەستیدا دانا، ئنجا لێی خواردو دابەشی کرد هەتا هەموو تەواو بوون.

**٣٣٠٤-** عَنْ حَكِيمِ بْنِ جَابِرٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي بَيْتِهِ، وَعِنْدَهُ هَذَا الدُّبَّاءُ، فَقُلْتُ: أَيُّ شَيْءٍ هَذَا قَالَ: «هَذَا الْقَرْعُ، هُوَ الدُّبَّاءُ نُكْثِرُ بِهِ طَعَامَنَا»(١).

**واتە:** حەکیمی کوڕی جابیر لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکەی خۆیدا، لەوکاتەدا لەو کولەکانەی لەلا بوو، منیش گوتم: ئەوە چ شتێکە؟ فەرمووی: ئەوە کولەکەیە کە خواردنی خۆمان بە هۆیەوە زۆر دەکەین.

## بابەت: گۆشت

**٣٣٠٥-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَيِّدُ طَعَامِ أَهْلِ الدُّنْيَا، وَأَهْلِ الْجَنَّةِ اللَّحْمُ»(٢).

**واتە:** ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەی خواردنی خەڵکی دنیاو بەهەشت گۆشتە.

**٣٣٠٦-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: «مَا دُعِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِلَى لَحْمٍ قَطُّ، إِلَّا أَجَابَ، وَلَا أُهْدِيَ لَهُ لَحْمٌ قَطُّ، إِلَّا قَبِلَهُ»(٣).

**واتە:** ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: هەرگیز نەبووە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگهێشت کرابێ بۆ گۆشت خواردن و نەچووبێت، وە نەبووە گۆشتی بە دیاری بۆ هاتبێ و وەرینەگرتبێ.

## بابەت: باشترین گۆشت

**٣٣٠٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ بِلَحْمٍ، فَرُفِعَ إِلَيْهِ الذِّرَاعُ، وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ، فَنَهَسَ مِنْهَا»(٤).

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) ضعيف جداً.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٤٠، ومسلم: ١٩٤، والترمذي: ٢٤٣٤ مطولًا عندهم. و ١٨٣٧.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ڕۆژێک گۆشت هێنرایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، جا دەستێکی گۆشتەکەیان بۆ هێنا، پێغەمبەریش ﷺ حەزی بە گۆشتی دەست دەهات، بۆیە بە ددانەکانی لێی دەکردەوە.

**٣٣٠٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ، يُحَدِّثُ ابْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ، وَقَدْ نَحَرَ لَهُمْ جَزُورًا، أَوْ بَعِيرًا أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: وَالْقَوْمُ يُلْقُونَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ اللَّحْمَ يَقُولُ: «أَطْيَبُ اللَّحْمِ لَحْمُ الظَّهْرِ»**[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ دەگێڕێتەوە، کە قسەی بۆ ئیبنو زوبەیر ﷺ گێڕاوەتەوەو لەوکاتەیدا کە وشتریان بۆ سەربڕیبوون، بۆی گێڕاوەتەوە کە خەڵکی گۆشتیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهێنا، وە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیفەرموو: خۆشترین و باشترینی گۆشت گۆشتی پشتە (پشتە مەزە).

## بابەت: گۆشتی برژاو

**٣٣٠٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «مَا أَعْلَمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَأَى شَاةً سَمِيطًا، حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ ﷻ»**[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: نەمزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ مەڕی برژاوی دیتبێ و خواردبێتی هەتا گەیشتەوە بە خوا ﷻ (واتە: هەتا وەفاتی کرد).

**٣٣١٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «مَا رُفِعَ مِنْ بَيْنِ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَضْلُ شِوَاءٍ قَطُّ، وَلَا حُمِلَتْ مَعَهُ طِنْفِسَةٌ»**[3].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: هەرگیز گۆشتی برژاوی زیادە لەبەردەستی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵنەگیراوەتەوە هەرگیز ڕاخەریشی بۆ هەڵنەگیراوە.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٨٥ و ٦٤٥٧.

(٣) ضعيف الإسناد.

**تێبینی:** واتە: هەرگیز ئەوەندە گۆشتی برژاوی لەبەردەست نەبووە بمێنێتەوە، یان کەم بووە، یان دابەشی کردوە، وە هەرگیزیش ڕاخەری بەدوادا هەڵنەگیراوە بۆ لەسەر دانیشتن، چونکە ئەوە بارگرانی تێدا بووەو کاری ئەوانە بووە کە خۆشگوزەران و ئەهلی دنیا بوون.

**٣٣١١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الْجَزْءِ الزُّبَيْدِيِّ ﷺ، قَالَ: «أَكَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ طَعَامًا فِي الْمَسْجِدِ، لَحْمًا قَدْ شُوِيَ، فَمَسَحْنَا أَيْدِيَنَا بِالْحَصْبَاءِ، ثُمَّ قُمْنَا نُصَلِّي، وَلَمْ نَتَوَضَّأْ»[١].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی جەزئی کوڕی زوبەیدی ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بەیەکەوە لەناو مزگەوتدا گۆشتی برژاومان خوارد، ئنجا دەستمان لە زەوی و بەردو خۆڵەکەی هەڵسوو (لەجیاتی شۆردنەوە)، پاشان هەڵسایین بۆ نوێژکردن و دەستنوێژمان نەگرتەوە.

## بابەت: گۆشتی وشککراوە

**٣٣١٢- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ، فَكَلَّمَهُ، فَجَعَلَ تُرْعَدُ فَرَائِصُهُ، فَقَالَ لَهُ: «هَوِّنْ عَلَيْكَ، فَإِنِّي لَسْتُ بِمَلِكٍ، إِنَّمَا أَنَا ابْنُ امْرَأَةٍ تَأْكُلُ الْقَدِيدَ» قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: إِسْمَاعِيلُ وَحْدَهُ، وَصَلَهُ[٢].**

واتە: ئەبو مەسعوود ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەڵ کرد، کابراش دەلەرزی و دەترسا، ئنجا پێی فەرموو: لەسەرخۆبە خۆ من پادشا نیم، من کوڕی ئافرەتێکم کە گۆشتی وشککراوەی دەخوارد.

**٣٣١٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «لَقَدْ كُنَّا نَرْفَعُ الْكُرَاعَ، فَيَأْكُلُهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ خَمْسَ عَشْرَةَ مِنَ الْأَضَاحِيِّ»[٣].**

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە پێچکەی ئاژەڵمان هەڵدەگرت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای پازدە ڕۆژ لە قوربانیکردن دەیخوارد.

---

(١) صحيح دون مسح الأيدي. أخرجه الترمذي: ١٦٦٠.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٢٣ و ٥٥٧٠، ومسلم: ١٩٧١، وأبو داود: ٢٨١٢، والترمذي: ١٥١١، والنسائي: ٤٤٣٢.

## بابەت: جگەرو سپڵ (سیپەلاک)

٣٣١٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أُحِلَّتْ لَكُمْ مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ، فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ، فَالْحُوتُ وَالْجَرَادُ، وَأَمَّا الدَّمَانِ، فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو مردارەوەبوو و دوو خوێنتان بۆ حەڵاڵ کراوە، جا مردارەکان (ئەوانەی کە کوشتنەوەیان ناوێ): ماسی و کوللەن، وە دوو خوێنەکانیش: جگەرو سپڵن.

## بابەت: خوێ

٣٣١٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَيِّدُ إِدَامِكُمُ الْمِلْحُ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەترینی پێخۆرەکانتان خوێیە.

## بابەت: بەپێخورکردنی سرکە

٣٣١٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نِعْمَ الْإِدَامُ الْخَلُّ»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سرکە لە باشترینی پێخۆرەکانە.

٣٣١٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نِعْمَ الْإِدَامُ الْخَلُّ»[٤].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سرکە لە باشترینی پێخۆرەکانە.

---

(١) حسن.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٥١، والترمذي: ١٨٤٠.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٥٢، وأبو داود: ٣٨٢٠ و ٣٨٢١، والترمذي: ١٨٣٩.

**٣٣١٨-** عَنْ أُمِّ سَعْدٍ ﵂، قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى عَائِشَةَ، وَأَنَا عِنْدَهَا، فَقَالَ: «هَلْ مِنْ غَدَاءٍ؟» قَالَتْ: عِنْدَنَا خُبْزٌ، وَتَمْرٌ، وَخَلٌّ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نِعْمَ الْإِدَامُ الْخَلُّ، اللَّهُمَّ بَارِكْ فِي الْخَلِّ، فَإِنَّهُ كَانَ إِدَامَ الْأَنْبِيَاءِ قَبْلِي، وَلَمْ يَفْتَقِرْ بَيْتٌ فِيهِ خَلٌّ»[1].

**واتە:** ئوممو سەعد ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ ماڵی عائیشەو منیش لەلای ئەو بووم، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا هیچ خواردنێکمان هەیە؟ گوتی: نان و خورماو سرکەمان هەیە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سرکە لە باشترینی پێخۆرەکانە، خودایە بەرەکەت بخەیتە سرکەوە، چونکە پێخۆری پێغەمبەرانی پێش منیش بووە، هەر ماڵێکیش سرکەی تێدابێ هەژار نابێ.

## بابەت: زەیت

**٣٣١٩-** عَنْ عُمَرَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ائْتَدِمُوا بِالزَّيْتِ، وَادَّهِنُوا بِهِ، فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ»[2].

**واتە:** عومەر ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەیت بکەنە پێخۆرو، سەرو ڕیش و جەستەی پێ چەور بکەن، چونکە زەیت لە دارێکی بە پیت و فەڕ بەرهەم هاتووە.

**٣٣٢٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُوا الزَّيْتَ، وَادَّهِنُوا بِهِ، فَإِنَّهُ مُبَارَكٌ»[3].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی سەعید لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﵁ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەیت بخۆن و، جەستەی پێ چەور بکەن، چونکە بە پیت و موبارەکە.

---

(١) موضوع.

(٢) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ١٨٥١.

(٣) ضعيف.

## بابەت: شیر

**٣٣٢١-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، تَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أُتِيَ بِلَبَنٍ، قَالَ: «بَرَكَةٌ أَوْ بَرَكَتَانِ»[١].

**واتە:** عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێک شیریان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهێنا دەیفەرموو: پیت و فەڕو بەرەکەتێکە، بەڵکو دووجار بەرەکەتە (هەم خواردنەوەیەو هەمیش پێی تێر دەخۆی).

**٣٣٢٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَطْعَمَهُ اللَّهُ طَعَامًا، فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ، وَارْزُقْنَا خَيْرًا مِنْهُ، وَمَنْ سَقَاهُ اللَّهُ لَبَنًا، فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ، وَزِدْنَا مِنْهُ، فَإِنِّي لَا أَعْلَمُ مَا يُجْزِئُ مِنَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ، إِلَّا اللَّبَنُ»[٢].

**واتە:** ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خوا خواردنێکی پێدا بڵێ: خودایە بەرەکەت و فەڕی تێبخە بۆمان و باشترمان پێبدە، وە هەرکەس خوا شیری خواردنەوەی پێدا، با بڵێ: خودایە بۆمان بەرەکەتدار بکەو بۆمان زیاد بکە، لەڕاستیدا نەمزانیوە هیچ شتێک وەکو شیر بەبری خواردن و خواردنەوە بکەوێ.

## بابەت: شیرینی

**٣٣٢٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ»[٣].

**واتە:** عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی بە شیرینی و هەنگوین دەکرد.

**الحلواء:** وەکو هەڵواو پەڵوی بە دۆشاوو شیرینییەکانی دیکەیە.

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٧٣٠، والترمذي: ٣٤٥٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٦٨، ومسلم: ١٤٧٤، وأبو داود: ٣٧١٤ و ٣٧١٥ ثلاثتهم مطولًا، والترمذي: ١٨٣١.

## بابەت: خواردنی ترۆزی و خورما بەیەکەوە

**٣٣٢٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَتْ أُمِّي تُعَالِجُنِي لِلسُّمْنَةِ، تُرِيدُ أَنْ تُدْخِلَنِي عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «فَمَا اسْتَقَامَ لَهَا ذَلِكَ، حَتَّى أَكَلْتُ الْقِثَّاءَ بِالرُّطَبِ، فَسَمِنْتُ كَأَحْسَنِ سِمْنَةٍ»**[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: دایکم دەیویست چارەسەری قەڵەویم بۆ بکات، (چونکە) دەیویست بە بوکی بمبات بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، جا ئەوەی دەیویست بۆی نەدەهاتە دی، هەتا خورمای تازەو ترۆزیم بەیەکەوە خوارد، ئەوجار بە جوانترین شێوە قەڵەو بووم.

**٣٣٢٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﵄، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «يَأْكُلُ الْقِثَّاءَ بِالرُّطَبِ»**[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﵄ دەڵێ: بینیومە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ترۆزی و خورمای بەیەکەوە دەخوارد.

**٣٣٢٦- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﵁، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَأْكُلُ الرُّطَبَ بِالْبِطِّيخِ»**[3].

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خورمای تازەو کاڵەکی بەیەکەوە دەخوارد.

## بابەت: خورما

**٣٣٢٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْتٌ لَا تَمْرَ فِيهِ جِيَاعٌ أَهْلُهُ»**[4].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرماڵێک خورمای تێدا نەبێت، ئەوە خێزانی ئەو ماڵە برسییە (بە تایبەت ئەوکات، چونکە خواردنی سەرەکی بووە وەکو گەنم و نانی ئێستا).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٩٠٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٤٠، ومسلم: ٢٠٤٣، وأبو داود: ٣٨٣٥، والترمذي: ١٨٤٤.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٤٦، وأبو داود: ٣٨٣١، والترمذي: ١٨١٥.

**٣٣٢٨-** عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، عَنْ جَدَّتِهِ سَلْمَى، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «بَيْتٌ لَا تَمْرَ فِيهِ، كَالْبَيْتِ لَا طَعَامَ فِيهِ»[١].

**واتە:** عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕافیع ﷺ لە سەلمای داپیریەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ماڵێک خورمای تێدا نەبێ وەکو ئەوە وایە هیچ خواردنێکی تێدا نەبێت.

## بابەت: نۆبەرەی بەروبووم

**٣٣٢٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أُتِيَ بِأَوَّلِ الثَّمَرَةِ قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا، وَفِي ثِمَارِنَا، وَفِي مُدِّنَا، وَفِي صَاعِنَا، بَرَكَةً مَعَ بَرَكَةٍ، ثُمَّ يُنَاوِلُهُ أَصْغَرَ مَنْ بِحَضْرَتِهِ مِنَ الْوِلْدَانِ»[٢].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، هەرکات نۆبەرەی بەروبوومیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهێنا دەیفەرموو: خودایە بەرەکەت بڕژێنە بەسەر شارو بەروبووم و مشت و پێوانەماندا، بەرەکەت لەگەڵ بەرەکەت (بڕژێنە بەسەرماندا)، پاشان دەیدا بە بچوکترین منداڵ لە ئامادەبووەکاندا.

## بابەت: خواردنی فەریکە خورما بە خورماوە

**٣٣٣٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُوا الْبَلَحَ بِالتَّمْرِ، كُلُوا الْخَلَقَ بِالْجَدِيدِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَغْضَبُ، وَيَقُولُ بَقِيَ ابْنُ آدَمَ، حَتَّى أَكَلَ الْخَلَقَ بِالْجَدِيدِ»[٣].

**واتە:** عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خورمای وشک (یان فەریکە خورما) لەگەڵ خورمای پێگەیشتوو بخۆن، کۆنەکان بە تازەکانەوە بخۆن، چونکە شەیتان پێی تووڕە دەبێ و دەڵێ: ئادەمیزاد مایەوە هەتا کۆنەکەشی لەگەڵ تازەکە خوارد.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٧٣، والترمذي: ٣٤٥٤.

(٣) موضوع.

## بابەت: نەهی کردن لە خواردنی خورما دوو دانە دوو دانە پێکەوە

٣٣٣١- عَنْ جَبَلَةَ بْنِ سُحَيْمٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ، يَقُولُ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَقْرِنَ الرَّجُلُ بَيْنَ التَّمْرَتَيْنِ، حَتَّى يَسْتَأْذِنَ أَصْحَابَهُ»[١].

واتە: جەبەلەی کوڕی سوحەیم ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عومەر بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە کە پیاو دوو خورما دوو خورما پێکەوە بخوات مەگەر مۆڵەت لە هاوڕێکانی وەربگرێت.

٣٣٣٢- عَنْ سَعْدٍ ﷺ، مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ، وَكَانَ سَعْدٌ يَخْدُمُ النَّبِيَّ ﷺ، وَكَانَ يُعْجِبُهُ حَدِيثُهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «نَهَى عَنِ الْإِقْرَانِ» يَعْنِي فِي التَّمْرِ[٢].

واتە: سەعدی ﷺ خزمەتکاری ئەبو بەکر کە خزمەتی پێغەمبەری ﷺ دەکردو کاریگەر بوو بە فەرموودەکانی دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە خواردنی دوو خورما دوو خورما بەیەکەوە،واتە: لە خورمادا.

## بابەت: پشکنینی خورما

٣٣٣٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أُتِيَ بِتَمْرٍ عَتِيقٍ، فَجَعَلَ يُفَتِّشُهُ»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: خورمای کۆنیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، منیش بینیم پێغەمبەر ﷺ دەیپشکنین (لەبەر هەبوونی کرم لەناویاندا).

## بابەت: خواردنی خورماو کەرە پێکەوە

٣٣٣٤- عَنِ ابْنَيْ بُسْرٍ السُّلَمِيَّيْنِ ﷺ، قَالَا: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَوَضَعْنَا تَحْتَهُ قَطِيفَةً لَنَا، صَبَبْنَاهَا لَهُ صَبًّا، فَجَلَسَ عَلَيْهَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ عَلَيْهِ الْوَحْيَ فِي بَيْتِنَا، وَقَدَّمْنَا لَهُ زُبْدًا، وَتَمْرًا، وَكَانَ يُحِبُّ الزُّبْدَ ﷺ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٥٥، ومسلم: ٢٠٤٥، وأبو داود: ١٨١٤.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٣٢.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٣٧.

واتە: دوو کوڕەکەی بوسڕی سولەمیی ﷺ دەگێڕنەوە، کە گوتویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ماڵمان، ئێمەش ڕاخەرێکمان بۆ ڕاخست و ئاومان لێپڕژاندو لەسەری دانیشت، جا هەر لە ماڵەکەی ئێمەدا خوای ﷻ وەحی دابەزاندە سەر، ئێمەش کەرەو خورمامان بۆ دانا، وە پێغەمبەر ﷺ کەرەی پێ خۆش بوو.

## بابەت: نانی ئاردی سپی

**٣٣٣٥- عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: سَأَلْتُ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ: هَلْ رَأَيْتَ النَّقِيَّ؟ قَالَ: «مَا رَأَيْتُ النَّقِيَّ، حَتَّى قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ» فَقُلْتُ: فَهَلْ كَانَ لَهُمْ مَنَاخِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «مَا رَأَيْتُ مُنْخُلًا، حَتَّى قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»، قُلْتُ: فَكَيْفَ كُنْتُمْ تَأْكُلُونَ الشَّعِيرَ غَيْرَ مَنْخُولٍ؟ قَالَ: «نَعَمْ كُنَّا نَنْفُخُهُ، فَيَطِيرُ مِنْهُ مَا طَارَ، وَمَا بَقِيَ ثَرَّيْنَاهُ»**[1].

واتە: عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبو حازیم ﷺ دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوەو گوتی: پرسیارم لە سەهلی کوڕی سەعد کرد: ئایا نانی سپیت دیتووە؟ گوتی: هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتیشی کرد نانی سپیم نەدیتبوو؟ گوتم: ئایا لەسەر دەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ هێڵەکیان هەبوو؟ گوتی: هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتیشی کرد هێڵەکم نەدیتبوو، گوتم: ئەی چۆن ئاردی جۆتان دەکردە نان و دەتان خوارد بەبێ دابێژتن؟ گوتی: بەڵێ، ئێمە فوومان لێدەکرد، جا ئەوەی دەڕۆشت دەڕۆشت، ئەوەشی دەمایەوە ئاومان لێدەداو دەمانکردە هەویر.

**هێڵەک:** بۆ دابێژانی ئارد بەکاردێ تاکو ئەو توێکڵە گەنم و جۆیەی لەگەڵ ئاردەکەیە جیای بکاتەوە.

**٣٣٣٦- عَنْ أُمِّ أَيْمَنَ ﷺ، أَنَّهَا غَرْبَلَتْ دَقِيقًا، فَصَنَعَتْهُ لِلنَّبِيِّ ﷺ رَغِيفًا، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟» قَالَتْ: طَعَامٌ نَصْنَعُهُ بِأَرْضِنَا، فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَصْنَعَ مِنْهُ لَكَ رَغِيفًا، فَقَالَ: «رُدِّيهِ فِيهِ، ثُمَّ اعْجِنِيهِ»**[2].

واتە: ئوممو ئەیمەن ﷺ دەگێڕێتەوە، کە ئاردی دابێژتبووەو کولێرەی بۆ پێغەمبەر ﷺ لێ دروست کردوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرموویەتی: ئەوە چییە؟ گوتوویەتی: ئەوە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤١٣، والترمذي: ٢٣٦٤.

(٢) حسن الإسناد.

خواردنێکە کە لەلای ئێمە دروست دەکرێ و منیش ویستم کولێرەی بۆ جەنابت لێ دروست بکەم، ئەویش فەرمووی: دابێژراوەکەی لەگەڵ تێکەڵ بکەوە، پاشان بیشێلە بۆ هەویر.

**٣٣٣٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «مَا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَغِيفًا مُحَوَّرًا، بِوَاحِدٍ مِنْ عَيْنَيْهِ، حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ»(١).

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ کولێرەیەکی بە چاوەکانی خۆی نەدیتبوو کە ئاردەکەی دابێژراو بێت، هەتا گەیشتەوە بە خوا.**

## بابەت: نانی تازەو تەنک (نانی تیری)

**٣٣٣٨-** عَنِ ابْنِ عَطَاءٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: زَارَ أَبُو هُرَيْرَةَ قَوْمَهُ - يَعْنِي قَرْيَةً، أَظُنُّهُ قَالَ يُبْنَى - فَأَتَوْهُ بِرُقَاقٍ مِنْ رُقَاقِ الْأُوَلِ، فَبَكَى، وَقَالَ: «مَا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَذَا بِعَيْنِهِ قَطُّ»(٢).

**واتە: ئیبنو عەتاء لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ سەردانی خزمەکانی خۆی کرد، واتە: لە گوندێک، وابزانم گوتی: یوبنا، جا نانی تازەو تەنکیان بۆ هێنا (نانی تیری) لەو نانەی کە سەرەتا کرابوون (گەرمە تەندوور)، ئەویش گریاو گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز بە چاوەکانی خۆی ئەو جۆرە نانەی نەبینی.**

**٣٣٣٩-** حَدَّثَنَا قَتَادَةُ ﷺ، قَالَ: كُنَّا نَأْتِي أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ - قَالَ إِسْحَاقُ: وَخَبَّازُهُ قَائِمٌ، وَقَالَ الدَّارِمِيُّ: وَخِوَانُهُ مَوْضُوعٌ - فَقَالَ يَوْمًا: «كُلُوا فَمَا أَعْلَمُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَأَى رَغِيفًا مُرَقَّقًا، بِعَيْنِهِ، حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ وَلَا شَاةً سَمِيطًا، قَطُّ»(٣).

**واتە: قەتادە بۆی گێڕاینەوە، گوتی: ئێمە دەچووین بۆ لای ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، ئیسحاق گوتی: نانەواکەی لەوێ بوو، داریمیش گوتی: سفرەی ڕاخراو بوو، جا ڕۆژێک ئەنەس گوتی: بخۆن، نەمزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ کە کولێرەی ئاردی سپی بە چاوەکانی خۆی بینیبێ هەتا گەیشتەوە بە خوا، وە هەرگیز مەڕی برژاویشی نەبینیوە.**

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٨٥ و ٦٤٥٧.

**٣٣٤٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: أَوَّلُ مَا سَمِعْنَا بِالْفَالُوذَجِ، أَنَّ جِبْرِيلَ ﵇، أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أُمَّتَكَ تُفْتَحُ عَلَيْهِمُ الْأَرْضُ، فَيُفَاضُ عَلَيْهِمْ مِنَ الدُّنْيَا، حَتَّى إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ الْفَالُوذَجَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَمَا الْفَالُوذَجُ» ؟ قَالَ: يَخْلِطُونَ السَّمْنَ وَالْعَسَلَ جَمِيعًا، فَشَهِقَ النَّبِيُّ ﷺ لِذَلِكَ شَهْقَةً[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: یەکەم جار کە ناوی «الفالوذج»مان بیست ئەوەبوو کە جیبریل ﵇ هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا فەرمووی: بێگومان ئوممەتەکەت وڵاتێکی زۆریان بۆ ڕزگار دەبێ و دونیا ڕوویان تێدەکات و بەسەریاندا دەڕژێت، بە جۆرێک هەتا «الفالوذج»ـیش دەخۆن، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «الفالوذج» چییە؟ جیبریل فەرمووی: ڕۆن و هەنگوین تێکەڵ دەکەن بەیەکەوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەو هەواڵە گریان لە سینگیدا دەهات و دەچوو.

## بابەت: تێکەڵکردنی ڕۆن بە نانەوە

**٣٣٤١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ: «وَدِدْتُ لَوْ أَنَّ عِنْدَنَا خُبْزَةً بَيْضَاءَ، مِنْ بُرَّةٍ سَمْرَاءَ، مُلَبَّقَةٍ بِسَمْنٍ، نَأْكُلُهَا» قَالَ: فَسَمِعَ بِذَلِكَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَاتَّخَذَهُ، فَجَاءَ بِهِ إِلَيْهِ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فِي أَيِّ شَيْءٍ كَانَ، هَذَا السَّمْنُ؟» قَالَ: فِي عُكَّةِ ضَبٍّ، قَالَ: «فَأَبَى أَنْ يَأْكُلَهُ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خۆزگە نانێکی سپیمان هەبوایە کە لە گەنم بوایەو بە ڕۆن چەورمان بکردبایەو بمانخواردبایە، ڕاوی دەڵێ: پیاوێک لە ئەنصارەکان گوێی لێبوو پەیدای کردو هێنایە خزمەتی، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو ڕۆنە لەچیدا هەڵگیرابوو؟ گوتی: لەپێستی بزنمژەدا، ڕاوی گوتی: پێغەمبەر ﷺ لێی نەخوارد.

**٣٣٤٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: صَنَعَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ لِلنَّبِيِّ ﷺ: خُبْزَةً، وَضَعَتْ فِيهَا شَيْئًا مِنْ سَمْنٍ، ثُمَّ قَالَتْ: اذْهَبْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَادْعُهُ قَالَ: فَأَتَيْتُهُ، فَقُلْتُ: أُمِّي تَدْعُوكَ، قَالَ، فَقَامَ، وَقَالَ: لِمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنَ النَّاسِ «قُومُوا» قَالَ: فَسَبَقْتُهُمْ إِلَيْهَا، فَأَخْبَرْتُهَا، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: «هَاتِي

---

(١) موضوع المتن.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٨١٨.

مَا صَنَعْتِ» فَقَالَتْ: إِنَّمَا صَنَعْتُهُ لَكَ وَحْدَكَ، فَقَالَ: «هَاتِيهِ» فَقَالَ: «يَا أَنَسُ أَدْخِلْ عَلَيَّ عَشَرَةً عَشَرَةً» قَالَ، فَمَا زِلْتُ أُدْخِلُ عَلَيْهِ عَشَرَةً عَشَرَةً، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، وَكَانُوا ثَمَانِينَ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: ئوممو سولەیم نانێکی بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست کرد کە کەمێک ڕۆنی پێوەکرد، پاشان گوتی: بچۆ بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و بانگی بکە، گوتی: منیش هاتمە خزمەتی و گوتم: دایکم بانگت دەکات، گوتی: ئەویش هەستاو بەو خەڵکەی لەدەوری بوون فەرمووی: هەستن، گوتی: منیش پێش هەموویان چوومەوەو هەواڵم پێدا، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەی دروستت کردوە بیهێنە، ئوممو سولەیم گوتی: ئاخر خۆ من تەنها بۆ تۆم دروست کردبوو تەنها بەشی تۆیە، ئەویش فەرمووی: بیهێنە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەنەس دە کەس دە کەس بیاننێرە ژووری، ئەنەس گوتی: بەردەوام دە کەس دە کەسم دەناردە خزمەتی، جا هەموویان تێر خواردیان و ژمارەشیان هەشتا کەس بوو.

## بابەت: نانی گەنم

٣٣٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا شَبِعَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، تِبَاعًا مِنْ خُبْزِ الْحِنْطَةِ، حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ ﷻ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ بەدوای یەکدا لە نانی گەنم تێری نەخواردووە، هەتا خوای ﷻ گێڕایەوە بۆلای خۆی.

٣٣٤٤- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ ﷺ مُنْذُ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ، ثَلَاثَ لَيَالٍ تِبَاعًا، مِنْ خُبْزِ بُرٍّ، حَتَّى تُوُفِّيَ ﷺ»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: ماڵ و خێزانی پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەی کە هاتوونە مەدینە سێ شەو بەدوای یەکدا تێریان نەخواردووە لە نانی گەنم هەتاکو وەفاتیشی کرد ﷺ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٧٨، ومسلم: ٢٠٤٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٧٤، ومسلم: ٢٩٧٦، والترمذي: ٢٣٥٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤١٦، ومسلم: ٢٩٧٠ وانظر ٣٣٤٦.

## بابەت: نانی جۆ

**٣٣٤٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «لَقَدْ تُوُفِّيَ النَّبِيُّ ﷺ، وَمَا فِي بَيْتِي مِنْ شَيْءٍ، يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ، إِلَّا شَطْرُ شَعِيرٍ، فِي رَفٍّ لِي، فَأَكَلْتُ مِنْهُ، حَتَّى طَالَ عَلَيَّ، فَكِلْتُهُ فَفَنِيَ»[١].

**واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد لەکاتێکدا هیچ شتێک لە ماڵەکەمدا نەبوو کە گیان لەبەر دەیخوات جگە لە هەندێک جۆ نەبێ لەناو تاقەیەکدا بوو، منیش لێم خوارد تا ماوەیەکی دوورو درێژ، ئنجا پێوام (جا کە پێوانەم کرد) زوو بە ماوەیەکی کەم کۆتایی پێهات.**

**٣٣٤٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ ﷺ، مِنْ خُبْزِ الشَّعِيرِ، حَتَّى قُبِضَ»[٢].

**واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: هەتا پێغەمبەر ﷺ وەفاتیشی کرد ماڵ و خێزانی پێغەمبەر ﷺ لە نانی جۆ تێریان نەخوارد.**

**٣٣٤٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَبِيتُ اللَّيَالِي الْمُتَتَابِعَةَ طَاوِيًا، وَأَهْلُهُ لَا يَجِدُونَ الْعَشَاءَ، وَكَانَ عَامَّةَ خُبْزِهِمْ، خُبْزُ الشَّعِيرِ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چەندین شەو بەدوای یەکدا بە سکی خاڵییەوە شەو دەنوست، وە خێزانەکەشی خواردنی شەویان دەسنەدەکەوت، وە زۆربەی خواردنەکەشیان نانی جۆ بوو.**

**٣٣٤٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: لَبِسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الصُّوفَ، وَاحْتَذَى الْمَخْصُوفَ وَقَالَ: «أَكَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَشِعًا، وَلَبِسَ خَشِنًا»، فَقِيلَ لِلْحَسَنِ، مَا الْبَشِعُ قَالَ: «غَلِيظُ الشَّعِيرِ، مَا كَانَ يُسِيغُهُ، إِلَّا بِجُرْعَةِ مَاءٍ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٩٧، ومسلم: ٢٩٧٣، والترمذي: ٢٤٦٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢/٢٩٧٠، والترمذي: ٢٣٥٧ وانظر ٢٣٤٤.

(٣) حسن صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٣٦٠.

(٤) ضعيف.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیکﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ پۆشاکی خوری لەبەردەکردو نەعلی پینەکراوی لەپێ دەکرد، وە گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی زبرو ڕەقی دەخواردو پۆشاکی زبری لەبەردەکرد، گوترا بە حەسەن: «البشع» چییە؟ گوتی: جۆی زبرو ڕەق کە بەبێ ئاو قوت نەدەدرا.

## بابەت: لێگرتنەوە لە خواردن و ناپەسەندی زۆرخۆری

**٣٣٤٩-** عَنِ الْمِقْدَامَ بْنَ مَعْدِ يكَرِبَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مَلَأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ، حَسْبُ الْآدَمِيِّ، لُقَيْمَاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ غَلَبَتِ الْآدَمِيَّ نَفْسُهُ، فَثُلُثٌ لِلطَّعَامِ، وَثُلُثٌ لِلشَّرَابِ، وَثُلُثٌ لِلنَّفَسِ»[١].

واتە: میقدامی کوڕی مەعدی کەریب ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خەراپترین دەفر کە ئادەمیزاد پڕی دەکات گەدەیەتی، چەند پاروویەک بۆ ئادەمیزاد بەسە کە بتوانێ خۆی پێ ڕابگرێت، خۆ ئەگەر هەر نەفسی بەسەریدا زاڵ بوو (با گەدەی بکاتە سێ بەش)، با بەشێکی بۆ خواردن بێ و بەشێکی بۆ خواردنەوە و بەشێکیشی بۆ هەناسەدان.

**٣٣٥٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: تَجَشَّأَ رَجُلٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «كُفَّ جُشَاءَكَ عَنَّا، فَإِنَّ أَطْوَلَكُمْ جُوعًا، يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أَكْثَرُكُمْ شِبَعًا فِي دَارِ الدُّنْيَا»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ قرقێنەیدا، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: قرقێنەکەت لە ئێمە دوور بخەوە، چونکە بێگومان برسیترین کەس لە ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە کە لەو دونیایەدا تێرتر بووە.

**٣٣٥١-** عَنْ عَطِيَّةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ سَلْمَانَ، وَأُكْرِهَ عَلَى طَعَامٍ يَأْكُلُهُ، فَقَالَ: حَسْبِي، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ شِبَعًا فِي الدُّنْيَا، أَطْوَلُهُمْ جُوعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٣].

---

(١) صحيح بطرقه. أخرجه الترمذي: ٢٣٨٠.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٤٧٨.

(٣) ضعيف.

واتە: عەتیەی کوڕی عامیری جوهەنیی ﷺ دەڵێ: بیستم لە سەلمان کە زۆری لێکراوە لەسەر خواردنێک تا بیخوات، ئەویش گوتوویەتی: بەسمە، بێگومان بۆخۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بێگومان ئەو کەسەی کە تێرترین کەسە لە دونیادا، ئەو برسیترین کەسە لە ڕۆژی قیامەتداو زۆرترین ماوە لە برسییەتیدا دەبێت.

## بابەت: ئەوەی کە ئەگەر هەرچی حەزت بۆ چوو بیخۆی بە زیادەڕەوی ئەژمار دەکرێت

٣٣٥٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنَ السَّرَفِ، أَنْ تَأْكُلَ كُلَّ مَا اشْتَهَيْتَ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هەرچی حەزت بۆچوو تۆش بیخۆی ئەوە بە زیادەڕەوی ئەژمار دەکرێت.

## بابەت: نەهی کردن لە فڕێدانی خواردن

٣٣٥٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ الْبَيْتَ، فَرَأَى كِسْرَةً مُلْقَاةً، فَأَخَذَهَا فَمَسَحَهَا، ثُمَّ أَكَلَهَا، وَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ أَكْرِمِي كَرِيمًا، فَإِنَّهَا مَا نَفَرَتْ عَنْ قَوْمٍ قَطُّ، فَعَادَتْ إِلَيْهِمْ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتەوە بۆماڵەوە، جا بینی کەوا پارچە نانێک لەسەر زەوی کەوتووە، ئەویش هەڵیگرتەوەو سڕیەوەو خواردی، وە فەرمووی: ئەی عائیشە ڕێزی شتی بەڕێز (ڕزق و ڕۆزی) بگرە، چونکە ئەگەر لەناو هەر گەلێکدا ڕزق باری کرد (بەهۆی ناسوپاسگوزارییەوە)، ئەوە هەرگیز ناگەڕێتەوە ناویان.

## بابەت: پەنا گرتن بە خوا لە برسییەتی

٣٣٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ، فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِيَانَةِ، فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ»[٣].

---

(١) موضوع.

(٢) صحيح.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ١٥٤٧، والنسائي: ٥٤٦٨ و ٥٤٦٩.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە پەنات پێدەگرم لە برسییەتی کە خراپترین هاونوێنە (چونکە کەسی برسی ناتوانێ کارو پەرستشەکانی ڕاپەڕێنێ و ناچارە بخەوێ)، وە پەنات پێدەگرم لە خیانەت کە خراپترین شتی شاراوەو نهێنییە.

## بابەت: وازهێنان لە خواردنی ژەمی شەو

**٣٣٥٥**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَدَعُوا الْعَشَاءَ، وَلَوْ بِكَفٍّ مِنْ تَمْرٍ، فَإِنَّ تَرْكَهُ يُهْرِمُ»[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: واز لە ژەمی شەوان مەهێنن، ئەگەر بە لویچێک خورماش بێ، چونکە وازهێنان لە ژەمی شەو پیری دێنێ.

## بابەت: میوانداری

**٣٣٥٦**- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْخَيْرُ أَسْرَعُ إِلَى الْبَيْتِ الَّذِي يُغْشَى، مِنَ الشَّفْرَةِ إِلَى سَنَامِ الْبَعِيرِ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاتنی خێرو چاکە بۆ ئەوماڵەی کە بە میوان و میوانداربیە زۆر خێراترە لە بڕینی کۆپارەی وشتر بە چەقۆ (عادەتی عەرەب وابووە کە وشتریان سەربڕیوە بە خێرایی و، پێش هەموو شتێک چەقۆیان لە کۆپارەکەی ناوەو لێیان کردۆتەوە بۆ خواردن، چونکە ڕەغبەتی زۆر لەسەر بووە).

**٣٣٥٧**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْخَيْرُ أَسْرَعُ إِلَى الْبَيْتِ الَّذِي يُؤْكَلُ فِيهِ، مِنَ الشَّفْرَةِ إِلَى سَنَامِ الْبَعِيرِ»[٣].

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاتنی خێرو چاکە بۆماڵێک کە نانی لێ دەخورێ (بەهۆی میوانداریییەوە) زۆر خێراترە لەو چەقۆیەی کە کۆپارەی وشتری پێ دەبڕن.

٣٣٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنَ السُّنَّةِ، أَنْ يَخْرُجَ الرَّجُلُ مَعَ ضَيْفِهِ، إِلَى بَابِ الدَّارِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕێبازو سوننەتی شەریعەتە کە پیاو هەتاکو دەرگای ماڵەکەی لەگەڵ میوانەکەی بچێتە دەرێ.

## بابەت: ئەگەر میوان شتێکی خراپی بینی، بگەڕێتەوە

٣٣٥٩- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: صَنَعْتُ طَعَامًا، فَدَعَوْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «فَجَاءَ فَرَأَى فِي الْبَيْتِ، تَصَاوِيرَ، فَرَجَعَ»[٢].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: خواردنێکم ئامادەکرد و بانگهێشتی پێغەمبەری خوام ﷺ کرد، ئەویش تەشریفی هات و وێنەی لە ماڵەکەدا بینی، بۆیە گەڕایەوە.

٣٣٦٠- عَنْ سَفِينَةَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ رَجُلًا، أَضَافَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، فَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا، فَقَالَتْ فَاطِمَةُ: لَوْ دَعَوْنَا النَّبِيَّ ﷺ، فَأَكَلَ مَعَنَا، فَدَعَوْهُ فَجَاءَ، فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى عِضَادَتَيِ الْبَابِ، فَرَأَى قِرَامًا فِي نَاحِيَةِ الْبَيْتِ، فَرَجَعَ فَقَالَتْ فَاطِمَةُ لِعَلِيٍّ: الْحَقْ، فَقُلْ لَهُ: مَا رَجَعَكَ؟ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «إِنَّهُ لَيْسَ لِي أَنْ أَدْخُلَ بَيْتًا مُزَوَّقًا»[٣].

واتە: سەفینە کە ئەبو عەبدوڕڕەحمانە دەگێڕێتەوە، پیاوێک بووە میوانی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی ﷺ، جا خواردنێکی بۆ دروست کردبوو، فاتیمەش گوتی: خۆزگە پێغەمبەرمان ﷺ بانگهێشت بکردبایەو نانی لەگەڵ خواردبایەن، ئنجا بانگهێشتیان کردو تەشریفی هات، جا دەستی خستە سەر لاشیپانەکانی دەرگاکەو لەوکاتەدا پەردەیەکی خوری ڕەنگاوڕەنگی بینی لە لایەکی ماڵەکەدا، بۆیە گەڕایەوە، فاتیمەش

---

(١) موضوع.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٥٣٥١.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٧٥٥.

به عەلی گوت: بیگەڕێ پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی بوو تۆی گێڕایەوە؟ فەرمووی: بێگومان من بۆم نیە بچمە ماڵێک کە بە نەخش و وێنە ڕازێنرابێتەوە.

## بابەت: کۆکردنەوەی ڕۆن و گۆشت بەیەکەوە

**٣٣٦١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: دَخَلَ عَلَيْهِ عُمَرُ، وَهُوَ عَلَى مَائِدَتِهِ، فَأَوْسَعَ لَهُ عَنْ صَدْرِ الْمَجْلِسِ، فَقَالَ: بِسْمِ اللَّهِ، ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدِهِ، فَلَقِمَ لُقْمَةً، ثُمَّ ثَنَّى بِأُخْرَى، ثُمَّ قَالَ: «إِنِّي لَأَجِدُ طَعْمَ دَسَمٍ، مَا هُوَ بِدَسَمِ اللَّحْمِ» فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنِّي خَرَجْتُ إِلَى السُّوقِ أَطْلُبُ السَّمِينَ لِأَشْتَرِيَهُ، فَوَجَدْتُهُ غَالِيًا، فَاشْتَرَيْتُ بِدِرْهَمٍ مِنَ الْمَهْزُولِ، وَحَمَلْتُ عَلَيْهِ بِدِرْهَمٍ سَمْنًا، فَأَرَدْتُ أَنْ يَتَرَدَّدَ عِيَالِي عَظْمًا عَظْمًا، فَقَالَ عُمَرُ: «مَا اجْتَمَعَا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَطُّ، إِلَّا أَكَلَ أَحَدَهُمَا، وَتَصَدَّقَ بِالْآخَرِ» قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: خُذْ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، فَلَنْ يَجْتَمِعَا عِنْدِي، إِلَّا فَعَلْتُ ذَلِكَ، قَالَ: «مَا كُنْتُ لِأَفْعَلَ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: عومەر چۆتە ماڵیان، کە لەوکاتەدا ئەو لەسەر سفرەی نان خواردن بووە، جا سەرەوەی مەجلیسەکەی بۆ عومەر چۆڵکرد، ئەویش گوتی: «بسم الله» (بۆ دەسپێکی نان خواردن)، پاشان دەستی برد پاروویەکی هەڵگرت و پاشان پاروویەکی تریشی هەڵگرت، ئەوجار گوتی: بۆنی چەورییەک دەکەم کە لە بۆنی چەوری گۆشتەکە ناچێت، عەبدوڵڵاش گوتی: ئەی ئەمیری بڕواداران لەڕاستیدا چووم بۆ بازاڕ، ویستم گۆشتی قەڵەو بکڕم، کەچی بینیم نرخی گرانە، منیش بای درهەمێک گۆشتی لاوازو کەم چەوریم کڕی، وە بای درهەمێکیش ڕۆنم بۆ بکڕی، کە ویستم بەوە ئێسکەکانی چەورو چۆڵ ببێت، بۆیە عومەر گوتی: هەرگیز ئەو دوو شتانە (ڕۆن و گۆشت) لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بەیەکەوە کۆنەبوونەوە مەگەر یەکێکیانی خواردووەو ئەویتریشی بەخشیوە، عەبدوڵڵا گوتی: ئەو جارەیان بخۆ ئەی ئەمیری بڕواداران، هەرگیز جارێکی تر لەلای منیش ئەو دووانە بەیەکەوە کۆنابنەوە، (عومەر) گوتی: کاری وا ناکەم (لێی ناخۆم).

---

(١) ضعيف.

## بابەت: ئەوەی ئەگەر شلە چێشت ئاوی زۆری تێبکرێت

٣٣٦٢- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا عَمِلْتَ مَرَقَةً، فَأَكْثِرْ مَاءَهَا، وَاغْتَرِفْ لِجِيرَانِكَ مِنْهَا»[1].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکات چێشتی شلەت لێنا ئەوە ئاوی زۆری تێبکە، وە بەشی هاوسێیەکەشتی لێبدە.

## بابەت: خواردنی سیرو پیازو کەوەر

٣٣٦٣- عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ الْيَعْمَرِيِّ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، قَامَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ خَطِيبًا، فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ تَأْكُلُونَ شَجَرَتَيْنِ، لَا أُرَاهُمَا، إِلَّا خَبِيثَتَيْنِ، هَذَا الثُّومُ، وَهَذَا الْبَصَلُ، وَلَقَدْ كُنْتُ أَرَى الرَّجُلَ، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يُوجَدُ رِيحُهُ مِنْهُ، فَيُؤْخَذُ بِيَدِهِ، حَتَّى يُخْرَجَ بِهِ إِلَى الْبَقِيعِ، فَمَنْ كَانَ آكِلَهُمَا لَا بُدَّ، فَلْيُمِتْهُمَا طَبْخًا»[2].

واتە: مەعدانی کوڕی ئەبو تەڵحەی یەعموریی ﷺ دەگێڕێتەوە، عومەری کوڕی خەتتاب ڕۆژی جومعە ڕاوەستا بۆ وتاردان -یان وتاریدا- و سوپاس و ستایشی خوای کردو پاشان گوتی: ئەی خەڵکینە ئێوە لەو دوو ڕووەکە دەخۆن بەڕاستی من بۆنەکەیان بە پیسی قێزەون دەبینم، ئەو سیرو پیازە، وە بەڕاستی من لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دەمبینی کە پیاوێک بۆنی سیری لێهاتبا دەستیان دەگرت و دەیانبردە دەرێ تاکو بەقیع، خۆ ئەگەر کەسێک هەر دەیخوات با بۆنەکەی بە کوڵاندن نەهێڵێ (ئنجا بیخوات).

٣٣٦٤- عَنْ أُمِّ أَيُّوبَ ﷺ، قَالَتْ: صَنَعْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ طَعَامًا فِيهِ، مِنْ بَعْضِ الْبُقُولِ، فَلَمْ يَأْكُلْ، وَقَالَ: «إِنِّي أَكْرَهُ أَنْ أُوذِيَ صَاحِبِي»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٢٥، والترمذي: ١٨٣٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٦٧، والنسائي: ٧٠٨.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ١٨١٠.

واتە: ئوممو ئەیوب ﵂ دەڵێ: خواردنێکم بۆ پێغەمبەر ﷺ ئامادەکرد، کە هەندێک شتی وەکو: پیازو سیری تێدابوو، پێغەمبەر ﷺ نەیخوارد و فەرمووی: لەڕاستیدا پێمناخۆشە هاوڕێکەم (کە جیبریلە بە بۆنی ناخۆش) ئازار بدەم.

**٣٣٦٥-** عَنْ جَابِرٍ ﵁، أَنَّ نَفَرًا، أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ، فَوَجَدَ مِنْهُمْ رِيحَ الْكُرَّاثِ، فَقَالَ: «أَلَمْ أَكُنْ نَهَيْتُكُمْ عَنْ أَكْلِ هَذِهِ الشَّجَرَةِ، إِنَّ الْمَلَائِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ الْإِنْسَانُ»(١).

واتە: جابیر ﵁ دەگێڕێتەوە، چەند کەسێک هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش بۆنی کەوەری لێکردن، بۆیە فەرمووی: ئایا من خواردنی ئەو ڕووەکەم لێ قەدەغە نەکردوون؟ بێگومان فریشتەکانیش بەو شتانە تووشی ئازارو ناڕەحەتی دەبن کە مرۆڤ پێی تووشی ئازارو ناڕەحەتی دەبێت.

**٣٣٦٦-** عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ الْجُهَنِيَّ ﵁، يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِأَصْحَابِهِ: «لَا تَأْكُلُوا الْبَصَلَ» ثُمَّ قَالَ: كَلِمَةً خَفِيَّةً النِّيءَ(٢).

واتە: عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: پیاز مەخۆن، پاشان بە سوکێکەوە فەرمووی: بە کاڵ و نەکوڵیوی.

## بابەت: خواردنی پەنیرو ڕۆن

**٣٣٦٧-** عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ ﵁، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ السَّمْنِ، وَالْجُبْنِ، وَالْفِرَاءِ قَالَ: «الْحَلَالُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ، وَالْحَرَامُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ، فَهُوَ مِمَّا عَفَا عَنْهُ»(٣).

واتە: سەلمانی فارسیی ﵁ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی ڕۆن و پەنیرو کەرەکێوی؟ فەرمووی حەڵاڵ ئەو شتەیە کە خوا لە قورئاندا حەڵاڵی کردوە، وە حەرامیش ئەوەیە کە خوا لە قورئاندا حەرامی کردوە، ئەوەشی باسی نەکردوە ئەوە لەو شتانەیە کە چاوپۆشی لێکراوە.

---

(١) صحيح. انظر: البخاري: ٨٥٤، ومسلم: ٥٦٤، وأبو داود: ٣٨٢٢، والنسائي: ٧٠٧.

(٢) صحيح دون قوله: «ثُمَّ قَالَ».

(٣) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ١٧٢٦.




## بابەت: خواردنی میوە

**٣٣٦٨- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، قَالَ أُهْدِيَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، عِنَبٌ مِنَ الطَّائِفِ، فَدَعَانِي فَقَالَ: «خُذْ هَذَا الْعُنْقُودَ، فَأَبْلِغْهُ أُمَّكَ» فَأَكَلْتُهُ قَبْلَ أَنْ أُبْلِغَهُ إِيَّاهَا، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ لَيَالٍ، قَالَ لِي: «مَا فَعَلَ الْعُنْقُودُ؟ هَلْ أَبْلَغْتَهُ أُمَّكَ؟» قُلْتُ: لَا. قَالَ: فَسَمَّانِي غُدَرَ»**[1].

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: هەندێک ترێ لە تائیفەوە بە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنرا، ئنجا بانگی کردم و فەرمووی: ئەو هێشوویە بگرەو بیگەیەنە بە دایکت، (دەڵێ:) منیش پێش ئەوەی بیگەیەنمە لای دایکم خواردم، جا دوای چەند شەوێک پێمی فەرموو: هێشووەکە چی لێهات؟ ئایا گەیاندتە لای دایکت؟ گوتم: نەخێر، دەڵێ: ئیتر ناوی لێنام ستەمکار یان فێڵباز.

**٣٣٦٩- عَنْ طَلْحَةَ ﷺ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَبِيَدِهِ سَفَرْجَلَةٌ فَقَالَ: «دُونَكَهَا، يَا طَلْحَةُ، فَإِنَّهَا تُجِمُّ الْفُؤَادَ»**[2].

واتە: تەڵحە ﷺ دەڵێ: چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە لەوکاتەدا بەهێیەکی بە دەستەوە بوو، ئنجا فەرمووی: وەریگرە ئەی تەڵحە چونکە بەهێ ئاسودەیی بە ناخ و دەروون دەدات.

**بەهێ:** میوەیەکی زەردی بۆنخۆشە، لە شێوەی هەرمێدایە.

## بابەت: نەهی کردن لە خواردن لەسەر دەم (لەسەر زگ)

**٣٣٧٠- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنْ يَأْكُلَ الرَّجُلُ، وَهُوَ مُنْبَطِحٌ عَلَى وَجْهِهِ»**[3].

واتە: سالیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە کە مرۆڤ لەسەر دەم ڕاکشێ و شت بخوات.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٧٧٤ و ٣٧٧٥.

## بابەت: ئەوەی کە عارەق کلیلی هەموو خراپەیەکە

٣٣٧١- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ: «لَا تَشْرَبِ الْخَمْرَ، فَإِنَّهَا مِفْتَاحُ كُلِّ شَرٍّ»[١].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: خۆشەویستەکەم ﷺ وەسیەتی بۆ کردم: شەڕاب و سەرخۆشکەرەکان مەخۆرەوە، چونکە ئەوانە کلیلی دەرگای هەموو خراپەیەکن.

٣٣٧٢- عَنْ خَبَّابَ بْنَ الْأَرَتِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِيَّاكَ وَالْخَمْرَ، فَإِنَّ خَطِيئَتَهَا تَفْرَعُ الْخَطَايَا، كَمَا أَنَّ شَجَرَتَهَا، تَفْرَعُ الشَّجَرَ»[٢].

واتە: خەبابی کوڕی ئەڕەت ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆت بپارێزە لە عارەق خواردنەوە، چونکە بێگومان تاوانەکەی لە سەرووی هەموو تاوانەکانەوەیە، یان تاوانی دیکەشی بەسەردا دێ، هەروەکو چۆن دارەکەی (مێو) درێژ دەبێتەوە بۆ سەر دارو دڕک و دایان دەپۆشێ.

## بابەت: هەرکەس لە دونیا عارەق بخواتەوە، ئەوە لە قیامەت خواردنەوە پاکەکە ناخواتەوە

٣٣٧٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا، لَمْ يَشْرَبْهَا فِي الْآخِرَةِ، إِلَّا أَنْ يَتُوبَ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لەو دونیایەدا عارەق و سەرخۆشکەرەکان بخواتەوە، ئەوە لە قیامەتدا (خواردنەوە پاکەکان) ناخواتەوە، مەگەر تۆبە بکات و پەشیمان بێتەوە (پێش مردن).

٣٣٧٤- عَنْ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا، لَمْ يَشْرَبْهَا فِي الْآخِرَةِ»[٤].

---

(١) حسن لغيره.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٧٥ مختصراً، ومسلم: ٢٠٠٣، وأبو داود: ١٨٦١، والنسائي: ٥٦٧١ و ٥٦٧٣ و ٥٦٧٤.

(٤) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەبەردەوامی سەرخۆشکەرەکان لە دونیادا بخواتەوە، ئەوە لە قیامەتدا (لێیان بێ بەشەو) لێیان ناخواتەوە.

## بابەت: ئالوودەی شەڕاب خواردنەوە

**٣٣٧٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مُدْمِنُ الْخَمْرِ، كَعَابِدِ وَثَنٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی ئالوودەی شەڕاب بووبێ، وەکو ئەو کەسە وایە کە بت بپەرستێ.

**٣٣٧٦-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مُدْمِنُ خَمْرٍ»[٢].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی ئالوودەی شەڕاب خواردنەوە بووە، ناچێتە بەهەشتەوە.

## بابەت: هەر کەس شەڕاب بخواتەوە نوێژی وەرناگیرێ

**٣٣٧٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ وَسَكِرَ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، وَإِنْ مَاتَ دَخَلَ النَّارَ، فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ، وَإِنْ عَادَ، فَشَرِبَ، فَسَكِرَ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، فَإِنْ مَاتَ دَخَلَ النَّارَ، فَإِنْ تَابَ، تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ، وَإِنْ عَادَ، فَشَرِبَ، فَسَكِرَ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، فَإِنْ مَاتَ دَخَلَ النَّارَ، فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ، وَإِنْ عَادَ، كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ، أَنْ يَسْقِيَهُ مِنْ رَدَغَةِ الْخَبَالِ، يَوْمَ الْقِيَامَةِ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا رَدَغَةُ الْخَبَالِ؟ قَالَ: «عُصَارَةُ أَهْلِ النَّارِ»[٣].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٥٦٦٤.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شەڕاب بخواتەوەو سەرخۆش بێ ئەوە چل ڕۆژ نوێژی گیرا نابێ، وە ئەگەر مرد دەچێتە دۆزەخ، جا ئەگەر تەوبەی کرد خوا تەوبەی وەردەگرێ، وە ئەگەر گەڕایەوە سەر خواردنەوەو سەرخۆش بوو ئەوە چل ڕۆژ نوێژی وەرناگیرێ و ئەگەر بمرێ دەچێتە ناو ئاگر، جا ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە خوا تەوبەی وەردەگرێ، وە ئەگەر گەڕایەوەو خواردیەوەو سەرخۆش بوو ئەوە چل ڕۆژ نوێژەکانی وەرناگیرێ و ئەگەر مرد ئەوە دەچێتە ناو ئاگر، خۆ ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە خوا تەوبەکەی لێ وەردەگرێ، وە ئەگەر (بۆ جاری چوارەم) گەڕایەوە (خواردیەوەو سەرخۆش بوو) ئەوە هەقی خۆیەتی کە خوا لە قیامەتدا لە جۆگەلەی کێم و زوخاوی خەڵکی جەهەنەم خواردنەوەی پێبدات، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ «ردغة الخبال» چییە؟ فەرمووی: کێم و زوخاوی خەڵکی ناو ئاگرە.

## بابەت: ئەو شتەی شەڕابی لێ دروست دەکرێ

**٣٣٧٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْخَمْرُ مِنْ هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ: النَّخْلَةِ، وَالْعِنَبَةِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەڕاب لە (بەرهەمی) ئەو دوو دارە دروست دەکرێن: خورماو ترێ.

**٣٣٧٩-** عَنِ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ رضي الله عنهما، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنَ الْحِنْطَةِ خَمْرًا، وَمِنَ الشَّعِيرِ خَمْرًا، وَمِنَ الزَّبِيبِ خَمْرًا، وَمِنَ التَّمْرِ خَمْرًا، وَمِنَ الْعَسَلِ خَمْرًا»[2].

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە گەنم شەڕاب دروست دەکرێ، وە لە جۆ شەڕاب دروست دەکرێ، وە لە مێوژ (بەرهەمی ترێ) شەڕاب دروست دەکرێ، وە لە خورماش شەڕاب دروست دەکرێ، وە لە هەنگوینیش شەڕاب دروست دەکرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٨٥، وأبو داود: ٣٦٧٨، والترمذي: ١٨٧٥، والنسائي: ٥٥٧٢ و ٥٥٧٣.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٦٧٦ و ٣٦٧٧، والترمذي: ١٨٧٢.

## بابەت: شەڕاب دەبێتە هۆکار بۆ نەفرەت کردن لە دە ڕووەوە

**٣٣٨٠-** عَنِ ابْنَ عُمَرَ ﵄، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لُعِنَتِ الْخَمْرُ عَلَى عَشَرَةِ أَوْجُهٍ: بِعَيْنِهَا، وَعَاصِرِهَا، وَمُعْتَصِرِهَا، وَبَائِعِهَا، وَمُبْتَاعِهَا، وَحَامِلِهَا، وَالْمَحْمُولَةِ إِلَيْهِ، وَآكِلِ ثَمَنِهَا، وَشَارِبِهَا، وَسَاقِيهَا»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەفرەت لە شەڕاب کراوە لە دە ڕووەوە: لە خودی خۆی، لە ئەو کەسەی ترێیەکە دەگوشێ، ئەوەشی داوای دەکات بۆ خۆی یان غەیری خۆی تا بۆی دروست بکرێ، ئەوەی دەیفرۆشێ، ئەوەی دەیکڕێ، ئەوەی دەیگوازێتەوە، ئەوەی بۆی دەگوازرێتەوە، ئەوەی پارەکەی دەخوات، ئەوەی دەیخواتەوە، ئەوەشی دەیگێڕێ.

**٣٣٨١-** عَنْ أَنَسٍ ﵁، قَالَ: «لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْخَمْرِ عَشَرَةً: عَاصِرَهَا، وَمُعْتَصِرَهَا، وَالْمَعْصُورَةَ لَهُ، وَحَامِلَهَا، وَالْمَحْمُولَةَ لَهُ، وَبَائِعَهَا، وَالْمَبْيُوعَةَ لَهُ، وَسَاقِيَهَا، وَالْمُسْتَقَاةَ لَهُ، حَتَّى عَدَّ عَشَرَةً، مِنْ هَذَا الضَّرْبِ»[٢].

واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی لە شەڕاب کردوە لە دە ڕووەوە: ئەوەی دروستی دەکات، ئەوەشی داوای دەکات بۆ خۆی یان غەیری خۆی تا بۆی دروست بکرێ، ئەوەی بۆی دروست دەکرێ، ئەوەی دەیگوازێتەوە، ئەوەی بۆی دەگوازرێتەوە، ئەوەی دەیفرۆشێ و ئەوەی دەیکڕێ، ئەوەی دەیگێڕێ، ئەوەشی کە بۆی دەگێڕن، هەتا دە جۆری لەو شێوەیەی بژارد.

## بابەت: بازرگانی کردن بە شەڕاب

**٣٣٨٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتِ الْآيَاتُ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي الرِّبَا، خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَحَرَّمَ التِّجَارَةَ فِي الْخَمْرِ»[٣].

---

(١) صحيح بطرقه. أخرجه أبو داود: ٣٦٧٤.

(٢) حسن. أخرجه البخاريالترمذي: ١٢٩٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٩، ومسلم: ١٥٨٠، وأبو داود: ٣٤٩٠ و ٣٤٩١، والنسائي: ٤٦٦٥.

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: كاتێک ئایەتەكانی كۆتایی سوورەتی بەقەرە لەسەر ڕیبا دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرێ و بازرگانی كردنی بە شەڕاب قەدەغەكرد.

**٣٣٨٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: بَلَغَ عُمَرَ أَنَّ سَمُرَةَ بَاعَ خَمْرًا، فَقَالَ: قَاتَلَ اللَّهُ سَمُرَةَ أَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَعَنَ اللَّهُ الْيَهُودَ، حُرِّمَتْ عَلَيْهِمُ الشُّحُومُ، فَجَمَلُوهَا، فَبَاعُوهَا»[١].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: هەواڵ بە عومەر گەیشت كە سەمورە شەڕابی فرۆشتووە، ئەویش گوتی: خوا سەمورە بكوژێ، نازانێ كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا نەفرەتی كرد لە جوولەكە كاتێک بەزی لێ حەرام كردن ئەوان هاتن تواندیانەوەو ڕۆنەكەیان لێگرت و فرۆشتیان (فێڵیان لە حەڕامكراوەكەدا كردوە).

## بابەت: ئەوەی كە ناوی عارەق دەگۆڕن تاكو حوكمەكەی بگۆڕن

**٣٣٨٤- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَذْهَبُ اللَّيَالِي وَالْأَيَّامُ، حَتَّى تَشْرَبَ فِيهَا، طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ، يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا»[٢].**

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەوو ڕۆژ كۆتاییان پێ نایەت هەتاكو تاقمێک لە ئوممەتی من شەڕاب دەخۆنەوەو ناوێكی دیكەی لێ دەنێن.

**٣٣٨٥- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَشْرَبُ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ، بِاسْمٍ يُسَمُّونَهَا إِيَّاهُ»[٣].**

واتە: عوبادەی كوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵكانێک لە ئوممەتەكەم شەڕاب دەخۆنەوە بە ناوێكی دیكەوە ناوی لێ دەنێن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٢٣، ومسلم: ١٥٨٢، والنسائي: ٤٢٥٧.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح.

## بابەت: هەموو سەرخۆشکەرێک حەرامە

**٣٣٨٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، تَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ، فَهُوَ حَرَامٌ»[١].

**واتە: عائیشە ﵂ پێی گەیشتوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: هەر خواردنەوەیەک کە مرۆڤ سەرخۆش بکات حەرام و قەدەغەیە.**

**٣٣٨٧-** عَنْ سَالِمَ بْن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ مُسْكِرٍ، حَرَامٌ»[٢].

**واتە: سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لە باوکییەوە ﵄ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک حەرامە.**

**٣٣٨٨-** عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُّ مُسْكِرٍ، حَرَامٌ»[٣].

**واتە: ئیبنو مەسعود ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک حەرامە.**

**٣٣٨٩-** عَنْ مُعَاوِيَةَ ﵁ سَمِعْتُ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّ مُسْكِرٍ، حَرَامٌ عَلَى كُلِّ مُؤْمِنٍ» وَهَذَا حَدِيثُ الرَّقِّيِّينَ[٤].

**واتە: موعاویە ﵁ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەموو سەرخۆشکەرێک لەسەر هەموو بڕوادارێک حەرامە.**

**٣٣٩٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ، وَكُلُّ خَمْرٍ حَرَامٌ»[٥].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٢، ومسلم: ٢٠٠١، وأبو داود: ٣٦٨٢، والترمذي: ١٨٦٣، والنسائي: ٥٥٩٠_٥٥٩٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٠٣، وأبو داود: ٣٦٧٩، والترمذي: ١٨٦٤، والنسائي: ٥٥٨٢ و ٥٥٨٣ و ٥٥٨٥ و ٥٥٨٦ و ٥٦٠٥ و ٥٦٩٩ و ٥٧٠٠.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) ضعيف.

(٥) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٠٣، وأبو داود: ٣٦٧٩، والترمذي: ١٨٦٤، والنسائي: ٥٥٨٢ و ٥٥٨٣ و ٥٥٨٥ و ٥٥٨٦ و ٥٦٠٥ و ٥٦٩٩ و ٥٧٠٠.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺدەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺفەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک شەڕابە، وە هەموو شەڕابێک حەرامە.

**٣٣٩١-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»(١).

واتە: ئەبو موسا ﷺدەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺفەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک حەرامە.

## بابەت: ئەوەی هەر شتێ زۆرەکەی سەرخۆشکەر بێ کەمەکەشی حەرامە

**٣٣٩٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، وَمَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ»(٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێک حەڕامە، وە ئەوەی کە زۆرەکەی مرۆڤ سەرخۆش بکات ئەوە کەمەکەشی حەرامە.

**٣٣٩٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ»(٣).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی کە زۆرەکەی مرۆڤ سەرخۆش بکات کەمەکەشی حەرامە.

**٣٣٩٤-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣٤٣، ومسلم بإثر: ٢٠٠١، وأبو داود: ٣٦٨٤ مطولًا، والنسائي: ٥٥٩٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٠٣، وأبو داود: ٣٦٧٩، والترمذي: ١٨٦٤، والنسائي: ٥٥٨٢ و ٥٥٨٣ و ٥٥٨٥ و ٥٥٨٦ و ٥٦٠٥ و ٥٦٩٩ و ٥٧٠٠.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٦٨١، والترمذي: ١٨٦٥.

(٤) صحيح لغيره. أخرجه النسائي: ٥٦٠٧.

واتە: عەمری کوڕی شوعەیبە لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی کە زۆرەکەی مرۆڤ سەرخۆش بکات، ئەوە کەمەکەشی حەرام و قەدەغەیە.

## بابەت: نەهیکردن لە تێکەڵکردنی دوو مادده

**٣٣٩٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «نَهَى أَنْ يُنْبَذَ التَّمْرُ، وَالزَّبِيبُ جَمِيعًا، وَنَهَى أَنْ يُنْبَذَ الْبُسْرُ، وَالرُّطَبُ جَمِيعًا»**[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی کە خۆشاوی خورماو ترێ پێکەوە تێکەڵ بکرێن، وە نەهیشی کردوە خۆشاوی فەریکە خورما لەگەڵ خورمای پێگەیشتوو تێکەڵ بکرێن.

**٣٣٩٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَنْبِذُوا التَّمْرَ وَالْبُسْرَ جَمِيعًا، وَانْبِذُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى حِدَتِهِ»**[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشاوی خورمای وشک و فەریکە خورما بەیەکەوە تێکەڵ مەکەن، هەریەکەیان بەجیا بکەنە خۆشاو.

**٣٣٩٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا تَجْمَعُوا بَيْنَ الرُّطَبِ، وَالزَّهْوِ، وَلَا بَيْنَ الزَّبِيبِ، وَالتَّمْرِ، وَانْبِذُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى حِدَتِهِ»**[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: خورمای تەڕو پێگەیشتوو لەگەڵ خورمای کاڵ تێکەڵ مەکەن، وە مێوژو خورماش پێکەوە تێکەڵ مەکەن، هەریەکەیان بەجیا بکەن بە خۆشاو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٠١، ومسلم: ١٩٨٦، وأبو داود: ٣٧٠٣، والترمذي: ١٨٧٦، والنسائي: ٥٥٥٦ و ٥٥٦٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٨٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٠٢، ومسلم: ١٩٨٨، وأبو داود: ٣٧٠٤، والنسائي: ٥٥٥١ و ٥٥٦١ و ٥٥٦٦ و ٥٥٦٧.

## بابەت: سیفەتی خۆشاوو خواردنەوەکەی

٣٣٩٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كُنَّا نَنْبِذُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فِي سِقَاءٍ، فَنَأْخُذُ قَبْضَةً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ قَبْضَةً مِنْ زَبِيبٍ، فَنَطْرَحُهَا فِيهِ، ثُمَّ نَصُبُّ عَلَيْهِ الْمَاءَ، فَنَنْبِذُهُ غُدْوَةً، فَيَشْرَبُهُ عَشِيَّةً، وَنَنْبِذُهُ عَشِيَّةً، فَيَشْرَبُهُ غُدْوَةً» وَقَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: نَهَارًا، فَيَشْرَبُهُ لَيْلًا، أَوْ لَيْلًا، فَيَشْرَبُهُ نَهَارًا[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئێمە لە کوندەیەکدا خۆشاومان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە دەکرد، جا چەنگێک خورما یان مێوژمان هەڵدەگرت و دەمانکردە ناوی، پاشان ئاومان بەسەردا دەکرد، جا بەیانیان خۆشاومان بۆ ئامادە دەکرد ئێوارە دەیخواردەوەو، شەو بۆمان ئامادە دەکرد بەیانی دەیخواردەوە. وە ئەبو موعاویە گوتی: هی ڕۆژانەی بە شەو دەخواردەوە، یان هی شەوی بە ڕۆژ دەخواردەوە.

٣٣٩٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: «كَانَ يُنْبَذُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَيَشْرَبُهُ يَوْمَهُ ذَلِكَ، وَالْغَدَ، وَالْيَوْمَ الثَّالِثَ، فَإِنْ بَقِيَ مِنْهُ شَيْءٌ، أَهْرَاقَهُ، أَوْ أَمَرَ بِهِ، فَأُهْرِيقَ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: خۆشاویان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە دەکرد، جا ئەو ڕۆژە لێی دەخواردەوەو بۆ ڕۆژی دووەم و سێیەمیش، جا ئەگەر زیاتر مابایەوە ئەوە دەیڕشت، یان فەرمانی دەکرد بیڕێژن.

٣٤٠٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، قَالَ: «كَانَ يُنْبَذُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي تَوْرٍ مِنْ حِجَارَةٍ»[٣].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: خۆشاویان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دروست دەکرد لە دەفرێکی بەردیندا (واتە: دەفرەکە لە بەرد دروستکرابوو).

## بابەت: قەدەغەکردنی خۆشاو هەڵگرتن لە هەندێ دەفردا

٣٤٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنْ يُنْبَذَ فِي النَّقِيرِ، وَالْمُزَفَّتِ، وَالدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمَةِ» وَقَالَ: «كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٠٥، وأبو داود: ٣٧١١، والترمذي: ١٨٧١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٠٤، وأبو داود: ٣٧١٣، والنسائي: ٥٧٣٧_٥٧٣٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٩٩، وأبو داود: ٣٧٠٢، والنسائي: ٥٦١٣ و ٥٦٤٧.

(٤) صحيح لغيره. انظر مسلم: ١٩٩٣.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە خۆشاو بکرێتە ناو دەفرێک کە لە دار هەڵکۆڵرابێ، وە دەفرێک کە بە زەفت ڕوپۆش کرابێ، وە (نەهی کردوە بکرێتە ناو) کولەکەو کوپەڵە، وە فەرمووی: هەموو سەرخۆشکەرێک حەرامە.

**٣٤٠٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُنْبَذَ فِي الْمُزَفَّتِ وَالْقَرْعِ»[١].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە کە خۆشاو بکرێتە ناو دەفرێک کە بە زەفت ڕووکەش کرابێ، وە (نەهی کردوە بکرێتە) ناو کولەکە.

**٣٤٠٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الشُّرْبِ فِي الْحَنْتَمِ، وَالدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ»[٢].**

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی کە لە دەفری کوپەڵەو، کولەکەو، داری کۆڵراودا خۆشاو بخورێتەوە.

**٣٤٠٤- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَعْمَرَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدُّبَّاءِ وَالْحَنْتَمِ»[٣].**

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەعمەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە کولەکەو گوزەی چەورکراودا خۆشاو هەڵبگیرێ.

## بابەت: ڕێگەپێدان بەو دەفرانەی باسکران

**٣٤٠٥- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنِ الْأَوْعِيَةِ، فَانْتَبِذُوا فِيهِ، وَاجْتَنِبُوا كُلَّ مُسْكِرٍ»[٤].**

واتە: ئیبنو بوڕەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەربارەی دەفرەکان نەهیم لێ کردبوون، ئیتر خۆشاویان تێبکەن و، خۆتان بپارێزن لە هەموو سەرخۆشکەرێک.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٩٧/٥٧، وأبو داود: ٣٦٩٠، والترمذي: ١٨٦٨، والنسائي: ٥٦٣١ و ٥٦٣٤ و ٥٦٤٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٩٦/٤٥، والنسائي: ٥٦٣٣.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٥٦٢٨.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٧/٦٣، وأبو داود: ٣٦٩٨، والترمذي: ١٨٦٩، والنسائي: ٢٠٣٣.

**٣٤٠٦- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ نَبِيذِ الْأَوْعِيَةِ، أَلَا وَإِنَّ وِعَاءً لَا يُحَرِّمُ شَيْئًا، كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ»[١].**

واتە: ئیبنو مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لێتانم قەدەغە کردبوو کە خۆشاو لە دەفرەکان بکەن، ئاگادارین دەفرەکان هیچ شتێک حەرام ناکەن، هەموو سەرخۆشکەرێک حەرامە.

## بابەت: خۆشاوی گۆزە

**٣٤٠٧- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: أَتَعْجِزُ إِحْدَاكُنَّ أَنْ تَتَّخِذَ كُلَّ عَامٍ مِنْ جِلْدِ أُضْحِيَّتِهَا سِقَاءً؟ ثُمَّ قَالَتْ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُنْبَذَ فِي الْجَرِّ وَفِي كَذَا، وَفِي كَذَا، إِلَّا الْخَلَّ»[٢].**

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: ئایا هەر یەکێک لە ئێوە لە توانایدا نیە کە هەموو ساڵێک پێستەی ئەو ئاژەڵەی کە دەیکاتە قوربانی بکاتە کوندە؟ پاشان گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کەوا خۆشاو بکرێتە ناو گۆزەوە یان بکرێتە ناو ئەوەو ئەوەوە، تەنها سرکە نەبێ.

**٣٤٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُنْبَذَ فِي الْجِرَارِ»[٣].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە خۆشاو بکرێتە ناو گۆزەوە.

**٣٤٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِنَبِيذِ جَرٍّ يَنِشُّ فَقَالَ: «اضْرِبْ بِهَذَا الْحَائِطَ، فَإِنَّ هَذَا شَرَابُ مَنْ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ»[٤].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە گۆزەیەکدا خۆشاویان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ (خۆشاوەکە) کوڵی دەدا، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: بیدە بەو دیوارەدا، چونکە بێگومان ئەوە خواردنەوەی کەسێکە کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) حسن. أخرجه مسلم: ١٩٩٣ بنحوه، والنسائي: ٥٦٣٥.

(٤) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٧١٦، والنسائي: ٥٦١٠ و ٥٧٠٤.

## بابەت: داپۆشینی دەفرو قاپەکان

**٣٤١٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «غَطُّوا الْإِنَاءَ، وَأَوْكُوا السِّقَاءَ، وَأَطْفِئُوا السِّرَاجَ، وَأَغْلِقُوا الْبَابَ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَحُلُّ سِقَاءً، وَلَا يَفْتَحُ بَابًا، وَلَا يَكْشِفُ إِنَاءً، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلَّا أَنْ يَعْرُضَ عَلَى إِنَائِهِ عُودًا، وَيَذْكُرَ اسْمَ اللَّهِ، فَلْيَفْعَلْ، فَإِنَّ الْفُوَيْسِقَةَ تُضْرِمُ عَلَى أَهْلِ الْبَيْتِ بَيْتَهُمْ»(١).

**واتە:** جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەفرو قاپەکان داپۆشن، کوندەو مەشکەکانتان سەر ببەستن، چراکان بکوژێننەوە، دەرگاکان دابخەن، چونکە بەڕاستی شەیتان سەری کوندەو مەشکە ناکاتەوە، وە دەرگا ناکاتەوە (کە داخراو بێ)، وە سەری دەفرو قاپ لانادات، جا ئەگەر تەنها دارێکت دەسکەوت کە بەسەر قاپەکەت یان دەفرەکەتی ڕابێڵی بۆ سەر داپۆشین ئەوە ئەوە بکەو ناوی خوای بەسەردا بخوێنە، چونکە بێگومان ئەو جرو جانەوەرانەی لە کونەکانیان دێنە دەرەوە (وەکو مشک و جرج) ئەوانە ئاگر بەر دەدەنە ماڵ و خانوی خەڵک (بۆیە شەوانە کاتی خەوتن چرا بکوژێنرێتەوە باشترە).

**٣٤١١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بِتَغْطِيَةِ الْإِنَاءِ، وَإِيكَاءِ السِّقَاءِ، وَإِكْفَاءِ الْإِنَاءِ»(٢).

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووین سەری قاپ و دەفرەکانمان داپۆشین و زاری کوندەکان ببەستین، قاپەکان (ئەگەر بەتاڵ بوون) سەرەوبنیان بکەین.

**٣٤١٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «كُنْتُ أَصْنَعُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثَةَ آنِيَةٍ مِنَ اللَّيْلِ مُخَمَّرَةً: إِنَاءً لِطَهُورِهِ، وَإِنَاءً لِسِوَاكِهِ، وَإِنَاءً لِشَرَابِهِ»(٣).

---

(١) صحيح مرفوع. أخرجه البخاري: ٣٢٨٠ و ٣٣١٦، ومسلم: ٢٠١٢ و ٢٠١٣، وأبو داود: ٣٧٣١ و ٣٧٣٣، والترمذي: ١٨١٢ و ٢٨٥٧.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف.

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: من سێ قاپم لە شەودا ئامادە دەکرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺو سەرم دادەپۆشی، قاپێک بۆ دەستنوێژەکەی، قاپێکیان بۆ سیواکەکەی، وە قاپێکیشیان بۆ خواردنەوەی.

## بابەت: خواردنەوە بە دەفری زیو

**٣٤١٣- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الَّذِي يَشْرَبُ فِي إِنَاءِ الْفِضَّةِ، إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ، نَارَ جَهَنَّمَ»[١].**

**واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە دەفری زیودا ئاو (یان هەر شتێکی تر) دەخواتەوە، ئەوە بێگومان ئاگری دۆزەخ خوڕە خوڕ دەکات لە ناو گەدەیدا.**

**٣٤١٤- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الشُّرْبِ فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَقَالَ: «هِيَ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَهِيَ لَكُمْ فِي الْآخِرَةِ»[٢].**

**واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی کە بە دەفری زێڕو زیو بخورێتەوە، فەرموویەتی: خواردنەوە بە زێڕو زیو لە دونیادا بۆ کافرەکانەو لە قیامەتیشدا بۆ ئێوەیە.**

**٣٤١٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ شَرِبَ فِي إِنَاءِ فِضَّةٍ، فَكَأَنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ، نَارَ جَهَنَّمَ»[٣].**

**واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە دەفری زیو بخواتەوە، ئەوە وەکو ئەوە وایە خوڕە خوڕی ئاگری دۆزەخ بچێتە ناو گەدەیەوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٣٤، ومسلم: ٢٠٦٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٢٦، ومسلم: ٢٠٦٧، وأبو داود: ٣٧٢٣، والترمذي: ١٨٧٨، والنسائي: ٥٣٠١.

(٣) صحيح.

## بابەت: خواردنەوە بە سێ نەفەس (بە سێ جار)

**٣٤١٦-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ: يَتَنَفَّسُ فِي الْإِنَاءِ ثَلَاثًا، وَزَعَمَ أَنَسٌ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ «يَتَنَفَّسُ فِي الْإِنَاءِ ثَلَاثًا»[١].

**واتە: لە ئەنەس ﷺ گێڕدراوەتەوە، قاپێک ئاوی بە سێ نەفەس دەخواردەوە، وە ئەنەس پێشی وابوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە سێ نەفەس قاپێک ئاوی دەخواردەوە.**

**٣٤١٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «شَرِبَ، فَتَنَفَّسَ فِيهِ مَرَّتَيْنِ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئاوی خواردەوەو دووجار هەناسەیدا (بە دوو نەفەس خواردیەوە).**

## بابەت: هەڵگێڕانەوەو لارکردنەوەی دەمی کوندە

**٣٤١٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ اخْتِنَاثِ الْأَسْقِيَةِ: أَنْ يُشْرَبَ مِنْ أَفْوَاهِهَا»[٣].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە هەڵگێڕانەوەی دەمی کوندەو مەشکە، بۆ ئەوەی کە لە دەمەکەیەوە لێی بخورێتەوە (هەڵگێڕانەوەی دەمەکەی بۆ ئەوەیە لەوێوە لێی بخورێتەوە، ئەوەش قەدەغە کراوە).**

**٣٤١٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ اخْتِنَاثِ الْأَسْقِيَةِ وَإِنَّ رَجُلًا بَعْدَ مَا نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، قَامَ مِنَ اللَّيْلِ إِلَى سِقَاءٍ، فَاخْتَنَثَهُ، فَخَرَجَتْ عَلَيْهِ مِنْهُ حَيَّةٌ»[٤].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە هەڵگێڕانەوەی دەمی کوندەو مەشکە، جا پیاوێک دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردبوو لەو هەڵگێڕانەوەیە، شەو هەڵسابوو، چووبوو دەمی کوندەکەی هەڵگێڕابووەوە، یەکسەر مارێکی لێ هاتبووە دەرەوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٣١، ومسلم: ٢٠٢٨، وأبو داود: ٣٧٢٧، والترمذي: ١٨٨٤.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٨٨٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٢٥، ومسلم: ٢٠٢٣، وأبو داود: ٣٧٢٠، والترمذي: ١٨٩٠.

(٤) ضعيف.

## بابەت: خواردنەوە لە دەمی کوندەوە

**٣٤٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الشُّرْبِ مِنْ فِي السِّقَاءِ»[1].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کەوا ئاو لە دەمی کوندەوە بخورێتەوە (واتە: دەم بنێی بە دەمی کوندەوە بۆ ئاو خواردنەوە).

**٣٤٢١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «نَهَى أَنْ يُشْرَبَ مِنْ فَمِ السِّقَاءِ»[2].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە دەمی کوندەوە ڕاستەوخۆ ئاو بخورێتەوە.

## بابەت: خواردنەوە بە پێوە

**٣٤٢٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «سَقَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ مِنْ زَمْزَمَ، فَشَرِبَ قَائِمًا» فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعِكْرِمَةَ فَحَلَفَ بِاللَّهِ، مَا فَعَلَ[3].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: لە ئاوی زەمزەمم دا بە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش بە پێوە خواردیەوە، ڕاوی دەڵێ: ئەوەم بۆ عیکریمە گێڕایەوە، ئەویش سوێندی خوارد کە وای نەکردوە!!

**تێبینی:** نەبینین و نەزانینی عیکڕیمە تەنها نەبوونی زانیارییەتی بەو کارەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەگەرنا جگە لەم ڕێگەیە، لە چەندان ڕێگەی دیکەش هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێوە بە ڕاوەستاوی ئاوی خواردۆتەوە.

**٣٤٢٣- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ، عَنْ جَدَّةٍ لَهُ يُقَالُ لَهَا كَبْشَةُ الْأَنْصَارِيَّةُ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «دَخَلَ عَلَيْهَا، وَعِنْدَهَا قِرْبَةٌ مُعَلَّقَةٌ، فَشَرِبَ مِنْهَا وَهُوَ قَائِمٌ، فَقَطَعَتْ فَمَ الْقِرْبَةِ تَبْتَغِي بَرَكَةَ مَوْضِعِ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[4].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٢٧ و ٥٦٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٢٩، وأبو داود: ٢٧١٩، والترمذي: ١٨٢٥، والنسائي: ٤٤٤٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٣٧، ومسلم: ٢٠٢٧، والترمذي: ١٨٨٢، والنسائي: ٢٩٦٤ و ٢٩٦٥.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٨٩٢.

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو عەمرە لە نەنکێکیەوە کە پێی دەگوترا: کەبشەی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کردوە، ئەویش کوندەیەکی لەلا بووە کە هەڵواسراو بووە، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) بەپێوە لە کوندەکەی خواردەوە، ئەویش شوێن دەمی پێغەمبەری خوای ﷺ لە کوندەکە بڕی بۆ بەرەکەت (هەڵیگرت).

٣٤٢٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «نَهَى عَنِ الشُّرْبِ قَائِمًا»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە خواردنەوەی بەپێوە.

## بابەت: دەستپێکردن لەلای ڕاستەوە بۆ ئاو خواردنەوە

٣٤٢٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِلَبَنٍ قَدْ شِيبَ بِمَاءٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ أَعْرَابِيٌّ، وَعَنْ يَسَارِهِ أَبُو بَكْرٍ، فَشَرِبَ ثُمَّ أَعْطَى الْأَعْرَابِيَّ، وَقَالَ: «الْأَيْمَنَ، فَالْأَيْمَنُ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، شیر هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئاوی لەگەڵ تێکەڵ کرابوو، وە لای ڕاستی پێغەمبەر ﷺ دەشتەکییەک بوو لای چەپیشی ئەبو بەکر بوو، (پێغەمبەر ﷺ) لە شیرەکەی خواردەوە، پاشان دای بە دەشتەکییەکەو فەرمووی: لە ڕاستەوە بۆ ڕاست (واتە: لەلای ڕاستەوە دەستی پێکرد).

٣٤٢٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِلَبَنٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ ابْنُ عَبَّاسٍ، وَعَنْ يَسَارِهِ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِابْنِ عَبَّاسٍ: «أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أَسْقِيَ خَالِدًا» قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَا أُحِبُّ أَنْ أُوثِرَ بِسُؤْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى نَفْسِي أَحَدًا، فَأَخَذَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَشَرِبَ وَشَرِبَ خَالِدٌ[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٢٤، وأبو داود: ٣٧١٧، والترمذي: ١٨٧٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٥٢، ومسلم: ٢٠٢٩، وأبو داود: ٣٧٢٦، والترمذي: ١٨٩٣.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٧٣٠، والترمذي: ٣٤٥٥.

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: شیر هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش لەلای ڕاستی پێغەمبەر ﷺ بوو خالیدی کوڕی وەلیدیش لەلای چەپی، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئیبنو عەبباسی فەرموو: مۆڵەت دەدەی (پێش تۆ کە لەلای ڕاستی) شیرەکە بدەمە خالید؟ ئیبنو عەبباسیش گوتی: حەزناکەم هیچ کەسێک بۆ بەرماوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێش خۆم بخەم، ئنجا ئیبنو عەبباس وەریگرت و لێی خواردەوەو خالیدیش لێی خواردەوە.

## بابەت: هەناسەدان لە ناو دەفردا

٣٤٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ، فَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَاءِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَعُودَ، فَلْيُنَحِّ الْإِنَاءَ، ثُمَّ لِيَعُدْ إِنْ كَانَ يُرِيدُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان شتێکی خواردەوە، ئەوە با لەناو قاپەکەدا هەناسە نەدات، ئەگەر ویستی دوای هەناسەدان زیاتر بخواتەوە، با قاپەکە لابدات و هەناسە بدات، ئنجا ئەگەر ویستی با بگەڕێتەوە سەر خواردنەوەی ناو قاپەکە.

٣٤٢٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ التَّنَفُّسِ فِي الْإِنَاءِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە هەناسەدان لە ناو قاپ و دەفرو پەرداخدا.

## بابەت: فووکردن لە خواردنەوە

٣٤٢٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُنْفَخَ فِي الْإِنَاءِ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی کە فوو بکرێتە (شتی) ناو دەفر.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٧٢٨، والترمذي: ١٨٨٨.

(٣) صحيح.




٣٤٣٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: «لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْفُخُ فِي الشَّرَابِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ فووی لە خواردنەوە نەکردوە.

## بابەت: ئاو خواردنەوە بە لوێچ و دەم نان بە جۆگاو ڕووبارەوە

٣٤٣١- عَنْ عَاصِمِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﵁، قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَشْرَبَ عَلَى بُطُونِنَا، وَهُوَ الْكَرْعُ، وَنَهَانَا أَنْ نَغْتَرِفَ بِالْيَدِ الْوَاحِدَةِ، وَقَالَ: «لَا يَلَغْ أَحَدُكُمْ، كَمَا يَلَغُ الْكَلْبُ، وَلَا يَشْرَبْ بِالْيَدِ الْوَاحِدَةِ، كَمَا يَشْرَبُ الْقَوْمُ الَّذِينَ سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ، وَلَا يَشْرَبْ بِاللَّيْلِ مِنْ إِنَاءٍ، حَتَّى يُحَرِّكَهُ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ إِنَاءً مُخَمَّرًا، وَمَنْ شَرِبَ بِيَدِهِ وَهُوَ يَقْدِرُ عَلَى إِنَاءٍ، يُرِيدُ التَّوَاضُعَ، كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِعَدَدِ أَصَابِعِهِ حَسَنَاتٍ، وَهُوَ إِنَاءُ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِمَا السَّلَامُ، إِذْ طَرَحَ الْقَدَحَ، فَقَالَ: أُفٍّ هَذَا مَعَ الدُّنْيَا»[٢].

واتە: عاصیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی زەیدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لێی قەدەغە کردووین کەوا لەسەر سک ئاو بخۆینەوەو لێی قەدەغە کردووین کەوا بە یەک لوێچ لێی هەڵگۆزین، وە فەرموویەتی: با هیچ یەکێکتان بە شێوازی سەگ ئاو نەخواتەوەو بە دەستێکیشی ئاو نەخواتەوە وەکو ئەو گەلەی کە خوا لێیان تووڕە بوو غەزەبی خۆی بەسەردا دان، وە با بە شەو ئاو نەخواتەوە لە دەفرێکدا هەتا نەیجوڵێنێ مەگەر دەفرەکە سەری داپۆشراو بووبێ، وە هەر کەسێک ئاو بە دەست بخواتەوە لە کاتێکدا دەفریشی دەستدەکەوێ، بەڵام وەکو خۆ بە کەمگرتن ئەوە بکات، ئەوە خوا بە ژمارەی پەنجەکانی چاکەی بۆ دەنووسێ، چونکە ئەوە دەفرو قاپی عیسای کوڕی مەریەمە دروودی خوایان لەسەر بێت، کاتێک کە (عیسا) دەفرەکەی فڕێداو فەرمووی: ئەمەش هەر لەگەڵ دونیا حیسابە.

---

(١) ضعيف، وصحح من قول ابن عباس. انظر أبو داود: ٣٧٢٨، والترمذي: ١٨٨٨.

(٢) ضعيف.

٣٤٣٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﭭ، قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، وَهُوَ يُحَوِّلُ الْمَاءَ فِي حَائِطِهِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَاءٌ بَاتَ فِي شَنٍّ فَاسْقِنَا، وَإِلَّا كَرَعْنَا» قَالَ: عِنْدِي مَاءٌ بَاتَ فِي شَنٍّ فَانْطَلَقَ وَانْطَلَقْنَا مَعَهُ، إِلَى الْعَرِيشِ، فَحَلَبَ لَهُ شَاةً عَلَى مَاءٍ بَاتَ فِي شَنٍّ فَشَرِبَ، ثُمَّ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ بِصَاحِبِهِ الَّذِي مَعَهُ[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﭭ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای پیاوێکی ئەنصاری کە لەوکاتەدا ئاوی دەگواستەوە بۆ ئاوداشتن لە ناو باخەکەی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر ئاوێکت لەلایێ شەوێ لە کوندەدا مابێتەوە ئەوە پێیان بدە، دەنا دەم بە جۆگەکەوە دەنێین و لێی دەخۆینەوە، گوتی: ئاوی شەویم لەلایە، ڕۆیشت و ئێمەش لەگەڵی ڕۆیشتین بۆ ئەو شوێنەی بۆ سێبەر دروستی کردبوو، ئنجا شیری مەڕێکی بۆ دۆشییە ناو ئاوە شەوییەکە، ئنجا خواردیەوە، پاشان بۆ هاوڕێکەشی هەمان شتی کرد.

٣٤٣٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ، قَالَ: مَرَرْنَا عَلَى بِرْكَةٍ، فَجَعَلْنَا نَكْرَعُ فِيهَا، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَكْرَعُوا، وَلَكِنِ اغْسِلُوا أَيْدِيَكُمْ، ثُمَّ اشْرَبُوا فِيهَا، فَإِنَّهُ لَيْسَ إِنَاءٌ أَطْيَبَ مِنَ الْيَدِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﭭ دەڵێ: بەسەر حەوزێکدا ڕەت بووین، ئێمەش خەریک بوو دەم بە حەوزەکەوە بنێین بۆ ئاو خواردنەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەمی پێوە مەنێن، بەڵکو دەستتان جوان بشۆن، پاشان بە دەستان ئاوەکەی بخۆنەوە، چونکە دەفرێک نیە پاکتر بێ لە دەستەکان.

## بابەت: ئاوگێڕی کۆمەڵێک دواین کەس ئاو دەخواتەوە

٣٤٣٤- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﭬ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَاقِي الْقَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْبًا»[٣].

واتە: ئەبو قەتادە ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی ئاو دەدات بە خەڵک و ئاو دەگێڕێ، کۆتا کەسە ئاو دەخواتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦١٣، وأبو داود: ٣٧٢٤.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٦٨١مطولاً، والترمذي: ١٨٩٤.

## بابەت: خواردنەوە لە شوشەدا

**٣٤٣٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَدَحُ قَوَارِيرَ يَشْرَبُ فِيهِ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفرێكی شوشەی هەبوو ئاوی تێدا دەخواردەوە.

* * *

---

(١) ضعيف.

## بابەت: خوا هەر نەخۆشییەکی دابەزاندبێ، مسۆگەر چارەسەریشی بۆ دابەزاندوە

٣٤٣٦- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ ﷺ، قَالَ: شَهِدْتُ الْأَعْرَابَ يَسْأَلُونَ النَّبِيَّ ﷺ: أَعَلَيْنَا حَرَجٌ فِي كَذَا؟ أَعَلَيْنَا حَرَجٌ فِي كَذَا؟ فَقَالَ لَهُمْ: «عِبَادَ اللَّهِ، وَضَعَ اللَّهُ الْحَرَجَ، إِلَّا مَنِ اقْتَرَضَ، مِنْ عِرْضِ أَخِيهِ شَيْئًا، فَذَاكَ الَّذِي حَرِجَ» فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ: هَلْ عَلَيْنَا جُنَاحٌ أَنْ لَا نَتَدَاوَى؟ قَالَ: «تَدَاوَوْا عِبَادَ اللَّهِ، فَإِنَّ اللَّهَ، سُبْحَانَهُ، لَمْ يَضَعْ دَاءً، إِلَّا وَضَعَ مَعَهُ شِفَاءً، إِلَّا الْهَرَمَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا خَيْرُ مَا أُعْطِيَ الْعَبْدُ قَالَ: «خُلُقٌ حَسَنٌ»[1].

واتە: ئوسامەی کوڕی شەریک ﷺ دەڵێ: ئاگام لێبوو هەندێ دەشتەکی پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد ئایا لەوەو لەوەدا گوناهبار دەبین؟ ئەویش پێیانی فەرموو: ئەی بەندەکانی خوا، خوا تاوانی ئەوانەی لەسەرتان هەڵگرتووە مەگەر کەسێک بە شتێک قەرزداری براکەی بێ (کە لە پاشەملە باسی کردبێ، یان جنێوی پێدابێ، یان لەڕووی دەروونییەوە ئازاری دابێ)، ئا بەمە گوناهبار دەبن، ئنجا گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا تاوانبار دەبین ئەگەر چارەسەری خۆمان نەکەین؟ فەرمووی: ئەی بەندەکانی خوا خۆتان چارەسەر بکەن، چونکە خوای پاک و بێگەرد هەر دەردێکی دانابێ شیفاو دەرمانیشی بۆ داناوە جگە لە پیری، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین شت چییە کە بەندە پێی بەخشراوە؟ فەرمووی: ڕەوشتی باش.

٣٤٣٧- عَنْ أَبِي خِزَامَةَ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَرَأَيْتَ أَدْوِيَةً نَتَدَاوَى بِهَا، وَرُقًى نَسْتَرْقِي بِهَا، وَتُقًى نَتَّقِيهَا، هَلْ تَرُدُّ مِنْ قَدَرِ اللَّهِ شَيْئًا؟ قَالَ: «هِيَ مِنْ قَدَرِ اللَّهِ»[2].

واتە: ئەبو خیزامە ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەو دەرمان و نوشتەو ڕوقیانەی کە بۆ چارەسەر بەکاریان دێنین هیچ لە قەدەری خوا دەگێڕێتەوە؟ فەرمووی: ئەویش هەر قەدەری خوایە.

٣٤٣٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا أَنْزَلَ اللَّهُ دَاءً، إِلَّا أَنْزَلَ لَهُ دَوَاءً»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٥٥، والترمذي: ٢٠٣٨.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٠٦٥ و ٢١٤٨.

(٣) صحيح.

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا هەر نەخۆشییەکی دابەزاندبێ، مسۆگەر چارەسەریشی بۆ دابەزاندووە.

**٣٤٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَنْزَلَ اللَّهُ دَاءً، إِلَّا أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً»[١].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا هەر دەردو نەخۆشییەکی دابەزاندبێ، مسۆگەر دەرمان و چارەسەریشی بۆ دابەزاندووە.

## بابەت: ئەو نەخۆشەی حەزی دەچێتە شتێک

**٣٤٤٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: عَادَ رَجُلًا، فَقَالَ لَهُ: «مَا تَشْتَهِي؟» فَقَالَ: أَشْتَهِي خُبْزَ بُرٍّ، فَقَالَ: النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ كَانَ عِنْدَهُ خُبْزُ بُرٍّ، فَلْيَبْعَثْ إِلَى أَخِيهِ» ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا اشْتَهَى مَرِيضُ أَحَدِكُمْ شَيْئًا، فَلْيُطْعِمْهُ»[٢].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ سەردانی پیاوێکی کرد، جا پێی فەرموو: حەزت لە چییە (لە خواردن)؟ گوتی: حەزم لە نانی گەنمە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکەس نانی گەنمی هەیە با بۆ براکەی بنێرێ، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر نەخۆشی هەر کەسێک حەزی لە شتێک بوو با دەرخواردی بدات.

**٣٤٤١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى مَرِيضٍ يَعُودُهُ، قَالَ: «أَتَشْتَهِي شَيْئًا» قَالَ: أَشْتَهِي كَعْكًا، قَالَ: «نَعَمْ» فَطَلَبُوا لَهُ[٣].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چووە ژوورەوە بۆ لای نەخۆشێک و سەردانی کرد، فەرمووی: ئایا شتێک هەیە حەزت لێبێ؟ گوتی: حەزم لە کێکە، فەرمووی: بەڵێ، ئنجا داوای کێکیان بۆ کرد (بۆیان هێنا).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٧٨.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

## بابەت: دوورکەوتنەوە لە هەندێک خواردن لەبەر نەخۆشی

٣٤٤٢- عَنْ أُمِّ الْمُنْذِرِ بِنْتِ قَيْسٍ الْأَنْصَارِيَّةِ ﵂، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَمَعَهُ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَعَلِيٌّ نَاقِهٌ مِنْ مَرَضٍ، وَلَنَا دَوَالِي مُعَلَّقَةٌ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ، يَأْكُلُ مِنْهَا فَتَنَاوَلَ عَلِيٌّ لِيَأْكُلَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَهْ يَا عَلِيُّ إِنَّكَ نَاقِهٌ» قَالَتْ: فَصَنَعْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ سِلْقًا، وَشَعِيرًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «يَا عَلِيُّ مِنْ هَذَا، فَأَصِبْ، فَإِنَّهُ أَنْفَعُ لَكَ»[1].

واتە: ئوممو مونزیری کچی قەیسی ئەنصاریی ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلامان و عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبیشی لەگەڵ بوو، وە عەلی تازە لە نەخۆشییەک چاک ببوویەوە، ئێمەش هێشووی فەریکە خورمامان هەڵواسیبوو، وە پێغەمبەر ﷺ لێی دەخوارد، جا عەلیش دەستی بۆ برد بیخوات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عەلی مەکە لێی مەخۆ تۆ تازە لە نەخۆشی چاک دەبیتەوە (دەبێ پارێز بکەی لە هەندێ خواردن تاکو بە تەواوی چاک دەبیتەوە)، (ئوممو مونزیر) گوتی: جا جۆو سڵقم بۆ پێغەمبەر ﷺ ئامادە کرد، ئەویش فەرمووی: ئەی عەلی لەمە بخۆ، ئەمە بۆ تۆ باشترەو بە سوودترە.

٣٤٤٣- عَنْ صُهَيْبٍ ﵁، قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَبَيْنَ يَدَيْهِ خُبْزٌ وَتَمْرٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ادْنُ فَكُلْ» فَأَخَذْتُ آكُلُ مِنَ التَّمْرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَأْكُلُ تَمْرًا وَبِكَ رَمَدٌ؟» قَالَ، فَقُلْتُ: إِنِّي أَمْضُغُ مِنْ نَاحِيَةٍ أُخْرَى، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[2].

واتە: صوهەیب ﵁ دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا نان و خورمای لەبەر دەست بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نزیک ببەوەو بخۆ، منیش خەریک بوو لە خورماکە بخۆم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا خورما دەخۆی لە کاتێکدا نەخۆشی چاو ئێشەت هەیە؟ دەڵێ گوتم: بەلایەکی تر دەیجوم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی بۆ کرد.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٨٥٦، والترمذي: ٢٠٣٧.

(٢) حسن.

## بابەت: خواردن و خواردنەوە بە زۆر مەدەن بە نەخۆش

٣٤٤٤- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُكْرِهُوا مَرْضَاكُمْ عَلَى الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ، فَإِنَّ اللَّهَ يُطْعِمُهُمْ وَيَسْقِيهِمْ»[1].

واتە: عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەزۆر خواردن و خواردنەوە مەدەن بە نەخۆشەکانتان، چونکە خوا بۆخۆی خواردن و خواردنەوەیان پێ دەبەخشێ.

## بابەت: پەڵوولە

٣٤٤٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَخَذَ أَهْلَهُ الْوَعْكُ أَمَرَ بِالْحَسَاءِ» قَالَتْ: وَكَانَ يَقُولُ: «إِنَّهُ لَيَرْتُو فُؤَادَ الْحَزِينِ، وَيَسْرُو عَنْ فُؤَادِ السَّقِيمِ، كَمَا تَسْرُو إِحْدَاكُنَّ الْوَسَخَ عَنْ وَجْهِهَا بِالْمَاءِ»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ خانەوادەکەی تایان هەبووایە فەرمانی دەکرد پەڵوولەی بۆ دروست بکەن، گوتی: وە دەیفەرموو: دڵی غەمبار بەهێز دەکات و ئازاری دڵی نەخۆش ناهێڵێ، وەک چۆن یەکێک لە ئێوە پیسی دەم و چاوی بە ئاو دەشۆرێ و پاکی دەکاتەوە.

٣٤٤٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالْبَغِيضِ النَّافِعِ التَّلْبِينَةِ» يَعْنِي الْحَسَاءَ قَالَتْ: «وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اشْتَكَى أَحَدٌ مِنْ أَهْلِهِ، لَمْ تَزَلِ الْبُرْمَةُ عَلَى النَّارِ حَتَّى يَنْتَهِيَ أَحَدُ طَرَفَيْهِ، يَعْنِي يَبْرَأُ أَوْ يَمُوتُ»[3].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: گرنگی بەو خواردنە بدەن کە دڵ حەزی بۆ ناچێ، بەڵام سوودی هەیە کە بریتیە لە پەڵوولە، (عائیشە) گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکاتێک یەکێک لە خانەوادەکەی بەدەم نەخۆشییەکەوە بیناڵاندبایە، ئەوە

---

(١) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٠٤٠.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٠٣٩.

(٣) ضعيف الإسناد. انظر: البخاري: ٥٦٩٠، ومسلم: ٢٢١٦.

هەمیشه پەڵووڵه لەسەر ئاگر بوو هەتا لایەکی لێ وەلایەک دەکەوت، واته: یان چاک دەبۆوه، یان دەمرد.

التلبينة: جۆره شیرینیەکه، له ئاردو ئاوو ڕۆن دروست دەکرێ، به خورما یان به هەنگوین شیرین دەکرێ.

## بابەت: ڕەشکه

٣٤٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ، سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ فِي الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ، إِلَّا السَّامَ، وَالسَّامُ الْمَوْتُ، وَالْحَبَّةُ السَّوْدَاءُ، الشُّونِيزُ»[١].

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ، گوێی له پێغەمبەری خوا ﷺ بووه دەیفەرموو: بەڕاستی له ڕەشکەدا شیفاو چارەسەری هەیه بۆ هەموو نەخۆشی و دەردێک جگه له مردن، وه «السام» مردنه، وه «الحبة السوداء» شونیزه (ڕەشکەیه).

٣٤٤٨- عَنْ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ، فَإِنَّ فِيهَا شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ، إِلَّا السَّامَ»[٢].

واته: سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا له باوکییەوه ﷺ دەگێڕێتەوه، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاگاداربن ڕەشکه شیفاو چارەسەره بۆ هەموو نەخۆشی و دەردێک جگه له مردن.

٣٤٤٩- عَنْ خَالِدِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: خَرَجْنَا، وَمَعَنَا غَالِبُ بْنُ أَبْجَرَ، فَمَرِضَ فِي الطَّرِيقِ، فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، وَهُوَ مَرِيضٌ، فَعَادَهُ ابْنُ أَبِي عَتِيقٍ، وَقَالَ: لَنَا عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ، فَخُذُوا مِنْهَا خَمْسًا، أَوْ سَبْعًا، فَاسْحَقُوهَا، ثُمَّ اقْطُرُوهَا فِي أَنْفِهِ بِقَطَرَاتِ زَيْتٍ فِي هَذَا الْجَانِبِ وَفِي هَذَا الْجَانِبِ، فَإِنَّ عَائِشَةَ حَدَّثَتْهُمْ، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ هَذِهِ الْحَبَّةَ السَّوْدَاءَ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ السَّامُ» قُلْتُ: وَمَا السَّامُ؟ قَالَ: «الْمَوْتُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٨٨، ومسلم: ٢٢١٥، والترمذي: ٢٠٤١.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٨٧.




واتە: خالیدی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: دەرچووین و غالیبی کوڕی ئەبجەڕیشمان لەگەڵ بوو، جا لە ڕێگادا نەخۆش کەوت، هاتینەوە مەدینەش هەر نەخۆش بوو، جا کوڕی ئەبو عەتیق سەردانی کردو پێی گوتین: گرنگی بەو ڕەشکەیە بدەن، پێنج یان حەوت دانەی بێنن و بیهاڕن، پاشان ئاردەکەی بە ڕۆنی زەیت بدڵۆپێننە ناو هەردوو کونە لووتەکانی، چونکە عائیشە بۆی گێڕاونەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە فەرموویەتی: بەڕاستی ئەو ڕەشکەیە شیفاو چارەسەرە بۆ هەموو نەخۆشییەک جگە لە مردن، (ڕاوی دەڵێ:) گوتم: «السام» چییە؟ گوتی: مردنە.

## بابەت: هەنگوین

٣٤٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَعِقَ الْعَسَلَ ثَلَاثَ غَدَوَاتٍ كُلَّ شَهْرٍ، لَمْ يُصِبْهُ عَظِيمٌ مِنَ الْبَلَاءِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە هەر مانگێکدا سێ بەیانی هەنگوین بخوات، ئەوە تووشی بەڵاو ناخۆشی گەورە نابێ.

٣٤٥١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: أُهْدِيَ لِلنَّبِيِّ ﷺ عَسَلٌ، فَقَسَمَ بَيْنَنَا لُعْقَةً لُعْقَةً، فَأَخَذْتُ لُعْقَتِي، ثُمَّ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَزْدَادُ أُخْرَى؟ قَالَ: «نَعَمْ»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: هەنگوین بە دیاری نێردرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش پارو پارو بە پەنجە لێمانی بەشکرد، منیش پارووەکەی خۆم وەرگرت، پاشان گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دانەیەکی تریش بخۆم؟ فەرمووی: بەڵێ.

٣٤٥٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالشِّفَاءَيْنِ: الْعَسَلِ وَالْقُرْآنِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گرنگی بە دوو چارەسەرەکە بدەن (کە بریتین لە): هەنگوین و قورئان.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف الإسناد.

(٣) صحيح موقوفاً.




## بابەت: دومەڵان و خورمای عەجوە

**٣٤٥٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَجَابِرٍ ﭫ، قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ، وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ، وَالْعَجْوَةُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَهِيَ شِفَاءٌ مِنَ السَّمِّ»[1].

واتە: ئەبو سەعیدو جابیر ﭫ، گوتوویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دومەڵان بەشێکە لەو مەننەی (جۆرە خواردنێکە) کە بۆ بەنو ئیسرائیل دەباری، وە ئاوەکەی دەرمانە بۆ نەخۆشی چاو، وە خورمای عەجوە لە بەهەشتەوەیە، وە شیفایە بۆ هەموو ژەهرێ.

**٣٤٥٣م-** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مَيْمُونٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الرَّقِّيَّانِ، قَالَا: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ مَسْلَمَةَ بْنِ هِشَامٍ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ جَعْفَرِ بْنِ إِيَاسٍ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ[2].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

**٣٤٥٤-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ ﷺ، يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «أَنَّ الْكَمْأَةَ مِنَ الْمَنِّ، الَّذِي أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ، وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ»[3].

واتە: سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتەوە کە دومەڵان بەشێکە لەو مەننە (جۆرە خواردنێکە) کە خوا بۆ بەنو ئیسرائیلی دابەزاند، وە ئاوەکەی دەرمانە بۆ نەخۆشی چاو.

**٣٤٥٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كُنَّا نَتَحَدَّثُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرْنَا الْكَمْأَةَ، فَقَالُوا: هُوَ جُدَرِيُّ الْأَرْضِ، فَنُمِيَ الْحَدِيثُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ، وَالْعَجْوَةُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَهِيَ شِفَاءٌ مِنَ السَّمِّ»[4].

---

(١) صحيح لغيره. بلفظ: «وَهِيَ شِفَاءٌ مِنَ السُّمِّ».

(٢) صحيح لغيره. بلفظ: «وَهِيَ شِفَاءٌ مِنَ السُّمِّ».

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٧٨، ومسلم: ٢٠٤٩، والترمذي: ٢٠٦٧.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٠٦٦ و ٢٠٦٨.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گفتوگۆمان دەکرد، جا باسی دومەڵانمان کرد، گوتیان: ئەوە دڕکەو مێکوتەی زەوییە، جا ئەو گفتوگۆیە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕدرایەوە، ئەویش فەرمووی: دومەڵان بەشێکە لەو مەننەی (جۆرە خواردنێکە) کە بۆ سەر بەنو ئیسڕائیل دابەزی، وە خورمای عەجوە لە بەهەشتەوەیەو چارەسەرە بۆ هەموو ژەهرێ.

٣٤٥٦- عَنْ رَافِعَ بْنَ عَمْرٍو الْمُزَنِيَّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْعَجْوَةُ وَالصَّخْرَةُ، مِنَ الْجَنَّةِ» قَالَ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ: «حَفِظْتُ الصَّخْرَةَ مِنْ فِيهِ»[1].

واتە: ڕافیعی کوڕی عەمری موزەنیی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خورمای عەجوەو بەردی «بیت المقدس» (کە پێی دەگوترێ: بەردی خوا) لە بەهەشتەوەن. عەبدوڕڕەحمان (کە یەکێکە لە ڕاوییەکانی ئەم فەرموودەیە) گوتی: لە دەمی ئەوەوە وشەی بەردم لەبەرکردوە وەرمگرتووە.

## بابەت: سەناو سەنوت: سینەمەکی و شویت یان هەنگوین

٣٤٥٧- عَنْ إِبْرَاهِيمُ بْنُ أَبِي عَبْلَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُبَيِّ بْنَ أُمِّ حَرَامٍ ﷺ، وَكَانَ قَدْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْقِبْلَتَيْنِ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «عَلَيْكُمْ بِالسَّنَى وَالسَّنُّوتِ، فَإِنَّ فِيهِمَا شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلَّا السَّامَ» قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا السَّامُ؟ قَالَ: «الْمَوْتُ» قَالَ عَمْرٌو: قَالَ ابْنُ أَبِي عَبْلَةَ: السَّنُّوتُ الشِّبِتُّ، وَقَالَ آخَرُونَ: بَلْ هُوَ الْعَسَلُ الَّذِي يَكُونُ فِي زِقَاقِ السَّمْنِ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّاعِرِ:

هُمُ السَّمْنُ بِالسَّنُّوتِ لَا أَلْسَ فِيهِمْ ... وَهُمْ يَمْنَعُونَ جَارَهُمْ أَنْ يَتَقَرَّدَا[2].

واتە: لە ئیبڕاهیمی کوڕی ئەبو عەبلەوە دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: گوێم لە ئەبو ئوبەی کوڕی ئوممو حەڕام ﷺ بووکە بەرەو هەردوو ڕووگەکە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کردوە، دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئاگاتان لە گیای سینەمەکی (سینا)و هەنگوین (سەنوت) بێ بۆ چارەسەر، چونکە بەڕاستی هەردووکیان

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

چارەسەرن بۆ هەموو نەخۆشییەک جگە لە مردن، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ «السام» چییە؟ فەرمووی: مردنە. عومەر گوتی: کوڕی ئەبو عەبلە گوتی: «السنوت»، واتە: شویت، وە کەسانی دی گوتوویانە: بەڵکو ئەو هەنگوینەیە کە لە نێو ڕۆن دایە، وە هەر لەوەشەوەیە کە شاعیر دەڵێ:

ئەوانە ڕۆنن لەگەڵ هەنگوین ناپاکیان تێدانیە ... هەر ئەوانیش ڕێگری لە دراوسێیان دەکەن، فێڵ بکەن

## بابەت: نوێژ شیفاو چارەسەرە

٣٤٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: هَجَّرَ النَّبِيُّ ﷺ، فَهَجَّرْتُ، فَصَلَّيْتُ ثُمَّ جَلَسْتُ، فَالْتَفَتَ إِلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: «اشِكَنِبَ دَرْدْ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «قُمْ فَصَلِّ، فَإِنَّ فِي الصَّلَاةِ شِفَاءً»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەخێرایی چوو بۆ نوێژ و منیش بەخێرایی چووم، نوێژم کرد، پاشان دانیشتم، ئنجا پێغەمبەر ﷺ ئاوڕی بۆ دامەوەو فەرمووی: ئایا سکت دێشێ؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: هەڵسە نوێژ بکە، چونکە بێگومان نوێژ شیفاو چارەسەری تێدایە.

٣٤٥٨م- حَدَّثَنَا أَبُو الْحَسَنِ الْقَطَّانُ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ نَصْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو سَلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا ذَوَّادُ بْنُ عُلْبَةَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَقَالَ فِيهِ: اشِكَنِبَ دَرْد، يَعْنِي تَشْتَكِي بَطْنَكَ بِالْفَارِسِيَّةِ قَالَ: أَبُو عَبْدِ اللَّهِ حَدَّثَ بِهِ رَجُلٌ لِأَهْلِهِ فَاسْتَعْدَوْا عَلَيْهِ[2].

واتە: هەر بەم سەنەدە ئەو بڕگەش هاتوە، ڕاوی دەربارەی گوتوویەتی: «اشِكَنِب دَرْد»، ڕستەیەکی فارسییە بەمانای: ئازاری سکت هەیە؟

## بابەت: ڕێگری کردن لە چارەسەرکردن بە دەرمانی پیس و خراپ

٣٤٥٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدَّوَاءِ الْخَبِيثِ، يَعْنِي السُّمَّ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٧٠، والترمذي: ٢٠٤٥.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە چارەسەرکردن بە دەرمانی پیس و خراپ، واتە: ژەهر.

٣٤٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ شَرِبَ سُمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَهُوَ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ژەهر بخواتەوەو بە ژەهر خۆی بکوژێ، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا ژەهرەکەی بە دەستەوەیەو پەیتا پەیتا دەیخواتەوە، ئیتر هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە.

## بابەت: دەرمانی ڕەوانی (سکچوون)

٣٤٦١- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بِمَاذَا كُنْتِ تَسْتَمْشِينَ؟» قُلْتُ: بِالشُّبْرُمِ، قَالَ: «حَارٌّ جَارٌّ» ثُمَّ اسْتَمْشَيْتُ بِالسَّنَى فَقَالَ: «لَوْ كَانَ شَيْءٌ يَشْفِي مِنَ الْمَوْتِ، كَانَ السَّنَى، وَالسَّنَى شِفَاءٌ مِنَ الْمَوْتِ»[٢].

واتە: ئەسمائی کچی عومەیس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: بە چ دەرمانێک خۆت ڕەوان دەکەی؟ گوتم: بە «الشبرم» (وەکو نۆک وایە، دەکوڵێنرێ و ئاوەکەی دەخورێتەوە)، فەرمووی: پلەی گەرمی جەستە بەرزدەکاتەوەو ئادەمیزاد زۆر ڕەوان دەکات، (ئەسماء گوتی:) پاشان بە سینەمەکی خۆم ڕەوان دەکرد، فەرمووی: ئەگەر شتێک شیفا بووایە بۆ مردن ئەوە ئەو شتە سینەمەکی دەبوو.

## بابەت: چارەسەری دومەڵ و ڕێگری کردن لە تەقاندنی بە پەنجە

٣٤٦٢- عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ ﷺ، قَالَتْ: دَخَلْتُ بِابْنٍ لِي عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَقَدْ أَعْلَقْتُ عَلَيْهِ مِنَ الْعُذْرَةِ، فَقَالَ: «عَلَامَ تَدْغَرْنَ أَوْلَادَكُنَّ بِهَذَا الْعِلَاقِ؟ عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ، فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ يُسْعَطُ بِهِ مِنَ الْعُذْرَةِ، وَيُلَدُّ بِهِ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٧٨، ومسلم: ١٠٩، وأبو داود: ٣٨٧٢، والترمذي: ٢٠٤٣، والنسائي: ١٩٦٥.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٠٨١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٩٢ و ٥٧١٣، ومسلم: ٢٢١٤، وأبو داود: ٣٨٧٧.




واتە: ئوممو قەیسی کچی میحصەن رضي الله عنها دەڵێ: کوڕێکی بچووکی خۆم کە لەوزەتێنی هەڵسابوو بە پەنجە بۆم تەقاندبوو بردمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: بۆچی بە زەبری پەنجە لەوزەتێنی گەرووی منداڵەکانتان دەتەقێنن و ئازاریان دەدەن؟! ئەو عودە هیندییە بەکاربێنن، چونکە شیفای حەوت دەردە، کە بۆ لەوزەتێن لەڕێگەی لوتەوە چارەسەری پێ دەکرێ، وە چارەسەریشە بۆ هەوکردنی پەردەی سییەکان (نەخۆشی سیل) کە لە ڕێگەی دەمەوە چارەسەری پێ دەکرێ.

**العود الهندي:** دارێکە بۆنێکی خۆشی هەیە، وەک دەرمان بۆ نەخۆشی بەکاردەهێنرێ.

**٣٤٦٢م-** حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ السَّرْحِ الْمِصْرِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَنْبَأَنَا يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ رضي الله عنها، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ قَالَ يُونُسُ: «أَعْلَقْتُ يَعْنِي غَمَزْتُ»[1].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە کە لە یونس دەڵێ: (أَعْلَقْتُ) واتە: (غَمَزْتُ).

## بابەت: چارەسەری نەخۆشی باداری یان لاق هێشە

**٣٤٦٣-** عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رضي الله عنه، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «شِفَاءُ عِرْقِ النَّسَا، أَلْيَةُ شَاةٍ أَعْرَابِيَّةٍ تُذَابُ، ثُمَّ تُجَزَّأُ ثَلَاثَةَ أَجْزَاءٍ، ثُمَّ يُشْرَبُ عَلَى الرِّيقِ فِي كُلِّ يَوْمٍ جُزْءٌ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: چارەسەری باداری (لاق هێشە) بریتیە لە چەوری مەڕێک کە لە دەشت بلەوەڕێ، چەورییەکەی دەتوێنرێتەوە، پاشان دەکرێتە سێ بەش، پاشان لە خورێنی (پێش نان خواردن) دەخورێتەوە، هەر ڕۆژەو بەشێکی (دەخورێتەوە).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٩٢ و ٥٧١٣، ومسلم: ٢٢١٤، وأبو داود: ٣٨٧٧.

(٢) صحيح.

## بابەت: چارەسەری برینداری

**٣٤٦٤- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: «جُرِحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ، وَهُشِمَتِ الْبَيْضَةُ عَلَى رَأْسِهِ، فَكَانَتْ فَاطِمَةُ تَغْسِلُ الدَّمَ عَنْهُ، وَعَلِيٌّ يَسْكُبُ عَلَيْهِ الْمَاءَ بِالْمِجَنِّ، فَلَمَّا رَأَتْ فَاطِمَةُ أَنَّ الْمَاءَ لَا يَزِيدُ الدَّمَ، إِلَّا كَثْرَةً أَخَذَتْ قِطْعَةَ حَصِيرٍ، فَأَحْرَقَتْهَا حَتَّى إِذَا صَارَ رَمَادًا، أَلْزَمَتْهُ الْجُرْحَ، فَاسْتَمْسَكَ الدَّمُ»[1].**

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: لە جەنگی ئوحوددا پێغەمبەری خوا ﷺ بریندار بوو ددانە چوارینەکەی شکاو خوددەکەی (کڵاوە ئاسنینەکەی) لە سەریدا شکا، جا فاتیمە خوێنەکەی (لە ڕوخساری) دەشۆردەوە، وە عەلیش بە قەڵغانەکەی ئاوی دەهێناو بەسەریدا دەکرد، کاتێ فاتیمە سەرنجیدا ئاوەکە تەنیا خوێن بەربوونەکە زیاتر دەکا، چوو پارچە حەسیرێکی هێناو سوتاندی تاوەکو بوو بە سووتوو (خۆڵەمێش)، وە لەسەر برینەکەی دانا، ئیتر خوێن بەربوونەکە وەستا.

**٣٤٦٥- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: إِنِّي لَأَعْرِفُ يَوْمَ أُحُدٍ مَنْ جَرَحَ وَجْهَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَمَنْ كَانَ يُرْقِئُ الْكَلْمَ مِنْ وَجْهِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَيُدَاوِيهِ، وَمَنْ يَحْمِلُ الْمَاءَ فِي الْمِجَنِّ، وَبِمَا دُووِيَ بِهِ الْكَلْمُ، حَتَّى رَقَأَ، قَالَ: «أَمَّا مَنْ كَانَ يَحْمِلُ الْمَاءَ فِي الْمِجَنِّ، فَعَلِيٌّ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ يُدَاوِي الْكَلْمَ، فَفَاطِمَةُ، أَحْرَقَتْ لَهُ، حِينَ لَمْ يَرْقَأْ قِطْعَةَ حَصِيرٍ خَلَقٍ، فَوَضَعَتْ رَمَادَهُ عَلَيْهِ، فَرَقَأَ الْكَلْمُ»[2].**

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: بەڕاستی من دەزانم کە لە جەنگی ئوحوددا کێ ڕوخساری پێغەمبەری خوای ﷺ بریندار کرد، وە کێش ڕوخساری پێغەمبەری خوای ﷺ پاک دەکردەوەو چارەسەری دەکرد، وە کێ بە مەتاڵە ئاوی دەهێنا، وە بە چی شتێکیش برینەکە چارەسەرکرا تاوەکو خوێنبەربوونەکە وەستا، جا ئەوەی کە بە مەتاڵە ئاوی دەهێنا عەلی بوو، وە ئەوەی کە چارەسەری برینەکەی دەکرد فاتیمە بوو، جا کاتێ خوێن بەربوونەکە نەوەستا پارچە حەسیرێکی کۆنی بۆ سوتاندو سووتووەکەی لەسەر برینەکەی دانا، ئیتر خوێن بەربوونەکە وەستا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٣، ومسلم: ١٧٩٠، والترمذي: ٢٠٨٥.

(٢) صحيح بما قبله. أخرجه البخاري: ٢٤٣، ومسلم: ١٧٩٠، والترمذي: ٢٠٨٥

## بابەت: کەسێ کە کاری پزیشکی بکات و پێشتر پیشەی پزیشکی لێ نەزانرابێ

**٣٤٦٦-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَطَبَّبَ، وَلَمْ يُعْلَمْ مِنْهُ طِبٌّ قَبْلَ ذَلِكَ، فَهُوَ ضَامِنٌ»[١].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ خۆی بکات بە پزیشک و پێشتر پیشەی لێ نەزانرابێ و کاری پزیشکی نەکردبێ ئەوە زامن و دەستەبەرە بۆ هەر زیانێ کە بیدات.

## بابەت: دەرمانی نەخۆشی هەوکردنی پەردەی سییەکان

**٣٤٦٧-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ، قَالَ: «نَعَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ، وَرْسًا، وَقُسْطًا، وَزَيْتًا، يُلَدُّ بِهِ»[٢].

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وەسفی زەیت و وەرس و عودی هیندی کرد کە چەندە باشن بۆ چارەسەری نەخۆشی هەوکردنی پەردەی سییەکان (نەخۆشی سیل) کە لە ڕێگەی دەمەوە بەکاردەهێنرێ.

**٣٤٦٨-** عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالْعُودِ الْهِنْدِيِّ، يَعْنِي بِهِ الْكُسْتَ، فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ، مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ» قَالَ ابْنُ سَمْعَانَ: فِي الْحَدِيثِ: فَإِنَّ فِيهِ شِفَاءً مِنْ سَبْعَةِ أَدْوَاءٍ، مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ[٣].

واتە: ئوممو قەیسی کچی میحصەن ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گرنگی بدەن بە عودی هیندی، مەبەستی «الکست» بوو، چونکە بەڕاستی چارەسەری حەوت نەخۆشییە، لەوانە نەخۆشی هەوکردنی پەردەی سییەکان. ئیبنو سەمعان لەبارەی فەرموودەکەوە گوتی: بەڕاستی چارەسەری حەوت دەردو نەخۆشییە، لەوانە نەخۆشی هەوکردنی پەردەی سییەکان.

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٥٨٦، والنسائي: ٤٨٣٠ و ٤٨٣١.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٠٧٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٩٢، ومسلم: ٢٢١٤، وأبو داود: ٣٨٧٧.

## بابەت: تا

**٣٤٦٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: ذُكِرَتِ الْحُمَّى عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَبَّهَا رَجُلٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تَسُبَّهَا، فَإِنَّهَا تَنْفِي الذُّنُوبَ، كَمَا تَنْفِي النَّارُ، خَبَثَ الْحَدِيدِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ باسی «تا» کرا، جا پیاوێک جنێوی پێدا، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جنێوی پێ مەدە، چونکە «تا» تاوانەکان لادەبا هەروەکو چۆن ئاگر پیسی ئاسن لادەبا.

**٣٤٧٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ عَادَ مَرِيضًا، وَمَعَهُ أَبُو هُرَيْرَةَ مِنْ وَعْكٍ كَانَ بِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَبْشِرْ فَإِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: هِيَ نَارِي أُسَلِّطُهَا عَلَى عَبْدِي الْمُؤْمِنِ فِي الدُّنْيَا، لِتَكُونَ حَظَّهُ مِنَ النَّارِ، فِي الْآخِرَةِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ سەردانی نەخۆشێکی کرد کە تووشی تا ببوو وە ئەبو هورەیرەشی لەگەڵ بوو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: موژدەت لێبێ، چونکە بەڕاستی خوا دەفەرمووێ: ئەو ئاگرە لە منەوەیە کە لە دونیادا بەسەر بەندە ئیماندارەکەمیدا زاڵ دەکەم بۆئەوەی بەبری ئاگری دۆزەخ کەوێ (واتە: گوناهی پێ ڕەش دەبنەوە).

## بابەت: ئەوەی کە (تا)، (گەرمای تا) لە هاڵاوی دۆزەخەوەیە بۆیە بە ئاو ساردی بکەنەوە

**٣٤٧١-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَابْرُدُوهَا بِالْمَاءِ»[3].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: گەرمای تا لە هاڵاوی دۆزەخەوەیە، بۆیە بە ئاو ساردی بکەنەوە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. الترمذي: ٢٠٨٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٦٣، ومسلم: ٢٢١٠، والترمذي: ٢٠٧٤.




٣٤٧٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّ شِدَّةَ الْحُمَّى، مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَابْرُدُوهَا بِالْمَاءِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی گەرماو تینی تا لە هاڵاوی دۆزەخەوەیە، بۆیە بە ئاو ساردی بکەنەوە.

٣٤٧٣- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَابْرُدُوهَا بِالْمَاءِ» فَدَخَلَ عَلَى ابْنٍ لِعَمَّارٍ فَقَالَ: «اكْشِفِ الْبَاسْ، رَبَّ النَّاسْ، إِلَهَ النَّاسْ»[٢].

واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: گەرمی تا لە هاڵاوی دۆزەخەوەیە، بۆیە بە ئاو ساردی بکەنەوە، جا چۆیە لای کوڕێکی عەممارو فەرمووی: پەروەردگاری خەڵکی، خودای خەڵکی ئەو ناخۆشییەی لەسەر لابەرە.

٣٤٧٤- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، أَنَّهَا كَانَتْ تُؤْتَى بِالْمَرْأَةِ الْمَوْعُوكَةِ، فَتَدْعُو بِالْمَاءِ، فَتَصُبُّهُ فِي جَيْبِهَا، وَتَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «ابْرُدُوهَا بِالْمَاءِ» وَقَالَ: «إِنَّهَا مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ»[٣].

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﷺ دەگێڕێتەوە، کاتێ ئافرەتێکیان دەهێنا بۆلای کە تای لێبایە، داوای ئاوی دەکرد، ئنجا دەیکردە ناو باخەڵی بۆ سەر جەستەی، وە دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە ئاو ساردی بکەنەوە، وە فەرموویەتی: گەرمی تا لە هاڵاوی دۆزەخەوەیە.

٣٤٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «الْحُمَّى كِيرٌ مِنْ كِيرِ جَهَنَّمَ، فَنَحُّوهَا عَنْكُمْ بِالْمَاءِ الْبَارِدِ»[٤].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی گەرمی تا هەڵێمێکە لە هەڵێمەکانی دۆزەخ، بۆیە بە ئاوی سارد لەخۆتانی دووربخەنەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٦٤، ومسلم: ٢٢٠٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٦٢، ومسلم: ٢٢١٢، والترمذي: ٢٠٧٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٢٤، ومسلم: ٢٢١١، والترمذي بإثر: ٢٠٧٤.

(٤) صحيح لغيره.

## بابەت: کەڵەشاخ

**٣٤٧٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ:: إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِمَّا تَدَاوَوْنَ بِهِ خَيْرٌ، فَالْحِجَامَةُ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئەو شتانەی کە ئێوە چارەسەری پێدەکەن باشیان تێدابێ ئەوە یەکێکیان کەڵەشاخە.

**٣٤٧٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَا مَرَرْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي، بِمَلَإٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ، إِلَّا كُلُّهُمْ يَقُولُ لِي: عَلَيْكَ، يَا مُحَمَّدُ بِالْحِجَامَةِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو شەوەی کە شەوڕەویم پێکرا بەلای هەر کۆمەڵە فریشتەیەکدا ڕۆیشتبام پێمیان دەفەرموو: ئەی موحەممەد ﷺ گرنگی بە کەڵەشاخ بدە.

**٣٤٧٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نِعْمَ الْعَبْدُ الْحَجَّامُ، يَذْهَبُ بِالدَّمِ، وَيُخِفُّ الصُّلْبَ، وَيَجْلُو الْبَصَرَ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکترین بەندە ئەو بەندەیەیە کە کەڵەشاخ دەکات بۆ خەڵک، خوێنی لەبەر دەڕوات، وە پشتی سووک دەکات، وە چاو پاک دەکاتەوەو بەهێزی دەکات.

**٣٤٧٩-** كَثِيرُ بْنُ سُلَيْمٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مَرَرْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي بِمَلَإٍ، إِلَّا قَالُوا: يَا مُحَمَّدُ، مُرْ أُمَّتَكَ بِالْحِجَامَةِ»[٤].

واتە: کەسیری کوڕی موسلیم ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیک بوو کە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو شەوەی کە شەوڕەویم پێکرا بەلای هەر کۆمەڵە فریشتەیەکدا ڕۆیشتبام دەیان فەرموو: ئەی موحەممەد ﷺ فەرمان بە ئوممەتەکەت بکە بە کەڵەشاخ گرتن.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٨٥٧.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٠٥٢ و ٢٠٥٣.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٠٥٣.

(٤) ضعيف.

٣٤٨٠- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، اسْتَأْذَنَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فِي الْحِجَامَةِ، «فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَبَا طَيْبَةَ أَنْ يَحْجُمَهَا» وَقَالَ: حَسِبْتُ أَنَّهُ كَانَ أَخَاهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ، أَوْ غُلَامًا لَمْ يَحْتَلِمْ[١].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، ئوممو سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە ڕێگەی بدات کەڵەشاخ بگرێ، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە ئەبو تەیبە کرد کە کەڵەشاخی بۆ بگرێ. وە (ڕاوی) گوتی: پێموابێ ئەبو تەیبە برای شیری ئوممو سەلەمە بوو، یان مێرمنداڵێک بوو کە باڵغ نەببوو.

## بابەت: شوێنی کەڵەشاخ گرتن

٣٤٨١- عَنْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ الْأَعْرَجَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ ابْنَ بُحَيْنَةَ، يَقُولُ: «احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بِلَحْيِ جَمَلٍ، وَهُوَ مُحْرِمٌ، وَسَطَ رَأْسِهِ»[٢].

واتە: عەبدوڕەحمانی ئەعرەج ﷺ دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی بوحەینە بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە «لحي جمل» (شوێنێکە لەنێوان مەککەو مەدینە) لەناوەڕاستی سەری کەڵەشاخی گرت، لەکاتێکدا لە ئیحڕامدا بوو.

٣٤٨٢- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: «نَزَلَ جِبْرِيلُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، بِحِجَامَةِ الْأَخْدَعَيْنِ، وَالْكَاهِلِ»[٣].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: جیبریل دابەزییە لای پێغەمبەر ﷺ بە کەڵەشاخ گرتنی دوو دەماری لاملی و نێو شانی.

٣٤٨٣- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «احْتَجَمَ فِي الْأَخْدَعَيْنِ، وَعَلَى الْكَاهِلِ»[٤].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە دوو دەماری لاملی و لەسەر نێوشانی کەڵەشاخی گرت.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٠٦، وأبو داود: ٤١٠٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٣٦، ومسلم: ١٢٠٣، والنسائي: ٢٨٥٠.

(٣) ضعيف جداً.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٦٠، والترمذي: ٢٠٥١.




٣٤٨٤- عَنْ أَبِي كَبْشَةَ الْأَنْمَارِيِّ، أَنَّهُ حَدَّثَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ يَحْتَجِمُ عَلَى هَامَتِهِ، وَبَيْنَ كَتِفَيْهِ، وَيَقُولُ: «مَنْ أَهْرَاقَ مِنْهُ هَذِهِ الدِّمَاءَ، فَلَا يَضُرُّهُ أَنْ لَا يَتَدَاوَى بِشَيْءٍ، لِشَيْءٍ»[1].

واتە: ئەبو کەبشەی ئەنماریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە سەری و نێوشانی کەڵەشاخی دەگرت، وە دەیفەرموو: هەر کەسێک خوێنی ئەم شوێنانە بەربدات، ئەگەر بە هیچ شتێک بۆ هیچ شتێک خۆی تیمار نەکات، هیچ زیانی پێ ناگات.

٣٤٨٥- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «سَقَطَ عَنْ فَرَسِهِ عَلَى جِذْعٍ، فَانْفَكَّتْ قَدَمُهُ» قَالَ وَكِيعٌ: يَعْنِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ احْتَجَمَ عَلَيْهَا مِنْ وَثْءٍ[2].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەسپەکەی بەربۆیەوەو کەوت بەسەر بنکی دار خورمایەکداو قاچی دەرچوو. وەکیع گوتی: واتە: پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو شوێنەی قاچی کە دەرچووبوو کەڵەشاخی گرت.

**وثء:** ئازارێکە لە گۆشتدا، ناگاتە سەر ئێسک، یان ئازارێکە لە ئێسکدا بێ ئەوەی شکابێ.

## بابەت: ئەوەی لە چ ڕۆژانێکدا کەڵەشاخ دەگیردرێ

٣٤٨٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ أَرَادَ الْحِجَامَةَ، فَلْيَتَحَرَّ سَبْعَةَ عَشَرَ، أَوْ تِسْعَةَ عَشَرَ، أَوْ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، وَلَا يَتَبَيَّغْ بِأَحَدِكُمُ الدَّمُ فَيَقْتُلَهُ»[3].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەی: هەر کەسێک ویستی کەڵەشاخ بگرێ با لە ڕۆژانی حەڤدەو نۆزدەو بیست و یەکی (مانگی کۆچیدا) کەڵەشاخ بگرێ، وە با خوێنتان ئەوەندە زۆر نەبێ و هەڵبچێ کە ببێتە هۆی کوشتنتان.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٥٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٦٣.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٠٥١.

٣٤٨٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: يَا نَافِعُ قَدْ تَبَيَّغَ بِيَ الدَّمُ فَالْتَمِسْ لِي حَجَّامًا وَاجْعَلْهُ رَفِيقًا، إِنِ اسْتَطَعْتَ، وَلَا تَجْعَلْهُ شَيْخًا كَبِيرًا، وَلَا صَبِيًّا صَغِيرًا، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْحِجَامَةُ عَلَى الرِّيقِ، أَمْثَلُ وَفِيهِ شِفَاءٌ، وَبَرَكَةٌ، وَتَزِيدُ فِي الْعَقْلِ، وَفِي الْحِفْظِ، فَاحْتَجِمُوا عَلَى بَرَكَةِ اللَّهِ، يَوْمَ الْخَمِيسِ وَاجْتَنِبُوا الْحِجَامَةَ، يَوْمَ الْأَرْبِعَاءِ، وَالْجُمُعَةِ، وَالسَّبْتِ، وَيَوْمَ الْأَحَدِ، تَحَرِّيًا وَاحْتَجِمُوا يَوْمَ الِاثْنَيْنِ، وَالثُّلَاثَاءِ، فَإِنَّهُ الْيَوْمُ الَّذِي عَافَى اللَّهُ فِيهِ أَيُّوبَ مِنَ الْبَلَاءِ، وَضَرَبَهُ بِالْبَلَاءِ يَوْمَ الْأَرْبِعَاءِ، فَإِنَّهُ لَا يَبْدُو جُذَامٌ، وَلَا بَرَصٌ إِلَّا يَوْمَ الْأَرْبِعَاءِ، أَوْ لَيْلَةَ الْأَرْبِعَاءِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: ئەی نافیع خوێنی جەستەم زۆر بووە، بۆیە کەسێکم بۆ پەیدا بکە کە کەڵەشاخ بگرێ، وە ئەگەر توانیت با گەنج بێت، وە با پیرێکی بەتەمەن یان منداڵێکی بچووک نەبێت، چونکە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کەڵەشاخ گرتن لەسەر برسییەتی باشترەو شیفاو بەرەکەتی تێدایە، وە بیرو هۆش و توانای لەبەرکردن زیاد دەکات، بۆیە لەسەر بەرەکەتی خوا ڕۆژانی پێنج شەممە کەڵەشاخ بگرن، وە لە ڕۆژانی چوار شەممەو هەینی و شەممەو یەک شەممەدا خۆتان بەدوور بگرن لە کەڵەشاخ گرتن، وە لە ڕۆژانی دوو شەممەو سێ شەممەدا کەڵەشاخ بگرن، چونکە بەڕاستی ئەو ڕۆژەیە کە خوا پێغەمبەر ئەیوبی ﷺ لە نەخۆشی چاک کردەوە، وە لە ڕۆژی چوار شەممەدا تووشی نەخۆشییەکەی کرد، بەڕاستی نەخۆشی گولی و بەڵەکی سەرهەڵنادات تەنیا لە ڕۆژی چوار شەممەدا یان لە شەوی چوار شەممەدا نەبێت.

٣٤٨٨- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عُمَرَ، يَا نَافِعُ تَبَيَّغَ بِيَ الدَّمُ فَأْتِنِي بِحَجَّامٍ، وَاجْعَلْهُ شَابًّا، وَلَا تَجْعَلْهُ شَيْخًا، وَلَا صَبِيًّا، قَالَ: وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْحِجَامَةُ عَلَى الرِّيقِ أَمْثَلُ، وَهِيَ تَزِيدُ فِي الْعَقْلِ، وَتَزِيدُ فِي الْحِفْظِ، وَتَزِيدُ الْحَافِظَ حِفْظًا، فَمَنْ كَانَ مُحْتَجِمًا، فَيَوْمَ الْخَمِيسِ، عَلَى اسْمِ اللَّهِ، وَاجْتَنِبُوا الْحِجَامَةَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَيَوْمَ السَّبْتِ، وَيَوْمَ الْأَحَدِ، وَاحْتَجِمُوا يَوْمَ الِاثْنَيْنِ، وَالثُّلَاثَاءِ، وَاجْتَنِبُوا الْحِجَامَةَ يَوْمَ الْأَرْبِعَاءِ، فَإِنَّهُ الْيَوْمُ الَّذِي أُصِيبَ فِيهِ أَيُّوبُ بِالْبَلَاءِ، وَمَا يَبْدُو جُذَامٌ، وَلَا بَرَصٌ إِلَّا فِي يَوْمِ الْأَرْبِعَاءِ، أَوْ لَيْلَةِ الْأَرْبِعَاءِ»[٢].

---

(١) حسن.

(٢) ضعيف.

واتە: نافیع ﷺ دەڵێ: ئیبنو عومەر گوتی: ئەی نافیع خوێنی جەستەم زۆر بووە، جا کەسێکم بۆ بێنە کە کەڵەشاخ بگرێ، وە با گەنج بێ و پیر یان منداڵ نەبێ، گوتی: وە ئیبنو عومەر گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کەڵەشاخ گرتن لەسەر برسییەتی باشترەو بیرو هۆش زیاد دەکات، وە هەروەها توانای لەبەرکردنیش زیاد دەکات، وە کەسێک کە شت لەبەردەکات بیری فراوان و بەهێز دەکات، وە هەر کەسێ کەڵەشاخی گرت با ڕۆژی پێنج شەممە لەسەر ناوی خوا بیگرێ، وە لە ڕۆژانی هەینی و شەممەو یەک شەممەدا خۆتان بەدوور بگرن لە کەڵەشاخ گرتن، وە لە ڕۆژانی دوو شەممەو سێ شەممەدا کەڵەشاخ بگرن، وە لە ڕۆژی چوار شەممەدا کەڵەشاخ مەگرن و خۆتانی لێ بە دوور بگرن، چونکە بەڕاستی پێغەمبەر ئەیوب ﷺ لەو ڕۆژەدا تووشی بەڵاو نەخۆشییەکەی بوو، وە نەخۆشی گولی و بەڵەکی سەرهەڵنادەن تەنیا لە ڕۆژانی چوار شەممەدا یان لە شەوی چوار شەممەدا نەبێ.

## بابەت: داخکردن

**٣٤٨٩- عَنْ عَقَّارِ بْنِ الْمُغِيرَةِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنِ اكْتَوَى، أَوِ اسْتَرْقَى، فَقَدْ بَرِئَ مِنَ التَّوَكُّلِ»[١].**

واتە: عەققاری کوڕی موغیرە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خۆی داخ بکات یان نوشتە بکات ئەوە پشتی بە خوا نەبەستووەو تەوەکولی لەدەست داوە.

**٣٤٩٠- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنِ الْكَيِّ، فَاكْتَوَيْتُ، فَمَا أَفْلَحْتُ، وَلَا أَنْجَحْتُ»[٢].**

واتە: عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کرد لە خۆ داخکردن (بە مەبەستی چارەسەرکردن)، جا من خۆم داخکرد، بەڵام نە ڕزگارم بوو، نە سەرکەوتووش بووم (واتە: سوودی نەبوو بۆم).

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٠٥٥.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٦٥، والترمذي: ٢٠٤٩.

**٣٤٩١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: «الشِّفَاءُ فِي ثَلَاثٍ: شَرْبَةِ عَسَلٍ، وَشَرْطَةِ مِحْجَمٍ، وَكَيَّةٍ بِنَارٍ، وَأَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَيِّ» رَفَعَهُ[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: شیفاو چارەسەر لە سێ شت دایە: خواردنەوەی هەنگوین و نەشتەری کەڵەشاخ گرو داخکردن بە ئاگر، بەڵام من حەز لە خۆ داخکردن ناکەم بۆ گەلی خۆم. ئیبنو عەبباس ئەو فەرموودەیەی بەرز کردەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ.

## بابەت: ئەو کەسەی کە داخی کردوە

**٣٤٩٢-** عَنْ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَعْدِ بْنِ زُرَارَةَ الْأَنْصَارِيُّ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ عَمِّي يَحْيَى، وَمَا أَدْرَكْتُ رَجُلًا مِنَّا بِهِ شَبِيهًا، يُحَدِّثُ النَّاسَ أَنَّ أَسْعَدَ بْنَ زُرَارَةَ، وَهُوَ جَدُّ مُحَمَّدٍ مِنْ قِبَلِ أُمِّهِ، أَنَّهُ أَخَذَهُ وَجَعٌ فِي حَلْقِهِ، يُقَالُ لَهُ الذُّبْحَةُ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَأُبْلِغَنَّ أَوْ لَأُبْلِيَنَّ فِي أَبِي أُمَامَةَ عُذْرًا» فَكَوَاهُ بِيَدِهِ فَمَاتَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «مِيتَةَ سَوْءٍ لِلْيَهُودِ، يَقُولُونَ: أَفَلَا دَفَعَ عَنْ صَاحِبِهِ، وَمَا أَمْلِكُ لَهُ، وَلَا لِنَفْسِي شَيْئًا»[٢].

واتە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی سەعدی کوڕی زوڕاڕەی ئەنصاریی ﵁ دەڵێ: گوێم لە یەحیای مامم بوو کە هیچ کەسێکم نەبینیوە کە لەناوماندا وەکو ئەو ئامۆژگاری خەڵکی بکات و چاکەی خەڵکی بوێت، کە سەعدی کوڕی زوڕاڕە کە باپیری موحەممەدە لە دایکییەوە ئازارێک لە گەروویدا دروست بوو کە بەو نەخۆشییە دەگوترا: «الذبحة»، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوپەڕی هەوڵی خۆم دەدەم بۆ دەست نیشانکردن و چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی ئەبو ئومامە، مەگەر بە جۆرێک بێ لە دەسەڵاتی مندا نەبێ، جا بە دەستی خۆی داخی کرد، ئیتر مرد، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مردنەکە بوو بە بەهانەیەکی ناخۆش بە دەست جولەکانەوە، خوا بە خراپترین شێوە بیانمرێنێ، چونکە دەڵێن: بۆ نەیتوانی هاوڕێکەی لە مردن ڕزگار بکات، لەکاتێکدا کە من نە بۆ ئەوو نە بۆ خۆشم هیچم لە دەست نایێت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٨٠ و ٥٦٨١.

(٢) صحيح.

**٣٤٩٣-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «مَرِضَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ مَرَضًا، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ طَبِيبًا، فَكَوَاهُ عَلَى أَكْحَلِهِ»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: ئوبەی کوڕی کەعب تووشی نەخۆشییەک بوو، جا پێغەمبەر ﷺ پزیشکێکی بۆ نارد، ئەویش دەماری ناوەڕاستی باسکی بۆ داخکرد.

**أكحل:** دەمارێکە لە ناوەڕاستی باسکی دایەو پێشی دەگوترێ: دەماری ژیان.

**٣٤٩٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «كَوَى سَعْدَ بْنَ مُعَاذٍ فِي أَكْحَلِهِ مَرَّتَيْنِ»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دووجار ناوەڕاستی باسکی سەعدی کوڕی موعازی داخکرد.

## بابەت: چاو ڕشتن بە کل

**٣٤٩٥-** عَنْ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالْإِثْمِدِ، فَإِنَّهُ يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعَرَ»[٣].

واتە: سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گرنگی بدەن بە چاوڕشتن بە کل، چونکە بەڕاستی چاو پاک دەکاتەوەو بەهێزی دەکات، مووی برژانگیش دەڕوێنێتەوە.

**٣٤٩٦-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «عَلَيْكُمْ بِالْإِثْمِدِ عِنْدَ النَّوْمِ، فَإِنَّهُ يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعَرَ»[٤].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لەکاتی نوستندا گرنگی بە کلی ڕەش بدەن، چونکە بەڕاستی چاو پاک دەکاتەوەو بەهێزی دەکات، وە برژانگیش دەڕوێنێتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٠٧، وأبو داود: ٣٨٦٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٠٨، وأبو داود: ٣٨٦٦، والترمذي: ١٥٨٢ مطولًا.

(٣) حسن لغيره.

(٤) حسن.




٣٤٩٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ أَكْحَالِكُمُ الْإِثْمِدُ، يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعَرَ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاكترین كلی ئێوە كلی ڕەشە، چاو پاک دەكاتەوەو بەهێزی دەكات، وە برژانگیش دەڕوێنێتەوە.

## بابەت: ئەوەی كە بە تاک چاو دەڕێژێ

٣٤٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «مَنِ اكْتَحَلَ فَلْيُوتِرْ، مَنْ فَعَلَ، فَقَدْ أَحْسَنَ، وَمَنْ لَا، فَلَا حَرَجَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی چاو دەڕێژێ با بە تاک بیڕێژێ (واتە: كە دەیهێنێ بە هەر چاوێكیدا با تاک بێت)، ئەوەی وا دەكات ئەوە زۆرباش دەكات، ئەوەشی وا ناكات گوناهی ناگات.

٣٤٩٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: «كَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ مُكْحُلَةٌ، يَكْتَحِلُ مِنْهَا ثَلَاثًا، فِي كُلِّ عَيْنٍ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كلدانێكی هەبوو هەر لایەكی چاوی سێ جار دەڕشت.

## بابەت: ڕێگری كردن لە بەكارهێنانی ئارەق بۆ چارەسەركردن

٣٥٠٠- عَنْ طَارِقِ بْنِ سُوَيْدٍ الْحَضْرَمِيِّ ﵁، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ بِأَرْضِنَا أَعْنَابًا نَعْتَصِرُهَا، فَنَشْرَبُ مِنْهَا؟ قَالَ: «لَا» فَرَاجَعْتُهُ، قُلْتُ: إِنَّا نَسْتَشْفِي بِهِ لِلْمَرِيضِ، قَالَ: «إِنَّ ذَلِكَ لَيْسَ بِشِفَاءٍ، وَلَكِنَّهُ دَاءٌ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٧٨ و ٤٠٦١، والترمذي: ١٧٥٧، والنسائي: ٥١١٣.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٧٥٧ و ٢٠٤٨.

(٤) حسن. أخرجه مسلم: ١٩٨٤، وأبو داود: ٣٨٧٣، والترمذي: ٢٠٤٦.

واتە: تاریقی کوڕی سوەیدی حەزرەمیی ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زەوییەکانی ناوچەی ئێمە ترێی زۆرە، جا ئێمە ترێیەکە دەگوشین و ئاوەکەی دەخۆینەوە، فەرمووی: نەخێر نابێ، گوتی: دواتر سەردانیم کردەوەو گوتم: ئێمە ئەو شەڕابە وەکو چارەسەری بۆ نەخۆشەکان بەکاردێنین، فەرمووی: نەخێر ئەوە دەرمان نیە، بەڵکو دەردو نەخۆشییە.

## بابەت: بەکارهێنانی قورئان بۆ چارەسەری

٣٥٠١- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ الدَّوَاءِ الْقُرْآنُ»[١].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین چارەسەرو دەرمان قورئانە.

## بابەت: خەنە

٣٥٠٢- عَنْ سَلْمَى أُمُّ رَافِعٍ ﷺ، مَوْلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: «كَانَ لَا يُصِيبُ النَّبِيَّ ﷺ، قَرْحَةٌ وَلَا شَوْكَةٌ، إِلَّا وَضَعَ عَلَيْهِ الْحِنَّاءَ»[٢].

واتە: سەلما ئوممو ڕافیعی ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەر شوێنێکی بریندار ببووایە، یان دڕکێ بە قاچیدا بچووایە ئەوە خەنەی لەسەر دادەنا.

## بابەت: میزی وشتر

٣٥٠٣- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ نَاسًا مِنْ عُرَيْنَةَ، قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَاجْتَوَوْا الْمَدِينَةَ، فَقَالَ ﷺ: «لَوْ خَرَجْتُمْ إِلَى ذَوْدٍ لَنَا، فَشَرِبْتُمْ مِنْ أَلْبَانِهَا، وَأَبْوَالِهَا» فَفَعَلُوا[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٨٥٨، والترمذي: ٢٠٥٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٣، ومسلم: ١٦٧١، وأبو داود: ٤٣٦٤_٤٣٦٨، والترمذي: ٧٢ و ١٨٤٥ مختصراً، والنسائي: ٣٠٦.

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، کومەڵێ لە هۆزی عورەینە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، جا ئاوو هەوای مەدینەیان پێ نەکەوت و نەخۆشکەوتن، بۆیە شاری مەدینەیان پێ خۆش نەبوو، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ڕۆیشتبان بۆ دەرەوەی شار بۆ ناو ڕانە وشترەکانمان، وە لە شیرو میزی وشترەکانتان خواردبایەوە (تاوەکو چاک دەبنەوە)، ئەوانیش وایانکرد.

## بابەت: کاتێک مێش دەکەوێتە ناو دەفری خواردن

٣٥٠٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «فِي أَحَدِ جَنَاحَيِ الذُّبَابِ سُمٌّ، وَفِي الْآخَرِ شِفَاءٌ، فَإِذَا وَقَعَ فِي الطَّعَامِ، فَامْقُلُوهُ فِيهِ، فَإِنَّهُ يُقَدِّمُ السُّمَّ، وَيُؤَخِّرُ الشِّفَاءَ»[١].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باڵێکی مێش دەردو ژەهری پێوەیەو باڵەکەی تری چارەسەرو شیفا بەخشە، جا ئەگەر کەوتە ناو دەفرو قاپی یەکێکتانەوە کە خواردنی تێدابوو، ئەوە مێشەکە بە تەواوی نقوم بکەن تێیدا، چونکە مێش سەرەتا باڵە ژەهراوییەکەی پێش دەخات (دەخاتە ناو خواردنەکە)، وە باڵە شیفا بەخشەکەی دوادەخات.

٣٥٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي شَرَابِكُمْ، فَلْيَغْمِسْهُ فِيهِ، ثُمَّ لِيَطْرَحْهُ، فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ دَاءً، وَفِي الْآخَرِ شِفَاءً»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر مێش کەوتە ناو خواردنەوەکانتانەوە ئەوە لە ناویدا نقومی بکەن، پاشان فڕێی بدەن، چونکە یەکێک لە باڵەکانی دەردو ژەهری پێوەیەو باڵەکەی تری چارەسەرو شیفا بەخشە.

## بابەت: چاوەزار

٣٥٠٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «الْعَيْنُ حَقٌّ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٤٢٦٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٢٠ و ٥٧٨٢، وأبو داود: ٣٨٤٤.

(٣) صحيح متواتر.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی ڕەبیعە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چاوەزار ڕاستەو بوونی هەیە.

٣٥٠٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعَيْنُ حَقٌّ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاوەزار ڕاستەو بوونی هەیە.

٣٥٠٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ، فَإِنَّ الْعَيْنَ حَقٌّ»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەنابگرن بە خوا، چونکە بەڕاستی چاوەزار ڕاستەو بوونی هەیە.

٣٥٠٩- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ، قَالَ: مَرَّ عَامِرُ بْنُ رَبِيعَةَ بِسَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، وَهُوَ يَغْتَسِلُ فَقَالَ: لَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ، وَلَا جِلْدَ مُخَبَّأَةٍ فَمَا لَبِثَ أَنْ لُبِطَ بِهِ، فَأُتِيَ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ فَقِيلَ لَهُ: أَدْرِكْ سَهْلًا صَرِيعًا، قَالَ «مَنْ تَتَّهِمُونَ بِهِ» قَالُوا عَامِرَ بْنَ رَبِيعَةَ، قَالَ: «عَلَامَ يَقْتُلُ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ، إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مِنْ أَخِيهِ مَا يُعْجِبُهُ، فَلْيَدْعُ لَهُ بِالْبَرَكَةِ» ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَأَمَرَ عَامِرًا أَنْ يَتَوَضَّأَ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَرُكْبَتَيْهِ وَدَاخِلَةَ إِزَارِهِ، وَأَمَرَهُ أَنْ يَصُبَّ عَلَيْهِ قَالَ سُفْيَانُ: قَالَ مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ: وَأَمَرَهُ أَنْ يَكْفَأَ الْإِنَاءَ مِنْ خَلْفِهِ[3].

واتە: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ دەڵێ: عامیری کوڕی ڕەبیعە بەلای سەهلی کوڕی حونەیفدا ڕۆیشت کە خەریکی خۆ شۆردن بوو، جا گوتی: تا ئەوڕۆ هیچ پێستێکی ئاوا سپی و ناسکم نەبینیوە، هێندە پێ نەچوو کەوت و بریندار بوو، جا سەهلیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺو، پێیان گوت: تەماشای سەهل بکە چی لێهاتووە، ئەویش فەرمووی: کێ تۆمەتبار دەکەن (بەوەی کە چاوی لێدابێ)؟ گوتیان: عامیری کوڕی ڕەبیعە، فەرمووی: بۆچی یەکێک لە ئێوە براکەی بە کوشت دەدات، ئەگەر یەکێک شتێکی لە براکەی بینی کە پێی سەرسام بوو، ئەوە با دوعای بەرەکەتی بۆ بکات، پاشان داوای ئاوی کرد، وە فەرمانی بە عامیر کرد کە دەستنوێژ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٤٠، ومسلم: ٢١٨٧، وأبو داود: ٣٨٧٩.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح.

بگرێ و دەم و چاوی و دەستەکانی تا ئانیشک و قاچەکانی تا ئەژنۆ بشوات و ژێر جلەکانیشی بشوات، وە فەرمانی پێکرد کە ئاوەکە بەسەر سەهلدا بڕێژێ. سوفیان گوتی: موعمەڕ لە زوهرییەوە گوتی: وە فەرمانی پێکرد کە ئاوەکە لە پشتییەوە (پشتی سەهلەوە) بڕێـژێ.

## بابەت: ئەو کەسەی نزاو پاڕانەوە دەکات بۆ چاوەزار

**٣٥١٠- عَنْ عُبَيْدِ بْنِ رِفَاعَةَ الزُّرَقِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَتْ أَسْمَاءُ ﷺ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ بَنِي جَعْفَرٍ تُصِيبُهُمُ الْعَيْنُ، فَأَسْتَرْقِي لَهُمْ قَالَ: «نَعَمْ، فَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ، سَبَقَتْهُ الْعَيْنُ»[١].**

واتە: عوبەیدی کوڕی ڕیفاعەی زوڕەقیی ﷺ دەڵێ: ئەسماء ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ منداڵەکانی جەعفەر زوو زوو دەبن بە چاوەوە، ئایا دوعایان بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر شتێ پێش قەدەر بکەوتایە ئەوە چاوی پیس پێشی دەکەوت.

**٣٥١١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَيْنِ الْجَانِّ، ثُمَّ أَعْيُنِ الْإِنْسِ، فَلَمَّا نَزَلَتِ الْمُعَوِّذَتَانِ، أَخَذَهُمَا وَتَرَكَ مَا سِوَى ذَلِكَ»[٢].**

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت بە خوا لە چاوپیسی جنۆکەکان، پاشان لە چاوپیسی مرۆڤ، جا کاتێ ئەم دوو سووڕەتە: «الفلق» و «الناس» دابەزین، ئیتر هەر ئەو دوو سووڕەتەی دەخوێندو وازی لە دوعاکانی تر هێنا لەوبارەیەوە.

**٣٥١٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «أَمَرَهَا أَنْ تَسْتَرْقِيَ مِنَ الْعَيْنِ»[٣].**

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردوە کە دوعا بکات بۆ (خۆ پاراستن لە) چاوەزار.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٠٥٩.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٠٥٨، والنسائي: ٥٤٩٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٣٨، ومسلم: ٢١٩٥.

## بابەت: ئەوەی ڕێگە دراوە دوعای بۆ بکرێ

٣٥١٣- عَنْ بُرَيْدَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا رُقْيَةَ إِلَّا مِنْ عَيْنٍ، أَوْ حُمَةٍ»[١].

واتە: بورەیدە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوعاکردن دروست نیە مەگەر بۆ چاوەزارو چارەسەری ژەهر بێت.

٣٥١٤- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، أَنَّ خَالِدَةَ بِنْتَ أَنَسٍ أُمَّ بَنِي حَزْمٍ السَّاعِدِيَّةَ ﷺ، جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ: «فَعَرَضَتْ عَلَيْهِ الرُّقَى، فَأَمَرَهَا بِهَا»[٢].

واتە: ئەبو بەکری کوڕی موحەممەد دەگێڕێتەوە، خالیدەی کچی ئەنەس کە دایکی منداڵەکانی حەزمی ساعیدییە ﷺ هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو شێوازی نزاکانی خۆی پیشاندا، ئەویش ڕێگەیدا کە بیکات.

٣٥١٥- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ أَهْلُ بَيْتٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، يُقَالُ لَهُمْ آلُ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، يَرْقُونَ مِنَ الْحُمَةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَدْ نَهَى عَنِ الرُّقَى، فَأَتَوْهُ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ قَدْ نَهَيْتَ عَنِ الرُّقَى، وَإِنَّا نَرْقِي مِنَ الْحُمَةِ، فَقَالَ لَهُمْ: «اعْرِضُوا عَلَيَّ» فَعَرَضُوهَا عَلَيْهِ، فَقَالَ: «لَا بَأْسَ بِهَذِهِ، هَذِهِ مَوَاثِيقُ»[٣].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: دانیشتوانی ماڵێک لە ئەنصارییەکان کە پێیان دەگوترا: بنەماڵەی عەمری کوڕی حەزم دوعایان دەکرد بۆ چارەسەری ژەهر، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردبوو لە دوعاکردن، جا هاتن بۆ خزمەتی و گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان جەنابت ڕێگریت کردوە لە دوعاکردن، وە ئێمە دوعا دەکەین بۆ چارەسەری ژەهر، پێیانی فەرموو: پێمی نیشان بدەن، ئەوانیش پێیان نیشاندا، ئنجا فەرمووی: ئەوە هیچ کێشەیەکی تێدانیە، ئەوە لەوانەیە کە جێی متمانەن.

٣٥١٦- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «رَخَّصَ فِي الرُّقْيَةِ مِنَ الْحُمَةِ، وَالْعَيْنِ، وَالنَّمْلَةِ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٩٩.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٩٦، والترمذي: ٢٠٥٦.

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داوە بە دوعاکردن بۆ چارەسەری ژەهرو بۆ چاوەزارو بۆ چارەسەری ئەو کێم و زوخاوەی لە کەلەکەوە دەردەچێ.

## بابەت: دوعاکردن بۆ مارو دووپشک

**٣٥١٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فِي الرُّقْيَةِ مِنَ الْحَيَّةِ، وَالْعَقْرَبِ»[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی داوە بە دوعاکردن بۆ خۆپاراستن لە مارو دووپشک.

**٣٥١٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: لَدَغَتْ عَقْرَبٌ رَجُلًا، فَلَمْ يَنَمْ لَيْلَتَهُ، فَقِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ إِنَّ فُلَانًا لَدَغَتْهُ عَقْرَبٌ فَلَمْ يَنَمْ لَيْلَتَهُ، فَقَالَ: «أَمَا إِنَّهُ لَوْ قَالَ حِينَ أَمْسَى: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، مَا ضَرَّهُ لَدْغُ عَقْرَبٍ حَتَّى يُصْبِحَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: دووپشکەیەک بە کابرایەکی وەدا، جا شەوەکە خەوی لێنەکەوت، ئنجا بە پێغەمبەر ﷺ گوترا: فڵان کەس دووپشک پێوەی داوەو شەوەکەی خەوی لێنەکەوتووە، ئەویش فەرمووی: بەڕاستی خۆ ئەگەر هاتباو سەر لە ئێوارە بیگوتبا: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)، واتە: پەنا دەگرم بە هەموو کەلیماتە تەواوەکانی خوا لە شەڕو خراپەی دروستکراوەکانی، ئەوە تاوەکو بەیانی تووشی پێوەدانی دووپشکە نەدەبوو.

**٣٥١٩-** عَنْ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ ﷺ، قَالَ: «عَرَضْتُ النَّهْشَةَ مِنَ الْحَيَّةِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَرَ بِهَا»[٣].

واتە: عەمری کوڕی حەزم ﷺ دەڵێ: شوێنی گەزی مارم بە پێغەمبەری خوا ﷺ نیشاندا، ئەویش ڕێگەیدا کە دوعای بۆ بکرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٤١، ومسلم: ٢١٩٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٠٩، وأبو داود: ٣٩٠٠.

(٣) حسن لغيره.

## بابەت: ئەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ پەنای بە خوا گرتووە لێیان و ئەوەشی کە پێغەمبەر ﷺ پێی پەنا گیراوە بە خودا

٣٥٢٠- عَنْ عَائِشَةَ ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَتَى الْمَرِيضَ فَدَعَا لَهُ قَالَ: «أَذْهِبِ الْبَاسْ رَبَّ النَّاسْ، وَاشْفِ أَنْتَ الشَّافِي لَا شِفَاءَ، إِلَّا شِفَاؤُكَ شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا»[١].

واتە: عائیشە  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەهات بۆ لای نەخۆشێ دوعای بۆ دەکرد، دەیفەرموو: پەروەردگاری خەڵکی ئەو ئێش و ئازارە لابەرە، وە شیفای بدە تۆ شیفا بەخشی، جگە لە تۆ شیفا بەخشی تر نیە، شیفایەکی وەها کە هیچ دەردو نەخۆشیێ بەجێ نەهێڵێ.

٣٥٢١- عَنْ عَائِشَةَ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ مِمَّا يَقُولُ لِلْمَرِيضِ بِبُزَاقِهِ بِإِصْبَعِهِ «بِسْمِ اللَّهِ، تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، لِيُشْفَى سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا»[٢].

واتە: عائیشە  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەو دوعایانەی کە بۆ نەخۆشی دەکرد ئەوەبوو کە پەنجەی شایەتومانی بە تف دەکردو دەیخستە سەر زەوی، وە ئەو خۆڵەی کە بە دەستییەوە دەنووسا دەیخستە سەر شوێنی ئازارەکەو دەیفەرموو: (بِسْمِ اللَّهِ، تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، لِيُشْفَى سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا)، واتە: بە ناوی خوا دوعات بۆ دەکەم، ئەوە خۆڵی خاکی خۆمانە بە لیکی دەمی مسوڵمانێ لە خۆمان، بە ئیزنی خوا دەبێتە شیفا بۆ نەخۆشمان.

٣٥٢٢- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ الثَّقَفِيِّ ، أَنَّهُ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَبِي وَجَعٌ، قَدْ كَادَ يُبْطِلُنِي، فَقَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: «اجْعَلْ يَدَكَ الْيُمْنَى عَلَيْهِ، وَقُلْ بِسْمِ اللَّهِ أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللَّهِ، وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ، وَأُحَاذِرُ، سَبْعَ مَرَّاتٍ، فَقُلْتُ ذَلِكَ، فَشَفَانِيَ اللَّهُ»[٣].

واتە: عوسمانی کوڕی ئەبو عاصی سەقەفیی  دەڵێ: چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺو ئازارێکم هەبوو کە خەریک بوو لە ناوم بەرێ، جا پێغەمبەر ﷺ پێمی فەرموو: دەستی

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٧٥، ومسلم: ٢١٩١، والترمذي: ٣٤٩٦ ذكر آخر الحديث.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٤٥ و ٥٧٤٦، ومسلم: ٢١٩٤، وأبو داود: ٣٨٩٥.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٠٢، وأبو داود: ٣٨٩١، والترمذي: ٢٠٨٠.





ڕاستت بخەرە سەر شوێنی ئازارەکەو حەوت جار، بڵێ: (بِسْمِ اللَّهِ أَعُوذُ بِعِزَّةِ اللَّهِ، وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ، وَأُحَاذِرُ)، واتە: بە ناوی خوا، پەنا دەگرم بە دەسەڵاتی خواو بە توانایی ئەو لە زیانی ئەو ئازارەی کە هەستی پێدەکەم و مەترسیم لێی هەیە، منیش وامگوت، ئیتر خوا شیفای دام و ئازارەکەم نەما.

**٣٥٢٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ جِبْرَائِيلَ، أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ اشْتَكَيْتَ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، قَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنٍ، أَوْ حَاسِدٍ اللَّهُ يَشْفِيكَ، بِسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ»**[1].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، جیبریل هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو فەرمووی: ئەی موحەممەد ﷺ نەخۆشیت؟ فەرمووی: بەڵێ، (جیبریل) فەرمووی: بە ناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم لە زیانی هەموو شتێ کە ئازارت بدات، لە شەڕو خراپەی هەموو نەفسێک، یان لە چاوی پیس، یان لە کەسی حەسوود، خوا شیفات بدات، بە ناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم.

**٣٥٢٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُنِي، فَقَالَ لِي «أَلَا أَرْقِيكَ بِرُقْيَةٍ جَاءَنِي بِهَا جِبْرَائِيلُ؟» قُلْتُ: بِأَبِي، وَأُمِّي بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ، وَاللَّهُ يَشْفِيكَ، مِنْ كُلِّ دَاءٍ فِيكَ، مِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ، وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»**[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بۆ سەردانی کردنم هاتبوو، جا پێمی فەرموو: ئایا دوعایەکت بۆ نەکەم کە جیبریل بۆی هێناوم و فێری کردووم، گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دایک و باوکمەوە بەفیدات بم، سێ جار فەرمووی: (بِسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ، وَاللَّهُ يَشْفِيكَ، مِنْ كُلِّ دَاءٍ فِيكَ، مِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ، وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ)، واتە: بە ناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم، وە خوا شیفای گشت نەخۆشییەکانت بدات و چارەسەرت بکات، لە شەڕو خراپەو زیانی ئەو کەسانەی جادوو دەکەن و فوو دەکەن بە گرێکاندا، وە لە شەڕو خراپەو زیانی هەر حەسودێک کاتێک حەسودیی و ئێرەیی دەبات.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٨٦، والترمذي: ٩٧٢.

(٢) ضعيف.

**٣٥٢٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعَوِّذُ الْحَسَنَ، وَالْحُسَيْنَ، يَقُولُ: «أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ، مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ» قَالَ: «وَكَانَ أَبُونَا إِبْرَاهِيمُ يُعَوِّذُ بِهَا إِسْمَاعِيلَ، وَإِسْحَاقَ» أَوْ قَالَ: «إِسْمَاعِيلَ، وَيَعْقُوبَ»[1].

**واتە:** ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دوعای پەناگرتنی بۆ حەسەن و حوسەین دەکردو دەیفەرموو: پەناتان دەدەم بە وشە تەواوەکانی خوا لە شەڕو خراپەی هەموو شەیتانێک و گیانەوەرانی ژەهردار، وە لە هەموو چاوێکی پیس. فەرمووی: وە ئیبراهیمی باوکیشمان بەو جۆرە دوعای پەناگرتنی بۆ ئیسماعیل و ئیسحاق دەکرد، یان فەرمووی: ئیسماعیل و یەعقووب.

## بابەت: ئەو شتەی کە پەنای پێ دەگیرێ لە تا

**٣٥٢٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُعَلِّمُهُمْ مِنَ الْحُمَّى، وَمِنَ الْأَوْجَاعِ كُلِّهَا، أَنْ يَقُولُوا: «بِسْمِ اللَّهِ الْكَبِيرِ، أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ، مِنْ شَرِّ عِرْقٍ نَعَّارٍ، وَمِنْ شَرِّ حَرِّ النَّارِ»[2].

**واتە:** ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فێری دەکردن لە کاتی تا لێهاتن و هەر ئازارێکدا کە بڵێن: بە ناوی خوا، پەنا دەگرم بە خوای باڵاو شکۆمەند لە شەڕو خراپەی هەموو فیچقەیەکی خوێن بەربوون، وە لە شەڕو خراپەی گەرمی ئاگر.

**٣٥٢٦م-** حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الدِّمَشْقِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي فُدَيْكٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي حَبِيبَةَ الْأَشْهَلِيُّ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ الْحُصَيْنِ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ وَقَالَ: «مِنْ شَرِّ عِرْقٍ يَعَّارٍ»[3].

**واتە:** بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێردراوەتەوە، بە بێژەی: {وَقَالَ: «مِنْ شَرِّ عِرْقٍ يَعَّارٍ»}.

**٣٥٢٧-** عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁، يَقُولُ: أَتَى جِبْرَائِيلُ ﵇، النَّبِيَّ ﷺ، وَهُوَ يُوعَكُ، فَقَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ حَسَدِ حَاسِدٍ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ، اللَّهُ يَشْفِيكَ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٧١، وأبو داود: ٤٧٣٧، والترمذي: ٢٠٦٠.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٠٧٥.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٠٧٥.

(٤) حسن.

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: جیبریل ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کاتێک ئازارێکی بە ئێشی هەبوو، جا (جیبریل) فەرمووی: بە ناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم، خوا شیفات بدات لە هەر شتێک کە ئازارت دەدات، لە حەسوودی پێبردنی کەسی حەسوود، لە هەموو چاوپیسی و چاوەزارێک.

## بابەت: فووکردن لە کاتی دوعاکردندا

**٣٥٢٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «كَانَ يَنْفُثُ فِي الرُّقْيَةِ»[١].**

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ نزای دەکرد (بە خوێندنی سوورەتەکانی «الفلق» و «الناس») فووی دەکرد بەسەر دەستەکانیدا، پاشان دەیهێنا بە خۆیدا لەکاتی خوێندنی نزاکاندا.

**٣٥٢٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا اشْتَكَى يَقْرَأُ عَلَى نَفْسِهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ وَيَنْفُثُ، فَلَمَّا اشْتَدَّ وَجَعُهُ كُنْتُ أَقْرَأُ عَلَيْهِ، وَأَمْسَحُ عَلَيْهِ بِيَدِهِ، رَجَاءَ بَرَكَتِهَا»[٢].**

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئێش و ئازارێکی ببووایە سوورەتەکانی «الفلق» و «الناس»ـی بەسەر خۆیدا دەخوێندەوەو، فووی دەکرد بەسەر خۆیدا، جا کاتێ کە نەخۆشی زۆری بۆ هێنا من ئەو دوو سوورەتەم بەسەردا دەخوێند، وە دەستی پێغەمبەرم ﷺ دەگرت دەمهێنا بە جەستەیدا بە هیوای فەڕو بەرەکەت.

## بابەت: هەڵواسینی نوشتە

**٣٥٣٠- عَنْ زَيْنَبَ ﷺ قَالَتْ: كَانَتْ عَجُوزٌ تَدْخُلُ عَلَيْنَا تَرْقِي مِنَ الْحُمْرَةِ، وَكَانَ لَنَا سَرِيرٌ طَوِيلُ الْقَوَائِمِ، وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ إِذَا دَخَلَ تَنَحْنَحَ وَصَوَّتَ، فَدَخَلَ يَوْمًا فَلَمَّا سَمِعَتْ صَوْتَهُ احْتَجَبَتْ مِنْهُ، فَجَاءَ فَجَلَسَ إِلَى جَانِبِي فَمَسَّنِي فَوَجَدَ مَسَّ خَيْطٍ فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَقُلْتُ: رُقًى لِي فِيهِ مِنَ الْحُمْرَةِ فَجَذَبَهُ وَقَطَعَهُ فَرَمَى بِهِ وَقَالَ: لَقَدْ أَصْبَحَ آلُ عَبْدِ اللَّهِ أَغْنِيَاءَ عَنِ الشِّرْكِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ الرُّقَى، وَالتَّمَائِمَ، وَالتِّوَلَةَ شِرْكٌ»، قُلْتُ: فَإِنِّي خَرَجْتُ يَوْمًا فَأَبْصَرَنِي فُلَانٌ، فَدَمَعَتْ**

---

(١) صحيح. انظر البخاري: ٤٤٣٩، ومسلم: ٢١٩٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠١٦، ومسلم: ٢١٩٢، وأبو داود: ٣٩٠٢.

**عَيْنِي الَّتِي تَلِيهِ، فَإِذَا رَقَّيْتُهَا سَكَنَتْ دَمْعَتُهَا، وَإِذَا تَرَكْتُهَا دَمَعَتْ، قَالَ: ذَاكِ الشَّيْطَانُ، إِذَا أَطَعْتِهِ تَرَكَكِ، وَإِذَا عَصَيْتِهِ طَعَنَ بِإِصْبَعِهِ فِي عَيْنِكِ، وَلَكِنْ لَوْ فَعَلْتِ كَمَا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَانَ خَيْرًا لَكِ، وَأَجْدَرَ أَنْ تُشْفَيْنَ تَنْضَحِينَ فِي عَيْنِكِ الْمَاءَ وَتَقُولِينَ: «أَذْهِبِ الْبَاسْ رَبَّ النَّاسْ، اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا»**[1].

واتە: زەینەب ﷺ دەڵێ: پیرەژنێک سەردانمانی دەکردو نوشتەی دەکرد بۆ چارەسەری زیپکەو سووربوونەوەی سەر پێست (نەخۆشییەکی پێستە)، وە ئێمە جێگای خەوێکمان هەبوو کە پێچکەکانی درێژ بوون، جا عەبدوڵلا هەرکاتێ دەهاتەوە ماڵەوە کۆخە کۆخی دەکردو دەنگی بەرز دەکردەوە، ڕۆژێکیان هاتەوە ماڵەوە، جا کاتێ پیرەژنەکە گوێی لە دەنگی بوو خۆی داپۆشی، ئەویش هات و لە تەنیشت من دانیشت، وە دەستی لێدام و دەستی بەر داوە بەنێک کەوت (کە بە باسکییەوە بوو)، گوتی: ئەوە چییە؟ گوتم: نوشتەیەکە کە بۆ چارەسەری زیپکەو سووربوونەوەی سەر پێست باشە، ئەویش داوە بەنەکەی ڕاکێشاو لەت لەتی کردو فڕێیدا، وە گوتی: بەڕاستی بنەماڵەی عەبدوڵلا بێ پێویستی بوون لە هاوبەشی دانان بۆ خوا، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: نوشتەو چاوەزار نوشتەی چەورو شیرینی هاوبەش بۆ خوا دانانە (ئەگەر بەپێی قورئان و سوننەت نەکرێن و شەرعی نەبن)، گوتم: دەنا من ڕۆژێک ڕۆیشتمە دەرەوە فلانە کەس چاوی پێم کەوت، جا ئەو چاوەم کە دوعای لەسەر خوێند فرمێسکی لێ دەهات، ئیتر هەرکاتێ ئەو دوعایەم دەخوێند (کە ئەو کەسە فێری کردبووم) فرمێسک هاتنەکە دەوەستا، وە هەرکات نەمخوێندبایە فرمێسکی لێ دەهات، گوتی: ئا ئەوە شەیتانە، کاتێ گوێڕایەڵیت کرد وازت لێدێنێ، وە کاتێ سەرپێچیت کرد پەنجە دەخاتە ناو چاوتەوە، بەڵکو ئەگەر ئەوەت کردبا کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردی بۆت باشتر بوو ئومێدی چاکبوونەوەشی زیاتر بوو، کە ئاوت لە چاوت بپرژاندبایەو بتگوتبا: پەروەردگاری خەڵکی ئەو ئێش و ئازارە لابەرە، شیفای بدە تۆ شیفا بەخشی، جگە لە شیفای تۆ هیچ شیفایەکی تر نیە، شیفایەکی وەها هیچ دەردو نەخۆشییەک بەجێ نەهێڵێ.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٨٨٣.

٣٥٣١- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: رَأَى رَجُلًا فِي يَدِهِ حَلْقَةٌ مِنْ صُفْرٍ فَقَالَ: «مَا هَذِهِ الْحَلْقَةُ؟» قَالَ: هَذِهِ مِنَ الْوَاهِنَةِ. قَالَ: «انْزِعْهَا فَإِنَّهَا لَا تَزِيدُكَ إِلَّا وَهْنًا»[١].

واته: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی ئاڵقەیەکی مسی لە دەستدا بوو، جا فەرمووی: ئەو ئاڵقەیە چییە؟ گوتی: ئەوە بۆ چارەسەری نەخۆشی لاوازی و بێهێزییە، فەرمووی: لە دەستت دەریبهێنەو داینێ، چونکە ئەوە تەنیا نەخۆشییەکەت زیاد دەکات و هیچ سوودیی نیە بۆت.

## بابەت: نوشتەی شێتی

٣٥٣٢- عَنْ أُمِّ جُنْدُبٍ ﷺ، قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، مِنْ بَطْنِ الْوَادِي يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ انْصَرَفَ وَتَبِعَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمٍ، وَمَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا بِهِ بَلَاءٌ لَا يَتَكَلَّمُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ هَذَا ابْنِي وَبَقِيَّةُ أَهْلِي، وَإِنَّ بِهِ بَلَاءً لَا يَتَكَلَّمُ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ائْتُونِي بِشَيْءٍ مِنْ مَاءٍ»، فَأُتِيَ بِمَاءٍ فَغَسَلَ يَدَيْهِ وَمَضْمَضَ فَاهُ ثُمَّ أَعْطَاهَا، فَقَالَ: «اسْقِيهِ مِنْهُ، وَصُبِّي عَلَيْهِ مِنْهُ، وَاسْتَشْفِي اللَّهَ لَهُ». قَالَتْ: فَلَقِيتُ الْمَرْأَةَ فَقُلْتُ: لَوْ وَهَبْتِ لِي مِنْهُ، فَقَالَتْ: إِنَّمَا هُوَ لِهَذَا الْمُبْتَلَى، قَالَتْ: فَلَقِيتُ الْمَرْأَةَ مِنَ الْحَوْلِ فَسَأَلْتُهَا عَنِ الْغُلَامِ، فَقَالَتْ: بَرَأَ وَعَقَلَ عَقْلًا لَيْسَ كَعُقُولِ النَّاسِ[٢].

واتە: ئوممو جوندوب ﷺ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژندا لەناو شیوەکەدا بەردبارانی جەمرەی عەقەبەی کرد، پاشان ڕۆیشت، ئافرەتێکی خەثعەمی بەدوای کەوت کە منداڵێکی خۆی لەگەڵ بوو تووشی نەخۆشییەک ببوو کە نەیدەتوانی قسە بکات، جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە کوڕمەو پاشماوەی خانەوادەکەمە، وە تووشی نەخۆشییەک بووە کە قسە ناکات، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئاوم بۆ بهێنن، جا کە ئاویان بۆ هێنا، دەستەکانی شۆردو ئاوی لە دەمی ڕادا، پاشان دای بە ئافرەتەکە، وە فەرمووی: لەو ئاوە دەرخواردی بدەو بەسەریشیدا بڕێژەو، داوای شیفای بۆ لە خوا بکە، (ئوممو جوندوب) گوتی: جا بەو ژنە گەیشتمەوەو گوتم: ئەگەر تۆزێک لەو ئاوەت پێدابام، ئەویش گوتی: ئەو ئاوە بۆ ئەو نەخۆشەیە (واتە:

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.



کوڕەکەی)، گوتی: دوای ساڵێک بەو ئافرەتە گەیشتمەوەو پرسیاری کوڕەکەیم لێکرد، ئەویش گوتی: چاک بۆتەوەو ئاقڵ بوونێک ئاقڵ بووە کە لە هی خەڵکی تر ناچێ (واتە: لە خەڵکی ئاقڵترە).

**النشرة:** جۆرێکی نوشتەیە بۆ ئەو کەسەی کەوا گومان دەبرێ جنۆکە دەستی لێ وەشاندبێ.

## بابەت: داواکردنی شیفا بە هۆی قورئانەوە

**٣٥٣٣-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ الدَّوَاءِ الْقُرْآنُ»[١].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قورئان باشترین دەرمان و چارەسەرە.

## بابەت: کوشتنی ئەو جۆرە مارەی کە دوو هێڵی ڕەشی وەک هێڵی پەلکە خورما بەسەر پشتییەوەیەتی

**٣٥٣٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِقَتْلِ ذِي الطُّفْيَتَيْنِ، فَإِنَّهُ يَلْتَمِسُ الْبَصَرَ، وَيُصِيبُ الْحَبَلَ»، يَعْنِي حَيَّةً خَبِيثَةً[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە کوشتنی ئەو جۆرە مارەی کە دوو هێڵی ڕەشی وەک هێڵی پەلکە خورما بەسەر پشتییەوەیەتی، چونکە ئەو جۆرە مارە ئاوی چاو دەبات و سک لەباری ژن دەبات. (ڕاوی دەڵێ:) مەبەستی: مارێکی زۆر پیسە.

**٣٥٣٥-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ، وَاقْتُلُوا ذَا الطُّفْيَتَيْنِ وَالْأَبْتَرَ، فَإِنَّهُمَا يَلْتَمِسَانِ الْبَصَرَ، وَيُسْقِطَانِ الْحَبَلَ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٠٨، ومسلم: ٢٢٣٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٩٧، ومسلم: ٢٢٣٣، وأبو داود: ٥٢٥٢، والترمذي: ١٤٨٣.

واتە: سالیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو جۆرە مارێک بکوژن، بە تایبەتی ئەو جۆرە کە دوو هێڵی ڕەشی بەسەر پشتییەوەیەو ماری کلک کورت، چونکە ئەو دوو جۆرە مارە ئاوی چاو دەبەن (چاو کز دەکەن)، منداڵی ناو سک لەبار دەبەن.

## بابەت: ئەو کەسەی نوخشەلێدانی پێ خۆشەو، ڕقی لە نوقڵانە لێدانە

٣٥٣٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْجِبُهُ الْفَأْلُ الْحَسَنُ، وَيَكْرَهُ الطِّيَرَةَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە نوخشەلێدان بە چاکە دڵخۆش دەبوو، وە ڕقی لە شووم و نوقڵانە لێدان بوو بە خراپە (واتە: گەشبینی پێ خۆش بوو، ڕقی لە ڕەشبینی بوو).

٣٥٣٧- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا عَدْوَى، وَلَا طِيَرَةَ، وَأُحِبُّ الْفَأْلَ الصَّالِحَ»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: گواستنەوەی نەخۆشی و شووم هێنان بوونی نیە، وە من نوخشەلێدانی بە چاکەم پێ خۆشە.

٣٥٣٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الطِّيَرَةُ شِرْكٌ وَمَا مِنَّا إِلَّا وَلَكِنَّ اللَّهَ يُذْهِبُهُ بِالتَّوَكُّلِ»[٣].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شومیەتی و نوقڵانە لێدان لە هاوبەش بۆ خوا دانانەوەیە، هەموومان لە دڵدا شومیەتی دەدەینە پاڵ شت، بەڵام خوا ئەو ئەندێشەو خەیاڵانە ناهێڵێ لە دڵدا بە هۆی پشت بەستن بە خواوە.

٣٥٣٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا عَدْوَى، وَلَا طِيَرَةَ، وَلَا هَامَةَ، وَلَا صَفَرَ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٩٧، ومسلم: ٢٢٣٣، وأبو داود: ٥٢٥٢، والترمذي: ١٤٨٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٥٦ و ٥٧٧٦، ومسلم: ٢٢٢٤، وأبو داود: ٣٩١٦، والترمذي: ١٦١٥.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٩١٠، والترمذي: ١٦١٤.

(٤) صحيح.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەنینەوەی نەخۆشی و نوقڵانە لێدان و شومی بە هۆی باڵندەی کوندەپەپووەوەو شومی بەهۆی هاتنی مانگی صەفەرەوە بوونیان نیە.

**٣٥٤٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا عَدْوَى، وَلَا طِيَرَةَ، وَلَا هَامَةَ». فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الْبَعِيرُ يَكُونُ بِهِ الْجَرَبُ فَتَجْرَبُ بِهِ الْإِبِلُ، قَالَ: «ذَلِكَ الْقَدَرُ، فَمَنْ أَجْرَبَ الْأَوَّلَ»[١].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەنینەوەی نەخۆشی (بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە تاکێکی توشبووەوە بۆ تاکێکی توشنەبوو) بوونی نیە، هەروەها ڕەش بینی و نوقڵانە لێدان بوونی نیە، وە هەروەها ڕەش بینی بەهۆی (بینینی باڵندەی) کوندەپەپووەوە (کە باڵندەیەکی دیاری کراو بووە لەسەردەمی خۆیدا) بوونی نیە، پیاوێکی دەشتەکی هەڵساوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدی ئەو وشترانە چی کە تووشی نەخۆشی گەڕی (گولی) دەبن، پاشان وشترەکانی تریش تووشی هەمان نەخۆشی دەکەن؟ فەرمووی: ئا ئەوە بریتیە لە قەدەر، ئەی کێ هی یەکەمی تووشی ئەو نەخۆشییە کرد؟

**٣٥٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُورِدُ الْمُمْرِضُ عَلَى الْمُصِحِّ»[٢].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با (وشتری) نەخۆش نەبرێتە لای ئەوانەی کە لەش ساغن.

## بابەت: گولی (گەڕی)

**٣٥٤٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَخَذَ بِيَدِ رَجُلٍ مَجْذُومٍ فَأَدْخَلَهَا مَعَهُ فِي الْقَصْعَةِ، ثُمَّ قَالَ: «كُلْ، ثِقَةً بِاللَّهِ وَتَوَكُّلًا عَلَى اللَّهِ»[٣].**

---

(١) صحيح دون قوله: «ذَلِكَ الْقَدَرُ».

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٧١، ومسلم: ٢٢٢١، وأبو داود: ٣٩١١ مطولًا.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٩٢٥، والترمذي: ١٨١٧.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی پیاوێکی گولی گرت و لەگەڵیدا دەستی کرد بە نان خواردن لە دەفرێکدا، پاشان فەرمووی: بخۆ بە ناوی خوا، بە متمانەبوون بە خواو پشت بەستن بە خواوە.

**٣٥٤٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا تُدِيمُوا النَّظَرَ إِلَى الْمَجْذُومِينَ»[١].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام سەیری ئەوانە مەکەن کەوا گەڕو گولن.

**٣٥٤٤- عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ آلِ الشَّرِيدِ يُقَالُ لَهُ: عَمْرٌو عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ فِي وَفْدِ ثَقِيفٍ رَجُلٌ مَجْذُومٌ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ «ارْجِعْ فَقَدْ بَايَعْنَاكَ»[٢].**

واتە: یەعلای کوڕی عەتاء ﷺ لە پیاوێکی بنەماڵەی شەریدەوە کە پێی دەگوترا: عەمر لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لەناو وەفدی سەقیفدا پیاوێکی گولی تێدا بوو، جا پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆلای کە بگەڕێتەوە، بێگومان ئەوە بەیعەت و پەیمانمان لێ وەرگرتی.

## بابەت: جادوو

**٣٥٤٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: سَحَرَ النَّبِيَّ ﷺ يَهُودِيٌّ مِنْ يَهُودِ بَنِي زُرَيْقٍ يُقَالُ لَهُ لَبِيدُ بْنُ الْأَعْصَمِ، حَتَّى كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَفْعَلُ الشَّيْءَ وَلَا يَفْعَلُهُ، قَالَتْ: حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ - أَوْ كَانَ ذَاتَ لَيْلَةٍ - دَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ دَعَا، ثُمَّ دَعَا، ثُمَّ قَالَ: «يَا عَائِشَةُ أَشَعَرْتِ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ؟ جَاءَنِي رَجُلَانِ، فَجَلَسَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي، وَالْآخَرُ عِنْدَ رِجْلِي فَقَالَ: الَّذِي عِنْدَ رَأْسِي لِلَّذِي عِنْدَ رِجْلِي - أَوِ الَّذِي عِنْدَ رِجْلِي لِلَّذِي عِنْدَ رَأْسِي - مَا وَجَعُ الرَّجُلِ قَالَ: مَطْبُوبٌ. قَالَ: مَنْ طَبَّهُ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ الْأَعْصَمِ. قَالَ: فِي أَيِّ شَيْءٍ؟ قَالَ: فِي مُشْطٍ، وَمُشَاطَةٍ، وَجُفِّ طَلْعَةِ ذَكَرٍ. قَالَ: وَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ: فِي بِئْرِ ذِي أَرْوَانَ» قَالَتْ: فَأَتَاهَا النَّبِيُّ ﷺ فِي أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: «وَاللَّهِ يَا عَائِشَةُ لَكَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّاءِ، وَلَكَأَنَّ نَخْلَهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ» قَالَتْ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلَا أَحْرَقْتَهُ؟ قَالَ: «لَا، أَمَّا أَنَا فَقَدْ عَافَانِي اللَّهُ، وَكَرِهْتُ أَنْ أُثِيرَ عَلَى النَّاسِ مِنْهُ شَرًّا» فَأَمَرَ بِهَا فَدُفِنَتْ[٣].**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٣١، والنسائي: ٤١٨٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٦٨ و ٥٧٦٦، ومسلم: ٢١٨٩.

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: جولەکەیەک لە جولەکەکانی بەنو زورەیق کە پێی دەگوترا: لەبیدی کوڕی ئەعصەم جادووی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، تاوەکو وای لێهات پێغەمبەر ﷺ وای بە خەیاڵدا دەهات کە شتێک دەکات و نەشی دەکرد، تاوەکو ڕۆژێک یان شەوێک پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای کرد، پاشان دوعای کرد، پاشان دوعای کرد، پاشان فەرمووی: ئەی عائیشە ئایا هەستت پێکرد کە خوا ڕێنموییی کردم لەو شتەدا کە داوای ڕێنموییم لێکردبوو، دوو پیاو هاتنە لام و یەکێکیان لەلای سەرم و ئەوەی تریان لەلای قاچم دانیشت، جا ئەوەی کە لەلای سەرم بوو بەوەی گوت کە لەلای قاچم بوو، یان ئەوەی کە لەلای قاچم بوو بەوەی گوت کە لەلای سەرم بوو: ئێش و ئازاری ئەم پیاوە چییە؟ گوتی: جادووی لێکراوە، گوتی: کێ جادووی لێکردوە؟ گوتی: لەبیدی کوڕی ئەعصەم، گوتی: لە چ شتێکدا (جادووی لێکردوە)؟ گوتی: لە شانەو لەو مووەی کە لەکاتی شانەکردندا بەردەبێتەوەو لە گەڵای نێرەی دار خورما، گوتی: جا ئەوە لەکوێیە؟ گوتی: لە بیری «ذو أروان» دایە، عائیشە گوتی: جا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوڕێکانی چوونە لای بیرەکە، پاشان هاتەوەو فەرمووی: سوێند بە خوا ئەی عائیشە ئاوی بیرەکە وەکو ئەوە وابوو کە خەنەی تێکرابێ و پەلی خورماکەش وەک سەری شەیتانەکان وابوو، (عائیشە) گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی نەتسوتاند؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام من خوا ڕزگاری کردم، وە پێم خۆش نەبوو کە شەڕو خراپەی ئەو جادوویە لەناو خەڵکی بڵاو بکەمەوە، ئەوجار فەرمانی کرد کە ژێر گڵی خەن.

٣٥٤٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَا يَزَالُ يُصِيبُكَ فِي كُلِّ عَامٍ وَجَعٌ مِنَ الشَّاةِ الْمَسْمُومَةِ الَّتِي أَكَلْتَ، قَالَ: «مَا أَصَابَنِي شَيْءٌ مِنْهَا، إِلَّا وَهُوَ مَكْتُوبٌ عَلَيَّ وَآدَمُ فِي طِينَتِهِ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: ئوممو سەلەمە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تاوەکو ئێستاش هەموو ساڵێ تووشی ئازارو ناڕەحەتی دەبی بەهۆی ئەو مەڕە شەهراوییەی کە خواردت، فەرمووی: هەر شتێک کە بەهۆی ئەوەوە توشم هاتبێ ئەوە بێگومان نوسراوە لەسەرم لەوکاتەوە کە ئادەم هەر قوڕ بووەو ڕوحی بەبەردا نەکرابوو.

---

(١) ضعيف.




## بابەت: خەوزڕان و ئەوەی پەنای پێ دەگیردرێ لێی

**٣٥٤٧-** عَنْ خَوْلَةَ بِنْتِ حَكِيمٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا نَزَلَ مَنْزِلًا قَالَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ لَمْ يَضُرَّهُ فِي ذَلِكَ الْمَنْزِلِ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْهُ»(١).

واتە: خەولەی کچی حەکیم ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە سەفەردا لە شوێنێک لایدا، وە گوتی: «أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ»، واتە: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا لە خراپەو زیانی ئەوەی کە خوا خۆی دروستی کردوە، لەو شوێنە هیچ شتێ زیانی پێ ناگەیەنێ هەتا لەو شوێنە دەڕوات.

**٣٥٤٨-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﷺ، قَالَ: لَمَّا اسْتَعْمَلَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الطَّائِفِ جَعَلَ يَعْرِضُ لِي شَيْءٌ فِي صَلَاتِي حَتَّى مَا أَدْرِي مَا أُصَلِّي، فَلَمَّا رَأَيْتُ ذَلِكَ رَحَلْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «ابْنُ أَبِي الْعَاصِ؟» قُلْتُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «مَا جَاءَ بِكَ؟» قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَرَضَ لِي شَيْءٌ فِي صَلَوَاتِي حَتَّى مَا أَدْرِي مَا أُصَلِّي قَالَ: «ذَاكَ الشَّيْطَانُ ادْنُهْ» فَدَنَوْتُ مِنْهُ، فَجَلَسْتُ عَلَى صُدُورِ قَدَمَيَّ، قَالَ: فَضَرَبَ صَدْرِي بِيَدِهِ، وَتَفَلَ فِي فَمِي وَقَالَ: «اخْرُجْ عَدُوَّ اللَّهِ» فَفَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَالَ: «الْحَقْ بِعَمَلِكَ» قَالَ: فَقَالَ عُثْمَانُ: «فَلَعَمْرِي مَا أَحْسِبُهُ خَالَطَنِي بَعْدُ»(٢).

واتە: عوسمانی کوڕی ئەبو عاص ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ کردمیە کاربەدەستی تائیف لە نوێژدا شتێکم بۆ دروست دەبوو هەتا وابوو نەمدەزانی چ نوێژێک دەکەم، جا کاتێ ئەوەم بینی سەفەرم کرد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، جا فەرمووی: کوڕی ئەبو عاص؟ گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: بۆچی هاتووی؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکانمدا شتێکم بۆ دروست دەبێ هەتا وای لێدێ نازانم چ نوێژێک دەکەم، فەرمووی: ئەوە شەیتانە، نزیک بەرەوە، منیش لێی نزیک بوومەوەو لەسەر سەرە پێیەکانم دانیشتم، گوتی: ئنجا بە دەستی لە سنگمیداو تفی کردە ناو دەممەوە، وە فەرمووی: دەربچۆ ئەی دوژمنی خودا، جا سێ جار ئەوەی کردو پاشان فەرمووی: بگەڕێوە بۆ سەر کارەکەت. گوتی: جاعوسمان گوتی: بە گیانی خۆم (یان لە ژیانی خۆمدا) پێم وانییە دوای ئەوە لێی تێکەڵ کردبم و سەری لێ تێکدابم.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٠٨، والترمذي: ٣٤٣٧.

(٢) صحيح. انظر: مسلم: ٢٢٠٣.

٣٥٤٩- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ أَبِيهِ أَبِي لَيْلَى ﷺ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ جَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: إِنَّ لِي أَخًا وَجِعًا، قَالَ: «مَا وَجَعُ أَخِيكَ؟» قَالَ: بِهِ لَمَمٌ، قَالَ: «اذْهَبْ فَأْتِنِي بِهِ». قَالَ: فَذَهَبَ فَجَاءَ بِهِ، فَأَجْلَسَهُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَسَمِعْتُهُ عَوَّذَهُ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَأَرْبَعِ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ الْبَقَرَةِ، وَآيَتَيْنِ مِنْ وَسَطِهَا، ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴿١٦٣﴾ ﴾ البقرة، وَآيَةِ الْكُرْسِيِّ، وَثَلَاثِ آيَاتٍ مِنْ خَاتِمَتِهَا، وَآيَةٍ مِنْ آلِ عِمْرَانَ أَحْسِبُهُ قَالَ: ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴿١٨﴾ ﴾ آل عمران، وَآيَةٍ مِنَ الْأَعْرَافِ: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأعراف، الْآيَةَ، وَآيَةٍ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، ﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ ﴿١١٧﴾ ﴾ المؤمنون، وَآيَةٍ مِنَ الْجِنِّ، ﴿ وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴿٣﴾ ﴾ الجن، وَعَشْرِ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ الصَّافَّاتِ، وَثَلَاثِ آيَاتٍ مِنْ آخِرِ الْحَشْرِ، وَ ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾، وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ، فَقَامَ الْأَعْرَابِيُّ، قَدْ بَرَأَ لَيْسَ بِهِ بَأْسٌ[1].

واتە: عەبدوڕحمانی کوڕی ئەبو لەیلا لە باوکییەوە ئەبو لەیلا ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: من لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووم کاتێ دەشتەکییەک هاتە خزمەتی و گوتی: بەڕاستی من برایەکم هەیە کە نەخۆشەو ئازاری هەیە، فەرمووی: ئازاری براکەت چییە؟ گوتی: بەجۆرێک شێت بووەو لەسەر خۆی نەماوە، فەرمووی: بڕۆ بیهێنە بۆلام، گوتی: ئەویش ڕۆیشت و هێنای، وە لەبەردەستی پێغەمبەر ﷺ داینیشاند، جا گوێم لێبوو کە پێغەمبەر ﷺ پەنای بۆ گرت بە سووڕەتی فاتیحەو چوار ئایەتی سەرەتای سووڕەتی «البقرة»و دوو ئایەتی ناوەڕاستی: ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴿١٦٣﴾ ﴾ البقرة، وە «آية الكرسي»و سێ ئایەتی کۆتایی، وە ئایەتێک لە سووڕەتی «آل عمران» وابزانم فەرمووی: ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴿١٨﴾ ﴾ آل عمران، وە ئایەتێک لە سووڕەتی «الأعراف»: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأعراف، وە ئایەتێک لە سووڕەتی «المؤمنون»: ﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ ﴿١١٧﴾ ﴾ المؤمنون، وە ئایەتێک لە سووڕەتی «الجن»: ﴿ وَأَنَّهُ تَعَالَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴿٣﴾ ﴾ الجن، وە دە ئایەتی سەرەتای سووڕەتی «الصافات»، وە سێ ئایەتی کۆتایی سووڕەتی «الحشر»، وە ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ﴾ وە سووڕەتی «الفلق» و «الناس»، ئنجا دەشتەکییەکە هەستایە سەرپێو چاک بۆیەوەو هیچ دەردێکی لێ نەما.

---

(١) ضعيف.



# پەرتووكی

# پۆشاک و جلوبەرگ



---

كِتَابُ اللِّبَاسِ.




## بابەت: پۆشاکی پێغەمبەری خوا ﷺ

**٣٥٥٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي خَمِيصَةٍ لَهَا أَعْلَامٌ، فَقَالَ: «شَغَلَنِي أَعْلَامُ هَذِهِ، اذْهَبُوا بِهَا إِلَى أَبِي جَهْمٍ، وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّتِهِ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە پۆشاکێکدا نوێژی کرد کە ڕەنگاو ڕەنگ و نەخشدار بوو، بۆیە فەرمووی: ئەو پۆشاکە سەرقاڵی کردم، بۆ ئەبو جەهمی بەرنەوە (چونکە ئەو بۆی هێنابوو)، وە پۆشاکێکی سادەم بۆ بێنن.

**٣٥٥١-** عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ «فَأَخْرَجَتْ لِي إِزَارًا غَلِيظًا مِنَ الَّتِي تُصْنَعُ بِالْيَمَنِ، وَكِسَاءً مِنْ هَذِهِ الْأَكْسِيَةِ الَّتِي تُدْعَى الْمُلَبَّدَةَ»، وَأَقْسَمَتْ لِي: لَقُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِيهِمَا[٢].

واتە: ئەبو بوردە ﵁ دەڵێ: چووم بۆ ماڵی عائیشە، ئەویش بەرکۆشێکی ئەستووری لەو بەرکۆشانە هێنا کە لە یەمەن دروست دەکرێن، وە پۆشاکێکی لەو پۆشاکانە هێناو کە پێیان دەگوترێ: «الملبد»، وە سوێندی خوارد کە کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی فەرموو ئەو پۆشاکانەی لەبەردا بوو.

**الملبد:** بەو پۆشاکانە دەڵێن کە لە یەمەن دروستکراون لەبەر ئەستوورییەکەی ئەو ناوەی لێنراوە.

**٣٥٥٢-** عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «صَلَّى فِي شَمْلَةٍ قَدْ عَقَدَ عَلَيْهَا»[٣].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە پۆشاکێکدا نوێژی کرد کە گرێی وێدابوو (بۆئەوەی نەکەوێتە خوارێ لەبەر گچکەیی).

**شملة:** عەبایەکە کە هەموو جەستە دادەپۆشێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٣، ومسلم: ٥٥٦، وأبو داود: ٩١٤ و ٤٠٥٢، والنسائي: ٧٧١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٠٨، ومسلم: ٢٠٨٠، وأبو داود: ٤٠٣٦، والترمذي: ١٧٣٣.

(٣) ضعيف الإسناد.



٣٥٥٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: «كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَعَلَيْهِ رِدَاءٌ نَجْرَانِيٌّ غَلِيظُ، الْحَاشِيَةِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووم کە عەبایەکی (ڕۆبێکی) نەجرانی بەسەر شانیدا دابوو کە پەراوێزەکانی ئەستوور بوون.

٣٥٥٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: «مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَسُبُّ أَحَدًا، وَلَا يُطْوَى لَهُ ثَوْبٌ»[2].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: هەرگیز نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ جوێن (جنێو) بە کەسێک بدات، وە هەرگیز پۆشاکی قەدکراوو پێچراوەو زیادەی نەبووە.

٣٥٥٥- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﵁، أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِبُرْدَةٍ - قَالَ: وَمَا الْبُرْدَةُ؟ قَالَ: الشَّمْلَةُ - قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي نَسَجْتُ هَذِهِ بِيَدِي لِأَكْسُوَكَهَا، فَأَخَذَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُحْتَاجًا إِلَيْهَا، فَخَرَجَ عَلَيْنَا فِيهَا وَإِنَّهَا لَإِزَارُهُ. فَجَاءَ فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ - رَجُلٌ سَمَّاهُ يَوْمَئِذٍ - فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَحْسَنَ هَذِهِ الْبُرْدَةَ اكْسُنِيهَا. قَالَ: «نَعَمْ». فَلَمَّا دَخَلَ طَوَاهَا وَأَرْسَلَ بِهَا إِلَيْهِ. فَقَالَ لَهُ الْقَوْمُ: وَاللَّهِ مَا أَحْسَنْتَ، كُسِيَهَا النَّبِيُّ ﷺ مُحْتَاجًا إِلَيْهَا، ثُمَّ سَأَلْتَهُ إِيَّاهَا؟ وَقَدْ عَلِمْتَ أَنَّهُ لَا يَرُدُّ سَائِلًا، فَقَالَ: إِنِّي وَاللَّهِ مَا سَأَلْتُهُ إِيَّاهَا لِأَلْبَسَهَا وَلَكِنْ سَأَلْتُهُ إِيَّاهَا لِتَكُونَ كَفَنِي. فَقَالَ سَهْلٌ: فَكَانَتْ كَفَنَهُ يَوْمَ مَاتَ[3].

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﵁ دەگێڕێتەوە، کە ئافرەتێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ عەبایەکی بۆ هێنابوو، ڕاوی گوتی: دەزانن بوڕدە چییە؟ گوتی: پۆشاکێکە هەموو جەستە دادەپۆشێ، جا ئافرەتەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی خۆم چنیومە بۆئەوەی کە جەنابت لەبەری بکەیت، پێغەمبەری خوا ﷺ کە پێویستی پێ بوو لێی وەرگرت، ئنجا بەو پۆشاکەوە کە کردبوویە بەرکۆش تەشریفی هێنا بۆ ناومان، جا فڵانی کوڕی فڵان هات - پیاوێک ئەو ڕۆژە ناوەکەی گوت -، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو عەبایە چەندە جوانە! بیدە من لەبەری بکەم، فەرمووی: بەڵێ باش، جا کاتێک ڕۆیشتەوە ماڵەوە عەباکەی بۆ پێچایەوەو بۆی نارد، خەڵکەکەش پێیان گوت: سوێند بە خوا کارێکی باشت نەکرد، پێغەمبەری

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٤٩ و ٥٨٠٩ و ٦٠٨٨، ومسلم: ١٠٥٧ أخرجاه مطولًا بقصة.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٧٧.

خوا ﷺ لەبەری کردبوو چونکە پێویستی بوو، پاشان تۆش داوات لێکردو دەشتزانی داواکاری کەس ڕەتناکاتەوە، ئەویش گوتی: سوێند بە خوا بۆ ئەوە داوام نەکردوە کە لەبەری بکەم، بەڵکو بۆ ئەوەمە (کە مردم) ببێتە کفن بۆم. سەهل گوتی: ئەو ڕۆژەی مرد کردیانە کفن بۆی (ئاواتەکەی هاتە دی).

**٣٥٥٦- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ «لَبِسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الصُّوفَ، وَاحْتَذَى الْمَخْصُوفَ، وَلَبِسَ ثَوْبًا خَشِنًا خَشِنًا»[١].**

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکی خوری لەبەر دەکردو نەعلی دوراوە (پینەکراو)ـی لەپێ دەکردو پۆشاکێکی زبر زبری لەبەردەکرد.

## بابەت: کەسێک پۆشاکی نوێ لەبەردەکات چی دەڵێ

**٣٥٥٧- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: لَبِسَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ثَوْبًا جَدِيدًا فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي مَا أُوَارِي بِهِ عَوْرَتِي، وَأَتَجَمَّلُ بِهِ فِي حَيَاتِي، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ لَبِسَ ثَوْبًا جَدِيدًا فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي مَا أُوَارِي بِهِ عَوْرَتِي، وَأَتَجَمَّلُ بِهِ فِي حَيَاتِي، ثُمَّ عَمَدَ إِلَى الثَّوْبِ الَّذِي أَخْلَقَ - أَوْ قَالَ: أَلْقَى - فَتَصَدَّقَ بِهِ كَانَ فِي كَنَفِ اللَّهِ، وَفِي حِفْظِ اللَّهِ، وَفِي سِتْرِ اللَّهِ حَيًّا وَمَيِّتًا» قَالَهَا ثَلَاثًا[٢].**

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب پۆشاکێکی نوێی لەبەرکردبوو، جا گوتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەو پۆشاکە لەشی داپۆشیم، وەخۆمی پێ جوان دەکەم لە ژیانمدا، پاشان گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک پۆشاکێکی نوێ لەبەربکات و بڵێت: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەو پۆشاکە لەشی داپۆشیم و بۆتە مایەی ئەوەی ژیانمی پێ جوان بکەم، پاشان پۆشاکە کۆنەکەی بکاتە خێرو بیبەخشێت، ئەوە لەژێر سایەو ڕەحمەت و پارێزگاری خوادا دەبێ بە زیندوویی و بە مردوویی، سێ جار ئەوەی فەرموو.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٣٥٦٠.

**٣٥٥٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: رَأَى عَلَى عُمَرَ قَمِيصًا أَبْيَضَ فَقَالَ: «ثَوْبُكَ هَذَا غَسِيلٌ أَمْ جَدِيدٌ؟» قَالَ: لَا، بَلْ غَسِيلٌ. قَالَ: «الْبَسْ جَدِيدًا، وَعِشْ حَمِيدًا، وَمُتْ شَهِيدًا»[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ عومەری بینی کراسێکی سپی لەبەردابوو، بۆیە فەرمووی: ئەو پۆشاکەت شردووە یان نوێ و تازەیە؟ گوتی: بەڵکو شۆراوە، فەرمووی: هەردەم نوێ لەبەربکەیت و بە خۆشی و سوپاسگوزاری بژیت و بە شەهیدی بمریت.

## بابەت: ئەو پۆشاکانەی نەهییان لێکراوە

**٣٥٥٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ لِبْسَتَيْنِ فَأَمَّا اللِّبْسَتَانِ: فَاشْتِمَالُ الصَّمَّاءِ، وَالِاحْتِبَاءُ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ، لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە دوو جۆر پۆشین: لەبەرکردنی پۆشاکێک کە داخراو بێت و نەتوانی دەستی بێنێتە دەر (وەکو مەلۆتکە پێچ)، هەروەها نەهی کردوە لەوەی کە بە چیچکانەوە دانیشی و پارچە قوماشێک لەخۆ بئاڵێنێ و عەورەتی هیچی لەسەر نەبێت.

**تێبینی:** بە چیچکانەوە دانیشتن ئەوەیە کە بە پۆشاکێک ئەژنۆکانت بە سنگتەوە بنوسێنی و لە خوارەوەش لەشت دیار بێت.

**٣٥٦٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ لِبْسَتَيْنِ: عَنِ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَعَنِ الِاحْتِبَاءِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ، يُفْضِي بِفَرْجِهِ إِلَى السَّمَاءِ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە دوو جۆر پۆشین: بەشێوەی مەلۆتکەپێچ، کە بە یەک پارچە پۆشاک خۆی داپۆشێ بە جۆرێک نەتوانێ دەستی بێنێتە دەر، هەروەها بە چیچکانەوە دانیشێ و پارچەیەک لەخۆ بئاڵێنێ و عەورەتی بەدەرەوە بێ بەرەو ئاسمان.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٧ و ١٩٩١ و ٥٨٢٠ و ٥٨٢٢ و ٦٢٨٤، وأبو داود: ٣٣٧٧، والنسائي: ٥٣٤٠ و ٥٣٤١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٨، وأبو داود: ٤٠٨٠، والترمذي: ١٧٥٨.




٣٥٦١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لِبْسَتَيْنِ: اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ، وَالِاحْتِبَاءِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، وَأَنْتَ مُفْضٍ فَرْجَكَ»[1].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە دوو جۆر پۆشاک پۆشین: بەشێوەی لەخۆ ئاڵاندن کە نەتوانی دەستت دەرکەی، هەروەها بە جۆرێک کە بە چیچکانەوە پۆشاکێک لەخۆ بئاڵێنی عەورەتیشت دەرکەوێ.

## بابەت: پۆشینی پۆشاکی خوری

٣٥٦٢- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي: «يَا بُنَيَّ لَوْ شَهِدْتَنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَصَابَتْنَا السَّمَاءُ، لَحَسِبْتَ أَنَّ رِيحَنَا رِيحُ الضَّأْنِ»[2].

واتە: ئەبو بوردە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: باوکم پێی گوتم: ڕۆڵەکەم ئەگەر کاتی خۆی ئێمەو پێغەمبەری خوات ﷺ بدیتبایە کاتێ بارانمان لێ دەباری، واتدەزانی بۆنی مەڕمان لێدێ (چونکە پۆشاکەکەیان خوری بوو).

٣٥٦٣- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: «خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ رُومِيَّةٌ مِنْ صُوفٍ ضَيِّقَةُ الْكُمَّيْنِ، فَصَلَّى بِنَا فِيهَا، لَيْسَ عَلَيْهِ شَيْءٌ غَيْرُهَا»[3].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ ناومان لەوکاتەدا عەبایەکی (جوبەیەکی) خوری ڕۆمی لەبەربوو، شوێنی دەستەکانی بەرتەسک بوو، جا بەو عەبایەوە نوێژی بۆ کردین، هیچی تریشی لەبەردا نەبوو جگە لەو عەبایە.

٣٥٦٤- عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ ﷺ «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: تَوَضَّأَ، فَقَلَبَ جُبَّةَ صُوفٍ كَانَتْ عَلَيْهِ. فَمَسَحَ بِهَا وَجْهَهُ»[4].

---

(١) صحيح بما قبله.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٠٣٣، والترمذي: ٢٤٧٩.

(٣) ضعيف.

(٤) ضعيف. (وحسن الألباني).

واتە: سەلمانی فارسیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت، جا جوبەیەکی خوری کە لەبەری دابوو هەڵیگێڕایەوەو ڕوخساری پێ سڕیەوە.

**٣٥٦٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «يَسِمُ غَنَمًا فِي آذَانِهَا، وَرَأَيْتُهُ مُتَّزِرًا بِكِسَاءٍ»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی مەڕی نیشانە دەکرد، وە بینیم کە بە پۆشاکێک خۆی پێچابۆوەو لەبەری کردبوو.

## بابەت: پۆشاکی سپی

**٣٥٦٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضُ فَالْبَسُوهَا، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ»(٢).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترینی پۆشاکەکانتان پۆشاکی سپییە، بۆیە لەبەری بکەن و مردووەکانیشتانی پێ کفن بکەن.

**٣٥٦٧-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْبَسُوا ثِيَابَ الْبَيَاضِ، فَإِنَّهَا أَطْهَرُ وَأَطْيَبُ»(٣).

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پۆشاکی سپی بپۆشن چونکە پاکترینەو خاوێن و جوانترینە.

**٣٥٦٨-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَحْسَنَ مَا زُرْتُمُ اللَّهَ بِهِ فِي قُبُورِكُمْ، وَمَسَاجِدِكُمْ، الْبَيَاضُ»(٤).

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین و جوانترین (پۆشاک) کە پێیەوە بچنەوە بەر بارەگای خوا لە گۆڕو لە مزگەوتەکانتان پۆشاکی سپییە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٥٤٢، ومسلم: ٢١١٩، وأبو داود: ٢٥٦٣.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٧٨ و ٤٠٦١، والترمذي: ٩٩٤.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٨١٠، والنسائي: ١٨٩٦.

(٤) موضوع.

## بابەت: کەسێ پۆشاکەکەی لەدوا بخشێ ئەوە خۆبەزل زانە

**٣٥٦٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الَّذِي يَجُرُّ ثَوْبَهُ مِنَ الْخُيَلَاءِ، لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].**

**واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی پۆشاکەکەی لەدوا بخشێ لەبەر خۆ بە گەورە زانین، لە ڕۆژی قیامەتدا خوا تەماشای ناکات.**

**٣٥٧٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ جَرَّ إِزَارَهُ مِنَ الْخُيَلَاءِ، لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ» قَالَ: فَلَقِيتُ ابْنَ عُمَرَ بِالْبَلَاطِ فَذَكَرْتُ لَهُ حَدِيثَ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ وَأَشَارَ إِلَى أُذُنَيْهِ: سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ، وَوَعَاهُ قَلْبِي[2].**

**واتە: ئەبو سەعید ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پۆشاکەکەی لەدوا بخشێ لەبەر خۆ بە گەورە زانین، ئەوە خوا لە ڕۆژی دواییدا تەماشای ناکات. (ڕاوی) گوتی: لە «بلاط» بە ئیبنو عومەر گەیشتم و ئەو فەرموودەیەی ئەبو سەعیدم بۆ گێڕایەوە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕابوویەوە، ئەویش ئاماژەی بۆ گوێیەکانی کردو گوتی: بەو دوو گوێیە لێم بیستووەو دڵم ئاگاداری بووەو وەری گرتووە.**

**٣٥٧١- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﵁، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: مَرَّ بِأَبِي هُرَيْرَةَ فَتًى مِنْ قُرَيْشٍ يَجُرُّ سَبَلَهُ، فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ مِنَ الْخُيَلَاءِ، لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[3].**

**واتە: ئەبو سەلەمە ﵁ لە ئەبو هورەیرەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گەنجێکی قورەیشی بەلای ئەبو هورەیرەدا ڕەت بوو جلەکانی درێژ بوون و دەخشان، ئەویش گوتی: برازای خۆم بەڕاستی بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەرکەس بە فیزەوە پۆشاکەکەی لەدوای خۆی بخشێنێ ئەوە خوا لە قیامەتدا تەماشای ناکات.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٦٥، ومسلم: ٢٠٨٥، وأبو داود: ٤٠٨٥ و ٤٠٩٤، والترمذي: ١٧٣٠، والنسائي: ٥٣٣٦_٥٣٣٨.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٨٨، ومسلم: ٢٠٨٧.

## بابەت: ئەوەی جل و بەرگ هەتاکو کوێ شۆڕ بێ

**٣٥٧٢-** عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِأَسْفَلِ عَضَلَةِ سَاقِي - أَوْ سَاقِهِ - فَقَالَ: «هَذَا مَوْضِعُ الْإِزَارِ، فَإِنْ أَبَيْتَ فَأَسْفَلَ، فَإِنْ أَبَيْتَ فَأَسْفَلَ، فَإِنْ أَبَيْتَ فَلَا حَقَّ لِلْإِزَارِ فِي الْكَعْبَيْنِ»[1].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خوارووی ماسولکەی لاقی من یان هی خۆی گرت و فەرمووی: تا ئێرە شوێنی شۆڕبوونەوەی پۆشاکە، ئەگەر هەر وازت نەهێناو زیاتر هاتیە خوارێ ئەوە خوارێتر، ئەگەر نەوەستای خوارێتر، ئەگەر هەر وازت نەهێنا ئەوە هەق نیە پۆشاک لە قولەپێ داکەوێت.

**٣٥٧٢م-** حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو إِسْحَاقَ، عَنْ مُسْلِمِ بْنِ نُذَيْرٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، مِثْلَهُ[2].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

**٣٥٧٣-** عَنِ الْعَلَاءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي سَعِيدٍ: هَلْ سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْئًا فِي الْإِزَارِ؟ قَالَ: نَعَمْ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِزْرَةُ الْمُؤْمِنِ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ، لَا جُنَاحَ عَلَيْهِ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَعْبَيْنِ، وَمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ فِي النَّارِ». يَقُولُ ثَلَاثًا: «لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَى مَنْ جَرَّ إِزَارَهُ بَطَرًا»[3].

واتە: عەلائی کوڕی عەبدوڕەحمان لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: بە ئەبو سەعیدم گوت: ئایا هیچ شتێکت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە دەربارەی پۆشاک؟ گوتی: بەڵێ، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: شێوەی پۆشاکی بڕوادار ئەوەیە کە هەتا نیوەی لاقی بێت، هیچ گوناهی نیە کە لەنێوانی لاق و قولەپێکانی بێت، ئەوەی کە لە خوار قولەپێیەکانەوە بێ ئەوە بۆ ئاگرە، سێ جار دەیفەرموو: خوا تەماشای کەسێک ناکات پۆشاکەکەی بە لوت بەرزی بەدوای خۆیدا ڕاکێشێ.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٧٨٤، والنسائي: ٥٣٢٩.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٧٨٤، والنسائي: ٥٣٢٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٠٩٣.




٣٥٧٤- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا سُفْيَانَ بْنَ سَهْلٍ، لَا تُسْبِلْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُسْبِلِينَ»(١).

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی سوفیانی کوڕی سەهل پۆشاکەکەت بەرمەدەوە (بۆ خوار قولەپێکان)، چونکە بێگومان خوا ئەوانەی خۆشناوێ کە پۆشاکەکانیان بەردەدەنەوە.

## بابەت: پۆشینی کراس

٣٥٧٥- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ قَالَتْ: «لَمْ يَكُنْ ثَوْبٌ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْقَمِيصِ»(٢).

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەڵێ: هیچ پۆشاکێک لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ لە کراس خۆشەویستتر نەبوو.

## بابەت: ئەندازەی درێژی کراس

٣٥٧٦- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْإِسْبَالُ فِي الْإِزَارِ، وَالْقَمِيصِ، وَالْعِمَامَةِ، مَنْ جَرَّ شَيْئًا خُيَلَاءَ، لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: «مَا أَغْرَبَهُ»(٣).

واتە: سالیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شۆڕبوونەوەی نادروست لە بەرکۆش و کراس و مێزەر دایە، هەر کەسێک یەکێک لەوانە شۆڕبکاتەوە زیاد لە پێویست و لەبەر خۆ بە گەورە دانان، ئەوە خوا لە ڕۆژی قیامەتدا تەماشای ناکات. ئەبو بەکر گوتی: چەند سەیرە!

## بابەت: قۆڵی کراس چەندە بێت

٣٥٧٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَلْبَسُ قَمِيصًا قَصِيرَ الْيَدَيْنِ، وَالطُّولِ»(٤).

---

(١) حسن.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٠٢٦، والترمذي: ١٧٦٢ و ١٧٦٣ و ١٧٦٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٦٥، ومسلم: ٢٠٨٥، وأبو داود: ٤٠٩٤، والنسائي: ٥٣٣٤.

(٤) ضعيف.




واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کراسی قۆڵ کورت و قۆڵ درێژی لەبەردەکرد.

## بابەت: کردنەوەی قۆپچەکانی کراس

٣٥٧٨- عَنْ مُعَاوِيَةُ بْنُ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: «أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَبَايَعْتُهُ وَإِنَّ زِرَّ قَمِيصِهِ لَمُطْلَقٌ» قَالَ عُرْوَةُ: «فَمَا رَأَيْتُ مُعَاوِيَةَ وَلَا ابْنَهُ فِي شِتَاءٍ وَلَا صَيْفٍ، إِلَّا مُطْلَقَةً أَزْرَارُهُمَا»[1].

واتە: موعاویەی کوڕی قوڕڕە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بەیعەتم پێیدا، لەوکاتەدا دووگمەی کراسەکەی کرابۆوە. عوڕوە گوتی: موعاویەو کوڕەکەی بە هاوین و زستان دووگمەی کراسیان کراوەبوو.

## بابەت: لەبەرکردنی شەڕواڵ

٣٥٧٩- عَنْ سُوَيْدِ بْنِ قَيْسٍ ﷺ، قَالَ: «أَتَانَا النَّبِيُّ ﷺ فَسَاوَمَنَا سَرَاوِيلَ»[2].

واتە: سوەیدی کوڕی قەیس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆلامان مامەڵەی شەڕواڵی لێکردین.

## بابەت: شۆڕبوونەوەی دامێنی پۆشاکی ئافرەت

٣٥٨٠- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَمْ تَجُرُّ الْمَرْأَةُ مِنْ ذَيْلِهَا؟ قَالَ: «شِبْرًا». قُلْتُ: إِذًا يَنْكَشِفُ عَنْهَا قَالَ: «ذِرَاعٌ لَا تَزِيدُ عَلَيْهِ»[3].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی پۆشاکی ئافرەت کە دامێنەکەی چەندە شۆڕ بێت؟ فەرمووی: بستێک، گوتم: جا ئەوکات جەستەی بەدەردەکەوێت، فەرمووی: باڵێک، لەوە زیاتری نەکات.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٠٨٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٣٦، والترمذي: ١٣٠٥، والنسائي: ٤٥٩٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١١٧، والترمذي: ١٧٣١، والنسائي: ٥٣٣٧_٥٣٣٠.

٣٥٨١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ «أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ رُخِّصَ لَهُنَّ فِي الذَّيْلِ ذِرَاعًا»، فَكُنَّ يَأْتِينَنَا فَنَذْرَعُ لَهُنَّ بِالْقَصَبِ ذِرَاعًا[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتیان پێدرا کە دامێنی پۆشاکەکانیان باڵێک درێژ بێت، جا ئەوان پۆشاکەکەیان دەهێنا بۆلای ئێمە، ئێمەش بە دارێک کە باڵێک بوو بۆمان دەپێوان.

٣٥٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِفَاطِمَةَ، أَوْ لِأُمِّ سَلَمَةَ: «ذَيْلُكِ ذِرَاعٌ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە فاتیمە یان بە ئوممو سەلەمەی فەرموو: دامێنی پۆشاکەکەت باڵێک درێژ بێت.

٣٥٨٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «فِي ذُيُولِ النِّسَاءِ شِبْرًا»، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: «إِذًا تَخْرُجَ سُوقُهُنَّ»، قَالَ: «فَذِرَاعٌ»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی دامێنی پۆشاکی ئافرەتان فەرمووی: با بستێک بێت، عائیشە گوتی: جا ئەوکات قاچیان دەردەکەوێت، فەرمووی: کەواتە با باڵێک بێت.

## بابەت: مێزەری ڕەش

٣٥٨٤- عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ»[٤].

واتە: جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی حورەیس لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: بینیومە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوانگە وتاری فەرمووەو مێزەری ڕەشی لەسەر بووە.

٣٥٨٥- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ، وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ»[٥].

---

(١) صحيح دون جملة القصب. أخرجه أبو داود: ٤١١٩.

(٢) حسن لغيره.

(٣) حسن لغيره.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٥٩، وأبو داود: ٤٠٧٧ مطولًا، والنسائي: ٥٣٤٣ و ٥٣٤٦.

(٥) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٥٨، وأبو داود: ٤٠٧٦، والترمذي: ١٧٣٥، والنسائي: ٢٨٦٩ و ٥٣٤٤ و ٥٣٤٥.

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ تەشریفی ڕۆیشتە ناو مەککەو مێزەرێکی ڕەشیشی لەسەر بوو.

**٣٥٨٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ تەشریفی چووە مەککەو لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا کە لەوکاتەدا مێزەرێکی ڕەشی لەسەر بوو.

## بابەت: بەردانەوەی لکی مێزەر بەنێوان شانەکاندا

**٣٥٨٧-** عَنْ جَعْفَرُ بْنُ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: «كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ قَدْ أَرْخَى طَرَفَيْهَا بَيْنَ كَتِفَيْهِ»[٢].

واتە: جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی حورەیس لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: وەکو ئێستا چاوم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بێ وایە کە مێزەرێکی ڕەشی لەسەر بوو لکەکانی بەنێوان شانیدا شۆڕکردبۆوە.

## بابەت: ناپەسەندی لەبەرکردنی ئاوریشم (حەریر)

**٣٥٨٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَبِسَ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الْآخِرَةِ»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لەو دونیایەدا ئاوریشم لەبەربکات، ئەوە لە قیامەتدا لێی بێ بەشەو لەبەری ناکات.

**٣٥٨٩-** عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الدِّيبَاجِ، وَالْحَرِيرِ، وَالْإِسْتَبْرَقِ»[٤].

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە پۆشینی ئاوریشم و ئەوەشی کە لێی دروست دەکرێ (جا بە هەر ناوێکەوە بێت).

---

(١) صحيح بما قبله.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٥٩، وأبو داود: ٤٠٧٧ مطولًا، والنسائي: ٥٣٤٣ و ٥٣٤٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٣٢، ومسلم: ٢٠٧٣.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٤٩ و ٥٨٦٣ و ٦٢٢٢ و ٦٢٣٥، ومسلم: ٢٠٦٦، والترمذي: ١٧٦٠، والنسائي: ١٩٣٩.




**٣٥٩٠- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ، وَالذَّهَبِ وَقَالَ: «هُوَ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا، وَلَنَا فِي الْآخِرَةِ»[١].**

**واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە لەبەرکردنی ئاوریشم و بەکارهێنانی زێڕ (بۆ پیاوان)، وە فەرمووی: ئەوە بۆ ئەوانە (بێبڕواەکان) لە دونیاداو بۆ ئێمەیە لە قیامەتدا.**

**٣٥٩١- عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ رَأَى حُلَّةً سِيَرَاءَ مِنْ حَرِيرٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوِ ابْتَعْتَ هَذِهِ الْحُلَّةَ لِلْوَفْدِ وَلِيَوْمِ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ فِي الْآخِرَةِ»[٢].**

**واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺدەگێڕێتەوە، پۆشاکێکی خەتداری بینی لە ئاوریشم دروستکرابوو، بۆیە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئەو عەبایەت کڕیبایە بۆ پێشوازی وەفدەکان و بۆ ڕۆژی هەینی لەبەرت کردبایە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان تەنها ئەو کەسانە ئەو جۆرە لەبەردەکەن کە لە قیامەتدا هیچ بەشێکیان پێوەی نابێت.**

## بابەت: ئەوانەی ڕێیان پێدراوە ئاوریشم بپۆشن

**٣٥٩٢- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، نَبَّأَهُمْ «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَخَّصَ لِلزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ، وَلِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، فِي قَمِيصَيْنِ مِنْ حَرِيرٍ مِنْ وَجَعٍ كَانَ بِهِمَا حِكَّةٍ»[٣].**

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺدەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺمۆڵەتی بە زوبەیری کوڕی عەوام و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفدا بۆ دوو کراسی ئاوریشم (کە لەبەری بکەن) لەبەر ئەو ئازارەی کە هەیانبوو، کە بریتیبوو لە خرو (واتە: خرویان لە جەستەدا بوو).**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤٢٦، ومسلم: ٢٠٦٧، وأبو داود: ٣٧٢٣، والترمذي: ١٨٧٨، والنسائي: ٥٣٠١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٨٦، ومسلم: ٢٠٦٨، وأبو داود: ١٠٧٦، والنسائي: ١٣٨٢ و ١٥٦٠ و ٥٢٩٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٢٠، ومسلم: ٢٠٧٦، وأبو داود: ٤٠٥٦، والترمذي: ١٧٢٢، والنسائي: ٥٣١٠ و ٥٣١١.

## بابەت: مۆڵەتدان بە نەخشکردنی جل و بەرگ

٣٥٩٣- عَنْ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ: يَنْهَى عَنِ الْحَرِيرِ، وَالدِّيبَاجِ، إِلَّا مَا كَانَ هَكَذَا، ثُمَّ أَشَارَ بِإِصْبَعِهِ، ثُمَّ الثَّانِيَةِ، ثُمَّ الثَّالِثَةِ، ثُمَّ الرَّابِعَةِ، فَقَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَنْهَانَا عَنْهُ»[1].

واتە: لە عومەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە، کە نەهی دەکرد لە لەبەرکردنی ئاوریشمی تەنک و ئەستوور مەگەر ئەوەندە نەبێ کە بە پەنجەکانی ئاماژەی کرد تا چوار پەنجە و گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە لەبەرکردنی ئاوریشم.

٣٥٩٤- عَنْ أَبِي عُمَرَ، مَوْلَى أَسْمَاءَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ اشْتَرَى عِمَامَةً لَهَا عَلَمٌ. فَدَعَا بِالْجَلَمَيْنِ فَقَصَّهُ، فَدَخَلْتُ عَلَى أَسْمَاءَ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهَا، فَقَالَتْ: «بُؤْسًا لِعَبْدِ اللَّهِ، يَا جَارِيَةُ هَاتِي جُبَّةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَجَاءَتْ بِجُبَّةٍ مَكْفُوفَةِ الْكُمَّيْنِ، وَالْجَيْبِ، وَالْفَرْجَيْنِ بِالدِّيبَاجِ»[2].

واتە: ئەبو عومەری مەولای ئەسماء ﷺ دەڵێ: ئیبنو عومەرم بینی مێزەرێکی کڕیبوو نەخشێنرابوو، ئەویش داوای موقەستی کردو نەخشەکەی بڕی، منیش چووم بۆلای ئەسماء و کارەکەی ئیبنو عومەرم بۆ گێڕایەوە، ئەویش گوتی: حەیف بۆ عەبدوڵڵا! ئادەی کچەکە عەبای پێغەمبەری خوا ﷺ بێنە، ئەویش عەباکەی هێنا، ئەولاو لای قۆڵەکانی و گیرفانەکانی و لای پێشەوەو دواوەی بە ئاوریشم نەخشێنرابوو.

## بابەت: لەبەرکردنی ئاوریشم و زێڕ بۆ ئافرەتان

٣٥٩٥- عَنْ عَلِيِّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ يَقُولُ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَرِيرًا بِشِمَالِهِ، وَذَهَبًا بِيَمِينِهِ، ثُمَّ رَفَعَ بِهِمَا يَدَيْهِ، فَقَالَ: «إِنَّ هَذَيْنِ حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي، حِلٌّ لِإِنَاثِهِمْ»[3].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پارچە ئاوریشمێکی بە دەستی چەپەوە گرتبوو زێڕیشی بە دەستی ڕاست، پاشان بەرزی کردن و فەرمووی: ئەو دوو شتە (ئاوریشم و زێڕ) بۆ نێرینەی ئوممەتەکەم حەرامن و بۆ ڕەگەزی مێینە حەڵاڵن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٢٨، ومسلم: ٢٠٦٩، وأبو داود: ٤٠٤٢، والترمذي: ١٧٢١، والنسائي: ٥٣١٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٦٩/١٠، وأبو داود: ٤٠٤٥.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٠٥٧، والنسائي: ٥١٤٤_٥١٤٧.

**٣٥٩٦- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّهُ أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ حُلَّةٌ مَكْفُوفَةٌ بِحَرِيرٍ، إِمَّا سَدَاهَا، وَإِمَّا لَحْمَتُهَا، فَأَرْسَلَ بِهَا إِلَيَّ، فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَصْنَعُ بِهَا؟ أَلْبَسُهَا، قَالَ: «لَا، وَلَكِنِ اجْعَلْهَا خُمُرًا بَيْنَ الْفَوَاطِمِ»[١].**

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، عەبایەکی نەخشێنراویان بە ئاوریشم بە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنابوو، کە یان باری درێژی یان باری پانی ئاوریشم بوو، پێغەمبەریش ﷺ بۆ منی نارد، منیش هێنامەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناردووتە چی لێبکەم؟ لەبەری بکەم؟ فەرمووی: نەخێر، بیکەیە لەچکەو سەرپۆش بۆ فاتیمەکان (فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺو فاتیمەی کچی ئەسەد یان فاتیمەی کچی حەمزە).

**٣٥٩٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَفِي إِحْدَى يَدَيْهِ ثَوْبٌ مِنْ حَرِيرٍ، وَفِي الْأُخْرَى ذَهَبٌ، فَقَالَ: «إِنَّ هَذَيْنِ مُحَرَّمٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي، حِلٌّ لِإِنَاثِهِمْ»[٢].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ ناومان، کە بە دەستێکی ئاوریشمی پێبوو دەستەکەیتریشی زێڕ، ئنجا فەرمووی: ئەو دوو شتە بۆ نێرینەی ئوممەتەکەم حەرامەو بۆ مێینەکان حەڵاڵە.

**٣٥٩٨- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ «رَأَيْتُ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَمِيصَ حَرِيرٍ سِيَرَاءَ»[٣].**

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: کراسێکی لە ئاوریشم چنراوم بینی بەسەر زەینەبی کچی پێغەمبەری خواوە ﷺ.

## بابەت: پۆشینی ڕەنگی سوور بۆ پیاوان

**٣٥٩٩- عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: «مَا رَأَيْتُ أَجْمَلَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُتَرَجِّلًا فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ»[٤].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦١٤، ومسلم: ٢٠٧١، وأبو داود: ٤٠٤٣، والنسائي: ٥٢٩٨.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٥٢٩٦.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٥١، ومسلم: ٢٣٣٧، وأبو داود: ٤٠٧٢ و ٤١٨٣، والترمذي: ١٧٢٤ و ٣٦٣٥، والنسائي: ٥٠٦٠ و ٥٠٦٢ و ٥٢٣٢ و ٥٢٣٣ و ٥٣١٤.

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: هیچ کەسێکم نەدیتووە جوانتر بێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک پۆشاکی سوورو ڕەشی لەبەردەکردو سەری شانە دەکرد.

٣٦٠٠- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ، حَدَّثَهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ، فَأَقْبَلَ حَسَنٌ وَحُسَيْنٌ عَلَيْهِمَا قَمِيصَانِ أَحْمَرَانِ، يَعْثُرَانِ وَيَقُومَانِ، فَنَزَلَ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَخَذَهُمَا فَوَضَعَهُمَا فِي حِجْرِهِ، فَقَالَ: «صَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ» ﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَـٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ۚ ﴿١٥﴾ ﴾ التغابن، «رَأَيْتُ هَذَيْنِ فَلَمْ أَصْبِرْ» ثُمَّ أَخَذَ فِي خُطْبَتِهِ[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوڕەیدە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە باوکی بۆی گێڕاوەتەوەو گوتوویەتی: بینیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەفەرموو، لەوکاتەدا حەسەن و حوسەین هاتن، هەریەکەو کراسێکی سوورباوی تێکەڵ بە ڕەشیان لەبەردابوو، دەکەوتن و هەڵدەستانەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوانگە دابەزی و لە باوەشی گرتن و فەرمووی: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاستیان فەرموو کە: ﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَـٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ۚ ﴿١٥﴾ ﴾ التغابن، واتە: بێگومان سەروەت وسامان وماڵ و منداڵتان هۆی تاقیکردەوەتانن. (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:) ئەم دووانەم بینی نەمتوانی ئارام بگرم، پاشان دەستی کردەوە بە وتارەکەی.

## بابەت: ناپەسەندی جل و بەرگی ڕەنگکراو بە سووری تۆخ

٣٦٠١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُفْدَمِ» قَالَ يَزِيدُ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ: مَا الْمُفْدَمُ قَالَ: «الْمُشْبَعُ بِالْعُصْفُرِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە ڕەنگکردنی پۆشاک بە ڕەنگی سووری تۆخ. یەزید گوتی: بە حەسەنم گوت: «المفدم» یانی چی؟ گوتی: واتە: ڕەنگی سووری تێر.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١٠٩، والترمذي: ٣٧٧٤، والنسائي: ١٤١٣.

(٢) صحيح لغيره.

**٣٦٠٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُنَيْنٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا ﷺ يَقُولُ: «نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَا أَقُولُ: نَهَاكُمْ عَنْ لُبْسِ الْمُعَصْفَرِ»[١].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حونەین دەڵێ: گوێم لە عەلی ﷺ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە منی قەدەغە کردوەو ناڵێم: لە ئێوەی قەدەغە کردوە، کە پۆشاکی ڕەنگکراو بە ڕەنگی سووری تێر لەبەربکەن.**

**٣٦٠٣-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: أَقْبَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ ثَنِيَّةِ أَذَاخِرَ فَالْتَفَتَ إِلَيَّ وَعَلَيَّ رَيْطَةٌ مُضَرَّجَةٌ بِالْعُصْفُرِ، فَقَالَ: «مَا هَذِهِ؟» فَعَرَفْتُ مَا كَرِهَ، فَأَتَيْتُ أَهْلِي، وَهُمْ يَسْجُرُونَ تَنُّورَهُمْ، فَقَذَفْتُهَا فِيهِ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ مِنَ الْغَدِ، فَقَالَ: «يَا عَبْدَ اللَّهِ مَا فَعَلَتِ الرَّيْطَةُ»، فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: «أَلَا كَسَوْتَهَا بَعْضَ أَهْلِكَ، فَإِنَّهُ لَا بَأْسَ بِذَلِكَ لِلنِّسَاءِ»[٢].

**واتە: عەمرِی کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ لە «ثنية أذاخر» (شوێنێکە) بووین، جا ئاوڕی دایەوە بۆ لای من، منیش پۆشاکێکی نەرمی تەنکی ڕەنگکراوم لەبەر بوو بە ڕەنگی سووری تێر، فەرمووی: ئەوە چییە؟ منیش زانیم بە دڵی نیە، کاتێک هاتمەوە ماڵ لە ماڵەوە تەنووریان گڕدابوو دەهایسا، منیش پۆشاکەکەم فڕێدایە ناوی، پاشان بەیانیەکەی هاتمەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: ئەی عەبدوڵڵا پۆشاکەکەت چی لێهات؟ منیش هەواڵم پێیدا، ئەویش فەرمووی: نەدەکرا بیدەیە یەکێک لە خێزانی ماڵەوە، چونکە بۆ ئافرەتان هیچ کێشەی نیە.**

## بابەت: ڕەنگی زەرد بۆ پیاوان

**٣٦٠٤-** عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: «أَتَانَا النَّبِيُّ ﷺ: فَوَضَعْنَا لَهُ مَاءً يَتَبَرَّدُ بِهِ، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ بِمِلْحَفَةٍ صَفْرَاءَ، فَرَأَيْتُ أَثَرَ الْوَرْسِ عَلَى عُكَنِهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٧٨، وأبو داود: ٤٠٤٤، والترمذي: ٢٦٤ و ١٧٢٥ و ١٧٣٧، والنسائي: ١٠٤٠_١٠٤٤ و ١١١٨ و ٥١٦٥_٥١٨٥ و ٥٢٦٧ و ٥٢٧٢ و ٥٣١٨.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٠٦٦.

(٣) ضعيف.

واتە: قەیسی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆ ماڵمان، ئاومان بۆ هێنا خۆی فێنک بکاتەوە، خۆی بە ئاوەکە شۆرد، پاشان خاولییەکی ڕەنگکراو بە ڕەنگی زەردم هێنایە خزمەتی، ئنجا شوێنەواری ڕەنگەکەم بە لۆچەکانی سکییەوە بینی (دوای ئەوەی خۆی پێ سڕیوەتەوە).

## بابەت: چیت دەوێ بپۆشە
## بەڵام بە زێدەڕۆیی و بۆ لوت بەرزی نەبێ

**٣٦٠٥- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُوا وَاشْرَبُوا وَتَصَدَّقُوا وَالْبَسُوا مَا لَمْ يُخَالِطْهُ إِسْرَافٌ، أَوْ مَخِيلَةٌ»[١].**

واتە: عەمرى کوڕى شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بخۆن و بخۆنەوەو خێرو چاکە بکەن و لەبەربکەن (بە دڵی خۆتان)، مادام زێدەڕۆیی و لوت بەرزی لەگەڵ تێکەڵاو ناکەن.

## بابەت: کەسێک پۆشاک بۆ ناوبانگ لەبەر بکات

**٣٦٠٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ أَلْبَسَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَوْبَ مَذَلَّةٍ»[٢].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەرگ و پۆشاکی فەخرو شانازی لەبەر بکات، خوا لە قیامەتدا پۆشاکی سەرشۆڕی و ڕیسوایی لەبەر دەکات.

**٣٦٠٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ فِي الدُّنْيَا، أَلْبَسَهُ اللَّهُ ثَوْبَ مَذَلَّةٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ أَلْهَبَ فِيهِ نَارًا»[٣].**

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٥٥٩.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٠٢٩.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٠٢٩.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پۆشاکێک لەبەر بکات لە دونیا کە فەخرو شانازی پێوە بکات بەسەر خەڵکیدا، ئەوە خوا لە قیامەتدا پۆشاکی سەرشۆڕی و ڕیسوایی لەبەر دەکات، پاشان ئاگری پێ خۆش دەکات.

٣٦٠٨- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَبِسَ ثَوْبَ شُهْرَةٍ، أَعْرَضَ اللَّهُ عَنْهُ حَتَّى يَضَعَهُ مَتَى وَضَعَهُ»[١].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پۆشاک بۆ ناوبانگ و شانازی لەبەر بکات، خوا ڕووی لێ وەردەگێڕێ هەتاکو دایدەنێ.

## بابەت: پۆشینی پێستەی خۆشکراوی ئاژەڵی مردار

٣٦٠٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَيُّمَا إِهَابٍ دُبِغَ فَقَدْ طَهُرَ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر پێستەیەک خۆش کرابێ، بە دڵنیایی پاک بۆتەوە.

٣٦١٠- عَنْ مَيْمُونَةَ ﷺ، أَنَّ شَاةً لِمَوْلَاةِ مَيْمُونَةَ مَرَّ بِهَا - يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ - قَدْ أُعْطِيَتْهَا مِنَ الصَّدَقَةِ مَيْتَةً، فَقَالَ: «هَلَّا أَخَذُوا إِهَابَهَا فَدَبَغُوهُ، فَانْتَفَعُوا بِهِ؟»، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا مَيْتَةٌ، قَالَ: «إِنَّمَا حُرِّمَ أَكْلُهَا»[٣].

واتە: مەیمونە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە مەڕێکیان بەخێر دابوو بە بەندەیەکی مەیمونە، مەڕەکەش مردار ببوو، جا پێغەمبەر ﷺ بەلای لاکی مەڕەکەدا تێپەڕی و فەرمووی: ئەوە نەدەکرا پێستەکەی خۆشە بکەن و سوودی لێ وەربگرن، ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاخر مەڕەکە مردار بووە، فەرمووی: تەنها خواردنی گۆشتەکەی حەڕامە (نەک پێستەکەی).

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٦٦، وأبو داود: ٤١٢٠ و ٤١٢٣، والترمذي: ١٧٢٨، والنسائي: ٤٢٤١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٩٢، ومسلم: ٣٦٣، وأبو داود: ٤١٢٠ بنحوه، والترمذي: ٤٢٣٤ و ٤٢٣٦.

**٣٦١١-** عَنْ سَلْمَانَ ﷺ قَالَ: كَانَ لِبَعْضِ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ شَاةٌ، فَمَاتَتْ فَمَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَيْهَا فَقَالَ: «مَا ضَرَّ أَهْلَ هَذِهِ، لَوِ انْتَفَعُوا بِإِهَابِهَا»[١].

**واتە:** سەلمان ﷺ دەڵێ: یەکێک لە دایکانی بڕواداران مەڕێکی هەبوو، مەڕەکەش مردار بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای کەلاکەکەدا تێپەڕی و فەرمووی: خاوەنی ئەو مەڕە هیچ زیانێکیان نەدەکرد ئەگەر سوودیان لە پێستەکەی وەرگرتبایە.

**٣٦١٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنْ يُسْتَمْتَعَ بِجُلُودِ الْمَيْتَةِ إِذَا دُبِغَتْ»[٢].

**واتە:** عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە کەوا پێستەی مردارەوەبوو سوودی لێ وەربگیرێ ئەگەر خۆشەکرا.

## بابەت: ئەوانەی دەڵێن: پێستەو دەماری مردارەوە بوو سوودی لێ وەرناگیرێ

**٣٦١٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُكَيْمٍ ﷺ قَالَ: أَتَانَا كِتَابُ النَّبِيِّ ﷺ: «أَنْ لَا تَنْتَفِعُوا مِنَ الْمَيْتَةِ بِإِهَابٍ وَلَا عَصَبٍ»[٣].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی عوکەیم ﷺ دەڵێ: نووسراوێکی پێغەمبەرمان ﷺ پێگەیشت (فەرمانی کردبوو): کە سوود لە مردارەوەبوو وەرمەگرن، نە لە پێستەکەی، نە لە دەمارەکەی.

## بابەت: سیفەتی نەعل

**٣٦١٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْعَبَّاسِ ﷺ قَالَ: «كَانَ لِنَعْلِ النَّبِيِّ ﷺ قِبَالَانِ مَثْنِيٌّ شِرَاكُهُمَا»[٤].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٢٤، والنسائي: ٤٢٥٢.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤١٢٧، والترمذي: ١٧٢٩، والنسائي: ٤٢٤٩_٤٢٥١.

(٤) صحيح.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: نەعلەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو داو، یان دوو خەتی هەبوو، کە بە قەیتانەکانی بەسترابوون (ئەو دوو داوە، یان چەرم بووە، یان قایش، یان هەر شتێکی تر، کە داوێکیان لە نێوان پەنجە گەورەی پێ و، پەنجەی تەنیشتی بووە، داوەکەیتریش لە نێوان پەنجەی نێوەڕاست و پەنجەی تەنیشتی بووە).

**٣٦١٥- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ «كَانَ لِنَعْلِ النَّبِيِّ ﷺ قِبَالَانِ»[١].**

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: نەعلەکانی پێغەمبەر ﷺ دوو تاڵ قایشیان هەبوو، جێ پەنجەی هەبوو کە پەنجەکانی تێدەکرد.

## بابەت: لەپێ کردنی نەعل و دانانیان

**٣٦١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيُمْنَى، وَإِذَا خَلَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالْيُسْرَى»[٢].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێکتان نەعلی لەبەرکرد با بەلای ڕاست دەست پێبکات، وە ئەگەر داشیکەند با بەلای چەپ دەست پێبکات.

## بابەت: ڕۆیشتن بە تاکە نەعلێک

**٣٦١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَمْشِي أَحَدُكُمْ فِي نَعْلٍ وَاحِدٍ، وَلَا خُفٍّ وَاحِدٍ لِيَخْلَعْهُمَا جَمِيعًا، أَوْ لِيَمْشِ فِيهِمَا جَمِيعًا»[٣].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێکتان بە یەک تاکە نەعل، یان بە یەک سۆڵ (خوف) ڕێ نەکات، با هەردووکیان دابنێ یان هەردووکیان لەپێ بکات.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٠٧، وأبو داود: ٤١٣٤، والترمذي: ١٧٧٢_١٧٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٥٦، ومسلم: ٢٠٩٧، وأبو داود: ٤١٣٩، والترمذي: ١٧٧٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٥٥، ومسلم: ٢٠٩٧، وأبو داود: ٤١٣٦، والترمذي: ١٧٧٤.

## بابەت: نەعل لەپێ کردن بەپێوە

٣٦١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَنْتَعِلَ الرَّجُلُ قَائِمًا»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی کە مرۆڤ بە پێوە (بە ڕاوەستانەوە) نەعل بکاتە پێی.

٣٦١٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَنْتَعِلَ الرَّجُلُ قَائِمًا»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە کە پیاو (مرۆڤ) بەپێوە نەعل بکاتە پێی.

## بابەت: خوفی ڕەش

٣٦٢٠- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، «أَنَّ النَّجَاشِيَّ أَهْدَى لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ خُفَّيْنِ سَاذَجَيْنِ أَسْوَدَيْنِ، فَلَبِسَهُمَا»[3].

واتە: ئیبنو بورەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە نەجاشی دوو خوفی ڕەنگ ڕەشی چنراوی بە دیاری بە پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشی، پێغەمبەریش ﷺ لەپێی کردن.

## بابەت: ڕەنگکردن بە خەنە

٣٦٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لَا يَصْبُغُونَ، فَخَالِفُوهُمْ»[4].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لەبەرئەوەی جوولەکەو نەصڕانی (سەرو ڕیشیان) ڕەنگ ناکەن، ئێوە پێچەوانەی ئەوان بکەن (واتە: ڕەنگی بکەن).

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٧٧٥.

(٢) صحيح.

(٣) حسن. أخرجه مسلم: ٢٣١، والنسائي: ١٤٥.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٦٢ و ٥٨٩٩، ومسلم: ٢١٠٣، وأبو داود: ٤٢٠٣، والنسائي: ٥٠٧٢ و ٥٢٤١..

٣٦٢٢- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَحْسَنَ مَا غَيَّرْتُمْ بِهِ الشَّيْبَ الْحِنَّاءُ وَالْكَتَمُ»[1].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین و جوانترین شتێک کە ڕەنگی (مووی سپی) پیریتانی پێ بگۆڕن، ڕەنگی خەنەو وسمەیە.

**الكتم:** جۆرە ڕووەکێکە لەگەڵ خەنە تێکەڵ دەکرێ و مووی پێ ڕەنگ دەکرێ و پێی دەڵێن: وسمە.

٣٦٢٣- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ مَوْهَبٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ قَالَ: «فَأَخْرَجَتْ إِلَيَّ شَعَرًا مِنْ شَعْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَخْضُوبًا بِالْحِنَّاءِ وَالْكَتَمِ»[2].

واتە: عوسمانی کوڕی مەوهەب دەڵێ: چوومە ماڵی ئوممو سەلەمە ﷺ، گوتی: ئوممو سەلەمە ﷺ تاڵە قژێکی لە مووەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هێنام کە بە خەنەو وسم ڕەنگ کرابوو.

## بابەت: ڕەنگکردنی موو بە ڕەنگی ڕەش

٣٦٢٤- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: جِيءَ بِأَبِي قُحَافَةَ يَوْمَ الْفَتْحِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ: وَكَأَنَّ رَأْسَهُ ثَغَامَةٌ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اذْهَبُوا بِهِ إِلَى بَعْضِ نِسَائِهِ، فَلْتُغَيِّرْهُ، وَجَنِّبُوهُ السَّوَادَ»[3].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا، ئەبو قوفاحەیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە سەری وەکو ڕووەکی «ثغامة» سپی بوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ببەن بۆ لای یەکێک لە خێزانەکانی با ڕەنگی بۆ بگۆڕن و لە ڕەنگی ڕەشیش بیپارێزن (واتە: ڕەنگی ڕەشی لێ نەدەن).

٣٦٢٥- عَنْ صُهَيْبِ الْخَيْرِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَحْسَنَ مَا اخْتَضَبْتُمْ بِهِ لَهَذَا السَّوَادُ، أَرْغَبُ لِنِسَائِكُمْ فِيكُمْ، وَأَهْيَبُ لَكُمْ فِي صُدُورِ عَدُوِّكُمْ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٢٠٥، والترمذي: ١٧٥٣، والنسائي: ٥٠٧٧_٥٠٨٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٩٦.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٠٢/٧٩، وأبو داود: ٤٢٠٤، والنسائي: ٥٠٧٦ و ٥٢٤٢.

(٤) ضعيف.

واتە: صوهەیبی خەیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین و جوانترین بۆیە کە بۆ ڕەنگکردن (ی سەرو ڕیش) ئەو ڕەنگە ڕەشەیە، خێزانەکانتان حەزیان پێدێ و هۆی سام و هەیبەتیشە لە دڵ و دەروونی دوژمندا.

## بابەت: ڕەنگکردن بە ڕەنگی زەرد

**٣٦٢٦- عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّ عُبَيْدَ بْنَ جُرَيْجٍ، سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُكَ تُصَفِّرُ لِحْيَتَكَ بِالْوَرْسِ؟ فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَمَّا تَصْفِيرِي لِحْيَتِي فَإِنِّي: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَفِّرُ لِحْيَتَهُ»**[١].

واتە: سەعیدی کوڕی ئەبو سەعید دەگێڕێتەوە، عوبەیدی کوڕی جورەیج پرسیاری لە ئیبنو عومەر ﷺ کردو گوتی: تۆم دیتووە کە ڕیشت بە ڕەنگی زەردی وەڕس ڕەنگ دەکەی؟! ئیبنو عومەریش گوتی: ئەوە کە ڕیشم بە زەرد ڕەنگ کردوە، بێگومان بینیومە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی زەردی بۆ ڕیشی بەکاردەهێنا.

**٣٦٢٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رَجُلٍ قَدْ خَضَبَ بِالْحِنَّاءِ فَقَالَ: «مَا أَحْسَنَ هَذَا»، ثُمَّ مَرَّ بِآخَرَ قَدْ خَضَبَ بِالْحِنَّاءِ وَالْكَتَمِ فَقَالَ: «هَذَا أَحْسَنُ مِنْ هَذَا»، ثُمَّ مَرَّ بِآخَرَ قَدْ خَضَبَ بِالصُّفْرَةِ فَقَالَ: «هَذَا أَحْسَنُ مِنْ هَذَا كُلِّهِ» قَالَ: «وَكَانَ طَاوُسٌ يُصَفِّرُ»**[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەلای پیاوێکدا تێپەڕی کە بە خەنە پرچی ڕەنگ کردبوو، بۆیە فەرمووی: ئەو (ڕەنگکردنە) چەند جوانە!! پاشان بەلای یەکێکی تردا تێپەڕی کە خەنەو وسمەی بەکارهێنابوو، بۆیە فەرمووی: ئەمەیان لەوەیان جوانترە، پاشان بەلای یەکێکی تردا تێپەڕی کە ڕەنگی زەردی بەکارهێنابوو، بۆیە فەرمووی: ئەمەیان لە هەموویان جوانترە. ڕاوی دەڵێ: تاوس کە یەکێکە لە ڕاوییەکانی ئەم فەرموودەیە، ڕەنگی زەردی بەکاردەهێنا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦٦، ومسلم: ١١٨٧، وأبو داود: ١٧٧٢، والنسائي: ٥٢٤٣.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٢١١.




## بابەت: ئەو کەسەی کە سەرو ڕیشی ڕەنگ ناکات

**٣٦٢٨-** عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ هَذِهِ مِنْهُ بَيْضَاءُ» يَعْنِي عَنْفَقَتَهُ[١].

**واتە:** ئەبو جوحەیفە ﷺ دەڵێ: بینیومە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ژێر لێوی خوارەوەی ڕەنگی سپی بوو.

**٣٦٢٩-** عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سُئِلَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ: أَخَضَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «إِنَّهُ لَمْ يَرَ مِنَ الشَّيْبِ إِلَّا نَحْوَ سَبْعَةَ عَشَرَ، أَوْ عِشْرِينَ شَعَرَةً فِي مُقَدَّمِ لِحْيَتِهِ»[٢].

**واتە:** حومەید دەڵێ: پرسیار لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ کرا: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ سەرو ڕیشی ڕەنگ دەکرد؟ گوتی: پێغەمبەر ﷺ پیری لێ بەدەرنەدەکەوت تەنها نزیکەی حەڤدە، یان بیست تاڵە موو نەبێ لە پێشەوەی ڕیشی سپی ببوون.

**٣٦٣٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «كَانَ شَيْبُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَحْوَ عِشْرِينَ شَعَرَةً»[٣].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: مووی سپی پێغەمبەری خوا ﷺ نزیکەی بیست تاڵە موو بوو.

## بابەت: دروستکردنی پەلکە و کەزی وپەرچەم

**٣٦٣١-** عَنْ مُجَاهِدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَتْ أُمُّ هَانِئٍ ﷺ: «دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ وَلَهُ أَرْبَعُ غَدَائِرَ» تَعْنِي ضَفَائِرَ[٤].

**واتە:** موجاهید دەڵێ: ئوممو هانیئ ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی ڕۆیشتە مەککە، لەوکاتەدا پرچی کردبوو بە چوار پەلکەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٤٣ و ٣٥٤٥، ومسلم: ٢٣٤٢ و ٢٣٤٣، والترمذي مطولًا: ٢٨٢٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٤٨ و ٣٥٥٠، ومسلم: ٢٣٤١ و ٢٣٤٧، وأبو داود: ٤٢٠٩، والترمذي: ٣٦٢٣، والنسائي: ٥٠٥٣.

(٣) صحيح.

(٤) حسن. أخرجه أبو داود: ٤١٩١، والترمذي: ١٧٨١.

**٣٦٣٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَسْدُلُونَ أَشْعَارَهُمْ، وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ يَفْرُقُونَ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحِبُّ مُوَافَقَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ، قَالَ: «فَسَدَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَاصِيَتَهُ ثُمَّ فَرَقَ بَعْدُ»**(١).

واته: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: خاوەن کتێبەکان پرچیان بەردەدایەوە، هاوبەشدانەرانیش لە ناوەڕاستەوە دەیانکردە دوو بەش (بەشێک بۆ لای ڕاست و بەشێکیش بۆ لای چەپ)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆش بوو وەکو خاوەن کیتابەکان پرچی دابێنێ، (ڕاوی) گوتی: بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشە سەری بەردەدایەوە، پاشان لەناوەڕاستەوە کردیە دوو بەش (سەرەتا بەریداوەتەوە، دواتر وەکو حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ کردوویەتیە دوو بەش).

**٣٦٣٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «كُنْتُ أَفْرِقُ خَلْفَ يَافُوخِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ أَسْدِلُ نَاصِيَتَهُ»**(٢).

واته: عائیشە ﷺ دەڵێ: بەشی سەرەوەی قژی پێغەمبەری خوام ﷺ دەکردە دوو بەش (بەملاو لادا لامدەدا)، بەشی پێشەوەشم بۆ بەردەدایەوە (کاتێک سەری بۆ شانە کردوە).

**٣٦٣٤- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ «كَانَ شَعَرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَعَرًا رَجِلًا بَيْنَ أُذُنَيْهِ وَمَنْكِبَيْهِ»**(٣).

واته: ئەنەس ﷺ دەڵێ: مووەکانی سەری پێغەمبەری خوا ﷺ بەردرابوونەوە لە نێوان گوێیەکانی و شانەکانیدا.

**٣٦٣٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَعَرٌ دُونَ الْجُمَّةِ، وَفَوْقَ الْوَفْرَةِ»**(٤).

واته: عائیشە ﷺ دەڵێ: پرچی پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەگەیشتە سەر شانی و لە نەرمەی گوێکانیشی زیاتر بوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٥٨ و ٣٩٤٤ و ٥٩١٧، ومسلم: ٢٣٣٦، وأبو داود: ٤١٨٨، والنسائي: ٥٢٣٨.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤١٨٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٠٣، ومسلم: ٢٣٣٨، وأبو داود: ٤١٨٥ و ٤١٨٦، والترمذي: ١٧٥٤، والنسائي: ٥٠٥٣.

(٤) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤١٨٧، والترمذي: ١٧٥٥ الشطر الثاني.

## بابەت: ناپەسندی پرچی زۆر درێژ

**٣٦٣٦-** عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ، قَالَ: رَآنِي النَّبِيُّ ﷺ وَلِي شَعَرٌ طَوِيلٌ فَقَالَ: «ذُبَابٌ، ذُبَابٌ» فَانْطَلَقْتُ فَأَخَذْتُهُ، فَرَآنِيَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «إِنِّي لَمْ أَعْنِكَ، وَهَذَا أَحْسَنُ»[1].

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: کە پرچم زۆر درێژ بوو پێغەمبەر ﷺ منی بینی و فەرمووی: شومە، شومە، منیش چووم کورتم کردەوە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ منی بینییەوەو فەرمووی: بێگومان من مەبەستم تۆ نەبوو، بەڵام ئەوەیان جوانترو چاکترە.

## بابەت: نەهیکردن لە تاشینی هەندێکی پرچ و هێشتنەوەی ئەویتر

**٣٦٣٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْقَزَعِ»، قَالَ: وَمَا الْقَزَعُ؟ قَالَ: «أَنْ يُحْلَقَ مِنْ رَأْسِ الصَّبِيِّ مَكَانٌ وَيُتْرَكَ مَكَانٌ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە قەزەع، ڕاوی لێی پرسی و گوتی: قەزەع چییە؟ گوتی: قەزەع ئەوەیە کە بەشێکی پرچی سەری منداڵ بتاشی و بەشێکی بهێڵیەوە.

**٣٦٣٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْقَزَعِ»[3].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی کە بەشێکی سەر بتاشرێ و بەشێکیشی بهێڵرێتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٩٠، والنسائي: ٥٠٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٢٠ و ٥٩٢١، ومسلم: ٢١٢٠، وأبو داود: ٤١٩٣ و ٤١٩٤ بنحوه، والنسائي: ٥٠٥٠ و ٥٢٣٠ و ٥٢٣١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٢٠ و ٥٩٢١، ومسلم: ٢١٢٠، وأبو داود: ٤١٩٣ و ٤١٩٤ بنحوه، والنسائي: ٥٠٥٠ و ٥٢٣٠ و ٥٢٣١.

## بابەت: نەخشاندنی ئەنگوستیلە

**٣٦٣٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ ثُمَّ نَقَشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، فَقَالَ: «لَا يَنْقُشْ أَحَدٌ عَلَى نَقْشِ خَاتَمِي هَذَا»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی لە زیو دروست کرد، پاشان نەخشی «محمد رسول الله»ـی لەسەر هەڵکەند، بۆیە فەرمووی: هیچ کەسێک هاوشێوەی ئەو نەخشەیەی ئەنگوستیلەی من نەخش دروست نەکات (لەسەر ئەنگوستیلەکەی).**

**٣٦٤٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: اصْطَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمًا فَقَالَ: «إِنَّا قَدِ اصْطَنَعْنَا خَاتَمًا وَنَقَشْنَا فِيهِ نَقْشًا فَلَا يَنْقُشْ عَلَيْهِ أَحَدٌ»[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی دا بەدروست کردن، ئنجا فەرمووی: لەڕاستییدا ئەنگوستیلەیەکمان دروست کردووەو نەخشمان لەسەر هەڵکەندووە، جا با هیچ کەسێک ئەو نەخشە (لەسەر ئەنگوستیلەکەی) هەڵنەکەنێت.**

**٣٦٤١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ لَهُ فَصٌّ حَبَشِيٌّ، وَنَقْشُهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ»[٣].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی زیوی دروست کرد، کە نەقێمەی حەبەشی بوو، نەخشەکەشی «محمد رسول الله» بوو.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٦٥، ومسلم: ٢٠٩١، وأبو داود: ٤٢١٨ و ٤٢١٩ مطولًا، والترمذي: ١٧٤٥، والنسائي: ٥٢١٦ و ٥٢٨٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٧٤، ومسلم: ٢٠٩٢، وأبو داود: ٤٢١٤، والترمذي: ١٧٤٥ و ٢٧١٨، والنسائي: ٥١٩٦ و ٥٢٠١ و ٥٢٠٨ و ٥٢٧٨ و ٥٢٨١.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٩٤، وأبو داود: ٤٢١٦، والترمذي: ١٧٣٩، والنسائي: ٥١٩٦ و ٥١٩٧ و ٥٢٧٧ و ٥٢٧٩.

## بابەت: نەهی کردن لە ئەنگوستیلەی زێڕ

**٣٦٤٢- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ التَّخَتُّمِ بِالذَّهَبِ»[١].**

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی کە ئەنگوستیلەی زێڕ بکرێتە دەست (بۆ پیاوان).

**٣٦٤٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ»[٢].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە ئەنگوستیلەی زێڕ (بۆ پیاوان).

**٣٦٤٤- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ قَالَتْ: أَهْدَى النَّجَاشِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَلْقَةً فِيهَا خَاتَمُ ذَهَبٍ فِيهِ فَصٌّ حَبَشِيٌّ، فَأَخَذَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعُودٍ، وَإِنَّهُ لَمُعْرِضٌ عَنْهُ - أَوْ بِبَعْضِ أَصَابِعِهِ - ثُمَّ دَعَا بِابْنَةِ ابْنَتِهِ أُمَامَةَ بِنْتِ أَبِي الْعَاصِ، فَقَالَ: «تَحَلَّي بِهَذَا يَا بُنَيَّةُ»[٣].**

واتە: دایکی بڕواداران عائیشە ﷺ دەڵێ: نەجاشی خشڵێکی بە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نارد کە ئەنگوستیلەیەکی زێڕی تێدابوو، نەقێمەکەی حەبەشی بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە دارێک، یان بە پەنجەی گرتی و لەڕاستیدا پشتی تێکرد، پاشان بانگی کچی کچەکەی (نەوەکەی) کرد کە ئومامەی کچی ئەبولعاص بوو، وە فەرمووی: ڕۆڵەکەم بەو ئەنگوستیلەیە خۆت برازێنەوە (واتە: بیکە دەستت).

## بابەت: نەقێمی ئەنگوستیلە کە بکەوێتە لای بەری دەست

**٣٦٤٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَجْعَلُ فَصَّ خَاتَمِهِ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ»[٤].**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٧٨، وأبو داود: ٤٠٤٤، والترمذي: ٢٦٤ و ١٧٢٥ و ١٧٣٧، والنسائي: ١٠٤٠_١٠٤٤ و ١١١٨ و ٥١٦٥_٥١٨٥ و ٥٢٦٧ و ٥٢٧٢ و ٥٣١٨.

(٢) صحيح بما قبله.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٢٣٥.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٦٥، ومسلم: ٢٠٩١، وأبو داود: ٤٢١٨ مطولًا، والترمذي: ١٧٤٠، والنسائي: ٥٢١٦ و ٥٢٨٨.




واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نەقێمی ئەنگوستیلەکەی خستبووە بەری دەستی.

٣٦٤٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَبِسَ خَاتَمَ فِضَّةٍ فِيهِ فَصٌّ حَبَشِيٌّ كَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ فِي بَطْنِ كَفِّهِ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی زیوی کردبووە دەستی، نەقێمێکی حەبەشی پێوەبوو، پێغەمبەر ﷺ نەقێمەکەی دەخستە لای بەری دەستی.

## بابەت: ئەنگوستیلە کردنە دەستی ڕاست

٣٦٤٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەی دەکردە دەستی ڕاستی.

## بابەت: ئەنگوستیلە کردنە پەنجە گەورە

٣٦٤٨- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: «نَهَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ أَتَخَتَّمَ فِي هَذِهِ وَفِي هَذِهِ»، يَعْنِي الْخِنْصَرَ وَالْإِبْهَامَ[٣].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێکردووم کە ئەنگوستیلە بکەمە ئەو پەنجەو ئەو پەنجەیان، واتە: پەنجە تووتەو پەنجە گەورە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٩٤، وأبو داود: ٤٢١٦، والترمذي: ١٧٣٩، والنسائي: ٥١٩٦ و ٥١٩٧ و ٥٢٧٧ و ٥٢٧٩.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٧٤٤، والنسائي: ٥٢٠٤.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٧٨، وأبو داود: ٤٢٢٥، والترمذي: ١٧٨٦، والنسائي: ٥٢١٠_٥٢١٢.

## بابەت: وێنە لەناوماڵدا

**٣٦٤٩- عَنْ أَبِي طَلْحَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ، وَلَا صُورَةٌ»[1].**

واتە: ئەبو تەڵحە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فریشتەکان ناچنە ناو ماڵێکەوە کە سەگ و، وێنەی تێدا بێت.

**٣٦٥٠- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْمَلَائِكَةَ لَا تَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ، وَلَا صُورَةٌ»[2].**

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان فریشتەکان ناچنە ناو ماڵێک کەوا سەگ و، وێنەی تێدا بێت.

**٣٦٥١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: وَاعَدَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جِبْرِيلُ ﷺ فِي سَاعَةٍ يَأْتِيهِ فِيهَا، فَرَاثَ عَلَيْهِ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فَإِذَا هُوَ بِجِبْرِيلَ قَائِمٌ عَلَى الْبَابِ. فَقَالَ: «مَا مَنَعَكَ أَنْ تَدْخُلَ»، قَالَ: «إِنَّ فِي الْبَيْتِ كَلْبًا، وَإِنَّا لَا نَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلَا صُورَةٌ»[3].**

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ جیبریلدا ﷺ کاتێکی دیاریکراویان هەبوو بۆ چاوپێکەوتن، ماوەی چاوەڕوانییەکە درێژەی کێشاو دواکەوت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ چۆیە دەرەوە بینی وا جیبریل لەبەر دەرگا وەستاوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: چی شتێک ڕێگر بووە کە نەهاتویتە ژوورەوە؟ جیبریل فەرمووی: چونکە لە ناو ماڵەکەدا سەگێک هەیە، وە بێگومان ئێمەش ناچینە ناو ماڵێک کە سەگ و وێنەی تێدا بێت.

**٣٦٥٢- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرَتْهُ أَنَّ زَوْجَهَا فِي بَعْضِ الْمَغَازِي، فَاسْتَأْذَنَتْهُ أَنْ تُصَوِّرَ فِي بَيْتِهَا نَخْلَةً، «فَمَنَعَهَا - أَوْ نَهَاهَا -»[4].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٢٥، ومسلم: ٢١٠٦، وأبو داود: ٤١٥٣ و ٤١٥٥، والترمذي: ٢٨٠٤، والنسائي: ٤٢٨٢ و ٥٣٤٧_٥٣٥٠.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٧ و ٤١٥٢، والنسائي: ٢٦١ و ٤٢٨١.

(٣) صحيح.

(٤) ضعيف.

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا هەواڵی بە پێغەمبەردا ﷺ کە مێردەکەی لە غەزایە (بۆیە بۆخۆی هاتووە)، ئنجا داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر ﷺ کرد کەوا لە ماڵەوە وێنەی داری خورما بکێشێ، پێغەمبەریش ﷺ ڕێگەی پێنەدا، یان نەهی لێکرد.

## بابەت: وێنە لەسەر شتێک کە بکەوێتە بەر پێیان

**٣٦٥٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «سَتَرْتُ سَهْوَةً لِي - تَعْنِي الدَّاخِلَ - بِسِتْرٍ فِيهِ تَصَاوِيرُ، فَلَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ هَتَكَهُ، فَجَعَلْتُ مِنْهُ مَنْبُوذَتَيْنِ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ مُتَّكِئًا عَلَى إِحْدَاهُمَا»[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: داخیلەیەکی کەل و پەلم بە پەردەیەکی وێنەدار داپۆشی بوو، جا کاتێک پێغەمبەر ﷺ هاتەوە پارچە پارچەو لەتی کرد، منیش کردمە دوو ڕاخەر، جا بینیم کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر یەکێکیان پاڵی دابۆوە.

## بابەت: جلی وڵاخ کە ئاوریشمی سوور بێت

**٣٦٥٤-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ خَاتَمِ الذَّهَبِ، وَعَنِ الْمِيثَرَةِ» يَعْنِي الْحَمْرَاءَ[٢].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە ئەنگوستیلەی زێڕو لە پۆشینی پۆشاکی صاف سوور، (کە هیچ ڕەنگی دیکەی لەگەڵ نەبێت) واتە: هی سوور.

**الْمَيَاثِر:** ڕاخەرێک بوو لەسەر کورتانی ئەسپ، یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوور بوو، لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووتبەرزەکان بوو).

---

(١) ضعيف. أخرجه مسلم: ٢١٠٧/٨٨، والترمذي: ٢٤٦٨، والنسائي: ٧٦١ و ٥٣٥٢_٥٣٥٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠٧٨، وأبو داود: ٤٠٥١، والترمذي: ٢٨٠٨، والنسائي: ٥١٦٥ و ٥١٦٦ و ٥١٦٧.

## بابەت: سواربوون لەسەر پێستەی پڵنگەوە

**٣٦٥٥-** عَنْ عَامِرٍ الْحَجْرِيِّ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا رَيْحَانَةَ، صَاحِبَ النَّبِيِّ ﷺ يَقُولُ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَنْهَى عَنْ رُكُوبِ النُّمُورِ»[١].

**واتە:** عامیری حەجەریی ﵁ دەڵێ: گوێم لە ئەبو ڕەیحانەی هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوو دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە سواری ئەو وڵاخانەی کە لەسەر جلەکەیان پێستی پڵنگ بێ (چونکە بۆ فیزو لووت بەرزییە، یان چونکە پێستەکە بە خۆشەکردنیش پاک نابێتەوە).

**٣٦٥٦-** عَنْ مُعَاوِيَةَ ﵁ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عَنْ رُكُوبِ النُّمُورِ»[٢].

**واتە:** موعاویە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی دەکرد لە سواربوونی وڵاخێک کە سەرجلەکەی پێستەی پڵنگ بووایە.

* * *

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٠٤٩، والنسائي: ٥٠٩١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤١٢٩.

## بابەت: چاکبوون لەگەڵ دایک و باوک

**٣٦٥٧-** عَنْ أَبِي سَلَامَةَ السَّلَامِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أُوصِي امْرَأً بِأُمِّهِ، أُوصِي امْرَأً بِأُمِّهِ، أُوصِي امْرَأً بِأُمِّهِ - ثَلَاثًا - أُوصِي امْرَأً بِأَبِيهِ، أُوصِي امْرَأً بِمَوْلَاهُ الَّذِي يَلِيهِ، وَإِنْ كَانَ عَلَيْهِ مِنْهُ أَذًى يُؤْذِيهِ»(١).

واتە: ئەبو سەلامەی سەلامیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئامۆژگاری هەر مرۆڤێک دەکەم کە لەگەڵ دایکیدا زۆر باش بێت، ئامۆژگاری هەر مرۆڤێک دەکەم کە لەگەڵ دایکیدا چاکەکارو باش بێت، ئامۆژگاری هەر مرۆڤێک دەکەم لەگەڵ دایکیدا چاکەکارو باش بێت، سێ جار ئەوەی فەرموو، (ئنجا فەرمووی:) ئامۆژگاری و وەسیەتی هەر مرۆڤێک دەکەم لەگەڵ باوکیدا چاک بێت، وەسیەت دەکەم کە هەموو کەس لەگەڵ ئەو گەورەیەی کە سەرپەرشتی دەکات باش بێ، هەرچەندە ئازاریشی بدات.

**٣٦٥٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: «أُمَّكَ». قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمَّكَ». قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أَبَاكَ». قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «الْأَدْنَى فَالْأَدْنَى»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کێ دا زۆر چاکەکار بم؟ فەرمووی: دایکت، گوتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: دایکت، گوتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: باوکت، گوتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: ئەوجار نزیکترو نزیک (واتە: کێ لێت نزیکترە ئەویان زیاتر هەقی بەسەرتەوە هەیە، لەوەی کە لێت دوورترە).

**٣٦٥٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَجْزِي وَلَدٌ وَالِدَهُ، إِلَّا أَنْ يَجِدَهُ مَمْلُوكًا فَيَشْتَرِيَهُ فَيُعْتِقَهُ»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ منداڵێک ناتوانێ چاکەی باوکی بداتەوە، مەگەر باوکی کۆیلە بێ و ئەویش بیکڕێتەوەو ئازادی بکات.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٧١، ومسلم: ٢٥٤٨ بنحوه عندهما.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥١٠، وأبو داود: ٥١٣٧، والترمذي: ١٩٠٦.

٣٦٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْقِنْطَارُ اثْنَا عَشَرَ أَلْفَ أُوقِيَّةٍ، كُلُّ أُوقِيَّةٍ خَيْرٌ مِمَّا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ» وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الرَّجُلَ لَتُرْفَعُ دَرَجَتُهُ فِي الْجَنَّةِ فَيَقُولُ: أَنَّى هَذَا؟ فَيُقَالُ: بِاسْتِغْفَارِ وَلَدِكَ لَكَ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «قنطار»ێک دوازدە هەزار ئۆقیەیە، هەر یەکێکیش لەو ئۆقیانە باشترە لەوەی کە لە نێوان ئاسمان و زەویدایە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی مرۆڤ هەیە لە بەهەشتدا بەردەوام پلەکانی بەرز دەکرێنەوە، ئەویش دەڵێ: ئەو پاداشت و پلە بەرزبوونەوەیە لە کوێوەیە؟ پێی دەگوترێ: بە هۆی دوعاو پاڕانەوەکانی منداڵەکەتە بۆت.

٣٦٦١- عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: قَالَ «إِنَّ اللَّهَ يُوصِيكُمْ بِأُمَّهَاتِكُمْ ثَلَاثًا، إِنَّ اللَّهَ يُوصِيكُمْ بِآبَائِكُمْ، إِنَّ اللَّهَ يُوصِيكُمْ بِالْأَقْرَبِ فَالْأَقْرَبِ»[2].

واتە: میقدامی کوڕی مەعدی کەریب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا وەسیەت و ئامۆژگاریتان دەکات کە لەگەڵ دایکانتان چاکەکاربن، سێ جار ئاوای فەرموو، (پاشان فەرمووی:) بێگومان خوا وەسیەت و ئامۆژگاریتان دەکات لەگەڵ باوکتان چاکەکاربن، بێگومان خوا وەسیەت و ئامۆژگاریتان دەکات کە لەگەڵ نزیکترینەکانتان پلە بە پلە چاکەکارو باش بن.

٣٦٦٢- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا حَقُّ الْوَالِدَيْنِ عَلَى وَلَدِهِمَا؟ قَالَ: «هُمَا جَنَّتُكَ وَنَارُكَ»[3].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا مافی باوک و دایک لەسەر منداڵەکانیان چییە؟ فەرمووی: ئەوان بەهەشت و دۆزەخی تۆن (واتە: بە چاکەکردن لەگەڵیان بەهەشتت مسۆگەر دەبێ، بە خراپ بوونت لەگەڵیان دۆزەخت دەست دەکەوێ، خوا پەنامان بدات یارب).

---

(١) حسن.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف.

٣٦٦٣- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، فَأَضِعْ ذَلِكَ الْبَابَ أَوِ احْفَظْهُ»[1].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە دەیفەرموو: باوک دەرگای ناوەڕاستی بەهەشت، جا (خۆت سەرپشکی)، یان ئەو دەرگایە دابخەو وازی لێبێنە، یان پارێزگاری لێبکەو دەستی پێوەبگرە.

## بابەت: پەیوەندی هەبوون لەگەڵ ئەوانەی باوک پەیوەندی لەگەڵیان هەبووە

٣٦٦٤- عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ مَالِكِ بْنِ رَبِيعَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلَمَةَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَبَقِيَ مِنْ بِرِّ أَبَوَيَّ شَيْءٌ أَبَرُّهُمَا بِهِ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهِمَا؟ قَالَ: «نَعَمْ، الصَّلَاةُ عَلَيْهِمَا، وَالِاسْتِغْفَارُ لَهُمَا، وَإِيفَاءٌ بِعُهُودِهِمَا مِنْ بَعْدِ مَوْتِهِمَا، وَإِكْرَامُ صَدِيقِهِمَا، وَصِلَةُ الرَّحِمِ الَّتِي لَا تُوصَلُ إِلَّا بِهِمَا»[2].

واتە: ئەبو ئوسەید مالیکی کوڕی ڕەبیعە ﷺ دەڵێ: لەوکاتەیدا کە ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین یەکسەر پیاوێک لە هۆزی بەنو سەلەمە هاتە خزمەتی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە دوای مردنی دایک و باوکم هیچ شتێک ماوە لە چاکە بۆیان بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، داوای سۆزو میهرەبانی خوایان بۆ بکەو داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکەو بەڵێنەکانیان جێبەجێ بکە لە دوای مردنیان و ڕێزی هاوڕێیەکانیان بگرەو ئەو پەیوەندییە خزمایەتییەش جێبەجێ بکە کە بە هۆی ئەوانەوەیە.

## بابەت: چاکەی باوک و چاکەکردن لەگەڵ کچەکاندا

٣٦٦٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَدِمَ نَاسٌ مِنَ الْأَعْرَابِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالُوا: أَتُقَبِّلُونَ صِبْيَانَكُمْ؟ قَالُوا: نَعَمْ، فَقَالُوا: لَكِنَّا وَاللَّهِ مَا نُقَبِّلُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَأَمْلِكُ أَنْ كَانَ اللَّهُ قَدْ نَزَعَ مِنْكُمُ الرَّحْمَةَ؟»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٩٠٠.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٥١٤٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٩٨، ومسلم: ٢٣١٧.




واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: کۆمەڵێک لە دەشتەکییەکان هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتیان: ئایا ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن؟ گوتیان: بەڵێ، ئەوانیش گوتیان: بەڵام سوێند بە خوا ئێمە ماچیان ناکەین، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جا من دەسەڵاتی چیم هەیە کە خوا سۆزو بەزەیی لە دڵتاندا نەهێشتوون؟!

**٣٦٦٦- عَنْ يَعْلَى الْعَامِرِيِّ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ ﵄ يَسْعَيَانِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَضَمَّهُمَا إِلَيْهِ وَقَالَ: «إِنَّ الْوَلَدَ مَبْخَلَةٌ مَجْبَنَةٌ»**[١].

واتە: یەعلای عامیریی ﵁ دەڵێ: حەسەن و حوسەین ﵄ هاتن و بە ڕاکردن چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ لە باوەشی کردن و بەخۆیەوە گوشینی و فەرمووی: بەڕاستی منداڵ هۆکاری ڕەزیلی و چروکی و ترسنۆکی باوک و دایکییەتی (بەهۆی منداڵەوە باوک دەست بە ماڵەکەیەوە دەگرێ و نابەخشێ تا بۆ منداڵەکەی کۆبکاتەوە، وە هەر بەهۆی منداڵەکەوە لە مردن دەترسێ و ناچێتە غەزاو ترسنۆک دەبێ).

**٣٦٦٧- عَنْ سُرَاقَةَ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى أَفْضَلِ الصَّدَقَةِ؟ ابْنَتُكَ مَرْدُودَةً إِلَيْكَ، لَيْسَ لَهَا كَاسِبٌ غَيْرُكَ»**[٢].

واتە: سوڕاقەی کوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئایا گەورەترین چاکەو خێرو بێرتان پێ بڵێم؟ (گوتیان: بەڵێ، فەرمووی:) ئەو کچەیە کە دەگێردرێتەوە بۆ تۆ (بەهۆی تەڵاق، یان مردنی هاوژینەکەی) کە هیچ کاسبکارو بژێو پەیداکەرێکی نیە جگە لە تۆ.

**٣٦٦٨- عَنْ صَعْصَعَةَ ﵁، عَمِّ الْأَحْنَفِ، قَالَ: دَخَلَتْ عَلَى عَائِشَةَ ﵂ امْرَأَةٌ مَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا، فَأَعْطَتْهَا ثَلَاثَ تَمَرَاتٍ، فَأَعْطَتْ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا تَمْرَةً، ثُمَّ صَدَعَتِ الْبَاقِيَةَ بَيْنَهُمَا، قَالَتْ: فَأَتَى النَّبِيُّ ﷺ، فَحَدَّثَتْهُ، فَقَالَ: «مَا عَجَبُكِ لَقَدْ دَخَلَتْ بِهِ الْجَنَّةَ»**[٣].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٣٠.




واتە: صەعصەعە مامی ئەحنەف ﷺ کە مامی ئەحنەفە، دەڵێ: ژنێک هاتە ماڵی عائیشە ﷺ، دوو کچی لەگەڵ بوو، (عائیشە) سێ دەنک خورمای پێدا، ژنەکەش هەر کچەو خورمایەکی پێداو دانەکەی تریشی لە نێوانیاندا دابەش کرد، گوتی: جا پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هاتەوەو بۆی گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: بۆ پێت سەیرە؟ بەهۆی ئەو کارەیەوە چۆتە بەهەشتەوە.

**٣٦٦٩**- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ كَانَ لَهُ ثَلَاثُ بَنَاتٍ فَصَبَرَ عَلَيْهِنَّ، وَأَطْعَمَهُنَّ، وَسَقَاهُنَّ، وَكَسَاهُنَّ مِنْ جِدَتِهِ كُنَّ لَهُ حِجَابًا مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»(١).

واتە: عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک سێ کچی هەبێ و لەسەریان ئارام بگرێ و خواردن و خواردنەوەو پۆشاکیان پێ بدات لە ماڵ و سامانی خۆی (بەپێی پێویست) ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی دەبن بەهۆی پەردەو ڕێگر لە ئاگر.

**٣٦٧٠**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ رَجُلٍ تُدْرِكُ لَهُ ابْنَتَانِ، فَيُحْسِنُ إِلَيْهِمَا مَا صَحِبَتَاهُ - أَوْ صَحِبَهُمَا - إِلَّا أَدْخَلَتَاهُ الْجَنَّةَ»(٢).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر پیاوێک دوو کچی پێگەیاندو لەگەڵیان چاکەکار بێ تا لەگەڵیدابن یان لەگەڵیان بێ، ئەوە بێگومان دەبنە هۆی ئەوەی (ئەو پیاوە) بەهەشتی مسۆگەر بێ.

**٣٦٧١**- عَنْ الْحَارِثُ بْنُ النُّعْمَانِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يُحَدِّثُ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَكْرِمُوا أَوْلَادَكُمْ وَأَحْسِنُوا أَدَبَهُمْ»(٣).

واتە: حاریسی کوڕی نوعمان دەڵێ: گوێم لێ بوو، ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەیگێڕایەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ڕێز لە منداڵەکانتان بگرن و بە جوانترین شێوە پەروەردەیان بکەن.

---

(١) صحيح.

(٢) حسن ليغره.

(٣) ضعيف.

## بابەت: مافی دراوسێ

**٣٦٧٢-** عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلْيُحْسِنْ إِلَى جَارِهِ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَسْكُتْ»[١].

**واتە:** ئەبو شورەیحی خوزاعیی ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با لەگەڵ دراوسێکانی باش بێ، وە هەر کەسێک بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانەکەی بگرێ، وە هەر کەسێک بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با هەمیشە قسەی چاک بکات، یان بێدەنگ بێت.

**٣٦٧٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ»[٢].

**واتە:** عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام جیبریل باسی مافی دراوسێی بۆ دەکردم، هەتا وایلێهات گومان بکەم کە (دراوسێ) میرات لە یەکتر دەگرن.

**٣٦٧٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا زَالَ جِبْرَائِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ»[٣].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام جیبریل باسی مافی دراوسێی بۆ دەکردم، هەتا وایلێهات گومان بکەم کە (دراوسێ) میرات لە یەکتر دەگرن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠١٩، ومسلم: ٤٨ وبإثر ١٧٢٦، والترمذي: ١٩٦٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠١٤، ومسلم: ٢٦٢٤، وأبو داود: ٥١٥١، والترمذي: ١٩٤٣.

(٣) صحيح.

## بابەت: مافی میوان

٣٦٧٥- عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ وَجَائِزَتُهُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَلَا يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَثْوِيَ عِنْدَ صَاحِبِهِ حَتَّى يُحْرِجَهُ، الضِّيَافَةُ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، وَمَا أَنْفَقَ عَلَيْهِ بَعْدَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فَهُوَ صَدَقَةٌ»(١).

واتە: ئەبو شوڕەیحی خوزاعیی  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێزی میوانەکەی بگرێ، وە شەوو ڕۆژێک دەبێ باشترین میوانداری لێبکات، وە دروست نیە بۆ میوان کە ئەوەندە بمێنێتەوە خانەخوێکەی بێزار بکات، میوانداری سێ ڕۆژە، پاشی سێ ڕۆژەکان هەرچی پێی بدات ئەوە بە خێرو چاکە ئەژمار دەکرێ (ڕۆژی یەکەم بەپێی توانا دەبێ خزمەتی بکرێ، دوو ڕۆژەکەی تر بە شێوەیەکی ئاسایی وەکو دابونەریت چۆنە ئاوا، لە سێ ڕۆژ بەدواوە هەرچی پێی بدات خێرو صەدەقەیە، نەک مافی میوانە لەسەر خانەخوێ).

٣٦٧٦- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ، أَنَّهُ قَالَ: قُلْنَا لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّكَ تَبْعَثُنَا فَنَنْزِلُ بِقَوْمٍ فَلَا يَقْرُونَا، فَمَا تَرَى فِي ذَلِكَ؟ قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنْ نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ، فَأَمَرُوا لَكُمْ بِمَا يَنْبَغِي لِلضَّيْفِ فَاقْبَلُوا، وَإِنْ لَمْ يَفْعَلُوا، فَخُذُوا مِنْهُمْ حَقَّ الضَّيْفِ الَّذِي يَنْبَغِي لَهُمْ»(٢).

واتە: عوقبەی کوڕی عامیر  دەڵێ: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کە دەماننێری بۆ شوێنێک جار هەیە لای خەڵکانێک لادەدەین کە مافی میوانداریمان پێ نادەن، لەوکاتەدا فەرمانی چیمان پێدەکەی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: ئەگەر لای خەڵکانێک لاتانداو ئەوەی بۆ میوان پێویستە بۆیان جێبەجێ کردن ئەوە پێی ڕازی بن، خۆ ئەگەر ئەوەیان نەکرد، ئەوە بە ئەندازەی پێویست مافی میوانداریيان لێ وەربگرن کە میوانداریيان لەسەر پێویست بوو.

٣٦٧٧- عَنِ الْمِقْدَامِ أَبِي كَرِيمَةَ  قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْلَةُ الضَّيْفِ وَاجِبَةٌ، فَإِنْ أَصْبَحَ بِفِنَائِهِ فَهُوَ دَيْنٌ عَلَيْهِ، فَإِنْ شَاءَ اقْتَضَى، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٣٥، ومسلم: ٤٨/٧٧، وأبو داود: ٣٧٤٨، والترمذي: ١٩٦٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٦١، ومسلم: ١٧٢٧، وأبو داود: ٣٧٥٢، والترمذي: ١٥٨٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٧٥٠.

واتە: میقدامی ئەبو کەریمە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەوی یەکەمی میوانداری پێویست و واجبە (لەسەر خانەخوێ)، جا ئەگەر میوان بەیانی کردەوەو مافی میوانیان پێنەدا ئەوە قەرزە لەسەر خاوەن ماڵ، ئەگەر پێی خۆش بوو با لێیان وەرگرێتەوە (لە خانەخوێ)، یان لە مافی خۆی خۆش ببێت.

## بابەت: مافی هەتیو (بێ باوک)

**٣٦٧٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أُحَرِّجُ حَقَّ الضَّعِيفَيْنِ: الْيَتِيمِ، وَالْمَرْأَةِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە من مافی دوو چینی لاواز دەستێنم (لەو خەڵکەی مافی زەوت کردوون، ئەوانیش): هەتیو و ئافرەتان.

**٣٦٧٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ بَيْتٍ فِي الْمُسْلِمِينَ بَيْتٌ فِيهِ يَتِيمٌ يُحْسَنُ إِلَيْهِ، وَشَرُّ بَيْتٍ فِي الْمُسْلِمِينَ بَيْتٌ فِيهِ يَتِيمٌ يُسَاءُ إِلَيْهِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: باشترین ماڵێک لە ماڵی مسوڵمانان ئەو ماڵەیە کە بێ باوکی تێدابێ و لەگەڵیدا چاکەکاربن، وە خراپترینی ماڵی ناو مسوڵمانان ماڵێکە کە بێ باوکی تێدا بێ و لەگەڵی خراپ بن.

**٣٦٨٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ عَالَ ثَلَاثَةً مِنَ الْأَيْتَامِ كَانَ كَمَنْ قَامَ لَيْلَهُ وَصَامَ نَهَارَهُ، وَغَدَا وَرَاحَ شَاهِرًا سَيْفَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَكُنْتُ أَنَا وَهُوَ فِي الْجَنَّةِ أَخَوَيْنِ كَهَاتَيْنِ أُخْتَانِ» وَأَلْصَقَ إِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةَ وَالْوُسْطَى»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سێ بێ باوک بەخێو بکات، وەکو ئەو کەسە وایە کە شەو بێدارە (بۆ شەونوێژ) و ڕۆژەکەی بەڕۆژوو بووبێ، وەکو ئەوە وایە کە بەیانی کردبێتەوەو

---

(١) حسن.

(٢) ضعیف.

(٣) ضعیف.

شمشێری گرتبێته دەست و ڕۆیشتبێ بۆ غەزا لە پێناوی خوا، وە من و ئەو کەسە لە بەهەشت وەکو برا لەیەک نزیکین وەکو ئەو دوو خوشکانە، (ڕاوی دەڵێ:) پەنجەی شایەتمان و پەنجەی ناوەڕاستی بەیەکەوە نوساند.

## بابەت: لابردنی دڕک و داڵ و ناڕەحەتی لەسەر ڕێگا

**٣٦٨١- عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ أَنْتَفِعُ بِهِ، قَالَ: «اعْزِلِ الْأَذَى عَنْ طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ»(١).**

واتە: ئەبو بەرزەی ئەسلەمیی ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کارێکم ڕێنوێنی بکە کە سوودی هەبێ بۆم، فەرمووی: دڕک و داڵ و ناڕەحەتی لەسەر ڕێگای مسوڵمانان لابدە.

**٣٦٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كَانَ عَلَى الطَّرِيقِ غُصْنُ شَجَرَةٍ يُؤْذِي النَّاسَ فَأَمَاطَهَا رَجُلٌ، فَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ»(٢).**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لەسەر ڕێگا چقڵ و چاڵی دارێک هەبوو کە خەڵکی ئازار دەدا، جا پیاوێک لەسەر ڕێگاکە لایبردو فڕێیدا، بەهۆیەوە خرایە ناو بەهەشت.

**٣٦٨٣- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «عُرِضَتْ عَلَيَّ أُمَّتِي بِأَعْمَالِهَا حَسَنِهَا وَسَيِّئِهَا، فَرَأَيْتُ فِي مَحَاسِنِ أَعْمَالِهَا: الْأَذَى يُنَحَّى عَنِ الطَّرِيقِ، وَرَأَيْتُ فِي سَيِّئِ أَعْمَالِهَا: النُّخَاعَةَ فِي الْمَسْجِدِ لَا تُدْفَنُ»(٣).**

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئوممەتەکەم بە کردەوەکانیانەوە نیشانمدران بە کردەوەی چاک و خراپیانەوە، جا بینیم کە لادان و فڕێدانی ئازار لەسەر ڕێگا لەناو کردەوە چاکەکاندا بوو، وە لە ناو کردەوە خراپەکانیشدا بەڵغەم فڕێدانم بینی لە ناو مزگەوتدا بەبێ شاردنەوە (دانەپۆشرابوو).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦١٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٢، ومسلم: ١٩١٤ وبإثر ٢٦١٧، وأبو داود: ٥٢٤٦، والترمذي: ١٩٥٨.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٥٣.

## بابەت: گەورەیی چاکەکردن بە ئاوەوە (خێراو)

٣٦٨٤- عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «سَقْيُ الْمَاءِ»[١].

واتە: سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە باشترینی چاکەخوازی کامەیانە؟ فەرمووی: ئاودان بە خەڵک.

٣٦٨٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَصُفُّ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صُفُوفًا - وَقَالَ: ابْنُ نُمَيْرٍ أَهْلُ الْجَنَّةِ - فَيَمُرُّ الرَّجُلُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ عَلَى الرَّجُلِ فَيَقُولُ: يَا فُلَانُ أَمَا تَذْكُرُ يَوْمَ اسْتَسْقَيْتَ فَسَقَيْتُكَ شَرْبَةً؟ قَالَ: فَيَشْفَعُ لَهُ، وَيَمُرُّ الرَّجُلُ فَيَقُولُ: أَمَا تَذْكُرُ يَوْمَ نَاوَلْتُكَ طَهُورًا؟ فَيَشْفَعُ لَهُ قَالَ: ابْنُ نُمَيْرٍ - وَيَقُولُ: يَا فُلَانُ أَمَا تَذْكُرُ يَوْمَ بَعَثْتَنِي فِي حَاجَةِ كَذَا وَكَذَا فَذَهَبْتُ لَكَ، فَيَشْفَعُ لَهُ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی ڕیز دەکرێن - ئیبنو نومەیر (کە یەکێکە لە ڕاوییەکان) گوتی: خەڵکی بەهەشت ڕیز دەکرێن - جا پیاو هەیە کە شایستەی ناو ئاگرەو بەلای پیاوێکی تردا تێدەپەڕێ و دەڵێ: ئایا لە بیرت نیە ڕۆژێک داوای ئاوی خواردنەوەت کرد منیش ئاوی خواردنەوەم پێتدا؟ فەرمووی: جا ئەو پیاوە دەبێتە تکاکار بۆی، وە پیاوێک بەلای پیاوێکیتردا تێدەپەڕێ و دەڵێ: ئایا لە بیرت نیە کە ڕۆژێک ئاوی دەستنوێژم بۆت هێنا، ئەویش دەبێتە تکاکار بۆی، ئیبنو نومەیر گوتی: وە دەڵێ: ئەی فڵان ئایا لە بیرت نیە جارێک بۆ فڵان پێویستی منت نارد منیش ڕۆیشتم بەدوایدا؟ ئەویش دەبێتە تکاکار بۆی.

٣٦٨٦- عَنْ سُرَاقَةَ بْنِ جُعْشُمٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ضَالَّةِ الْإِبِلِ تَغْشَى حِيَاضِي، قَدْ لُطْتُهَا لِإِبِلِي، فَهَلْ لِي مِنْ أَجْرٍ إِنْ سَقَيْتُهَا؟ قَالَ: «نَعَمْ، فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ حَرَّى أَجْرٌ»[٣].

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٦٧٩_١٦٨١، والنسائي: ٣٦٦٤ و ٣٦٦٥ و ٣٦٦٦.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.



واتە: سوڕاقەی کوڕی جوعشوم ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئەو وشترانەی کە بێ شوانن و ون بوون و، دێنە سەر ئەو گۆلاوانەی کە بۆ وشترەکانی خۆم دروستم کردوون، ئایا پاداشتم هەیە کە لەو گۆلاوانە ئاویان بدەم؟ فەرمووی: بەڵێ، هەموو گیان لەبەرێک کە تینوێتی و گەرما تینی بۆ دێنێ پاداشتی هەیە (کە ئاوی پێ بدەی).

## بابەت: دڵناسکی و نەرمی و نیانی

**٣٦٨٧- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقَ يُحْرَمِ الْخَيْرَ»**[1].

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە نەرم و نیانی بێبەش بێت، ئەوە خێرو چاکەیەکی زۆری لە دەستداوە.

**٣٦٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَيْهِ مَا لَا يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ**[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا ئارامگرە (لەگەڵ بەندەکانی)، وە کەسی نەرم و نیانیشی خۆشدەوێ، وە ئەوەی بە کەسی نەرم و نیانی دەبەخشێ بە هۆی نەرم و نیانییەکەیەوە، بە کەسی توندو دڵڕەقی نابەخشێ.

**٣٦٨٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الْأَمْرِ كُلِّهِ»**[3].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا بە ئارامگرو لەسەرخۆیەو نەرم و نیانی و ئارامیشی لە هەموو شتێکدا خۆشدەوێ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٥٩٢، وأبو داود: ٤٨٠٩.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠٢٤، ومسلم: ٢٥٩٣، والترمذي: ٢٧٠١.

## بابەت: چاکەکردن لەگەڵ ژێردەستەکان

٣٦٩٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِخْوَانُكُمْ جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَأَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ، وَأَلْبِسُوهُمْ مِمَّا تَلْبَسُونَ، وَلَا تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ»[1].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (بەندەو کۆیلەکان) برای ئێوەن و، خوا ئەوانی خستۆتە ژێر دەستی ئێوە، جا خۆتان چی دەخۆن ئەوەیان بدەنێ بیخۆن، وە چی دەپۆشن لەو پۆشاکەش بیاندەنێ بیپۆشن، وە هەرگیز کارێک کە لە توانایاندا نیە مەیخەنە سەر شانیان، خۆ ئەگەر کاری قورستان خستە سەر شانیان ئەوە خۆشتان یارمەتییان بدەن.

٣٦٩١- عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ سَيِّئُ الْمَلَكَةِ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَيْسَ أَخْبَرْتَنَا أَنَّ هَذِهِ الْأُمَّةَ أَكْثَرُ الْأُمَمِ مَمْلُوكِينَ وَيَتَامَى؟ قَالَ: «نَعَمْ، فَأَكْرِمُوهُمْ كَكَرَامَةِ أَوْلَادِكُمْ، وَأَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ»، قَالُوا: فَمَا يَنْفَعُنَا فِي الدُّنْيَا؟ قَالَ: «فَرَسٌ تَرْتَبِطُهُ تُقَاتِلُ عَلَيْهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، مَمْلُوكُكَ يَكْفِيكَ، فَإِذَا صَلَّى فَهُوَ أَخُوكَ»[2].

واتە: ئەبو بەکری صدیق ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە لەگەڵ ژێر دەستەکانی خراپە ناچێتە ناو بەهەشتەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا هەواڵت پێنەداین کە ئەو ئوممەتە لە هەموو ئوممەتەکانی دیکە زیاتر ژێر دەستەو بێ باوکی دەبێ؟ فەرمووی: بەڵێ، بۆیە ڕێزیان بگرن وەکو چۆن ڕێزی منداڵەکانتان دەگرن، وە لەو خواردنەشیان پێبدەن کە خۆتان دەیخۆن، گوتیان: کەواتە چ سوودێکی هەیە بۆمان لە دونیادا؟ فەرمووی: ئەسپێک بە خێوی دەکەی و ئامادەی دەکەی بۆ جەنگ و غەزا، ئەوەشی ژێر دەست و خزمەتکارتە بەسە بۆ تۆ، جا هەر کاتێک نوێژی کرد ئەوە وەکو برات وایەو براتە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠، ومسلم: ١٦٦١، وأبو داود: ٥١٥٧ و ٥١٥٨، والترمذي: ١٩٤٥.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٩٤٦ مقتصراً على الجملة الأولى.

## بابەت: سڵاو کردن

**٣٦٩٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَا تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ، أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە تاکو بڕوا نەهێنن ناچنە ناو بەهەشتەوە، وە بڕوایشتان دانامەزرێ هەتا یەکترتان لەلا خۆشەویست نەبێ، ئایا شتێکتان پێ نەڵێم کە ئەگەر بیکەن یەکترتان لەلا خۆشەویست دەبێ؟ خۆبەخۆ زۆر سەلام لە یەکتر بکەن و بڵاوی بکەنەوە لە نێوانتاندا.**

**٣٦٩٣-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: «أَمَرَنَا نَبِيُّنَا ﷺ أَنْ نُفْشِيَ السَّلَامَ»[٢].

**واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرمان ﷺ فەرمانی پێکردووین کە سەلامکردن زۆر بڵاوبکەینەوەو زۆر سەلام بکەین.**

**٣٦٩٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اعْبُدُوا الرَّحْمَنَ، وَأَفْشُوا السَّلَامَ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەندایەتی تەنها بۆ خوا بکەن و سەلامیش زۆر (لە یەکتر) بکەن.**

## بابەت: وەڵامدانەوەی سڵاو

**٣٦٩٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ الْمَسْجِدَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ، فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ، فَقَالَ: «وَعَلَيْكَ السَّلَامُ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٤، وأبو داود: ٥١٩٣، والترمذي: ٢٦٨٨.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٨٥٥ وزاد: «وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَأَفْشُوا السَّلَامَ، تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلَامٍ».

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٥٧، ومسلم: ٣٩٧، وأبو داود: ٨٥٦، والترمذي: ٣٠٣ و ٢٦٩٢، والنسائي: ٨٨٤.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک هات بۆناو مزگەوت، وە لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەکی مزگەوت دانیشتبوو، ئنجا کابرا نوێژی کرد، پاشان هات و سڵاوی کرد، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سڵاو لەسەر تۆش.

**٣٦٩٦- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ حَدَّثَتْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهَا: «إِنَّ جِبْرَائِيلَ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلَامَ»، قَالَتْ، وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ**[1].

واتە: ئەبو سەلەمە دەگێڕێتەوە کە عائیشە ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: جیبریل سڵاوت لێ دەکات، ئەویش گوتی: سڵاو و سۆزو بەزەیی خوا لەسەر ئەویش.

## بابەت: وەڵامدانەوەی سڵاوی (أهل الذمة)

**٣٦٩٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ فَقُولُوا: وَعَلَيْكُمْ»**[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکاتێک یەکێک لە ئەهلی کتێب (جوولەکەو نەصرانی) سەلامی لە یەکێکتان کرد، ئەوە بڵێن: لەسەر ئێوەش.

**أهل الذمة:** ئەوانەن کە لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژین بە ئەمن و ئاسایشەوە.

**٣٦٩٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ نَاسٌ مِنَ الْيَهُودِ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَقَالَ: «وَعَلَيْكُمْ»**[3].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، خەڵکانێک لە جوولەکە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا گوتیان: «السام علیك یا أبا القاسم»، واتە: مردن لەسەر تۆ بێت ئەی ئەبو لقاسم ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: لەسەر ئێوەش.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢١٧، ومسلم: ٢٤٤٧، وأبو داود: ٥٢٣٢، والترمذي: ٢٦٩٣ و ٣٨٨٢، والنسائي: ٣٩٥٢_٣٩٥٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٥٨، ومسلم: ٢١٦٣، وأبو داود: ٥٢٠٧ مطولًا، والترمذي: ٣٣٠١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٣٥، ومسلم: ٢١٦٥، والترمذي: ٢٧٠١.




**٣٦٩٩- عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي رَاكِبٌ غَدًا إِلَى الْيَهُودِ فَلَا تَبْدَءُوهُمْ بِالسَّلَامِ، فَإِذَا سَلَّمُوا عَلَيْكُمْ فَقُولُوا: وَعَلَيْكُمْ»[1].**

واتە: ئەبو عەبدوڕڕەحمانی جوهەنیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من بەیانی دەچم بۆ لای جوولەکەکان، جا ئێوە دەستپێشخەری مەکەن لە سەلام کردن، جا ئەگەر سەلامیان لێکردن ئێوەش بڵێن: لەسەر ئێوەش.

## بابەت: سڵاوکردن لە منداڵان و لە ژنان

**٣٧٠٠- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ «أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ صِبْيَانٌ، فَسَلَّمَ عَلَيْنَا»[2].**

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ئێمە منداڵ بووین پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هات بۆ لامان و سڵاوی لێکردین.

**٣٧٠١- عَنْ أَسْمَاءِ بِنْت يَزِيدَ ﷺ قَالَتْ: «مَرَّ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي نِسْوَةٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْنَا»[3].**

واتە: ئەسمائی کچی یەزید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە لاماندا تێپەڕی کە کۆمەڵێک ئافرەت بووین و سەلامی لێکردین.

## بابەت: تەوقە کردن

**٣٧٠٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيَنْحَنِي بَعْضُنَا لِبَعْضٍ؟ قَالَ: «لَا». قُلْنَا أَيُعَانِقُ بَعْضُنَا بَعْضًا؟ قَالَ: «لَا، وَلَكِنْ تَصَافَحُوا»[4].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا دەکرێ (کاتێک بەیەک گەیشتین خۆبەخۆ) بۆ یەکتر بچەمێینەوە؟ فەرمووی: نەخێر، گوتمان: ئایا یەکتر بگرینە باوەش؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام تەوقە بەیەکەوە بکەن.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٤٧، ومسلم: ٢١٦٨، وأبو داود: ٥٢٠٢ و ٥٢٠٣، والترمذي: ٢٦٩٦.

(٣) صحيح إلا الإلواء باليد عند الترمذي. أخرجه أبو داود: ٥٢٠٤، والترمذي: ٢٦٩٧.

(٤) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٧٢٨.




**٣٧٠٣-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ، إِلَّا غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَتَفَرَّقَا»[1].

**واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکات دوو مسوڵمان بەیەکتر دەگەن و تەوقە دەکەن، ئەوە بێگومان لە گوناهەکانیان دەبوردرێن، پێش ئەوەی لە یەکتر جیاببنەوە.**

## بابەت: دەست ماچکردن

**٣٧٠٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «قَبَّلْنَا يَدَ النَّبِيِّ ﷺ»[2].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: ئێمە دەستی پێغەمبەرمان ﷺ ماچ کردوە.**

**٣٧٠٥-** عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ ﷺ «أَنَّ قَوْمًا مِنَ الْيَهُودِ قَبَّلُوا يَدَ النَّبِيِّ ﷺ وَرِجْلَيْهِ»[3].

**واتە: صەفوانی کوڕی عەسسال ﷺ دەگێڕێتەوە، خەڵکانێک لە جوولەکە دەست و پێی پێغەمبەریان ﷺ ماچکردوە.**

## بابەت: مۆڵەت وەرگرتن لە خاوەن ماڵ

**٣٧٠٦-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ أَبَا مُوسَى اسْتَأْذَنَ عَلَى عُمَرَ ثَلَاثًا، فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ، فَانْصَرَفَ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ عُمَرُ: مَا رَدَّكَ؟ قَالَ: «اسْتَأْذَنْتُ الِاسْتِئْذَانَ الَّذِي أَمَرَنَا بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثًا، فَإِنْ أُذِنَ لَنَا دَخَلْنَا، وَإِنْ لَمْ يُؤْذَنْ لَنَا رَجَعْنَا»، قَالَ: فَقَالَ: لَتَأْتِيَنِّي عَلَى هَذَا بِبَيِّنَةٍ أَوْ لَأَفْعَلَنَّ، فَأَتَى مَجْلِسَ قَوْمِهِ فَنَاشَدَهُمْ، فَشَهِدُوا لَهُ، فَخَلَّى سَبِيلَهُ»[4].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەبو موسا سێ جار داوای مۆڵەتی لە عومەر کرد، ئەویش مۆڵەتی پێنەدا، ئەویش گەڕایەوە، بۆیە عومەر کەسێکی نارد بۆ لای ئەبو مووسا کە چ هۆکارێک تۆی گێڕایەوە؟ گوتی: داوای مۆڵەتێکم کرد**

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٥٢١١ و ٥٢١٢، والترمذي: ٢٧٢٧.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٥٢٢٣.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٧٣٣ و ٣١٤٤ مطولًا.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٤٥، ومسلم: ٢١٥٣ و ٢١٥٤، وأبو داود: ٥١٨٠ و ٥١٨١، والترمذي: ٢٦٩٠.

که پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوە که سێ جارە، جا ئەگەر ڕێگامان پێدرا دەچینە ژوور، ئەگەر ڕێگەشیان پێنەدرا دەگەڕێینەوە، گوتی: جا عومەر گوتی: لەسەر ئەو شتەی که باست کرد یان دەبێ بەڵگەم بۆ بێنی، یان کارێک دەکەم بێگومان، (ئەبو مووسا) هاتەوە ناو خزمەکانی و داوای بەڵگەو شاهیدی لێکردن، ئەوانیش شاهیدییان بۆی داو عومەریش وازی لێهێنا.

٣٧٠٧- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا السَّلَامُ، فَمَا الإِسْتِئْذَانُ؟ قَالَ: «يَتَكَلَّمُ الرَّجُلُ تَسْبِيحَةً، وَتَكْبِيرَةً، وَتَحْمِيدَةً، وَيَتَنَحْنَحُ، وَيُؤْذِنُ أَهْلَ الْبَيْتِ»(١).

واته: ئەبو ئەیوبی ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە شێوازی سەلامکردن ڕوونە، ئەی داوای مۆڵەت کردن چۆنە؟ فەرمووی: (بۆ مۆڵەت وەرگرتن) پیاو قسە دەکات و «سبحان الله» یان «الله أكبر» یان «الحمدلله» دەڵێت و دەکۆکێت، ئەوجار داوای مۆڵەت لە ئەوانە دەکات که لە ماڵەکەدان بۆ ئەوەی ڕێگەی پێبدەن (ئەگەر کاتەکە گونجاو بوو).

٣٧٠٨- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: كَانَ لِي مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُدْخَلَانِ: مُدْخَلٌ بِاللَّيْلِ، وَمُدْخَلٌ بِالنَّهَارِ، فَكُنْتُ إِذَا أَتَيْتُهُ وَهُوَ يُصَلِّي «يَتَنَحْنَحُ لِي»(٢).

واته: عەلی ﷺ دەڵێ: من دوو کاتی دیاریکراوم هەبوو که دەچوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، جارێکیان بە شەو جارێکیشیان بە ڕۆژ، جا کاتێک من دەهاتمە خزمەتی و ئەویش لە نوێژدا بوو ئەوە بۆ مۆڵەتدانم دەکۆخی.

٣٧٠٩- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: اسْتَأْذَنْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «مَنْ هَذَا؟» فَقُلْتُ: أَنَا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَنَا، أَنَا»(٣).

واته: جابیر ﷺ دەڵێ: داوای مۆڵەتم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: ئەوە کێیە؟ منیش گوتم: منم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: منم، منم؟!! (واته: ئەو وەڵامدانەوەی پێ ناخۆش بوو، دەبێ کابرا ناوی خۆی بڵێت و خۆی بناسێنێ).

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه النسائي: ١٢١١ و ١٢١٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٥٠، ومسلم: ٢١٥٥، وأبو داود: ٥١٨٧، والترمذي: ٢٧١١.

## بابەت: ئەو پیاوەی پێی دەگوترێ: بەیانیت چۆن کردەوە

**٣٧١٠-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: كَيْفَ أَصْبَحْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «بِخَيْرٍ، مِنْ رَجُلٍ لَمْ يُصْبِحْ صَائِمًا، وَلَمْ يَعُدْ سَقِيمًا»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنت بەیانی کردەوە؟ فەرمووی: بە باشتر لە پیاوێک کە بەڕۆژووەوە بەیانی نەکاتەوە، سەردانی نەخۆشێکی نەکردبێ.

**٣٧١١-** عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَدَخَلَ عَلَيْهِمْ فَقَالَ: «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ»، قَالُوا: وَعَلَيْكَ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، قَالَ: «كَيْفَ أَصْبَحْتُمْ؟» قَالُوا: بِخَيْرٍ نَحْمَدُ اللَّهَ، فَكَيْفَ أَصْبَحْتَ بِأَبِينَا وَأُمِّنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أَصْبَحْتُ بِخَيْرٍ، أَحْمَدُ اللَّهَ»[٢].

واتە: ئەبو ئوسەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ ماڵی عەبباسی کوڕی عەبودولموتەڵیب و پێی فەرموو: سەلامی خواتان لەسەر بێ، ئەوانیش گوتیان: سەلام و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا لەسەر تۆش، فەرمووی: چۆن بەیانیتان کردەوە؟ گوتیان: بە خێرو خۆشی، سوپاسی خوا دەکەین، ئەی جەنابت چۆن بەیانیت کردەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە باوک و دایکمانەوە بەفیدات بین؟ فەرمووی: بە خێرو خۆشی بەیانیم کردەوە سوپاسی خوا دەکەم.

## بابەت: ڕێزگرتن لە گەورەی هەر هۆزو گەلێک کاتێک سەردانتان دەکات

**٣٧١٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَتَاكُمْ كَرِيمُ قَوْمٍ فَأَكْرِمُوهُ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک ڕێزلێگراوو پیاوماقوڵی هۆزێک هاتە لاتان ڕێزی لێبگرن.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) حسن.

## بابەت: وەڵامدانەوەی كەسێك كە دەپژمێت

**٣٧١٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: عَطَسَ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَشَمَّتَ أَحَدَهُمَا - أَوْ سَمَّتَ - وَلَمْ يُشَمِّتِ الْآخَرَ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَطَسَ عِنْدَكَ رَجُلَانِ فَشَمَّتَّ أَحَدَهُمَا وَلَمْ تُشَمِّتِ الْآخَرَ، فَقَالَ: «إِنَّ هَذَا حَمِدَ اللَّهَ، وَإِنَّ هَذَا لَمْ يَحْمَدِ اللَّهَ»[(١)].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: دوو پیاو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ پژمین، جا پێغەمبەر ﷺ وەڵامی یەكێكیانی دایەوەو وەڵامی ئەویتری نەدایەوە، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو كەس لە خزمەت جەنابتدا پژمین و وەڵامی یەكێكیانت داوەو، وەڵامی ئەویترت نەدایەوە؟ فەرمووی: ئەوەیان (كە وەڵامم دایەوە دوای پژمین) سوپاسی خوای كردو گوتی: «الْحَمْدُ لِلَّه»، بەڵام ئەویتر «الْحَمْدُ لِلَّه»ـی نەگوت.

**٣٧١٤-** عَنْ إِيَاسِ بْنِ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُشَمَّتُ الْعَاطِسُ ثَلَاثًا، فَمَا زَادَ فَهُوَ مَزْكُومٌ»[(٢)].

واتە: ئیپاسی كوڕی سەلەمەی كوڕی ئەكوەع لە باوكییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ جار وەڵامی ئەو كەسە دەدرێتەوە كە دەپژمێت، ئەگەر زیاد لە سێ جار پژمی ئەوە نەخۆشەو هەڵامەتی لێیە.

**٣٧١٥-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: الْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلْيَرُدَّ عَلَيْهِ مَنْ حَوْلَهُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، وَلْيَرُدَّ عَلَيْهِمْ: يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ»[(٣)].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەكێكتان پژمی با بڵێ: «الْحَمْدُ لِلَّه»، واتە: سوپاس بۆ خوا، ئەوانەی كە لە دەوروبەریشن لە وەڵامدا بڵێن: «يَرْحَمُكَ اللَّه»، واتە: خوا بەزەیی پێتدا بێتەوەو ڕەحمت پێبكات، ئەویش وەڵامیان بداتەوە: «يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ»، واتە: خوا ڕێنموونیتان بكات لەسەر هەق و كاروبارتان ڕێكبخات.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٢١، ومسلم: ٢٩٩١، وأبو داود: ٥٠٣٩، والترمذي: ٢٧٤٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٩٣، وأبو داود: ٥٠٣٧، والترمذي: ٢٧٤٣.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي بإثر: ٢٧٤١.




## بابەت: ڕێزگرتنی کۆڕو دانیشتن

**٣٧١٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا لَقِيَ الرَّجُلَ فَكَلَّمَهُ، لَمْ يَصْرِفْ وَجْهَهُ عَنْهُ حَتَّى يَكُونَ هُوَ الَّذِي يَنْصَرِفُ، وَإِذَا صَافَحَهُ، لَمْ يَنْزِعْ يَدَهُ مِنْ يَدِهِ حَتَّى يَكُونَ هُوَ الَّذِي يَنْزِعُهَا، وَلَمْ يُرَ مُتَقَدِّمًا بِرُكْبَتَيْهِ جَلِيسًا لَهُ قَطُّ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێک دەگەیشت و قسەی لەگەڵ دەکرد هەرگیز ڕووی لێ وەرنەدەگێڕا تاکو ئەو کەسە خۆی نەڕۆیشتبایە، وە ئەگەر تەوقەی لەگەڵ بکردایە هەرگیز دەستی بەرنەدەدا هەتا ئەو کەسە دەستی بەرنەدابایە، وە هەرگیز نەبینراوە (پێغەمبەر ﷺ) ئەژنۆکانی لە کاتی دانیشتندا پێش دانیشتوان بخات (هەمیشە ڕێکی دانیشتوان دانیشتووە).

## بابەت: هەرکەسێک هەڵسێ لە شوێنەکەی، کە گەڕایەوە لە هەموو کەس شایستەترە پێی

**٣٧١٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ رَجَعَ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکات یەکێکتان لە شوێنی دانیشتن و کۆڕ هەڵسا، پاشان گەڕایەوە، ئەوە ئەو کەسە شایستەترینە بە شوێنەکەی خۆی (کە لێی دانیشتوە پێشتر).

## بابەت: پاساو هێنانەوە

**٣٧١٨-** عَنْ جُودَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اعْتَذَرَ إِلَى أَخِيهِ بِمَعْذِرَةٍ فَلَمْ يَقْبَلْهَا، كَانَ عَلَيْهِ مِثْلُ خَطِيئَةِ صَاحِبِ مَكْسٍ»[3].

---

(١) ضعيف، غير قصة المصافحة فحسنة عند أبي داود. أخرجه الترمذي: ٢٤٩٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٧٩، وأبو داود: ٤٨٥٣.

(٣) ضعيف.

واتە: جودان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پاساو بۆ براکەی بهێنێتەوەو، ئەویش قبووڵی نەکات، ئەوە گوناهی وەکو ئەو کەسە وایە کە باج و دەیەک لە بازرگان وەردەگرێ.

**٣٧١٨م-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ هُوَ ابْنُ مِينَاءَ، عَنْ جُودَانَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، مِثْلَهُ[١].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێردراوەتەوە.

## بابەت: سوعبەت و گاڵتەکردن

**٣٧١٩-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: خَرَجَ أَبُو بَكْرٍ فِي تِجَارَةٍ إِلَى بُصْرَى قَبْلَ مَوْتِ النَّبِيِّ ﷺ بِعَامٍ، وَمَعَهُ نُعَيْمَانُ، وَسُوَيْبِطُ بْنُ حَرْمَلَةَ، وَكَانَا شَهِدَا بَدْرًا، وَكَانَ نُعَيْمَانُ عَلَى الزَّادِ، وَكَانَ سُوَيْبِطٌ رَجُلًا مَزَّاحًا، فَقَالَ لِنُعَيْمَانَ: أَطْعِمْنِي، قَالَ: حَتَّى يَجِيءَ أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: فَلَأُغِيظَنَّكَ. قَالَ: فَمَرُّوا بِقَوْمٍ فَقَالَ لَهُمْ سُوَيْبِطٌ: تَشْتَرُونَ مِنِّي عَبْدًا لِي؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: إِنَّهُ عَبْدٌ لَهُ كَلَامٌ، وَهُوَ قَائِلٌ لَكُمْ: إِنِّي حُرٌّ، فَإِنْ كُنْتُمْ إِذَا قَالَ لَكُمْ هَذِهِ الْمَقَالَةَ تَرَكْتُمُوهُ، فَلَا تُفْسِدُوا عَلَيَّ عَبْدِي، قَالُوا: لَا بَلْ نَشْتَرِيهِ مِنْكَ، فَاشْتَرَوْهُ مِنْهُ بِعَشْرِ قَلَائِصَ، ثُمَّ أَتَوْهُ فَوَضَعُوا فِي عُنُقِهِ عِمَامَةً - أَوْ حَبْلًا - فَقَالَ نُعَيْمَانُ: إِنَّ هَذَا يَسْتَهْزِئُ بِكُمْ وَإِنِّي حُرٌّ لَسْتُ بِعَبْدٍ، فَقَالُوا: قَدْ أَخْبَرَنَا خَبَرَكَ. فَانْطَلَقُوا بِهِ، فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ، فَأَخْبَرُوهُ بِذَلِكَ قَالَ: فَاتَّبَعَ الْقَوْمَ وَرَدَّ عَلَيْهِمُ الْقَلَائِصَ، وَأَخَذَ نُعَيْمَانَ. قَالَ: فَلَمَّا قَدِمُوا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَأَخْبَرُوهُ قَالَ: «فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ مِنْهُ حَوْلًا»[٢].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: ئەبو بەکر ﷺ بۆ بازرگانی کردن دەرچوو بۆ بوصرا پێش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بە ساڵێک، نوعەیمان و سوەیبیتی کوڕی حەرمەلەی لەگەڵدا بوو، هەردووکیان لە غەزای بەدر بەشداربوون، جا نوعەیمان کرابوو بە سەرپەرشتیاری خواردن و خواردنەوە، سوەیبیتیش پیاوێکی سوعبەتچی و قسەخۆش بوو، بۆیە بە نوعەیمانی گوتی: خواردنم بدەیە، ئەویش گوتی: با ئەبو بەکر بگەڕێتەوە، گوتی: چارەت دەکەم و تووڕەت دەکەم، (ڕاوی) دەڵێ: بەلای هۆزێکدا تێپەڕین، جا سوەیبیت بە خەڵکەکەی گوت: بەندەیەکم هەیە ئایا لێم ناکڕن؟ گوتیان: بەڵێ، گوتی: بەڵام ئەو

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

بەندەیە قسەیەک دەکات و پێتان دەڵێ: من ئازادم (کۆیلە نیم)، جا ئێوە ئەگەر ئەو قسەیەی پێگوتن وازی لێدێنن، بۆیە کۆیلەکەم لێ بەدخوو مەکەن، گوتیان: نەخێر، ئێمە لێت دەکڕین، جا بە دە وشتر کڕییان، ئنجا هاتن مێزەرێک یان پەتێکیان کردە گەردنی، ئنجا نوعەیمان گوتی: بەدڵنیایی ئەو پیاوە گاڵتەتان لەگەڵ دەکات، من کۆیلە نیم و ئازادم، گوتیان: ئەوەی هەموو پێگوتووین، ئیتر لەگەڵ خۆیان برد، ئەوجار ئەبو بەکر ﷺ هاتەوەو هەواڵەکەیان پێدا، ڕاوی دەڵێ: ئەبو بەکر بەدوا خەڵکەکەدا ڕۆیشت و وشترەکانی دانەوەو نوعەیمانی وەرگرتەوە، گوتی: جا کە هاتنەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ باسەکەیان بۆ گێڕایەوە، گوتی: پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی، وە هاوەڵەکانیش هەتا یەک ساڵ پێی پێدەکەنین.

**٣٧٢٠- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُخَالِطُنَا حَتَّى يَقُولَ لِأَخٍ لِي صَغِيرٍ: يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟ قَالَ: وَكِيعٌ: يَعْنِي طَيْرًا كَانَ يَلْعَبُ بِهِ**[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر تێکەڵ بوو لەگەڵمان، بە جۆرێک هەتا برایەکی گچکەم هەبوو پێی دەگوت: ئەی ئەبو عومەیر نوغەیر چی بەسەرهات؟ وەکیع دەڵێ: مەبەستی ئەو باڵندەیە بووە کە عومەیر یاری لەگەڵدا دەکرد (وە دواتر مرد، جا پێغەمبەر ﷺ بۆ دڵدانەوە سوعبەتی لەگەڵ عومەیر دەکردو ئەوەی پێ دەفەرموو).

## بابەت: هەڵکەندنی مووی سپی

**٣٧٢١- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نَتْفِ الشَّيْبِ، وَقَالَ» هُوَ نُورُ الْمُؤْمِنِ»**[2].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە هەڵقەندنی مووی سپی و فەرموویەتی: مووی سپی نوورو ڕووناکی بڕوادارە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٢٩ و ٦٢٠٣ و ٢١٥٠، وأبو داود: ٤٩٦٩، والترمذي: ٣٣٣ و ١٩٨٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٢٠٢، والترمذي: ٢٨٢١، والنسائي: ٥٠٦٨.

## بابەت: دانیشتن لە نێوان هەتاو و سێبەردا

٣٧٢٢- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «نَهَى أَنْ يُقْعَدَ بَيْنَ الظِّلِّ وَالشَّمْسِ»[١].

واتە: ئیبنو بورەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نەهی کردوە لە دانیشتن لەنێوان سێبەرو خۆرەتاودا.

## بابەت: نەهی کردن لە ڕاکشان لەسەر ڕوو (سک)

٣٧٢٣- عَنْ قَيْسِ بْنِ طِهْفَةَ الْغِفَارِيِّ، عَنْ أَبيه ﷺ قَالَ: أَصَابَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَائِمًا فِي الْمَسْجِدِ عَلَى بَطْنِي، فَرَكَضَنِي بِرِجْلِهِ وَقَالَ: «مَا لَكَ وَلِهَذَا النَّوْمِ هَذِهِ نَوْمَةٌ يَكْرَهُهَا اللَّهُ - أَوْ يُبْغِضُهَا اللَّهُ -»[٢].

واتە: قەیسی کوڕی تیفهەی غیفاریی لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە مزگەوت لەسەر سک خەوتبووم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ تووشم هات و بە پێیەکانی ڕایچڵەکاندم و فەرمووی: ئەوە چییە ئەو جۆرە نوستنەت؟ ئەو نوستنە لای خوا ناپەسندە، یان خوا ڕقی لێیەتی.

٣٧٢٤- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا مُضْطَجِعٌ عَلَى بَطْنِي، فَرَكَضَنِي بِرِجْلِهِ وَقَالَ: «يَا جُنَيْدِبُ، إِنَّمَا هَذِهِ ضِجْعَةُ أَهْلِ النَّارِ»[٣].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەلامدا تێپەڕی لەوکاتەدا لەسەر سک ڕاکشابووم، جا بە پێیەکانی ڕایچڵەکاندم و فەرمووی: ئەی جونەیدیب ئەو جۆرە ڕاکشانە هی خەڵکی دۆزەخە.

٣٧٢٥- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رَجُلٍ نَائِمٍ فِي الْمَسْجِدِ مُنْبَطِحٍ عَلَى وَجْهِهِ، فَضَرَبَهُ بِرِجْلِهِ وَقَالَ: «قُمْ وَاقْعُدْ، فَإِنَّهَا نَوْمَةٌ جَهَنَّمِيَّةٌ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٥٠٤٠.

(٣) حسن.

(٤) ضعيف.




واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەلای پیاوێکی خەوتوو تێپەڕی کە لەناو مزگەوتدا لەسەر ڕوو ڕاکشابوو، ئەویش بە پێ هەڵیستاندو فەرمووی: هەڵسەو دانیشە، چونکە ئەو جۆرە نوستنە نوستنێکی دۆزەخییانەیە.

## بابەت: فێربوونی لێکدانەوەی ڕووداو بەپێی ئەستێرەکان

**٣٧٢٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اقْتَبَسَ عِلْمًا مِنَ النُّجُومِ، اقْتَبَسَ شُعْبَةً مِنَ السِّحْرِ زَادَ مَا زَادَ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە پێی ئەستێرەو ئەستێرەناسی بەشێک لە زانستی وەرگرت (و ڕووداو لێکبداتەوە)، ئەوە بەشێک لە جادووی وەرگرتووە، چەندە زیاد بکات لە جادووەکە زیاد دەبێ.

## بابەت: نەهی کردن لە جنێودان بە «با»

**٣٧٢٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَسُبُّوا الرِّيحَ فَإِنَّهَا مِنْ رَوْحِ اللَّهِ تَأْتِي بِالرَّحْمَةِ وَالْعَذَابِ، وَلَكِنْ سَلُوا اللَّهَ مِنْ خَيْرِهَا وَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جنێو بە با مەدەن، چونکە لەلایەن خواوە دێت، هەم بە ڕەحمەتەوە دێت و هەمیش بە سزا، بەڵکو داوای خێرو بێری بایەکە لە خوا بکەن و لە شەڕو خراپەکانی پەنا بە خوا بگرن.

## بابەت: ئەو ناوانەی خۆشەویستن و سوننەتن بۆ ناونان

**٣٧٢٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَحَبُّ الْأَسْمَاءِ إِلَى اللَّهِ ﷻ: عَبْدُ اللَّهِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ»[٣].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٩٠٥.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٥٠٩٧.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٣٢، وأبو داود: ٤٩٤٩، والترمذي: ٢٨٣٣ و ٢٨٣٤.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویسترین ناو لەلای خوای ﷻ بریتیە لە: عەبدوڵڵا و عەبدورڕەحمان.

## بابەت: ئەو ناوانەی کە ناپەسندن

**٣٧٢٩-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَئِنْ عِشْتُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، لَأَنْهَيَنَّ أَنْ يُسَمَّى: رَبَاحٌ، وَنَجِيحٌ، وَأَفْلَحُ، وَنَافِعٌ، وَيَسَارٌ»[١].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خوا پێی خۆش بێت و بژیم، ئەوە ناونانی: «رباح»و «نجیح»و «أفلح»و «نافع»و «یسار»تان لێ قەدەغە دەکەم.

**٣٧٣٠-** عَنْ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نُسَمِّيَ رَقِيقَنَا أَرْبَعَةَ أَسْمَاءٍ: أَفْلَحُ، وَنَافِعٌ، وَرَبَاحٌ، وَيَسَارٌ»[٢].

واتە: سەموڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لێی قەدەغە کردووین کە منداڵەکانمان بەو چوار ناوانە ناو بنێین: «أفلح»، «نافع»، «رباح»، «یسار».

**٣٧٣١-** عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: لَقِيتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ فَقَالَ: مَنْ أَنْتَ؟ فَقُلْتُ: مَسْرُوقُ بْنُ الْأَجْدَعِ، فَقَالَ عُمَرُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْأَجْدَعُ شَيْطَانٌ»[٣].

واتە: مەسڕوق دەڵێ: تووشی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بووم و گوتی: تۆ کێیت؟ منیش گوتم: مەسڕوقی کوڕی ئەجدەعم، عومەریش گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەجدەع (ناوی) شەیتانە.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه مسلم: ٢٢٣٤، وأبو داود: ٤٩٦٠ كلاهما عن جابر فقط الترمذي: ٢٨٣٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٣٦، وأبو داود: ٤٩٥٨ و ٤٩٥٩، والترمذي: ٢٨٣٦.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٩٥٧.

## بابەت: گۆڕینی ناوەکان

**٣٧٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ زَيْنَبَ كَانَ اسْمُهَا بَرَّةَ فَقِيلَ لَهَا: تُزَكِّي نَفْسَهَا «فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، زَيْنَبَ»[١].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، زەینەب ناوی بەڕڕە بوو، جا پێیان گوت کە مەدحی خۆی دەکات (بەو ناوە، چونکە بەڕڕە واتە: زۆر چاک)، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی لێنا: زەینەب.

**٣٧٣٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ ابْنَةً لِعُمَرَ كَانَ يُقَالُ لَهَا عَاصِيَةُ «فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَمِيلَةَ»[٢].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، عومەر کچێکی هەبوو پێیان دەگوت: عاصیە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی لێنا: جەمیلە.

**٣٧٣٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ ﷺ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلَيْسَ اسْمِي عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَلَامٍ: «فَسَمَّانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَلَامٍ»[٣].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ﷺ دەڵێ: کاتێک کە هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ناوم عەبدوڵڵای کوڕی سەلام نەبوو، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی لێنام عەبدوڵڵای کوڕی سەلام.

## بابەت: ناونان بە نازناو و ناوی پێغەمبەر ﷺ

**٣٧٣٥- عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: «تَسَمَّوْا بِاسْمِي، وَلَا تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي»[٤].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٩٢، ومسلم: ٢١٤١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢١٣٩، وأبو داود: ٤٩٥٢، والترمذي: ٢٨٣٨.

(٣) ضعيف الإسناد. أخرجه الترمذي: ٣٢٥٦ و ٣٨٣٨ مطولًا.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٠ و ٣٥٣٩، ومسلم: ٢١٣٤، وأبو داود: ٤٩٦٥.




واتە: موحەممەد دەڵێ: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیگوت: ئەبولقاسم (كە نازناوی پێغەمبەرە ﷺ) فەرموویەتی: ناوی من لە منداڵەكانتان بنێن، بەڵام نازناوی من مەكەن بە نازناوتان.

**٣٧٣٦-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَسَمَّوْا بِاسْمِي، وَلَا تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ناوی من لە منداڵەكانتان بنێن، بەڵام نازناوی من مەكەن بە نازناوتان.

**٣٧٣٧-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بِالْبَقِيعِ فَنَادَى رَجُلٌ رَجُلًا يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي لَمْ أَعْنِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَسَمَّوْا بِاسْمِي، وَلَا تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەقیع بوو، جا پیاوێک بانگی پیاوێکی کرد (و گوتی): ئەی ئەبولقاسم، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی لێدایەوە، پیاوەکەش گوتی: مەبەستم جەنابت نەبوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە ناوی من ناوی منداڵەكانتان بنێن، بەڵام نازناوم مەكەن بە نازناو بۆخۆتان.

## بابەت: کەسێک نازناوی بۆ دابنرێ پێش ئەوەی منداڵی هەبێ

**٣٧٣٨-** عَنْ حَمْزَةَ بْنِ صُهَيْبٍ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ قَالَ لِصُهَيْبٍ: مَا لَكَ تَكْتَنِي بِأَبِي يَحْيَى وَلَيْسَ لَكَ وَلَدٌ، قَالَ: «كَنَّانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِأَبِي يَحْيَى»[٣].

واتە: حەمزەی کوڕی صوهەیب ﷺ دەگێڕێتەوە، عومەر بە صوهەیبی گوت: مەسەلە چییە کە تۆ نازناوت ئەبو یەحیایەو منداڵیشت نیە؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نازناوی ئەبو یەحیای لێناوم.

**٣٧٣٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ: «كُلُّ أَزْوَاجِكَ كَنَّيْتَهُ غَيْرِي قَالَ: «فَأَنْتِ أُمُّ عَبْدِ اللَّهِ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه البخاري: ٣١١٥، ومسلم: ٢١٣٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٢٠، ومسلم: ٢١٣١، والترمذي بإثر: ٢٨٤١.

(٣) حسن.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٩٧٠.

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە کە ئەو بە پێغەمبەری ﷺ گوتووە: هەموو خێزانەکانت نازناوت لێناون جگە لە من، فەرمووی: کەواتە تۆش نازناوت دایکی عەبدوڵڵا بێت.

**٣٧٤٠-** عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْتِينَا فَيَقُولُ لِأَخٍ لِي وَكَانَ صَغِيرًا: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ»[١].

واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەردانی دەکردین و برایەکی گچکەم هەبوو پێی دەفەرموو: ئەی ئەبو عومەیر (باوکی عومەیر).

## بابەت: ناو و ناتۆرە

**٣٧٤١-** عَنْ أَبِي جَبِيرَةَ بْنِ الضَّحَّاكِ ﵁ قَالَ: فِينَا نَزَلَتْ مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ: ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ ﴿١١﴾﴾ الحجرات، قَدِمَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ وَالرَّجُلُ مِنَّا لَهُ الِاسْمَانِ وَالثَّلَاثَةُ، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ رُبَّمَا دَعَاهُمْ بِبَعْضِ تِلْكَ الْأَسْمَاءِ فَيُقَالُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ يَغْضَبُ مِنْ هَذَا، فَنَزَلَتْ: ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ ﴿١١﴾﴾ الحجرات[٢].

واتە: ئەبو جەبیرەی کوڕی زەححاک ﵁ دەڵێ: ئەو ئایەتە: ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ ﴿١١﴾﴾ الحجرات، واتە: ناوو ناتۆرە لەیەکتری مەنێن، لەسەر ئێمەی کۆمەڵی ئەنصار دابەزی، پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆ ناومان، جا پیاو هەبوو لە ئێمە دوو سێ ناوی لێبوو، جا کە پێغەمبەر ﷺ هەندێ جار بە یەکێک لەو ناوانە بانگی دەکردن، پێیان دەگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسە بەو ناوە تووڕە دەبێت، ئیتر ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ ﴿١١﴾﴾ الحجرات.

## بابەت: پیاهەڵدان

**٣٧٤٢-** عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ عَمْرٍو ﵁، قَالَ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَحْثُوَ فِي وُجُوهِ الْمَدَّاحِينَ التُّرَابَ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٢٩ و ٦٢٠٣ و ٢١٥٠، وأبو داود: ٤٩٦٩، والترمذي: ٣٣٣ و ١٩٨٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٩٦٢، والترمذي: ٣٢٦٨.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٠٠٢، وأبو داود: ٤٨٠٤، والترمذي: ٢٣٩٣.

واتە: میقدادی کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووین کەوا خۆڵ و گڵ بپرژێنینە دەم و چاوی ئەو کەسەی کە پیاهەڵدان دەکات.

**٣٧٤٣-** عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِيَّاكُمْ وَالتَّمَادُحَ فَإِنَّهُ الذَّبْحُ»[١].

واتە: موعاویە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئاگاداری پیاهەڵدانی یەکتر بن و مەیکەن، چونکە وەکو بە کوشتدان وایە.

**٣٧٤٤-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: مَدَحَ رَجُلٌ رَجُلًا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَيْحَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ مِرَارًا». ثُمَّ قَالَ: «إِنْ كَانَ أَحَدُكُمْ مَادِحًا أَخَاهُ فَلْيَقُلْ: «أَحْسِبُهُ وَلَا أُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا»[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پیاوێک لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بە پیاوێکی تریدا هەڵدا (مەدحی کرد)، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هاوار بۆ تۆ! گەردنی هاوڕێکەت بڕی، چەند جار وای فەرموو، پاشان فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان ویستی مەدحی براکەی بکات با بڵێ: وا دەزانم (ئاواو ئاوا باشە)و، بە هیچ جۆرێک لە جێگای خوا پاکانەی بۆ ناکەم (واتە: بە گومانەوە باسی بکات و مەدحی بکات، چونکە پاکانەکردن بۆ بەندەکان تەنها مافی خوایە).

## بابەت: ڕاوێژکار جێی متمانەیە

**٣٧٤٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ»[٣].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕاوێژکار جێگای متمانەیەو پێویستە بە متمانەو ڕاستییەوە وەڵام بداتەوە.

**٣٧٤٦-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ»[٤].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٦٢، ومسلم: ٣٠٠٠، وأبو داود: ٤٨٠٥.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥١٢٨، والترمذي: ٢٨٢٢ وفي حديث طويل ٢٣٦٩.

(٤) صحيح لغيره.




واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسی ڕاوێژپێکراو جێگای متمانەیە (بۆ بەرانبەرەکەی).

**٣٧٤٧- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اسْتَشَارَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ، فَلْيُشِرْ عَلَيْهِ»[(١)].**

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان ڕاوێژی بە براکەی کرد، با ڕاوێژی بۆ بکات.

## بابەت: چوونە حەمام (گەرماو)

**٣٧٤٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تُفْتَحُ لَكُمْ أَرْضُ الْأَعَاجِمِ، وَسَتَجِدُونَ فِيهَا بُيُوتًا يُقَالُ لَهَا الْحَمَّامَاتُ، فَلَا يَدْخُلْهَا الرِّجَالُ إِلَّا بِإِزَارٍ، وَامْنَعُوا النِّسَاءَ أَنْ يَدْخُلْنَهَا، إِلَّا مَرِيضَةً أَوْ نُفَسَاءَ»[(٢)].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وڵاتی عەجەم و غەیری عەڕەب ئازاد دەبێ بەڕووتان، جا هەندێ خانوو دەبینن پێیان دەگوترێ: گەرماوەکان، بۆیە با هیچ پیاوێک بەبێ پەشتەماڵ نەچێتە ناویان، وە ڕێگری لە ئافرەتان بکەن، مەگەر ئەوانە نەبێت کە نەخۆشن، یان زەیستانن.

**٣٧٤٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «نَهَى الرِّجَالَ وَالنِّسَاءَ عَنِ الْحَمَّامَاتِ ثُمَّ رَخَّصَ لِلرِّجَالِ، أَنْ يَدْخُلُوهَا فِي الْمَيَازِرِ، وَلَمْ يُرَخِّصْ لِلنِّسَاءِ»[(٣)].**

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پیاوان و ئافرەتانی قەدەغەکرد کە بچنە گەرماوە گشتییەکان، پاشان مۆڵەتی بە پیاواندا کە بە پشتە ماڵەوە بچن، وە ڕێگەی بە ئافرەتان نەدا.

**٣٧٥٠- عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ الْهُذَلِيِّ ﷺ، أَنَّ نِسْوَةً مِنْ أَهْلِ حِمْصَ اسْتَأْذَنَّ عَلَى عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: لَعَلَّكُنَّ مِنَ اللَّوَاتِي يَدْخُلْنَ الْحَمَّامَاتِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ وَضَعَتْ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِ زَوْجِهَا، فَقَدْ هَتَكَتْ سِتْرَ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ»[(٤)].**

---

(١) حسن لغيره.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٠١١.

(٣) حسن ليغره. أخرجه أبو داود: ٤٠٠٩، والترمذي: ٢٨٠٢.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٠١٠، والترمذي: ٢٨٠٣.




واتە: ئەبو مەلیحی هوزەلیی ﷺ دەگێڕێتەوە، كۆمەڵە ئافرەتێک لە خەڵكی حیمص داوای مۆڵەتی لای عائیشەیان كرد، ئەویش گوتی: لەوانەیە ئێوە لەو ئافرەتانە بن كەوا دەچنە گەرماوە گشتییەكان، خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر ئافرەتێک جگە لە ماڵی مێردەكەی پۆشاكی دابنێ ئەوە هەتكی ئەو خۆ داپۆشین و شەرم و حەیایەی كردوە كە لە نێوان خۆی و خوادایە.

## بابەت: موو لابردن بە "نورە"
## (بەردێكە بەكاردەهێنرێ بۆ تاشینی موو)

٣٧٥١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا اطَّلَى بَدَأَ بِعَوْرَتِهِ، فَطَلَاهَا بِالنُّورَةِ، وَسَائِرَ جَسَدِهِ أَهْلُهُ»[١].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ هەركات مووی جەستەی لابېردبایە، ئەوە سەرەتا هی عەورەتی بۆخۆی بە نورە (بەردی قسڵ) لادەبرد، ئەوجار خێزانەكانی هی تەواوی جەستەیان بۆ لادەبرد.

٣٧٥٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اطَّلَى وَوَلِيَ عَانَتَهُ بِيَدِهِ»[٢].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە دەستی خۆی مووی عەورەتی لادەبرد.

## بابەت: چیرۆک

٣٧٥٣- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَقُصُّ عَلَى النَّاسِ إِلَّا أَمِيرٌ، أَوْ مَأْمُورٌ أَوْ مُرَاءٍ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح لغيره.

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەس بۆی نیە قسەو ئامۆژگاری و چیرۆک بۆ خەڵک بگێڕێتەوە، مەگەر ئەو کەسە پێشەوای مسوڵمانان بێ، یان لەلایەن پێشەواوە دانرابێ، یان کەسێکە کە ڕووپاماو ڕیابازە.

**٣٧٥٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «لَمْ يَكُنِ الْقَصَصُ فِي زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَا زَمَنِ أَبِي بَكْرٍ، وَلَا زَمَنِ عُمَرَ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: چیرۆک گێڕانەوە نە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺو، نە لە سەردەمی ئەبو بەکرو، نە لە سەردەمی عومەردا نەبووە.**

## بابەت: شیعر (هۆنراوە)

**٣٧٥٥-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً»[٢].

**واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی هۆنراوەی وا هەیە دانایی و لێزانی تێدایە.**

**٣٧٥٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكَمًا»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: بەڕاستی هۆنراوەی وا هەیە دانایی و لێزانی تێدایە.**

**٣٧٥٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِرُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: أَلَا كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلَا اللَّهَ بَاطِلُ» وَكَادَ أُمَيَّةُ بْنُ أَبِي الصَّلْتِ أَنْ يُسْلِمَ[٤].

---

(١) أثر صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٤٥، وأبو داود: ٥٠١٠.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٥٠١١، والترمذي: ٢٨٤٥.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨٤١، ومسلم: ٢٢٥٦، والترمذي: ٢٨٤٩.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕاسترین قسەیەک کە شاعیرێک گوتوویەتی قسەکەی لەبیدە (کە دەڵێ): بێگومان هەموو شتێک جگە لە (فەرمانبەرداری) خوا بەتاڵ و بێ سوودە، (پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو:) نزیک بوو کە ئومەییەی کوڕی ئەبو صەلت مسوڵمان ببێ. (لە کاتی بیستنیدا)

**٣٧٥٨-** عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: أَنْشَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِائَةَ قَافِيَةٍ مِنْ شِعْرِ أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ، يَقُولُ بَيْنَ كُلِّ قَافِيَةٍ: «هِيهْ»، وَقَالَ «كَادَ أَنْ يُسْلِمَ»[١].

واتە: عەمری کوڕی شەرید لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: سەد دێڕە شیعری ئومەییەی کوڕی ئەبو صەلتم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندەوە، لە نێوان هەر بەشێک دەیفەرموو: زیاتر، فەرمووی: نزیک بوو کە (ئومەییە) مسوڵمان بێ.

## بابەت: ئەو شتانەی کە لە شیعردا ناپەسندن

**٣٧٥٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ الرَّجُلِ قَيْحًا حَتَّى يَرِيَهُ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا» إِلَّا أَنَّ حَفْصًا لَمْ يَقُلْ يَرِيَهُ[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێک ناوسکی پڕبێت لە کێم و زوخاو بە جۆرێک هەتا ناوسکی وێران بکات، باشترە بۆی لەوەی کە پڕبێت لە شیعر. تەنها ئەوەندە هەیە حەفص نەیگوت: «یریە» واتە: دەردو نەخۆشی هەیە.

**٣٧٦٠-** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحًا حَتَّى يَرِيَهُ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا»[٣].

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لەڕاستیدا ئەگەر یەکێکتان ناوسکی پڕبێت لە کێم و زوخاو و تاکو ناوسکی وێران بکات بۆی باشترە لەوەی کە پڕی بکات لە شیعر.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٥٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٥٥، ومسلم: ٢٢٥٧، وأبو داود: ٥٠٠٩، والترمذي: ٢٨٥٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٥٨، والترمذي: ٢٨٥١.

**٣٧٦١-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَعْظَمَ النَّاسِ فِرْيَةً لَرَجُلٌ هَاجَى رَجُلًا، فَهَجَا الْقَبِيلَةَ بِأَسْرِهَا، وَرَجُلٌ انْتَفَى مِنْ أَبِيهِ وَزَنَّى أُمَّهُ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان گەورەترین بوختانچی و درۆزن لە ناو خەڵکدا پیاوێکە کە پیاوێکی تر داشۆرێت (هەجوی بکات)، جا بێت هەموو هۆزەکەی بە گشتی داشۆرێت، وە پیاوێک ئینکاری باوکی خۆی بکات و (لەو پەنایەشەوە) دایکی بە زینا تۆمەتبار بکات، (چونکە ئەگەر ئینکاری باوکی خۆی بکات کەواتە باوکێکی دیکەی هەیە، ئەوکات ئاماژەیە بۆ ئەو تۆمەتەی بۆ دایکی دەکات).

## بابەت: یاریکردن بە زار (وەکو تاوڵە)

**٣٧٦٢-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدِ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ»[2].

واتە: ئەبو موسا ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک یاری بە زار بکات، ئەوە بێگومان سەرپێچی خواو پێغەمبەری خوای ﷺ کردوە.

**٣٧٦٣-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدَشِيرِ، فَكَأَنَّمَا غَمَسَ يَدَهُ فِي لَحْمِ خِنْزِيرٍ وَدَمِهِ»[3].

واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە لە باوکییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک یاری بە نەردەشیر بکات، ئەوە وەکو ئەوە وایە دەستی نوقمی گۆشت و خوێنی بەراز بووبێ.

## بابەت: یاریکردن بە کۆتر

**٣٧٦٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَظَرَ إِلَى إِنْسَانٍ يَتْبَعُ طَائِرًا، فَقَالَ: «شَيْطَانٌ يَتْبَعُ شَيْطَانًا»[4].

---

(١) صحيح.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٩٣٨.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٦٠، وأبو داود: ٤٩٣٩.

(٤) حسن.

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ تەماشای کەسێکی کرد کە بەدوای باڵندەیەکەوە بوو، فەرمووی: شەیتانێک بە دوای شەیتانێکی دیکە کەوتوە.

٣٧٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى رَجُلًا يَتْبَعُ حَمَامَةً فَقَالَ: «شَيْطَانٌ يَتْبَعُ شَيْطَانَةً»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی بەشوێن کۆترێکەوە بوو، بۆیە فەرمووی: شەیتانێک بە دوای شەیتانێکی دیکە کەوتوە.

٣٧٦٦- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى رَجُلًا وَرَاءَ حَمَامَةٍ فَقَالَ: «شَيْطَانٌ، يَتْبَعُ شَيْطَانَةً»[٢].

واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی بەشوێن کۆترێکەوە بوو، بۆیە فەرمووی: شەیتانێک بە دوای شەیتانێکی دیکە کەوتوە.

٣٧٦٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلًا يَتْبَعُ حَمَامًا فَقَالَ: «شَيْطَانٌ يَتْبَعُ شَيْطَانًا»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی بەشوێن کۆترێکەوە بوو، بۆیە فەرمووی: شەیتانێک بە دوای شەیتانێکی دیکە کەوتوە.

## بابەت: ناپەسندی تەنیابوون

٣٧٦٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُكُمْ مَا فِي الْوَحْدَةِ، مَا سَارَ أَحَدٌ بِلَيْلٍ وَحْدَهُ»[٤].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان بزانن تەنیایی چۆنەو چی تێدایە، ئەوە هەرگیز هیچ کەس شەوانە بە تەنیا نەدەڕۆیشت بە ڕێگادا.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٩٤٠.

(٢) حسن لغيره.

(٣) حسن لغيره.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٩٨، والترمذي: ١٦٧٣.

## بابەت: کوژاندنەوەی ئاگر لەکاتی نوستندا

**٣٧٦٩-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﭭ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا تَتْرُكُوا النَّارَ فِي بُيُوتِكُمْ حِينَ تَنَامُونَ»[١].

واتە: سالیم لە باوکییەوە ﭭ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێک کە دەخەون ئاگر لەماڵەکانتان بەجێمەهێڵن (بیکوژێننەوە).

**٣٧٧٠-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﭬ، قَالَ: احْتَرَقَ بَيْتٌ بِالْمَدِينَةِ عَلَى أَهْلِهِ، فَحُدِّثَ النَّبِيُّ ﷺ بِشَأْنِهِمْ، فَقَالَ: «إِنَّمَا هَذِهِ النَّارُ عَدُوٌّ لَكُمْ، فَإِذَا نِمْتُمْ فَأَطْفِئُوهَا عَنْكُمْ»[٢].

واتە: ئەبو موسا ﭬ دەڵێ: لە مەدینە ماڵێک بەسەر خێزانی ماڵەکەدا سووتا، جا ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، فەرمووی: لەڕاستییدا ئەو ئاگرە دوژمنە بۆ ئێوە، جا هەرکاتێک خەوتن ئەوە ئاگر لەسەر خۆتان بکوژێننەوە.

**٣٧٧١-** عَنْ جَابِرٍ ﭬ، قَالَ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَهَانَا، فَأَمَرَنَا أَنْ نُطْفِئَ سِرَاجَنَا»[٣].

واتە: جابیر ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیشی پێدەکردین و شتیشی لێ قەدەغە دەکردین، جا فەرمانی پێکردین کەوا چراکانمان بکوژێنینەوە (کاتی خەوتن).

## بابەت: نەهی کردن لە مەنزڵگرتن لەسەر چەقی ڕێگا

**٣٧٧٢-** عَنْ جَابِرٍ ﭬ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَنْزِلُوا عَلَى جَوَادِّ الطَّرِيقِ، وَلَا تَقْضُوا عَلَيْهَا الْحَاجَاتِ»[٤].

واتە: جابیر ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەسەر چەقی جادەو ڕێگاو بانەکان بارگە مەگرن، وە سەرئاویش لەسەر ڕێگاکان مەکەن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٩٣، ومسلم: ٢٠١٥، وأبو داود: ٥٢٤٦، والترمذي: ١٨١٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٩٤، ومسلم: ٢٠١٦.

(٣) صحيح. انظر: البخاري: ٦٢٩٥ و ٦٢٩٦، ومسلم: ٢٠١٢.

(٤) صحيح لغيره. انظر الحديث: ٣٢٩.

## بابەت: سێ سوار لەسەر وڵاخێک

**٣٧٧٣-** عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ ﭬ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ تُلُقِّيَ بِنَا. قَالَ: فَتُلُقِّيَ بِي وَبِالْحَسَنِ، أَوْ بِالْحُسَيْنِ، قَالَ: فَحَمَلَ أَحَدَنَا بَيْنَ يَدَيْهِ، وَالْآخَرَ خَلْفَهُ، حَتَّى قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ»[١].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﭬ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەرێک دەهاتەوە ئێمەیان بە پێشوازی دەبرد بە پیریەوە، جا من و حەسەن یان حوسەینیان بەپیرەوە برد، گوتی: یەکێکمانی لە پێش خۆی داناو ئەویتریش لە دواوە، هەتا گەیشتینەوە مەدینە.

## بابەت: خۆڵاوکردنی نامە

**٣٧٧٤-** عَنْ جَابِرٍ ﭬ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «تَرِّبُوا صُحُفَكُمْ أَنْجَحُ لَهَا، إِنَّ التُّرَابَ مُبَارَكٌ»[٢].

**واتە:** جابیر ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەڕاوو نامەکانتان خۆڵاوی بکەن سەرکەوتووترە بۆی، چونکە گڵ موبارەک و بەفەڕە.

## بابەت: بە نهێنی قسەکردنی دوو کەس جیا لە کەسی سێیەم

**٣٧٧٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﭬ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ صَاحِبِهِمَا، فَإِنَّ ذَلِكَ يَحْزُنُهُ»[٣].

**واتە:** عەبدوڵڵا ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکاتێک بوون بە سێ کەس، ئەوە با دووانیان بەبێ هاوڕێکەیان سرکەو کورکە نەکەن، چونکە ئەو کارە دڵتەنگی دەکات.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٤٢٨، وأبو داود: ٢٥٦٦.

(٢) منكر. أخرجه بنحوه. وانظر: الترمذي: ٢٧١٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٩٠، ومسلم: ٢١٨٤، وأبو داود: ٤٨٥١، والترمذي: ٢٨٢٥.




٣٧٧٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الثَّالِثِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە کەوا دوو کەس بە چرپەو نهێنی قسە بکەن بەبێ کەسی سێیەم (واتە: کەسی سێیەمیش لەوێ بێت و، ئەوانیش سرکەو کورکە بکەن، ئەوە پەسند نیە).

## بابەت: هەر کەسێک تیری پێیە
## با سەرە نووکە تیژەکەی بگرێ، تاکو خەڵک پارێزراو بێ

٣٧٧٧- عَنْ سُفْيَان بْن عُيَيْنَةَ قَالَ: قُلْتُ لِعَمْرِو بْنِ دِينَارٍ: سَمِعْتَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَرَّ رَجُلٌ بِسِهَامٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمْسِكْ بِنِصَالِهَا؟ قَالَ: نَعَمْ»[٢].

واتە: سوفیانی کوڕی عویەینە دەڵێ: بە عەمڕی کوڕی دینارم ﷺ گوت: گوێت لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا بووە دەڵێ: پیاوێک بە تیرەکانیەوە بە مزگەوتدا تێپەڕی، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەری تیرەکانت بگرە؟ گوتی: بەڵێ.

٣٧٧٨- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا مَرَّ أَحَدُكُمْ فِي مَسْجِدِنَا أَوْ فِي سُوقِنَا وَمَعَهُ نَبْلٌ، فَلْيُمْسِكْ عَلَى نِصَالِهَا بِكَفِّهِ، أَنْ تُصِيبَ أَحَدًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ بِشَيْءٍ، أَوْ فَلْيَقْبِضْ عَلَى نِصَالِهَا»[٣].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان بە تیغ و تیرەوە بە مزگەوتەکانماندا یان بە بازاڕەکانماندا ڕەت بوو، ئەوە با سەری تیژی تیرەکان بە دەست بگرێ، نەبادا یەکێک لە موسڵمانان تووشی شتێک ببێت، یان (فەرمووی:) با نوکی تیرەکان بگرێت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٨٨، ومسلم: ٢١٨٣، وأبو داود: ٤٨٥٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥١، ومسلم: ٢٦١٤، وأبو داود: ٢٥٨٦، والنسائي: ٧١٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٧٥، ومسلم: ٢٦١٥، وأبو داود: ٢٥٨٧.




## بابەت: پاداشتی قورئان

٣٧٧٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَؤُهُ يَتَتَعْتَعُ فِيهِ وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرَانِ اثْنَانِ»(١).

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە شارەزایی باشی لە قورئاندا هەیە ئەوە لەگەڵ فریشتە نزیکەکان دایە، وە ئەو کەسەش کە دەیخوێنێ و زمانی تەتڵە لەسەری قورسە، ئەوە دوو جار پاداشت دەدرێتەوە (جارێک هی خوێندنەکەو جارێک هی ماندووبوونەکە).

٣٧٨٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ إِذَا دَخَلَ الْجَنَّةَ اقْرَأْ وَاصْعَدْ، فَيَقْرَأُ وَيَصْعَدُ بِكُلِّ آيَةٍ دَرَجَةً حَتَّى يَقْرَأَ آخِرَ شَيْءٍ مَعَهُ»(٢).

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکات قورئانخوێن ڕۆیشتە ناو بەهەشتەوە پێی دەگوتریت: بخوێنەو بەسەر پلەکانی بەهەشتدا سەربکەوە، ئەویش قورئان دەخوێنێت و لەگەڵ هەر ئایەتێک پلەیەک سەر دەکەوێ، هەتاکو کۆتا ئایەت کە لەبەریەتی دەیخوێنێ.

٣٧٨١- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَجِيءُ الْقُرْآنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَالرَّجُلِ الشَّاحِبِ فَيَقُولُ: أَنَا الَّذِي أَسْهَرْتُ لَيْلَكَ، وَأَظْمَأْتُ نَهَارَكَ»(٣).

واتە: ئیبنو بورەیدە لە باوکییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا قورئان لەسەر شێوەی پیاوێکی ماندوو دێت و بە هاوەڵە قورئانخوێنەکەی دەڵێ: من بووم کە لە دونیادا شەونخونیم پێدەکردی و، ڕۆژیش تینووم دەکردی.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩٣٧، ومسلم: ٧٩٨، وأبو داود: ١٤٥٤، والترمذي: ٢٩٠٤.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) حسن الإسناد.

٣٧٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ أَنْ يَجِدَ فِيهِ ثَلَاثَ خَلِفَاتٍ عِظَامٍ سِمَانٍ؟» قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: «فَثَلَاثُ آيَاتٍ يَقْرَؤُهُنَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلَاثِ خَلِفَاتٍ سِمَانٍ عِظَامٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەر یەکێک لە ئێوە پێی خۆشە کاتێک دەگەڕێتەوە ماڵەکەی خۆی سێ وشتری چاک و قەڵەوی ئاوسی دەسکەوێ؟ گوتمان: بەڵێ، فەرمووی: دەی سێ ئایەت کە یەکێکتان لە ناو نوێژدا دەیخوێنێ بۆی باشترە لە سێ وشتری قەڵەو و باشی ئاوس.

٣٧٨٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ الْقُرْآنِ مَثَلُ الْإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ، إِنْ تَعَاهَدَهَا صَاحِبُهَا بِعُقُلِهَا أَمْسَكَهَا عَلَيْهِ، وَإِنْ أَطْلَقَ عُقُلَهَا ذَهَبَتْ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وێنەی قورئان (بۆ کەسێک کە لەبەری کردوە) وەکو وشترێک وایە کە پەتک (حەبل)ـی پێوە بێ، جا ئەگەر خاوەنەکەی بەو پەتکە بیبەستێتەوە ئەوە دەتوانێ بیگرێتەوە، خۆ ئەگەر بەرەڵای بکات ئەوە دەڕوات (قورئانیش خاوەنەکەی دەبێ زوو دەوری بکاتەوە دەنا لەبیری دەچێتەوە).

٣٧٨٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «قَالَ اللَّهُ ﷻ: قَسَمْتُ الصَّلَاةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي شَطْرَيْنِ، فَنِصْفُهَا لِي وَنِصْفُهَا لِعَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ» قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْرَءُوا: يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة، فَيَقُولُ اللَّهُ ﷻ: حَمِدَنِي عَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، فَيَقُولُ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣﴾ الفاتحة، فَيَقُولُ: أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، يَقُولُ: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾، فَيَقُولُ اللَّهُ: مَجَّدَنِي عَبْدِي فَهَذَا لِي، وَهَذِهِ الْآيَةُ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾ الفاتحة - يَعْنِي فَهَذِهِ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي - وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، وَآخِرُ السُّورَةِ لِعَبْدِي، يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، فَهَذَا لِعَبْدِي وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٠٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٣١، ومسلم: ٧٨٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٩٥، وأبو داود: ٨٢١، والترمذي: ٢٩٥٣، والنسائي: ٩٠٩.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوای ﷻ فەرموویەتی: نوێژم لەگەڵ بەندەکەم کردوەتە دوو بەش، نیوەی بۆ من و نیوەشی بۆ بەندەکەم، وە ئەوەی بەندەکەشم داوای بکات پێی دەبەخشم، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بخوێننەوە (یان گوێبگرن و تێبگەن)، کاتێک بەندە دەڵێ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾ الفاتحة، خوای ﷻ دەفەرمووێت: بەندەکەم سوپاس و ستایشی کردم و ئەوەی بەندەکەم داوای بکات پێی دەبەخشم، جا کە دەڵێ: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣﴾ الفاتحة، خوا دەفەرموێ: بەندەکەم ستایشی کردم و ئەوەی بەندەکەم داوای بکات پێی دەبەخشم، کە دەڵێ: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤﴾ الفاتحة، ئەوە خوا دەفەرموێ: بەندەکەم بە شکۆو مەزنی ناوی هێنام، جا ئەوەیان بۆ منە، وە ئەو ئایەتەش لە نێوانی من و بەندەکەم دایە بە نیوە، بەندە دەڵێ: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥﴾ الفاتحة، واتە: ئەوەیان لە نێوان من و بەندەکەم دایە، وە ئەوەی بەندەکەم داوای بکات پێی دەبەخشم، وە کۆتایی سوورەتەکە بۆ بەندەکەمە، بەندە دەڵێ: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧﴾ الفاتحة، ئەوەیان بۆ بەندەکەمەو ئەوەی بەندەکەم داوای بکات پێی دەبەخشم.

**٣٧٨٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا أُعَلِّمُكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ أَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ؟» قَالَ: فَذَهَبَ النَّبِيُّ ﷺ لِيَخْرُجَ، فَأَذْكَرْتُهُ، فَقَالَ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾، وَهِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي، وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ»[1].

واتە: ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئایا گەورەترین سوورەتی قورئانت فێربکەم پێش ئەوەی لە مزگەوت دەربچم؟ گوتی: جا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت دەربچێ لە مزگەوت، منیش بە یادم خستەوە، ئەویش فەرمووی: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾، (واتە: سوورەتی: «الفاتحة»)، ئەو سوورەتە حەوت ئایەتی دووبارەبووەیە (لەناو نوێژدا)، وە تەواوی قورئانی گەورەو بەرزە کە من هێناومە (واتە: هەموو مانای قورئانی بە کورتی و پوختی تێدایە).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٧٤، وأبو داود: ١٤٥٨، والنسائي: ٩١٣.

٣٧٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ سُورَةً فِي الْقُرْآنِ ثَلَاثُونَ آيَةً شَفَعَتْ لِصَاحِبِهَا حَتَّى غُفِرَ لَهُ: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ ①﴾»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سوورەتێک لە قورئاندا هەیە کە سی ئایەتە دەبێتە تکاکار بۆ خاوەنەکەی هەتا لێی دەبوردرێت (ئەویش بریتیە لە سوورەتی: «الملك») ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ ①﴾.

٣٧٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾ تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾ (سوورەتی: الإخلاص) بەرانبەرە بە سێیەکی قورئان.

٣٧٨٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾ تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ»[3].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾ (سوورەتی: الإخلاص) بەرانبەرە بە سێیەکی قورئان.

٣٧٨٩- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُ أَحَدٌ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ»[4].

واتە: ئەبو مەسعودی ئەنصاریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «اللَّهُ أَحَدٌ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ» (سوورەتی: «الإخلاص») بەرانبەرە بە سێیەکی قورئان.

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٤٠٠، والترمذي: ٢٨٩١.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٨٩٩.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

## بابەت: گەورەیی زیکر کردن

**٣٧٩٠-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ وَأَرْضَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ، وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ إِعْطَاءِ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ، وَمِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ، وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ؟» قَالُوا: وَمَا ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «ذِكْرُ اللَّهِ» وَقَالَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ : «مَا عَمِلَ امْرُؤٌ بِعَمَلٍ أَنْجَى لَهُ مِنْ عَذَابِ اللَّهِ ﷻ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ»[1].

**واتە:** ئەبو دەرداء  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئایا باشترینی کردەوەکانتان پێ بڵێم، کە زیاتر لە هەموویان جێگای ڕەزامەندی خوای خاوەن و پەروەردگارتانەو هۆی بەرزترین پلەتانەو لە بەخشینی زێڕو زیو بۆتان باشترەوە، باشترە بۆتان لەوەی کە بە دوژمنتان بگەن و لە گەردنیان بدەن و لە گەردنتان بدەن؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جا ئەوە چییە (ئاوا پاداشتی هەیە)؟ فەرمووی: یادی خوا، وە موعازی کوڕی جەبەل  گوتی: هیچ کردەوەیەکی مرۆڤ بۆ نەجات بوون لە سزای خوای ﷻ ناگاتە یادی خوا.

**٣٧٩١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ ، يَشْهَدَانِ بِهِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِسًا يَذْكُرُونَ اللَّهَ فِيهِ إِلَّا حَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ، وَتَغَشَّتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَتَنَزَّلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ»[2].

**واتە:** ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعید  دەگێڕنەوە، شاهیدی دەدەن کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هەر کۆڕو مەجلیسێک کە دادەنیشن و یادی خوای تێدا دەکەن ئەوە فریشتەکان دەوریان دەدەن و ڕەحمەت و میهرەبانی خوا دایاندەپۆشێ و ئارامی و دڵنەوایی دادەبەزێتە سەریان، وە خوا لەلای ئەوانەی کە لەلای زاتی خوان باسیان دەکات.

**٣٧٩٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ يَقُولُ: أَنَا مَعَ عَبْدِي إِذَا هُوَ ذَكَرَنِي وَتَحَرَّكَتْ بِي شَفَتَاهُ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٣٧٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٠٠، والترمذي: ٣٣٧٨.

(٣) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای ﷻ دەفەرموێ: من لەگەڵ بەندەکەی خۆمم کاتێک ئەو یادم دەکات و دەمی بە یادی منەوە دەجوڵێنێ.

**٣٧٩٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ ﷺ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ شَرَائِعَ الْإِسْلَامِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيَّ، فَأَنْبِئْنِي مِنْهَا بِشَيْءٍ أَتَشَبَّثُ بِهِ قَالَ: «لَا يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ ﷻ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوسڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، دەشتەکییەک بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: بەڕاستی دروشم و شیعارەکانی ئیسلام لەسەر من زۆر بوون، جا ئەگەر شتێکم پێ بفەرمووی کە دەستی پێوە بگرم بە بەردەوامی، فەرمووی: با هەمیشە زمانت پاراو بێت بە یادی خوای ﷻ.

## بابەت: گەورەیی "لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ"

**٣٧٩٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّهُمَا شَهِدَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَالَ الْعَبْدُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، قَالَ يَقُولُ اللَّهُ ﷻ: صَدَقَ عَبْدِي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا وَأَنَا أَكْبَرُ، وَإِذَا قَالَ الْعَبْدُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ، قَالَ: صَدَقَ عَبْدِي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا وَحْدِي، وَإِذَا قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، قَالَ: صَدَقَ عَبْدِي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا وَلَا شَرِيكَ لِي، وَإِذَا قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، قَالَ: صَدَقَ عَبْدِي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا، لِي الْمُلْكُ، وَلِيَ الْحَمْدُ، وَإِذَا قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، قَالَ: صَدَقَ عَبْدِي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِي» قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: ثُمَّ قَالَ الْأَغَرُّ شَيْئًا لَمْ أَفْهَمْهُ، قَالَ: فَقُلْتُ لِأَبِي جَعْفَرٍ: مَا قَالَ؟ فَقَالَ: «مَنْ رُزِقَهُنَّ عِنْدَ مَوْتِهِ لَمْ تَمَسَّهُ النَّارُ»[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە شاهێدییان داوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک بەندە دەڵێ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ»، فەرمووی: خوای ﷻ دەفەرموێ: بەندەکەم ڕاستی گوت، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە من وە من گەورەترینم، وە کاتێک بەندە دەڵێ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ»، دەفەرموێ: بەندەکەم ڕاستی گوت، هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لەمن، من تاک و تەنیام، وە کە گوتی: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ لَا شَرِيكَ لَهُ»، دەفەرمووێت: بەندەکەم ڕاستی کرد، هیچ

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٣٧٥.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٤٣٠.

پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە من و من هیچ هاوبەشێکم نیە، وە کاتێک گوتی: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ»، دەفەرموێ: بەندەکەم ڕاستی کرد، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە من و هەموو دەسەڵات و سوپاس و ستایش تەنها بۆ منە، وە کاتێک گوتی: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ»، دەفەرموێ: بەندەکەم ڕاستی کرد، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە من و هیچ ئاڵوگۆڕێک و هێزێک نیە جگە لەوەی کە من هەمە. ئەبو ئیسحاق گوتی: پاشان ئەغەڕ شتێکی گوت تێی نەگەیشتم، بە ئەبو جەعفەرم گوت: چی گوت؟ ئەویش گوتی: هەر کەسێک لەکاتی مردندا ئەوە بڵێت ئەوە ناچێتە ناو ئاگرەوە.

**٣٧٩٥-** عَنْ سُعْدَى الْمُرِّيَّةِ ﵂ قَالَتْ: مَرَّ عُمَرُ بِطَلْحَةَ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: مَا لَكَ كَئِيبًا؟ أَسَاءَتْكَ إِمْرَةُ ابْنِ عَمِّكَ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنِّي لَأَعْلَمُ كَلِمَةً لَا يَقُولُهَا أَحَدٌ عِنْدَ مَوْتِهِ إِلَّا كَانَتْ نُورًا لِصَحِيفَتِهِ، وَإِنَّ جَسَدَهُ وَرُوحَهُ لَيَجِدَانِ لَهَا رَوْحًا عِنْدَ الْمَوْتِ». فَلَمْ أَسْأَلْهُ حَتَّى تُوُفِّيَ، قَالَ: أَنَا أَعْلَمُهَا، هِيَ الَّتِي أَرَادَ عَمَّهُ عَلَيْهَا، وَلَوْ عَلِمَ أَنَّ شَيْئًا أَنْجَى لَهُ مِنْهَا، لَأَمَرَهُ»[1].

واتە: سوعدای مورییە ﵂ دەڵێ: لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ عومەر بە لای تەڵحەدا تێپەڕی و پێی گوت: بۆ وا غەمبارو غەمگینی؟ ئایا سەرکردایەتی و ئەمیرایەتی کوڕە مامەکەت ناڕەحەتی کردووی؟ گوتی: نەخێر، بەڵام گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لەڕاستییدا وشەیەک دەزانم کە ئەگەر کەسێک لە سەرەمەرگدا بیڵێ، ئەوە بێگومان دەبێتە ڕووناکی بۆ پەڕاوەکانی، وەە بێگومان جەستەو گیانی بەو وشە خۆشی و ئارامی هەست پێ دەکەن لەکاتی مردنیدا. جا من پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکرد تاکو وەفاتی کرد، عومەر گوتی: من دەزانم چییە، ئەوە ئەو وشەیە بوو کە پێغەمبەر ﷺ لە مامی خۆی داوای دەکرد (کە بریتیە لە: «لا الە إلا الله») خۆ ئەگەر باشتری شک ببردبایە ئەوە بە ئەو شتە فەرمانی پێدەکرد.

**٣٧٩٦-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ نَفْسٍ تَمُوتُ تَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَرْجِعُ ذَلِكَ إِلَى قَلْبِ مُوقِنٍ إِلَّا غَفَرَ اللَّهُ لَهَا»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک نیە کە بمرێت و شاهێدی بدات کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە زاتی الله، وە شاهێدی بدات کە من پێغەمبەری خوام ﷺ، وە ئەوەش لە دڵێکی پڕ لە یەقینەوە بڵێ، حەتمەن خوا لێی خۆش دەبێت.

٣٧٩٧- عَنْ أُمِّ هَانِئٍ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ لَا يَسْبِقُهَا عَمَلٌ وَلَا تَتْرُكُ ذَنْبًا»[١].

واتە: ئوممو هانیئ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وشەی «لا اله الا الله» هیچ کردەوەیەکی ناگاتێ و هیچ تاوانێکیش ناهێڵێ.

٣٧٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَالَ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ، لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، كَانَ لَهُ عَدْلُ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكُنَّ لَهُ حِرْزًا مِنَ الشَّيْطَانِ، سَائِرَ يَوْمِهِ إِلَى اللَّيْلِ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا أَتَى بِهِ، إِلَّا مَنْ قَالَ أَكْثَرَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ»، ئەوە بۆی بەرانبەر دەکرێ بە ئازادکردنی دە کۆیلە، وە سەد چاکەی بۆ دەنوسرێ، وە سەد خراپەی لێ دەسڕدرێتەوە، وە بۆی دەبێتە هۆی پاراستن لە شەیتان تەواوی ئەو ڕۆژە تاکو شەو، وە هیچ کەسێک ناتوانێ لە ئەو چاکتر بەدەست بێنێ، مەگەر کەسێک لە ئەو زیاتر ئەو زیکرەی کردبێ.

٣٧٩٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَالَ فِي دُبُرِ صَلَاةِ الْغَدَاةِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، كَانَ كَعَتَاقِ رَقَبَةٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٩٣، ومسلم: ٢٦٩١، والترمذي: ٣٤٦٨.

(٣) ضعيف.




واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە دوای نوێژی بەیانی گوتی: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ»، ئەوە پاداشتەکەی وەکو ئەوە وایە کە کۆیلەیەکی لە نەوەی ئیسماعیل ئازاد کردبێ.

## بابەت: گەورەیی سوپاسگوزاری

**٣٨٠٠- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَفْضَلُ الذِّكْرِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَفْضَلُ الدُّعَاءِ الْحَمْدُ لِلَّهِ»[1].**

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: باشترین زیکرو یادی خوا بریتیە لە: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»، وە باشترین دوعا بریتیە لە: «الْحَمْدُ لِلَّهِ».

**٣٨٠١- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَدَّثَهُمْ: «أَنَّ عَبْدًا مِنْ عِبَادِ اللَّهِ قَالَ: يَا رَبِّ لَكَ الْحَمْدُ كَمَا يَنْبَغِي لِجَلَالِ وَجْهِكَ وَلِعَظِيمِ سُلْطَانِكَ، فَعَضَّلَتْ بِالْمَلَكَيْنِ، فَلَمْ يَدْرِيَا كَيْفَ يَكْتُبَانِهَا، فَصَعِدَا إِلَى السَّمَاءِ، وَقَالَا: يَا رَبَّنَا، إِنَّ عَبْدَكَ قَدْ قَالَ مَقَالَةً لَا نَدْرِي كَيْفَ نَكْتُبُهَا، قَالَ اللَّهُ ﷻ: وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا قَالَ عَبْدُهُ: مَاذَا قَالَ عَبْدِي؟ قَالَا: يَا رَبِّ إِنَّهُ قَالَ: يَا رَبِّ لَكَ الْحَمْدُ كَمَا يَنْبَغِي لِجَلَالِ وَجْهِكَ وَعَظِيمِ سُلْطَانِكَ، فَقَالَ اللَّهُ ﷻ لَهُمَا: «اكْتُبَاهَا كَمَا قَالَ عَبْدِي، حَتَّى يَلْقَانِي فَأَجْزِيَهُ بِهَا»[2].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی گێڕاونەوە کە بەندەیەک لە بەندەکانی خوا گوتوویەتی: «يَا رَبِّ لَكَ الْحَمْدُ كَمَا يَنْبَغِي لِجَلَالِ وَجْهِكَ وَلِعَظِيمِ سُلْطَانِكَ»، واتە: ئەی پەروەردگارا سوپاس و ستایش بۆ تۆ بەو جۆرەی کە شایەنی گەورەیی تۆیەو شایەنی گەورەیی و زۆری دەسەڵاتی تۆیە، ئنجا ئەو دوو فریشتەیەی کە کردەوەکان دەنوسن لەسەریان قورس بوو نەیاندەزانی چۆن و چی بنوسن، بۆیە بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان و گوتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە لەڕاستیدا

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٣٨٣.

(٢) ضعيف.

بەندەیەکت شتێکی گوتووە کە نازانین چۆنی بنوسین، خوای ﷻ کە زاناترە بەوەی کە بەندەکەی چی گوتووە فەرمووی: بەندەکەم چی گوتووە؟ گوتیان: ئەی پەروەردگارا لەڕاستیدا ئەو گوتی: «يَا رَبِّ لَكَ الْحَمْدُ كَمَا يَنْبَغِي لِجَلَالِ وَجْهِكَ وَلِعَظِيمِ سُلْطَانِكَ»، ئنجا خوای ﷻ بە فریشتەکانی فەرموو: بەو جۆرەی بنوسن کە بەندەکەم گوتویەتی، هەتاکو دەگاتەوە بە خۆم و هەر خۆشم پاداشتی دەدەمەوە.

٣٨٠٢- عَنْ عَبْدِ الْجَبَّارِ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رَجُلٌ: الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، فَلَمَّا صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: «مَنْ ذَا الَّذِي قَالَ هَذَا؟» قَالَ الرَّجُلُ: أَنَا وَمَا أَرَدْتُ إِلَّا الْخَيْرَ، فَقَالَ: «لَقَدْ فُتِحَتْ لَهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ، فَمَا نَهْنَهَهَا شَيْءٌ دُونَ الْعَرْشِ»[1].

واتە: عەبدولجەباری کوڕی وائیل لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ نوێژم کرد، جا پیاوێک گوتی: «الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ»، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە نوێژ بۆوە فەرمووی: کێ بوو ئەمەی گوت؟ ئەو پیاوەش گوتی: من بووم و تەنها مەبەستم خێرو چاکە بوو، بۆیە فەرمووی: لەڕاستیدا هەموو دەرگای ئاسمانەکان بۆ ئەو زیکرە کرانەوەو هیچ شتێک نەبوو بە بەربەست و ڕێگر تاکو گەیشتە عەرش.

٣٨٠٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا رَأَى مَا يُحِبُّ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحَاتُ»، وَإِذَا رَأَى مَا يَكْرَهُ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە شتێکی دەبینی و خۆشحاڵی دەکرد دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحَاتُ»، واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەهۆی نازو نیعمەتەکانی ئەو هەموو کردەوە چاکەکان تەواوو کامڵ دەبن، خۆ ئەگەر شتێکی بینیبا کە پێی ناخۆش بوایە دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ»، واتە: سوپاس بۆ خوا لەسەر هەموو بارو زروفێک.

---

(١) حسن لغيره.

(٢) حسن بشواهده.

**٣٨٠٤-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ حَالِ أَهْلِ النَّارِ»[١].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: سوپاس و ستایش بۆ خوا لە هەموو حاڵ و بارێکدا، پەروەردگارا پەنا دەگرم بە تۆ لە بارودۆخی خەڵکی دۆزەخ.

**٣٨٠٥-عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَى عَبْدٍ نِعْمَةً فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ، إِلَّا كَانَ الَّذِي أَعْطَى أَفْضَلَ مِمَّا أَخَذَ»[٢].**

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەک خوا نازو نیعمەتی پێ ببەخشێت و ئەویش بڵێت: «الْحَمْدُ لِلَّهِ»، ئەوە بێگومان خوا ئەوەی کە پێی بەخشیوە باشترە لەوەی کەوا وەریگرتووە.

## بابەت: گەورەیی تەسبیحات

**٣٨٠٦-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ»[٣].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو وشە هەیە کە لەسەر زمان ئاسانن و لە تەرازوودا گرانن و لەلای خوا خۆشەویست و قەدر گرانن: «سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ»، «سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ».

**٣٨٠٧-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِهِ وَهُوَ يَغْرِسُ غَرْسًا، فَقَالَ: «يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، مَا الَّذِي تَغْرِسُ؟» قُلْتُ: غِرَاسًا لِي، قَالَ: «أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى غِرَاسٍ خَيْرٍ لَكَ مِنْ هَذَا؟» قَالَ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «قُلْ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، يُغْرَسْ لَكَ بِكُلِّ وَاحِدَةٍ شَجَرَةٌ فِي الْجَنَّةِ»[٤].**

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٠٦، ومسلم: ٢٦٩٤، والترمذي: ٣٤٦٧.

(٤) حسن.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایدا تێدەپەڕێت لەکاتێکدا کە نەمامێک دەچێنێت، بۆیە دەفەرمووێت: ئەی ئەبو هورەیرە ئەوە چی دەچێنی؟ (دەڵێ:) گوتم: دارێکە بۆ خۆم دەیچێنم، فەرمووی: ئایا شتێکت پێ بڵێم کە چاندنی لەو چاندنەی تۆ چاکتر بێ؟ گوتی: بەڵێ پێم بڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: بڵێ: «سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ»، بۆ هەر یەکێک لەوانە لە بەهەشتدا دارێکت بۆ دەچێنرێت.

**٣٨٠٨- عَنْ جُوَيْرِيَةَ ﷺ قَالَتْ: مَرَّ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ صَلَّى الْغَدَاةَ، - أَوْ بَعْدَ مَا صَلَّى الْغَدَاةَ - وَهِيَ تَذْكُرُ اللَّهَ، فَرَجَعَ حِينَ ارْتَفَعَ النَّهَارُ - أَوْ قَالَ: انْتَصَفَ - وَهِيَ كَذَلِكَ، فَقَالَ: «لَقَدْ قُلْتُ مُنْذُ قُمْتُ عَنْكِ: أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَهِيَ أَكْثَرُ وَأَرْجَحُ - أَوْ أَوْزَنُ - مِمَّا قُلْتِ: سُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ رِضَا نَفْسِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ مِدَادَ كَلِمَاتِهِ»[1].**

واتە: جوەیریە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی نوێژی بەیانیدا یان لەدوای ئەوەی نوێژی بەیانی کردوە بەلایدا تێپەڕیوە، لەوکاتەشدا جوەیریە زیکرو یادی خوای کردوە، جا پێغەمبەر ﷺ کاتێ ڕۆژ بەرزبۆتەوە یان کاتێ پێشنیوەڕۆ نیوەیی بووە ئەو هەر خەریکی زیکر کردن و یادی خوا بووە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەوکاتەوەی کە من لەلای تۆ هەستام سێ جار چوار وشەم گوتووە کە ئەو وشانە زۆرترو باشتر یان بە سەنگ و قورسترن لەوەی تۆ گوتوتە (لەوکاتەوە)، (وشەکان بریتین لە:) «سُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ رِضَا نَفْسِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ مِدَادَ كَلِمَاتِهِ»، واتە: پاک و بێگەردی بۆ خوا بە ئەندازەی دروستکراوەکانی و تاکو خۆی ڕازی دەبێ و بە قورسایی عەرشەکەی و بە ئەندازەی وشەکانی.

**٣٨٠٩- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِمَّا تَذْكُرُونَ مِنْ جَلَالِ اللَّهِ التَّسْبِيحَ، وَالتَّهْلِيلَ، وَالتَّحْمِيدَ يَنْعَطِفْنَ حَوْلَ الْعَرْشِ، لَهُنَّ دَوِيٌّ كَدَوِيِّ النَّحْلِ، تُذَكِّرُ بِصَاحِبِهَا، أَمَا يُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَوْ لَا يَزَالَ لَهُ مَنْ يُذَكِّرُ بِهِ؟»[2].**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٢٦، وأبو داود: ١٥٠٣، والترمذي: ٣٥٥٥، والنسائي: ١٣٥٢.

(٢) صحيح.




واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئەوەی کە لە گەورەیی و دەسەڵاتی خوا یادی پێ دەکەن «سبحان الله» و «لا اله الا الله» و «الحمد لله»یە، لە دەوری عەرش دەسوڕێنەوەو دەنگێکیان لێ دێت وەکو دەنگی (گیزەگیزی) هەنگ کە باسی خاوەنەکانیان دەکەن لەوێ، جا ئایا هەر یەکێک لە ئێوە حەزناکات کە لەو دەنگ و سەدایەی هەبێت یان بەردەوام ئەو دەنگەی هەبێت کە باسی بکەن؟!

٣٨١٠- عَنْ أُمِّ هَانِئٍ ﷺ، قَالَتْ: أَتَيْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ فَإِنِّي قَدْ كَبِرْتُ وَضَعُفْتُ وَبَدُنْتُ، فَقَالَ: «كَبِّرِي اللَّهَ مِائَةَ مَرَّةٍ، وَاحْمَدِي اللَّهَ مِائَةَ مَرَّةٍ، وَسَبِّحِي اللَّهَ مِائَةَ مَرَّةٍ خَيْرٌ مِنْ مِائَةِ فَرَسٍ مُلْجَمٍ مُسْرَجٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَخَيْرٌ مِنْ مِائَةِ بَدَنَةٍ، وَخَيْرٌ مِنْ مِائَةِ رَقَبَةٍ»[1].

واتە: ئوممو هانیئ ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ جا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردەوەیەکم نیشان بدەو فێرم بکە، لەڕاستیدا هەم بەتەمەندا چووم و بێهێزو بێتاقەت بووم و قەڵەویش بووم، ئەویش فەرمووی: سەد جار «الله أكبر» بڵێ و سەد جار «الحمد لله» بڵێ و سەد جار «سبحان الله» بڵێ، ئەوە لە سەد ئەسپی لغاوکراوی زین کراوو ئامادە لەپێناو خوادا باشترە، وە باشترە لە سەد وشترو باشترە لە سەد بەندە.

٣٨١١- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَرْبَعٌ أَفْضَلُ الْكَلَامِ لَا يَضُرُّكَ بِأَيِّهِنَّ بَدَأْتَ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ»[2].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چوار وشە گەورەترینن، جا بە کامیان دەست پێ بکەی زەرەری نیە: «سبحان الله، والحمد لله، ولا اله الا الله، والله أكبر».

٣٨١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ، غُفِرَتْ لَهُ ذُنُوبُهُ، وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ»[3].

---

(١) حس.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٠٥، ومسلم: ٢٦٩١، وأبو داود: ٥٠٩١، والترمذي: ٣٤٦٦ و ٣٤٦٨م و ٣٤٦٩.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سەد جار بڵێت: «سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ»، ئەوە لە گوناهەکانی دەبوردرێت ئەگەر بە ئەندازەی کەفی دەریاش بن.

**٣٨١٣- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكَ بِسُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ فَإِنَّهَا يَعْنِي يَحْطُطْنَ الْخَطَايَا، كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا»[1].**

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئاگادارو پابەندی گوتنی: «سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ» بە، چونکە ئەوانە تاوانەکان هەڵدەوەرێنن وەکو چۆن گەڵا لە دار هەڵدەوەرێت.

## بابەت: داوای لێخۆشبوون کردن

**٣٨١٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْمَجْلِسِ يَقُولُ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ»، مِائَةَ مَرَّةٍ[2].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: ئێمە لە مەجلیس و کۆڕی پێغەمبەری خوادا ﷺ حیسابمان دەکرد کە سەد جار دەیفەرموو: «رَبِّ اغْفِرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ».

**٣٨١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ»[3].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من لە ڕۆژێکدا سەد جار داوای لێخۆش بوون لە خوا دەکەم و تۆبە دەکەم.

**٣٨١٦- عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ سَبْعِينَ مَرَّةً»[4].**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥١٦، والترمذي: ٣٤٣٤.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي بإثر: ٣٢٥٩.

(٤) صحيح.




واتە: سەعیدی کوڕی ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو موسا لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من لە ڕۆژێکدا حەفتا جار داوای لێ خۆشبوون لە خوا دەکەم و تۆبە دەکەم.

**٣٨١٧-** عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ فِي لِسَانِي ذَرَبٌ عَلَى أَهْلِي، وَكَانَ لَا يَعْدُوهُمْ إِلَى غَيْرِهِمْ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «أَيْنَ أَنْتَ مِنَ الِاسْتِغْفَارِ، تَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي الْيَوْمِ سَبْعِينَ مَرَّةً»[١].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: زمانم لەسەر خانەوادەکەم توند بوو (شتی خەراپم پێ دەگوتن) وە جگە لە خانەوادەکەی لەگەڵ کەسیتر وانەبوو، جا ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوەو فەرمووی: داوای لێخۆشبوون و تۆ لەکوێن؟ لە ڕۆژێکدا حەفتا جار داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەی.

**٣٨١٨-** عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ بُسْرٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «طُوبَى لِمَنْ وَجَدَ فِي صَحِيفَتِهِ اسْتِغْفَارًا كَثِيرًا»[٢].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی بوسرِ ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆش بە حاڵی ئەو کەسەی کە پەڕاوی کردەوەکانی داوای لێخۆشبوونی زۆری تێدایە.

**٣٨١٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَزِمَ الِاسْتِغْفَارَ جَعَلَ اللَّهُ لَهُ مِنْ كُلِّ هَمٍّ فَرَجًا، وَمِنْ كُلِّ ضِيقٍ مَخْرَجًا، وَرَزَقَهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ»[٣].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پابەندی داوای لێخۆشبوون بێت، ئەوە خوا لە هەموو غەم و ناڕەحەتییەک ڕزگاری دەکات، وە لە هەموو تەنگانەیەک ڕێگای دەرچوونی بۆ دەکاتەوە، وە ڕزق و ڕۆزی پێدەدات لە شوێنێکەوە کە مرۆڤەکە خۆی پێی نازانێت و حیسابی بۆ نەکردوە.

**٣٨٢٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ الَّذِينَ إِذَا أَحْسَنُوا اسْتَبْشَرُوا، وَإِذَا أَسَاءُوا اسْتَغْفَرُوا»[٤].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٥١٨.

(٤) ضعيف.

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە لەوانە بم کە کاتێک چاکەیەک دەکەن خۆشحاڵ دەبن و کاتێک خەراپەیەک دەکەن داوای لێبووردن دەکەن.

## بابەت: گەورەیی کردەوە

**٣٨٢١- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَأَزِيدُ، وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ مِثْلُهَا أَوْ أَغْفِرُ، وَمَنْ تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْرًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ ذِرَاعًا، وَمَنْ تَقَرَّبَ مِنِّي ذِرَاعًا، تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا، وَمَنْ أَتَانِي يَمْشِي، أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً، وَمَنْ لَقِيَنِي بِقِرَابِ الْأَرْضِ خَطِيئَةً ثُمَّ لَا يُشْرِكُ بِي شَيْئًا، لَقِيتُهُ بِمِثْلِهَا مَغْفِرَةً»**(١).

واتە: ئەبو زەڕ ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرزو بەدەسەڵات دەفەرمووێت: هەر کەسێک چاکەیەک بکات ئەوە بە دە بەرابەر پاداشت دەدرێتەوە، وە بۆشی زیاتر دەکەم، وە هەر کەسێک خەراپەیەک بکات، ئەوە جەزای تاوان بە قەدەر یەک تاوانەکەیە، یان لێی خۆش دەبم، وە هەر کەسێک بستێک لە من نزیک بێتەوە ئەوە من باڵێک لێی نزیک دەبمەوە، وە هەر کەس باڵێک لە من نزیک بێتەوە من دوو باڵ لێی نزیک دەبمەوە، وە هەر کەس بە پێڕۆ بێت بۆلام من خێرا دەڕۆم بەدەمیەوە، وە هەر کەسێک بە نزیکی پڕی زەوی بە تاوانەوە بگەڕێتەوە بۆلام پاشان هیچ هاوبەشێکم بۆ دانەنێ ئەوە من بەو ئەندازەیە بە لێخۆشبوونەوە پێی دەگەم.

**٣٨٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَقُولُ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي، فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ، ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ، ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ، وَإِنِ اقْتَرَبَ إِلَيَّ شِبْرًا، اقْتَرَبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا، وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً»**(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای پاک و بێگەرد دەفەرمووێت: من بە ئەندازەی گومانی بەندەکەم لەگەڵ بەندەکەمم، وە من لەگەڵ ئەودام کاتێک یادم دەکات، جا ئەگەر لە دڵی خۆیدا یادی کردم منیش لەلای خۆم

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٨٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٤٠٥، ومسلم: ٢٦٧٥، والترمذي: ٣٦٠٣.




یادی دەکەم، وە ئەگەر لەلای کۆمەڵێک یادی کردم ئەوە منیش لەلای کۆمەڵێکی باشتر لە هی ئەو یادی دەکەم، وە ئەگەر بستێک لێم نزیک بێتەوە ئەوە باڵێک لێی نزیک دەبمەوە، وە ئەگەر بە ڕۆشتنی ئاسایی بێت بۆلام بە خێرایی دەچم بەدەمیەوە.

**٣٨٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ لَهُ الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ، قَالَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: «إِلَّا الصَّوْمَ فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ»**[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو کردەوەیەکی نەوەی ئادەم بۆی دوو بەرابەر دەکرێت، جا هەر چاکەیەک بە دە بەرابەر تاکو حەوسەد بەرابەر پاداشتی دەدرێتەوە، خوای پاک و بێگەرد فەرموویەتی: تەنها ڕۆژوو نەبێت چونکە ڕۆژوو بۆ منەو هەر خۆشم پاداشتی دەدەمەوە.

## بابەت: ئەوەی دەربارەی "لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ" هاتووە

**٣٨٢٤- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: سَمِعَنِي النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا أَقُولُ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، قَالَ: «يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى كَلِمَةٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ؟»، قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: قُلْ: «لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ»**[٢].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گوێی لێم بووکە ئەمن دەمگوت: «لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ»، واتە: هیچ گۆڕان و گۆڕانکاری و هێزێک بوونی نیە جگە لە هی خوا، فەرمووی: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس ئایا وشەیەکت پێ نەڵێم کە یەکێکە لە گەنجینەکانی بەهەشت؟ گوتم: بەڵێ پێم بڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: بڵێ: «لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ» (واتە: دڵنیای کردەوە).

**٣٨٢٥- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ؟» قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ»**[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٩٤، ومسلم: ١١٥١، والترمذي: ٧٦٤، والنسائي: ٢٢١٤_٢٢١٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢٠٥، ومسلم: ٢٧٠٤، وأبو داود: ١٥٢٦، والترمذي: ٣٣٧٤ و ٣٤٦١.

(٣) صحيح.




واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئایا شارەزاییت نەکەم بۆ گەنجینەیەک لە گەنجینەکانی بەهەشت؟ گوتم: بەڵێ ڕێنماییم بکە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: «لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ».

**٣٨٢٦**-عَنْ حَازِمِ بْنِ حَرْمَلَةَ قَالَ: مَرَرْتُ بِالنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ لِي: «يَا حَازِمُ أَكْثِرْ مِنْ قَوْلِ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، فَإِنَّهَا مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ»[1].

واتە: حازیمی کوڕی حەرمەلە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: بەلای پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕیم، ئەویش پێمی فەرموو: ئەی حازم زۆر ئەو ڕستەیە بڵێوە: «لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ»، چونکە لە گەنجینەکانی بەهەشتە.

* * *

---

(١) صحيح لغيره.

## بابەت: گەورەیی پاڕانەوە

٣٨٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَمْ يَدْعُ اللَّهَ سُبْحَانَهُ، غَضِبَ عَلَيْهِ» قَالَ ابْنُ مَاجَةَ: سَأَلْتُ أَبَا زُرْعَةَ عَنْ أَبِي صَالِحٍ هَذَا، قَالَ: هُوَ الَّذِي يُقَالُ لَهُ الْفَارِسِيُّ، وَهُوَ خُوزِيٌّ، وَلَا أَعْرِفُ اسْمَهُ[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە خوای پاک و بێگەرد نەپاڕێتەوە لێی تووڕە دەبێ. ئیبنو ماجە دەڵێ: پرسیارم لە ئەبو زورعە کرد دەربارەی ئەبو صالیح، گوتی: ئەو کەسەیە کە پێی دەڵێن: فارسی، کە خوزییەو ناوی نازانم.

٣٨٢٨- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الدُّعَاءَ هُوَ الْعِبَادَةُ» ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴿٦٠﴾ ﴾ غافر»[2].

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان پاڕانەوە پەرستشە، پاشان (ئەم ئایەتەی) خوێندەوە: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴿٦٠﴾ ﴾ غافر، واتە: وە پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە.

٣٨٢٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللَّهِ سُبْحَانَهُ مِنَ الدُّعَاءِ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێ لەلای خوای پاک و بێگەرد لە پاڕانەوە بەڕێزتر نیە.

## بابەت: پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ

٣٨٣٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي دُعَائِهِ: «رَبِّ أَعِنِّي وَلَا تُعِنْ عَلَيَّ، وَانْصُرْنِي وَلَا تَنْصُرْ عَلَيَّ، وَامْكُرْ لِي وَلَا تَمْكُرْ عَلَيَّ، وَاهْدِنِي وَيَسِّرِ الْهُدَى لِي، وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ بَغَى عَلَيَّ، رَبِّ اجْعَلْنِي لَكَ شَكَّارًا، لَكَ ذَكَّارًا، لَكَ رَهَّابًا، لَكَ مِطِيعًا، إِلَيْكَ مُخْبِتًا، إِلَيْكَ أَوَّاهًا مُنِيبًا، رَبِّ تَقَبَّلْ

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٣٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٧٩، والترمذي: ٢٩٦٩ و ٣٢٤٧ و ٣٣٧٢.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٣٧٠.

تَوْبَتِي، وَاغْسِلْ حَوْبَتِي، وَأَجِبْ دَعْوَتِي، وَاهْدِ قَلْبِي، وَسَدِّدْ لِسَانِي، وَثَبِّتْ حُجَّتِي، وَاسْلُلْ سَخِيمَةَ قَلْبِي» قَالَ أَبُو الْحَسَنِ الطَّنَافِسِيُّ: قُلْتُ لِوَكِيعٍ: أَقُولُهُ فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ؟ قَالَ: «نَعَمْ»[1].

واته: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە پاڕانەوەکانیدا دەیفەرموو: خوایەگیان یارمەتیم بدە لە دژی نەیارەکانم و یارمەتی ئەوان مەدە لەدژی من، وە سەرم بخە بەسەریانداو ئەوان سەرمەخە بەسەر مندا، وە پلانی ڕێگای سەرکەوتنم بۆ ئاسان بکەو پیلانی نەیارەکانم پوچەڵ بکەوە، وە ڕێنمونیم بکە (بۆ ڕێگای ڕاست) و ڕێگای ڕێنمونیم بۆ ئاسان بکە، وە سەرم بخە بەسەر ئەوانەدا کە زوڵم و ستەمم لێدەکەن، وە وام لێبکە هەمیشە سوپاس گوزارت بم، وە هەمیشە یادت بکەم، وە زۆرت لێ بترسم، وە گوێڕایەڵ و فەرمان بەردارت بم، وە زۆر ملکەچ بم و بۆلای تۆ بگەڕێمەوە، وە وام لێبکە شکایەتی حاڵم هەر لەلای تۆ بکەم، پەروەردگار تەوبەو پەشیمانیم لێوەرگرە، وە تاوانەکانم بسڕەوە، وە پاڕانەوەکانم لێ قبوڵ بکە، وە دڵم ڕێنمایی بکە، وە زمانم ڕاستبێژ بکە، وە بەڵگەکانم بچەسپێنە، وە هەروەها ڕق و کینەی سینەم لابەرەو دڵم ساف و بێگەرد بکە. ئەبولحەسەنی تەنافیسی دەڵێ: بە وەکیعم گوت: ئایا (ئەو دوعایە) لە قونوتی نوێژی ویتردا بخوێنم؟ گوتی: بەڵێ.

٣٨٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: أَتَتْ فَاطِمَةُ النَّبِيَّ ﷺ تَسْأَلُهُ خَادِمًا، فَقَالَ لَهَا: «مَا عِنْدِي مَا أُعْطِيكِ». فَرَجَعَتْ، فَأَتَاهَا بَعْدَ ذَلِكَ فَقَالَ: «الَّذِي سَأَلْتِ أَحَبُّ إِلَيْكِ، أَوْ مَا هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ؟» فَقَالَ لَهَا عَلِيٌّ: قُولِي لَا، بَلْ مَا هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ، فَقَالَتْ: فَقَالَ: «قُولِي: اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، مُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ الْعَظِيمِ، أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْنِنَا مِنَ الْفَقْرِ»[2].

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: فاتیمە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ داوای خزمەتکارێکی لێکرد، پێی فەرموو: ئەوەم لا نیە کە پێتی ببەخشم، ئەویش گەڕایەوە، پاش ئەوە (پێغەمبەرﷺ ) هاتە لای و فەرمووی: ئەوەی کە داوات کرد لات خۆشەویستترە یان شتێ کە لە ئەو باشترە، عەلی پێی گوت: بڵێ: نەخێر، بەڵکو ئەوەی کە لەو باشترە،

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥١٠، والترمذي: ٣٥٥١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧١٣، وأبو داود: ٥٠٥١، والترمذي: ٣٤٠٠ و ٣٤٨١.




ئەویش وایگوت، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بڵێ: خودایە ئەی پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و پەروەردگاری عەرشی گەورەو بەرین، پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری گشت شتێ، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئانی گەورەو مەزن، تۆ یەکەم و سەرەتای هەموو شتێکی و هیچ لەپێش تۆ بوونی نەبووە، وە تۆ کۆتایی هەموو شتێکی و هەر دەمێنی و لەدوای لەناوچوونی هەموو دروستکراوەکان، وە تۆ بەهێزو بەتوانایت و هیچ شتێک لەسەرووی تۆوە نیە، وە تۆ پەنهانی و هیچ شتێکیش لە تۆ پەنهان نیە، سا خودایە قەرزداریمان لەسەر لابەرەو بێنیازمان بکە لە هەژاری.

**٣٨٣٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى، وَالتُّقَى، وَالْعَفَافَ، وَالْغِنَى»[1].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خودایە داوای ڕێنمویی و پارێزگاری و دەست و دەم و داوێن پاکی و بێ نیازیت لێدەکەم.

**٣٨٣٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ انْفَعْنِي بِمَا عَلَّمْتَنِي، وَعَلِّمْنِي مَا يَنْفَعُنِي، وَزِدْنِي عِلْمًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ النَّارِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خودایە سوودم پێ بگەیەنە بەوەی کە فێرت کردووم، وە ئەوەم فێربکە کە سوودی دەبێ بۆم، وە زانست و زانیاریم زیاد بکە، سوپاس بۆ خوا لە هەموو بارودۆخێکدا، وە پەنا دەگرم بە خوا لە سزای ئاگر (دۆزەخ).

**٣٨٣٤-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ: «اللَّهُمَّ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ»، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَخَافُ عَلَيْنَا وَقَدْ آمَنَّا بِكَ، وَصَدَّقْنَاكَ بِمَا جِئْتَ بِهِ، فَقَالَ: «إِنَّ الْقُلُوبَ بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ ﷻ يُقَلِّبُهَا» وَأَشَارَ الْأَعْمَشُ بِإِصْبَعَيْهِ[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٢١، والترمذي: ٣٤٨٩.

(٢) صحيح دون قوله: «الْحَمْدُ لِلَّهِ...إلخ» أخرجه الترمذي: ٣٥٩٩.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢١٤٠.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر جار دەیفەرموو: پەروەردگارا دڵم جێگیرو دامەزراو بکە لەسەر دینەکەت، ئنجا پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا دەترسی هەڵگەڕێینەوەو بێبڕوا بین لەکاتێکدا بڕوامان هێناوە بە تۆو بەوەش کە هێناوتە (لەلایەن خواوە)؟! فەرمووی: بێگومان هەڵگەڕانەوەی دڵەکان بە ویستی خوای ﷻ، (هەر چۆن ویستی لەسەر بێت) هەڵیان دەگێڕێتەوە. ئەعمەش ئاماژەی بە پەنجەکانی کرد.

**٣٨٣٥- عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي، قَالَ: «قُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ»**(١).

واتە: لە ئەبو بەکری صدیقەوە ﷺ دەگێڕنەوە، بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوتووە: پاڕانەوەیەکم فێربکە کە لەناو نوێژەکانمدا پێی بپاڕێمەوە، فەرمووی: بڵێ: خودایە من زوڵم و ستەمی زۆرم لە خۆم کردوە، جگە لە تۆ کەسیش لە گوناە و تاوان خۆش نابێت، لێخۆشبوونی خۆتم پێ ببەخشە لەلایەن خۆتەوە، وە بەزەییت پێمدا بێتەوە، هەر خۆت خاوەنی لێخۆشبوون و بەزەیی و میهرەبانیت.

**٣٨٣٦- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُتَّكِئٌ عَلَى عَصًا، فَلَمَّا رَأَيْنَاهُ قُمْنَا، فَقَالَ: «لَا تَفْعَلُوا كَمَا يَفْعَلُ أَهْلُ فَارِسَ بِعُظَمَائِهَا». قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ دَعَوْتَ اللَّهَ لَنَا قَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا، وَارْضَ عَنَّا، وَتَقَبَّلْ مِنَّا، وَأَدْخِلْنَا الْجَنَّةَ، وَنَجِّنَا مِنَ النَّارِ، وَأَصْلِحْ لَنَا شَأْنَنَا كُلَّهُ»، قَالَ: فَكَأَنَّمَا أَحْبَبْنَا أَنْ يَزِيدَنَا، فَقَالَ: «أَوَلَيْسَ قَدْ جَمَعْتُ لَكُمُ الْأَمْرَ؟»**(٢).

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆلامان وە خۆی دابوو بەسەر گۆچانەکەیدا، جا ئێمەش کە بینیمان لەبەری هەستاین، ئەویش فەرمووی: ئێوەش وەکو خەڵکی فارس ڕەفتار لەگەڵ گەورەکانتان مەکەن، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بۆمان لە خوا پاڕابایتەوە، فەرمووی: ئەی پەروەردگارا لێیان خۆشبەو بەزەییت پێیاندا بێتەوەو لێیان ڕازیبە، وە خێرو چاکەمان لێ قبوڵ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٣٤، ومسلم: ٢٧٠٥، والترمذي: ٣٥٣١، والنسائي: ١٣٠٢.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٥٢٣٠.




بکە، وە بمانبە ناو بەهەشت و بمانپارێزە لە ئاگر، وە هەموو کاروبارەکانمان بۆ باش بکە. گوتی: ئێمەش وەکو ئەوە وابوو کە حەزمان لێبێ زیاتر بۆمان بپاڕێتەوە، ئنجا فەرمووی: ئایا داوای هەموو شتێکم بۆ نەکردن؟!

**٣٨٣٧- عَنْ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْأَرْبَعِ: مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لَا يُسْمَعُ»**[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە گیان پەنا بە تۆ دەگرم لە چوار شت: لە زانستێک کە سوودی نەبێت، وە لە دڵێک کە تەقواو خواپەرستی تێدا نەبێت، وە لەسەر سووربوون و تێر نەبوون لە هەواو ئارەزووەکانی دونیا، وە لە پاڕانەوەیەک کە وەڵام نەدرێتەوە.

## بابەت: ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای بە خوا گرتووە لێی

**٣٨٣٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الدَّعَوَاتِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وَعَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى، وَشَرِّ فِتْنَةِ الْفَقْرِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّ قَلْبِي مِنَ الْخَطَايَا، كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَبَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ، وَالْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ»**[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بەو وشانە دەپاڕایەوە: خودایە پەنات پێدەگرم لە فیتنەی ئاگرو لە سزای ئاگر، وە لە فیتنەی ناوگۆڕو سزای ناوگۆڕ، وە لە فیتنەو ئاشوبی دەوڵەمەندی و هەژاری، وە لە فیتنەو ئاشوبی مەسیحی دەجال، خودایە گیان تاوانەکانم بشۆ بە ئاوو بەفرو تەرزە دڵم پاک بکەوە لە گوناە و تاوان هەروەکو چۆن پۆشاکی سپی لە پیسی پاک دەکەیتەوە، وە لە تاوانەکانم دوورم بخەوە هەروەکو چۆن ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوات لە یەک دوورخستۆتەوە، خودایە من پەنات پێدەگرم لە تەمبەڵی و پیری و گوناهباری و قەرزداری.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٥٤٨، والنسائي: ٥٤٦٧ و ٥٥٣٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣٦٨، ومسلم: ٥٨٩، وأبو داود: ٨٨٠، والترمذي: ٣٤٩٥، والنسائي: ٥٤٦٦ و ٥٤٧٧.

**٣٨٣٩-** عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ: عَنْ دُعَاءٍ كَانَ يَدْعُو بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ»[١].

**واتە:** فەڕوەی کوڕی نەوفەل ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە کرد دەربارەی پاڕانەوەیەک کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەپاڕایەوە، ئەویش گوتی: دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێدەگرم لە شەڕو خراپەی ئەوەی کە کردوومەو لە شەڕو خراپەی ئەوەی نەمکردوە.

**٣٨٤٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا هَذَا الدُّعَاءَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»[٢].

**واتە:** ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پاڕانەوەیەی فێردەکردین وەکو چۆن سوورەتێکی قورئانی فێردەکردین: خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای ئاگری دۆزەخ، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای سەختی گۆڕ، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە بەڵاو فیتنەی دەجالی درۆزن، هەروەها پەنا دەگرم بە تۆ لە بەڵاو فیتنەی ژیان و مردن.

**٣٨٤١-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ مِنْ فِرَاشِهِ، فَالْتَمَسْتُهُ، فَوَقَعَتْ يَدِي عَلَى بَطْنِ قَدَمَيْهِ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ، وَهُمَا مَنْصُوبَتَانِ، وَهُوَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ»[٣].

**واتە:** عائیشە ﷺ دەڵێ: شەوێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە جێگاکەیدا نەماو لێم ونبوو، منیش بۆی گەڕام و دەستم دەکوتا لەوکاتەدا دەستم کەوت بە بەری پێیەکانی کە پێغەمبەر ﷺ لە سوجدەدا بوو، وە پێیەکانی چەقاندبوون، وە دەیفەرموو: خودایە من پەنا بە ڕازی بوونت دەگرم لە توڕەیی و قینت، وە پەنا بە لێبوردنەکانت دەگرم لە سزاکانت، وە پەنا بە تۆ دەگرم بە تۆ لە خۆت، من نازانم سوپاس و ستایشی تۆ بکەم، تۆ بەو جۆرەی کە ستایشی خۆتت کردوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧١٦، وأبو داود: ١٥٥٠، والنسائي: ١٣٠٧ و ٥٥٢٥ و ٥٥٢٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٩٠، وأبو داود: ٩٨٤ و ١٥٤٢، والترمذي: ٣٤٩٤، والنسائي: ٢٠٦٣ و ٥٥١٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٨٦، وأبو داود: ٨٧٩، والترمذي: ٣٤٩٣، والنسائي: ١١٠٠ و ٥٥٣٤.

٣٨٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الْفَقْرِ وَالْقِلَّةِ وَالذِّلَّةِ، وَأَنْ تَظْلِمَ أَوْ تُظْلَمَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەنا بگرن بە خوا لە هەژاری و لە کەمی ژمارەتان و لە ڕیسوایی و سەرشۆڕی، وە لەوەی کە ستەم بکەی یان ستەمت لێبکرێ.

٣٨٤٣- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَلُوا اللَّهَ عِلْمًا نَافِعًا، وَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ»[٢].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: داوای زانستێکی بەسوود لە خوا بکەن، وە پەنا بگرن بە خوا لە زانستێک کە سوودو قازانجی نەبێت.

٣٨٤٤- عَنْ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ: «يَتَعَوَّذُ مِنَ الْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَأَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَفِتْنَةِ الصَّدْرِ» قَالَ وَكِيعٌ: يَعْنِي الرَّجُلَ يَمُوتُ عَلَى فِتْنَةٍ، لَا يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ مِنْهَا[٣].

واتە: عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت بە خوا لە ترسنۆکی و ڕەزیلی و تەمەنی پیری پەککەوتەیی و لە سزای ناوگۆڕو بەڵاو فیتنەی ناو دڵ. وەکیع گوتی: مەبەستی ئەوەیە پیاو لەسەر فیتنەو بەڵایەک بمرێ و داوای لێخۆشبوون لە خوا نەکات لەسەری.

## بابەت: پاڕانەوە گشت گیرەکان

٣٨٤٥- عَنْ أَبُو مَالِكٍ سَعْدُ بْنُ طَارِقٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ وَقَدْ أَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ أَقُولُ حِينَ أَسْأَلُ رَبِّي؟ قَالَ: «قُلْ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي، وَعَافِنِي وَارْزُقْنِي - وَجَمَعَ أَصَابِعَهُ الْأَرْبَعَ إِلَّا الْإِبْهَامَ - فَإِنَّ هَؤُلَاءِ يَجْمَعْنَ لَكَ دِينَكَ وَدُنْيَاكَ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٤٤، والنسائي: ٥٤٦١ و ٥٤٦٣ و ٥٤٦٤.

(٢) حسن.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٥٣٩، والنسائي: ٥٤٤٣ و ٥٤٨٠_٥٤٨٢.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٩٧.

واتە: ئەبو مالیک سەعدی کوڕی تاریق لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە کە لەوکاتەدا پیاوێک هاتۆتە خزمەتی و گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک داوا لە پەروەردگارم دەکەم چی بڵێم؟ فەرمووی: بڵێ: خودایە لێم خۆشبەو بەزەییت پێمدا بێتەوەو لاشەیەکی تەندروست و سەلامەتم پێ ببەخشەو ڕزق و ڕۆزیم بدە، وە بە پەنجەکانی دەستی بۆی ژماردن، پەنجەکانی نوقاندن جگە لە پەنجە گەورەی، (وە فەرمووی:) بەڕاستی ئەوانە خێری دین و دونیات بۆ دەستەبەر دەکەن.

**٣٨٤٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَّمَهَا هَذَا الدُّعَاءَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنَ الْخَيْرِ كُلِّهِ عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَاذَ بِهِ عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَسْأَلُكَ أَنْ تَجْعَلَ كُلَّ قَضَاءٍ قَضَيْتَهُ لِي خَيْرًا»**[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پاڕانەوەیەی فێرکردوە: خودایە داوای هەموو خێرێکی دونیاو قیامەتت لێدەکەم لەوەی کە دەیزانم و ئەوەشی کە نایزانم، وە پەنا بە تۆ دەگرم لە هەموو شەڕو خراپەی دونیاو قیامەت لەوەی کە دەیزانم و ئەوەشی کە نایزانم، خودایە من داوای ئەو خێرو چاکەیەت لێدەکەم کە بەندەکەت و پێغەمبەرەکەت ﷺ داوای لێکردووی، وە پەنا بە تۆ دەگرم لەو شەڕو خراپەیەی کە بەندەکەت و پێغەمبەرەکەت ﷺ پەنای بە تۆ گرتووە لێی، خودایە من داوای بەهەشتت لێدەکەم وە ئەوەشی کە لە بەهەشت نزیکم دەکاتەوە لە قسەو کردار، وە پەنات پێ دەگرم لە ئاگر وە ئەوەشی کە لە ئاگر نزیکم دەکاتەوە لە قسەو کردار، وە داوات لێدەکەم کە هەر قەزاو قەدەرێک کە بۆمنت داناوە بۆم بە خێر بگێڕی.

**٣٨٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِرَجُلٍ: «مَا تَقُولُ فِي الصَّلَاةِ؟» قَالَ: أَتَشَهَّدُ ثُمَّ أَسْأَلُ اللَّهَ الْجَنَّةَ، وَأَعُوذُ بِهِ مِنَ النَّارِ، أَمَا وَاللَّهِ، مَا أُحْسِنُ دَنْدَنَتَكَ، وَلَا دَنْدَنَةَ مُعَاذٍ قَالَ: «حَوْلَهَا نُدَنْدِنُ»**[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٧٩٢ عن بعض أصحاب النبي ﷺ.




واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: لە نوێژدا چی دەڵێیت؟ گوتی: شایەتمان (تەحیات) دەخوێنم، پاشان داوای بەهەشت لە خوا دەکەم و پەنای پێ دەگرم لە ئاگر، بەڵام سوێند بە خوا ئەو دەنگە دەنگە کزەی تۆو مەعاز تێناگەم، فەرمووی: ئێمەش لەدەوری بەهەشت (دەربارەی بەهەشت) دەنگە دەنگ دەکەین.

**دندنة:** واتە: قسەکردن بە دەنگی نزم.

## بابەت: پاڕانەوەی لێخۆشبوون و لەش ساغی

**٣٨٤٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الدُّعَاءِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «سَلْ رَبَّكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ». ثُمَّ أَتَاهُ فِي الْيَوْمِ الثَّانِي فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الدُّعَاءِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «سَلْ رَبَّكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ». ثُمَّ أَتَاهُ فِي الْيَوْمِ الثَّالِثِ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَيُّ الدُّعَاءِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «سَلْ رَبَّكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، فَإِذَا أُعْطِيتَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، فَقَدْ أَفْلَحْتَ»[1].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام پاڕانەوەیە زۆر گەورەیە؟ فەرمووی: داوای لێخۆشبوون و ڕزگاربوون لە دونیاو دواڕۆژدا لە پەروەردگارت بکە، پاشان ڕۆژی دووەم هاتەوە خزمەتی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام پاڕانەوەیە زۆر گەورەیە؟ فەرمووی: داوای لێخۆشبوون و ڕزگاربوون لە دونیاو دواڕۆژدا لە پەروەردگارت بکە، پاشان ڕۆژی سێیەم هاتەوە خزمەتی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام پاڕانەوەیە زۆر گەورەیە؟ فەرمووی: داوای لێخۆشبوون و ڕزگاربوون لە دونیاو دواڕۆژدا لە پەروەردگارت بکە، جا ئەگەر خوا لە دونیاو دواڕۆژدا لێت خۆشبێ و ڕزگاربوونت پێ ببەخشێ ئەوە بێگومان سەرفرازو سەرکەوتوو دەبیت.

---

(١) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٣٥١٢.

٣٨٤٩- عَنْ أَوْسَطَ بْنِ إِسْمَاعِيلَ الْبَجَلِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا بَكْرٍ، حِينَ قُبِضَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَقَامِي هَذَا عَامَ الْأَوَّلِ، ثُمَّ بَكَى أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ قَالَ: «عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ، فَإِنَّهُ مَعَ الْبِرِّ وَهُمَا فِي الْجَنَّةِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإِنَّهُ مَعَ الْفُجُورِ وَهُمَا فِي النَّارِ، وَسَلُوا اللَّهَ الْمُعَافَاةَ، فَإِنَّهُ لَمْ يُؤْتَ أَحَدٌ بَعْدَ الْيَقِينِ خَيْرًا مِنَ الْمُعَافَاةِ، وَلَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَقَاطَعُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا»[1].

واتە: ئەوسەتی کوڕی ئیسماعیلی بەجەلیی ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە ئەبو بەکر بوو کاتێ پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەساڵی یەکەمی کۆچی لەو شوێنەی من بەپێوە وەستا، پاشان ئەبو بەکر گریا، دواتر (ئەبو بەکر گوتی: پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: پابەندی ڕاستگۆیی بن چونکە بەڕاستی لەگەڵ چاکەکاریدایەو هەردووکیان لە بەهەشتدان، وە خۆتان بەدوور بگرن لە درۆ چونکە بەڕاستی لەگەڵ خراپەکاریدایە وە هەردووکیان لە ئاگردان، وە داوای لەش ساغی و بێوەیی لە خودا بکەن، چونکە بێگومان هیچ کەسێ لەدوای بڕوا شتێکی پێ نەبەخشراوە کە خێرترو چاکتر بێ لە لەش ساغی، وە بەرانبەر یەکتری چاوچنۆک مەبن و ڕق و قینەتان نەبێ بەرابەر یەکتری و سیلەی خزمایەتی مەپچڕێنن و پشت لە یەکتری مەکەن، وە هەمووتان بەندەی خوا بن و برای یەکتری بن.

٣٨٥٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ وَافَقْتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ مَا أَدْعُو؟ قَالَ: «تَقُولِينَ: اللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر وا ڕێککەوت زانیم کە شەوەکە شەوی «لیلة القدر»ـە ئایا چ دوعایەک بکەم؟ فەرمووی: بڵێ: خودایە تۆ بەخشەری و بەخشینت پێ خۆشە، سا خودایە لێم خۆشبە.

٣٨٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ دَعْوَةٍ يَدْعُو بِهَا الْعَبْدُ أَفْضَلَ مِنْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْمُعَافَاةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٥٥٨ مختصراً.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٥١٣.

(٣) صحيح لغيره.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ دوعایەک نیە کە بەندە پێی دەپاڕێتەوە لەو دوعایە چاکترو گەورەتر بێت: خودایە من داوای لەش ساغی و بێوەیی هەردوو دونیات لێدەکەم.

## بابەت: ئەوەی ئەگەر یەکێکتان دوعای کرد با سەرەتا دوعا بۆ خۆی بکات

٣٨٥٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَرْحَمُنَا اللَّهُ وَأَخَا عَادٍ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە گیان بەزەییت بە ئێمەو بە برای عاد (پێغەمبەر هود)دا بێتەوە.

## بابەت: ئەوەی کە ئەگەر پەلەپەل نەکرێت وەڵامی پاڕانەوە دەدرێتەوە

٣٨٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ» قِيلَ: وَكَيْفَ يَعْجَلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «يَقُولُ: قَدْ دَعَوْتُ اللَّهَ فَلَمْ يَسْتَجِبِ اللَّهُ لِي»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نزاو پاڕانەوەی (هەر) یەکێکتان وەڵام دەدرێتەوە بە مەرجێ پەلەپەل نەکات، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن پەلەپەل دەکات؟ فەرمووی: بەوەی کە دەڵێ: من لە خودا پاڕامەوە، بەڵام وەڵامی نەدامەوە.

## بابەت: ئەوەی کە پیاو نابێ بڵێ: خوایە ئەگەر پێت خۆشە لێم خۆشبە

٣٨٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي إِنْ شِئْتَ، وَلْيَعْزِمْ فِي الْمَسْأَلَةِ، فَإِنَّ اللَّهَ لَا مُكْرِهَ لَهُ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣٤٠، ومسلم: ٢٧٣٥، وأبو داود: ١٤٨٤، والترمذي: ٣٣٨٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣٣٩، ومسلم: ٢٦٧٩، وأبو داود: ١٤٨٣، والترمذي: ٣٤٩٧.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با کەس لە ئێوە نەڵێ: خودایە ئەگەر پێت خۆشە لێم خۆشبە، بەڵکو با بە بڕوا بە خۆ بوون و سور بوونەوە بپاڕێتەوە، چونکە کەس زۆری لەسەر خوا نیە.

## بابەت: ناوە شکۆمەندترین و بەرزترین و بەڕێزترینەکانی خودا

**٣٨٥٥- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْمُ اللَّهِ الْأَعْظَمُ فِي هَاتَيْنِ الْآيَتَيْنِ: ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾ ﴾ البقرة، وَفَاتِحَةِ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ»[1].**

واتە: ئەسمائی کچی یەزید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ناوە شکۆمەندو گەورەکەی خوا لەم دوو ئایەتەدایە: ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾ ﴾ البقرة، واتە: پەرستراوی ئێوە پەرستراوێکی تاک و تەنهایە هیچ پەرستراوێکی بە هەق و ڕاست نیە بە تەنها ئەو نەبێت کە بەخشندەو میهرەبانە، وە سەرەتای سووڕەتی آل عمران.

**٣٨٥٦- عَنِ الْقَاسِمِ قَالَ: «اسْمُ اللَّهِ الْأَعْظَمُ الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ فِي سُوَرٍ ثَلَاثٍ: الْبَقَرَةِ، وَآلِ عِمْرَانَ، وَطه»[2].**

واتە: قاسیم ﷺ دەڵێ: ناوی شکۆمەندو گەورەی خودا کە هەرکات بەندە پێی بپاڕێتەوە وەڵامی دەداتەوە لەم سێ سووڕەتەدایە: «البقرة» و «آل عمران» و»طه».

**٣٨٥٦م- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الدِّمَشْقِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ أَبِي سَلَمَةَ، قَالَ: ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعِيسَى بْنِ مُوسَى، فَحَدَّثَنِي أَنَّهُ سَمِعَ غَيْلَانَ بْنَ أَنَسٍ، يُحَدِّثُ عَنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[3].**

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٤٩٦، والترمذي: ٣٤٧٦.

(٢) حسن.

(٣) حسن.




٣٨٥٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنَّكَ أَنْتَ اللَّهُ الْأَحَدُ الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقَدْ سَأَلَ اللَّهَ بِاسْمِهِ الْأَعْظَمِ، الَّذِي إِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى، وَإِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گوێی لە پیاوێک بوو دەیگوت: خودایە من داوات لێدەکەم بەوەی کە تۆ تاک و تەنیای و جێی نیازی، ئەو خوایەی کە نە کەسی لێ بووەو نە لە کەسیش بووە، کەس هاووێنەو هاوتای نیە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی بە ناوە شکۆمەندو گەورەکەی خوا پاڕایەوە کە هەر کەس بەو ناوە داوای لێ بکات وەڵامی دەداتەوە، وە هەر کەسێ پێی بپاڕێتەوە نائومێدی ناکات و پاڕانەوەکەی گیرا دەکات.

٣٨٥٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنَّ لَكَ الْحَمْدَ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، وَحْدَكَ لَا شَرِيكَ لَكَ، الْمَنَّانُ، بَدِيعُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ، فَقَالَ: «لَقَدْ سَأَلَ اللَّهَ بِاسْمِهِ الْأَعْظَمِ، الَّذِي إِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى، وَإِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێک بوو دەیگوت: خودایە داوات لێدەکەم بەوەی کە هەرچی سوپاس و ستایشە شایستەی تۆیە، هیچ پەرستراوێکی بە هەق و ڕاستی نیە جگە لە تۆ، تاک و تەنیای و هیچ هاوەڵ و هاوبەشێکت نیە، بەخشندەو خاوەن چاکەی، دروستکەری ئاسمانەکان و زەویت، ئەی گەورەی خاوەن شکۆی خاوەن ڕێز. ئەویش فەرمووی: بەڕاستی بە ناوە شکۆمەندو گەورەکەی خودا پاڕایەوە کە هەرکەس بەو ناوە داوای لێبکات ئەیداتێ، وە هەرکەسێ پێی بپاڕێتەوە نائومێدی ناکات و پاڕانەوەکەی گیرا دەکات.

٣٨٥٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِاسْمِكَ الطَّاهِرِ الطَّيِّبِ الْمُبَارَكِ الْأَحَبِّ إِلَيْكَ، الَّذِي إِذَا دُعِيتَ بِهِ أَجَبْتَ، وَإِذَا سُئِلْتَ بِهِ أَعْطَيْتَ، وَإِذَا اسْتُرْحِمْتَ بِهِ رَحِمْتَ، وَإِذَا اسْتُفْرِجْتَ بِهِ فَرَّجْتَ» قَالَتْ: وَقَالَ ذَاتَ يَوْمٍ: «يَا عَائِشَةُ هَلْ عَلِمْتِ أَنَّ اللَّهَ قَدْ دَلَّنِي عَلَى الِاسْمِ الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ؟» قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٩٣ و ١٤٩٤، والترمذي: ٣٤٧٥.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٩٥، والترمذي: ٣٥٤٤، والنسائي: ١٣٠٠.

فَعَلِّمْنِيهِ، قَالَ: «إِنَّهُ لَا يَنْبَغِي لَكِ يَا عَائِشَةُ»، قَالَتْ: فَتَنَحَّيْتُ وَجَلَسْتُ سَاعَةً، ثُمَّ قُمْتُ فَقَبَّلْتُ رَأْسَهُ، ثُمَّ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلِّمْنِيهِ، قَالَ: «إِنَّهُ لَا يَنْبَغِي لَكِ يَا عَائِشَةُ أَنْ أُعَلِّمَكِ، إِنَّهُ لَا يَنْبَغِي لَكِ أَنْ تَسْأَلِي بِهِ شَيْئًا مِنَ الدُّنْيَا»، قَالَتْ: فَقُمْتُ فَتَوَضَّأْتُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَدْعُوكَ اللَّهَ، وَأَدْعُوكَ الرَّحْمَنَ، وَأَدْعُوكَ الْبَرَّ الرَّحِيمَ، وَأَدْعُوكَ بِأَسْمَائِكَ الْحُسْنَى كُلِّهَا، مَا عَلِمْتُ مِنْهَا، وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، أَنْ تَغْفِرَ لِي وَتَرْحَمَنِي، قَالَتْ: فَاسْتَضْحَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّهُ لَفِي الْأَسْمَاءِ الَّتِي دَعَوْتِ بِهَا»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خودایە بە ناوە پاک و بێگەردو جوان و پیرۆزەکەت کە لەلات خۆشەویستترینە داوات لێدەکەم، ئەو ناوەی کە هەرکات بەو ناوە داوات لێ بکرێ وەڵام دەدەیتەوە، وە ئەگەر بەو ناوە داوات لێ بکرێ ئەبەخشی، وە ئەگەر بەو ناوە داوای سۆزو بەزەییت لێکرا سۆزو بەزەیی ئەنوێنی، وە ئەگەر بەو ناوە داوای ڕزگارکردن و دەربازکردنت لێکرا ئەوە دەربازی دەکەیت. (عائیشە) گوتی: ڕۆژێکیان فەرمووی: ئەی عائیشە ئایا زانیوتە کە خودا ڕێنمونی کردم بۆ ئەو ناوەی کە هەرکات بەو ناوە داوای لێکرا وەڵام دەداتەوە، گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دایک و باوکمەوە بەفیدات بم کەواتە فێری ئەو ناوەم بکە، فەرمووی: بۆ تۆ پێویست ناکات ئەی عائیشە، گوتی: منیش گۆشەگیر بووم و ساتێک دانیشتم، پاشان هەستام سەریم ماچ کردو دواتر گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فێری ئەو ناوەم بکە، فەرمووی: بێگومان ئەوە بۆ تۆ پێویست نیە کە فێرت بکەم ئەی عائیشە، بەڕاستی پێویست ناکات بەو ناوە داوای هیچ شتێکی دونیایی بکەی، گوتی: منیش هەستام و دەستنوێژم گرت، پاشان دوو ڕکات نوێژم کرد، پاشان گوتم: خودایە من بە ناوەکانی «الله»و «الرحمن»و «البر»و «الرحيم»و هەموو ناوە جوانەکانت لەوانەی کە دەیانزانم و ئەوەشی کە نایزانم داوات لێ دەکەم کە لێم خۆشبی و بەزەییت پێمدا بێتەوە، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پێکەنی و پاشان فەرمووی: بێگومان لەناو ئەو ناوانە دایە کە تۆ دوعات پێکردن.

---

(١) ضعيف.

## بابەت: ناوەکانی خوای ﷻ

٣٨٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا، مِائَةً إِلَّا وَاحِدًا، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا نەوەدو نۆ ناوی هەیە، هەرکەس بیانزمێرێ و لێیان تێبگات دەچێتە بەهەشتەوە.

٣٨٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا، مِائَةً إِلَّا وَاحِدًا، إِنَّهُ وِتْرٌ، يُحِبُّ الْوِتْرَ، مَنْ حَفِظَهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ وَهِيَ: اللَّهُ، الْوَاحِدُ، الصَّمَدُ، الْأَوَّلُ، الْآخِرُ، الظَّاهِرُ، الْبَاطِنُ، الْخَالِقُ، الْبَارِئُ، الْمُصَوِّرُ، الْمَلِكُ، الْحَقُّ، السَّلَامُ، الْمُؤْمِنُ، الْمُهَيْمِنُ، الْعَزِيزُ، الْجَبَّارُ، الْمُتَكَبِّرُ، الرَّحْمَنُ، الرَّحِيمُ، اللَّطِيفُ، الْخَبِيرُ، السَّمِيعُ، الْبَصِيرُ، الْعَلِيمُ، الْعَظِيمُ، الْبَارُّ، الْمُتْعَالِ، الْجَلِيلُ، الْجَمِيلُ، الْحَيُّ، الْقَيُّومُ، الْقَادِرُ، الْقَاهِرُ، الْعَلِيُّ، الْحَكِيمُ، الْقَرِيبُ، الْمُجِيبُ، الْغَنِيُّ، الْوَهَّابُ، الْوَدُودُ، الشَّكُورُ، الْمَاجِدُ، الْوَاجِدُ، الْوَالِي، الرَّاشِدُ، الْعَفُوُّ، الْغَفُورُ، الْحَلِيمُ، الْكَرِيمُ، التَّوَّابُ، الرَّبُّ، الْمَجِيدُ، الْوَلِيُّ، الشَّهِيدُ، الْمُبِينُ، الْبُرْهَانُ، الرَّءُوفُ، الرَّحِيمُ، الْمُبْدِئُ، الْمُعِيدُ، الْبَاعِثُ، الْوَارِثُ، الْقَوِيُّ، الشَّدِيدُ، الضَّارُّ، النَّافِعُ، الْبَاقِي، الْوَاقِي، الْخَافِضُ، الرَّافِعُ، الْقَابِضُ، الْبَاسِطُ، الْمُعِزُّ، الْمُذِلُّ، الْمُقْسِطُ، الرَّزَّاقُ، ذُو الْقُوَّةِ، الْمَتِينُ، الْقَائِمُ، الدَّائِمُ، الْحَافِظُ، الْوَكِيلُ، الْفَاطِرُ، السَّامِعُ، الْمُعْطِي، الْمُحْيِي، الْمُمِيتُ، الْمَانِعُ، الْجَامِعُ، الْهَادِي، الْكَافِي، الْأَبَدُ، الْعَالِمُ، الصَّادِقُ، النُّورُ، الْمُنِيرُ، التَّامُّ، الْقَدِيمُ، الْوِتْرُ، الْأَحَدُ، الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ، وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ» قَالَ زُهَيْرٌ: فَبَلَغَنَا مِنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، أَنَّ أَوَّلَهَا يُفْتَحُ بِقَوْلِ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا نەوەدو نۆ ناوی هەیە، بەڕاستی خوا تاکەو تاکی خۆش دەوێ، هەرکەس لەبەریان بکات دەچێتە بەهەشتەوە، کە بریتین لە: «اللَّهُ، الْوَاحِدُ، الصَّمَدُ، الْأَوَّلُ، الْآخِرُ، الظَّاهِرُ، الْبَاطِنُ، الْخَالِقُ، الْبَارِئُ، الْمُصَوِّرُ، الْمَلِكُ، الْحَقُّ، السَّلَامُ، الْمُؤْمِنُ، الْمُهَيْمِنُ، الْعَزِيزُ، الْجَبَّارُ، الْمُتَكَبِّرُ، الرَّحْمَنُ، الرَّحِيمُ، اللَّطِيفُ، الْخَبِيرُ، السَّمِيعُ، الْبَصِيرُ، الْعَلِيمُ، الْعَظِيمُ، الْبَارُّ، الْمُتْعَالِ، الْجَلِيلُ،

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٣٦، ومسلم: ٢٦٧٧، والترمذي: ٣٥٠٦ و ٣٥٠٨.

(٢) ضعيف بسرد الأسماء.

الْجَمِيلُ، الْحَيُّ، الْقَيُّومُ، الْقَادِرُ، الْقَاهِرُ، الْعَلِيُّ، الْحَكِيمُ، الْقَرِيبُ، الْمُجِيبُ، الْغَنِيُّ، الْوَهَّابُ، الْوَدُودُ، الشَّكُورُ، الْمَاجِدُ، الْوَاجِدُ، الْوَالِي، الرَّاشِدُ، الْعَفُوُّ، الْغَفُورُ، الْحَلِيمُ، الْكَرِيمُ، التَّوَّابُ، الرَّبُّ، الْمَجِيدُ، الْوَلِيُّ، الشَّهِيدُ، الْمُبِينُ، الْبُرْهَانُ، الرَّءُوفُ، الرَّحِيمُ، الْمُبْدِئُ، الْمُعِيدُ، الْبَاعِثُ، الْوَارِثُ، الْقَوِيُّ، الشَّدِيدُ، الضَّارُّ، النَّافِعُ، الْبَاقِي، الْوَاقِي، الْخَافِضُ، الرَّافِعُ، الْقَابِضُ، الْبَاسِطُ، الْمُعِزُّ، الْمُذِلُّ، الْمُقْسِطُ، الرَّزَّاقُ، ذُو الْقُوَّةِ، الْمَتِينُ، الْقَائِمُ، الدَّائِمُ، الْحَافِظُ، الْوَكِيلُ، الْفَاطِرُ، السَّامِعُ، الْمُعْطِي، الْمُحْيِي، الْمُمِيتُ، الْمَانِعُ، الْجَامِعُ، الْهَادِي، الْكَافِي، الْأَبَدُ، الْعَالِمُ، الصَّادِقُ، النُّورُ، الْمُنِيرُ، التَّامُّ، الْقَدِيمُ، الْوِتْرُ، الْأَحَدُ، الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ، وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ»، زوهەیر گوتی: لە زیاتر لە کەسێک لەوانەی کە ئەهلی زانست و زانیارین پێیان گەیشتووە کە سەرەتاکەی بەو وتەیە دەست پێدەکات: هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە زاتی الله، تاک و تەنیایەو هیچ هاوەڵ و هاوبەشێکی نیە، هەموو دەسەڵاتداری و خاوەنداری هەر بۆ ئەوە، هەموو سوپاس و ستایشێک شایستەی ئەوە، هەرچی خێرو چاکەیە بە دەستی ئەوە، وە دەسەڵاتدارو بە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا، هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە زاتی الله، وە چەندین ناوی جوان و پیرۆزی هەیە کە لە ئەوپەڕی بەرزی و پیرۆزی دان.

## بابەت: پاڕانەوەی باوک و پاڕانەوەی ستەملێکراو

**٣٨٦٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثُ دَعَوَاتٍ يُسْتَجَابُ لَهُنَّ، لَا شَكَّ فِيهِنَّ: دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ، وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ، وَدَعْوَةُ الْوَالِدِ لِوَلَدِهِ»**(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ پاڕانەوە هەن کە هیچ گومانێکی تێدا نیە وەردەگیرێن و قبوڵ دەبن: پاڕانەوەی ستەم لێکراو، وە پاڕانەوەی ڕێبوار، وە پاڕانەوەی باوک بۆ منداڵەکانیان.

**٣٨٦٣- عَنْ أُمِّ حَكِيمٍ بِنْتِ وَدَّاعٍ الْخُزَاعِيَّةِ ﷺ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «دُعَاءُ الْوَالِدِ يُفْضِي إِلَى الْحِجَابِ»**(٢).

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٥٣٦، والترمذي: ١٩٠٥ و ٣٤٤٨.

(٢) ضعيف.

واتە: ئوممو حەکیمی کچی وەداعی خوزاعییە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پاڕانەوەی باوک بەرزدەکرێتەوە تاکو شوێنی وەڵامدانەوە.

## بابەت: ناپەسەندی تێپەڕاندن لە پاڕانەوەدا

**٣٨٦٤- عَنْ أَبِي نَعَامَةَ ﷺ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مُغَفَّلٍ، سَمِعَ ابْنَهُ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْقَصْرَ الْأَبْيَضَ عَنْ يَمِينِ الْجَنَّةِ، إِذَا دَخَلْتُهَا، فَقَالَ: أَيْ بُنَيَّ سَلِ اللَّهَ الْجَنَّةَ، وَعُذْ بِهِ مِنَ النَّارِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «سَيَكُونُ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الدُّعَاءِ»**[1].

واتە: ئەبو نەعامە ﷺ دەگێڕێتەوە، عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل گوێی لە کوڕەکەی بوو دەیگوت: خوایە گیان داوات لێدەکەم ئەگەر چوومە ناو بەهەشت ئەو کۆشکە سپیەی لای ڕاستی بەهەشتم (پێبدەی)، ئەویش گوتی: ئەی ڕۆڵەکەم داوای بەهەشت لە خوا بکەو پەنای پێبگرە لە ئاگر، چونکە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لێرە بە دواوە خەڵکانێک پەیدا دەبن کە لە پاڕانەوەدا سنور دەبەزێنن.

## بابەت: بەرزکردنەوەی دەستەکان لە پاڕانەوەدا

**٣٨٦٥- عَنْ سَلْمَانَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ رَبَّكُمْ حَيِيٌّ كَرِيمٌ، يَسْتَحْيِي مِنْ عَبْدِهِ أَنْ يَرْفَعَ إِلَيْهِ يَدَيْهِ، فَيَرُدَّهُمَا صِفْرًا، - أَوْ قَالَ: خَائِبَتَيْنِ -»**[2].

واتە: سەلمان ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەرە ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگاری بەرزو شکۆمەندتان زۆر بە حەیاو بەڕێزەوە نازو نیعمەت بەخشە بە بەندەکانی، حەیا دەکا ئەگەر بەندەیەکی دەستەکانی بۆ بەرز بکاتەوە بە خاڵی یان فەرمووی: بە بەتاڵی بیانگێڕێتەوە.

**٣٨٦٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَعَوْتَ اللَّهَ فَادْعُ بِبُطُونِ كَفَّيْكَ، وَلَا تَدْعُ بِظُهُورِهِمَا، فَإِذَا فَرَغْتَ فَامْسَحْ بِهِمَا وَجْهَكَ»**[3].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٩٦.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ١٤٨٨، والترمذي: ٣٥٥٦.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٤٨٥.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لە خودا پاڕایتەوە ئەوە بەرە دەستەکانت بەرزبکەوەو بپاڕێوە، بە پشتە دەستەکانت مەپاڕێوە، جا کاتێ لە پاڕانەوەکەت تەواو بوویت دەستەکانت بە ڕوخسارتدا بهێنە.

## بابەت: زیکری بەیانیان و ئێواران

٣٨٦٧- عَنْ أَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، كَانَ لَهُ عَدْلَ رَقَبَةٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَحُطَّ عَنْهُ عَشْرُ خَطِيئَاتٍ، وَرُفِعَ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ، وَكَانَ فِي حِرْزٍ مِنَ الشَّيْطَانِ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِذَا أَمْسَى فَمِثْلُ ذَلِكَ حَتَّى يُصْبِحَ» قَالَ: فَرَأَى رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِيمَا يَرَى النَّائِمُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا عَيَّاشٍ يَرْوِي عَنْكَ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: «صَدَقَ أَبُو عَيَّاشٍ»(١).

واتە: ئەبو عەییاشی زورەقیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ بەیانیان بڵێ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ»، واتە: هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە زاتی الله، تاکی بێ هاوبەشە، موڵک و ستایش هەر بۆ ئەوەو شایستەی ئەوە، بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، وەک ئەوە وایە کۆیلەیەکی لە نەوەی ئیسماعیل ڕزگار کردبێ، دە خراپەی لەسەر دەسڕدرێتەوەو دە پلە بەرز دەکرێتەوە، لە شەیتان دەپارێزرێت تاکو ئێوارە، ئەگەر ئێوارەش بیڵێ هەر وەک ئەوەی هەیە تاکو بەیانی. (ڕاوی) دەڵێ: جا پیاوێک پێغەمبەری ﷺ لە خەودا بینی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو عەیاش ئاواو ئاوا لە تۆوە دەگێڕێتەوە، ئەویش فەرمووی: ئەبو عەیاش ڕاستی گوتووە.

٣٨٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَصْبَحْتُمْ فَقُولُوا: اللَّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا، وَبِكَ أَمْسَيْنَا، وَبِكَ نَحْيَا، وَبِكَ نَمُوتُ، وَإِذَا أَمْسَيْتُمْ فَقُولُوا: اللَّهُمَّ بِكَ أَمْسَيْنَا، وَبِكَ أَصْبَحْنَا، وَبِكَ نَحْيَا، وَبِكَ نَمُوتُ، وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ»(٢).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٠٧٧.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٠٦٨، والترمذي: ٣٣٩١.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بەیانیتان کردەوە بڵێن: «اللَّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا، وَبِكَ أَمْسَيْنَا، وَبِكَ نَحْيَا، وَبِكَ نَمُوتُ»، واتە: خودایە بە بەخشش و نیعمەتی تۆوە بەیانی و ئێوارەمان بەسەردا هات و بە بەخشش و نیعمەتی تۆوە دەژین و دەمرین، وە هەرکات ئێوارەتان کردەوە بڵێن: «اللَّهُمَّ بِكَ أَمْسَيْنَا، وَبِكَ أَصْبَحْنَا، وَبِكَ نَحْيَا، وَبِكَ نَمُوتُ، وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ»، واتە: خودایە بە بەخشش و نیعمەتی تۆوە ئێوارەو بەیانیمان بەسەردا هات و بە بەخشش و نیعمەتی تۆوە دەژین و دەمرین، گەڕانەوەش هەر بۆلای تۆیە.

**٣٨٦٩-** عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ عَبْدٍ يَقُولُ فِي صَبَاحِ كُلِّ يَوْمٍ، وَمَسَاءِ كُلِّ لَيْلَةٍ: بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ، وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَيَضُرَّهُ شَيْءٌ» قَالَ: وَكَانَ أَبَانُ قَدْ أَصَابَهُ طَرَفٌ مِنَ الْفَالِجِ، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ لَهُ أَبَانُ: «مَا تَنْظُرُ إِلَيَّ؟ أَمَا إِنَّ الْحَدِيثَ كَمَا قَدْ حَدَّثْتُكَ، وَلَكِنِّي لَمْ أَقُلْهُ يَوْمَئِذٍ، لِيُمْضِيَ اللَّهُ عَلَيَّ قَدَرَهُ»[1].

واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک سەر لە بەیانیان و سەر لە ئێوارانی هەموو ڕۆژو شەوێ سێ جار بڵێ: «بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ، وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ»، واتە: بە ناوی ئەو خوایەی کە لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێ زەرەرو زیان ناگەیەنێ نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا، ئەو خودایەی کە بیسەرو بینایە. ئەوە بێگومان هیچ شتێ زیانی پێ ناگەیەنێ. (ڕاوی) گوتی: ئەبان (کوڕی پێشەوا عوسمان) ئیفلیج بوو لایەکی جەستەی شەلەل لێیدا، جا ئەو پیاوە (کە فەرموودەکەی لێ بیستبوو) سەیری دەکرد (وەک ئەوەی بڵێ: خۆ تۆ ئەو ویردەت خوێندووە، ئەی بۆچی ئیفلیج بووی؟!!)، ئەبان پێی گوت: ئەوە بۆچی بەو شێوەیە سەیرم دەکەی، سوێند بە خوا ئەو فەرموودەیە هەر وەکو ئەوەیە کە بۆم گێڕاویەوە، بەڵام ئەو ڕۆژەی کە توشی ئەو نەخۆشییە بووم نەمگوتبوو، تا ئەو قەدەرەی کە خوا بۆمی دانابوو بەسەرم بێت.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٥٠٨٨ و ٥٠٨٩ بنحوه، والترمذي: ٣٣٨٨.

**٣٨٧٠- عَنْ أَبِي سَلَّامٍ ﷺ، خَادِمِ النَّبِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ أَوْ إِنْسَانٍ أَوْ عَبْدٍ يَقُولُ حِينَ يُمْسِي وَحِينَ يُصْبِحُ: رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، إِلَّا كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يُرْضِيَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»**[١].

واته: ئەبو سەلامی ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەر دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر مسوڵمانێک یان مرۆڤێک یان بەندەیەک ئێواران و بەیانیان بڵێ: «رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا»، واتە: ڕازیم بەوەی الله پەروەردگارم بێ و ئیسلام دینم بێ و موحەممەد ﷺ پێغەمبەرم بێ، ئەوە بێگومان هەقە لەسەر خوا کە لە ڕۆژی دواییدا ڕازی بکات.

**٣٨٧١- عَنْ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَعُ هَؤُلَاءِ الدَّعَوَاتِ حِينَ يُمْسِي، وَحِينَ يُصْبِحُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، اللَّهُمَّ أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهْلِي وَمَالِي، اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي، وَآمِنْ رَوْعَاتِي، وَاحْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، وَمِنْ خَلْفِي، وَعَنْ يَمِينِي، وَعَنْ شِمَالِي، وَمِنْ فَوْقِي، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي» قَالَ وَكِيعٌ يَعْنِي الْخَسْفَ**[٢].

واته: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ ئێوارەو بەیانییەک وازی لەم پاڕانەوانە نەهێناوە: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، اللَّهُمَّ أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهْلِي وَمَالِي، اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي، وَآمِنْ رَوْعَاتِي، وَاحْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، وَمِنْ خَلْفِي، وَعَنْ يَمِينِي، وَعَنْ شِمَالِي، وَمِنْ فَوْقِي، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي»، واتە: خودایە داوای لێخۆشبوون و پارێزگاریت لێدەکەم لە دونیاو دوارۆژدا، خودایە داوای لێخۆشبوون و پارێزگاریت لێدەکەم لە دین و دونیاو خانەوادەو ماڵ و سامانمدا، خودایە عەیب و ناتەواوی و کەم و کورتییەکانم داپۆشە، خودایە ترسەکانم هێور بکەرەوەو دڵەڕاوکێکانم مەهێڵە، خودایە لە پێش و لە دواوەو لای ڕاست و لای چەپ و لای سەرووەمەوە پارێزگاریم لێبکە (واتە: لە هەموو ڕوویەکەوە بمپارێزە لە دەردو بەڵای خەراپ)، خودایە پەنات پێدەگرم کە لە ژێرمەوە سزا بدرێم بە ڕۆچوون بە زەویداو لەناوبچم.

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٥٠٧٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٠٧٤، والنسائي: ٥٥٢٩ و ٥٥٣٠.

٣٨٧٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ بِنِعْمَتِكَ، وَأَبُوءُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ» قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَالَهَا فِي يَوْمِهِ وَلَيْلَتِهِ، فَمَاتَ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ، أَوْ تِلْكَ اللَّيْلَةِ، دَخَلَ الْجَنَّةَ، إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوڕەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خودایە تۆ پەروەردگاری منی، تۆ دروستت کردووم، منیش بەندەی تۆم، خودایە من لەسەر بەڵێن و پەیمانەکەی خۆمم کە بە تۆم داوە ئەوەندەی لە توانامدا هەبێ، خودایە پەنات پێ دەگرم لە شەڕو خراپەی ئەوەی ئەنجامم داوە، خودایە دان بەوەدا دەنێم کە تۆ بەخشش و نیعمەتت بەسەردا ڕشتووم، دانیش بە تاوانەکانمدا دەنێم و داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم، وە بێگومان جگە لە تۆ هیچ کەسێک لە تاوانەکان خۆش نابێت. (ڕاوی) گوتی: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێ بە ڕۆژو بە شەو ئەم نزایە بخوێنێ و ئەو ڕۆژە یان ئەو شەوە بمرێ، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە ئەگەر خوا پێی خۆش بێت.

## بابەت: پاڕانەوەی کەسێ بچێتە سەر جێگای خەوتن

٣٨٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ: «اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، مُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ الْعَظِيمِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ دَابَّةٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا، أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ وَأَغْنِنِي مِنَ الْفَقْرِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەچۆیە سەر جێگای خەوەکەی دەیفەرموو: خودایە ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، ئەی پەروەردگاری هەموو شتێک، ئەی ڕوێنەری دانەوێڵەو تۆمە، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٠٧٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧١٣، وأبو داود: ٥٠٥١، والترمذي: ٣٤٠٠ و ٣٤٨١.

قورئانی گەورەو پیرۆز، پەنات پێ دەگرم لە شەڕو زیانی هەموو ئەو دروستکراوانەی خۆت کە جڵەویان بەدەست تۆیە، خودایە هیچ شتێک لەپێش تۆوە نەبووەو دەمێنیت لەدوای لەناوچوونی هەموو دروستکراوەکان، وە بەهێزو بەتوانایت و وە تۆ دیاریت و هیچ شتێکیش لەسەرووی تۆوە نیە، خۆت پەنهانیت و هیچ شتێک لە تۆ پەنهان نیە، سا خوایە قەزرداریم لەسەر لابەرەو بێ نیازیشم بکە لە هەژاری.

**٣٨٧٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَضْطَجِعَ عَلَى فِرَاشِهِ فَلْيَنْزِعْ دَاخِلَةَ إِزَارِهِ، ثُمَّ لِيَنْفُضْ بِهَا فِرَاشَهُ، فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ، ثُمَّ لِيَضْطَجِعْ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ لِيَقُلْ: رَبِّ بِكَ وَضَعْتُ جَنْبِي، وَبِكَ أَرْفَعُهُ، فَإِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا حَفِظْتَ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکاتێ یەکێ لە ئێوە ویستی لەسەر جێگای خەوەکەی پاڵکەوێ، ئەوە با بە لکی پۆشاکەکەی ژێرەوەی جێگاکەی بتەکێنێ، چونکە نازانێ لەپاش ئەو نوێنەکە چی تێدەچێ (لە جڕوجانەوەری زیانبەخش)، پاشان با لەسەر لای ڕاستی پاڵبکەوێ، دواتر بڵێ: پەروەردگارم بە بەخشش و نیعمەتی تۆ تەنیشتی خۆم لەسەر ئەم نوێنە دانا، وە هەر بە بەخشش و نیعمەتی تۆش بەرزی دەکەمەوەو لە خەو هەڵدەستم، خودایە ئەگەر لەو خەوەدا ڕوحەکەمت گرتەوەو ڕوحت کێشام ڕەحمم پێبکە، خۆ ئەگەر گەڕاندیشتەوەو لەم خەوە خەبەرت کردمەوە ئەوە بیپارێزە لە تاوان و لە زیانی شەیتان و ئاگات لێی بێ بەوەی کە بەندە چاکەکانی خۆتی پێ دەپارێزی.

**٣٨٧٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ نَفَثَ فِي يَدَيْهِ، وَقَرَأَ بِالْمُعَوِّذَتَيْنِ وَمَسَحَ بِهِمَا جَسَدَهُ»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەچۆیە سەر جێگای خەوتنەکەی فووی دەکردە ناو لەپی دەستەکانی و سوورەتی «الفلق»و «الناس»ـی دەخوێندو دەستەکانی بە جەستەیدا دەهێنا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣٢٠، ومسلم: ٢٧١٤، وأبو داود: ٥٠٥٠، وزاد الترمذي: ٣٤٠١ قوله: «فَإِذَا اسْتَيْقَظَ... إلخ».

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠١٧، وأبو داود: ٥٠٥٦، والترمذي: ٣٤٠٢.




٣٨٧٦- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ: «إِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ أَوْ أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَقُلْ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَى مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، فَإِنْ مِتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ مِتَّ عَلَى الْفِطْرَةِ، وَإِنْ أَصْبَحْتَ أَصْبَحْتَ وَقَدْ أَصَبْتَ خَيْرًا كَثِيرًا»[1].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: ئەگەر جێگای خەوەکەت ڕاخست یان چوویتە سەر جێگای خەوەکەت ئەوە بڵێ: «اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَى مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ»، واتە: خودایە خۆم تەسلیمی تۆ کردو پشتم بەستووە بە تۆو کاروبارم گەڕاندەوە بۆلای تۆو سپاردم بە تۆ، ئومێدەوارو خۆشحاڵم بە پاداشتەکانت و دەترسم لە سزاکانت، هیچ حەشارگەیەک نیە هەتا خۆم حەشار بدەم و هیچ ڕزگاربوونێکیش نیە لە سزاکانت جگە لەوە نەبێت کە بگەڕێمەوە بۆلای تۆ، بڕوام هێناوە بە قوڕئانەکەت کە داتبەزاندۆتە خوارەوە، هەروەها بڕوایشم هێناوە بە پێغەمبەرەکەت کە موحەممەدە ﷺ، خۆت ڕەوانەت کردوە. جا ئەگەر لەو شەوەدا بمریت ئەوە لەسەر دینی پاکی ئیسلامەتی دەمریت، ئەگەر ڕۆژت لێ بۆوە خێرو خۆشییەکی زۆرت دێتە ڕێ.

٣٨٧٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ وَضَعَ يَدَهُ - يَعْنِي الْيُمْنَى - تَحْتَ خَدِّهِ، ثُمَّ قَالَ: «قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ - أَوْ تَجْمَعُ عِبَادَكَ -»[2].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەچۆیە سەر جێگای خەوەکەی دەستی -واتە: دەستی ڕاستی- دەخستە ژێر ڕوومەتی، پاشان دەیفەرموو: خودایە بمپارێزە لە سزای خۆت ئەو ڕۆژەی کە بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە یان کۆیان دەکەیتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٧، ومسلم: ٢٧١٠، وأبو داود: ٥٠٤٦، والترمذي: ٣٣٩٤ و ٣٥٧٤.

(٢) صحيح.

## بابەت: پاڕانەوە لەکاتی بە خەبەر هاتنەوە لە شەودا

٣٨٧٨- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ فَقَالَ حِينَ يَسْتَيْقِظُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ، ثُمَّ دَعَا رَبِّ اغْفِرْ لِي، غُفِرَ لَهُ - قَالَ الْوَلِيدُ: أَوْ قَالَ: دَعَا اسْتُجِيبَ لَهُ -، فَإِنْ قَامَ فَتَوَضَّأَ ثُمَّ صَلَّى، قُبِلَتْ صَلَاتُهُ»[1].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ شەو لە خەو هەستاو لەوکاتەدا گوتی: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ»، لەپاشدا بپاڕێتەوەو بڵێ: ئەی پەروەردگارا لێم خۆشبە، لێی خۆش دەبێ. وەلید گوتی: یان فەرمووی: ئەگەر پاڕایەوە ئەوە پاڕانەوەکەی گیرا دەبێ، وە ئەگەر هەستاو دەستنوێژی گرت و نوێژی کرد ئەوە نوێژەکەی قبوڵ دەبێ.

٣٨٧٩- عَنْ رَبِيعَةَ بْنَ كَعْبٍ الْأَسْلَمِيَّ ﵁، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ كَانَ يَبِيتُ عِنْدَ بَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَ يَسْمَعُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ مِنَ اللَّيْلِ: «سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ الْهَوِيَّ، ثُمَّ يَقُولُ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ»[2].

واتە: ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمیی ﵁ دەگێڕێتەوە، شەوانە لەبەردەم دەرگای هۆدەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەخەوت، وە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبوو ماوەیەکی زۆر لە شەودا دەیفەرموو: پاک و بێگەردی بۆ خودای پەروەردگاری جیهانیان، پاشان دەیفەرموو: پاک و بێگەردی و سوپاس و ستایش هەر بۆ خودایە.

٣٨٨٠- عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا انْتَبَهَ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا، وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٥٤، وأبو داود: ٥٠٦٠، والترمذي: ٣٤١٤.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٤١٦، والنسائي: ١٦١٨. وانظر: مسلم: ٤٨٩، وأبو داود: ١٣٢٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣١٢، وأبو داود: ٥٠٤٩، والترمذي: ٣٤١٧.

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ شەوانە لە خەو هەڵدەستا دەیفەرموو: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی دوای مردنمان زیندووی کردینەوە، گەڕانەوەش هەر بۆلای ئەوە.

٣٨٨١- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ عَبْدٍ بَاتَ عَلَى طُهُورٍ، ثُمَّ تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ فَسَأَلَ اللَّهَ شَيْئًا مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا، أَوْ مِنْ أَمْرِ الْآخِرَةِ، إِلَّا أَعْطَاهُ»[(١)].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەک بە دەستنوێژەوە بخەوێت، پاشان شەو خەبەری بێتەوە داوای هەر شتێک لە کاروباری دونیاو دواڕۆژدا لە خودا بکات ئەوە پێی دەبەخشێ و دەیداتێ.

## بابەت: پاڕانەوەی کاتی بەڵاو ناخۆشی

٣٨٨٢- عَنْ أَسْمَاءَ ابْنَةِ عُمَيْسٍ ﷺ قَالَتْ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ عِنْدَ الْكَرْبِ: «اللَّهُ، اللَّهُ رَبِّي لَا أُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا»[(٢)].

واتە: ئەسمائی کچی عومەیس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند وشەیەکی فێرکردم کە لەکاتی بەڵاو ناخۆشیدا دەیانڵێم: «اللَّهُ، اللَّهُ رَبِّي لَا أُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا»، واتە: ئەی خودایە، ئەی خودایە (لەم بەڵاو ناخۆشییە ڕزگارم بکە) تۆ پەروەردگاری منی هیچ شتێک ناکەمە هاوبەشت.

٣٨٨٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ، سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبِّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ» قَالَ وَكِيعٌ مَرَّةً: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فِيهَا كُلِّهَا[(٣)].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەکاتی بەڵاو ناخۆشیدا دەیفەرموو: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ، سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبِّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ»، واتە: هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە زاتی الله،

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٠٤٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٢٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣٤٥، ومسلم: ٢٧٣٠، والترمذي: ٣٤٣٥.



لێبوردەیەو بەخشندەیە، پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگاری عەرشی گەورەو مەزن، پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و پەروەردگاری عەرشی پیرۆز. وەکیع گوتی: لە هەر یەکێکیاندا جارێک (دەیفەرموو:) «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ» (واتە: بەم شێوەیە دەیفەرموو: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ»).

## بابەت: پاڕانەوەی کاتی لە ماڵ دەرچوون

**٣٨٨٤- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنْ مَنْزِلِهِ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ، أَوْ أَزِلَّ، أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ، أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ»**[١].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە ماڵەکەی دەردەچوو دەیفەرموو: خودایە پەنات پێدەگرم لەوەی گومڕا ببم یان لەخشتە ببرێم (پێم بخلیسکێ) یان ستەم بکەم یان ستەمم لێبکرێ یان نەفامی بکەم یان نەفامیم بەرانبەر بکرێ.

**٣٨٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ قَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ، لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، التُّكْلَانُ عَلَى اللَّهِ»**[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە ماڵەکەی دەردەچوو دەیفەرموو: بە ناوی پیرۆزی خودا، هیچ گۆڕانکاری و هێزو توانایەک نیە مەگەر لەلای خواوە بێت، پشتبەستن هەر بە خوایەو هەر ئەو پشتیوانە.

**٣٨٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا خَرَجَ الرَّجُلُ مِنْ بَابِ بَيْتِهِ، أَوْ مِنْ بَابِ دَارِهِ، كَانَ مَعَهُ مَلَكَانِ مُوَكَّلَانِ بِهِ، فَإِذَا قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ قَالَا: هُدِيتَ، وَإِذَا قَالَ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ قَالَا: وُقِيتَ، وَإِذَا قَالَ: تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ قَالَا: كُفِيتَ، قَالَ: فَيَلْقَاهُ قَرِينَاهُ فَيَقُولَانِ: مَاذَا تُرِيدَانِ مِنْ رَجُلٍ قَدْ هُدِيَ وَكُفِيَ وَوُقِيَ؟»**[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٠٩٤، والترمذي: ٣٤٢٧، والنسائي: ٥٤٨٦ و ٥٥٣٩.

(٢) حسن لغيره.

(٣) حسن لغيره.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکاتێ پیاو لە ماڵەکەی بچێتە دەرەوە یان لە دەرگای ماڵەکەی بچێتە دەرەوە دوو فریشتەی لەگەڵدان کە ڕاسپێردراون لەگەڵی بن، جا کاتێ (پیاوەکە) گوتی: بە ناوی خوا، ئەوان دەڵێن: هیدایەت درایت، وە کاتێ گوتی: هیچ هێزو توانایەک نیە مەگەر لەلای خوا بێت، دەڵێن: پارێزرایت لە شەیتان، وە کاتێ گوتی: پشتم بە خوا بەست، دەڵێن: ئەوەت بەسە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: جا شەیتانەکانی (ئەو دوو شەیتانەی کە لەگەڵ هەر کەسێکدان) پێی دەگەن، فریشتەکان دەڵێن: چیتان دەوێ لە پیاوێک کە هیدایەت دراوەو کیفایەت کراوەو لە شەیتان پارێزراوە؟!

## بابەت: پاڕانەوەی کاتی چوونەوە ماڵ

**٣٨٨٧-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ فَذَكَرَ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ، وَعِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: لَا مَبِيتَ لَكُمْ وَلَا عَشَاءَ، وَإِذَا دَخَلَ وَلَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ، فَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ، وَالْعَشَاءَ»[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە دەیفەرموو: کاتێک پیاو چووە ناو ماڵەکەی و لەکاتی چوونە ژوورەوەو لەکاتی نان خواردنی ئێوارەدا یادی خوای کرد، شەیتان (بە بەردەستەکانی) دەڵێ: نە شوێنی مانەوەتان هەیە نە نانی ئێوارە (لەم ماڵەدا)، وە کاتێ چۆیە ماڵەوەو لەکاتی چوونە ژورەوە یادی خوای نەکرد، شەیتان دەڵێ: شوێنی مانەوەتان دەست کەوت، وە ئەگەر لەکاتی نانی ئێوارەشدا یادی خوای نەکرد، (شەیتان) دەڵێ: شوێنی مانەوەو نانی ئێوارەتان دەستکەوت.

## بابەت: نزای سەفەرکردن

**٣٨٨٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ - وَقَالَ: عَبْدُ الرَّحِيمِ: يَتَعَوَّذُ - إِذَا سَافَرَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَالْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْرِ، وَدَعْوَةِ الْمَظْلُومِ، وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْأَهْلِ وَالْمَالِ» وَزَادَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: فَإِذَا رَجَعَ قَالَ: مِثْلَهَا[2].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٠١٨، وأبو داود: ٣٧٦٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٤٣، والترمذي: ٣٤٣٩، والنسائي: ٥٤٩٨_٥٥٠٠.

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی سەرجیس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ سەفەری دەكرد - وە عەبدوڕەحیم گوتی: پەنای بە خوا دەگرت - دەیفەرموو: خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە ناڕەحەتی و ناسۆری سەفەرو غەم و پەژارەی گەڕانەوە، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە سەرلێشێوان دوای ڕێنمایی و گەڕانەوە لە بڕواوە بۆ بێبڕوایی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە پاڕانەوەی ستەم لێكراو و لە بینینی شتێكی ناخۆش و نامۆ لەناو ماڵ و منداڵم. وە ئەبو موعاویە لە گێڕانەوەكەیدا ئەوەی زیاد كردوە: وە كاتێ دەگەڕایەوە (لە سەفەرەكەی) بە هەمان شێوەی دەفەرموو.

## بابەت: پاڕانەوەی كاتی بینینی هەورو باران

٣٨٨٩- عَنْ يَزِيدُ بْنُ الْمِقْدَامِ بْنِ شُرَيْحٍ، عَنْ أَبِيهِ الْمِقْدَامِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عَائِشَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا رَأَى سَحَابًا مُقْبِلًا مِنْ أُفُقٍ مِنَ الْآفَاقِ، تَرَكَ مَا هُوَ فِيهِ وَإِنْ كَانَ فِي صَلَاتِهِ، حَتَّى يَسْتَقْبِلَهُ، فَيَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا أُرْسِلَ بِهِ»، فَإِنْ أَمْطَرَ قَالَ: «اللَّهُمَّ سَيْبًا نَافِعًا» مَرَّتَيْنِ، أَوْ ثَلَاثًا، وَإِنْ كَشَفَهُ اللَّهُ ﷻ وَلَمْ يُمْطِرْ حَمِدَ اللَّهَ عَلَى ذَلِكَ[1].

واتە: یەزیدی كوڕی میقدامی كوڕی شورەیح لە باوكییەوە میقدام، ئەویش لە باوكییەوە دەگێڕێتەوە كە عائیشە ﷺ هەواڵی پێداوە پێغەمبەر ﷺ كاتێ هەورێكی دەبینی لەلایەكی ئاسمانەوە دەهات لە هەر شتێكدا بوایە جێی دەهێشت ئەگەر هاتباو لە نوێژیشدا بوایە تاوەكو بەرەوڕووی دەبوو دەیفەرموو: خودایە ئێمە پەنات پێدەگرین لەو شەڕو خراپەیەی كە بەهۆیەوە نێردراوە، وە ئەگەر باران باریبا دوو جار یان سێ جار دەیفەرموو: خودایە گیان بیكە بە بارانێكی بە خووڕی سوودبەخش، وە ئەگەر خوای ﷻ هەورەكەی لابردبا و باران نەباریبا، سوپاس و ستایشی خوای دەكر لەسەر ئەوە.

٣٨٩٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا رَأَى الْمَطَرَ قَالَ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ صَيِّبًا هَنِيئًا»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ بارانی دەبینی دەیفەرموو: خودایە گیان بیكە بە بارانێكی بە لێزمەو بەسوود.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٠٩٩. وانظر: ما بعده.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٠٣٢، والنسائي: ١٥٢٣.

٣٨٩١- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِذَا رَأَى مَخِيلَةً تَلَوَّنَ وَجْهُهُ وَتَغَيَّرَ، وَدَخَلَ وَخَرَجَ، وَأَقْبَلَ وَأَدْبَرَ، فَإِذَا أَمْطَرَتْ سُرِّيَ عَنْهُ، قَالَ: فَذَكَرَتْ لَهُ عَائِشَةُ بَعْضَ مَا رَأَتْ مِنْهُ، فَقَالَ: «وَمَا يُدْرِيكِ؟ لَعَلَّهُ كَمَا قَالَ قَوْمُ هُودٍ: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ۚ بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ ۖ ﴿٢٤﴾﴾ الأحقاف، الْآيَةَ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکاتێ هەورێکی باراناوی بینیبا ڕەنگی دەگۆڕاو دەهاتو دەچووە ژوورەوەو دەهاتە دەرەوە، جا کاتێ باران دەباری بێتاقەتییەکەی نەدەما، (ڕاوی) گوتی: جا عائیشە بەشێک لەوەی کە لێی بینیبوو بۆی باسکرد، ئەویش فەرمووی: تۆ نازانی دەترسم وەکو ئەوە بێ کە قەومی هود گوتیان: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ۚ بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ ۖ ﴿٢٤﴾﴾ الأحقاف، واتە: جا کاتێک ئەو (سزایە)یان بینی پەڵە هەورێک بوو بەرەو شیوەکانیان دێت (دڵخۆش بوون) ووتیان ئەمە هەورێکە بارانی پێیە بۆمان (هود وتی: نەخێر) بەڵکو ئەوە ئەو (سزایە)یە بەپەلە داواتان دەکرد.

## بابەت: ئەوەی کە پیاو چی دەڵێ کاتێ خەڵکی گرفتار دەبینێ

٣٨٩٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ فَجِئَهُ صَاحِبُ بَلَاءٍ، فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلَاكَ بِهِ، وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلًا، عُوفِيَ مِنْ ذَلِكَ الْبَلَاءِ، كَائِنًا مَا كَانَ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ کتوپڕ بە کەسێکی گرفتار گەیشت با بڵێ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلَاكَ بِهِ، وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلًا»، واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی سەلامەتی کردم لەوەی کە تۆی پێ گرفتار کرد، وە فەزڵی داوم بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانیدا. ئەو کەسە بە هەر شێوەیەک بێت ئەو دەردو بەڵایەی تووش نابێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨٢٩، ومسلم: ٨٩٩، وأبو داود: ٥٠٩٨، والترمذي: ٣٢٥٧.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٤٣١ وذكر فيه عمر.



# پەرتووکی

# لێکدانەوەی خەون



---

كِتَابُ تَعْبِيرِ الرُّؤْيَا.

## بابەت: خەونی چاک و باش
## کە مسوڵمان دەیبینێ یان پێوەی دەبینرێ

٣٨٩٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ مِنَ الرَّجُلِ الصَّالِحِ، جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەونی باش کە پیاوی چاکەکار دەیبینێ بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی.

٣٨٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خەونی (مرۆڤی) ئیماندار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی.

٣٨٩٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «رُؤْيَا الرَّجُلِ الْمُسْلِمِ الصَّالِحِ، جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ»[٣].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خەونی مسوڵمانی چاکەکار بەشێکە لە حەفتا بەشی پێغەمبەرایەتی.

٣٨٩٦- عَنْ أُمِّ كُرْزٍ الْكَعْبِيَّةِ ﷺ، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «ذَهَبَتِ النُّبُوَّةُ، وَبَقِيَتِ الْمُبَشِّرَاتُ»[٤].

واتە: ئوممو کوڕزی کەعبییە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پێغەمبەرایەتی نەماو تەواو بوو، بەڵام موژدەدەرەکان (ئەو شتانەی کە لە خەوندا دەبینرێن و دڵخۆشکەرن) هەر دەمێنن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٩٨٣، ومسلم: ٢٢٦٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٩٨٨ و ٧٠١٧، ومسلم: ٢٢٦٣، وأبو داود: ٥٠١٩، والترمذي: ٢٢٧٠ و ٢٢٩١.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح لغيره.

٣٨٩٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ، جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ»(١).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەونی باش و چاک بەشێکە لە حەفتا بەشی پێغەمبەرایەتی.

٣٨٩٨- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عَنْ قَوْلِ اللَّهِ سُبْحَانَهُ: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِۚ ﴿٦٤﴾ ﴾ يونس، قَالَ: «هِيَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ، يَرَاهَا الْمُسْلِمُ، أَوْ تُرَى لَهُ»(٢).

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئەم ئایەتەی خوا کە دەفەرمووێ: ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِۚ ﴿٦٤﴾ ﴾ یونس. واتە: هەر بۆ ئەوانە مزگێنی وموژدە لە ژیانی دونیاداو لە دواڕۆژیشدا، ئەویش فەرمووی: ئەوە خەونی چاک و باشە کە مسوڵمان دەیبینێ یان پێوەی دەبینرێ.

٣٨٩٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: كَشَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ السِّتَارَةَ فِي مَرَضِهِ، وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلَّا الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ، يَرَاهَا الْمُسْلِمُ، أَوْ تُرَى لَهُ»(٣).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی نەخۆشییەکەیدا (کە لە ماڵەوە بوو) پەردەی لاداو تەماشای کرد خەڵکی لەپشت ئەبو بەکرەوە ڕیزیان بەستووە (بۆ نوێژ)، جا فەرمووی: ئەی خەڵکینە نیشانەی موژدەدەرانی پێغەمبەرایەتی نەماون بێجگە لە خەونی چاک کە مسوڵمان دەیبینێ یان پێوەی دەبینرێ.

## بابەت: بینینی پێغەمبەر ﷺ لە خەودا

٣٩٠٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ، فَقَدْ رَآنِي فِي الْيَقَظَةِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ عَلَى صُورَتِي»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٦٥.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٢٧٥.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٧٩، وأبو داود: ٨٧٦، والنسائي: ١٠٤٥ و ١١٢٠.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٢٧٦.




واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە خەودا بمبینێت ئەوە بەڕاستی وەک بەخەبەر بێ منی بینیوە، چونکە بێگومان شەیتان ناتوانێ خۆی بخاتە سەر شکڵ و شێوەی من.

**٣٩٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ بِي»(١).**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە خەودا بمبینێت ئەوە بەڕاستی منی بینیوە، چونکە بێگومان شەیتان ناتوانێ خۆی بخاتە سەر شکڵ و شێوەی من.

**٣٩٠٢- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ، فَقَدْ رَآنِي، إِنَّهُ لَا يَنْبَغِي لِلشَّيْطَانِ أَنْ يَتَمَثَّلَ فِي صُورَتِي»(٢).**

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە خەودا بمبینێت ئەوە بەڕاستی منی بینیوە، چونکە بێگومان شەیتان ناتوانێ و بۆی نیە خۆی بخاتە سەر شکڵ و شێوەی من.

**٣٩٠٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ، فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ بِي»(٣).**

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە خەودا بمبینێت ئەوە بەڕاستی منی بینیوە، چونکە بێگومان شەیتان ناتوانێ خۆی بخاتە سەر شکڵ و شێوەی من.

**٣٩٠٤- عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ، فَكَأَنَّمَا رَآنِي فِي الْيَقَظَةِ، إِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَتَمَثَّلَ بِي»(٤).**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٩٩٣، ومسلم: ٢٢٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٦٨/١٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٩٩٧.

(٤) صحيح.



واتە: عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە خەودا بمبینێت ئەوە وەکو ئەوە وایە بەڕاستی منی بینیبێ، چونکە بێگومان شەیتان ناتوانێ خۆی بخاتە سەر شکڵ و شێوەی من.

٣٩٠٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ، فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ بِي»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە خەودا بمبینێت ئەوە بەڕاستی منی بینیوە، چونکە بێگومان شەیتان ناتوانێ خۆی بخاتە سەر شکڵ و شێوەی من.

## بابەت: ئەوەی کە خەون سێ جۆرە

٣٩٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «الرُّؤْيَا ثَلَاثٌ: فَبُشْرَى مِنَ اللَّهِ، وَحَدِيثُ النَّفْسِ، وَتَخْوِيفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنْ رَأَى أَحَدُكُمْ رُؤْيَا تُعْجِبُهُ فَلْيَقُصَّهَا، إِنْ شَاءَ، وَإِنْ رَأَى شَيْئًا يَكْرَهُهُ، فَلَا يَقُصُّهُ عَلَى أَحَدٍ، وَلْيَقُمْ يُصَلِّي»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خەون سێ جۆرە: یان موژدە دانە لەلایەن خواوە، یان داڵغەو خەیاڵی نەفسە، وە یان خەم و ترساندنە لە شەیتانەوە، جا ئەگەر یەکێکتان خەونێکی بینی کە پێی خۆشحاڵ بوو ئەوە ئەگەر پێی خۆش بوو با بیگێڕێتەوەو باسی بکات، وە ئەگەر شتێکی بینی کە پێی ناخۆش بوو با نەیگێڕێتەوەو لای کەس باسی نەکات وە با هەستێ نوێژ بکات.

٣٩٠٧- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ الرُّؤْيَا ثَلَاثٌ: مِنْهَا أَهَاوِيلُ مِنَ الشَّيْطَانِ لِيَحْزُنَ بِهَا ابْنَ آدَمَ، وَمِنْهَا مَا يَهُمُّ بِهِ الرَّجُلُ فِي يَقَظَتِهِ، فَيَرَاهُ فِي مَنَامِهِ، وَمِنْهَا جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ » قَالَ، قُلْتُ لَهُ: أَنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، أَنَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[٣].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري بإثر: ٧٠١٧ موقوفاً، وأبو داود: ٥٠١٩، والترمذي: ٢٢٧٠ و ٢٢٩١.

(٣) صحيح.




واتە: عەوفی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەون سێ جۆرە: یەکێکیان ترساندنە لەلایەن شەیتانەوە بۆئەوەی بەنی ئادەم خەمبارو خەفەتبار بکات، وە جۆرێکیان ئەوەیە کە پیاو لەکاتی بەخەبەریدا داڵغەو خەیاڵی لایەتی ئیتر لە خەونیدا دەیبینێ، وە جۆرێکیشیان بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی، (ڕاوی) گوتی: پێم گوت: تۆ ئەوەت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستووە؟ گوتی: بەڵێ من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە، من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە.

## بابەت: ئەو کەسەی کە خەونی ناخۆش و بێزارکەر دەبینێ و پێی ناخۆشە

**٣٩٠٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «إِذَا رَأَى أَحَدُكُمُ الرُّؤْيَا يَكْرَهُهَا، فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثًا، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ ثَلَاثًا، وَلْيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ»**[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێ لە ئێوە خەونێکی بینی کە پێی ناخۆش بوو بێزاری کرد، ئەوە با لەلای چەپیەوە سێ جار تف بکات، وە سێ جار پەنا بە خوا بگرێ لە شەیتان، وە با باری نوستنەکەی بگۆڕێت و بە لاکەیتردا بخەوێت.

**٣٩٠٩- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «الرُّؤْيَا مِنَ اللَّهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ شَيْئًا يَكْرَهُهُ، فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثًا، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ثَلَاثًا، وَلْيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ»**[٢].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەون بینینی باش لە خواوەیە، خەونی ناخۆش و خراپیش لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر یەکێکتان خەونێکی دی کە پێی ناخۆش بوو، ئەوە با لەلای چەپییەوە سێ جار تف بکات، وە با سێ جار پەنا بگرێ بە خوا لە شەیتانی دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوا، وە با لەسەر ئەو لایەی کە پاڵکەوتبوو بسوڕێت بۆ لایەکەی دیکە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٦٢، وأبو داود: ٥٠٢٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٩٢، ومسلم: ٢٢٦١، وأبو داود: ٥٠٢١، والترمذي: ٢٢٧٧.




**٣٩١٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ رُؤْيَا يَكْرَهُهَا، فَلْيَتَحَوَّلْ وَلْيَتْفُلْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثًا، وَلْيَسْأَلِ اللَّهَ مِنْ خَيْرِهَا، وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان خەونێکی دی کە پێی ناخۆش بوو، ئەوە با لەسەر ئەو لایە بسوڕێت کە لەسەری پاڵکەوتبوو بۆ لایەکەیتر، وە با لەلای چەپیەوە سێ جار تف بکات، وە با داوا لە خوا بکات لە خێرو چاکەی ئەو خەونە، وە پەنا بە خوا بگرێ لە شەڕو خراپەی ئەو خەونە.

## بابەت: ئەو کەسەی کە شەیتان لە خەونیدا گاڵتەی پێکرد با لەلای خەڵکی باسی نەکات

**٣٩١١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ رَأْسِي ضُرِبَ، فَرَأَيْتُهُ يَتَدَهْدَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَعْمِدُ الشَّيْطَانُ إِلَى أَحَدِكُمْ فَيَتَهَوَّلُ لَهُ، ثُمَّ يَغْدُو يُخْبِرُ النَّاسَ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو گوتی: لە خەودا بینیم کە لە سەرم دراو سەرم دەجوڵاو تلاوتلی دەکرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شەیتان دێت ترس و دڵەڕاوکێ بۆ یەکێک لە ئێوە دروست دەکات، پاشان ئەو کەسە بەیانییەکەی دێت بۆ خەڵکی دەگێڕێتەوە (واتە: ئەو کارە مەکەن).

**٣٩١٢-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ وَهُوَ يَخْطُبُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ رَأَيْتُ الْبَارِحَةَ فِيمَا يَرَى النَّائِمُ، كَأَنَّ عُنُقِي ضُرِبَتْ، وَسَقَطَ رَأْسِي، فَاتَّبَعْتُهُ فَأَخَذْتُهُ فَأَعَدْتُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا لَعِبَ الشَّيْطَانُ بِأَحَدِكُمْ فِي مَنَامِهِ، فَلَا يُحَدِّثَنَّ بِهِ النَّاسَ»[3].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خەریکی وتاردان بوو کە پیاوێک هاتە خزمەتی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من شەوی ڕابردوو (لە خەودا) ئەوەم بینی کە کەسی نوستوو دەیبینێ، وەکو ئەوە وابوو کە سەرم پەڕێنرابێ و کەوتبێتە سەر زەوی، منیش

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٦٨.



دوای کەوتم و گرتم و خستمە شوێنی خۆی، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە شەیتان لە خەویدا گاڵتەی پێکرد ئەوە با بۆ خەڵکی نەگێڕێتەوەو باسی نەکات.

**٣٩١٣-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِذَا حَلَمَ أَحَدُكُمْ، فَلَا يُخْبِرِ النَّاسَ بِتَلَعُّبِ الشَّيْطَانِ بِهِ فِي الْمَنَامِ»[1].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان خەوتێکی ناخۆش و خراپی بینی با بۆ خەڵکی نەگێڕێتەوە کەوا شەیتان لە خەویدا گاڵتەی پێکردوە.

## بابەت: ئەوەی کە ئەگەر خەون لێکدرایەوە دێتەدی، وە با نەیگێڕێتەوە تەنها بۆ کەسی نزیک و خۆشەویستی نەبێ

**٣٩١٤-** عَنْ أَبِي رَزِينٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «الرُّؤْيَا عَلَى رِجْلِ طَائِرٍ، مَا لَمْ تُعْبَرْ، فَإِذَا عُبِرَتْ وَقَعَتْ». قَالَ: «وَالرُّؤْيَا جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ» - قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: - «لَا يَقُصُّهَا إِلَّا عَلَى وَادٍّ أَوْ ذِي رَأْيٍ»[2].

واتە: ئەبو ڕەزین ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە دەیفەرموو: خەون قەرار ناگرێ و نایەتەدی ئەگەر پیاو باسی نەکات و لێکدانەوەی بۆ نەکات، بەڵام ئەگەر باسی بکات و لێکدانەوەی بۆ بکات دێتە دی، فەرمووی: وە خەون بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی - (ڕاوی) گوتی: وە وابزانم فەرمووی: - وە با خەوەکەی نەگێڕێتەوە تەنها بۆ کەسی خۆشەویست و نزیکی نەبێ یان بۆ کەسێ کە شارەزا بێت لە لێکدانەوەی خەون.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٢٦٨.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٥٠٢٠، والترمذي: ٢٢٧٨.

## بابەت: ئەوەی کە خەون لەسەر چی لێکدانەوەی بۆ دەکرێ

٣٩١٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اعْتَبِرُوهَا بِأَسْمَائِهَا، وَكَنُّوهَا بِكُنَاهَا، وَالرُّؤْيَا لِأَوَّلِ عَابِرٍ»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەونەکان بەو ناوە لێکبدەنەوە کە لەناو خەونەکەدا هاتووە، وە بەو نازناوەش کە لەناو خەونەکەدا هاتووە، خەون لێکدانەوەش بۆ ئەو کەسەیە کە یەکەم جار لێکی دەداتەوە.

## بابەت: کەسێ کە بە درۆ بڵێ: خەونێکی ئاواو ئاوم دیوە

٣٩١٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَحَلَّمَ حُلُمًا كَاذِبًا، كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ، وَيُعَذَّبُ عَلَى ذَلِكَ»(٢).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ بە درۆ بڵێ: خەونێکی ئاواو ئاوام دیوە، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا ڕادەسپێردرێ کە نێوانی دوو دەنکە جۆ پێکەوە گرێ بدات.

## بابەت: ئەوەی کە ڕاسترین خەون
## خەونی ئەو کەسانەیە کەوا ڕاستگۆن

٣٩١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَرُبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ تَكْذِبُ، وَأَصْدَقُهُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُهُمْ حَدِيثًا، وَرُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ زەمان نزیک بۆوە (کۆتایی زەمان) زۆر نزیکە خەونی ئیماندار ڕاست دەرچێ و کەمجار درۆ دەرچێ، وە ڕاسترین خەون خەونی ئەو کەسانەیە کە خۆیان ڕاستگۆن، وە خەونی ئیماندار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٤٢، وأبو داود: ٥٠٢٤، والترمذي: ٢٢٨٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٩٨٨ و ٧٠١٧، ومسلم: ٢٢٦٣، وأبو داود: ٥٠١٩، والترمذي: ٢٢٧٠ و ٢٢٩١.




## بابەت: لێكدانەوەی خەون

٣٩١٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ مُنْصَرَفَهُ مِنْ أُحُدٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ ظُلَّةً تَنْطُفُ سَمْنًا وَعَسَلًا، وَرَأَيْتُ النَّاسَ يَتَكَفَّفُونَ مِنْهَا، فَالْمُسْتَكْثِرُ، وَالْمُسْتَقِلُّ، وَرَأَيْتُ سَبَبًا وَاصِلًا إِلَى السَّمَاءِ، رَأَيْتُكَ أَخَذْتَ بِهِ، فَعَلَوْتَ بِهِ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ بَعْدَكَ فَعَلَا بِهِ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ بَعْدَهُ فَعَلَا بِهِ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ بَعْدَهُ فَانْقَطَعَ بِهِ، ثُمَّ وُصِلَ لَهُ فَعَلَا بِهِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: دَعْنِي أَعْبُرْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «اعْبُرْهَا»، قَالَ: أَمَّا الظُّلَّةُ فَالْإِسْلَامُ، وَأَمَّا مَا يَنْطُفُ مِنْهَا مِنَ الْعَسَلِ وَالسَّمْنِ، فَهُوَ الْقُرْآنُ، حَلَاوَتُهُ وَلِينُهُ، وَأَمَّا مَا يَتَكَفَّفُ مِنْهُ النَّاسُ، فَالْآخِذُ مِنَ الْقُرْآنِ كَثِيرًا، وَقَلِيلًا، وَأَمَّا السَّبَبُ الْوَاصِلُ إِلَى السَّمَاءِ، فَمَا أَنْتَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَقِّ، أَخَذْتَ بِهِ فَعَلَا بِكَ، ثُمَّ يَأْخُذُهُ رَجُلٌ مِنْ بَعْدِكَ فَيَعْلُو بِهِ، ثُمَّ آخَرُ فَيَعْلُو بِهِ، ثُمَّ آخَرُ فَيَنْقَطِعُ بِهِ، ثُمَّ يُوَصَّلُ لَهُ فَيَعْلُو بِهِ، قَالَ: «أَصَبْتَ بَعْضًا، وَأَخْطَأْتَ بَعْضًا»، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَقْسَمْتُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَتُخْبِرَنِّي بِالَّذِي أَصَبْتُ، مِنَ الَّذِي أَخْطَأْتُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تُقْسِمْ يَا أَبَا بَكْرٍ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێک لە جەنگی ئوحود گەڕایەوە پیاوێک هاتە خزمەتی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئەمشەو لە خەونمدا هەورێکم دی ڕۆن و هەنگوینی لێ دەباری، خەڵکم دەبینی مشتیان بۆ گرتبوو، جا هەیان بوو زۆری بەردەکەوت و هەشیان بوو کەمی بەردەکەوت، پەتێکیشم بینی لە ئاسمانەوە شۆڕکرابۆوە، وە تۆم بینی دەستت پێوەگرت و سەرکەوتی، لەدوای تۆش کەسێکی تر دەستی پێوەگرت و سەرکەوت، دواتر کەسێکی تریش دەستی پێوەگرت و سەرکەوت، پاشان کەسێکی تر دەستی پێوەگرت و پەتەکە پچڕا (سەرنەکەوت)، پاشان پەتەکە بەیەک گەیەنرایەوەو سەرکەوت، ئەبو بەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەم بدە با لێکی بدەمەوە، فەرمووی: لێکی بدەوە، گوتی: هەورەکە ئیسلامە، وە ئەو هەنگوین و ڕۆنەی کە لێی دەباری هێمنی و نەرمی و شیرینی قورئانە، وە ئەوەشی کە خەڵکی مشتیان بۆ گرتبوو بریتیە لە کەمی و زۆری دەست گرتنیان بە قورئانەوە، وە ئەو پەتەشی کە لە ئاسمانەوە شۆڕکرابۆوە ئەو ڕێگا ڕاست و هەقەیە کە تۆ لەسەریتی، دەستت پێوەگرتووەو خوا سەرت دەخات، لەدوای تۆش کەسێکی

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٤٦، ومسلم: ٢٢٦٩، وأبو داود: ٣٢٦٨ و ٤٦٣٢، والترمذي: ٢٢٩٣.




تر دەستی پێوە دەگرێت و سەردەکەوێت، لەدوای ئەویش کەسێکی تر دەستی پێوە دەگرێت و سەردەکەوێت، پاشان کەسێکی تر دەستی پێوە دەگرێت و دەپچڕێت، پاشان دەستی پێوە دەگرێت و سەردەکەوێت، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: هەندێکیت پێکاو هەندێکیشت نەپێکا، ئەبو بەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندت دەدەم کە پێم بڵێی چیم پێکاو چیم نەپێکا، فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر سوێند مەخۆ.

**٣٩١٨م- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ، قَالَ: كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَجُلًا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ رَأَيْتُ ظُلَّةً بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، تَنْطِفُ سَمْنًا وَعَسَلًا، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ نَحْوَهُ[(١)].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﭭ دەڵێ: ئەبو هورەیرە دەیگێڕایەوە کە پیاوێک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەونمدا هەورێکم بینی لە نێوان ئاسمان و زەوی، ڕۆن و هەنگوینی لێ دەباری، وەک فەرموودەی پێشووی گێڕایەوە.

**٣٩١٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ، قَالَ: كُنْتُ غُلَامًا شَابًّا عَزَبًا، فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَكُنْتُ أَبِيتُ فِي الْمَسْجِدِ، فَكَانَ مَنْ رَأَى مِنَّا رُؤْيَا، يَقُصُّهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ لِي عِنْدَكَ خَيْرٌ فَأَرِنِي رُؤْيَا يُعَبِّرُهَا لِي النَّبِيُّ ﷺ، فَنِمْتُ، فَرَأَيْتُ مَلَكَيْنِ أَتَيَانِي فَانْطَلَقَا بِي، فَلَقِيَهُمَا مَلَكٌ آخَرُ، فَقَالَ: لَمْ تُرَعْ، فَانْطَلَقَا بِي إِلَى النَّارِ، فَإِذَا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَيِّ الْبِئْرِ، وَإِذَا فِيهَا نَاسٌ قَدْ عَرَفْتُ بَعْضَهُمْ، فَأَخَذُوا بِي ذَاتَ الْيَمِينِ، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِحَفْصَةَ، فَزَعَمَتْ حَفْصَةُ، أَنَّهَا قَصَّتْهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ رَجُلٌ صَالِحٌ، لَوْ كَانَ يُكْثِرُ الصَّلَاةَ مِنَ اللَّيْلِ» قَالَ: «فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُكْثِرُ الصَّلَاةَ مِنَ اللَّيْلِ»[(٢)].**

واتە: ئیبنو عومەر ﭭ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ من گەنجێکی پێگەیشتووی بێ ژن بووم، جا شەوانە لە مزگەوتدا دەمامەوە، وە هەر کەسێ لە ئێمە خەونێکی دیبا بۆ پێغەمبەری ﷺ دەگێڕایەوە، جا منیش گوتم: ئەی خودایە ئەگەر خێری پێوەیە لەلایەن تۆوە بۆ من ئەوە خەونێکم نیشانبدە کە پێغەمبەر ﷺ بۆمی لێکبداتەوە، ئیتر خەوتم و لە خەودا دوو فریشتەم بینی کە هاتنە لام و بردیانم، جا فریشتەیەکی تریان پێگەیشت و فەرمووی: ترست نەبێ، ئنجا بردیانم بۆلای دۆزەخ

---

(١) صحيح. انظر الذي قبله.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٢١ و ٧٠٣٠، ومسلم: ٢٤٧٩ وانظر: ٧٥١.




کە وەکو بیری هەڵچنراو لە ناوەوە هەڵچنرابوو، وە خەڵکانێکم بینی لەناویدا کە هەندێکیانم دەناسیەوە، ئنجا گرتیانم و بەرەو لای ڕاستیان بردم، جا کاتێ بەیانیم کردەوە ئەوەم بۆ حەفصە باسکرد، وە وابزانم بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: بەڕاستی عەبدوڵلا پیاوێکی باش و بۆ خوا صوڵحاوە ئەگەر هاتباو زیاتر شەونوێژی کردبا (زۆر باشتریش دەبوو). (ڕاوی) گوتی: ئیتر لەمەودوا عەبدوڵلا زۆر شەونوێژی دەکرد.

**٣٩٢٠-** عَنْ خَرَشَةَ بْنِ الْحُرِّ ﵁، قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَجَلَسْتُ إِلَى شِيَخَةٍ فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَجَاءَ شَيْخٌ يَتَوَكَّأُ عَلَى عَصًا لَهُ، فَقَالَ الْقَوْمُ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا، فَقَامَ خَلْفَ سَارِيَةٍ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَقُمْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ لَهُ: قَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ كَذَا، وَكَذَا، قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ، الْجَنَّةُ لِلَّهِ يُدْخِلُهَا مَنْ يَشَاءُ، وَإِنِّي رَأَيْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، رُؤْيَا، رَأَيْتُ كَأَنَّ رَجُلًا أَتَانِي، فَقَالَ لِي: انْطَلِقْ، فَذَهَبْتُ مَعَهُ، فَسَلَكَ بِي فِي نَهْجٍ عَظِيمٍ، فَعُرِضَتْ عَلَيَّ طَرِيقٌ عَلَى يَسَارِي، فَأَرَدْتُ أَنْ أَسْلُكَهَا، فَقَالَ: إِنَّكَ لَسْتَ مِنْ أَهْلِهَا، ثُمَّ عُرِضَتْ عَلَيَّ طَرِيقٌ عَنْ يَمِينِي، فَسَلَكْتُهَا، حَتَّى إِذَا انْتَهَيْتُ إِلَى جَبَلٍ زَلَقٍ فَأَخَذَ بِيَدِي، فَزَجَّلَ بِي، فَإِذَا أَنَا عَلَى ذُرْوَتِهِ، فَلَمْ أَتَقَارَّ، وَلَمْ أَتَمَاسَكْ، وَإِذَا عَمُودٌ مِنْ حَدِيدٍ فِي ذُرْوَتِهِ حَلْقَةٌ مِنْ ذَهَبٍ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَزَجَّلَ بِي، حَتَّى أَخَذْتُ بِالْعُرْوَةِ، فَقَالَ: اسْتَمْسِكْ. قُلْتُ: نَعَمْ، فَضَرَبَ الْعَمُودَ بِرِجْلِهِ، فَاسْتَمْسَكْتُ بِالْعُرْوَةِ، فَقَالَ: قَصَصْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتَ خَيْرًا، أَمَّا الْمَنْهَجُ الْعَظِيمُ، فَالْمَحْشَرُ، وَأَمَّا الطَّرِيقُ الَّتِي عُرِضَتْ عَنْ يَسَارِكَ، فَطَرِيقُ أَهْلِ النَّارِ، وَلَسْتَ مِنْ أَهْلِهَا، وَأَمَّا الطَّرِيقُ الَّتِي عُرِضَتْ عَنْ يَمِينِكَ، فَطَرِيقُ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَأَمَّا الْجَبَلُ الزَّلَقُ، فَمَنْزِلُ الشُّهَدَاءِ، وَأَمَّا الْعُرْوَةُ الَّتِي اسْتَمْسَكْتَ بِهَا، فَعُرْوَةُ الْإِسْلَامِ، فَاسْتَمْسِكْ بِهَا حَتَّى تَمُوتَ»، فَأَنَا أَرْجُو أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَإِذَا هُوَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ[(١)].

واتە: خەڕەشەی کوڕی حوڕڕ﵁ دەڵێ: هاتم بۆ شاری مەدینەو لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ لەلای کۆمەڵە پیاوێکی پیر دانیشتم، جا پیاوێکی بەتەمەن هاتە ناو مزگەوت کە خۆی دابوو بەسەر گۆچانێکەوە، جا هەندێ خەڵک گوتیان: هەرکەسێ حەزدەکا سەیری پیاوێک لە پیاوەکانی بەهەشت بکات ئەوە با سەیری ئەو پیاوە بەتەمەنە بکات، ئنجا (پیاوە بەتەمەنەکە) هەستا لەپشت پایەیەکەوەو دوو ڕکات نوێژی کرد،

---

(١) حسن. أخرجە مسلم: ٢٤٨٤.

منیش هەستام و چوومە لای و پێم گوت: ئەو خەڵکانە ئاواو ئاوایان گوت، گوتی: سوپاس و ستایش بۆ خوا، بەهەشت هی خوایەو هەر کەسێکی پێ خۆش بێ دەیخاتە ناوی، وە بەڕاستی من لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خەونێکم دی، بینیم پیاوێک هاتە لام و گوتی: بڕۆ، منیش لەگەڵی ڕۆیشتم، جا بەناو ڕێگایەکی پان و بەرینیدا بردم، ئنجا لەلای چەپمەوە ڕێگایەکم هاتە پێش، منیش ویستم ئەو ڕێگایە بگرمە بەر، ئەویش گوتی: تۆ لە خەڵکی ئەم ڕێگایە نیت، پاشان لەلای ڕاستمەوە ڕێگایەکم هاتە پێش، منیش گرتمەبەرو تاوەکو گەیشتمە گردێکی خلیسک، ئنجا دەستی گرتم و گرتمیەوە (بۆئەوەی نەکەوم)، جا کاتێ گەیشتمە لوتکەی گردەکە تەواو قاچەکانم جێگیر نەبوون و دەستیشم بە هیچەوە نەگرتبوو، وە عەمودێکی ئاسنینی لێبوو کە ئاڵقەیەکی ئاڵتوونی بە سەرەکەیەوە بوو، ئەویش دەستی گرتم و گرتمیەوە تاوەکو دەستم بە ئاڵقەکەوە گرت، جا گوتی: ئایا دەستت پێوەگرتووە؟ گوتم: بەڵێ، ئنجا بە قاچی لە عەمودەکەیدا، منیش دەستم گرت بە ئاڵقەکەوە، ئەوجار (پیاوە بەتەمەنەکە) گوتی: منیش ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، فەرمووی: خێرو چاکەت دیوە، ڕێگا پان و بەرینەکە ئەوە مەحشەرە، وە ئەو ڕێگایەی کە لەلای چەپتەوە هاتە پێشت ئەوە ڕێگای خەڵکی دۆزەخەو تۆش لەوان نیت، وە ئەو ڕێگایەشی کە لەلای ڕاستتەوە هاتە پێشت ئەوە ڕێگای خەڵکی بەهەشتە، وە گردە خلیسکەکەش مەنزڵگای شەهیدانە، وە ئەو ئاڵقەیەش کە دەستت پێوەی گرتبوو ئەوە ئاڵقەی ئیسلامە، بۆیە تاوەکو دەمریت دەستی پێوە بگرە، جا بۆیە ئەمن هیوام وایە کە لە خەڵکی بەهەشت بم. وە ئەو پیاوە بەتەمەنە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام بوو.

٣٩٢١- عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أُهَاجِرُ مِنْ مَكَّةَ إِلَى أَرْضٍ بِهَا نَخْلٌ، فَذَهَبَ وَهَلِي إِلَى أَنَّهَا يَمَامَةُ أَوْ هَجَرٌ، فَإِذَا هِيَ الْمَدِينَةُ، يَثْرِبُ، وَرَأَيْتُ فِي رُؤْيَايَ هَذِهِ، أَنِّي هَزَزْتُ سَيْفًا فَانْقَطَعَ صَدْرُهُ، فَإِذَا هُوَ مَا أُصِيبَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، ثُمَّ هَزَزْتُهُ فَعَادَ أَحْسَنَ مَا كَانَ، فَإِذَا هُوَ مَا جَاءَ اللَّهُ بِهِ مِنَ الْفَتْحِ، وَاجْتِمَاعِ الْمُؤْمِنِينَ، وَرَأَيْتُ فِيهَا أَيْضًا بَقَرًا، وَاللَّهُ خَيْرٌ، فَإِذَا هُمُ النَّفَرُ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَإِذَا الْخَيْرُ مَا جَاءَ اللَّهُ بِهِ مِنَ الْخَيْرِ بَعْدُ، وَثَوَابِ الصِّدْقِ الَّذِي آتَانَا اللَّهُ بِهِ يَوْمَ بَدْرٍ»(١).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٢٢، ومسلم: ٢٢٧٢.




واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە خەودا بینیم کە من لە مەککەوە کۆچ دەکەم بەرەو شوێنێک کە دارخومای لێبوو، منیش وا گومانم برد کە یەمامە یان هەجەڕە، کەچی ئەو شارە «یثرب» بوو، وە لە خەوەکەمدا ئەوەم بینی کە من شمشێرەکەم ڕاوەشاندو سەرەکەی پسا، وە ئەوە لێکدانەوەکەی بەو جۆرەیە کە بەسەر ئیماندااران هات لە جەنگی ئوحوددا، پاشان جارێکی تر ڕاموەشاندەوەو لە جاری پێشتر باشتر بوو، وە ئەوە لێکدانەوەکەی بەو جۆرەیە کە خوا فەتحی مەککەی بۆ کردم و ئیماندارانی بەیەکەوە کۆکردەوە، وە هەروەها مانگایەکم دی کە لێکدانەوەی بریتی بوو لەو شەهیدانەی جەنگی ئوحود کە پاداشتی خوا باشتر بوو بۆیان، وە ئەو خێرەی کە خوا لەدواتردا هێنای باشتر بوو وە پاداشتی ئەو ڕاستگۆییە بوو کە خوا لە ڕۆژی بەدردا پێی داین.

٣٩٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَأَيْتُ فِي يَدِي سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ، فَنَفَخْتُهُمَا، فَأَوَّلْتُهُمَا هَذَيْنِ الْكَذَّابَيْنِ: مُسَيْلِمَةَ، وَالْعَنْسِيَّ»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە خەومدا بینیم دوو بازنەی زێڕم لە دەستدا بوو، منیش فووم لێکردن، ئەو دوو بازنەم بە دوو درۆزن لێکدایەوە کە موسەیلەمەو عەنسی بوون.

٣٩٢٣- عَنْ قَابُوسَ ﷺ، قَالَ: قَالَتْ أُمُّ الْفَضْلِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ رَأَيْتُ كَأَنَّ فِي بَيْتِي عُضْوًا مِنْ أَعْضَائِكَ، قَالَ: «خَيْرًا رَأَيْتِ، تَلِدُ فَاطِمَةُ غُلَامًا فَتُرْضِعِيهِ»، فَوَلَدَتْ حُسَيْنًا، أَوْ حَسَنًا، فَأَرْضَعَتْهُ بِلَبَنِ قُثَمٍ، قَالَتْ: فَجِئْتُ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَوَضَعْتُهُ فِي حَجْرِهِ، فَبَالَ، فَضَرَبْتُ كَتِفَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَوْجَعْتِ ابْنِي، رَحِمَكِ اللَّهُ»[٢].

واتە: قابوس ﷺ دەڵێ: ئوممو فەزڵ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەودا بینیم وەکو ئەوە وابوو کە ئەندامێک لە ئەندامەکانی جەستەت لە ماڵی من بێت، فەرمووی: ئەوە خێر بووە دیوتە، فاتیمە کوڕێکی دەبێ و تۆ شیری پێ دەدەی، جا حەسەن یان حوسەین لە دایکبوو ئەو لە شیری قوسەمی (کوڕی) شیری پێدەدا،

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٢١، ومسلم: ٢٢٧٤، والترمذي: ٢٢٩٢.

(٢) حسن.




گوتی جا بردم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو لەسەر کۆشی دامنا، ئنجا منداڵەکە میزی بەخۆیدا کردو منیش لە شانیم دا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کوڕەکەمت ئازاردا خوا ڕوحمت پێ بکات.

**٣٩٢٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنْ رُؤْيَا النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ امْرَأَةً سَوْدَاءَ ثَائِرَةَ الرَّأْسِ، خَرَجَتْ مِنَ الْمَدِينَةِ حَتَّى قَامَتْ بِالْمَهْيَعَةِ، وَهِيَ الْجُحْفَةُ، فَأَوَّلْتُهَا وَبَاءً بِالْمَدِينَةِ، فَنُقِلَ إِلَى الْجُحْفَةِ»[١].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر رضي الله عنهما لەبارەی خەوەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ (لە پێغەمبەرەوە ﷺ) گێڕاویەتەوە، فەرموویەتی: لە خەومدا ئافرەتێکی ڕەشتاڵەم بینی کە قژی پەرش و بڵاوبوو، لە مەدینە دەرچوو تاکو گەیشتە مەهیەعە کە جوحفەیە (شوێنێکە)، وە منیش خەوەکەم بەوە لێکدایەوە کە پەتایەکە لە مەدینەوە دەگوازرێتەوە بۆ جوحفە.

**٣٩٢٥-** عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ رضي الله عنه، أَنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ بَلِيٍّ قَدِمَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَ إِسْلَامُهُمَا جَمِيعًا، فَكَانَ أَحَدُهُمَا أَشَدَّ اجْتِهَادًا مِنَ الْآخَرِ، فَغَزَا الْمُجْتَهِدُ مِنْهُمَا فَاسْتُشْهِدَ، ثُمَّ مَكَثَ الْآخَرُ بَعْدَهُ سَنَةً، ثُمَّ تُوُفِّيَ، قَالَ طَلْحَةُ: فَرَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ: بَيْنَا أَنَا عِنْدَ بَابِ الْجَنَّةِ، إِذَا أَنَا بِهِمَا، فَخَرَجَ خَارِجٌ مِنَ الْجَنَّةِ، فَأَذِنَ لِلَّذِي تُوُفِّيَ الْآخِرَ مِنْهُمَا، ثُمَّ خَرَجَ، فَأَذِنَ لِلَّذِي اسْتُشْهِدَ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَيَّ، فَقَالَ: ارْجِعْ، فَإِنَّكَ لَمْ يَأْنِ لَكَ بَعْدُ، فَأَصْبَحَ طَلْحَةُ يُحَدِّثُ بِهِ النَّاسَ، فَعَجِبُوا لِذَلِكَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَحَدَّثُوهُ الْحَدِيثَ، فَقَالَ: «مِنْ أَيِّ ذَلِكَ تَعْجَبُونَ؟» فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا كَانَ أَشَدَّ الرَّجُلَيْنِ اجْتِهَادًا، ثُمَّ اسْتُشْهِدَ، وَدَخَلَ هَذَا الْآخِرُ الْجَنَّةَ قَبْلَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَيْسَ قَدْ مَكَثَ هَذَا بَعْدَهُ سَنَةً؟» قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «وَأَدْرَكَ رَمَضَانَ فَصَامَ، وَصَلَّى كَذَا وَكَذَا مِنْ سَجْدَةٍ فِي السَّنَةِ؟» قَالُوا: بَلَى، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَمَا بَيْنَهُمَا أَبْعَدُ مِمَّا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ»[٢].

واتە: تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، دوو پیاو لە بەلییەوە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وە هەردووکیان بەیەکەوە مسوڵمان بوون، جا یەکێکیان زۆر هەوڵ و ماندووبوونی لەوەی تریان زیاتر بوو، جا ئەوەیان کە تێکۆشان و ماندووبوونی زیاتر بوو چوو بۆ جەنگ و جەنگی کردو شەهید بوو، پاشان ئەوەی تریان ساڵێک دوای

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٣٨، والترمذي: ٢٢٩٠.

(٢) صحيح لغيره.





ئەو ژیاو دواتر وەفاتی کرد. تەڵحە گوتی: جا لە خەومدا بینیم کە لەلای دەرگای بەهەشت بووم و ئەو دووانەشم لەلا بوو، جا کەسێک لە بەهەشتەوە هاتە دەرێ و ڕێگەی بەوەیاندا کە دواتر وەفاتی کردبوو بچێتە بەهەشتەوە، دواتر هاتە دەرەوەو ڕێگەی بەوەیاندا کە شەهید بوو بچێتە ناو بەهەشتەوە، پاشان گەڕایەوە بۆلای من و گوتی: بگەڕێوە، چونکە تۆ تاوەکو ئێستا کاتی چوونە ناو بەهەشتت نەهاتووە. جا تەڵحە کە بەیانی کردەوە ئەوەی بۆ خەڵکی دەگێڕایەوەو ئەوانیش سەریان لەوە سوڕما، جا ئەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتەوەو باسەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئنجا فەرمووی: بۆچی پێتان سەیرەو سەرتان سوڕماوە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیان زۆر لەوەی تریان هەوڵ و ماندووبوونی زیاتر بوو پاشان شەهید بوو، وە ئەوەی تریان لەپێش ئەودا چۆیە ناو بەهەشت! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ساڵێک لەدوای ئەو نەژیا؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: وە بە ڕەمەزان گەیشتەوەو بەڕۆژوو بوو نوێژی کردو ئەوەو ئەوەی کردو ئەو سوجدانەشی کە لەو ساڵەدا بردی، گوتیان: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەواتە ئەوەی کە لە نێوانیان دایە زۆر زیاترەو دوورترە لە دووری نێوان ئاسمان و زەوی.

**٣٩٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَكْرَهُ الْغِلَّ، وَأُحِبُّ الْقَيْدَ، الْقَيْدُ ثَبَاتٌ فِي الدِّينِ»**[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من زنجیری ملم لە خەودا پێ ناخۆشە، بەڵام پێوەندم پێ خۆشە (کە دەکرێتە پێ)، پێوەند نیشانەی دامەزراوییە لەسەر دین.



(١) ضعيف مرفوعاً. صحيح موقوفاً. أخرجه البخاري بإثر: ٧٠١٧ موقوفاً. وانظر: ما تقدم ٣٨٩٤.

## بابەت: وازهێنان لەو کەسەی دەڵێ: "لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ"

**٣٩٢٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا، عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ ﷻ»[1].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم هەتا شایەتمان دێنن و دەڵێن: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»، جا ئەگەر ئەوەیان گوت، ئەوە خوێن و ماڵیان دەپارێزرێت بە هەقی ئیسلام نەبێت، دوای ئەوە لێپرسینەوەیان لەلای خوایە ﷻ.

**٣٩٢٨-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ، وَأَمْوَالَهُمْ، إِلَّا بِحَقِّهَا، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ»[2].

**واتە:** جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم هەتا شایەتمان دێنن و دەڵێن: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»، جا ئەگەر گوتیان: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»، ئەوە خوێن و ماڵیان دەپارێزرێت بە هەقی ئیسلام نەبێت، دوای ئەوە لێپرسینەوەیان لەلای خوایە.

**سەرنج:** ئەم فەرموودەیە زیاتر پەیوەندی بە سیاسەتی شەرعییەوە هەیە، پێویستە لەگەڵ فەرموودەکانی تری هاوشێوەی بە یەکەوە کۆ بکرێنەوەو کەسانی پسپۆڕ لە سیاسەتی شەرعیدا هەڵهێنجانیان بۆ بکەن. هەروەکو خوا دەفەرموێ: ﴿فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ النحل، واتە: دەی پرسیار بکەن لە زانایان ئەگەر ئێوە نازانن.

**٣٩٢٩-** عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ سَالِمٍ، أَنَّ عَمْرَو بْنَ أَوْسٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَاهُ أَوْسًا أَخْبَرَهُ، قَالَ: إِنَّا لَقُعُودٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، وَهُوَ يَقُصُّ عَلَيْنَا، وَيُذَكِّرُنَا، إِذْ أَتَاهُ رَجُلٌ فَسَارَّهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اذْهَبُوا بِهِ فَاقْتُلُوهُ»، فَلَمَّا وَلَّى الرَّجُلُ، دَعَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «هَلْ تَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ؟» قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «اذْهَبُوا فَخَلُّوا سَبِيلَهُ، فَإِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ، حَرُمَ عَلَيَّ دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٤٦، ومسلم: ٢١، وأبو داود: ٢٦٤٠، والترمذي: ٢٦٠٦، والنسائي: ٣٠٩٠ و ٣٠٩٥ و ٣٩٧١ و ٣٩٧٢ و ٣٩٧٤ و ٣٩٧٦ و ٣٩٧٨.

(٢) صحيح متواتر. أخرجه مسلم: ٢١/٣٥، والترمذي: ٣٣٤١.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٣٩٨٠_٣٩٨٣.

واتە: نوعمانی کوڕی سالم دەگێڕێتەوە کە عەمری کوڕی ئەوس هەواڵی پێداوە کە باوکی ئەوسﷺ هەواڵی پێداوە و دەڵێ: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، وە ئەویش بۆی دەگێڕاینەوەو بۆی باس دەکردین و وەبیری دەهێنانینەوە کە پیاوێک هاتۆتە خزمەتی و بە نهێنی قسەی لەگەڵدا کردوە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیبەن و بیکوژن، جا کاتێ پیاوەکە دوورکەوتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردو فەرمووی: ئایا شایەتومان دێنی و دەڵێی: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: بڕۆن و ڕێگای بەردەن با بڕوا، چونکە من فەرمانم پێکراوە کە لەگەڵ خەڵکی بجەنگم هەتا شایەتمان دێنن و دەڵێن: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»، جا ئەگەر ئەوەیان کرد ئەوە خوێن و ماڵیان لەسەر من حەڕام دەبێت.

٣٩٣٠- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، قَالَ: أَتَى نَافِعُ بْنُ الْأَزْرَقِ وَأَصْحَابُهُ، فَقَالُوا: هَلَكْتَ يَا عِمْرَانُ قَالَ: مَا هَلَكْتُ، قَالُوا: بَلَى، قَالَ: مَا الَّذِي أَهْلَكَنِي؟ قَالُوا: قَالَ اللَّهُ: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ﴿٣٩﴾ ﴾ الأنفال، قَالَ: قَدْ قَاتَلْنَاهُمْ حَتَّى نَفَيْنَاهُمْ، فَكَانَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ، إِنْ شِئْتُمْ حَدَّثْتُكُمْ، حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالُوا: وَأَنْتَ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَقَدْ بَعَثَ جَيْشًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِلَى الْمُشْرِكِينَ، فَلَمَّا لَقُوهُمْ قَاتَلُوهُمْ قِتَالًا شَدِيدًا، فَمَنَحُوهُمْ أَكْتَافَهُمْ، فَحَمَلَ رَجُلٌ مِنْ لُحْمَتِي عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ بِالرُّمْحِ، فَلَمَّا غَشِيَهُ، قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، إِنِّي مُسْلِمٌ، فَطَعَنَهُ فَقَتَلَهُ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكْتُ، قَالَ: «وَمَا الَّذِي صَنَعْتَ؟» مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ، فَأَخْبَرَهُ بِالَّذِي صَنَعَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَهَلَّا شَقَقْتَ عَنْ بَطْنِهِ فَعَلِمْتَ مَا فِي قَلْبِهِ؟» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ شَقَقْتُ بَطْنَهُ لَكُنْتُ أَعْلَمُ مَا فِي قَلْبِهِ، قَالَ: «فَلَا أَنْتَ قَبِلْتَ مَا تَكَلَّمَ بِهِ، وَلَا أَنْتَ تَعْلَمُ مَا فِي قَلْبِهِ»، قَالَ: فَسَكَتَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمْ يَلْبَثْ إِلَّا يَسِيرًا حَتَّى مَاتَ، فَدَفَنَّاهُ فَأَصْبَحَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ، فَقَالُوا: لَعَلَّ عَدُوًّا نَبَشَهُ، فَدَفَنَّاهُ، ثُمَّ أَمَرْنَا غِلْمَانَنَا يَحْرُسُونَهُ، فَأَصْبَحَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ، فَقُلْنَا: لَعَلَّ الْغِلْمَانَ نَعَسُوا، فَدَفَنَّاهُ، ثُمَّ حَرَسْنَاهُ بِأَنْفُسِنَا، فَأَصْبَحَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ، فَأَلْقَيْنَاهُ فِي بَعْضِ تِلْكَ الشِّعَابِ[1].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: نافیعی کوڕی ئەزرەق و هاوڕێکانی هاتن و گوتیان: ئەی عیمران تۆ بەهیلاک چووی، گوتی: نەخێر بەهیلاک نەچووم،

---

(١) حسن لغيره.

گوتیان: بەڵێ (بەهیلاک چووی)، گوتی: چ شتێک بەهیلاکی بردووم؟ گوتیان: خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ﴿٣٩﴾ ﴾ الأنفال، واتە: (باوەڕداران) جەنگ بکەن لەگەڵ بێ باوەڕاندا هەتا ئاژاوە (بێ باوەڕی و بت پەرستی) نامێنێت و ئاین و ملکەچی هەمووی بۆ خوا دەبێت. گوتی: بێگومان ئێمە شەڕمان لەگەڵیان کرد تاوەکو دوورمان خستنەوە، وە ئیتر دین هەمووی هی خوا بوو، ئەگەر پێتان خۆشە فەرموودەیەکتان بۆ دەگێڕمەوە کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە، گوتیان: تۆ لە پێغەمبەری خوات ﷺ بیستووە؟! گوتی: بەڵێ، بینیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی لە مسوڵمانان نارد بۆ سەر هاوبەشدانەرەکان، جا کاتێ پێیان گەیشتن جەنگێکی سەختیان لەگەڵ کردن، وە بەسەریاندا زاڵبوون، جا یەکێ لە مسوڵمانان کە خزمی خۆم بوو ڕمی لە هاوبەشدانەرێک بەرزکردەوە، جا کاتێ بەسەریدا زاڵ بوو (هاوبەشدانەرەکە) گوتی: شایەتی دەدەم کە هیچ خودایەکی بەهەق نیە جگە لە الله، وە من مسوڵمانم، ئەویش لێیداو کوشتی، ئنجا هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەهیلاک چووم، جارێک یان دوو جار فەرمووی: بۆ چیت کردوە؟ ئەویش ئەوەی کە کردبووی بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا سینەت شەقکردو بزانی کە دڵی چی تێدایە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆ ئەگەر سینەیم شەق کردبا ئەوە دەمزانی دڵی چی تێدایە، فەرمووی: کەواتە تۆ نە ئەوەی کە گوتویەتی لێت قەبوڵ کردووەو نەشت زانیوە کە چی لە دڵی دایە!! (ڕاوی) گوتی: جا پێغەمبەری خوا ﷺ لێی بێدەنگ بوو (هیچی تری نەگوت)، جا ئەو کابرایە ماوەیەکی کەمی پێچوو وەفاتی کرد، ئێمەش ناشتمان و بۆ بەیانی (جەستەکەی) هاتبۆیەوە سەر ڕووی زەوی، گوتمان: لەوانەیە دوژمنێکی دەری هێنابێتەوە، جا ناشتمانەوە، پاشان فەرمانمان کرد بە هەندێ لە گەنجەکانمان کە چاودێری بکەن، جا بەیانییەکەی (جەستەکە) هاتبۆوە سەر ڕووی زەوی، گوتمان: لەوانەیە گەنجەکان شەو خەویان لێکەوتبێ، جا ناشتمانەوەو پاشان بۆخۆمان چاودێریمان کرد، جا بەیانییەکەی هەر هاتەوە سەر ڕووی زەوی، ئیتر ئێمەش فڕێمان دایە ناو یەکێک لەو شیوو ڕێچکانەوە.

**٣٩٣٠م-** حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ حَفْصٍ الْأُبُلِّيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنِ السُّمَيْطِ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَرِيَّةٍ، فَحَمَلَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَزَادَ فِيهِ، فَنَبَذَتْهُ الْأَرْضُ: فَأُخْبِرَ النَّبِيُّ ﷺ، وَقَالَ: «إِنَّ الْأَرْضَ لَتَقْبَلُ مَنْ هُوَ شَرٌّ مِنْهُ، وَلَكِنَّ اللَّهَ أَحَبَّ أَنْ يُرِيَكُمْ تَعْظِيمَ حُرْمَةِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»[1].

له گێڕانەوەیەکی تردا عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ له جەنگێکدا ناردینی، جا پیاوێ له مسوڵمانان چەکی له یەکێ له هاوبەشدانەران بەرزکردەوەو هەڵیکوتایە سەر، وە فەرموودەکەی (بەهەمان شێوەی فەرموودەی پێشتر) گێڕایەوە، وە ئەوەشی لێ زیادکرد: جا زەوی فڕێیدایەوە دەرێ، جا هەواڵ درا بە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: بەڕاستی زەوی کەسی لەویش خراپتر لەخۆی دەگرێ، بەڵام خوا پێی خۆشبوو کە گەورەیی و ڕێزی «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»تان نیشان بدات.

## بابەت: حەرامییەتی (پارێزراوی) خوێن و ماڵی برِوادار

**٣٩٣١-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: «أَلَا إِنَّ أَحْرَمَ الْأَيَّامِ يَوْمُكُمْ هَذَا، أَلَا وَإِنَّ أَحْرَمَ الشُّهُورِ شَهْرُكُمْ هَذَا، أَلَا وَإِنَّ أَحْرَمَ الْبَلَدِ بَلَدُكُمْ هَذَا، أَلَا وَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلَا هَلْ بَلَّغْتُ؟» قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «اللَّهُمَّ اشْهَدْ»[2].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ له حەجی ماڵئاوایدا فەرمووی: ئاگاداربن لە حەرامترین ڕۆژەکان ئەمڕۆتانە، وە ئاگاداربن لە حەرامترین مانگەکانتان ئەم مانگەتانە، وە ئاگاداربن لە حەرامترین شارەکانتان ئەم شارەیە، وە ئاگاداربن کە خوێن و ماڵتان بۆ یەکتری حەرامە وەکو حەرامی ئەو ڕۆژەتان لەو مانەگەتانداو لەو شارەتاندا، (پاشان فەرمووی:) ئایا گەیاندم؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: خوایە گیان شاهید بە.

---

(١) حسن لغيره.

(٢) صحيح.

٣٩٣٢- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ ﵄، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ، وَيَقُولُ: «مَا أَطْيَبَكِ وَأَطْيَبَ رِيحَكِ، مَا أَعْظَمَكِ وَأَعْظَمَ حُرْمَتَكِ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَحُرْمَةُ الْمُؤْمِنِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ حُرْمَةً مِنْكِ، مَالِهِ، وَدَمِهِ، وَأَنْ نَظُنَّ بِهِ إِلَّا خَيْرًا»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ تەوافی کەعبەی دەکردو دەیفەرموو: چەندە پاک و خاوێنی و بۆنت چەندە پاک و خۆشە! چەندە گەورەو پایەداری و چەندە شکۆدارو ڕێزداری! سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی ﷺ بەدەستە حەرامی و ڕێزو گەورەیی ماڵ و خوێنی بڕوادار لەلای خوا لە ڕێزو گەورەیی تۆ زیاترە، وە بێگومان تەنها گومانی باش نەبێ هیچ گومانێکی دیکەی پێ نابەین.

٣٩٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ، دَمُهُ، وَمَالُهُ، وَعِرْضُهُ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوێن و ماڵ و ناموسی هەر مسوڵمانێک بۆ مسوڵمانێکی تر حەڕامە.

٣٩٣٤- عَنْ عَمْرِو بْنِ مَالِكٍ الْجَنْبِيِّ ﵁، أَنَّ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ حَدَّثَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «الْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ الْخَطَايَا وَالذُّنُوبَ»[3].

واتە: فەزالەی کوڕی عوبەید ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار ئەو کەسەیە خەڵکی بۆ ماڵ و نەفسی خۆیان لێی ئەمین بن، وە موهاجیر ئەو کەسەیە کە لە تاوان و خراپەکاری دووردەکەوێتەوە.

## بابەت: ڕێگری کردن لە شت فڕاندن

٣٩٣٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ انْتَهَبَ نُهْبَةً مَشْهُورَةً، فَلَيْسَ مِنَّا»[4].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٥٦٤، وأبو داود: ٤٨٨٢، والترمذي: ١٩٢٧.

(٣) صحيح.

(٤) ضعيف. انظر أبو داود: ٤٣٩١ و ٤٣٩٢، والترمذي: ١٤٤٨، والنسائي: ٤٩٧١_٤٩٧٥.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ بە ئاشکرایی (شت) بفڕێنێ لە ئێمە نیە.

**٣٩٣٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَنْتَهِبُ نُهْبَةً يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ أَبْصَارَهُمْ حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ»[١].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زیناکار لەکاتی زیناکردندا ئیمانی نیە، وە شەڕابخۆر لەکاتی شەڕاب خواردنەوەدا ئیمانی نیە، وە دز لەکاتی دزیکردندا ئیمانی نیە، وە ئەو کەسەشی کە بە ئاشکرا شت دەفڕێنێ و لەکاتی شت فڕاندنەکەیدا خەڵکی چاویان لێیەتی و دەیبینن ئیمانی نیە.

**٣٩٣٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنِ انْتَهَبَ نُهْبَةً، فَلَيْسَ مِنَّا»[٢].**

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ شت بفڕێنێ لە ئێمە نیە.

**٣٩٣٨- عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ الْحَكَمِ ﷺ، قَالَ: أَصَبْنَا غَنَمًا لِلْعَدُوِّ فَانْتَهَبْنَاهَا، فَنَصَبْنَا قُدُورَنَا، فَمَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِالْقُدُورِ، فَأَمَرَ بِهَا فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ النُّهْبَةَ لَا تَحِلُّ»[٣].**

واتە: سەعلەبەی کوڕی حەکەم ﷺ دەڵێ: مەڕی دوژمنمان دەست کەوت و فڕاندمان، ئنجا مەنجەڵەکانمان حازرکرد، جا پێغەمبەر ﷺ بەلای مەنجەڵەکاندا ڕۆیشت و فەرمانی کرد (کە بڕێژرێن)، ئیتر ڕژێنران، پاشان فەرمووی: شت فڕاندن حەڵاڵ نیە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٧٥، ومسلم: ٥٧، وأبو داود: ٤٦٨٩، والترمذي: ٢٦٢٥، والنسائي: ٤٨٧٠_٤٨٧٢ و ٥٦٥٩ و ٥٦٦٠.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٥٨١ مختصراً، والترمذي: ١١٢٣، والنسائي: ٣٣٣٥ و ٣٥٩٠ و ٣٥٩١.

(٣) صحيح.

## بابەت: جنێودان بە مسوڵمان دەرچوونە لە فەرمانی خواو شەڕ لەگەڵ کردنیشی کوفرە

٣٩٣٩- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»(١).

واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جنێودان بە مسوڵمان دەرچوونە لە فەرمانی خواو شەڕ لەگەڵ کردنیشی کوفرە.

٣٩٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جنێودان بە مسوڵمان دەرچوونە لە فەرمانی خواو شەڕ لەگەڵ کردنیشی کوفرە.

٣٩٤١- عَنْ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»(٣).

واتە: سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جنێودان بە مسوڵمان دەرچوونە لە فەرمانی خواو شەڕ لەگەڵ کردنیشی کوفرە.

## بابەت: ڕێگری کردن لە گەڕانەوە بۆ سەر کوفرو جەنگ لەگەڵ یەکتر کردن

٣٩٤٢- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: «اسْتَنْصِتِ النَّاسَ»، فَقَالَ: «لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»(٤).

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا فەرمووی: خەڵکی بێدەنگ بکە، ئنجا فەرمووی: لەدوای من مەگەڕێنەوە بۆ سەر کوفر (بە جۆرێک) هەندێکتان لە ملی هەندێکتان بدەن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨، ومسلم: ٦٤، والترمذي: ١٩٨٣ و ٢٦٣٤ و ٢٦٣٥، والنسائي: ٤١٠٥_٤١١٣.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٤١٠٤.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢١، ومسلم: ٦٥، والنسائي: ٤١٣١_٤١٢٧.

٣٩٤٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «وَيْحَكُمْ، أَوْ وَيْلَكُمْ، لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاوار بۆ ئێوە یان وەیل بۆ ئێوە لەدوای من مەگەڕێنەوە بۆ سەر کوفر (بە جۆرێک) هەندێکتان لە ملی هەندێکتان بدەن.

٣٩٤٤- عَنِ الصُّنَابِحِ الْأَحْمَسِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا إِنِّي فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ، وَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الْأُمَمَ فَلَا تَقْتَتِلُنَّ بَعْدِي»[٢].

واتە: صونابیحی ئەحمەسیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من لەسەر حەوز (حەوزی کەوسەر) چاوەڕێتانم، وە من شانازی بە زۆری ئێوەوە دەکەم لەناو ئوممەتەکانی تردا، بۆیە لەدوای من شەڕ لەگەڵ یەکتردا مەکەن (یان یەکتر مەکوژن).

## بابەت: ئەوەی کە مسوڵمانان لە ئەمانەتی خوای ﷻ دان

٣٩٤٥- عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فَهُوَ فِي ذِمَّةِ اللَّهِ، فَلَا تُخْفِرُوا اللَّهَ فِي عَهْدِهِ، فَمَنْ قَتَلَهُ طَلَبَهُ اللَّهُ حَتَّى يَكُبَّهُ فِي النَّارِ، عَلَى وَجْهِهِ»[٣].

واتە: ئەبو بەکری صدیق ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژی بەیانی بکات لە پارێزگاری خوادایە، جا ئەو پەیمانەی خوا مەشکێنن، جا هەر یەکێک (ئەو کەسەی لە پارێزگاری خوادایە) بکوژێ، ئەوە خوا داوای مافی لە بکوژەکە دەکات و بۆی وەردەگرێتەوە تاوەکو لەسەر ڕوو فڕێی دەداتە ناو دۆزەخ.

٣٩٤٦- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فَهُوَ فِي ذِمَّةِ اللَّهِ ﷻ»[٤].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ نوێژی بەیانی بکات ئەوە لە پارێزگاری و ئەمان و پەیمانی خوای ﷻ دایە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٦٦، ومسلم: ٦٦، وأبو داود: ٤٦٨٦، والنسائي: ٤١٢٥_٤١٢٧.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح لغيره.




**٣٩٤٧-** عَنْ أَبُو الْمُهَزِّمِ يَزِيدُ بْنُ سُفْيَانَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤْمِنُ أَكْرَمُ عَلَى اللَّهِ ﷻ، مِنْ بَعْضِ مَلَائِكَتِهِ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار لەلای خوای ﷻ بەڕێزترە لە هەندێ لە فریشتەکان.

## بابەت: دەمارگیری

**٣٩٤٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَاتَلَ تَحْتَ رَايَةٍ عِمِّيَّةٍ، يَدْعُو إِلَى عَصَبِيَّةٍ، أَوْ يَغْضَبُ لِعَصَبِيَّةٍ، فَقِتْلَتُهُ جَاهِلِيَّةٌ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک لەژێر ئاڵایەکدا شەڕ بکات کە نەزانێ شەڕەکە لەسەر چییە بەڵکو تەنها لەبەر دەمارگیری و ڕەگەزپەرستی بێ و بانگەوازی بۆ بکات و بەرگری لێبکات، ئەوە کوژرانەکەی وەکو کوژرانی سەردەمی نەفامییە.

**٣٩٤٩-** عَنْ عَبَّادِ بْنِ كَثِيرٍ الشَّامِيِّ ﷺ، عَنِ امْرَأَةٍ مِنْهُمْ يُقَالُ لَهَا فُسَيْلَةُ، قَالَتْ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ، سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمِنَ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُحِبَّ الرَّجُلُ قَوْمَهُ؟ قَالَ: «لَا، وَلَكِنْ مِنَ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُعِينَ الرَّجُلُ قَوْمَهُ عَلَى الظُّلْمِ»[٣].

واتە: عەببادی کوڕی کەسیری شامیی ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک لەوانەوە کە پێی دەگوترا: فوسەیلە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە باوکم بوو دەیگوت: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کردو گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر پیاو قەوم و هۆزی خۆی خۆشبوێ ئەوە لە دەمارگیرییەوە؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵکو ئەوە لە دەمارگیرییەوەیە کە پیاو لەسەر زوڵم و ستەم یارمەتی هۆزەکەی بدات.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٤٨، والنسائي: ٤١١٤.

(٣) حسن بطرقه. أخرجه أبو داود: ٥١١٩ بنحوه.

## بابەت: ئەو کۆمەڵەی کە زۆرترینە (لەڕووی ژمارەوە)

٣٩٥٠- عَنْ أَبُو خَلَفٍ الْأَعْمَى ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّ أُمَّتِي لَا تَجْتَمِعُ عَلَى ضَلَالَةٍ، فَإِذَا رَأَيْتُمُ اخْتِلَافًا فَعَلَيْكُمْ بِالسَّوَادِ الْأَعْظَمِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی ئوممەتەکەی من لەسەر گومڕایی کۆنابنەوە، جا ئەگەر ناکۆکی و ڕاجیاییەکتان بینی، ئەوە لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیە بن کە زۆرترینە (لە ڕووی ژمارەوە).

## بابەت: ئەوەی لە ئاشووب و فیتنە دەکەوێتەوە

٣٩٥١- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَوْمًا صَلَاةً، فَأَطَالَ فِيهَا، فَلَمَّا انْصَرَفَ قُلْنَا: - أَوْ قَالُوا: - يَا رَسُولَ اللَّهِ أَطَلْتَ الْيَوْمَ الصَّلَاةَ، قَالَ: «إِنِّي صَلَّيْتُ صَلَاةَ رَغْبَةٍ وَرَهْبَةٍ، سَأَلْتُ اللَّهَ ﷻ لِأُمَّتِي ثَلَاثًا، فَأَعْطَانِي اثْنَتَيْنِ وَرَدَّ عَلَيَّ وَاحِدَةً، سَأَلْتُهُ أَنْ لَا يُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ غَيْرِهِمْ، فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يُهْلِكَهُمْ غَرَقًا، فَأَعْطَانِيهَا، وَسَأَلْتُهُ أَنْ لَا يَجْعَلَ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ، فَرَدَّهَا عَلَيَّ»[2].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان نوێژێکی کردو درێژی کردەوە، جا کاتێ لێبۆیەوە، گوتمان یان گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوڕۆ نوێژت درێژ کردەوە! فەرمووی: من نوێژی ئومێد بە خواو ترسان لە خوام کرد، داوای سێ شتم بۆ ئوممەتەکەم لە خوای ﷻ کرد، جا دووانی پێبەخشیم و دانەیەکیشی ڕەت کردەوەو پێی نەبەخشیم، داوام لێکرد کە لە غەیری خۆیان هیچ دوژمنێکیان بەسەردا زاڵ نەکات، جا ئەوەی پێ بەخشیم، وە داوام لێکرد کە بە لافاوو نقوم بوون لەناویان نەبات، وە ئەوەشی پێ بەخشیم، وە داواشم لێکرد کە شەڕو ئاژاوەو پارچە پارچە بوون لەناو خۆیاندا سەرهەڵنەدات، جا ئەوەی ڕەت کردەوەو پێی نەبەخشیم.

---

(١) ضعيف جداً دون الجملة الأولى، فهي صحيحة.

(٢) حسن.

**٣٩٥٢-** عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «زُوِيَتْ لِي الْأَرْضُ حَتَّى رَأَيْتُ مَشَارِقَهَا، وَمَغَارِبَهَا، وَأُعْطِيتُ الْكَنْزَيْنِ، الْأَصْفَرَ أَوِ الْأَحْمَرَ، وَالْأَبْيَضَ، يَعْنِي الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ، وَقِيلَ لِي: إِنَّ مُلْكَكَ إِلَى حَيْثُ زُوِيَ لَكَ، وَإِنِّي سَأَلْتُ اللَّهَ ﷻ ثَلَاثًا، أَنْ لَا يُسَلِّطَ عَلَى أُمَّتِي جُوعًا فَيُهْلِكَهُمْ بِهِ عَامَّةً، وَأَنْ لَا يَلْبِسَهُمْ شِيَعًا، وَيُذِيقَ بَعْضَهُمْ بَأْسَ بَعْضٍ، وَإِنَّهُ قِيلَ لِي: إِذَا قَضَيْتُ قَضَاءً فَلَا مَرَدَّ لَهُ، وَإِنِّي لَنْ أُسَلِّطَ عَلَى أُمَّتِكَ جُوعًا فَيُهْلِكَهُمْ فِيهِ، وَلَنْ أَجْمَعَ عَلَيْهِمْ مِنْ بَيْنَ أَقْطَارِهَا حَتَّى يُفْنِيَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا، وَيَقْتُلَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا، وَإِذَا وُضِعَ السَّيْفُ فِي أُمَّتِي، فَلَنْ يُرْفَعَ عَنْهُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَإِنَّ مِمَّا أَتَخَوَّفُ عَلَى أُمَّتِي أَئِمَّةً مُضِلِّينَ، وَسَتَعْبُدُ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِي الْأَوْثَانَ، وَسَتَلْحَقُ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِي بِالْمُشْرِكِينَ، وَإِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ دَجَّالِينَ كَذَّابِينَ، قَرِيبًا مِنْ ثَلَاثِينَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، وَلَنْ تَزَالَ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى الْحَقِّ مَنْصُورِينَ، لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ ﷻ» قَالَ أَبُو الْحَسَنِ: لَمَّا فَرَغَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ مِنْ هَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: «مَا أَهْوَلَهُ»[1].

واتە: سەوبان ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەویم بۆ کۆکرایەوەو هێنرایە بەرچاوم تاوەکو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواییم بینی، وە دوو گەنجینەی زەرد یان سورو سپیم پێدرا، (ڕاوی دەڵێ:) مەبەستی پێ لە زێڕو زیوە، وە پێم گوترا: بێگومان دەسەڵات و قەڵەمڕەویت تا ئەو شوێنەیە کە نیشانت درا، وە من داوای سێ شتم لە خوای ﷻ کرد: کە برسییەتییەک بەسەر ئوممەتەکەمدا زاڵ نەکات بەگشتی لەناویان بەرێت، وە توشی پارچە پارچە بوون نەبن و هەندێکیان ئازاری هەندێکیان نەچێژن، وە بەڕاستی پێم گوترا: ئەگەر فەرمانێکم دەرکردو بڕیارێکمدا ئەوە ڕەت بوونەوەی نیە، وە من برسییەتییەک زاڵ ناکەم بەسەر ئوممەتەکەتدا کە تێیدا لەناوبچن، وە ئەگەر دوژمنان لە هەموو لایەکی زەوییەوە کۆببنەوەو گەلەکۆمەکیتان لێ بکەن دەرەقەتتان نایەن تاوەکو خۆخۆر نەبن و هەندێکتان هەندێکتان نەکوژن، وە ئەگەر جەنگ و ئاژاوە کەوتە ناو ئوممەتەکەی من ئەوە تا ڕۆژی دوایی بەردەوام دەبێت لێرەو لەوێ، وە ترسی هەرە گەورەم لە پێشەواو سەرۆکە سەرکەش و گومڕاکانە کە خەڵک بانگ دەکەن بۆ تاوان و خراپەکاری و بیدعەو گومڕایان دەکەن، وە چەند تیرەو هۆزێ لە ئوممەتی من بت دەپەرستنەوە، وە چەند تیرەو هۆزێ لە ئوممەتەکەم پەیوەندی دەکەن بە هاوبەش بۆ خوا دانەرانەوە،

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٢٠، وأبو داود: ٤٢٥٢، والترمذي: ٢١٧٦.




وە لە ئێستاوە تاوەکو ڕۆژی دوایی چەندان دەجالی درۆزن پەیدا دەبن کە نزیکەی سی کەس دەبن کە هەموویان وا گومان دەبەن و خۆیان بە پێغەمبەر دەزانن، وە بەردەوام کۆمەڵێ لە ئوممەتەکەم لە هەقدا سەرکەوتوون و ئەوەی دژیان بێ زیانیان پێ ناگەیەنێ هەتا فەرمانی خوای ﷻ دێت (واتە: قیامەت). ئەبولحەسەن گوتی: کاتێ عەبدوڵڵا لە (گێڕانەوەی) ئەو فەرموودەیە بۆیەوە گوتی: چەندە سامناک و ترسێنەرە!

**٣٩٥٣-** عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ نَوْمِهِ، وَهُوَ مُحْمَرٌّ وَجْهُهُ، وَهُوَ يَقُولُ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ، وَمَأْجُوجَ» وَعَقَدَ بِيَدَيْهِ عَشَرَةً، قَالَتْ زَيْنَبُ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: «إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ»(١).

واتە: زەینەبی کچی جەحش ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەو هەڵساو دەم و چاوی سوور هەڵگەڕابوو، وە دەیفەرموو: هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە الله، هاوار بۆ عەرەب لە بەڵاو کارەساتێکی گەورە کە نزیکی بۆتەوە، وە بە پەنجەی دەستەکانی بازنەیەکی دروستکردو (فەرمووی:) ئەمڕۆ بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجوج ئەوەندەی ئەمە کونی تێ بووە. زەینەب گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لەناودەچین لەکاتێکدا پیاوچاکانمان لەناودایە؟ فەرمووی: بەڵێ کاتێ تاوان و خراپەکاری زۆر بوو.

**٣٩٥٤-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَتَكُونُ فِتَنٌ يُصْبِحُ الرَّجُلُ فِيهَا مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا، إِلَّا مَنْ أَحْيَاهُ اللَّهُ بِالْعِلْمِ»(٢).

واتە: ئەبو ئومامە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ئایندەیەکی نزیکدا فیتنەو ئاژاوەیەکی وا ڕوودەدات کە پیاو بە مسوڵمانی بەیانی دەکاتەوەو بە کافری ئێوارە دەکاتەوە، مەگەر کەسێک خوا بە زانست و زانیاری بیژیێنێت و بیپارێزێت و دەربازی بکات.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٤٦، ومسلم: ٢٨٨٠، والترمذي: ٢١٨٧.

(٢) ضعيف جداً.

**٣٩٥٥- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ عُمَرَ، فَقَالَ: أَيُّكُمْ يَحْفَظُ حَدِيثَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْفِتْنَةِ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ فَقُلْتُ: أَنَا، قَالَ: إِنَّكَ لَجَرِيءٌ، قَالَ: كَيْفَ؟ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ، تُكَفِّرُهَا الصَّلَاةُ وَالصِّيَامُ وَالصَّدَقَةُ، وَالْأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ، وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ»، فَقَالَ عُمَرُ: لَيْسَ هَذَا أُرِيدُ، إِنَّمَا أُرِيدُ الَّتِي تَمُوجُ كَمَوْجِ الْبَحْرِ، فَقَالَ: مَا لَكَ وَلَهَا يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ؟ إِنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا، قَالَ: فَيُكْسَرُ الْبَابُ أَوْ يُفْتَحُ؟ قَالَ: لَا، بَلْ يُكْسَرُ، قَالَ: ذَاكَ أَجْدَرُ أَنْ لَا يُغْلَقَ قُلْنَا لِحُذَيْفَةَ: أَكَانَ عُمَرُ يَعْلَمُ مَنِ الْبَابُ؟ قَالَ: «نَعَمْ، كَمَا يَعْلَمُ أَنَّ دُونَ غَدٍ اللَّيْلَةَ، إِنِّي حَدَّثْتُهُ حَدِيثًا لَيْسَ بِالْأَغَالِيطِ»، فَهِبْنَا أَنْ نَسْأَلَهُ، مَنِ الْبَابُ؟ فَقُلْنَا لِمَسْرُوقٍ: سَلْهُ، فَسَأَلَهُ، فَقَالَ عُمَرُ[1].**

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: ئێمە لەلای پێشەوا عومەر دانیشتبووین، جا گوتی: کێ لە ئێوە ئەوەی لەبەرکردوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی فیتنەو ئاژاوە فەرموویەتی؟ حوزەیفە گوتی: گوتم: من، گوتی: بەڕاستی تۆ بە جورئەتی و بە توانای، گوتی: چۆنت گوێ لێبووە؟ گوتی: گوێم لێبوو دەیفەرموو: فیتنەی پیاو بەرنابەر بە خانەوادەو کەسوکارو منداڵەکانی ودراوسێکانی نوێژو ڕۆژوو چاکەو خێرکردن و فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەبنە کەفارەتیان و دەیانسڕنەوە، عومەر گوتی: لەوبارەوە پرسیارت لێ ناکەم، بەڵکو دەربارەی ئەو فیتنەو ئاژاوەیە پرسیارت لێدەکەم کە وەک هەڵچوون و شەپۆلی زۆر بەهێزی دەریاکان شەپۆل دەدەن، (حوزەیفە) گوتی: چیت داوە بەسەر ئەوەوە ئەی ئەمیری بڕواداران، بەڕاستی لەنێوان تۆو ئەو ئاژاوەو فیتنەیەدا دەرگایەکی داخراو هەیەو تا تۆ مابیت هیچی لێ نایەتەدەر، گوتی: ئایا ئەو دەرگایە دەشکێنرێ یان دەکرێتەوە؟ گوتی: بەڵکو دەشکێنرێت، گوتی: کەواتە ئەو دەرگایە داناخرێتەوە. بە حوزەیفەمان گوت: ئایا عومەر دەیزانی کێ ئەو دەرگایەیە؟ گوتی: بەڵێ هەروەکو دەیزانی کە لەدوای ڕۆژ شەو دێ، من فەرموودەیەکم بۆ عومەر گێڕایەوە کە لەوانە نەبوو عومەر نەیزانێ، جا ویستمان پرسیاری لێبکەین کێ دەرگاکەیە؟ ئنجا بە مەسڕوقمان گوت: پرسیاری لێبکە، ئەویش پرسیاری لێکرد، گوتی: (ئەو دەرگایە) عومەرە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٥، ومسلم: ١٤٤، والترمذي: ٢٢٥٨.

٣٩٥٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ رَبِّ الْكَعْبَةِ ﷺ، قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، وَهُوَ جَالِسٌ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ، وَالنَّاسُ مُجْتَمِعُونَ عَلَيْهِ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: بَيْنَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، إِذْ نَزَلَ مَنْزِلًا، فَمِنَّا مَنْ يَضْرِبُ خِبَاءَهُ، وَمِنَّا مَنْ يَنْتَضِلُ، وَمِنَّا مَنْ هُوَ فِي جَشَرِهِ، إِذْ نَادَى مُنَادِيهِ: الصَّلَاةُ جَامِعَةٌ، فَاجْتَمَعْنَا فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَخَطَبَنَا، فَقَالَ: «إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ نَبِيٌّ قَبْلِي إِلَّا كَانَ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ يَدُلَّ أُمَّتَهُ عَلَى مَا يَعْلَمُهُ خَيْرًا لَهُمْ، وَيُنْذِرَهُمْ مَا يَعْلَمُهُ شَرًّا لَهُمْ، وَإِنَّ أُمَّتَكُمْ هَذِهِ جُعِلَتْ عَافِيَتُهَا فِي أَوَّلِهَا، وَإِنَّ آخِرَهُمْ يُصِيبُهُمْ بَلَاءٌ، وَأُمُورٌ تُنْكِرُونَهَا، ثُمَّ تَجِيءُ فِتَنٌ يُرَقِّقُ بَعْضُهَا بَعْضًا، فَيَقُولُ الْمُؤْمِنُ: هَذِهِ مُهْلِكَتِي، ثُمَّ تَنْكَشِفُ، ثُمَّ تَجِيءُ فِتْنَةٌ، فَيَقُولُ الْمُؤْمِنُ: هَذِهِ مُهْلِكَتِي، ثُمَّ تَنْكَشِفُ، فَمَنْ سَرَّهُ أَنْ يُزَحْزَحَ عَنِ النَّارِ، وَيُدْخَلَ الْجَنَّةَ، فَلْتُدْرِكْهُ مَوْتَتُهُ وَهُوَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَلْيَأْتِ إِلَى النَّاسِ الَّذِي يُحِبُّ أَنْ يَأْتُوا إِلَيْهِ، وَمَنْ بَايَعَ إِمَامًا فَأَعْطَاهُ صَفْقَةَ يَمِينِهِ، وَثَمَرَةَ قَلْبِهِ فَلْيُطِعْهُ، مَا اسْتَطَاعَ، فَإِنْ جَاءَ آخَرُ يُنَازِعُهُ، فَاضْرِبُوا عُنُقَ الْآخَرِ» قَالَ: فَأَدْخَلْتُ رَأْسِي مِنْ بَيْنِ النَّاسِ، فَقُلْتُ: أَنْشُدُكَ اللَّهَ أَنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: فَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى أُذُنَيْهِ، فَقَالَ: سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي[1].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدو ڕەبولکەعب ﷺ دەڵێ: گەیشتمە لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص کە لە سێبەری کەعبەدا دانیشتبوو خەڵکی دەوریان دابوو، جا گوێم لێبوو دەیگوت: کاتێ ئێمە لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە جێگایەک لایدا، هەندێکمان دەوارەکەیان هەڵدەدا، وە هەندێکمان پێشبڕکێی تیرهاویشتنمان دەکرد، وە هەندێکمان وڵاخەکەیان دەلەوەڕاند، لەناکاو بانگبێژی پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد: نوێژی جەماعەتە، ئێمەش کۆبووینەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو وتاری بۆ داین و فەرمووی: هەر پێغەمبەرێک ﷺ لەپێش من هاتبێ هەق بووە لەسەری کە ڕێنمایی ئوممەتەکەی بکات بۆ ئەو شتەی کە بە خێری زانیوە بۆیان، وە ئاگاداریان بکات لەو شتەی کە بە شەڕو زیانبەخشی زانیوە بۆیان، وە بەڕاستی ئوممەتەکەی ئێوە سەرەتایەکەی پارێزراو بووە لە فیتنەو بەڵا، وە ئەوانەی لە کۆتاییدا دێن تووشی بەڵاو کاروباری وا دەبن کە زۆریان پێ ناخۆش و سەختە، پاشان چەند بەڵاو فیتنەیەکی تر دێن کە هەر یەکێکیان لەوەی پێش خۆی سەختترو ناخۆشترە، جا بڕوادار دەڵێ: ئەمە لەناوم دەبات، پاشان نامێنێ و کۆتایی دێت، دواتر بەڵایەکی

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٤٤، وأبو داود مختصراً: ٤٢٤٨، والنسائي: ٤١٩١.

تر دێت، بڕوادار دەڵێ: ئەمە لەناوم دەبات، پاشان نامێنێ و کۆتایی دێت، جا هەر کەسێ پێی خۆشە لە ئاگر ڕزگاری بێت و بچێتە بەهەشتەوە با کاتێ کە دەمرێ بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت، وە با بەوجۆرە مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکات کە پێی خۆشە خەڵکی مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، وە هەر کەسێ دەستی بخاتە ناو دەستی پێشەوایەک و لە ناخ و دڵەوە بەیعەتی پێبدات، ئەوە با بەگوێرەی توانا گوێڕایەڵی بکات، جا ئەگەر کەسێ هات و دژایەتی کرد ئەوە بدەن لە گەردەنی. (عەبدوڕەحمان) گوتی: منیش سەرم بردە ناو خەڵکەکەو گوتم: بە خوا سوێندت دەدەم ئایا تۆ ئەوەت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە؟ گوتی: بە دەستی ئاماژەی بۆ گوێیەکانی کردو گوتی: گوێیەکانم بیستیان و دڵیشم ئاگای لێ بوو.

## بابەت: دامەزراوی لەکاتی بەڵاو فیتنەدا

**٣٩٥٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «كَيْفَ بِكُمْ وَبِزَمَانٍ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ، يُغَرْبَلُ النَّاسُ فِيهِ غَرْبَلَةً، وَتَبْقَى حُثَالَةٌ مِنَ النَّاسِ قَدْ مَرِجَتْ عُهُودُهُمْ، وَأَمَانَاتُهُمْ، فَاخْتَلَفُوا، وَكَانُوا هَكَذَا؟»، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، قَالُوا: كَيْفَ بِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِذَا كَانَ ذَلِكَ؟ قَالَ: «تَأْخُذُونَ بِمَا تَعْرِفُونَ، وَتَدَعُونَ مَا تُنْكِرُونَ، وَتُقْبِلُونَ عَلَى خَاصَّتِكُمْ، وَتَذَرُونَ أَمْرَ عَوَامِّكُمْ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەبێ حاڵتان چۆن بێ لە سەردەمێکدا کە نزیکە بێت و خەڵکی بە بێژران ببێژرێن و هەرچی و پەرچی خەراپەکاران بمێنن، وە پەیمان بەستن و ئەمانەت پارێزی لەناویاندا نەمێنێ و لەناو خۆیاندا ناکۆک بن، وە بەو شێوەیان لێبێ پەنجەکانی کرد بەناو یەکدا، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئەوە ڕوویدا ئێمە حاڵمان چۆن دەبێ؟ فەرمووی: دەست بەوەوە دەگرن کە بە باشی دەزانن و ئەوەشی بە باشی نازانن و نکوڵی لێدەکەن وازی لێ دێنن، وە خەریکی ئیشی تایبەتی خۆتان دەبن و واز لە کاروباری گشتی دێنن.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٤٢.

٣٩٥٨- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَيْفَ أَنْتَ يَا أَبَا ذَرٍّ وَمَوْتًا يُصِيبُ النَّاسَ حَتَّى يُقَوَّمَ الْبَيْتُ بِالْوَصِيفِ؟» - يَعْنِي الْقَبْرَ - قُلْتُ: مَا خَارَ اللَّهُ لِي وَرَسُولُهُ - أَوْ قَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ - قَالَ: «تَصَبَّرْ» قَالَ: «كَيْفَ أَنْتَ، وَجُوعًا يُصِيبُ النَّاسَ، حَتَّى تَأْتِيَ مَسْجِدَكَ فَلَا تَسْتَطِيعَ أَنْ تَرْجِعَ إِلَى فِرَاشِكَ، وَلَا تَسْتَطِيعَ أَنْ تَقُومَ مِنْ فِرَاشِكَ إِلَى مَسْجِدِكَ؟» قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ - أَوْ مَا خَارَ اللَّهُ لِي وَرَسُولُهُ - قَالَ: «عَلَيْكَ بِالْعِفَّةِ» ثُمَّ قَالَ: «كَيْفَ أَنْتَ، وَقَتْلًا يُصِيبُ النَّاسَ حَتَّى تُغْرَقَ حِجَارَةُ الزَّيْتِ بِالدَّمِ؟» قُلْتُ: مَا خَارَ اللَّهُ لِي وَرَسُولُهُ، قَالَ: «الْحَقْ بِمَنْ أَنْتَ مِنْهُ»، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلَا آخُذُ بِسَيْفِي، فَأَضْرِبَ بِهِ مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ، قَالَ: «شَارَكْتَ الْقَوْمَ إِذًا، وَلَكِنِ ادْخُلْ بَيْتَكَ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَإِنْ دُخِلَ بَيْتِي؟ قَالَ: «إِنْ خَشِيتَ أَنْ يَبْهَرَكَ شُعَاعُ السَّيْفِ، فَأَلْقِ طَرَفَ رِدَائِكَ عَلَى وَجْهِكَ، فَيَبُوءَ بِإِثْمِهِ وَإِثْمِكَ، فَيَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ»[١].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی ئەبو زەڕ حاڵت چۆن دەبێ و چی دەکەیت لە ڕۆژێکدا کە خەڵکی لەبەر سەرقاڵی یان لەبەر زۆری ژمارەی مردووەکانیان بۆیان ناکرێ مردووەکان بنێژن، بەڵکو پارە دەدەن بە قەبرهەڵکەن کە بۆیان بنێژێ و پارەی جێگەی قەبرەکەش دەدەن؟ گوتم: ئەوەی کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆم دیاری بکەن یان گوتی: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ باشتر دەزانن، فەرمووی: ئارامگربە، وە فەرمووی: وە حاڵت چۆن دەبێ و چی دەکەی ئەگەر برسییەتییەک تووشی خەڵکی بوو تاوەکو وای لێبێ بێی بۆ مزگەوتەکەت و نەتوانی بگەڕێیتەوە بۆناو جێگاکەت وە هەروەها نەتوانی لەناو جێگاکەت هەستی و بێی بۆ مزگەوتەکەت؟ گوتی: گوتم: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ باشتر دەزانن یان ئەوەی کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆم دیاری بکەن، فەرمووی: لەسەرت پێویتسە خۆت بپارێزی لە تووشبوون بە حەرام، پاشان فەرمووی: حاڵت چۆن دەبێ کە کوشتن و کوشتارێک تووشی خەڵکی دەبێ تاوەکو گەڕەکی «حجرة الزيت» لە خوێندا نقوم دەبێ؟ گوتم: ئەوەی کە خواو پێغەمبەرەکەم ﷺ بۆم دیاری بکەن، فەرمووی: پابەندبە بە کەسوکارو هۆزەکەتەوە کە تۆ یەکێکی لەوان یان پابەندبە بەو ئەمیرەوە کە بەڵێن و پەیمانت پێداوە، گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا شمشێرەکەم هەڵنەگرم و لەو کەسە بدەم کە ئەو کارە دەکات؟ فەرمووی: ئەگەر وابکەی تۆش بەشداری ئەو

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٢٦١ ومختصراً ٤٤٠٩.

خەڵکە دەکەی، بەڵکو بڕۆ کونجی ماڵەکەتەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئەگەر یەکێک هاتە ماڵەکەمەوە؟ فەرمووی: ئەگەر ترسایت و بریقەی شمشێرەکەیت بینی کە لێی هەڵکێشاوی و خەریکە لێ بدات ئەوە لایەکی پۆشاکەکەت بدە بەسەر ڕوخسارتدا، جا ئەگەر کوشتیتی ئەوە گوناە و تاوانی تۆو هی خۆیشی لەسەر ئەوەو دەبێتە ئەهلی دۆزەخ.

**٣٩٥٩- عَنْ أَبُو مُوسَى ﷺ قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ لَهَرْجًا»، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا الْهَرْجُ؟ قَالَ: «الْقَتْلُ»، فَقَالَ بَعْضُ الْمُسْلِمِينَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا نَقْتُلُ الْآنَ فِي الْعَامِ الْوَاحِدِ مِنَ الْمُشْرِكِينَ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ بِقَتْلِ الْمُشْرِكِينَ، وَلَكِنْ يَقْتُلُ بَعْضُكُمْ بَعْضًا، حَتَّى يَقْتُلَ الرَّجُلُ جَارَهُ، وَابْنَ عَمِّهِ وَذَا قَرَابَتِهِ»، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَعَنَا عُقُولُنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا، تُنْزَعُ عُقُولُ أَكْثَرِ ذَلِكَ الزَّمَانِ، وَيَخْلُفُ لَهُ هَبَاءٌ مِنَ النَّاسِ لَا عُقُولَ لَهُمْ» ثُمَّ قَالَ الْأَشْعَرِيُّ: «وَايْمُ اللَّهِ، إِنِّي لَأَظُنُّهَا مُدْرِكَتِي وَإِيَّاكُمْ، وَايْمُ اللَّهِ، مَا لِي وَلَكُمْ مِنْهَا مَخْرَجٌ، إِنْ أَدْرَكَتْنَا فِيمَا عَهِدَ إِلَيْنَا نَبِيُّنَا ﷺ، إِلَّا أَنْ نَخْرُجَ كَمَا دَخَلْنَا فِيهَا»[1].**

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێانی فەرموو: یەکێ لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی هەرجە، گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرج چییە؟ فەرمووی: کوشت و بڕە، هەندێک لە مسوڵمانان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە ئێستا لە ساڵێکدا ئەوەندەو ئەوەندە لە هاوبەشدانەران دەکوژین! ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە کوشتنی هاوبەشدانەران نیە، بەڵکو لەناو خۆتاندا یەکتری دەکوژن، هەتا پیاو جیرانەکەی خۆی و ئامۆزاکەی و خزمی نزیکی خۆی دەکوژێ، هەندێ لە خەڵکەکە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئا لەو ڕۆژەدا ئێمە تەواوین و ئاقڵمان هەیە؟ ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر (بەم جۆرە نیە)، بەڵکو زۆربەی ژیرو داناکان لادەبرێن و خەڵکی هەرچی و پەرچی و هیچ نەزان و بێ ئەقڵ شوێنیان دەگرنەوە. پاشان ئەشعەری گوتی: سوێند بە خوا من وا گومان دەبەم کە من و ئێوەش بەو ڕۆژە بگەین، سوێند بە خوا ئەگەر هاتوو تووشمان بوو هەروەکو پێغەمبەرەکەمان ﷺ پەیمانی پێداوین ئەوە هیچ دەرچوونێک نیە لێی نە بۆ من و نە بۆ ئێوە، مەگەر بەو جۆرە لێی دەرچین کە چووینەتە ناوی و تووشی بووین.

---

(١) صحيح.

٣٩٦٠- عَنْ عُدَيْسَةُ بِنْتُ أُهْبَانَ ﷺ، قَالَتْ: لَمَّا جَاءَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ هَاهُنَا الْبَصْرَةَ، دَخَلَ عَلَى أَبِي، فَقَالَ: يَا أَبَا مُسْلِمٍ أَلَا تُعِينُنِي عَلَى هَؤُلَاءِ الْقَوْمِ؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: فَدَعَا جَارِيَةً لَهُ، فَقَالَ: يَا جَارِيَةُ أَخْرِجِي سَيْفِي، قَالَ: فَأَخْرَجَتْهُ، فَسَلَّ مِنْهُ قَدْرَ شِبْرٍ، فَإِذَا هُوَ خَشَبٌ، فَقَالَ: «إِنَّ خَلِيلِي وَابْنَ عَمِّكَ ﷺ، عَهِدَ إِلَيَّ إِذَا كَانَتِ الْفِتْنَةُ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ فَأَتَّخِذُ سَيْفًا مِنْ خَشَبٍ، فَإِنْ شِئْتَ خَرَجْتُ مَعَكَ»، قَالَ: لَا حَاجَةَ لِي فِيكَ وَلَا فِي سَيْفِكَ[١].

واتە: عودەیسەی کچی ئوهبان ﷺ دەڵێ: کاتێ عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب هاتە ئێرە بۆ بەصرە، هاتە لای باوکم و گوتی: ئەی ئەبو موسلیم ئایا هاوکاریم ناکەی لەدژی ئەو خەڵکە، گوتی: بێگومان بەڵێ، (ڕاوی) گوتی: جا بانگی کەنیزەکێکی کردو گوتی: ئەی کەنیزەک شمشێرەکەم بۆ بێنە، گوتی: جا بۆی هێنا (و دایە دەستی)، ئنجا (ئەبو موسلیم) بە ئەندازەی بستێک شمشێرەکەی لە کێلانەکەی دەرهێنا کە شمشێرێکی دارین بوو، وە گوتی: بەڕاستی خۆشەویستم و کوڕە مامەکەت وەسیەتی بۆ کردووم کاتێ شەڕو ئاژاوەو فیتنە لەنێو مسوڵمانان پەیدا بوو شمشێرێکی دارین هەڵبگرم، جا ئەگەر دەتەوێ (بەم شمشێرە دارینەوە) لەخزمەتتدام و لەگەڵت دەردەچم، (عەلی) گوتی: نەخێر، هیچ پێویستیم نە بە خۆت و نە بە شمشێرەکەشت نیە.

٣٩٦١- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ، يُصْبِحُ الرَّجُلُ فِيهَا مُؤْمِنًا، وَيُمْسِي كَافِرًا، وَيُمْسِي مُؤْمِنًا، وَيُصْبِحُ كَافِرًا، الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْقَائِمِ، وَالْقَائِمُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي، وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي، فَكَسِّرُوا قِسِيَّكُمْ، وَقَطِّعُوا أَوْتَارَكُمْ، وَاضْرِبُوا بِسُيُوفِكُمُ الْحِجَارَةَ، فَإِنْ دُخِلَ عَلَى أَحَدِكُمْ، فَلْيَكُنْ كَخَيْرِ ابْنَيْ آدَمَ»[٢].

واتە: ئەبو موسای ئەشعەریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی بەر لە هاتنی قیامەت بە ماوەیەکی کەم فیتنەو ئاژاوەیێ بەرپا دەبێ وەک شەوەزەنگ دونیا تاریک دەبێ، پیاو هەیە بەیانی مسوڵمانەو ئێوارە کافرە، وە هەیە ئێوارە مسوڵمانەو بەیانی کافرە، ئەو کەسەی لەوکاتەدا دانیشتووە چاکترە لەوەی کە بە پێوەیە، وە ئەو کەسەی کە لەوکاتەدا بە پێوەیە چاکترە لەوەی کە ڕێ دەکات، وە ئەو کەسەی کە لەوکاتەدا ڕێ دەکات چاکترە لەوەی کە هەوڵدەدات (بۆ هەڵگیرساندنی

---

(١) صحيح بمجموع طرقه. أخرجه الترمذي: ٢٢٠٣.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٢٥٩، والترمذي: ٢٢٠٤.




و دەستی تێدا هەیە)، جا تیرو کەوانەکانتان بشکێنن و ژێی کەوانەکانتان بپسێنن و بە شمشێرەکانتان لە بەرد بدەن (بۆئەوەی کول ببن یان بشکێن)، جا ئەگەر کەسێ هاتە ناو ماڵی یەکێکتانەوەو هێرشی بۆ هێناو ویستی بیکوژێ ئەوە با وەک چاکترینی هەردوو کوڕەکەی ئادەم بێت.

٣٩٦٢- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ ﷺ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى مُحَمَّدِ بْنِ مَسْلَمَةَ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتْنَةٌ وَفُرْقَةٌ وَاخْتِلَافٌ، فَإِذَا كَانَ كَذَلِكَ فَأْتِ بِسَيْفِكَ أُحُدًا، فَاضْرِبْهُ حَتَّى يَنْقَطِعَ، ثُمَّ اجْلِسْ فِي بَيْتِكَ، حَتَّى تَأْتِيَكَ يَدٌ خَاطِئَةٌ، أَوْ مَنِيَّةٌ قَاضِيَةٌ». فَقَدْ وَقَعَتْ وَفَعَلْتُ مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[1].

واتە: ئەبو بوڕدە ﷺ دەڵێ: چووم بۆلای موحەممەدی کوڕی مەسلەمەو گوتی: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە داهاتوودا ئاژاوەو لێکترازان و ڕاجیایی لەناوتان سەرهەڵدەدات، جا ئەگەر ئەوە هات و ڕوویدا ئەوە بە خۆت و شمشێرەکەتەوە بڕۆ بۆ چیای ئوحودو شمشێرەکەت بکێشە بە چیای ئوحوددا تاوەکو دەپەڕێت، پاشان لە ماڵی خۆت دانیشە تاوەکو دەستی تاوانکارێکت پێ دەگات یان ئەو مردنەت پێدەگات کە خوا بۆی دیاری کردووی. (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە گوتی:) لەڕاستیدا ئەو پێشهاتە ڕوویدا، وە منیش هەر ئەوەم کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی.

## بابەت: ئەوەی کە دوو مسوڵمان بە شمشێرەکانیان بەرەوڕووی یەکتر ببنەوە

٣٩٦٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ الْتَقَيَا بِأَسْيَافِهِمَا، إِلَّا كَانَ الْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر دوو مسوڵمانێک کە بە شمشێرەکانیان ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە ئەوە بکوژو کوژراوەکە هەردووکیان لە ئاگردان.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره.

٣٩٦٤- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا، فَالْقَاتِلُ، وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا الْقَاتِلُ، فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: «إِنَّهُ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ»(١).

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر دوو مسوڵمانێک کە بە شمشێرەکانیان ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە ئەوە بکوژو کوژراوەکە هەردووکیان لە ئاگردان، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (قەینا) ئەوەیان کە بکوژەکەیە، بەس کوژراوەکە بۆ حاڵی وایە؟! فەرمووی: چونکە بێگومان ئەویش دەیویست هاوڕێکەی بکوژێ (ئەگەر نەکوژرابایە).

٣٩٦٥- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا الْمُسْلِمَانِ حَمَلَ أَحَدُهُمَا عَلَى أَخِيهِ السِّلَاحَ، فَهُمَا عَلَى جُرُفِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا قَتَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، دَخَلَا جَمِيعًا»(٢).

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک دوو مسوڵمان بە چەکەوە لە یەکتر ڕاسان، ئەوە هەردووکیان لە قەراغی دۆزەخن، جا ئەگەر یەکێکیان هاوڕێکەی کوشت ئەوە هەردووکیان لە ئاگردان.

٣٩٦٦- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مِنْ شَرِّ النَّاسِ مَنْزِلَةً عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، عَبْدٌ أَذْهَبَ آخِرَتَهُ بِدُنْيَا غَيْرِهِ»(٣).

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەراپترین شوێن و پلە لەلایەن خواوە لە ڕۆژی دواییدا هی بەندەیەکە کە قیامەتی خۆی بە دنیای خەڵکی دابێت.

## بابەت: پاراستنی زمان لەکاتی فیتنەو ئاژاوەدا

٣٩٦٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَكُونُ فِتْنَةٌ تَسْتَنْظِفُ الْعَرَبَ قَتْلَاهَا فِي النَّارِ، اللِّسَانُ فِيهَا أَشَدُّ مِنْ وَقْعِ السَّيْفِ»(٤).

---

(١) ضعيف. أخرجه النسائي: ٤١١٨ و ٤١١٩ و ٤١٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١، ومسلم: ٢٨٨٨، والنسائي: ٤١١٦ و ٤١١٧ و ٤١٢٠ و ٤١٢١ و ٤١٢٢ و ٤١٢٣.

(٣) ضعيف.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٢٦٥، والترمذي: ٢١٧٨.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فیتنەو ئاژاوەیەک بەرپا دەبێ عەرەب دەفەوتێن، کوژراوەکانی ئەو فیتنەو ئاژاوەیە لە ئاگردان، زمان تێیدا لە شمشێر وەشاندن کاریگەرترە.

**٣٩٦٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكُمْ وَالْفِتَنَ، فَإِنَّ اللِّسَانَ فِيهَا مِثْلُ وَقْعِ السَّيْفِ»(١).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەکاتی فیتنەو ئاژاوەدا خۆتان بپارێزن و ئاگاداربن، چونکە بەڕاستی لەوکاتەدا (کاریگەری) زمان وەکو شمشێر وەشاندنە.

**٣٩٦٩-** عَنْ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أَبِيهِ عَلْقَمَةَ بْنِ وَقَّاصٍ، قَالَ: مَرَّ بِهِ رَجُلٌ لَهُ شَرَفٌ، فَقَالَ لَهُ عَلْقَمَةُ: إِنَّ لَكَ رَحِمًا، وَإِنَّ لَكَ حَقًّا، وَإِنِّي رَأَيْتُكَ تَدْخُلُ عَلَى هَؤُلَاءِ الْأُمَرَاءِ، وَتَتَكَلَّمُ عِنْدَهُمْ بِمَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَتَكَلَّمَ بِهِ، وَإِنِّي سَمِعْتُ بِلَالَ بْنَ الْحَارِثِ الْمُزَنِيَّ، صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللَّهِ، مَا يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ، فَيَكْتُبُ اللَّهُ ﷻ لَهُ بِهَا رِضْوَانَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سُخْطِ اللَّهِ، مَا يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ، فَيَكْتُبُ اللَّهُ ﷻ عَلَيْهِ بِهَا سُخْطَهُ إِلَى يَوْمِ يَلْقَاهُ» قَالَ عَلْقَمَةُ: فَانْظُرْ وَيْحَكَ مَاذَا تَقُولُ؟ وَمَاذَا تَكَلَّمُ بِهِ، فَرُبَّ كَلَامٍ قَدْ مَنَعَنِي أَنْ أَتَكَلَّمَ بِهِ، مَا سَمِعْتُ مِنْ بِلَالِ بْنِ الْحَارِثِ»(٢).

واتە: عەلقەمەی کوڕی وەقاص ﷺ دەڵێ: پیاوێکی بەڕێز بەلایدا تێپەڕی، جا عەلقەمە پێی گوت: بەڕاستی تۆ سیلەی ڕەحم بەجێ دێنی و خاوەنی مافی ڕێزلێگرتنی، وە لە ڕاستیدا من بینیومی کە سەردانی ئەو کاربەدەستانە دەکەی و بەجۆرێک لەلایان قسە دەکەی کە خوا ڕێی پێداوی بەو شێوەیە قسە بکەی، وە بەڕاستی من گوێم لە هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بیلالی کوڕی حاریسی موزەنی بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان جاری وا هەیە کەسێ قسەیێ دەکات هۆکاری ڕەزامەندی خوایە، نازانێ ئەو قسەیە بە کوێی دەگەیەنێ (بە چ پلەو پایەیەکی دەگەیەنێ)،

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٣١٩.

خوای ﷻ ڕەزامەندی خۆی بۆ دەنوسێ هەتا ڕۆژی قیامەت، هەروەها جاری وا هەیە کەسێ قسەیێ دەکات هۆکاری توڕەیی خوایە، نازانێ ئەو قسەیە بە کوێی دەگەیەنێ، خوای ﷻ توڕەیی خۆی بۆ دەنوسێ تاوەکو ڕۆژی قیامەت. عەلقەمە گوتی: هاوار بۆ تۆ، جا بزانە چی دەڵێیت و چ وشەیەک بەکاردێنی، چەندین قسە هەبووە کە لەبەرئەوەی کە لە بیلالی کوڕی حاریسم بیستووە نەمتوانیوە بیانڵێم.

**٣٩٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سُخْطِ اللَّهِ، لَا يَرَى بِهَا بَأْسًا، فَيَهْوِي بِهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ سَبْعِينَ خَرِيفًا»[1].**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسی وا هەیە قسەیەک دەکات بەلای خۆیەوە زۆر ئاساییەو گوێی ناداتێ، بەڵام هۆکاری توڕەیی خوایە، وە بەهۆیەوە حەفتا پایز بە ناخی ئاگری دۆزەخدا دەچێتە خوارەوە.

**٣٩٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَسْكُتْ»[2].**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە ئەوە با قسەی باش و چاک بکات یان بێدەنگ بێت.

**٣٩٧٢- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَاعِزٍ الْعَامِرِيِّ ﷺ، أَنَّ سُفْيَانَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ الثَّقَفِيَّ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ حَدِّثْنِي بِأَمْرٍ أَعْتَصِمُ بِهِ، قَالَ: «قُلْ: رَبِّيَ اللَّهُ، ثُمَّ اسْتَقِمْ» قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَكْثَرُ مَا تَخَافُ عَلَيَّ؟ فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بِلِسَانِ نَفْسِهِ، ثُمَّ قَالَ: «هَذَا»[3].**

واتە: سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵای سەقەفیی ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کارێکم پێ بفەرموو کە دەستی پێوە بگرم و خۆمی لێ قایم بکەم، فەرمووی: بڵێ: الله پەروەردگارمە، پاشان بەردەوام پابەندی ئەو ڕێبازە ڕاستە بە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر لە چی دەترسی کە من بەهۆیەوە لەناو بچم؟ ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ سەری زمانی خۆی گرت و پاشان فەرمووی: ئا ئەمە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٧٧، ومسلم: ٢٩٨٨ بنحوه.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠١٨، ومسلم: ٤٧، وأبو داود: ٥١٥٤، والترمذي: ٢٥٠٠.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٤١٠، واقتصر مسلم: ٣٨ على قصة الاستقامة.

**٣٩٧٣-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَأَصْبَحْتُ يَوْمًا قَرِيبًا مِنْهُ وَنَحْنُ نَسِيرُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ، وَيُبَاعِدُنِي مِنَ النَّارِ، قَالَ: «لَقَدْ سَأَلْتَ عَظِيمًا، وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ، تَعْبُدُ اللَّهَ لَا تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ الْبَيْتَ» ثُمَّ قَالَ: «أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ؟ الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ النَّارَ الْمَاءُ، وَصَلَاةُ الرَّجُلِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، ثُمَّ قَرَأَ ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ ﴿١٦﴾ ﴾ السجدة، حَتَّى بَلَغَ ﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة». ثُمَّ قَالَ: «أَلَا أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الْأَمْرِ، وَعَمُودِهِ، وَذُرْوَةِ سَنَامِهِ؟ الْجِهَادُ» ثُمَّ قَالَ: «أَلَا أُخْبِرُكَ بِمِلَاكِ ذَلِكَ كُلِّهِ؟» قُلْتُ: بَلَى، فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ، فَقَالَ: «تَكُفُّ عَلَيْكَ هَذَا» قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ؟ قَالَ: «ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا مُعَاذُ وَهَلْ يُكِبُّ النَّاسَ عَلَى وُجُوهِهِمْ فِي النَّارِ، إِلَّا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ؟»[1].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: لە سەفەرێکدا لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووم، جا ڕۆژێک لێی نزیک بوومەوەو بەیەکەوە دەڕۆیشتین، ئنجا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کارو کردەوەیەکم پێ بفەرموو کە بەهۆیەوە بچمە بەهەشتەوەو لە ئاگری دۆزەخیش دوورم بخاتەوە، فەرمووی: دەربارەی کارێکی زۆر گەورەو شکۆمەند پرسیارت کرد، وە بەڕاستی ئاسانە بۆ کەسێ کە خوا بۆی ئاسان بکات، (کە ئەمەیە) خوا بپەرستەو هاوبەشی بۆ دامەنێ، پێنج نوێژە فەرزەکە ئەنجام بدە، زەکاتی ماڵ و سامانەکەت دەربکە، وە مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بە، وە حەجی ماڵی خوا بکە، پاشان فەرمووی: ئایا دەرگاکانی خێرت نیشان بدەم؟ ڕۆژوو قەڵغانە دەتپارێزێ لە تاوان، خێرو سەدەقەش گوناه و تاوان دەکوژێنێتەوە وەک چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە، هەروەها نوێژی کەسێ لە شەودا، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ ﴿١٦﴾ ﴾ السجدة، واتە: تەنیشتیان دوور ئەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (واتە: لەخەو هەڵدەسن بۆ شەو نوێژ کردن)، تاوەکو گەیشتە: ﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة، واتە: ئەم پاداشتە (دەدرێنەوە) بە هۆی ئەو کردەوانەی کە کردویانە. پاشان فەرمووی: ئایا بنەمای هەموو کارێکی باش و کۆڵەکەو چڵەپۆپەیت پێ بڵێم؟ جیهادو تێکۆشانە لەڕێی خوادا، پاشان فەرمووی: ئایا شیرازەی هەموو ئەمانەشت پێ

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٦١٦.

بڵێم؟ گوتم: بەڵێ، ئنجا سەری زمانی خۆی گرت و فەرمووی: زمانی خۆت بگرە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەو قسانەی کە دەیکەین لێپرسینەوەمان لێ دەکرێ و سزا دەدرێین؟ فەرمووی: ئەی موعاز دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکات، ئەی چی ئەو خەڵکە لە ئاگری دۆزەخدا لەسەر ڕوخساریان دەگەوزێنێ جگە لە بەرهەمی زمانیان نەبێ.

٣٩٧٤- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «كَلَامُ ابْنِ آدَمَ عَلَيْهِ لَا لَهُ، إِلَّا الْأَمْرَ بِالْمَعْرُوفِ، وَالنَّهْيَ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَذِكْرَ اللَّهِ ﷻ»[1].

واتە: ئوممو حەبیبەی ﵂ هاوسەری پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو قسەیەکی ئادەمیزاد زیانەکانی لە ئەستۆی خۆیەتی و سوودی بۆی نیە، جگە لە فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپەو یادکردنی خوای ﷻ.

٣٩٧٥- عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ ﵁، قَالَ: قِيلَ لِابْنِ عُمَرَ: إِنَّا نَدْخُلُ عَلَى أُمَرَائِنَا فَنَقُولُ الْقَوْلَ: فَإِذَا خَرَجْنَا قُلْنَا غَيْرَهُ، قَالَ: «كُنَّا نَعُدُّ ذَلِكَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، النِّفَاقَ»[2].

واتە: ئەبو شەعساء ﵁ دەڵێ: بە ئیبنو عومەر گوترا: ئێمە کاتێ دەچینە لای کاربەدەستەکانمان قسەیەک دەکەین و کاتێ دێینە دەرەوە قسەیەکی تر دەکەین، (ئیبنو عومەر) گوتی: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەوەمان بە دووڕوویی ئەژمار دەکرد.

٣٩٧٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِنْ حُسْنِ إِسْلَامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لَا يَعْنِيهِ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە جوانی و چاکی موسوڵمانییەتی مرۆڤ ئەوەیە کە وازبهێنێ لە شتێ کە پەیوەندی بەوەوە نیە.

## بابەت: دوورەپەرێزی

٣٩٧٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «خَيْرُ مَعَايِشِ النَّاسِ لَهُمْ، رَجُلٌ مُمْسِكٌ بِعِنَانِ فَرَسِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَيَطِيرُ عَلَى مَتْنِهِ، كُلَّمَا سَمِعَ هَيْعَةً أَوْ فَزْعَةً، طَارَ عَلَيْهِ إِلَيْهَا، يَبْتَغِي الْمَوْتَ

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٤١٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧١٧٨.

(٣) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٣١٧.

أَوِ الْقَتْلَ مَظَانَّهُ، وَرَجُلٌ فِي غُنَيْمَةٍ فِي رَأْسِ شَعَفَةٍ مِنْ هَذِهِ الشِّعَافِ، أَوْ بَطْنِ وَادٍ مِنْ هَذِهِ الْأَوْدِيَةِ، يُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَيُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَيَعْبُدُ رَبَّهُ حَتَّى يَأْتِيَهُ الْيَقِينُ، لَيْسَ مِنَ النَّاسِ إِلَّا فِي خَيْرٍ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: باشترین ژیانکردن ژیانی ئەو کەسەیە کەوا بەردەوام لەکاتی پێویستدا لەسەر پشتی ئەسپەکەی بێ و لەپێناو خوادا تێبکۆشێ، جا هەرکاتێک دەنگی دوژمن هات یان ئامادە بوو بۆ شەڕ بە سواری ئەسپەکەی بەرەوڕوویان بچێ و تەنها مەبەستی مردن بێ لەپێناو خوا یان مەبەستی جەنگ بێ، یان پیاوێک لەسەرووی کێوێک لەو کێوانە یان لەناو شیوێک لەو شیوانە پارچە مەڕێک بەخێو بکات، نوێژ بکات و زەکات بدات و پەروەردگاری خۆی بپەرستێ تاوەکو مردن پێی دەگات، تەنها لە چاکەو خێردا لەگەڵ خەڵکییە.

٣٩٧٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «رَجُلٌ مُجَاهِدٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِنَفْسِهِ، وَمَالِهِ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ امْرُؤٌ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ، يَعْبُدُ اللَّهَ ﷻ، وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَرِّهِ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو گوتی: چاکترین کەس کێیە؟ فەرمووی: کەسێکە لەپێناوی خوادا بە سەرو ماڵی جیهاد بکات، گوتی: لەپاش ئەو؟ فەرمووی: پاشان مرۆڤێک کە لە شیوێک لە شیوەکاندا خوای ﷻ بپەرستێ، وە خۆی بەدوور بگرێ لە خراپە کردن لەگەڵ خەڵکی.

٣٩٧٩- عَنْ أَبُو إِدْرِيسَ الْخَوْلَانِيُّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمَانِ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَكُونُ دُعَاةٌ عَلَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ، مَنْ أَجَابَهُمْ إِلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ صِفْهُمْ لَنَا، قَالَ: «هُمْ قَوْمٌ مِنْ جِلْدَتِنَا يَتَكَلَّمُونَ بِأَلْسِنَتِنَا»، قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي إِنْ أَدْرَكَنِي ذَلِكَ؟ قَالَ: «فَالْزَمْ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ، وَإِمَامَهُمْ، قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ جَمَاعَةٌ، وَلَا إِمَامٌ؟ قَالَ: فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا، وَلَوْ أَنْ تَعَضَّ بِأَصْلِ شَجَرَةٍ، حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ، وَأَنْتَ كَذَلِكَ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٨٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٨٦، ومسلم: ١٨٨٨، وأبو داود: ٢٤٨٥، والترمذي: ١٦٦٠، والنسائي: ٣١٠٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٠٦، ومسلم: ١٨٤٧.





واتە: ئەبو ئیدریسی خەولانی ﷺ دەگێڕێتەوە کە گوێی لە حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ بوودەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بانگەوازکەرانێ پەیدا دەبن لە دەرگای دۆزەخدا وەستاون، هەر کەسێ بە گوێیان بکات فڕێی دەدەنە ناوی، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناونیشانی ئەوانەمان پێ بفەرموو، فەرمووی: بە ناوو بە دیمەن لە خۆمانن، بە زمانی خۆمان دەدوێن، گوتم: فەرمانی چیم پێ دەکەی لەکاتێکدا کەوتمە ئەو سەردەمەوە؟ فەرمووی: لایەنی کۆمەڵی مسوڵمانان و پێشەوای ئەوان بگرە، گوتم: ئەگەر هیچ کۆمەڵ و پێشەوایەک نەبوو؟ فەرمووی: ئەوە خۆت لە هەموو ئەو کۆمەڵانە بەدوور بگرە، ئەگەر قەپ بگری بە ڕەگی دارێکداو بۆخۆت لەوێ بمێنیتەوە تاوەکو لەسەر ئەو حاڵەت مردن پێت دەگات.

٣٩٨٠- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرَ مَالِ الْمُسْلِمِ غَنَمٌ، يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الْجِبَالِ، وَمَوَاقِعَ الْقَطْرِ، يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الْفِتَنِ»[1].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە گوێی لە ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ بووە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاکا ئەو ڕۆژە هات کە چاکترین ماڵ و سامانی مسوڵمان ئەو ڕانە مەڕەیە کە شوێنیان دەکەوێ بۆ لوتکەی شاخەکان و لەوەڕگاکان، بە خۆی و دینەکەیەوە هەڵدێ لە فیتنەو ئاژاوە.

٣٩٨١- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَكُونُ فِتَنٌ عَلَى أَبْوَابِهَا دُعَاةٌ إِلَى النَّارِ، فَأَنْ تَمُوتَ وَأَنْتَ عَاضٌّ عَلَى جِذْلِ شَجَرَةٍ، خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ تَتْبَعَ أَحَدًا مِنْهُمْ»[2].

واتە: حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چەند فیتنەو ئاژاوەیەک سەرهەڵدەدەن کە لەسەر دەرگاکانیان بانگەوازکەرانێک هەن بانگەواز دەکەن بۆ ئاگر، جا خۆ ئەگەر تۆ بمریت و حاڵت وابێ گازت لە ڕەگی دارێک گرتبێ باشترە لەوەی کە شوێنی یەکێک لەوانە بکەوی.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩ و ٣٣٠٠ و ٣٦٠٠ و ٦٤٩٥ و ٧٠٨٨، وأبو داود: ٤٢٦٧، والنسائي: ٥٠٣٦.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٢٤٤_٤٢٤٧.

٣٩٨٢- عَنْ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ ﷺ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ، أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ مَرَّتَيْنِ»[١].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب ﷺ لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بڕاوادار نابێ دوو جار لە کونێکەوە بگەزرێ.

٣٩٨٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ مَرَّتَيْنِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار نابێ دوو جار لە کونێکەوە بگەزرێ.

## بابەت: خۆپاراستن و هەڵوێستە کردن لەو شتانەی کە گومان و شوبهەیان تێدایە

٣٩٨٤- عَنِ الشَّعْبِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ، يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَأَهْوَى بِإِصْبَعَيْهِ إِلَى أُذُنَيْهِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْحَلَالُ بَيِّنٌ، وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشْتَبِهَاتٌ لَا يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى، يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ، أَلَا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلَا وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَحَارِمُهُ، أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً، إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ، فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ»[٣].

واتە: شەعبیی ﷺ دەڵێ: گوێم لە نوعمانی کوڕی بەشیر بوو کە لەسەر مینبەر بە پەنجەکانی ئاماژەی بۆ گوێیەکانی دەکردو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی ئەو کاروکردەوانەی لەلایەن خواوە حەڵاڵ کراون ڕوون و ئاشکراو دیارن، هەروەها ئەو کاروکردەوانەش کە لەلایەن خواوە حەرام کراون ڕوون و ئاشکراو دیارن، وە لەنێوان ئەم دووانەدا هەندێ شت هەن جێگەی گومانن و حەڵاڵی و حەرامییان ڕوون و ئاشکرا نیە، زۆربەی خەڵکی نازانن کە حەرامن یان

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٣٣، ومسلم: ٢٩٩٨، وأبو داود: ٤٨٦٢.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢، ومسلم: ١٥٩٩، وأبو داود: ٣٣٢٩ و ٣٣٣٠، والترمذي: ١٢٠٥، والنسائي: ٤٤٥٣ و ٥٧١٠.




حەڵاڵن، جا هەرکەس خۆی بپارێزێ لە شتی گومان لێکراو ئەوە دین و ناموسی خۆی دەپارێزێ و سەلامەت دەبێت، وە هەرکەس بکەوێتە ناو شتی گومان لێکراو ئەوە دەکەوێتە ناو حەرامەوە، وەکو چۆن ئەگەر شوان ڕانەکەی لە دەوروبەری پاواندا بلەوەڕێنێ نزیکە بکەوێتە ناویەوە، ئاگاداربن هەموو کاربەدەستێک پاوانی خۆی هەیەو دەیپارێزێ، پاوانی خواش ئەو شتانەیە کە حەرامی کردوون، ئاگاداربن لە جەستەدا پارچە گۆشتێک هەیە ئەگەر هات و باش و چاک بوو ئەوە هەموو جەستە باش دەبێ، وە ئەگەر هاتو خراپ بوو ئەوە هەموو جەستە خراپ دەبێ، وە ئاگاداربن ئەو پارچە گۆشتە دڵە.

**٣٩٨٥-** عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعِبَادَةُ فِي الْهَرْجِ، كَهِجْرَةٍ إِلَيَّ»[1].

**واتە:** مەعقیلی کوڕی یەسار ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خواپەرستی لە ڕۆژانی ئاژاوەو فیتنەدا وەکو کۆچکردنە بۆلای من.

## بابەت: ئەوەی کە ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد

**٣٩٨٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَدَأَ الْإِسْلَامُ غَرِيبًا، وَسَيَعُودُ غَرِيبًا، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ»[2].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد، وە جارێکی تر نامۆ دەبێتەوە، بۆیە خۆشبەختی بۆ نامۆکان.

**٣٩٨٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ الْإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا، وَسَيَعُودُ غَرِيبًا، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ»[3].

**واتە:** ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد، وە جارێکی تر نامۆ دەبێتەوە، بۆیە خۆشبەختی بۆ نامۆکان.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٤٨، والترمذي: ٢٢٠١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٥.

(٣) صحيح لغيره.




٣٩٨٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا، وَسَيَعُودُ غَرِيبًا، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ»، قَالَ: قِيلَ: وَمَنِ الْغُرَبَاءُ؟ قَالَ: «النُّزَّاعُ مِنَ الْقَبَائِلِ»[1].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد، وە جارێکی تر نامۆ دەبێتەوە، بۆیە خۆشبەختی بۆ نامۆکان، گوتی: گوترا: ئایا نامۆکان کێن؟ فەرمووی: نامۆکانی ناو هۆزو عەشیرەتەکانن.

## بابەت: ئەوانەی کەوا ئومێد دەکرێ
## لە فیتنەو ئاژاوە سەلامەت بن

٣٩٨٩- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنَّهُ خَرَجَ يَوْمًا إِلَى مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَوَجَدَ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ قَاعِدًا عِنْدَ قَبْرِ النَّبِيِّ ﷺ يَبْكِي؟ فَقَالَ: مَا يُبْكِيكَ؟ قَالَ: يُبْكِينِي شَيْءٌ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّ يَسِيرَ الرِّيَاءِ شِرْكٌ، وَإِنَّ مَنْ عَادَى لِلَّهِ وَلِيًّا، فَقَدْ بَارَزَ اللَّهَ بِالْمُحَارَبَةِ، إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْأَبْرَارَ الْأَتْقِيَاءَ الْأَخْفِيَاءَ، الَّذِينَ إِذَا غَابُوا لَمْ يُفْتَقَدُوا، وَإِنْ حَضَرُوا لَمْ يُدْعَوْا، وَلَمْ يُعْرَفُوا قُلُوبُهُمْ مَصَابِيحُ الْهُدَى، يَخْرُجُونَ مِنْ كُلِّ غَبْرَاءَ مُظْلِمَةٍ»[2].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەگێڕێتەوە، ڕۆژێک چوو بۆ مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا بینی موعازی کوڕی جەبەل لەلای گۆڕی پێغەمبەر ﷺ دانیشتووەو دەگریێ، گوتی: چی دەتگریێنێ؟ گوتی: شتێ دەمگریێنێ کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە، گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بەڕاستی کەمێکیش لە ڕیا هەر هاوبەش دانانە بۆ خودا، هەرکەسێ دوژمنایەتی خۆشەویستێکی خوا بکات، ئەوە بێگومان جاڕی جەنگی لەگەڵ خوادا داوە، بێگومان خوا ئەوانەی خۆش دەوێن کە بە شاراوەیی لە خوا ترسن و خۆپارێزن، ئەوانەی کە هەرکاتێ لەبەرچاو نەبن خەڵک بۆیان ناگەڕێ، وە کاتێکیش ئامادەو حازرن کەس بانگیان ناکات، وە ناسراوو بەناوبانگ نین، دڵەکانیان چرای ڕۆشنی ڕێگای هیدایەتن، هەر کاتێک فیتنەو ئاژاوەو کێشە بێ ئەوان بە سەلامەتی لێی دەرباز دەبن.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٦٢٩.

(٢) ضعيف.



٣٩٩٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «النَّاسُ كَإِبِلٍ مِائَةٍ، لَا تَكَادُ تَجِدُ فِيهَا رَاحِلَةً»(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵک وەک ڕەوە وشتری سەد دانەیی وان، بە ئەستەم وشترێکی باشی تێدا دەست دەکەوێ بۆ بارکردن (واتە: کەم کەس هەیە شایستەی بەرپرسیارییەتی بێت).

## بابەت: پارچە پارچە بوونی ئوممەتەکان

٣٩٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَفَرَّقَتِ الْيَهُودُ عَلَى إِحْدَى وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جوولەکە بوون بە حەفتاو یەک لق و پارچە، وە ئوممەتی منیش دەبن بە حەفتاو سێ لق و پارچە.

٣٩٩٢- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «افْتَرَقَتِ الْيَهُودُ عَلَى إِحْدَى وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، فَوَاحِدَةٌ فِي الْجَنَّةِ، وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ، وَافْتَرَقَتِ النَّصَارَى عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، فَإِحْدَى وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ، وَوَاحِدَةٌ فِي الْجَنَّةِ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَتَفْتَرِقَنَّ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَاحِدَةٌ فِي الْجَنَّةِ، وَثِنْتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النَّارِ»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ هُمْ؟ قَالَ: «الْجَمَاعَةُ»(٣).

واتە: عەوفی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جوولەکە بوون بە حەفتاو یەک پارچە، جا یەکێکیان لە بەهەشت دایەو حەفتا دانەیان لە ئاگردان، وە مەسیحییەکانیش بوون بە حەفتاو دوو پارچە، جا حەفتاو یەک دانەیان لە ئاگردان و یەکێکیان لە بەهشت دایە، وە سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی ﷺ بەدەستە ئوممەتەکەی منیش پارچە پارچە دەبن بۆ حەفتاو سێ پارچە، یەکێکیان لە بەهەشت دایەو حەفتاو دوو دانەیان لە ئاگردان. گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە کێن (بەهەشتییەکان)؟ فەرمووی: ئەوانەی کە لەسەر بیروبڕوای کۆمەڵەی هاوەڵانن (یەک ڕەنگ و یەک دەنگن).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٩٨، ومسلم: ٢٥٤٧، والترمذي: ٢٨٧٢.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٥٩٦، والترمذي: ٢٦٤٠.

(٣) صحيح لغيره.

٣٩٩٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ افْتَرَقَتْ عَلَى إِحْدَى وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَإِنَّ أُمَّتِي سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، كُلُّهَا فِي النَّارِ، إِلَّا وَاحِدَةً وَهِيَ: الْجَمَاعَةُ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی بەنی ئیسرائیل پارچە پاچە بوون بۆ حەفتاو یەک پارچە، وە بێگومان ئوممەتەکەی منیش پارچە پارچە دەبێ بۆ حەفتاو دوو پارچە، هەموویان لە ئاگردان تەنها دانەیەکیان نەبێ، کە ئەوانیش ئەوانەن کە لەسەر بیروبڕوای کۆمەڵەی هاوەڵانن.

٣٩٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَتَتَّبِعُنَّ سُنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بَاعًا بِبَاعٍ، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، وَشِبْرًا بِشِبْرٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِي جُحْرِ ضَبٍّ لَدَخَلْتُمْ فِيهِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ الْيَهُودُ، وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: «فَمَنْ إِذًا»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئێوە باڵ بە باڵ و بست بە بست شوێن ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون، تاوەکو ئەگەر بچنە ناو کونی بزنمژەشەوە ئێوەش دەچنە ناوی، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە جوولەکەو مەسیحییەکانن؟ فەرمووی: ئەی ئەگەر ئەوان نەبن کێن!!

**باع:** بە ئەندازەی درێژی هەردوو باڵە.

**ذراع:** بە ئەندازەی درێژی باڵێکە.

## بابەت: فیتنەو ئاژاوەی سەروەت و سامان

٣٩٩٥- عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ، يَقُولُ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَقَالَ: «لَا وَاللَّهِ، مَا أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ إِلَّا مَا يُخْرِجُ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا»، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَأْتِي الْخَيْرُ بِالشَّرِّ؟ فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: كَيْفَ قُلْتَ؟ قَالَ: قُلْتُ: وَهَلْ يَأْتِي الْخَيْرُ بِالشَّرِّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْخَيْرَ لَا يَأْتِي إِلَّا بِخَيْرٍ، أَوَخَيْرٌ هُوَ؟ إِنَّ كُلَّ مَا يُنْبِتُ الرَّبِيعُ يَقْتُلُ حَبَطًا أَوْ يُلِمُّ، إِلَّا آكِلَةَ الْخَضِرِ، أَكَلَتْ حَتَّى إِذَا امْتَلَأَتِ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. انظر: البخاري: ٧٣١٩.




امْتَدَّتْ خَاصِرَتَاهَا، اسْتَقْبَلَتِ الشَّمْسَ، فَثَلَطَتْ وَبَالَتْ ثُمَّ اجْتَرَّتْ فَعَادَتْ فَأَكَلَتْ، فَمَنْ يَأْخُذْ مَالًا بِحَقِّهِ يُبَارَكْ لَهُ، وَمَنْ يَأْخُذْ مَالًا بِغَيْرِ حَقِّهِ، فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الَّذِي يَأْكُلُ وَلَا يَشْبَعُ»[1].

واتە: عیازی کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە ئەبو سەعیدی خودری بوو کە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو وتاری بۆ خەڵکیدا، جا فەرمووی: نەخێر، سوێند بە خوا ئەی خەڵکینە من لە هیچ شتێک لێتان ناترسم لەوە نەبێ کە ڕازاوەیی و جوانی و خۆشی دونیاتان بەسەردا بکرێتەوە، ئنجا پیاوێک پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا خێر شەڕ بەدوای خۆیدا دێنێ؟ جا پێغەمبەری خوا ﷺ ساتێک بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: چۆنت گوت؟ ئەویش گوتی: گوتم: وە ئایا خێر شەڕ بەدوای خۆیدا دێنێ؟ ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی خێر تەنیا خێر یان خێرتر لە خۆی بەدوای خۆیدا دێنێ، ئایا ئەوە خێرە؟ بەڕاستی هەموو ئەوەی کە لە بەهاراندا سەوز دەبێ ئاژەڵ دەکوژێ یان نزیکی دەکاتەوە لە مردن مەگەر ئەو ئاژەڵە نەبێ کە لەوەڕی باوی خۆی دەخوات، تاوەکو پڕ دەبێ و هەردوو کەلەکەی دەئاوسێن، پاشان ڕوو لە خۆر دەکات و پیسایی و میز دەکات، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ لەوەڕو دەست دەکاتەوە بە خواردن، جا هەرکەسێ سەروەت و سامان بە هەقی خۆی پەیدا بکات ئەوە بۆی بەرەکەتدار دەکرێ، وە هەرکەسێ سەروەت و سامان بە غەیری هەقی خۆی پەیدا بکات ئەوە وەکو ئەو ئاژەڵە وایە کە هەر دەخوات و تێر نابێ.

**٣٩٩٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «إِذَا فُتِحَتْ عَلَيْكُمْ خَزَائِنُ فَارِسَ وَالرُّومِ، أَيُّ قَوْمٍ أَنْتُمْ؟»، قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: نَقُولُ كَمَا أَمَرَنَا اللَّهُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوْ غَيْرَ ذَلِكَ تَتَنَافَسُونَ، ثُمَّ تَتَحَاسَدُونَ، ثُمَّ تَتَدَابَرُونَ، ثُمَّ تَتَبَاغَضُونَ، أَوْ نَحْوَ ذَلِكَ، ثُمَّ تَنْطَلِقُونَ فِي مَسَاكِينِ الْمُهَاجِرِينَ، فَتَجْعَلُونَ بَعْضَهُمْ عَلَى رِقَابِ بَعْضٍ»[2].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هاتو گەنجینەکانی فارس و ڕۆمتان بۆ کرایەوە ئێوە چ جۆرە گەلێک دەبن؟ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف گوتی: بەو شێوەیە دەڵێین کە خوا

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٦٥ و ٦٤٢٧، ومسلم: ١٠٥٢ و ٢٥٨١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٦٢.




فەرمانی پێکردووین (واتە: شوکرو سوپاسی ستایشی خوا دەکەین)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یان بەو شێوەیە نابن، مونافەسەی یەکتر دەکەن و پاشان حەسوودی بە یەکتر دەبەن و پاشان پشت لە یەکتری دەکەن و پاشان ڕق و کینتان لە یەکتر دەبێ یان شتێکی لەو جۆرە، پاشان دەچن دەست بەسەر سەروەت و ماڵی هەژارو کەم دەرامەتەکاندا دەگرن و خۆتان بەسەریاندا دەسەپێنن.

**٣٩٩٧-** عَنْ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ ﷺ، وَهُوَ حَلِيفُ بَنِي عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ، وَكَانَ شَهِدَ بَدْرًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، بَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ إِلَى الْبَحْرَيْنِ، يَأْتِي بِجِزْيَتِهَا، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ، هُوَ صَالَحَ أَهْلَ الْبَحْرَيْنِ، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمُ الْعَلَاءَ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ، فَقَدِمَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِمَالٍ مِنَ الْبَحْرَيْنِ، فَسَمِعَتِ الْأَنْصَارُ بِقُدُومِ أَبِي عُبَيْدَةَ، فَوَافَوْا صَلَاةَ الْفَجْرِ، مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، انْصَرَفَ فَتَعَرَّضُوا لَهُ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ رَآهُمْ، ثُمَّ قَالَ: «أَظُنُّكُمْ سَمِعْتُمْ أَنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ قَدِمَ بِشَيْءٍ مِنَ الْبَحْرَيْنِ؟»، قَالُوا: أَجَلْ، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «أَبْشِرُوا، وَأَمِّلُوا مَا يَسُرُّكُمْ، فَوَاللَّهِ مَا الْفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ، وَلَكِنِّي أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ الدُّنْيَا عَلَيْكُمْ، كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا، فَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ»[1].

واتە: عەمری کوڕی عەوف ﷺ کە هاوپەیمانی بەنو عامیری کوڕی لوئەی بووە، وە هەروەها لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداری جەنگی بەدری کردوە دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی نارد بۆ بەحرەین بۆئەوەی سەرانەی ئەوێ بهێنێ، وە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەهلی بەحرەین ڕێککەوتبوو ئەبو عەلائی کوڕی حەزرەمی کردبووە فەرمانڕەوایان، جا ئەبو عوبەیدە هاتەوەو ماڵێکی زۆریشی لە بەحرەینەوە لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، جا پشتیوانان بیستیان کە ئەبو عوبەیدە هاتۆتەوە، نوێژی بەیانییان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کرد، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد دەرچوو، جا (پشتیوانان) ڕوویان لێناو داوای بەشیان لێکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ کاتێ بەم حاڵەوە بینینی بزەیەکی کردو فەرمووی: وا دەزانم کە بیستوتانە ئەبو عوبەیدە لە بەحرەینەوە شتێکی هێناوە، گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: موژدەتان لێ بێ و ئومێدو هیواتان بە شتێ هەبێ کە دڵخۆشتان دەکات، سوێند بە خوا من لەوە ناترسم کە هەژارو نەداربن، بەڵکو لەوە دەترسم کە دونیا

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٥٨، ومسلم: ٢٩٦١، والترمذي: ٢٤٦٢.

ڕووتان تێبکات و بێ بەپیرتانەوە، هەروەک چۆن ڕووی کردە گەلانی پێش ئێوەو خۆشگوزەران بوون، ئێوەش پەلاماری بدەن و پێشبڕکێ بکەن لەسەری و لەناوتان بەرێ، وەک چۆن گەلانی پێش ئێوە پەلاماریان داو پێشبڕکێیان کرد لەسەری و لەناوی بردن.

## بابەت: ئافرەتان

**٣٩٩٨- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَدَعُ بَعْدِي فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ، مِنَ النِّسَاءِ»[1].**

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەدوای خۆم هیچ تاقیکردنەوەیەک جێ ناهێڵم بە ئەندازەی ئافرەت زیانبەخش بێ بۆ پیاوان.

**٣٩٩٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ صَبَاحٍ إِلَّا وَمَلَكَانِ يُنَادِيَانِ: وَيْلٌ لِلرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ، وَوَيْلٌ لِلنِّسَاءِ مِنَ الرِّجَالِ»[2].**

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ بەیانییەک نیە کە دوو فریشتە بانگەواز نەکەن و نەڵێن: هاوار بۆ پیاوان لە دەستی ئافرەتان و بۆ ئافرەتان لە دەستی پیاوان.

**٤٠٠٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: قَامَ خَطِيبًا فَكَانَ فِيمَا قَالَ: «إِنَّ الدُّنْيَا خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، وَإِنَّ اللَّهَ مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيهَا، فَنَاظِرٌ كَيْفَ تَعْمَلُونَ، أَلَا فَاتَّقُوا الدُّنْيَا، وَاتَّقُوا النِّسَاءَ»[3].**

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ (لەسەر مینبەر) هەستا بۆ ئامۆژگاری کردن و وتاردان، وە لە وتارەکەیدا فەرمووی: دونیا سەوزاییەکی خۆش و بەتامە، وە بێگومان خوا ئێوەی کردوە بە جێنشین لەناویدا، وە سەیر دەکات بزانێ کاروکردەوەتان چۆنە، جا هۆشیار بن و خۆتان بپارێزن لە فێڵ و تەڵەکەی دونیاو داوی ئافرەتان.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٩٦، ومسلم: ٢٧٤٠، والترمذي: ٢٧٨٠.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٤٢ دون قوله: «قَامَ خَطِيبًا»، والترمذي: ٢١٩١.




٤٠٠١- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ، إِذْ دَخَلَتِ امْرَأَةٌ مِنْ مُزَيْنَةَ تَرْفُلُ فِي زِينَةٍ لَهَا فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ انْهَوْا نِسَاءَكُمْ عَنْ لُبْسِ الزِّينَةِ، وَالتَّبَخْتُرِ فِي الْمَسْجِدِ، فَإِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ لَمْ يُلْعَنُوا حَتَّى لَبِسَ نِسَاؤُهُمُ الزِّينَةَ، وَتَبَخْتَرْنَ فِي الْمَسَاجِدِ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لەوکاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو مزگەوتدا دانیشتبوو ئافرەتێک لە هۆزی موزەینە هاتە ناو مزگەوت کە جلێکی درێژی لەبەردابوو خۆی پێوە هەڵدەکێشا لەناو مزگەوتدا، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی خەڵکینە ڕێگا مەدەن کە ئافرەتەکانتان لەناو مزگەوتدا جلی ڕازاوە لەبەربکەن و شانازی پێ بە خۆیانەوە بکەن، چونکە بەڕاستی بەنو ئیسرائیل لەعنەتیان لێ نەکرا تاوەکو ئافرەتەکانیان لەناو پەرستگاکاندا جلی ڕازاوەیان لەبەرنەکردو شانازییان بە خۆیانەوە نەکرد.

٤٠٠٢- عَنْ مَوْلَى أَبِي رُهْمٍ، وَاسْمُهُ عُبَيْدٌ ﵁، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ، لَقِيَ امْرَأَةً مُتَطَيِّبَةً تُرِيدُ الْمَسْجِدَ، فَقَالَ: يَا أَمَةَ الْجَبَّارِ أَيْنَ تُرِيدِينَ؟ قَالَتْ: الْمَسْجِدَ، قَالَ: وَلَهُ تَطَيَّبْتِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ تَطَيَّبَتْ، ثُمَّ خَرَجَتْ إِلَى الْمَسْجِدِ، لَمْ تُقْبَلْ لَهَا صَلَاةٌ حَتَّى تَغْتَسِلَ»[2].

واتە: خزمەتکاری ئەبو ڕوهم کە ناوی عوبەیدەیە ﵁ دەگێڕێتەوە، ئەبو هورەیرە بە ئافرەتێک گەیشت کە خۆی بۆنخۆش کردبوو نیازی مزگەوتی هەبوو، جا (ئەبو هورەیرە وەکو سەرزەنشت کردن و بەئاگا هێنانەوە) گوتی: ئەی «أمة الجبار» نیازی کوێت هەیە؟! گوتی: مزگەوت، گوتی: وە بۆ ئەوێ خۆت بۆنخۆش کردوە؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: دەنا من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دەیفەرموو: هەر ئافرەتێک خۆی بۆنخۆش بکات و لە ماڵ دەربچێ بە نیازی مزگەوت، هیچ نوێژێکی لێ وەرناگیرێ تاوەکو خۆی نەشوات (بۆئەوەی بۆنەکەی بڕوات).

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤١٧٤.

٤٠٠٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ، وَأَكْثِرْنَ مِنَ الِاسْتِغْفَارِ، فَإِنِّي رَأَيْتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ»، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ جَزْلَةٌ: وَمَا لَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ؟ قَالَ: «تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ، وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَغْلَبَ لِذِي لُبٍّ مِنْكُنَّ»، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا نُقْصَانُ الْعَقْلِ وَالدِّينِ؟ قَالَ: «أَمَّا نُقْصَانُ الْعَقْلِ: فَشَهَادَةُ امْرَأَتَيْنِ تَعْدِلُ شَهَادَةَ رَجُلٍ، فَهَذَا مِنْ نُقْصَانِ الْعَقْلِ، وَتَمْكُثُ اللَّيَالِيَ مَا تُصَلِّي، وَتُفْطِرُ فِي رَمَضَانَ، فَهَذَا مِنْ نُقْصَانِ الدِّينِ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی گرۆی ئافرەتان خێرو چاکە بکەن و زۆر داوای لێخۆشبوون لە خوا بکەن، چونکە بەڕاستی من بینیومە کە زۆرترین خەڵکی دۆزەخ لە ئێوەیە (ئافرەتان)، جا یەکێ لە ئافرەتەکان کە خاوەنی قسە بوو گوتی: بۆ مەگەر ئێمە چیمانە کە زۆرترینی خەڵکی دۆزەخین؟! فەرمووی: زۆر نەفرین دەکەن و سپڵەو پێ نەزانن لە ئاستی مێردەکانتان، کەسم نەدیوە کە وەکو ئێوە لەڕووی ئەقڵ و بیرکردنەوەو دینداریدا کەمتەرخەم و نوقسان بێ و لەگەڵ ئەوەشدا زاڵ بێ بەسەر کەسی وادا کە زۆر لە خۆتان بیرتیژترو زیرەکترە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نازیرەکی و کەم دینداری ئێمە لە چی دایە؟ فەرمووی: لایەنی نازیرەکی ئەقڵی ئێوە لەوەدایە کە شایەتیدانی دوو ئافرەت بەرانبەرە بە شایەتیدانی یەک پیاو، ئەوە لە لایەنی نازیرەکی ئەقڵییەوە، هەروەها ئافرەت چەندان شەو بێ نوێژکردن دەمێنێتەوە، وە لە ڕەمەزانیشدا ڕۆژوو دەشکێنێ (کە ئەو دووانەش بەهۆی سوڕی مانگاوەن)، جا ئەمەش لەڕووی کەموکوڕی دینداریتان.

## بابەت: فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپە

٤٠٠٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مُرُوا بِالْمَعْرُوفِ، وَانْهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ، قَبْلَ أَنْ تَدْعُوا فَلَا يُسْتَجَابَ لَكُمْ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٠، وأبو داود: ٤٦٧٩.

(٢) حسن لغيره.

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: فەرمان بکەن بە چاکەو ڕێگری بکەن لە خراپە پێش ئەوەی کە واتان لێبێ بانگەواز بکەن و وەڵامتان نەدرێتەوە (یان دوعا بکەن و قبوڵ نەبێت).

٤٠٠٥- عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ ﷺ، قَالَ: قَامَ أَبُو بَكْرٍ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ ﴿١٠٥﴾ ﴾ المائدة، وَإِنَّا سَمِعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوُا الْمُنْكَرَ لَا يُغَيِّرُونَهُ، أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ بِعِقَابِهِ»، قَالَ أَبُو أُسَامَةَ مَرَّةً أُخْرَى: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ[1].

واتە: قەیسی کوڕی ئەبو حازیم ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکر هەستا (بۆ وتاردان) و سوپاس و ستایشی خوای کردو پاشان گوتی: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ ﴿١٠٥﴾ ﴾ المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە هۆشتان بەخۆتانەوە بێ زیانتان پێناگەیەنێ ئەوەی گومڕا بووە ئەگەر ئێوە لەسەر ڕێی ڕاست بن (ڕێگری کردن لە خراپە بەشێکە لە ڕێنمونی وەرگرتن). وە بێگومان ئێمە گوێیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیفەرموو: هەرکاتێ خەڵکی تاوان و خراپەیان بینی و ڕێگرییان لێ نەکرد، ئەوە نزیکە خوا سزایەکی گشتییان بۆ بنێرێ و سەرجەمیان گیرۆدە بکات. جارێکی تر ئەبو ئوسامە گوتی: (ئەبو بەکر گوتی:) بێگومان من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو وای دەفەرموو.

٤٠٠٦- عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ لَمَّا وَقَعَ فِيهِمُ النَّقْصُ، كَانَ الرَّجُلُ يَرَى أَخَاهُ عَلَى الذَّنْبِ فَيَنْهَاهُ عَنْهُ، فَإِذَا كَانَ الْغَدُ لَمْ يَمْنَعْهُ مَا رَأَى مِنْهُ، أَنْ يَكُونَ أَكِيلَهُ وَشَرِيبَهُ وَخَلِيطَهُ، فَضَرَبَ اللَّهُ قُلُوبَ بَعْضِهِمْ بِبَعْضٍ، وَنَزَلَ فِيهِمُ الْقُرْآنُ» فَقَالَ: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ﴿٧٨﴾ ﴾ حَتَّى بَلَغَ ﴿ وَلَوۡ كَانُواْ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِيِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمۡ أَوۡلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ المائدة. قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، مُتَّكِئًا فَجَلَسَ، وَقَالَ: «لَا حَتَّى تَأْخُذُوا عَلَى يَدَيِ الظَّالِمِ، فَتَأْطِرُوهُ عَلَى الْحَقِّ أَطْرًا»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٣٨، والترمذي: ٢١٦٨ و ٣٠٥٧.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٣٣٦ و ٤٣٣٧، والترمذي: ٣٠٤٧.

واتە: ئەبو عوبەیدە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ کەموکوڕی لەنێو بەنو ئیسرائیلدا ڕوویدا، بەو شێوەیە بووکە: کاتێ پیاوێ دەگەیشت بە براکەی کارێکی خراپی بکردایە ڕێگری لێ دەکرد، بەڵام کاتێ بۆ ڕۆژی دواتر لەسەر ئەو حاڵە پێی دەگەیشتەوە ڕێگری لێ نەدەکرد، بەڵکو خۆشی لەگەڵی دەیخواردو دەیخواردەوەو دەبوو بە هاونشینی، جا کە حاڵیان گەیشت بەو ئاستە خوا دڵیانی تێکەڵ و پێکەڵ کردو کردنی بە فیتنەو ئاژاوە بۆ یەکتری، وە قورئانیشیان لەسەر دابەزی کە دەفەرمووێ: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ ﴿٧٨﴾ ﴾ المائدة، واتە: نەفرین کرا لەوانەی بێ بڕوابوون لەبەرەو نەوەی ئیسرائیل لەسەر زمانی داود و لەسەر زمانی عیسای کوڕی مەریەمیش، هەتاوەکو دەگاتە: ﴿ وَلَوۡ كَانُواْ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِيِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمۡ أَوۡلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ﴾ المائدة، واتە: وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بەخوا وە بە پێغەمبەر ﷺ و بەو بەرنامەیەی کە نێردراوەتە خوارەوە بۆ سەری ئەو بێ بڕوایانەیان نەدەکرد بەدۆست و خوشەویستی خۆیان بەڵام زۆربەیان لە ئاین دەرچوون و یاخین لە خوا. (ڕاوی) گوتی: وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوکاتەدا پاڵی دابۆوە هەستایەوەو فەرمووی: نەخێر (ڕزگارتان نابێ) تاوەکو ڕێ لە زۆری زۆرداران دەگرن و دەیانگێڕنەوە بۆ ڕێگەی ڕاست و نایەڵن لە ڕێی ڕاست لابدەن.

٤٠٠٦م- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ - أَمْلَاهُ عَلَيَّ - قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي الْوَضَّاحِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ بَذِيمَةَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ ﷺ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، بِمِثْلِهِ[1].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

٤٠٠٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ خَطِيبًا، فَكَانَ فِيمَا قَالَ: «أَلَا لَا يَمْنَعَنَّ رَجُلًا هَيْبَةُ النَّاسِ أَنْ يَقُولَ بِحَقٍّ إِذَا عَلِمَهُ» قَالَ: فَبَكَى أَبُو سَعِيدٍ، وَقَالَ: «قَدْ وَاللَّهِ رَأَيْنَا أَشْيَاءَ فَهِبْنَا»[2].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٣٣٦ و ٤٣٣٧، والترمذي: ٣٠٤٧.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢١٩١ مطولًا.

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷛ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو وتاریدا، جا لەوانەی کە باسی کرد ئەوە بوو کە فەرمووی: ئاگاداربن ترسی خەڵک واتان لێنەکات کە پیاو بزانێ شتێک هەق و ڕاستەو نەوێرێ بیڵێت، (ڕاوی) گوتی: جا ئەبو سەعید گریاو گوتی: بێگومان سوێند بە خوا شتانێکمان دیوەو لە ترسی خەڵکی نەمانوێراوە کە قسەی تێدا بکەین.

**٤٠٠٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷛، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَحْقِرْ أَحَدُكُمْ نَفْسَهُ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يَحْقِرُ أَحَدُنَا نَفْسَهُ؟ قَالَ: «يَرَى أَمْرًا لِلَّهِ عَلَيْهِ فِيهِ مَقَالٌ، ثُمَّ لَا يَقُولُ فِيهِ، فَيَقُولُ اللَّهُ ﷻ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تَقُولَ فِي كَذَا وَكَذَا؟ فَيَقُولُ: خَشْيَةُ النَّاسِ، فَيَقُولُ: فَإِيَّايَ كُنْتَ أَحَقَّ أَنْ تَخْشَى»**[١].

واتە: ئەبو سەعید ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێکتان نەفسی خۆی بێبەها نەکات، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن یەکێکمان نەفسی خۆی بێبەها دەکات؟! فەرمووی: بەوەی کە شتێک (کارێکی خراپ) دەبینێ کە لەسەری پێویستە لەپێناوی خوادا قسەیەکی تێدا بکات، بەڵام هیچ قسەی تێدا ناکات، جا خوای ﷻ لە ڕۆژی دواییدا پێی دەفەرمووێ: چی ڕێگری لێکردی کە لەوەدا ئاواو ئاوا بڵێی؟ ئەویش دەڵێ: ترسی خەڵک، ئنجا خوا دەفەرمووێ: بەڕاستی من شایستەتر بووم بەوەی کە لێم بترسی.

**٤٠٠٩- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷛، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ قَوْمٍ يُعْمَلُ فِيهِمْ بِالْمَعَاصِي، هُمْ أَعَزُّ مِنْهُمْ وَأَمْنَعُ، لَا يُغَيِّرُونَ، إِلَّا عَمَّهُمُ اللَّهُ بِعِقَابٍ»**[٢].

واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی جەریر لە باوکییەوە ﷛ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ قەوم و گەلێک نیە کە تاوان و خراپەکارییان لەناودا دەکرێ و ئەوانیش بە تواناو دەسەڵاتترن کە نەهێڵن و ڕێگری بکەن لەو تاوانکارییە، بەڵام نایکەن و نایگۆڕن، ئەوە بێگومان خوا سزایەکی گشتییان بۆ دەنێرێ و سەرجەمیان گیرۆدە دەکات.

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٣٣٩.

٤٠١٠- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا رَجَعَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُهَاجِرَةُ الْبَحْرِ، قَالَ: «أَلَا تُحَدِّثُونِي بِأَعَاجِيبِ مَا رَأَيْتُمْ بِأَرْضِ الْحَبَشَةِ؟» قَالَ فِتْيَةٌ مِنْهُمْ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللَّهِ بَيْنَا نَحْنُ جُلُوسٌ مَرَّتْ بِنَا عَجُوزٌ مِنْ عَجَائِزِ رَهَابِينِهِمْ، تَحْمِلُ عَلَى رَأْسِهَا قُلَّةً مِنْ مَاءٍ، فَمَرَّتْ بِفَتًى مِنْهُمْ، فَجَعَلَ إِحْدَى يَدَيْهِ بَيْنَ كَتِفَيْهَا، ثُمَّ دَفَعَهَا فَخَرَّتْ عَلَى رُكْبَتَيْهَا، فَانْكَسَرَتْ قُلَّتُهَا، فَلَمَّا ارْتَفَعَتِ الْتَفَتَتْ إِلَيْهِ، فَقَالَتْ: سَوْفَ تَعْلَمُ يَا غُدَرُ إِذَا وَضَعَ اللَّهُ الْكُرْسِيَّ، وَجَمَعَ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ، وَتَكَلَّمَتِ الْأَيْدِي وَالْأَرْجُلُ، بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ، فَسَوْفَ تَعْلَمُ كَيْفَ أَمْرِي وَأَمْرُكَ عِنْدَهُ غَدًا، قَالَ: يَقُولُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَدَقَتْ، صَدَقَتْ كَيْفَ يُقَدِّسُ اللَّهُ أُمَّةً لَا يُؤْخَذُ لِضَعِيفِهِمْ مِنْ شَدِيدِهِمْ؟»[1].

واته: جابیر ﷺ دەڵێ: کاتێ کە لە موهاجەڕەی بەحر (ئەو کۆمەڵەیە بوون کە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە) گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئایا باسی ئەو شتە سەرسوڕهێنەرانەم بۆ ناکەن کە لە خاکی حەبەشەدا بینیوتانە؟ کۆمەڵێک لەوان گوتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتێ کە ئێمە دانیشتبووین پیرەژنێک کە لە پیرە ڕەهبانییەکان بەلاماندا تێپەڕی کە گۆزەیەکی گەورەی ئاوی لەسەر سەری هەڵگرتبوو، جا بەلای گەنجێکی خۆیاندا تێپەڕی، ئەویش دەستێکی خستە نێوان شانەکانی و پاڵی پێوەنا، بۆیە بەسەر ئەژنۆکانیدا کەوت و گۆزەکەی شکا، جا کاتێ هەستایەوە ئاوڕی بۆ دایەوەو گوتی: ئەی ستەمکار لە داهاتوویەکی نزیکدا دەزانی کاتێ خوا کورسی داناو خەڵکانی پێشین و پاشینی کۆکردەوەو دەست و قاچەکان بە قسە هاتن و باسی ئەوەیان کرد کە ئەنجامیان داوە، لێرە بەدواوە سبەی ڕۆژ دەزانی کەوا بڕیاری خوا لەنێوان من و تۆ دا (لەسەر ئەو کارەی کە کردت چییەو چۆنە). (ڕاوی) گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ڕاستی کرد، ڕاستی کرد، چۆن خوا گەلێک بەرزو ڕێزدار دەکات کە مافی لاوازەکانیان لە بەهێزەکانیان وەرنەگیرێتەوە.

٤٠١١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ»[2].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٣٤٤، والترمذي: ٢١٧٤.




واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەترین و باشترین جیهادو تێکۆشان گوتنی قسەی هەق و ڕاستییە لەبەردەم دەسەڵاتداری زاڵم و ستەمکاردا.

٤٠١٢- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: عَرَضَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ عِنْدَ الْجَمْرَةِ الْأُولَى، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الْجِهَادِ أَفْضَلُ؟ فَسَكَتَ عَنْهُ، فَلَمَّا رَمَى الْجَمْرَةَ الثَّانِيَةَ، سَأَلَهُ، فَسَكَتَ عَنْهُ، فَلَمَّا رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، وَضَعَ رِجْلَهُ فِي الْغَرْزِ لِيَرْكَبَ، قَالَ: «أَيْنَ السَّائِلُ؟» قَالَ: أَنَا، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «كَلِمَةُ حَقٍّ عِنْدَ ذِي سُلْطَانٍ جَائِرٍ»[١].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: لە جەمرەی یەکەمدا پیاوێک هاتە پێش پێغەمبەری خوا ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەورەترین بەشی جیهاد کامەیە؟ ئەویش لێی بێدەنگ بوو، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەجمی جەمرەی دووەمی کرد پرسیاری لێکردەوە، ئەوەیش بێدەنگ بوو، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ ڕەجمی جەمرەی عەقەبەی کرد پێی خستە ناو ئاوزەنگی وڵاخەکەی بۆئەوەی سەرکەوێت، (لەوکاتەدا) فەرمووی: کوا پرسیارکەرەکە؟ (کابرا) گوتی: منم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: گوتنی هەق و ڕاستییە لەبەردەم دەسەڵاتداری ستەمکاردا.

٤٠١٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: أَخْرَجَ مَرْوَانُ الْمِنْبَرَ فِي يَوْمِ عِيدٍ، فَبَدَأَ بِالْخُطْبَةِ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا مَرْوَانُ خَالَفْتَ السُّنَّةَ، أَخْرَجْتَ الْمِنْبَرَ فِي هَذَا الْيَوْمِ، وَلَمْ يَكُنْ يُخْرَجُ، وَبَدَأْتَ بِالْخُطْبَةِ قَبْلَ الصَّلَاةِ، وَلَمْ يَكُنْ يُبْدَأُ بِهَا، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أَمَّا هَذَا فَقَدْ قَضَى مَا عَلَيْهِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا، فَاسْتَطَاعَ أَنْ يُغَيِّرَهُ بِيَدِهِ، فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: مەڕوان لە ڕۆژی جەژندا مینبەرەکەی دەرکردو پێش ئەوەی نوێژ بکات وتاریدا، جا پیاوێک گوتی: ئەی مەڕوان پێچەوانەی سوننەت جوڵایتەوە، (بەوەی کە) لەم ڕۆژەدا مینبەرەکەت دەرکرد وە پێشتر دەرنەدەکرا، هەروەها پێش نوێژکردن دەستت کرد بە وتاردان کە لەمەوپێش بەوە دەست پێنەدەکرا،

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٩، وأبو داود: ١١٤٠ و ٤٣٤٠، والترمذي: ٢١٧٢، والنسائي: ٥٠٠٨ و ٥٠٠٩.

ئنجا ئەبو سەعید گوتی: بەڕاستی ئەو پیاوە ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێهێنا، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر یەکێ لە ئێوە شتێکی ناڕەوای بینی و دەیتوانی بە دەستی بیگۆڕێ، با بە دەست و بازووی بیگۆڕێ و ڕێگری لێ بکات، ئەگەر نەیتوانی با بە زمانی بیگۆڕێ، خۆ ئەگەر هەر نەیتوانی ئەوە با لە دڵی خۆیدا پێی ناخۆش بێ، کە ئەوەش لاوازترینی ئیمانە.

### بابەت: ڕوونکردنەوەی ئایەتی:

### ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ ﴿١٠٥﴾ ﴾ المائدة

٤٠١٤- عَنْ أَبِي أُمَيَّةَ الشَّعْبَانِيِّ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ أَبَا ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيَّ، قَالَ: قُلْتُ: كَيْفَ تَصْنَعُ فِي هَذِهِ الْآيَةِ؟ قَالَ: أَيَّةُ آيَةٍ؟ قُلْتُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ ﴿١٠٥﴾ ﴾ المائدة، قَالَ: سَأَلْتَ عَنْهَا خَبِيرًا، سَأَلْتُ عَنْهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «بَلِ ائْتَمِرُوا بِالْمَعْرُوفِ، وَتَنَاهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ، حَتَّى إِذَا رَأَيْتَ شُحًّا مُطَاعًا، وَهَوًى مُتَّبَعًا، وَدُنْيَا مُؤْثَرَةً، وَإِعْجَابَ كُلِّ ذِي رَأْيٍ بِرَأْيِهِ، وَرَأَيْتَ أَمْرًا لَا يَدَانِ لَكَ بِهِ، فَعَلَيْكَ خُوَيْصَّةَ نَفْسِكَ، وَدَعْ أَمْرَ الْعَوَامِّ، فَإِنَّ مِنْ وَرَائِكُمْ أَيَّامَ الصَّبْرِ، الصَّبْرُ فِيهِنَّ عَلَى مِثْلِ قَبْضٍ عَلَى الْجَمْرِ، لِلْعَامِلِ فِيهِنَّ مِثْلُ أَجْرِ خَمْسِينَ رَجُلًا، يَعْمَلُونَ بِمِثْلِ عَمَلِهِ»[1].

واتە: ئەبو ئومەییەی شەعبانیی ﷺ دەڵێ: هاتم بۆلای ئەبو سەعلەبەی خوشەنی و گوتم: چی دەڵێی دەربارەی ئەو ئایەتە؟ گوتی: کامە ئایەت؟ گوتم: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ ﴿١٠٥﴾ ﴾ المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە هۆشتان بەخۆتانەوە بێ زیانتان پێناگەیەنێ ئەوەی گومڕا بووە ئەگەر ئێوە لەسەر ڕێی ڕاست بن (ڕێگری کردن لە خراپە بەشێکە لە ڕێنمونی وەرگرتن). گوتی: پرسیارت لە کەسێکی شارەزا کرد دەربارەی، من دەربارەی (ئەو ئایەتە) پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: بەڵکو ئێوە هەر فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن، تا ئەوکاتەی کە دەبینی چروکی و ڕەزیلی و سووربوون بۆ بەدەستهێنانی ماڵ و سامان زاڵ دەبێ بەسەر خەڵکداو شوێن هەواو ئارەزوو دەکەون و خۆشەویستی دنیا زاڵ دەبێ بەسەریاندا، هەروەها هەر کەس

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٣٤١، والترمذي: ٣٠٥٨.

ڕای خۆی لا پەسند دەبێت، وە کارگەلێک دەبینی کە لە تواناتدا نیە ڕێگرییان لێ بکەی، ئەوکاتە خەمی خۆتت بێ و واز لە کاری خەڵکی بێنە، وە بەڕاستی ڕۆژانی ئارامگرتنتان لەبەردەم دایە، کە ئارامگرتن لەوکاتانەدا وەکو پشکۆ گرتن بە دەستەوە وایە، ئەوەی لەناویاندا کاردەکات لەو سەردەمەدا (واتە: فەرمان بە چاکە دەکات و ڕێگری لە خراپە دەکات) پاداشتی پەنجا پیاوی جگە لەو ڕۆژگارەی هەیە کە هەمان کار دەکەن.

**٤٠١٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى نَتْرُكُ الْأَمْرَ بِالْمَعْرُوفِ، وَالنَّهْيَ عَنِ الْمُنْكَرِ؟ قَالَ: «إِذَا ظَهَرَ فِيكُمْ مَا ظَهَرَ فِي الْأُمَمِ قَبْلَكُمْ»، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا ظَهَرَ فِي الْأُمَمِ قَبْلَنَا؟ قَالَ: «الْمُلْكُ فِي صِغَارِكُمْ، وَالْفَاحِشَةُ فِي كِبَارِكُمْ، وَالعِلْمُ فِي رُذَالَتِكُمْ» قَالَ زَيْدٌ: تَفْسِيرُ مَعْنَى قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «وَالْعِلْمُ فِي رُذَالَتِكُمْ»، إِذَا كَانَ الْعِلْمُ فِي الْفُسَّاقِ»[1].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ کاتێک وازدێنین لە فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپە؟ فەرمووی: کاتێ کە ئەوەی لە گەلانی پێش خۆتاندا سەری هەڵدا لەناو ئێوەشدا سەری هەڵدا، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە چی بوو کە لەناو گەلانی پێش خۆماندا سەری هەڵدا؟ فەرمووی: بچوکەکانتان (لە ڕووی) تەمەنەوە دەبنە فەرمانڕەواو دەسەڵاتدار، وە کاری فاحیشەو بێ ئابڕوویی لەناو پیرەکانتاندا زۆر دەبێت، وە زانست و زانیاری لای کاڵفام و دنیا ویستەکانتانە. زەید لە ڕوونکردنەوەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (وە زانست و زانیاری لای کاڵ فام و دنیا ویستەکانتە)، گوتی: ئەگەر هات و زانست و زانیاری لای بەدکارو یاخییەکان بوو.

**٤٠١٦- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَنْبَغِي لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يُذِلَّ نَفْسَهُ»، قَالُوا: وَكَيْفَ يُذِلُّ نَفْسَهُ؟ قَالَ: «يَتَعَرَّضُ مِنَ الْبَلَاءِ لِمَا لَا يُطِيقُهُ»[2].**

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ هیچ مسوڵمانێک دروست نیە کە خۆی زەلیل بکات، گوتیان: جا چۆن خۆی زەلیل دەکات؟ فەرمووی: خۆی دەخاتە ناو داوی بەڵایەکەوە کە بەرگەی ناگرێت.

---

(١) حسن - لعنعة مكحول.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٢٥٤.

**٤٠١٧- عَنْ نَهَارٌ الْعَبْدِيُّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ لَيَسْأَلُ الْعَبْدَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، حَتَّى يَقُولَ: مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَ الْمُنْكَرَ أَنْ تُنْكِرَهُ؟ فَإِذَا لَقَّنَ اللَّهُ عَبْدًا حُجَّتَهُ، قَالَ: يَا رَبِّ رَجَوْتُكَ، وَفَرِقْتُ مِنَ النَّاسِ»[١].**

**واتە: نەهاری عەبدی دەگێڕێتەوە کە گوێی لە ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ بووە دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی خوا لە ڕۆژی دواییدا لێپرسینەوە لە بەندەکەی دەکات، تاوەکو دەفەرمووێ: چی ڕێگری لێکردی کە کاری خراپەت بینی نکوڵی و ڕێگری لێ بکەی؟ جا کاتێ خوا بەڵگەی بەندەکەی ئەخاتە دڵییەوە، دەڵێ: ئەی پەروەردگار لە ترسی خراپەی خەڵکی و بە ئومێد بوون بە لێخۆشبوونی تۆ.**

## بابەت: سزاکان

**٤٠١٨- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يُمْلِي لِلظَّالِمِ، فَإِذَا أَخَذَهُ، لَمْ يُفْلِتْهُ»، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾ هود[٢].**

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوا تا ماوەیەک مۆڵەتی ستەمکار دەدات، جا کاتێ کە گرتی و لەناوی برد ئیتر قوتاری نابێ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾﴾ هود، واتە: ئا بەو شێوەیە سزادانی پەروەردگارت کاتێک خەڵکی شارەکان سزا دەدات لە کاتێکدا ستەمکاربوون بەڕاستی تۆڵە سەندنی ئەو ئازاردەرو بەتینە.**

**٤٠١٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: أَقْبَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ: لَمْ تَظْهَرِ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَطُّ، حَتَّى يُعْلِنُوا بِهَا، إِلَّا فَشَا فِيهِمُ الطَّاعُونُ، وَالْأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلَافِهِمُ الَّذِينَ مَضَوْا، وَلَمْ يَنْقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ، إِلَّا أُخِذُوا بِالسِّنِينَ، وَشِدَّةِ الْمَئُونَةِ، وَجَوْرِ السُّلْطَانِ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يَمْنَعُوا زَكَاةَ**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٦٨٦، ومسلم: ٢٥٨٣، والترمذي: ٣١١٠.

**أَمْوَالِهِمْ، إِلَّا مُنِعُوا الْقَطْرَ مِنَ السَّمَاءِ، وَلَوْلَا الْبَهَائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا، وَلَمْ يَنْقُضُوا عَهْدَ اللَّهِ، وَعَهْدَ رَسُولِهِ، إِلَّا سَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ غَيْرِهِمْ، فَأَخَذُوا بَعْضَ مَا فِي أَيْدِيهِمْ، وَمَا لَمْ تَحْكُمْ أَئِمَّتُهُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ، وَيَتَخَيَّرُوا مِمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ، إِلَّا جَعَلَ اللَّهُ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ»**[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان و فەرمووی: ئەی گرۆی کۆچکەران پێنج شت هەیە کە پێیان تاقی بکرێنەوە، وە پەنا دەگرم بە خوا کە بیان بینن و پێیان بگەن: هیچ گەلێک نیە فاحیشەو بێ ئابڕوویيان تێدا سەرهەڵدا تاوەکو وای لێ بێ بە ئاشکرایی و بەربڵاوی ئەنجام بدرێ ئیلا تاعون و نەخۆشی و ئێش و ئازار لەناویاندا بڵاودەبێتەوە کە لە پێشینانی خۆیاندا شتی وا نەبووەو ڕووی نەداوە، وە لە کێشان و پێوانەدا فێڵ ناکەن و بەکەمییەوە نایکێشن ئیلا سزا دەدرێن بە برسییەتی و قات و قڕی و کەمی پێداویستی و زۆرداری دەسەڵاتدار لەسەریان، وە کە زەکاتی سەروەت و سامانیان نادەن ئیلا باران بارینی ئاسمانیان لێ کەم دەکرێتەوە، خۆ ئەگەر لەبەر ئاژەڵانی تر نەبێ ئەوە بە یەکجاری باران دەگیردرێتەوەو ناباریّ، وە بەڵێن و پەیمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ناشکێنن و پشت گوێی ناخەن ئیلا خوا دوژمنێکیان لە غەیری خۆیان بەسەردا زاڵ دەکات کە بەشێک لەوەی لەژێر دەستیان دایە لەژێر دەستیانی دەردێنن، وە ئەگەر پێشەواو سەرۆکەکانیان حوکم بە کتێبی خوا نەکەن و فەرمانەکانی خوا هەڵنەبژێرن ئیلا خوا فیتنەو ئاشوب و ئاژاوە لەناویاندا بەرپا دەکات.

**٤٠٢٠- عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيَشْرَبَنَّ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ، يُسَمُّونَهَا بِغَيْرِ اسْمِهَا، يُعْزَفُ عَلَى رُءُوسِهِمْ بِالْمَعَازِفِ، وَالْمُغَنِّيَاتِ، يَخْسِفُ اللَّهُ بِهِمُ الْأَرْضَ، وَيَجْعَلُ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ»**[٢].

واتە: ئەبو مالیکی ئەشعەریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکانێک لە ئوممەتی من شەڕاب دەخۆنەوەو ناوی تری لێ دەنێن، گۆرانی و مۆسیقا بەسەر سەریانەوە لێ دەدرێ و ئافرەتی گۆرانیبێژ گۆرانییان بۆ دەڵێ، جا خوا بەناخی زەویدا دەیانباتە خوارەوەو دەیانکاتە مەیمون و بەراز.

---

(١) حسن لغيره.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٦٨٨.

٤٠٢١- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ البقرة، قَالَ: «دَوَابُّ الْأَرْضِ»[1].

واتە: بەرِائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانای ئەو ئایەتەدا: ﴿ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ البقرة، واتە: خودا نەفرەتیان لێ دەکات وە نەفرەتکارانیش نەفرەتیان لێ دەکەن، فەرموویەتی: بریتین لە گیانەوەرانی سەر زەوی.

٤٠٢٢- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَزِيدُ فِي الْعُمْرِ إِلَّا الْبِرُّ، وَلَا يَرُدُّ الْقَدَرَ إِلَّا الدُّعَاءُ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيُحْرَمُ الرِّزْقَ بِالذَّنْبِ يُصِيبُهُ»[2].

واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێک تەمەن زیاد ناکات تەنها چاکەکاری نەبێت، وە هیچ شتێک قەدەری خوا ناگێڕێتەوە تەنها پاڕانەوە نەبێت، وە بەڕاستی پیاو بەهۆی تاوانێک کە ئەنجامی دەدات لە ڕزق و ڕۆزی بێبەش دەکرێ.

## بابەت: ئارامگرتن لەسەر بەڵاو نەهامەتی

٤٠٢٣- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ النَّاسِ أَشَدُّ بَلَاءً؟ قَالَ: «الْأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الْأَمْثَلُ فَالْأَمْثَلُ، يُبْتَلَى الْعَبْدُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ صُلْبًا، اشْتَدَّ بَلَاؤُهُ، وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ، ابْتُلِيَ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَمَا يَبْرَحُ الْبَلَاءُ بِالْعَبْدِ، حَتَّى يَتْرُكَهُ يَمْشِي عَلَى الْأَرْضِ، وَمَا عَلَيْهِ مِنْ خَطِيئَةٍ»[3].

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە کێن کە تووشی سەختترین بەڵاو تاقیکردنەوە دەبن؟ فەرمووی: پێغەمبەران لەپاشدا شایستەترو شایستەتر، هەر کەسێ بەگوێرەی دینداری خۆی تاقی دەکرێتەوەو تووشی بەڵاو مەینەتی دەبێت، جا ئەگەر دینداریيەکەی پتەو بوو تاقیکردنەوەکەی توندترو گرانتر دەبێ، وە ئەگەر نەرم و نیانی لە دینداریيەکەیدا هەبوو بەپێی ئەوە

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) حسن، دون قوله: «وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيُحْرَمُ الرِّزْقَ بِالذَّنْبِ يُصِيبُهُ».

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٣٩٨.



تاقی دەکرێتەوە، وە ئەو تاقیکردنەوانەش بەردەوام لە کۆڵی بەندە نابنەوە هەتاوەکو وای لێ دێ بەسەر زەویدا دەڕوات و گوناهی نامێنێ.

٤٠٢٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يُوعَكُ، فَوَضَعْتُ يَدِي عَلَيْهِ فَوَجَدْتُ حَرَّهُ بَيْنَ يَدَيَّ فَوْقَ اللِّحَافِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَشَدَّهَا عَلَيْكَ قَالَ: «إِنَّا كَذَلِكَ يُضَعَّفُ لَنَا الْبَلَاءُ، وَيُضَعَّفُ لَنَا الْأَجْرُ» قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ النَّاسِ أَشَدُّ بَلَاءً؟ قَالَ: «الْأَنْبِيَاءُ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ الصَّالِحُونَ، إِنْ كَانَ أَحَدُهُمْ لَيُبْتَلَى بِالْفَقْرِ، حَتَّى مَا يَجِدُ أَحَدُهُمْ إِلَّا الْعَبَاءَةَ يَحُوبُهَا، وَإِنْ كَانَ أَحَدُهُمْ لَيَفْرَحُ بِالْبَلَاءِ، كَمَا يَفْرَحُ أَحَدُكُمْ بِالرَّخَاءِ»[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە تای لێ بوو، جا دەستم لەسەر جەستەی داناو لەسەر پێخەفەکەیەوە هەستم بە گەرمی جەستەی کرد، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تایەکەت چەندە بەتینە! فەرمووی: ئێمە بەو جۆرەین، توندی تاقیکردنەوەکانمان دوو بەرانبەری کەسانی ترە هەر وەکو چۆن پاداشتیشمان دوو بەرانبەرە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە کێن کە تووشی سەختترین بەڵاو تاقیکردنەوە دەبن؟ فەرمووی: پێغەمبەران، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەپاشدا کێ؟ فەرمووی: لەپاشدا چاکەکاران و بۆ خوا سوڵحاوان، هی وایان هەیە کە بە هەژاری تاقی دەکرێتەوەو هیچ شتێکی نیە جگە لە عەبایەک نەبێ کە خۆی پێ دادەپۆشێ، وە هەیانە بە سەختی و ئازارەکان بە جۆرێک دڵخۆش دەبێ هەروەکو ئێوە بە خۆشی و ئاسودەییەکان دڵخۆش دەبن.

٤٠٢٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ يَحْكِي نَبِيًّا مِنَ الْأَنْبِيَاءِ، ضَرَبَهُ قَوْمُهُ، وَهُوَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ، وَيَقُولُ: «رَبِّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ»[2].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: وەکو ئەوە وایە کە ئێستا سەیری پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم کە بەسەرهاتی پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرەکانی دەگێڕایەوە کە گەلەکەی لێیان داوە ئەویش خوێنی ڕوخساری پاک دەکردەوەو دەیفەرموو: پەروەردگارا لە گەلەکەم خۆشبە، چونکە بەڕاستی ئەوان نازانن و تێ نەگەیشتوون.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٧٧، ومسلم: ١٧٩٢.

٤٠٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَحْنُ أَحَقُّ بِالشَّكِّ مِنْ إِبْرَاهِيمَ، إِذْ قَالَ: رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى، قَالَ: أَوَلَمْ تُؤْمِنْ؟ قَالَ: بَلَى، وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي، وَيَرْحَمُ اللَّهُ لُوطًا، لَقَدْ كَانَ يَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ، وَلَوْ لَبِثْتُ فِي السِّجْنِ طُولَ مَا لَبِثَ يُوسُفُ لَأَجَبْتُ الدَّاعِيَ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر (ئیبراهیم لە پرسیارکردنەکەی) شک و گومانی هەبایە ئەوە ئێمە شایستەتر بووین لەوەی کە گومان بکەین کاتێ کە فەرمووی: «رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى»، واتە: ئەی پەروەردگاری من نیشانم بدە (با بە چاوی سەر ببینم) کە تۆ چۆن مردووان زیندوو ئەکەیتەوە (کەواتە ئیبراهیم گومانی نەبووە). فەرمووی: ئایا بڕوات نیە؟ گوتی: بەڵێ بڕوام هەیە، بەڵام بۆئەوەی دڵم ئارام و دامەزراو بێت، هەروەها خوا ڕەحمەتی خۆی برێژێ بەسەر «لوط»دا کە دەیویست پەنا ببات بۆلای کەسێکی خاوەن دەسەڵات و بە ناموس کە بەرگری لێبکات، خۆ ئەگەر بە ئەندازەی ماوەی یوسف لە زینداندا مابامەوە ئەوە وەڵامی داواکارەکەم دەدایەوە (مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە بەهێزی و خۆڕاگری و ئارامگری پێغەمبەر یوسفە (على نبينا وعليه الصلاة والسلام).

٤٠٢٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ كُسِرَتْ رَبَاعِيَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَشُجَّ، فَجَعَلَ الدَّمُ يَسِيلُ عَلَى وَجْهِهِ، وَجَعَلَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ، وَيَقُولُ: «كَيْفَ يُفْلِحُ قَوْمٌ خَضَبُوا وَجْهَ نَبِيِّهِمْ بِالدَّمِ، وَهُوَ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللَّهِ؟» فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ آل عمران»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کاتێ کە ڕۆژی جەنگی ئوحود بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ددانە چوارینەکەی شکاو سەری بریندار بوو، جا خوێن بە دەم و چاویدا دەهاتە خوارێ، ئەویش خوێنی دەم و چاوی دەسڕی و دەیفەرموو: چۆن گەلێک ڕزگاریان دەبێ کە ڕوومەتی پێغەمبەرەکەیان ﷺ شەلاڵ بکەن لە خوێندا، لەکاتێکدا کە ئەو بانگیان دەکات بۆلای خوا؟! ئنجا خوای ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ آل عمران، واتە: دەربارەی هەڵهاتووەکانی شەڕی ئوحود بە ڕاستی بەدەست تۆ نیە (ئەی موحەممەد ﷺ) هیچ شتێک لەو کارەدا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٧٢، ومسلم: ١٥١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧٩١، والترمذي: ٣٠٠٢ و ٣٠٠٣.

٤٠٢٨- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ جِبْرِيلُ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ جَالِسٌ حَزِينٌ قَدْ خُضِّبَ بِالدِّمَاءِ، قَدْ ضَرَبَهُ بَعْضُ أَهْلِ مَكَّةَ، فَقَالَ: مَا لَكَ؟ فَقَالَ: «فَعَلَ بِي هَؤُلَاءِ، وَفَعَلُوا»، قَالَ: أَتُحِبُّ أَنْ أُرِيَكَ آيَةً؟ قَالَ: «نَعَمْ، أَرِنِي» فَنَظَرَ إِلَى شَجَرَةٍ مِنْ وَرَاءِ الْوَادِي، قَالَ: ادْعُ تِلْكَ الشَّجَرَةَ، فَدَعَاهَا فَجَاءَتْ تَمْشِي، حَتَّى قَامَتْ بَيْنَ يَدَيْهِ، قَالَ: قُلْ لَهَا فَلْتَرْجِعْ، فَقَالَ لَهَا، فَرَجَعَتْ حَتَّى عَادَتْ إِلَى مَكَانِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «حَسْبِي»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ڕۆژێک لە ڕۆژان جیبریل ﷺ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، کە بە دڵتەنگی دانیشتبوو شوێنەواری ڕەنگی خوێن بە ڕوخسارییەوە دیار بوو کە خەڵکی ئازاریان دابوو، جا (جیبریل) فەرمووی: ئەوە چیت بەسەرهاتووە، فەرمووی: ئەو خەڵکانە ئەوەیان بەسەر هێناوم و ئەم کارەیان بە من کردوە، جا (جیبریل) فەرمووی: ئایا پێت خۆشە کە نیشانەیەکت (لەسەر گەورەیی و ڕێزی خۆت) پیشان بدەم؟ فەرمووی: بەڵێ، پیشانم بدە، جا (جیبریل) تەماشای دارێکی کرد کە لە پشتەوەی شیوەکە بوو، وە فەرمووی: بانگی ئەو دارە بکە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ بانگی دارەکەی کردو یەکسەر دارەکە دەستی بە ڕۆیشتن کردو هات تاوەکو گەیشتە بەردەمی پێغەمبەر ﷺ، جیبریل فەرمووی: بە دارەکە بڵێ بگەڕێتەوە، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو، بۆیە دارەکە گەڕایەوە تا گەیشتەوە شوێنی خۆی، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەو نیشانەیە) بەسمە.

٤٠٢٩- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَحْصُوا لِي كُلَّ مَنْ تَلَفَّظَ بِالْإِسْلَامِ»، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَخَافُ عَلَيْنَا، وَنَحْنُ مَا بَيْنَ السِّتِّمِائَةِ إِلَى السَّبْعِمِائَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّكُمْ لَا تَدْرُونَ، لَعَلَّكُمْ أَنْ تُبْتَلُوا»، قَالَ: فَابْتُلِينَا، حَتَّى جَعَلَ الرَّجُلُ مِنَّا مَا يُصَلِّي إِلَّا سِرًّا[٢].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو ئەوانەم بۆ ببژێرن کەوا دانیان بە مسوڵمان بوون ناوە، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ترست لێمان هەیە لەکاتێکدا کە ئێمە ژمارەمان لەنێوان شەش سەد بۆ حەوت سەد کەسە؟ ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێوە نازانن بەڵکو تاقی بکرێنەوە (بە بەڵاو ناخۆشی).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٦٠، ومسلم: ١٤٩ باختلاف.





(ڕاوی) گوتی: جا ئێمە تاقی کراینەوە تاوەکو وای لێهات پیاوێ لە ئێمە نەیئەتوانی نوێژ بکات مەگەر بە نهێنی نەبێت.

**٤٠٣٠-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ وَجَدَ رِيحًا طَيِّبَةً، فَقَالَ: «يَا جِبْرِيلُ مَا هَذِهِ الرِّيحُ الطَّيِّبَةُ؟» قَالَ: هَذِهِ رِيحُ قَبْرِ الْمَاشِطَةِ وَابْنَيْهَا وَزَوْجِهَا، قَالَ: وَكَانَ بَدْءُ ذَلِكَ أَنَّ الْخَضِرَ كَانَ مِنْ أَشْرَافِ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَكَانَ مَمَرُّهُ بِرَاهِبٍ فِي صَوْمَعَتِهِ، فَيَطَّلِعُ عَلَيْهِ الرَّاهِبُ، فَيُعَلِّمُهُ الْإِسْلَامَ، فَلَمَّا بَلَغَ الْخَضِرُ، زَوَّجَهُ أَبُوهُ امْرَأَةً فَعَلَّمَهَا الْخَضِرُ، وَأَخَذَ عَلَيْهَا أَنْ لَا تُعْلِمَهُ أَحَدًا، وَكَانَ لَا يَقْرَبُ النِّسَاءَ، فَطَلَّقَهَا ثُمَّ زَوَّجَهُ أَبُوهُ أُخْرَى، فَعَلَّمَهَا وَأَخَذَ عَلَيْهَا أَنْ لَا تُعْلِمَهُ أَحَدًا، فَكَتَمَتْ إِحْدَاهُمَا، وَأَفْشَتْ عَلَيْهِ الْأُخْرَى، فَانْطَلَقَ هَارِبًا حَتَّى أَتَى جَزِيرَةً فِي الْبَحْرِ، فَأَقْبَلَ رَجُلَانِ يَحْتَطِبَانِ فَرَأَيَاهُ، فَكَتَمَ أَحَدُهُمَا، وَأَفْشَى الْآخَرُ، وَقَالَ: قَدْ رَأَيْتُ الْخَضِرَ، فَقِيلَ: وَمَنْ رَآهُ مَعَكَ؟ قَالَ: فُلَانٌ، فَسُئِلَ، فَكَتَمَ وَكَانَ فِي دِينِهِمْ أَنَّ مَنْ كَذَبَ قُتِلَ، قَالَ: فَتَزَوَّجَ الْمَرْأَةَ الْكَاتِمَةَ، فَبَيْنَمَا هِيَ تَمْشُطُ ابْنَةَ فِرْعَوْنَ، إِذْ سَقَطَ الْمُشْطُ، فَقَالَتْ: تَعِسَ فِرْعَوْنُ، فَأَخْبَرَتْ أَبَاهَا، وَكَانَ لِلْمَرْأَةِ ابْنَانِ وَزَوْجٌ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِمْ، فَرَاوَدَ الْمَرْأَةَ وَزَوْجَهَا أَنْ يَرْجِعَا عَنْ دِينِهِمَا، فَأَبَيَا، فَقَالَ: إِنِّي قَاتِلُكُمَا، فَقَالَا: إِحْسَانًا مِنْكَ إِلَيْنَا، إِنْ قَتَلْتَنَا أَنْ تَجْعَلَنَا فِي بَيْتٍ، فَفَعَلَ، فَلَمَّا أُسْرِيَ بِالنَّبِيِّ ﷺ، وَجَدَ رِيحًا طَيِّبَةً، فَسَأَلَ جِبْرِيلَ فَأَخْبَرَهُ[1].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە ئەو شەوەی شەوڕەوی پێکرا بۆنێکی زۆر خۆشی کرد، جا فەرمووی: ئەی جیبریل ئەو بۆنە خۆشە چییە؟ فەرمووی: ئەوە بۆنی گۆڕی قژداهێنەرەکەو دوو کوڕەکەیی و هاوسەرەکەیەتی، سەرەتای ئەو بەسەرهاتە بەوجۆرە بووە کە «خضر» یەکێک بووە لە بەڕێزترین کەسەکانی بەنی ئیسرائیل، جا هاتوچۆی بەسەر ڕاهیبێکدا بوو کە لە پەرستگاکەی خۆیدا بوو، جا ڕاهیبەکە ئەبینێ و فێری ئیسلامی دەکات، جا کاتێ «خضر» باڵغ بوو باوکی کچێکی لێ مارەکرد، ئنجا «خضر» فێری ئیسلامی کردو پەیمانی لێ وەرگرت کە هیچ کەسێک فێر نەکات، وە (خضر) زۆر لە ئافرەت نزیک نەدەبۆوە بۆیە تەڵاقیدا، پاشان باوکی دانەیەکی تری لێ مارەکرد، جا ئەویش فێری کردو پەیمانی لێ وەرگرت کە هیچ کەسێک فێرنەکات، جا یەکێکیان (لە دوو ئافرەتەکە) شاردیەوەو بێدەنگ بوو، وە ئەوەی تریان لێی ئاشکرا کرد، جا (خضر) بە ڕاکردن هەڵات تاوەکو

---

(١) ضعيف الإسناد.

گەیشتە دوورگەیەک لە دەریادا، جا بە دوو پیاو گەیشت کە داریان کۆدەکردەوە، پیاوەکانیش ئەویان بینی، جا یەکێکیان بێدەنگ بوو ئەوەی تریان ئاشکرای کرد، وە گوتی: بەڕاستی من «خضر»م بینی، گوترا: کێی ترت لەگەڵ بینی؟ گوتی: فڵانە کەس، ئیتر پرسیاری لێکراو ئەویش بێدەنگ بوو شاردیەوە، وە لە دینی ئەواندا وابوو کە هەرکەسێک درۆی کردبا دەکوژرا، (جیبریل) فەرمووی: جا (ئەو کابرایەی کە شاردیەوە) ئەو ئافرەتەی مارەکرد کە شاردبوویەوە، جا لەوکاتەدا کە ئەو ئافرەتە قژی کچی فیرعەونی شانەدەکرد شانەکە لە دەستی بەربۆوە، جا گوتی: فیرعەون لەناوبچێ و تەفرو تونا بێت، بۆیە کچەکە هەواڵی ئەوەی بە باوکیدا، وە ئەو ئافرەتە هاوسەرو دوو کوڕی هەبوون، جا (فیرعەون) ناردی بەدوایاندا زۆر هەوڵی لەگەڵ ئافرەتەکەو هاوسەرەکەیدا کە لە دینەکەیان پاشگەز ببنەوە، ئەوانیش نکوڵیان کردو پاشگەز نەبونەوە، ئنجا گوتی: بەڕاستی من دەتانکوژم، ئەوانیش گوتیان: لە چاکی خۆتەوە ئەگەر بێتو دوای کوشتنمان هەموومان لە یەک گۆڕدا کۆبکەیتەوە، ئیتر ئەوە کرا، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ شەوڕەوی پێکرا بۆنێکی زۆر خۆشی کردو پرسیاری لە جیبریل کرد، ئەویش هەواڵی پێداو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

**٤٠٣١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «عِظَمُ الْجَزَاءِ مَعَ عِظَمِ الْبَلَاءِ، وَإِنَّ اللَّهَ إِذَا أَحَبَّ قَوْمًا ابْتَلَاهُمْ، فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضَا، وَمَنْ سَخِطَ فَلَهُ السُّخْطُ»[١].**

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان پاداشتی گەورە لەسەر بەڵاو مەینەتی گەورە وەردەگیرێت، ئەگەر خوا گەلێکی خۆشویست ئەوە بە بەڵاو مەینەتی تاقیان دەکاتەوە، جا ئەوەی ڕازی بێ خوا لێی ڕازی دەبێ، وە ئەوەی ناڕازی بێ خوا لێی ناڕازی دەبێ و سزای سەختی دەدات و لێی تووڕەیە.**

**٤٠٣٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ، وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ، أَعْظَمُ أَجْرًا مِنَ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لَا يُخَالِطُ النَّاسَ، وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ»[٢].**

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي بإثر: ٢٣٩٦.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٥٠٧.





واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو بڕوادارەی کە تێکەڵاوی خەڵکی دەکات و لەسەر ئازارو ناڕەحەتییەکانیان ئارام دەگرێ خێرو پاداشتی گەورەترە لە بڕواداریێ کە تێکەڵاوی خەڵکی ناکات و ئارام ناگرێ لەسەر ئازارو ناڕەحەتییەکانیان.

**٤٠٣٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ طَعْمَ الْإِيمَانِ - وَقَالَ بُنْدَارٌ: حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ - مَنْ كَانَ يُحِبُّ الْمَرْءَ، لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ، وَمَنْ كَانَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَمَنْ كَانَ أَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَرْجِعَ فِي الْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ مِنْهُ»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێ ئەم سێ شتەی تێدابێ تامی ئیمان دەچێژێ - وە بوندار گوتی: شیرینی ئیمان دەچێژێ -، هەر کەسێ کەسێکی خۆشبوێ تەنها لەپێناوی خوادا خۆشی بوێت، وە هەر کەسێ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ لە هەموو شتێ زیاتر بەلاوە خۆشەویست بێت، وە هەر کەسێ کە فڕێبدرێتە ناو ئاگرەوە زۆر پێی خۆشتر بێ لەوەی کە دووبارە بگەڕێتەوە بۆ کوفرو بێبڕوای لەدوای ئەوەی کە خوا هیدایەتی داوە بۆ سەر دینی ئیسلام.

**٤٠٣٤-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ أَنْ: «لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ شَيْئًا، وَإِنْ قُطِّعْتَ وَحُرِّقْتَ، وَلَا تَتْرُكْ صَلَاةً مَكْتُوبَةً مُتَعَمِّدًا، فَمَنْ تَرَكَهَا مُتَعَمِّدًا، فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ، وَلَا تَشْرَبِ الْخَمْرَ، فَإِنَّهَا مِفْتَاحُ كُلِّ شَرٍّ»(٢).

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: هاوڕێ دڵسۆزو خۆشەویستەکەم (کە پێغەمبەرە ﷺ) ئامۆژگاری کردم بەوەی کە (فەرمووی): هاوبەش بۆ خوا بڕیار مەدە ئەگەر پارچە پارچە بکرێی و بسوتێنرێی، وە هەرگیز بە ئەنقەست نوێژی فەڕز وازلێ مەهێنە، خۆ هەر کەسێک بە ئەنقەست وازی لێ بهێنێ ئەوە بێبەری دەبێ لە پارێزگاری خوا، وە هەرگیز عارەق مەخۆرەوە چونکە بەڕاستی عارەق خواردنەوە کلیلی (کردنەوەی دەرگای) هەموو شەڕو خراپەیەکە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٦، ومسلم: ٤٣، والترمذي: ٢٦٢٤، والنسائي: ٤٩٨٧_٤٩٨٩.

(٢) حسن لغيره.

## بابەت: توندی و نارەحەتییەکانی زەمانە

٤٠٣٥- عَنْ أَبَا عَبْدِ رَبِّهِ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا إِلَّا بَلَاءٌ وَفِتْنَةٌ»[1].

واتە: ئەبو عەبدی ڕەببیهی دەڵێ: گوێم لە موعاویە ﷺ بوو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەو دنیایە وای لێدێ کە جگە لە فیتنەو ئاشوب و بەڵا هیچی تری تێدا نامێنێتەوە.

٤٠٣٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ سَنَوَاتٌ خَدَّاعَاتُ، يُصَدَّقُ فِيهَا الْكَاذِبُ، وَيُكَذَّبُ فِيهَا الصَّادِقُ، وَيُؤْتَمَنُ فِيهَا الْخَائِنُ، وَيُخَوَّنُ فِيهَا الْأَمِينُ، وَيَنْطِقُ فِيهَا الرُّوَيْبِضَةُ»، قِيلَ: وَمَا الرُّوَيْبِضَةُ؟ قَالَ: «الرَّجُلُ التَّافِهُ فِي أَمْرِ الْعَامَّةِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژگارێک بەسەر خەڵکیدا دێ کە ڕۆژگاری فرت و فێڵ و تەڵەکەبازییە، بە جۆرێک خەڵکی درۆزن بە ڕاستگۆ دادەنرێ و خەڵکی ڕاستگۆش بە درۆزن، ئەمین و دەستپاک بە خائین و ناپاک ئەژمار دەکرێ و خائین و ناپاک بە دەستپاک ئەژمار دەکرێت، وە خەڵکی الرويبضة بە دەمڕاست و قسەکەر دادەنرێن، گوترا: «الرويبضة» چییە؟ فەرمووی: ئەو پیاوەیە کە کەم ئەقڵ و کەم زانستەو دەست لە کاروباری گشتی خەڵکی وەردەدات.

٤٠٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ عَلَى الْقَبْرِ فَيَتَمَرَّغَ عَلَيْهِ، وَيَقُولَ: يَا لَيْتَنِي كُنْتُ مَكَانَ صَاحِبِ هَذَا الْقَبْرِ، وَلَيْسَ بِهِ الدِّينُ إِلَّا الْبَلَاءُ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بەدەستە دونیا کۆتایی نایەت تاوەکو وای لێ نەیەت کە کەسێک بەلای گۆڕێکدا تێدەپەڕێ و دەچێتە سەر گۆڕەکەو خۆی لە خۆڵ وەردەدات و دەڵێ:

---

(١) حسن.

(٢) حسن.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٧١١٥، ومسلم بإثر: ٢٩٠٧.

خۆزگە من لە جێگای خاوەنی ئەو گۆڕە بوومایە، ئەوەش لەبەر دینەکەی ناڵێ (کە بڵێی بۆ بەرژەوەندی یان داخوازییەکی دینی ئەوە بڵێت)، تەنها لەبەر بەڵاو ناخۆشییەکانی زەمانە ئەوە دەڵێت.

٤٠٣٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَتُنْتَقَوُنَّ كَمَا يُنْتَقَى التَّمْرُ مِنْ أَغْفَالِهِ، فَلْيَذْهَبَنَّ خِيَارُكُمْ، وَلَيَبْقَيَنَّ شِرَارُكُمْ، فَمُوتُوا إِنِ اسْتَطَعْتُمْ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژگارێک دادێ کە بە جۆرێک گوڵبژێر دەکرێن وەکو چۆن خورما لە خراپەکەی بژار دەکرێت، بە جۆرێک خەڵکی باشتان تێدا نامێنێت، باشترینەکانتان دەڕۆن و خراپترینەکانی خەڵکی دەمێننەوە، بۆیە گەر توانیتان بمرن (بۆتان باشترە لەم ڕۆژگارە).

٤٠٣٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا يَزْدَادُ الْأَمْرُ إِلَّا شِدَّةً، وَلَا الدُّنْيَا إِلَّا إِدْبَارًا، وَلَا النَّاسُ إِلَّا شُحًّا، وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا عَلَى شِرَارِ النَّاسِ، وَلَا الْمَهْدِيُّ إِلَّا عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستگرتن بە دین و پابەندبوون تەنها ناڕەحەتی و ناخۆشی زیاد دەکات (چونکە خەڵکی دینداری ڕاستەقینە کەم دەبن)، وە دونیاش تەنها خۆشییە هەڵخەڵەتێنەرەکانی زیاد دەکات، وە خەڵکیش زیاتر چرووک و بەخیل دەبن، وە قیامەتیش بەرپا نابێ تەنها لەسەر ئەوانە نەبێ کە خەراپترینی خەڵکین، وە هیچ ڕێنوێنیکەرێک نیە جگە لە عیسای کوڕی مەریەم (علیه وعلى نبينا الصلاة والسلام).

## بابەت: نیشانەکانی کۆتایی زەمان

٤٠٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةُ كَهَاتَيْنِ»، وَجَمَعَ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ[3].

---

(١) صحيح، دون قوله: «فَمُوتُوا».

(٢) ضعيف جداً، إلا جملة الساعة فصحيحة.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٠٥.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من و کۆتایی زەمان بەیەکەوەین و لە یەک نزیکین وەکو ئەو دوو پەنجەیە، ڕاوی دەڵێ: لەوکاتەدا دوو پەنجەکانی خستە پاڵ یەک و کۆی کردنەوە.

٤٠٤١- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ ﷺ، قَالَ: اطَّلَعَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ مِنْ غُرْفَةٍ وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ السَّاعَةَ، فَقَالَ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَكُونَ عَشْرُ آيَاتٍ الدَّجَّالُ، وَالدُّخَانُ، وَطُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا»[١].

واتە: حوزەیفەی کوڕی ئەسید ﷺ دەڵێ: لە ژوورێکدا بووین پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆلامان، لەوکاتەدا باسی کۆتایی زەمانمان دەکرد، ئەویش فەرمووی: قیامەت هەڵناستێ و دونیا کۆتایی نایەت تاکو دە نیشانە دێنە جێ! هاتنی دەجال و دوکەڵەکەو هەڵهاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە.

٤٠٤٢- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، وَهُوَ فِي خِبَاءٍ مِنْ أَدَمٍ، فَجَلَسْتُ بِفِنَاءِ الْخِبَاءِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ادْخُلْ يَا عَوْفُ فَقُلْتُ: بِكُلِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «بِكُلِّكَ»، ثُمَّ قَالَ: «يَا عَوْفُ احْفَظْ خِلَالًا سِتًّا، بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ إِحْدَاهُنَّ مَوْتِي»، قَالَ: فَوَجَمْتُ عِنْدَهَا وَجْمَةً شَدِيدَةً، فَقَالَ: «قُلْ: إِحْدَى، ثُمَّ فَتْحُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، ثُمَّ دَاءٌ يَظْهَرُ فِيكُمْ يَسْتَشْهِدُ اللَّهُ بِهِ ذَرَارِيَّكُمْ، وَأَنْفُسَكُمْ، وَيُزَكِّي بِهِ أَمْوَالَكُمْ، ثُمَّ تَكُونُ الْأَمْوَالُ فِيكُمْ، حَتَّى يُعْطَى الرَّجُلُ مِائَةَ دِينَارٍ، فَيَظَلَّ سَاخِطًا، وَفِتْنَةٌ تَكُونُ بَيْنَكُمْ لَا يَبْقَى بَيْتُ مُسْلِمٍ إِلَّا دَخَلَتْهُ، ثُمَّ تَكُونُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ بَنِي الْأَصْفَرِ هُدْنَةٌ، فَيَغْدِرُونَ بِكُمْ، فَيَسِيرُونَ إِلَيْكُمْ فِي ثَمَانِينَ غَايَةٍ، تَحْتَ كُلِّ غَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا»[٢].

واتە: عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیی ﷺ دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبوک، پێغەمبەر ﷺ لەناو خێمەیەکی (گچکەی) لە چەرم دروستکراودا بوو، منیش لە دەرەوەی خەیمەکەدا دانیشتم، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عەوف وەرە ژوورەوە، منیش گوتم: بە تەواوی بێمە ژوورە (چونکە خەیمەکە گچکە بووەو جێگاکە کەم بووە بۆیە وایگوتووە)؟ فەرمووی: بە تەواوی، پاشان فەرمووی: ئەی عەوف ئەو شەش نیشانانە لەبەر بکە پێش هاتنی قیامەت: یەکێک

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٠١، وأبو داود: ٤٣١١، والترمذي: ٢١٨٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٧٦، وأبو داود: ٥٠٠٠، وسيأتي: ٤٠٩٥.

لەو نیشانانە مردنی منە، عەوف گوتی: بەو قسەیە تووشی شۆک بووم و غەمبار بووم، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڵێ ئەوە یەک، پاشان ڕزگارکردنی بەیتولمەقدیس، پاشان پەتاو دەردێک لەناوتاندا سەرهەڵدەدات کە خۆتان و وەچەتان بەهۆیەوە کردەوەکانتان پاک دەبێتەوە، پاشان ماڵ و سامان لەناوتاندا زۆر دەبێت، هەتا وای بەسەردێ کە پیاو سەد دیناری زێڕی پێ دەدرێ هێشتا ناڕازی و لالوتە، وە فیتنەو ئاشوبێک لەناوتاندا سەرهەڵدەدات کە هیچ ماڵێکی مسوڵمانان نامێنێ نەچێتە ناوی، پاشان لەنێوان ئێوەو ڕۆمەکان ئاگربەست و هودنەیەک دەکرێت، بەڵام ئەوان پەیمان دەشکێنن و لەژێر هەشتا ئاڵادا بۆتان دێن، کە لەژێر هەر ئاڵایەک دوانزە هەزار کەس هەیە.

**٤٠٤٣- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَقْتُلُوا إِمَامَكُمْ، وَتَجْتَلِدُوا بِأَسْيَافِكُمْ، وَيَرِثُ دُنْيَاكُمْ شِرَارُكُمْ»**[١].

واتە: حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قیامەت بەرپا نابێ تاکو وای لێدێ ئێوە شەڕ لەگەڵ پێشەواکانتاندا دەکەن و شمشێر لە یەکتری ڕادەکێشن (و شەڕ لەگەڵ یەکتری دەکەن)، خەراپترینەکانتان دەست دەگرن بەسەر ماڵ و سامان و دەسەڵاتدا.

**٤٠٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا بَارِزًا لِلنَّاسِ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ؟ فَقَالَ: «مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، وَلَكِنْ سَأُخْبِرُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا، إِذَا وَلَدَتِ الْأَمَةُ رَبَّتَهَا، فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وَإِذَا كَانَتِ الْحُفَاةُ الْعُرَاةُ رُءُوسَ النَّاسِ، فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وَإِذَا تَطَاوَلَ رِعَاءُ الْغَنَمِ فِي الْبُنْيَانِ، فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، فِي خَمْسٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ»، فَتَلَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ ﴿٣٤﴾ ﴾ لقمان، الْآيَةَ**[٢].

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢١٧٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠ و ٤٧٧٧، ومسلم: ٩ و ١٠، وأبو داود: ٤٦٩٨، والنسائي: ١٠١/٨.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو خەڵکدا دەرکەوت، جا پیاوێک هاتە خزمەتی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دوایی کەی دێت؟ فەرمووی: پرسیار لێکراویش لە پرسیارکەر زیاتری لێ نازانێ، بەڵام نیشانەکانت پێ دەڵێم: هەر کاتێک دایک سەرپەرشتیاری خۆی لێ لە دایک بوو (واتە: کچ بوو بە گەورەی دایکی)، ئەوە لە نیشانەکانی ڕۆژی دواییە، وە کاتێک خەڵکانی پێ پەتی بوونە سەرکردە و کاربەدەستی خەڵک، ئەوە لە نیشانەکانی ڕۆژی دواییە، وە هەر کاتێک شوانی مەڕو ماڵات بیناو باڵەخانەی بەرزیان دروست کرد ئەوە لە نیشانەکانیەتی، (وە کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی) لەو پێنج شتانەیە کە تەنها خوا دەیانزانێ، پاشان پێغەمبەر ﷺ (ئەو ئایەتەی) خوێندەوە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ ﴿٣٤﴾ ﴾ لقمان، واتە: بەڕاستی تەنها لای خوایە زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی وە هەر خوا باران دەبارێنێ تەنها خوا دەزانێ بەوەی لە منداڵدانی (دایکان) دایە.

٤٠٤٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: أَلَا أُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَا يُحَدِّثُكُمْ بِهِ أَحَدٌ بَعْدِي سَمِعْتُهُ مِنْهُ: «إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ، أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ، وَيَظْهَرَ الْجَهْلُ، وَيَفْشُوَ الزِّنَا، وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ، وَيَذْهَبَ الرِّجَالُ وَيَبْقَى النِّسَاءُ، حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً قَيِّمٌ وَاحِدٌ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: ئایا فەرموودەیەکتان بۆ نەگێڕمەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە هیچ کەسێک جگە لە من بۆتان ناگێڕێتەوە (واتە: هەر من ئاگام لێیە)؟ لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە (دەیفەرموو): لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە زانست و زانیاری هەڵدەگیرێتەوەو نەزانین و جەهل سەرهەڵدەدات، وە زینا بەربڵاو دەبێت، وە عەرەق (بە ئاشکرا) دەخورێتەوە، وە پیاوان دەڕۆن و کەم دەبنەوەو ئافرەتان دەمێننەوە، هەتا وای لێدێ بۆ پەنجا ئافرەت یەک سەرپەرشتیار دەبێت.

٤٠٤٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَحْسِرَ الْفُرَاتُ عَنْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَيَقْتَتِلُ النَّاسُ عَلَيْهِ، فَيُقْتَلُ مِنْ كُلِّ عَشَرَةٍ تِسْعَةٌ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٠ و ٨١، ومسلم: ٢٦٧١، والترمذي: ٢٢٠٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧١١٩، ومسلم: ٢٨٩٤، وأبو داود: ٤٣١٣، والترمذي: ٢٥٦٩ و ٢٥٧٠.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قیامەت بەرپا نابێ تاکو کێوێک لە ئاڵتون لە ڕووباری فورات دەرنەکەوێت، جا خەڵکی لەسەر ئەو زێڕە بەشەڕدێن و یەکتر دەکوژن، بۆیە لە هەر دە کەسێک نۆیان دەکوژرێن.

**٤٠٤٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَفِيضَ الْمَالُ، وَتَظْهَرَ الْفِتَنُ، وَيَكْثُرَ الْهَرْجُ»، قَالُوا: وَمَا الْهَرْجُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الْقَتْلُ، الْقَتْلُ، الْقَتْلُ» ثَلَاثًا[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی دوایی نایەت هەتاکو ماڵ و سامان زۆر زیاد دەکات، وە فیتنەو ئاشوب سەرهەڵدەدات، وە هەرەج زۆر دەبێت، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرەج چییە؟ سێ جار فەرمووی: کوشتن، کوشتن، کوشتن.

## بابەت: بەرزبوونەوەو هەڵگیرانەوەی قورئان

**٤٠٤٨-** عَنْ زِيَادِ بْنِ لَبِيدٍ ﷺ، قَالَ: ذَكَرَ النَّبِيُّ ﷺ شَيْئًا، فَقَالَ: «ذَاكَ عِنْدَ أَوَانِ ذَهَابِ الْعِلْمِ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ يَذْهَبُ الْعِلْمُ، وَنَحْنُ نَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَنُقْرِئُهُ أَبْنَاءَنَا، وَيُقْرِئُهُ أَبْنَاؤُنَا أَبْنَاءَهُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: «ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ زِيَادُ إِنْ كُنْتُ لَأَرَاكَ مِنْ أَفْقَهِ رَجُلٍ بِالْمَدِينَةِ، أَوَلَيْسَ هَذِهِ الْيَهُودُ، وَالنَّصَارَى، يَقْرَءُونَ التَّوْرَاةَ، وَالْإِنْجِيلَ لَا يَعْمَلُونَ بِشَيْءٍ مِمَّا فِيهِمَا؟»[2].

واتە: زیادی کوڕی لەبید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شتێکی باسکردو فەرمووی: ئەو شتە ئەو کاتەیە کە زانست و زانیاری باردەکات و نامێنێ، (زیاد دەڵێ:) گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن زانست باردەکات لەکاتێکدا ئێمە قورئان دەخوێنین و منداڵەکانیشمان فێردەکەین و منداڵەکانیشمان منداڵەکانیان فێردەکەن تاوەکو ڕۆژی قیامەت؟ فەرمووی: دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکات ئەی زیاد من وام دەبینی کە تۆ لە شارەزاترینی پیاوی مەدینە بی، ئایا هەر یەهود (جولەکە)و نەسرانی نین کە تەورات و ئینجیل دەخوێننەوە، کارو کردەوەش بە هیچ شتێک ناکەن کە لەناو تەورات و ئینجیلەکەیان دایە؟!

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٥، ومسلم: ١٥٧.

(٢) صحيح لغيره.

٤٠٤٩- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَدْرُسُ الْإِسْلَامُ كَمَا يَدْرُسُ وَشْيُ الثَّوْبِ، حَتَّى لَا يُدْرَى مَا صِيَامٌ، وَلَا صَلَاةٌ، وَلَا نُسُكٌ، وَلَا صَدَقَةٌ، وَلَيُسْرَى عَلَى كِتَابِ اللَّهِ ﷻ فِي لَيْلَةٍ، فَلَا يَبْقَى فِي الْأَرْضِ مِنْهُ آيَةٌ، وَتَبْقَى طَوَائِفُ مِنَ النَّاسِ الشَّيْخُ الْكَبِيرُ وَالْعَجُوزُ، يَقُولُونَ: أَدْرَكْنَا آبَاءَنَا عَلَى هَذِهِ الْكَلِمَةِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَنَحْنُ نَقُولُهَا». فَقَالَ لَهُ صِلَةُ: مَا تُغْنِي عَنْهُمْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَهُمْ لَا يَدْرُونَ مَا صَلَاةٌ، وَلَا صِيَامٌ، وَلَا نُسُكٌ، وَلَا صَدَقَةٌ؟ فَأَعْرَضَ عَنْهُ حُذَيْفَةُ، ثُمَّ رَدَّهَا عَلَيْهِ ثَلَاثًا، كُلَّ ذَلِكَ يُعْرِضُ عَنْهُ حُذَيْفَةُ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْهِ فِي الثَّالِثَةِ، فَقَالَ: «يَا صِلَةُ، تُنْجِيهِمْ مِنَ النَّارِ» ثَلَاثًا[١].

واتە: حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیسلام وەکو نەخشی سەر پۆشاک کاڵ دەبێتەوە، هەتا وای بەسەردێ نازانرێ ڕۆژوو نوێژو قوربانی و زەکات چییە، وە شەوێک قورئان شەوڕەوی دەکات و نامێنێ، یەک دانە ئایەتیش لە قورئان لەسەر زەوی نامێنێ، هەندێ کەس لە خەڵکی دەمێنن پیرە پیاوو پیرەژن دەڵێن: باوک و باپیرانمان دیتووە ئەو کەلیمەیان دەگوت: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»، بۆیە ئێمەش دەیڵێینەوە، جا صیلە (پیاوێکە) بە حوزەیفە دەڵێ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ» سودیان پێ ناگەیەنێ لەکاتێکدا ئەوان نازانن نوێژو ڕۆژوو قوربانی و زەکات چییە؟ حوزەیفەش ڕووی لێ وەرگێڕا (وەڵامی نەدایەوە)، پاشان سێ جار پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، هەموو جارەکان حوزەیفە ڕووی لێ وەردەگێڕا، پاشان لە سێهەم جاردا ڕووی تێکردو سێ جار گوتی: ئەی صیلە (ئەو وشەیە) لە ئاگر نەجاتیان دەدات.

٤٠٥٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَكُونُ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ أَيَّامٌ يُرْفَعُ فِيهَا الْعِلْمُ، وَيَنْزِلُ فِيهَا الْجَهْلُ، وَيَكْثُرُ فِيهَا الْهَرْجُ» وَالْهَرْجُ: الْقَتْلُ[٢].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کۆتایی زەماندا ڕۆژانێک دێن کە زانستیان تێدا هەڵدەگیرێتەوەو نەزانین دێتە سەر زەوی و کوشتن و کوشتار زۆر دەبێت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٤٠٥١-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ وَرَائِكُمْ أَيَّامًا يَنْزِلُ فِيهَا الْجَهْلُ، وَيُرْفَعُ فِيهَا الْعِلْمُ، وَيَكْثُرُ فِيهَا الْهَرْجُ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْهَرْجُ؟ قَالَ: «الْقَتْلُ»[1].

**واتە:** ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەدوای ئێوە ڕۆژانێک هەیە کە نەزانینی تێدا بەربڵاو دەبێ و زانستی تێدا هەڵدەگیرێتەوەو کوشتن و کوشتاری تێدا زۆر دەبێت، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرەج چییە؟ فەرمووی: کوشتنە.

**٤٠٥٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، يَرْفَعُهُ، قَالَ: «يَتَقَارَبُ الزَّمَانُ، وَيَنْقُصُ الْعِلْمُ، وَيُلْقَى الشُّحُّ، وَتَظْهَرُ الْفِتَنُ، وَيَكْثُرُ الْهَرْجُ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْهَرْجُ؟ قَالَ: «الْقَتْلُ»[2].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زەمان و کات لە یەک نزیک دەبێتەوەو زوو تێدەپەڕێت، زانست لە کەم و کورتی دەدات، چروکی سەرهەڵدەدات، فیتنەو ئاشوب سەرهەڵدەدات، وە هەرەج زۆر دەبێت، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرەج چییە؟ فەرمووی: کوشتنە.

## بابەت: نەمانی دەستپاکی و ئەمینی

**٤٠٥٣-** عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَدِيثَيْنِ، قَدْ رَأَيْتُ أَحَدَهُمَا، وَأَنَا أَنْتَظِرُ الْآخَرَ. حَدَّثَنَا «أَنَّ الْأَمَانَةَ نَزَلَتْ فِي جَذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ - قَالَ الطَّنَافِسِيُّ: يَعْنِي وَسْطَ قُلُوبِ الرِّجَالِ - وَنَزَلَ الْقُرْآنُ فَعَلِمْنَا مِنَ الْقُرْآنِ، وَعَلِمْنَا مِنَ السُّنَّةِ» ثُمَّ حَدَّثَنَا عَنْ رَفْعِهَا، فَقَالَ: «يَنَامُ الرَّجُلُ النَّوْمَةَ، فَتُرْفَعُ الْأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ، فَيَظَلُّ أَثَرُهَا كَأَثَرِ الْوَكْتِ، ثُمَّ يَنَامُ النَّوْمَةَ، فَتُنْزَعُ الْأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ، فَيَظَلُّ أَثَرُهَا كَأَثَرِ الْمَجْلِ، كَجَمْرٍ دَحْرَجْتَهُ عَلَى رِجْلِكَ، فَنَفِطَ فَتَرَاهُ مُنْتَبِرًا، وَلَيْسَ فِيهِ شَيْءٌ»، ثُمَّ أَخَذَ حُذَيْفَةُ كَفًّا، مِنْ حَصًى فَدَحْرَجَهُ عَلَى سَاقِهِ، قَالَ: «فَيُصْبِحُ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ، وَلَا يَكَادُ أَحَدٌ يُؤَدِّي الْأَمَانَةَ، حَتَّى يُقَالَ: إِنَّ فِي بَنِي فُلَانٍ رَجُلًا أَمِينًا، وَحَتَّى يُقَالَ لِلرَّجُلِ: مَا أَعْقَلَهُ وَأَجْلَدَهُ وَأَظْرَفَهُ، وَمَا فِي قَلْبِهِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ «وَلَقَدْ أَتَى عَلَيَّ زَمَانٌ، وَلَسْتُ أُبَالِي أَيُّكُمْ بَايَعْتُ، لَئِنْ كَانَ مُسْلِمًا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَيَّ إِسْلَامُهُ، وَلَئِنْ كَانَ يَهُودِيًّا، أَوْ نَصْرَانِيًّا، لَيَرُدَّنَّهُ عَلَيَّ سَاعِيهِ، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَمَا كُنْتُ لِأُبَايِعَ إِلَّا فُلَانًا، وَفُلَانًا»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٦٣، ومسلم: ٢٦٧٢، والترمذي: ٢٢٠٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٦١، ومسلم بإثر: ٢٦٧٢، وأبو داود: ٤٢٥٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٩٧، ومسلم: ١٤٣، والترمذي: ٢١٧٩.

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو هەواڵی بۆ باسکردین، یەکێکیانم بە چاوی خۆم دی، چاوەڕێی ئەوەی تریشیانم، (هەواڵی یەکەم ئەمە بوو کە) پێیانی فەرموو: ئەمانەت کە هاتەخوار لەناخی دڵی پیاوچاکاندا ڕەگ و ڕیشەی داکوتاو جێگەی خۆی گرت - تەنافیسی گوتی: واتە: ناوەڕاستی دڵی پیاوان -، لەپاشدا بەرە بەرە قورئانیش دەهاتە خوارەوەو بە فێربوونی قورئان و سوننەت پەروەردەیان دەکرد، دواتر باسی هەڵگیرانەوەو نەمانی ئەمانەتی بۆ کردین و فەرمووی: پیاو هەیە خەوی لێ دەکەوێ و ئەمانەت لەدڵی وەردەگیرێتەوە، شوێنەکەی وەک پەڵەیەک یان خاڵێ دەمێنێتەوە، دواتر خەوی لێ دەکەوێ ئەوەشی ماوە لەدڵیدا نامێنێ، شوێنەکەی وەک تلۆقی لێ دێ، وەک ئەو پشکۆیە وایە بینێی بە قاچی خۆتەوە تلۆق دەکات تلۆقەکە تا ماوەیە دەمێنێ بەڵام پشکۆکە نامێنێ، ئەمانەتیش بەو شێوەیە نامێنێ، لەپاشدا بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستەکە چەوێکی هەڵگرت و تلانیەوە بەسەر قاچی خۆیدا. فەرمووی: جا کە بەیانی هات خەڵک سەوداو مامەڵە لەگەڵ یەکتر دەکەن، وای لێ دێ کەس ئەمانەت بەجێ ناهێنێ و پیاوی ئەمین و دەستپاک ئەوەندە کەم دەبێ دەڵێن: لەناو فڵانە هۆزو خێڵدا پیاوێکی ئەمین ماوە، تا وای لێدێ بە پیاوی وا دەوترێ: چەندە بەهێزو جوان و زمان پاراوو ژیرە کە هێندەی دەنکە خەرتەلەیەک بڕوا لەدڵیدا نیە، (کەچی پێی دەڵێن: ئای لەم شاپیاوە چەندە ژیر و ئاقڵ و ئازاو نەبەردە). (حوزەیفە گوتی:) ئیتر ئەو زەمانە نەماوە کە من دەربەست نەبووم لەگەڵ هەر کەسێکتاندا سەوداو مامەڵە بکەم، ئەگەر مسوڵمان بوایە دینەکەی ڕێگری ئەوەی لێ دەکرد گزی و ناپاکیم لەگەڵ بکات، خۆ ئەگەر گاورو جولەکە بوایە ئەوە سەرکارەکەی ڕێگری ئەوەی لێ دەکرد گزی و ناپاکیم لەگەڵ بکات، بەڵام ئەمڕۆ مەگەر لەگەڵ فڵان و فڵان سەوداو مامەڵە بکەم کە لێیان دڵنیام.

٤٠٥٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُهْلِكَ عَبْدًا، نَزَعَ مِنْهُ الْحَيَاءَ، فَإِذَا نَزَعَ مِنْهُ الْحَيَاءَ، لَمْ تَلْقَهُ إِلَّا مَقِيتًا مُمَقَّتًا، فَإِذَا لَمْ تَلْقَهُ إِلَّا مَقِيتًا مُمَقَّتًا، نُزِعَتْ مِنْهُ الْأَمَانَةُ، فَإِذَا نُزِعَتْ مِنْهُ الْأَمَانَةُ، لَمْ تَلْقَهُ إِلَّا خَائِنًا مُخَوَّنًا، فَإِذَا لَمْ تَلْقَهُ إِلَّا خَائِنًا مُخَوَّنًا، نُزِعَتْ مِنْهُ الرَّحْمَةُ، فَإِذَا نُزِعَتْ مِنْهُ الرَّحْمَةُ، لَمْ تَلْقَهُ إِلَّا رَجِيمًا مُلَعَّنًا، فَإِذَا لَمْ تَلْقَهُ إِلَّا رَجِيمًا مُلَعَّنًا، نُزِعَتْ مِنْهُ رِبْقَةُ الْإِسْلَامِ»[١].

---

(١) موضوع.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئەگەر خوای ﷻ بیهەوێ بەندەیەک لەناو ببات ئەوە شەرم و شکۆی لێ دادەڕنێ، جا کە شەرم و شکۆی لێ داڕنرا ئەوە تەنها بەجۆرێک دەیبینی کە شوێنەواری غەزەب و توڕەیی خوای پێوە دیارە، ئەگەر غەزەبی خواشی پێوە دیار بوو ئەوە دەستپاکی و ئەمینداری لێ دادەڕنرێت، ئەگەر ئەمینداریشی لێ داڕنرا ئەوە هەردەم بە ناپاک و خیانەتکار دەیبینی (لەناو خەڵکدا)، خۆ ئەگەر بە خیانەتکار دەرکەوت ئەوە سۆزو بەزەیی لێ دادەڕنرێت، ئەگەر سۆزو بەزەیشی لێ داماڵا ئەوە هەردەم بە نەفرین لێکراو دەیبینی (لەناو خەڵکدا)، ئەگەریش بە نەفرین لێکراو دەرکەوت ئەوە پەیوەندی بە ئیسلامەوە لێ دادەماڵرێت.

## بابەت: نیشانەکانی کۆتایی زەمان

**٤٠٥٥- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ أَبِي سَرِيحَةَ ﷺ، قَالَ: اطَّلَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ غُرْفَةٍ، وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ السَّاعَةَ، فَقَالَ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَكُونَ عَشْرُ آيَاتٍ: طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَالدَّجَّالُ، وَالدُّخَانُ، وَالدَّابَّةُ، وَيَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ، وَخُرُوجُ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ﷺ، وَثَلَاثُ خُسُوفٍ، خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَنَارٌ تَخْرُجُ مِنْ قَعْرِ عَدَنِ أَبْيَنَ، تَسُوقُ النَّاسَ إِلَى الْمَحْشَرِ، تَبِيتُ مَعَهُمْ إِذَا بَاتُوا، وَتَقِيلُ مَعَهُمْ إِذَا قَالُوا»[١].**

واتە: حوزەیفەی کوڕی ئەسیدی کوڕی ئەبو سەریحە ﷺ دەڵێ: (لە سێبەری هۆدەیەکی پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتبووین) لەنێوان خۆماندا باسی بەرپابوونی قیامەتمان دەکرد، دەنگمان بەرزبویەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکێک لە ژوورەکان دەرچوو وە فەرمووی: قیامەت بەرپا نابێ هەتا دە لە نیشانەکانی ڕوونەدات لەپێشەوە: هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوە، وە دەرکەوتنی دەجال، وە دوکەڵەکە، وە دەرکەوتنی یەئجوج و مەئجوج، وە دەرچوونی زیندەوەرێک (الدابة)، وە دەرکەوتنی عیسای کوڕی مەریەم ﷺ، وە سێ ڕۆچوونی زەوی: یەکێک لە ڕۆژئاوا، یەکێک لە ڕۆژهەڵات، یەکێکیش لە دوورگەی عەرەبی، وە ئاگرێک لە یەمەن پەیدا دەبێ

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٠١، وأبو داود: ٤٣١١، والترمذي: ٢١٨٣.

خەڵک بەرەو شوێنی کۆبونەوەیان راپێچ دەکات و ئیتر ئاگرەکە لەگەڵیاندایە، لەکوێ شەو بکەنەوە ئەویش لەوێ شەو دەکاتەوە، نیوەڕۆیان لەکوێ وچان بگرن ئەویش لەوێ وچان دەگرێت.

٤٠٥٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «بَادِرُوا بِالْأَعْمَالِ سِتًّا: طُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَالدُّخَانَ، وَدَابَّةَ الْأَرْضِ، وَالدَّجَّالَ، وَخُوَيْصَّةَ أَحَدِكُمْ، وَأَمْرَ الْعَامَّةِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێش ئەوەی ئەو شەش ڕووداوە ڕووبدەن ئێوە پەلە بکەن لە کاری چاکەو چاکەکاری بکەن: هەڵهاتنی ڕۆ ژلە ڕۆژئاواوە، وە دوکەڵەکە، وە «دابة الأرض» (ئاژەڵێکە لە کۆتایی زەمان بەدەردەکەوێت)، وە دەرکەوتنی دەجال، وە مردنی هەر یەکێکتان، وە گرتنە دەستی کاروباری گشتی (واتە: پێش ئەوەی کاروباری گشتی بکەوێتە بەردەستتان کاری چاکە بکەن، نەبادا ئەوکات سەرقاڵبن و بە کاری چاکە ڕانەگەن).

٤٠٥٧- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْآيَاتُ بَعْدَ الْمِائَتَيْنِ»[2].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لەدوایساڵی دوو سەدەوە سەرهەڵدەدەن (دوو سەدی هیجری).

٤٠٥٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «أُمَّتِي عَلَى خَمْسِ طَبَقَاتٍ: فَأَرْبَعُونَ سَنَةٍ، أَهْلُ بِرٍّ وَتَقْوَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةِ سَنَةٍ، أَهْلُ تَرَاحُمٍ وَتَوَاصُلٍ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، إِلَى سِتِّينَ وَمِائَةِ سَنَةٍ أَهْلُ تَدَابُرٍ وَتَقَاطُعٍ، ثُمَّ الْهَرْجُ الْهَرْجُ، النَّجَا النَّجَا»[3].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئوممەتەکەم دەبێتە پێنج چین: چل ساڵ ئەهلی چاکەو پارێزکارین، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن هەتاکو سەدو بیست ساڵ ئەهلی بەزەیی و پەیوەندی کۆمەڵایەتین، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن هەتاکو سەدو شەست ساڵ ئەهلی پشت لە یەکترکردن و دابڕانن، پاشان کوشت و کوشتار، کەواتە خۆتان ڕزگار بکەن.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) موضوع.

(٣) ضعيف.

٤٠٥٨م- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمَّتِي عَلَى خَمْسِ طَبَقَاتٍ، كُلُّ طَبَقَةٍ أَرْبَعُونَ عَامًا، فَأَمَّا طَبَقَتِي، وَطَبَقَةُ أَصْحَابِي فَأَهْلُ عِلْمٍ وَإِيمَانٍ، وَأَمَّا الطَّبَقَةُ الثَّانِيَةُ، مَا بَيْنَ الْأَرْبَعِينَ إِلَى الثَّمَانِينَ، فَأَهْلُ بِرٍّ وَتَقْوَى»، ثُمَّ ذَكَرَ نَحْوَهُ[1].

واتە: لە ڕیوایەتێکی تردا ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئوممەتەکەم دابەشدەبن بەسەر پێنج چیندا: هەر چینێک چل ساڵە، جا ئەو چینەی من و هاوەڵانم چینی زانست و ئیمانە، وە بەڵام چینی دوهەم لەنێوان چل بۆ هەشتا ساڵەو ئەویش چینی چاکەکاری و پارێزکارییە. پاشان فەرموودەکەی وەکو ڕیوایەتەکەی پێشوو باسکرد.

## بابەت: زەوی ڕۆچوون

٤٠٥٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ مَسْخٌ، وَخَسْفٌ، وَقَذْفٌ»[2].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە کۆتایی زەماندا گۆڕانی ڕەنگ و ڕوخسار (یان دڵ و دەروون) وڕۆچوونی زەویی و بەردبارانکردن سەرهەڵدەدەن.

٤٠٦٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «يَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي خَسْفٌ، وَمَسْخٌ، وَقَذْفٌ»[3].

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە کە دەیفەرموو: لە کۆتاییەکانی ئوممەتەکەم گۆڕانی شکڵ و شێوەو ڕۆچوونی زەویی و بەردبارانکردن سەرهەڵدەدەن.

٤٠٦١- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا أَتَى ابْنَ عُمَرَ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ فُلَانًا يُقْرِئُكَ السَّلَامَ، قَالَ: إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّهُ قَدْ أَحْدَثَ، فَإِنْ كَانَ قَدْ أَحْدَثَ فَلَا تُقْرِئْهُ مِنِّي السَّلَامَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «يَكُونُ فِي أُمَّتِي أَوْ فِي هَذِهِ الْأُمَّةِ مَسْخٌ، وَخَسْفٌ، وَقَذْفٌ»، وَذَلِكَ فِي أَهْلِ الْقَدَرِ[4].

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٢١٥٢، وانظر أبو داود: ٤٦١٣.

واتە: نافیع ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک هاتە لای ئیبنو عومەر ﷺ و گوتی: لەڕاستیدا فڵانە کەس سەلامی لێدەکردی، گوتی: بێگومان بیستومە کە ئەو کەسە داهێنانی لە دیندا کردوە، جا ئەگەر داهێنانی لە دیندا کردبوو ئەوە سەلامی منی لێمەکە، چونکە بە دڵنیایی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومە کە دەیفەرموو: لەو ئوممەتەی من گۆڕانی شکڵ و ڕۆچوون و بەردبارانکردن ڕوو دەدەن، (ئیبنو عومەر گوتی:) ئەوەش لە ناو قەدەریەکان ڕوودەدات.

**٤٠٦٢**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَكُونُ فِي أُمَّتِي خَسْفٌ، وَمَسْخٌ، وَقَذْفٌ»[(١)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ناو ئوممەتەکەم ڕۆچوونی زەویی و گۆڕانی شکڵ و شێوەو بەردبارانکردن سەرهەڵدەدەن.

## بابەت: لەشکری بەیدا

**٤٠٦٣**- عَنْ حَفْصَةُ ﷺ، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «لَيَؤُمَّنَّ هَذَا الْبَيْتَ جَيْشٌ يَغْزُونَهُ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الْأَرْضِ، خُسِفَ بِأَوْسَطِهِمْ، وَيَتَنَادَى أَوَّلُهُمْ آخِرَهُمْ، فَيُخْسَفُ بِهِمْ، فَلَا يَبْقَى مِنْهُمْ إِلَّا الشَّرِيدُ الَّذِي يُخْبِرُ عَنْهُمْ» فَلَمَّا جَاءَ جَيْشُ الْحَجَّاجِ ظَنَنَّا أَنَّهُمْ هُمْ، فَقَالَ رَجُلٌ: أَشْهَدُ عَلَيْكَ أَنَّكَ لَمْ تَكْذِبْ عَلَى حَفْصَةَ، وَأَنَّ حَفْصَةَ لَمْ تَكْذِبْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ»[(٢)].

واتە: حەفصە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: لەشکرێک پەیدا دەبێ کە نیازی ئەوەیان دەبێ کەعبە داگیر بکەن، دێن تاکو دەگەنە زەوییەک کە پێی دەڵێن: بەیدا (شوێنێکە)، جا ناوەڕاستی ئەو لەشکرە بە زەویدا ڕۆدەچێ و سەرەتاکەی هاوارو بانگی کۆتاییەکەی دەکات، ئنجا ئەوانیش بە زەوییەکەدا ڕۆدەچن، بۆیە هیچ کەسێک نامێنێ تەنها دانەیەک نەبێ کە هەڵدێ و ڕادەکات و هەواڵی جەیشەکە دەباتەوە. (ڕاوی دەڵێ:) جا کاتێک لەشکری حەجاج هات بۆ مەککە گومانمان وابوو کە ئەو لەشکرە بێت، بۆیە پیاوێک گوتی: شاهێدی دەدەم کە تۆ درۆت بە زمانی حەفصەوە نەکردوەو حەفصەش درۆی بە زمانی پێغەمبەرەوە ﷺ نەکردوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٨٣/٦، والنسائي: ٢٨٨٠.

٤٠٦٤- عَنْ صَفِيَّةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَنْتَهِي النَّاسُ عَنْ غَزْوِ هَذَا الْبَيْتِ، حَتَّى يَغْزُوَ جَيْشٌ حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْبَيْدَاءِ، أَوْ بَيْدَاءَ مِنَ الْأَرْضِ، خُسِفَ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ، وَلَمْ يَنْجُ أَوْسَطُهُمْ»، قُلْتُ: فَإِنْ كَانَ فِيهِمْ مَنْ يُكْرَهُ؟ قَالَ: «يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ عَلَى مَا فِي أَنْفُسِهِمْ»[1].

واتە: صەفیە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی وازناهێنن لە داگیرکردنی ئەو ماڵەی خوایە، هەتا لەشکرێک دێ و دەگاتە بەیدا، ئنجا سەرەتاو کۆتاییەکەی بە زەویدا ڕۆدەچێ و ناوەڕاستەکەشی ڕزگاری نابێت، ڕاوی گوتی: (بە پێغەمبەری خوام ﷺ گوت:) باشە ئەگەر لەناو ئەو خەڵکەدا کەسێک هەبوو کە بە تۆبزی خرابێتە گەڵ لەشکرەکەو پێشی ناخۆش بێ (ئەوانە حوکمیان چییە)؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا لەسەر نیەتیان زیندوویان دەکاتەوە.

٤٠٦٥- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: ذَكَرَ النَّبِيُّ ﷺ الْجَيْشَ الَّذِي يُخْسَفُ بِهِمْ، فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَعَلَّ فِيهِمُ الْمُكْرَهَ؟ قَالَ: «إِنَّهُمْ يُبْعَثُونَ عَلَى نِيَّاتِهِمْ»[2].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ باسی ئەو لەشکرەی کرد کە ڕۆدەچێت، جا ئوممو سەلەمە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵکو ئەو لەشکرە کەسانێکی تێدابێ کە ئەو داگیرکارییەیان پێ خۆش نەبێ و بەزۆر هێنرابن؟ فەرمووی: ئەوانیش لەسەر نیەتیان زیندوو دەکرێنەوە.

## بابەت: گیاندارێک کە پێی دەڵێن: "دابة الأرض"

٤٠٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «تَخْرُجُ الدَّابَّةُ وَمَعَهَا خَاتَمُ سُلَيْمَانَ بْنِ دَاوُدَ، وَعَصَا مُوسَى بْنِ عِمْرَانَ، q، فَتَجْلُو وَجْهَ الْمُؤْمِنِ بِالْعَصَا، وَتَخْطِمُ أَنْفَ الْكَافِرِ بِالْخَاتِمِ، حَتَّى أَنَّ أَهْلَ الْحِوَاءِ لَيَجْتَمِعُونَ، فَيَقُولُ: هَذَا يَا مُؤْمِنُ وَيَقُولُ هَذَا: يَا كَافِرُ». قَالَ أَبُو الْحَسَنِ الْقَطَّانُ: حَدَّثَنَاهُ إِبْرَاهِيمُ بْنُ نَصْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَقَالَ فِيهِ مَرَّةً، فَيَقُولُ هَذَا: يَا مُؤْمِنُ وَهَذَا: يَا كَافِرُ»[3].

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢١٨٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٨٢، وأبو داود: ٤٢٨٩، والترمذي: ٢١٧١.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٣١٨٧.

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «الدابة» (کە گیاندارێکە) لە زەوی دەردەچێ و مۆری سولەیمانی کوڕی داودی پێیە لەگەڵ دارعەساکەی موساى کوڕی عیمران q، جا ڕوخساری بڕوادار بە دارعەساکە دەدرەوشێنێتەوەو بە مۆرەکەش دەدات لە لوتی کافرو نیشانەی دەکات، بەجۆرێک (کە ئەوانە دەناسرێنەوەو) ئەگەر لەسەر شوێنی نان خواردن یان ئاو خواردنەوە دانیشن ئەوە یەک بە یەکیتر دەڵێ: ئەوە بڕوادارە، وە بەویتر دەڵێ: ئەوە کافرە.

**٤٠٦٧- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: ذَهَبَ بِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِلَى مَوْضِعٍ بِالْبَادِيَةِ قَرِيبٍ مِنْ مَكَّةَ، فَإِذَا أَرْضٌ يَابِسَةٌ حَوْلَهَا رَمْلٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَخْرُجُ الدَّابَّةُ مِنْ هَذَا الْمَوْضِعِ، فَإِذَا فِتْرٌ فِي شِبْرٍ» قَالَ ابْنُ بُرَيْدَةَ: فَحَجَجْتُ بَعْدَ ذَلِكَ بِسِنِينَ، فَأَرَانَا عَصًا لَهُ فَإِذَا هُوَ بِعَصَايَ، هَذِهِ هَكَذَا، وَهَكَذَا[١].**

واته: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە لە باوکییەوەﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ لەگەڵ خۆی بردم بۆ شوێنێک لە شیوێکدا کە نزیکی مەککە بوو، شوێنەکە زەوییەکی وشک بوو، دەوروبەرەکەی خۆڵ و لم بوو، ئنجا پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: «الدابة» ئا لەو شوێنەدا دەردەچێت. (ڕاوی دەڵێ:) شوێنەکە بە ئەندازەی بستێک بوو.

## بابەت: هەڵهاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە

**٤٠٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا طَلَعَتْ وَرَآهَا النَّاسُ آمَنَ مَنْ عَلَيْهَا، فَذَلِكَ حِينَ لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا، لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ»[٢].**

واته: ئەبو هورەیرەﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: ڕۆژی دوایی و کۆتایی زەمان نایەت هەتاکو ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵنەیەت، جا کاتێک ڕۆژ (لە ڕۆژئاوا) هەڵهات و خەڵکی بینییان هەموو خەڵکی بڕوا دێنن، جا ئەوکاتە ئەوکاتەیە هیچ کەسێک ئیمانەکەی سوودی پێ ناگەیەنێ ئەگەر پێشتر بڕوای نەبووبێت.

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٦٣٥، ومسلم: ١٥٧، وأبو داود: ٤٣١٢.

٤٠٦٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوَّلُ الْآيَاتِ خُرُوجًا، طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَخُرُوجُ الدَّابَّةِ عَلَى النَّاسِ ضُحًى»، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: «فَأَيَّتُهُمَا مَا خَرَجَتْ قَبْلَ الْأُخْرَى فَالْأُخْرَى مِنْهَا قَرِيبٌ»، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: «وَلَا أَظُنُّهَا إِلَّا طُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا»(١).

واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەم نیشانەکانی کۆتایی زەمان کە دەردەکەون: هەڵهاتنی ڕۆژە لە ڕۆژئاواوەو دەرچوونی «الدابة»یە لەناو خەڵکی لەکاتی چێشتەنگاودا. جا عەبدوڵڵا گوتی: هەر یەکێک لەو نیشانانە پێش ئەویتر بێت، ئەوە ئەوەیتر نزیکەو بەدوایدا دێت. عەبدوڵڵا گوتی: من پێموایە هەڵهاتنی ڕۆژە لە ڕۆژئاواوە.

٤٠٧٠- عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ قِبَلِ مَغْرِبِ الشَّمْسِ بَابًا مَفْتُوحًا، عَرْضُهُ سَبْعُونَ سَنَةً، فَلَا يَزَالُ ذَلِكَ الْبَابُ مَفْتُوحًا لِلتَّوْبَةِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ نَحْوِهِ، فَإِذَا طَلَعَتْ مِنْ نَحْوِهِ، لَمْ يَنْفَعْ نَفْسًا إِيمَانُهَا، لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ، أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا»(٢).

واته: صەفوانی کوڕی عەسسال ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە بێگومان لە ڕۆژئاواوە دەرگایەکی کراوە هەیە کە بەرینییەکەی حەفتا ساڵ ڕێیە، جا بەردەوام ئەو دەرگایە کراوەیە بۆ ئەوانەی تەوبە دەکەن، هەتا ئەوکاتەی کە ڕۆژی لێوە هەڵدێت، جا هەرکات ڕۆژ لەلای ئەو دەرگایەوە (لە ڕۆژئاواوە) هەڵهات، ئەوە هیچ کەسێک ئیمانەکەی سوودی پێ ناگەیەنێ ئەگەر پێشتر ئیمانی نەهێنابێ یان کردەوەی چاکی نەکردبێت.

## بابەت: دەجال و هاتنی
## عیسای کوڕی مەریەم و دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج

٤٠٧١- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الدَّجَّالُ أَعْوَرُ، عَيْنِ الْيُسْرَى جُفَالُ الشَّعَرِ، مَعَهُ جَنَّةٌ وَنَارٌ، فَنَارُهُ جَنَّةٌ، وَجَنَّتُهُ نَارٌ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٤١، وأبو داود: ٤٣١٠.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٩٦، والنسائي: ١٢٦ و ١٢٧ و ١٥٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٣٤/١٠٤، وانظر البخاري: ٢٤٥٠، وأبو داود: ٤٣١٥.

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەجال چاوی چەپی کوێرەو نیەتی: پرچی زۆرە، بەهەشت و دۆزەخی لەگەڵدایە، (لە واقیعدا) دۆزەخەکەی بەهەشتەو بەهەشتەکەی دۆزەخە.

**٤٠٧٢- عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «أَنَّ الدَّجَّالَ يَخْرُجُ مِنْ أَرْضٍ بِالْمَشْرِقِ، يُقَالُ لَهَا: خُرَاسَانُ، يَتْبَعُهُ أَقْوَامٌ كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ»**[1].

واتە: ئەبو بەکری صدیق ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی دەجالی بۆ کردین (و فەرمووی:) دەجال لە ڕۆژهەڵاتەوە لە شوێنێک دەردەکەوێ و پەیدا دەبێ پێی دەڵێن: خوراسان، خەڵکێکی بەدوادەکەوێ کە دەم و چاویان وەکو قەڵغانێکە کە بە سیرمەی زۆر دەورە دراوە (واتە: دەم و چاویان پان و بەرین و بازنەییە).

**٤٠٧٣- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: مَا سَأَلَ أَحَدٌ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الدَّجَّالِ، أَكْثَرَ مِمَّا سَأَلْتُهُ - وَقَالَ ابْنُ نُمَيْرٍ: أَشَدَّ سُؤَالًا مِنِّي - فَقَالَ لِي: «مَا تَسْأَلُ عَنْهُ؟» قُلْتُ: إِنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّ مَعَهُ الطَّعَامَ، وَالشَّرَابَ، قَالَ: «هُوَ أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ ذَلِكَ»**[2].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: هیچ کەسێک لە من زیاتر دەربارەی دەجال پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ نەکردوە - ئیبنو نومەیر گوتی: لە منیش زیاتر پرسیاری دەکرد -، جا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: دەربارەی چی پرسیار دەکەی؟ گوتم: دەڵێن کە ئەو (دەجال) خواردن و خواردنەوەشی بەدەستە، فەرمووی: زۆر لەوە سوکترو بێ بایەخترە لەلای خوا کە ئەو هەموو دەسەڵاتەی بداتێ (واتە: لەبەرچاوی خەڵکی وایە، ئەگەرنا لە ڕاستیدا ئەو دەسەڵاتەی نیە).

**٤٠٧٤- عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ ﷺ، قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، وَصَعِدَ الْمِنْبَرَ، وَكَانَ لَا يَصْعَدُ عَلَيْهِ قَبْلَ ذَلِكَ، إِلَّا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَى النَّاسِ فَمِنْ بَيْنِ قَائِمٍ وَجَالِسٍ، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ بِيَدِهِ، أَنِ اقْعُدُوا «فَإِنِّي وَاللَّهِ مَا قُمْتُ مَقَامِي هَذَا لِأَمْرٍ يَنْفَعُكُمْ، لِرَغْبَةٍ وَلَا لِرَهْبَةٍ، وَلَكِنَّ تَمِيمًا الدَّارِيَّ أَتَانِي، فَأَخْبَرَنِي خَبَرًا مَنَعَنِي الْقَيْلُولَةَ، مِنَ الْفَرَحِ وَقُرَّةِ الْعَيْنِ، فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَنْشُرَ عَلَيْكُمْ فَرَحَ نَبِيِّكُمْ، أَلَا إِنَّ ابْنَ عَمٍّ لِتَمِيمٍ الدَّارِيِّ أَخْبَرَنِي، أَنَّ الرِّيحَ أَلْجَأَتْهُمْ إِلَى جَزِيرَةٍ لَا يَعْرِفُونَهَا،**

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٢٣٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧١٢٢، ومسلم: ٢٩٣٩.




فَقَعَدُوا فِي قَوَارِبِ السَّفِينَةِ، فَخَرَجُوا فِيهَا، فَإِذَا هُمْ بِشَيْءٍ أَهْدَبَ أَسْوَدَ كَثِيرِ الشَّعَرِ، قَالُوا لَهُ: مَا أَنْتَ؟ قَالَ: أَنَا الْجَسَّاسَةُ، قَالُوا: أَخْبِرِينَا، قَالَتْ: مَا أَنَا بِمُخْبِرَتِكُمْ شَيْئًا، وَلَا سَائِلَتِكُمْ، وَلَكِنْ هَذَا الدَّيْرُ، قَدْ رَمَقْتُمُوهُ، فَأْتُوهُ، فَإِنَّ فِيهِ رَجُلًا بِالْأَشْوَاقِ إِلَى أَنْ تُخْبِرُوهُ وَيُخْبِرَكُمْ، فَأَتَوْهُ فَدَخَلُوا عَلَيْهِ، فَإِذَا هُمْ بِشَيْخٍ مُوثَقٍ شَدِيدِ الْوَثَاقِ، يُظْهِرُ الْحُزْنَ، شَدِيدِ التَّشَكِّي، فَقَالَ لَهُمْ: مِنْ أَيْنَ؟ قَالُوا: مِنَ الشَّامِ، قَالَ: مَا فَعَلَتِ الْعَرَبُ؟ قَالُوا: نَحْنُ قَوْمٌ مِنَ الْعَرَبِ، عَمَّ تَسْأَلُ؟ قَالَ: مَا فَعَلَ هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي خَرَجَ فِيكُمْ؟ قَالُوا: خَيْرًا، نَاوَى قَوْمًا، فَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ، فَأَمْرُهُمُ الْيَوْمَ جَمِيعٌ: إِلَهُهُمْ وَاحِدٌ، وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ، قَالَ: مَا فَعَلَتْ عَيْنُ زُغَرَ؟ قَالُوا: خَيْرًا يَسْقُونَ مِنْهَا زُرُوعَهُمْ، وَيَسْتَقُونَ مِنْهَا لِسَقْيِهِمْ، قَالَ: فَمَا فَعَلَ نَخْلٌ بَيْنَ عَمَّانَ وَبَيْسَانَ؟ قَالُوا: يُطْعِمُ ثَمَرَهُ كُلَّ عَامٍ، قَالَ: فَمَا فَعَلَتْ بُحَيْرَةُ الطَّبَرِيَّةِ؟ قَالُوا: تَدَفَّقُ جَنَبَاتُهَا مِنْ كَثْرَةِ الْمَاءِ، قَالَ: فَزَفَرَ ثَلَاثَ زَفَرَاتٍ، ثُمَّ قَالَ: لَوِ انْفَلَتُّ مِنْ وَثَاقِي هَذَا، لَمْ أَدَعْ أَرْضًا إِلَّا وَطِئْتُهَا بِرِجْلَيَّ هَاتَيْنِ، إِلَّا طَيْبَةَ، لَيْسَ لِي عَلَيْهَا سَبِيلٌ». قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِلَى هَذَا يَنْتَهِي فَرَحِي، هَذِهِ طَيْبَةُ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا فِيهَا طَرِيقٌ ضَيِّقٌ، وَلَا وَاسِعٌ، وَلَا سَهْلٌ، وَلَا جَبَلٌ، إِلَّا وَعَلَيْهِ مَلَكٌ شَاهِرٌ سَيْفَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[١].

واتە: فاتیمەی کچی قەیس ﷺ دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کردو سەرکەوتە سەر مینبەرەکەی، وە هەرگیز پێشتر لەوکاتانەدا نەدەچوو بۆ سەر مینبەرەکە جگە لە ڕۆژانی جومعە، بۆیە خەڵکەکە بەلایانەوە جێی گرنگی بوو، جا هەبوو بەپێوە بوو هەبوو دانیشتبوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کردن کە دانیشن، (پاشان فەرمووی:) سوێند بە خوا بۆ ئەوە لێرە ڕانەوەستاوم کە هەواڵ و کارێکی واتان پێ بڵێم کە بۆ هیواو ئومێد پێبوون یان لێ ترسان بێت، بەڵکو تەمیمی داری هات بۆلام و هەواڵێکی پێدام کە لەبەر ئەو هەواڵە خەوی نیوەڕۆم نەکرد، لە خۆشییان و تامەزرۆییان، جا پێم خۆش بوو کە خۆشحاڵی پێغەمبەرەکەتان ﷺ بەسەردا بڵاوبکەمەوە، هەواڵەکە دەڵێ کە کوڕە مامێکی تەمیمی داری بۆی گێڕاومەوە کە لەناو دەریادا بایەکی هاتووەو بردوونی بۆ دوورگەیەک کە شارەزای نەبوون، جا ئەوانیش لەناو بەلەمەکانیاندا دانیشتوون و چوونەتە دەرەوە لە کەشتییەکەیان، ئیتر لەوکاتەدا تووشی گیاندارێک بوون کە زۆر توکن و ڕەش بووە، پێیان گوتووە: تۆ چیت؟ گوتوویەتی: من جەسساسەم، گوتویانە مادام هەواڵ و دەنگ و باسی ئێرەمان پێبدە،

---

(١) ضعيف السند، صحيح المتن، دون الجمل التي بين حاصرتين. أخرجه مسلم: ٢٩٤٢ بأطول من هذا، وأبو داود: ٤٣٢٦، والترمذي: ٢٢٥٣.

گوتوویەتی: من هیچتان پێ ناڵێم و پرسیاریشتان لێ ناکەم، بەڵام ئەو پەرستگایەی نزیکتانەوە بچۆنە ئەوێ، چونکە پیاوێکی تێدایە تامەزرۆی بینیتانە بۆئەوەی هەم ئێوە هەواڵ بە ئەو بدەن و هەم ئەویش هەواڵتان پێ بدات، جا هاتنە لای دەیرەکەو چوونە ناوی، ئیتر بینیان پیرێکی بەستراوەی بە زنجیرێکی توند بەستراوی تێدایە، کە خەمباری پێوە دیار بوو، بە توندی سکاڵای هەبوو، ئنجا پێی گوتن: لەکوێوە هاتوون؟ گوتیان: لە شامەوە، گوتی: عەرەب چی کردوە چی بەسەرهاتووە؟ گوتیان: ئێمە لە گەلی عەرەبین، دەربارەی چی دەپرسی؟ گوتی: ئەو پیاوەی لەناوتان پەیدا بووە چی کردوە؟ گوتیان: باشترین کاری کردوە، هۆزەکەی دژایەتییان کردو خوا زاڵی کرد بەسەریاندا، ئیتر لە ئێستادا هەموویان یەک ڕێگایان هەیەو هەموویان پەرستراوو خودایان یەکە، وە دینیان یەکە، گوتی: «عين زغر» (شوێنێکە لە شام) چی بەسەرهاتووە؟ گوتیان: زۆر باشەو کشتوکاڵەکانیان و ماڵاتیانی لێ ئاو دەدەن، گوتی: ئەی باخە خورماکانی نێوان عەمان و بەیسان چۆنن؟ گوتیان: هەموو ساڵێ بەرهەمی خۆی دەدات، گوتی: ئەی دەریاچەی تەبەرییە چۆنە؟ گوتیان: ئەوەندە ئاوەکەی زۆرە لە چوار دەورییەوە ئاو دەردەچێ، گوتی: ئنجا سێ جار بە توندی هەناسەی قوڵی هەڵمژی، پاشان گوتی: ئەگەر لەو کۆت و زنجیرە ڕزگارم بێ ئەوە یەک شوێن نامێنێ لەسەر زەوی کە پێی لێ نەنێم و نەچمە ناوی جگە لە مەدینە، بۆ چوونە مەدینە ڕێگام پێ نەدراوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دڵخۆشییەکەی من ئا لێرەیە ئەوە (مەدینە) شاری «طيبة»یە، کە سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە هیچ ڕێگایەکی تەنگەبەرو فراوان و ئاسان و کێوێک نیە ئەگەر فریشتەی شمشێر بەدەستی لەسەر نەبێ تاکو ڕۆژی دوایی.

٤٠٧٥- عَنْ النَّوَّاسَ بْنَ سَمْعَانَ الْكِلَابِيَّ، يَقُولُ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الدَّجَّالَ الْغَدَاةَ، فَخَفَضَ فِيهِ وَرَفَعَ، حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ فِي طَائِفَةِ النَّخْلِ، فَلَمَّا رُحْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، عَرَفَ ذَلِكَ فِينَا، فَقَالَ: «مَا شَأْنُكُمْ؟» فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ذَكَرْتَ الدَّجَّالَ الْغَدَاةَ، فَخَفَضْتَ فِيهِ ثُمَّ رَفَعْتَ، حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ فِي طَائِفَةِ النَّخْلِ، قَالَ: «غَيْرُ الدَّجَّالِ أَخْوَفُنِي عَلَيْكُمْ: إِنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فِيكُمْ فَأَنَا حَجِيجُهُ دُونَكُمْ، وَإِنْ يَخْرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ، فَامْرُؤٌ حَجِيجُ نَفْسِهِ، وَاللَّهُ خَلِيفَتِي عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، إِنَّهُ شَابٌّ قَطَطٌ، عَيْنُهُ قَائِمَةٌ، كَأَنِّي أُشَبِّهُهُ بِعَبْدِ الْعُزَّى بْنِ قَطَنٍ، فَمَنْ رَآهُ مِنْكُمْ، فَلْيَقْرَأْ عَلَيْهِ فَوَاتِحَ سُورَةِ الْكَهْفِ، إِنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ خَلَّةٍ بَيْنَ الشَّامِ، وَالْعِرَاقِ، فَعَاثَ يَمِينًا، وَعَاثَ شِمَالًا، يَا عِبَادَ اللَّهِ اثْبُتُوا». قُلْنَا: يَا رَسُولَ

اللَّهِ وَمَا لُبْثُهُ فِي الْأَرْضِ؟ قَالَ «أَرْبَعُونَ يَوْمًا، يَوْمٌ كَسَنَةٍ، وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ، وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ، وَسَائِرُ أَيَّامِهِ كَأَيَّامِكُمْ»، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَذَلِكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَسَنَةٍ، تَكْفِينَا فِيهِ صَلَاةُ يَوْمٍ؟ قَالَ: «فَاقْدُرُوا لَهُ قَدْرَهُ»، قَالَ، قُلْنَا: فَمَا إِسْرَاعُهُ فِي الْأَرْضِ؟ قَالَ: «كَالْغَيْثِ اسْتَدْبَرَتْهُ الرِّيحُ». قَالَ: «فَيَأْتِي الْقَوْمَ فَيَدْعُوهُمْ فَيَسْتَجِيبُونَ لَهُ، وَيُؤْمِنُونَ بِهِ، فَيَأْمُرُ السَّمَاءَ أَنْ تُمْطِرَ فَتُمْطِرَ، وَيَأْمُرُ الْأَرْضَ أَنْ تُنْبِتَ فَتُنْبِتَ، وَتَرُوحُ عَلَيْهِمْ سَارِحَتُهُمْ أَطْوَلَ مَا كَانَتْ ذُرًى، وَأَسْبَغَهُ ضُرُوعًا، وَأَمَدَّهُ خَوَاصِرَ، ثُمَّ يَأْتِي الْقَوْمَ فَيَدْعُوهُمْ فَيَرُدُّونَ عَلَيْهِ قَوْلَهُ، فَيَنْصَرِفُ عَنْهُمْ فَيُصْبِحُونَ مُمْحِلِينَ، مَا بِأَيْدِيهِمْ شَيْءٌ، ثُمَّ يَمُرُّ بِالْخَرِبَةِ، فَيَقُولُ لَهَا: أَخْرِجِي كُنُوزَكِ فَيَنْطَلِقُ، فَتَتْبَعُهُ كُنُوزُهَا كَيَعَاسِيبِ النَّحْلِ، ثُمَّ يَدْعُو رَجُلًا مُمْتَلِئًا شَبَابًا، فَيَضْرِبُهُ بِالسَّيْفِ ضَرْبَةً، فَيَقْطَعُهُ جِزْلَتَيْنِ، رَمْيَةَ الْغَرَضِ، ثُمَّ يَدْعُوهُ، فَيُقْبِلُ يَتَهَلَّلُ وَجْهُهُ يَضْحَكُ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ، إِذْ بَعَثَ اللَّهُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ، فَيَنْزِلُ عِنْدَ الْمَنَارَةِ الْبَيْضَاءِ، شَرْقِيَّ دِمَشْقَ، بَيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ، وَاضِعًا كَفَّيْهِ عَلَى أَجْنِحَةِ مَلَكَيْنِ، إِذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ، وَإِذَا رَفَعَهُ يَنْحَدِرُ مِنْهُ جُمَانٌ كَاللُّؤْلُؤِ، وَلَا يَحِلُّ لِكَافِرٍ يَجِدُ رِيحَ نَفَسِهِ إِلَّا مَاتَ، وَنَفَسُهُ يَنْتَهِي حَيْثُ يَنْتَهِي طَرَفُهُ، فَيَنْطَلِقُ حَتَّى يُدْرِكَهُ عِنْدَ بَابِ لُدٍّ، فَيَقْتُلُهُ، ثُمَّ يَأْتِي نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى، قَوْمًا قَدْ عَصَمَهُمُ اللَّهُ، فَيَمْسَحُ وُجُوهَهُمْ، وَيُحَدِّثُهُمْ بِدَرَجَاتِهِمْ فِي الْجَنَّةِ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ أَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ: يَا عِيسَى إِنِّي قَدْ أَخْرَجْتُ عِبَادًا لِي، لَا يَدَانِ لِأَحَدٍ بِقِتَالِهِمْ، وَأَحْرِزْ عِبَادِي إِلَى الطُّورِ، وَيَبْعَثُ اللَّهُ يَأْجُوجَ، وَمَأْجُوجَ، وَهُمْ كَمَا قَالَ اللَّهُ: ﴿مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ۝٩٦﴾ الأنبياء، فَيَمُرُّ أَوَائِلُهُمْ عَلَى بُحَيْرَةِ الطَّبَرِيَّةِ، فَيَشْرَبُونَ مَا فِيهَا، ثُمَّ يَمُرُّ آخِرُهُمْ فَيَقُولُونَ: لَقَدْ كَانَ فِي هَذَا مَاءٌ مَرَّةً، وَيُحْصَرُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ حَتَّى يَكُونَ رَأْسُ الثَّوْرِ لِأَحَدِهِمْ خَيْرًا مِنْ مِائَةِ دِينَارٍ لِأَحَدِكُمُ الْيَوْمَ، فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى اللَّهِ، فَيُرْسِلُ اللَّهُ عَلَيْهِمُ النَّغَفَ فِي رِقَابِهِمْ، فَيُصْبِحُونَ فَرْسَى كَمَوْتِ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ، وَيَهْبِطُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ فَلَا يَجِدُونَ مَوْضِعَ شِبْرٍ إِلَّا قَدْ مَلَأَهُ زَهَمُهُمْ، وَنَتْنُهُمْ، وَدِمَاؤُهُمْ، فَيَرْغَبُونَ إِلَى اللَّهِ سُبْحَانَهُ، فَيُرْسِلُ عَلَيْهِمْ طَيْرًا كَأَعْنَاقِ الْبُخْتِ، فَتَحْمِلُهُمْ فَتَطْرَحُهُمْ حَيْثُ شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مَطَرًا لَا يُكِنُّ مِنْهُ بَيْتُ مَدَرٍ وَلَا وَبَرٍ، فَيَغْسِلُهُ حَتَّى يَتْرُكَهُ كَالزَّلَقَةِ، ثُمَّ يُقَالُ لِلْأَرْضِ: أَنْبِتِي ثَمَرَتَكِ، وَرُدِّي بَرَكَتَكِ، فَيَوْمَئِذٍ تَأْكُلُ الْعِصَابَةُ مِنَ الرُّمَّانَةِ، فَتُشْبِعُهُمْ، وَيَسْتَظِلُّونَ بِقِحْفِهَا، وَيُبَارِكُ اللَّهُ فِي الرِّسْلِ حَتَّى إِنَّ اللِّقْحَةَ مِنَ الْإِبِلِ تَكْفِي الْفِئَامَ مِنَ النَّاسِ، وَاللِّقْحَةَ مِنَ الْبَقَرِ تَكْفِي الْقَبِيلَةَ، وَاللِّقْحَةَ مِنَ الْغَنَمِ تَكْفِي الْفَخِذَ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ، إِذْ بَعَثَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ رِيحًا طَيِّبَةً، فَتَأْخُذُ تَحْتَ آبَاطِهِمْ، فَتَقْبِضُ رُوحَ كُلِّ مُسْلِمٍ، وَيَبْقَى سَائِرُ النَّاسِ يَتَهَارَجُونَ، كَمَا تَتَهَارَجُ الْحُمُرُ، فَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ»[1].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٣٧، وأبو داود: ٣٤٢١، والترمذي: ٢٢٤٠.

واته: نەواسی کوڕی سەمعانی کیلابی ﷛ دەڵێ: سەر لەبەیانییەک پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوورو درێژی باسی فیتنەو ئاژاوەی دەجالی بۆ کردین، دەنگی نزم دەکردەوەو دەنگی بەرزدەکردەوە بەشێوەیە وامان دەزانی ئەوەتا لەناو دارخورماکانی مەدینەدا، گوتی: جا کاتێ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ هەستاین و ڕۆشتین، لەپاشدا گەڕاینەوە بۆ خزمەتی، شوێنەواری ترسان لە دەجالی بەڕوخسارمانەوە دی، فەرمووی: چیتانە؟ گوتی: گوتمان: بەیانی بەشێوەیەک باسی دەجالت بۆ کردین، دەنگت نزم دەکردەوەو دەنگت بەرزدەکردەوە وامان دەزانی کە لەناو دارخورماکانی مەدینەدایە، فەرمووی: من لە شتێتر دەترسم جگە لە دەجال کە زیانی هەبێ بۆتان، خۆ ئەگەر بێتو من لەناوتاندا بم خۆم بە بەڵگەوە بەرەنگاری دەبمەوە لە جیاتی ئێوە، ئەگەر منیش لەناوتاندا نەبووم ئەوە هەرکەسە بۆ خۆی دەبێ بە بەڵگەوە رووبەرووی بێتەوەو گفتوگۆی لەگەڵ بکات، خوا دۆست و پارێزەری هەموو مسوڵمانێکە لەدوای من، گەنجێکی موو گرژی سەر ئاڵۆسکاوییە، چاوێکی کوێرە، من شێوەیم پێ لە عەبدولعیزی کوڕی قوتن دەچێ، هەرکەس لەئێوە بینی و گەیشت بە دەجال با سەرەتای سورەتی «الكهف» بخوێنێ ئەوە دەبێتە هۆی سەلامەتی و دەیپارێزێ لە فیتنەی دەجال. فەرمووی: لەنێوان شام و عێراق دەردەکەوێت، بەڕاست بە چەپدا خراپەکاری و ئاژاوە و فیتنە بەرپا دەکات، ئەی بەندەکانی خوا خۆڕاگرو دامەزراوبن، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چەندە دەمێنێتەوە لەسەر زەویدا؟ فەرمووی: چل رۆژ، رۆژێک وەک ساڵێک و رۆژێک وەک مانگێک و رۆژێک وەک هەفتەیەک، رۆژەکانی تریشی ئاسایی دەبن، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو رۆژەی وەک ساڵێکە ئایا نوێژی یەک رۆژی تێدا بکەین بەسە؟ فەرمووی: نەخێر بە مەزەندە بۆی دیاری بکەن، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خێرایی رۆشتنی چۆنە بەسەر زەویدا؟ فەرمووی: زۆر خێرایە وەک باران وایە بەدەم باوە، فەرمووی: دەجال دەچێتە سەر هەندێ قەوم و تیرە بانگیان دەکات و دەڵێ: من خوام، ئەوانیش بڕوای پێ دەهێنن و بەگوێی دەکەن، فەرمان دەکات بە ئاسمان باران دەبارێنێ، فەرمان دەکات بە زەوی شینایی دەڕوێنێ، جا وشترو ماڵاتیان ئەوەندە تێر و تەسەل و قەڵەو دەبن و شیریان زۆر دەبێ لەبەر زۆری لەوەڕ، پاشان دەجال دەچێتە سەر هەندێ خەڵک بانگیان

دەکات و دەڵێ: من خوام، ئەوانیش بڕوای پێ ناهێنن و بەرپەرچی دەدەنەوە، ئەویش بەجێیان دەهێڵێ، لەپاش ئەو دەکەونە قات و قڕی و گرانیەکی واوە ڕۆژیان لێ دەبێتەوە هیچیان بەدەستەوە نامێنێ، پاشان دەجال بەلای وێرانەیەکدا ڕەت دەبێ پێی دەڵێ: گەنجینەکەت دەرکە دەرەوە، ئەویش بە گوێی دەکات، ئیتر هەرچی گەنجینەی ناو ئەو کەلاوەیە وەک پورەی هەنگ چۆن شوێنی شاکەیان دەکەون ئەوانیش ئاوەها شوێنی دەجال دەکەون، لەپاشدا کوڕێکی گەنج کە لە تافی لاویدایە بانگی دەکات و بە شمشێر لێی دەدات و دەیکات بە دووکەرتەوە، جا بانگی دەکاتەوە لاوەکە زیندوو دەبێتەوە و بە ڕوویەکی گەش و دەم بە زەردەخەنەوە دێتەوە بۆ لای، جا دەجال خەریکی کاری خۆیەتی ئا لەوکاتەدا خوا عیسای کوڕی مەریەم لە ڕۆژهەڵاتی دیمەشق لەلای منارە سپیەکە دادەبەزێنێ دوو دەست جلی لەبەردایە بە وەرس و بە زەعفەران ڕەنگ کراون، هەردوو لەپی دەستی لەسەر باڵی دوو مەلائیکە داناوە، کە سەر دادەنەوێنێ ئاوی لێ دەتکێ، کاتێ کە سەری بەرزدەکاتەوە وەک مرواری ئارەق لەڕووی هەڵدەنیشێ، هەر کافرێ بۆنی هەناسەی عیسا بکات خێرا دەمرێت، لەکاتێکدا کە بۆنی هەتا چاو بڕ بکات دەڕوات، جا عیسا دوای دەجال دەکەوێ هەتا لە «باب اللد» پێی دەگات و دەیکوژێت، پاشان دەچێتە لای قەومێک کە خوا پاراستوونی، دەست بە ڕوخساریاندا دێنێ و هەواڵی پلەو پایەکەیان پێدەدات لە بەهەشتدا، لەکاتێکدا ئەوان لەو حاڵەدان ئیتر خوا نیگای بۆ دەنێرێ: ئەی عیسا بێگومان هەندێ لە بەندەکانم بەرەڵاکردوە کەس دەرەقەتیان نایە، بەندەکانم دەرکەو بیانگەیەنە کێوی «الطور»، ئنجا خوا یەئجوج و مەئجوج بەرەڵا دەکات، ئیتر لە هەموو بەرزاییەکەوە بە تەکان دێن و جمەیان دێت، هەروەک خوا دەفەرموێت: ﴿مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ۝٩٦﴾ الأنبياء، واتە: لە هەموو بەرزاییەکەوە بەپەلە (و بەخێرایی) دێنە خوارەوە، کە سەرەتایان دەگاتە دەریای تەبەریە هەموو ئاوەکەی دەخۆنەوەو چۆڕی لێ دەبڕن، ئەوانەی دواوە کە دێن دەڵێن: جارێ لە جاران لەم شوێنەدا ئاو هەبووە، گەمارۆی عیساو هاوەڵانی دەدەن بە شێوەیە سەرەگایە لەو ڕۆژەدا بۆ یەکێ لەوان چاکترە لەسەد دینار بۆ یەکێ لە ئێوە لە ئەمڕۆدا، بۆیە عیسای کوڕی مەریەم و هاوەڵانی بەکوڵ لەخوا دەپاڕێنەوە لەناویان بەرێ و ڕزگاریان بکات لەدەستیان،

جا خوا كرمێكیان بۆ دەنێرێ دەداتە ملیان بەیەكجار هەرهەموویان لەناودەچن وەک چۆن یەک كەس لەناو دەچێت، جا عیسای كوڕی مەریەم و هاوەڵانی لە كێوی «الطور» دێنەخوارەوە ئەوەندەی بستێ خاک نەماوە پیس نەبووبێ بە خوێن و كەلاكی ئەوان، دەبینن بۆگەنی پیسی جەستەی ئەوان سەرزەوی گرتۆتەوە، بۆیە عیسای كوڕی مەریەم و هاوەڵانی بەكوڵ لەخوا دەپاڕێنەوە ڕزگاریان بكات لەو بۆگەنە، جا خوا باڵندەیەكی گەورەیان بۆ دەنێرێ وەک گەردنی وشتری مل درێژ كەلاكەكانیان هەڵدەگرن و لە شوێنێ فڕێیان دەدەن كە خوا دەیهەوێت، جا خوا بارانێكی ڕەحمەت دەبارێنێ و هەموو خانوبەرەو ڕەشماڵەكان دەگرێتەوەو سەرزەوی وەک ئاوێنەی ساف پاک پاک دەكاتەوە، لەپاشدا بە زەوی دەوترێت: بێرەوە بەرو دەستبكەرەوە بە پیت و فەڕ خستنەوەو بەروبووم پێشكەشی مرۆڤەكان بكە، وای لێ دێ كۆمەڵێ لەیەک هەنار تێردەخۆن و لەسێبەری قاوغەكەیا دادەنیشن و دەحەسێنەوە، ئاژەڵە شیردەرەكان وەها پیت و بەرەكەتیان تێ دەكەوێ شیری وشترێكی تازە زاو بەشی كۆمەڵێ خەڵكی زۆر دەكات، شیری مانگایەكی تازە زاو بەشی هۆزێ دەكات، فرۆی ژەمی مەڕێ یان بزنێكی دۆشەنی بەشی تیرەیە دەكات، ئیتر بەو شێوەیە لەو خێرو خۆشیەدا دەمێننەوەو لەكاتێكدا لەسەر ئەو حاڵەتەن، خوا بایەكی خۆش هەڵدەكات ڕۆحی هەرچی بڕواداره دەكێشێ، ئەوەی ئەمێنێتەوە كەسە خراپەكانن و هەروەكو چۆن كەرگەل لەبەر چاوی یەكتردا سواری یەک دەبن ئاوا ئەو خەڵكە خراپەش زینا لەگەڵ یەک دەكەن و قیامەت بەسەر ئەواندا بەرپا ئەكرێ.

**٤٠٧٦- عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّوَّاسَ بْنَ سَمْعَانَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَيُوقِدُ الْمُسْلِمُونَ مِنْ قِسِيِّ يَأْجُوجَ، وَمَأْجُوجَ، وَنُشَّابِهِمْ، وَأَتْرِسَتِهِمْ سَبْعَ سِنِينَ»[1].**

واتە: عەبدوڕەحمانی كوڕی جوبەیری كوڕی نوفەیر لە باوكییەوە دەگێڕێتەوە كە گوێی لە نەواسی كوڕی سەمعان ﷺ بووە كە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمانان حەوت ساڵ بە كەل و پەلی جەنگی وەكو تیرو كەوان و قەڵغانی یەئجوج و مەئجوج ئاگر دەكەنەوە.

---

(١) صحيح.

٤٠٧٧- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﷺ، قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكَانَ أَكْثَرُ خُطْبَتِهِ حَدِيثًا، حَدَّثَنَاهُ عَنِ الدَّجَّالِ، وَحَذَّرَنَاهُ، فَكَانَ مِنْ قَوْلِهِ أَنْ قَالَ: «إِنَّهُ لَمْ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ، مُنْذُ ذَرَأَ اللَّهُ ذُرِّيَّةَ آدَمَ، أَعْظَمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يَبْعَثْ نَبِيًّا إِلَّا حَذَّرَ أُمَّتَهُ الدَّجَّالَ، وَأَنَا آخِرُ الْأَنْبِيَاءِ، وَأَنْتُمْ آخِرُ الْأُمَمِ، وَهُوَ خَارِجٌ فِيكُمْ لَا مَحَالَةَ، وَإِنْ يَخْرُجْ وَأَنَا بَيْنَ ظَهْرَانَيْكُمْ، فَأَنَا حَجِيجٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ، وَإِنْ يَخْرُجْ مِنْ بَعْدِي، فَكُلُّ امْرِئٍ حَجِيجُ نَفْسِهِ، وَاللَّهُ خَلِيفَتِي عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، وَإِنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ خَلَّةٍ بَيْنَ الشَّامِ، وَالْعِرَاقِ، فَيَعِيثُ يَمِينًا وَيَعِيثُ شِمَالًا، يَا عِبَادَ اللَّهِ فَاثْبُتُوا، فَإِنِّي سَأَصِفُهُ لَكُمْ صِفَةً لَمْ يَصِفْهَا إِيَّاهُ نَبِيٌّ قَبْلِي، إِنَّهُ يَبْدَأُ، فَيَقُولُ: أَنَا نَبِيٌّ وَلَا نَبِيَّ بَعْدِي، ثُمَّ يُثَنِّي فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ وَلَا تَرَوْنَ رَبَّكُمْ حَتَّى تَمُوتُوا، وَإِنَّهُ أَعْوَرُ، وَإِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ، وَإِنَّهُ مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَافِرٌ، يَقْرَؤُهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ، كَاتِبٍ أَوْ غَيْرِ كَاتِبٍ، وَإِنَّ مِنْ فِتْنَتِهِ أَنَّ مَعَهُ جَنَّةً وَنَارًا، فَنَارُهُ جَنَّةٌ، وَجَنَّتُهُ نَارٌ، فَمَنِ ابْتُلِيَ بِنَارِهِ، فَلْيَسْتَغِثْ بِاللَّهِ، وَلْيَقْرَأْ فَوَاتِحَ الْكَهْفِ فَتَكُونَ عَلَيْهِ بَرْدًا وَسَلَامًا، كَمَا كَانَتِ النَّارُ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَإِنَّ مِنْ فِتْنَتِهِ أَنْ يَقُولَ لِأَعْرَابِيٍّ: أَرَأَيْتَ إِنْ بَعَثْتُ لَكَ أَبَاكَ وَأُمَّكَ، أَتَشْهَدُ أَنِّي رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيَتَمَثَّلُ لَهُ شَيْطَانَانِ فِي صُورَةِ أَبِيهِ، وَأُمِّهِ، فَيَقُولَانِ: يَا بُنَيَّ، اتَّبِعْهُ، فَإِنَّهُ رَبُّكَ، وَإِنَّ مِنْ فِتْنَتِهِ أَنْ يُسَلَّطَ عَلَى نَفْسٍ وَاحِدَةٍ، فَيَقْتُلَهَا، وَيَنْشُرَهَا بِالْمِنْشَارِ، حَتَّى يُلْقَى شِقَّتَيْنِ، ثُمَّ يَقُولَ: انْظُرُوا إِلَى عَبْدِي هَذَا، فَإِنِّي أَبْعَثُهُ الْآنَ، ثُمَّ يَزْعُمُ أَنَّ لَهُ رَبًّا غَيْرِي، فَيَبْعَثُهُ اللَّهُ، وَيَقُولُ لَهُ الْخَبِيثُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ رَبِّيَ اللَّهُ، وَأَنْتَ عَدُوُّ اللَّهِ، أَنْتَ الدَّجَّالُ، وَاللَّهِ مَا كُنْتُ بَعْدُ أَشَدَّ بَصِيرَةً بِكَ مِنِّي الْيَوْمَ».

قَالَ أَبُو الْحَسَنِ الطَّنَافِسِيُّ: فَحَدَّثَنَا الْمُحَارِبِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ الْوَلِيدِ الْوَصَّافِيُّ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ذَلِكَ الرَّجُلُ أَرْفَعُ أُمَّتِي دَرَجَةً فِي الْجَنَّةِ».

قَالَ: قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: «وَاللَّهِ مَا كُنَّا نُرَى ذَلِكَ الرَّجُلَ إِلَّا عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ حَتَّى مَضَى لِسَبِيلِهِ. قَالَ الْمُحَارِبِيُّ، ثُمَّ رَجَعْنَا إِلَى حَدِيثِ أَبِي رَافِعٍ، قَالَ: «وَإِنَّ مِنْ فِتْنَتِهِ أَنْ يَأْمُرَ السَّمَاءَ أَنْ تُمْطِرَ فَتُمْطِرَ، وَيَأْمُرَ الْأَرْضَ أَنْ تُنْبِتَ فَتُنْبِتَ، وَإِنَّ مِنْ فِتْنَتِهِ أَنْ يَمُرَّ بِالْحَيِّ فَيُكَذِّبُونَهُ، فَلَا تَبْقَى لَهُمْ سَائِمَةٌ إِلَّا هَلَكَتْ، وَإِنَّ مِنْ فِتْنَتِهِ أَنْ يَمُرَّ بِالْحَيِّ فَيُصَدِّقُونَهُ، فَيَأْمُرَ السَّمَاءَ أَنْ تُمْطِرَ فَتُمْطِرَ، وَيَأْمُرَ الْأَرْضَ أَنْ تُنْبِتَ فَتُنْبِتَ، حَتَّى تَرُوحَ مَوَاشِيهِمْ، مِنْ يَوْمِهِمْ ذَلِكَ أَسْمَنَ مَا كَانَتْ وَأَعْظَمَهُ، وَأَمَدَّهُ خَوَاصِرَ، وَأَدَرَّهُ ضُرُوعًا، وَإِنَّهُ لَا يَبْقَى شَيْءٌ مِنَ الْأَرْضِ إِلَّا وَطِئَهُ، وَظَهَرَ عَلَيْهِ، إِلَّا مَكَّةَ، وَالْمَدِينَةَ، لَا يَأْتِيهِمَا مِنْ نَقْبٍ مِنْ نِقَابِهِمَا إِلَّا لَقِيَتْهُ الْمَلَائِكَةُ بِالسُّيُوفِ صَلْتَةً، حَتَّى يَنْزِلَ عِنْدَ الظُّرَيْبِ الْأَحْمَرِ، عِنْدَ مُنْقَطَعِ السَّبَخَةِ، فَتَرْجُفُ الْمَدِينَةُ بِأَهْلِهَا ثَلَاثَ رَجَفَاتٍ، فَلَا يَبْقَى مُنَافِقٌ، وَلَا مُنَافِقَةٌ إِلَّا خَرَجَ إِلَيْهِ، فَتَنْفِي الْخَبَثَ مِنْهَا كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ، خَبَثَ الْحَدِيدِ، وَيُدْعَى ذَلِكَ الْيَوْمُ يَوْمَ الْخَلَاصِ».

فَقَالَتْ أُمُّ شَرِيكٍ بِنْتُ أَبِي الْعَكَرِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَأَيْنَ الْعَرَبُ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ «هُمْ يَوْمَئِذٍ قَلِيلٌ، وَجُلُّهُمْ بِبَيْتِ الْمَقْدِسِ، وَإِمَامُهُمْ رَجُلٌ صَالِحٌ، فَبَيْنَمَا إِمَامُهُمْ قَدْ تَقَدَّمَ يُصَلِّي بِهِمُ الصُّبْحَ، إِذْ نَزَلَ عَلَيْهِمْ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ الصُّبْحَ، فَرَجَعَ ذَلِكَ الْإِمَامُ يَنْكُصُ، يَمْشِي الْقَهْقَرَى، لِيَتَقَدَّمَ عِيسَى يُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَيَضَعُ عِيسَى يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، ثُمَّ يَقُولُ لَهُ: تَقَدَّمْ فَصَلِّ، فَإِنَّهَا لَكَ أُقِيمَتْ، فَيُصَلِّي بِهِمْ إِمَامُهُمْ، فَإِذَا انْصَرَفَ، قَالَ عِيسَى ﷺ: افْتَحُوا الْبَابَ، فَيُفْتَحُ، وَوَرَاءَهُ الدَّجَّالُ مَعَهُ سَبْعُونَ أَلْفَ يَهُودِيٍّ، كُلُّهُمْ ذُو سَيْفٍ مُحَلًّى وَسَاجٍ، فَإِذَا نَظَرَ إِلَيْهِ الدَّجَّالُ ذَابَ، كَمَا يَذُوبُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ، وَيَنْطَلِقُ هَارِبًا، وَيَقُولُ عِيسَى ﷺ: إِنَّ لِي فِيكَ ضَرْبَةً، لَنْ تَسْبِقَنِي بِهَا، فَيُدْرِكُهُ عِنْدَ بَابِ اللُّدِّ الشَّرْقِيِّ، فَيَقْتُلُهُ، فَيَهْزِمُ اللَّهُ الْيَهُودَ، فَلَا يَبْقَى شَيْءٌ مِمَّا خَلَقَ اللَّهُ يَتَوَارَى بِهِ يَهُودِيٌّ إِلَّا أَنْطَقَ اللَّهُ ذَلِكَ الشَّيْءَ، لَا حَجَرَ، وَلَا شَجَرَ، وَلَا حَائِطَ، وَلَا دَابَّةَ، إِلَّا الْغَرْقَدَةَ، فَإِنَّهَا مِنْ شَجَرِهِمْ، لَا تَنْطِقُ، إِلَّا قَالَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ الْمُسْلِمَ هَذَا يَهُودِيٌّ، فَتَعَالَ اقْتُلْهُ».

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَإِنَّ أَيَّامَهُ أَرْبَعُونَ سَنَةً، السَّنَةُ كَنِصْفِ السَّنَةِ، وَالسَّنَةُ كَالشَّهْرِ، وَالشَّهْرُ كَالْجُمُعَةِ، وَآخِرُ أَيَّامِهِ كَالشَّرَرَةِ، يُصْبِحُ أَحَدُكُمْ عَلَى بَابِ الْمَدِينَةِ، فَلَا يَبْلُغُ بَابَهَا الْآخَرَ حَتَّى يُمْسِيَ»، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ نُصَلِّي فِي تِلْكَ الْأَيَّامِ الْقِصَارِ؟ قَالَ: «تَقْدُرُونَ فِيهَا الصَّلَاةَ كَمَا تَقْدُرُونَهَا فِي هَذِهِ الْأَيَّامِ الطِّوَالِ، ثُمَّ صَلُّوا»، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَيَكُونُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ ﷺ فِي أُمَّتِي حَكَمًا عَدْلًا، وَإِمَامًا مُقْسِطًا، يَدُقُّ الصَّلِيبَ، وَيَذْبَحُ الْخِنْزِيرَ، وَيَضَعُ الْجِزْيَةَ، وَيَتْرُكُ الصَّدَقَةَ، فَلَا يُسْعَى عَلَى شَاةٍ، وَلَا بَعِيرٍ، وَتُرْفَعُ الشَّحْنَاءُ، وَالتَّبَاغُضُ، وَتُنْزَعُ حُمَةُ كُلِّ ذَاتِ حُمَةٍ، حَتَّى يُدْخِلَ الْوَلِيدُ يَدَهُ فِي فِي الْحَيَّةِ، فَلَا تَضُرُّهُ، وَتُفِرُّ الْوَلِيدَةُ الْأَسَدَ، فَلَا يَضُرُّهَا، وَيَكُونَ الذِّئْبُ فِي الْغَنَمِ كَأَنَّهُ كَلْبُهَا، وَتُمْلَأُ الْأَرْضُ مِنَ السِّلْمِ كَمَا يُمْلَأُ الْإِنَاءُ مِنَ الْمَاءِ، وَتَكُونُ الْكَلِمَةُ وَاحِدَةً، فَلَا يُعْبَدُ إِلَّا اللَّهُ، وَتَضَعُ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا، وَتُسْلَبُ قُرَيْشٌ مُلْكَهَا، وَتَكُونُ الْأَرْضُ كَفَاثُورِ الْفِضَّةِ، تُنْبِتُ نَبَاتَهَا بِعَهْدِ آدَمَ حَتَّى يَجْتَمِعَ النَّفَرُ عَلَى الْقِطْفِ مِنَ الْعِنَبِ فَيُشْبِعَهُمْ، وَيَجْتَمِعَ النَّفَرُ عَلَى الرُّمَّانَةِ فَتُشْبِعَهُمْ، وَيَكُونَ الثَّوْرُ بِكَذَا وَكَذَا مِنَ الْمَالِ، وَتَكُونَ الْفَرَسُ بِالدُّرَيْهِمَاتِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا يُرْخِصُ الْفَرَسَ؟ قَالَ «لَا تُرْكَبُ لِحَرْبٍ أَبَدًا»، قِيلَ لَهُ: فَمَا يُغْلِي الثَّوْرَ؟ قَالَ «تُحْرَثُ الْأَرْضُ كُلُّهَا، وَإِنَّ قَبْلَ خُرُوجِ الدَّجَّالِ ثَلَاثَ سَنَوَاتٍ شِدَادٍ، يُصِيبُ النَّاسَ فِيهَا جُوعٌ شَدِيدٌ، يَأْمُرُ اللَّهُ السَّمَاءَ فِي السَّنَةِ الْأُولَى أَنْ تَحْبِسَ ثُلُثَ مَطَرِهَا، وَيَأْمُرُ الْأَرْضَ فَتَحْبِسُ ثُلُثَ نَبَاتِهَا، ثُمَّ يَأْمُرُ السَّمَاءَ، فِي الثَّانِيَةِ فَتَحْبِسُ ثُلُثَيْ مَطَرِهَا، وَيَأْمُرُ الْأَرْضَ فَتَحْبِسُ ثُلُثَيْ نَبَاتِهَا، ثُمَّ يَأْمُرُ اللَّهُ السَّمَاءَ، فِي السَّنَةِ الثَّالِثَةِ، فَتَحْبِسُ مَطَرَهَا كُلَّهُ، فَلَا تُقْطِرُ قَطْرَةً، وَيَأْمُرُ الْأَرْضَ، فَتَحْبِسُ نَبَاتَهَا كُلَّهُ، فَلَا

تُنْبِتُ خَضْرَاءَ، فَلَا تَبْقَى ذَاتُ ظِلْفٍ إِلَّا هَلَكَتْ، إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ»، قِيلَ: فَمَا يُعِيشُ النَّاسُ فِي ذَلِكَ الزَّمَانِ؟ قَالَ «التَّهْلِيلُ، وَالتَّكْبِيرُ، وَالتَّسْبِيحُ، وَالتَّحْمِيدُ، وَيُجْرَى ذَلِكَ عَلَيْهِمْ مُجْرَى الطَّعَامِ».

قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: سَمِعْتُ أَبَا الْحَسَنِ الطَّنَافِسِيَّ، يَقُولُ: سَمِعْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ الْمُحَارِبِيَّ، يَقُولُ: «يَنْبَغِي أَنْ يُدْفَعَ هَذَا الْحَدِيثُ إِلَى الْمُؤَدِّبِ، حَتَّى يُعَلِّمَهُ الصِّبْيَانَ فِي الْكُتَّابِ»[1].

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین کە زۆربەی وتارەکەشی باسی دەجال بوو، لە دەجال ئاگاداری دەکردینەوە، بەشێک لە فەرمایشتەکەی ئەوەبوو کە فەرمووی: بێگومان هیچ فیتنەو ئاشوبێک لە فیتنەو ئاشوبی دەجال گەورەتر نیەو نەبووە لەو کاتەوەی خوا ئادەمیزادی بەسەر زەویدا بڵاو کردۆتەوە، وە بێگومان هەر پێغەمبەرێک کە خوا ناردوویەتی ئەوە ئوممەتەکەی لە دەجال ئاگادار کردۆتەوە، وە منیش کۆتایی هەموو پێغەمبەرانم و ئێوەش کۆتایی هەموو ئوممەتەکانن، کەواتە: گومانی تێدا نیە کە دەجال لەنێو ئێوەدا پەیدا دەبێت، جا ئەگەر دەجال هات و منیش لە ناوتاندا بووم ئەوە خۆم لە جیاتی هەر مسوڵمانێک بە دەلیل و بەڵگەوە بەرەورووی دەبمەوە، خۆ ئەگەر لە دوای من سەریهەڵدا ئەوە دەبێ هەر کەسێ بۆ خۆی ڕوو بە ڕووی ببێتەوە، وە خوا پشتیوانی لەدوای نەمانی منیش هەر دەمێنێ و یارمەتیدەری مسوڵمانانە، بێگومانیش لە نێوان شام و عێراق سەرهەڵدەدات، بە ڕاست و چەپدا خەراپەو خەراپەکاری بڵاو دەکاتەوە، بۆیە ئەی بەندەکانی خوا خۆڕاگرو دامەزراو بن، بێگومان بە جۆرێک بۆتان پێناسە دەکەم و پێتان دەناسێنم کە هیچ پێغەمبەرێک پێش من ئاوا نەیناساندبێت، ئەو بەو جۆرە دەستپێدەکات دەڵێ: من پێغەمبەرم، دەی خۆ لە دوای من هیچ پێغەمبەرێکیتر نیە، پاشان زیاتر دەڕوات و دەڵێ: من پەروەردگارتانم، ئێ خۆ پەروەردگاریشتان نابینن تاکو نەمرن، وە دەجال کوێرە، دەی خۆ پەروەردگارتان وانییە، وە بێگومان لە نێوچاوانی نوسراوە»کافر» کە هەموو بڕوادارێکی خوێندەوارو نەخوێندەوار دەتوانێ بیخوێنێتەوە، یەکێک لە فیتنەکانی ئەوەیە کە (بە ڕواڵەت) بەهەشت و دۆزەخی پێیە، دۆزەخی ئەو بەهەشتەو بەهەشتیشی دۆزەخە، جا هەر کەسێک چووە ناو

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٣٢٢ مختصراً.

دۆزەخەکەی با پەنا بە خوا بگرێ و سەرەتای سوورەتی «الكهف» بخوێنێت، ئەو کات ئاگرەکە سارد دەبێتەوەو سەلامەت دەبێ هەر وەکو ئاگرەکەی ئیبراهیم، وە یەکێک لە فیتنەکانی ئەوەیە کە بە بابای دەشتەکی و سادە دەڵێ: ئەگەر دایک و باوکت بۆ زیندوو بکەمەوە شاهێدیم بۆ دەدەی کە پەروەردگارتم؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، ئیتر دوو شەیاتینی دەچنە سەر شێوەی دایک و باوکی و پێی دەڵێن: ڕۆڵەکەم شوێنی بکەوە چونکە بە ڕاستی ئەو پەروەردگاری تۆیە، یەکێکیتر لە فیتنەکانی ئەوەیە کە بە سەر یەکێکدا زاڵ دەبێ و دەیهێنێ بە موشار لەتی دەکات تاکو دەیکات بە دوو کەرتەوە، پاشان دەڵێ: تەماشای ئەو بەندەیەم بکەن چونکە ئێستا زیندووی دەکەمەوەو پاشان وادەزانێ کە جگە لە من پەروەردگارێکیتری هەیە، ئنجا خوا زیندووی دەکاتەوە، جا ئەو دەجالە پیسە پێی دەڵێ: پەروەروەردگارت کێیە؟ ئەویش دەڵێ: پەروەردگاری من «الله» یە، وە تۆش دوژمنی خوای، تۆ دەجالی، سوێند بە خوا قەت وەکو ئەورۆ تۆم نەناسیوەو ئاوا بەرچاو ڕۆشن نەبووم.

ئەبو سەعید دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئا ئەو پیاوە بەرزترین پلەی هەیە لە بەهەشتدا لەناو ئوممەتەکەمدا.
ئەبو سەعید گوتی: سوێند بەخوا هەتا عومەری کوڕی خەتتاب وەفاتی کرد ئێمە هەر دەمانگوت: ئەو پیاوە عومەرە.

موحاریبی دەڵێ: پاشان گەڕاینەوە بۆ فەرموودەکەی ئەبو ڕافیع، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: یەکیتر لە فیتنەی دەجال ئەوەیە کە کاتێک فەرمان دەکات بە ئاسمان کە باران ببارێنێ ئەوە باران دەبارێت، وە فەرمان دەکات بە زەوی ئیتر گژو گیا سەوز دەبێت، یەکیتر لە فیتنەکانی ئەوەیە کە بە لای ئاواییەکدا دەڕوات و بە درۆی دەخەنەوە ئەوە ئەو ئاواییە هیچ مەڕو ماڵاتێکیان نامێنێ و هەمووی لەناو دەچێت، وە بەلای ئاوایەکیتردا کە تێدەپەڕێ و بڕوای پێدێنن ئەوە فەرمان دەکات ئاسمان باران دەبارێنێ و زەوییان بۆ سەوز دەبێت، ئیتر ماڵاتەکەیان لە جاران قەڵەوترو گەورەتر دەبێ و شیری زیاتریان دەبێت، هیچ بەشێکی زەوی نامێنێ کە پێیدا نەڕوات و بە سەریدا زاڵ نەبێ جگە لە مەککەو مەدینە، کاتێک لە هەر ڕێگاو کەلێنێکەوە بۆیان دێ ئەوە فریشتە بە شمشێری ڕووتەوە بەرەو ڕووی دەبێتەوە، تاکو لە گردۆڵکە سورەکەوە دادەبەزێ کە

خاکەکەی وەکو خوێ وایە، ئەوجار مەدینە سێ جار دەلەرزێت، هەرچی دووڕووە لە مەدینە دەردەچێ بۆلای دەجال، بۆیە لە خەڵکی خەراپ پاک دەبێتەوە هەروەکو چۆن ئاسنی ژەنگاوی لە کورەدا پاک دەبێتەوە، وە ئەو ڕۆژە پێیدەڵێن ڕۆژی ڕزگار بوون.

ئنجا ئوممو شەریکی کچی ئەبو عەکەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ عەرەب لەو ڕۆژەدا لە کوێیە؟ عەرەب ئەو ڕۆژە کەمەو بەشە هەرەزۆرەکەی لە بەیتولمەقدیسە، پێشەواکەیان پیاوێکی چاکە، جا لەو کاتەیدا کە پێشەوایەکەیان پێشنوێژی نوێژی بەیانیان بۆ دەکات عیسای کوڕی مەریەم لەو بەرەبەیانەدا دادەبەزێت، ئەویش دەیهەوێ بکشێتەوە دواوە تا عیسا بەرنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، عیساش دەستی لەنێو شانیدەدات و پێیدەڵێ: پێشکەوەو بەرنوێژییەکە بکە چونکە قامەت بۆ تۆ کراوە، ئنجا بەرنوێژییان بۆ دەکات و کاتێک لێدەبنەوە عیسا ﷺ دەفەرموێت: دەرگاکە بکەنەوە، ئنجا دەرگاکە دەکرێتەوە، دەبینن دەجال لەگەڵ حەفتا هەزار جولەکە لەوێ وەستاوە، هەموویان چەکیان پێیە، شمشێرەکانیان ڕازاوەتەوەو خۆیشیان قوماشی سەوزیان داوە بە شانیانا، جا کە دەجال چاوی بە عیسا دەکەوێ وەکو خوێ کە لە ئاودا دەتوێتەوە ئاوا دەتوێتەوەو دەیهەوێ ڕابکات، بۆیە عیسا ﷺ پێیدەڵێ: لێدانێکم بۆ تۆ پێیە کە لەدەستم دەرناچی، ئیتر لە شوێنێک کە پێیدەگوترێت: «باب اللد» لە ڕۆژهەڵاتیدا پێیدەگات و دەیکوژێت، ئیتر خوا جولەکە لەناو دەبات، هیچ شتێک لەدروستکراوانی خوا نامێنێ کە جولەکە داڵدە بدات، هەموو شتێک لە جولەکە بە دەنگ دێت، نە بەردو نە دارو نە دیوارو نە ئاژەڵ نامێنێ بە دەنگ نەیەت جگە لەداری غەرقەد کە دارێکی خۆیانەو دەنگ ناکات، هەموو شتەکانیتر دەڵێن: ئەی بەندەی مسوڵمان ئەوە جولەکەیە وەرە بیکوژە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ماوەی مانەوەی دەجال چل ساڵە، ساڵێکیان وەکو نیو ساڵەو ساڵێکیان وەکو مانگێکەو مانگێک وەکو هەفتەیەک وایەو ڕۆژەکانیتر وەکو پڕشکە ئاگر کورتن، لە دەروازەی مەدینە کە یەکێکتان بەیانی بەڕێدەکەوێ تا دەگاتە دەرگاکەیتر ئێوارەی لێدادێت، پێی گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕۆژە کورتانەدا چۆن نوێژ بکەین؟ فەرمووی: چۆن لە ڕۆژە درێژەکاندا دەیخەمڵێنن لە

ڕۆژە کورتەکانیش بەو جۆرە بیخەمڵێنن و نوێژیان تێدا بکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: عیسای کوڕی مەریەم ﷺ لەناو ئوممەتەکەمدا دادوەرێکی دادپەروەر دەبێ و پێشەوایەکی دادگەر دەبێت، خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێ ( دینی نەسرانی هەڵدەوەشێنێتەوە) سەرانە ناهێڵێ و واز لە خێرکردن دێنێ و کەس بە شوێن مەڕو وشتردا ناڕوات و ڕق و کینە هەڵدەگیرێ و هیچ ژەهرداریک ژەهری نامێنی، بە جۆرێک منداڵ دەست دەخاتە ناو دەمی مارو هیچ زەرەریشی پێناگات، منداڵ شێر ڕاو دەنێ و زیانیشی پێناگات، گورگ وەکو سەگی مەڕی لێدێت، زەوی پڕ دەبێ لە ئاشتی هەروەکو چۆن دەفر پڕ دەبێ لە ئاو، هەموو خەڵکی لەسەر یەک وشە «لا إله إلا الله» ڕێک دەبن، جگە لە زاتی الله هیچ شتێک ناپەرسترێت، شەڕو ئاژاوە نامێنێت، قورەیش موڵکیان لێوەردەگیرێتەوە، سەر زەوی وەکو دەفری زیوی لێدێ لە خاوێنیدا، وەکو سەردەمی ئادەم زەوی سەوزای لێ سەوز دەبێتەوە، بەجۆرێک چەند کەسێک بە یەک هێشوو ترێ تێر دەخۆن، وە کۆمەڵە کەسێک بە یەک هەنار تێر دەخۆن، گاجووت ئەوەندەو ئەوەندە دەکات و ئەسپ بە چەند دیرهەمێک دەبێت، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەسپ بۆ هەرزان دەبێت؟ فەرمووی: هەرگیز بۆ شەڕ سواری ئەسپ نابنەوە، گوترا: ئەی گاجووت بۆ گران دەبێت؟ فەرمووی: زەوی هەمووی دەکێڵدرێت، بێگومان پێش هاتنی دەجال سێ ساڵان وشکە ساڵی دەبێت، خەڵکی تووشی برسێتی و نەبوونی دەبن، خوا ساڵی یەکەم فەرمان بە ئاسمان دەکات سێیەکی باران دەگرێتەوە، وە فەرمان بە زەوی دەکات سێیەکی سەوزایی بگرێتەوە، وە خوا لە ساڵی دووهەمدا فەرمان بە ئاسمان دەکات دوو لەسەر سێی بارانی بگرێتەوە وفەرمان بە زەوی دەکات دوو لەسەر سێی سەوزاییەکەی بگرێتەوە، پاشان لەساڵی سێهەمدا خوا فەرمان دەکات ئاسمان هەموو بارانکەی بگرێتەوەو دڵۆپێک نابارێنێت، فەرمانیش بەزەوی دەکات تەواوی سەوزاییەکەی بگرێتەوە، سەوزایی لێ سەوز نابێت، هەموو ماڵات لەناو دەچێ جگە لەوەی کە خوا بیهەوێ بمێنێت، گوترا: ئەی خەڵک لەو زەمانەدا بەچی دەژیت؟ فەرمووی: بە زیکری: «لا إله إلا الله» و «الله أكبر» و «سبحان الله» و «الحمد لله»، ئەو زیکرە جێی خواردنیان بۆ دەگرێتەوە.




٤٠٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا مُقْسِطًا، وَإِمَامًا عَدْلًا، فَيَكْسِرُ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلُ الْخِنْزِيرَ، وَيَضَعُ الْجِزْيَةَ، وَيَفِيضُ الْمَالُ حَتَّى لَا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ»[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: ڕۆژی دوایی نایەت هەتاکو عیسای کوڕی مەریەم دانەبەزێ کە بە دادپەروەری حوکمی زەوی دەکات و پێشەوایەکی دادپەروەر دەبێت، بۆیە خاچ تێکدەشکێنێ و بەراز دەکوژێ و سەرانە هەڵدەگرێ و لە سەردەمی ئەودا ماڵ و سامان ئەوەندە زۆر دەبێ کە کەس نایهەوێت.

٤٠٧٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «تُفْتَحُ يَأْجُوجُ، وَمَأْجُوجُ فَيَخْرُجُونَ كَمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ٩٦﴾ الأنبياء، فَيَعُمُّونَ الْأَرْضَ، وَيَنْحَازُ مِنْهُمُ الْمُسْلِمُونَ، حَتَّى تَصِيرَ بَقِيَّةُ الْمُسْلِمِينَ فِي مَدَائِنِهِمْ وَحُصُونِهِمْ، وَيَضُمُّونَ إِلَيْهِمْ مَوَاشِيَهُمْ، حَتَّى أَنَّهُمْ لَيَمُرُّونَ بِالنَّهَرِ فَيَشْرَبُونَهُ، حَتَّى مَا يَذَرُونَ فِيهِ شَيْئًا، فَيَمُرُّ آخِرُهُمْ عَلَى أَثَرِهِمْ، فَيَقُولُ قَائِلُهُمْ: لَقَدْ كَانَ بِهَذَا الْمَكَانِ، مَرَّةً مَاءٌ، وَيَظْهَرُونَ عَلَى الْأَرْضِ فَيَقُولُ قَائِلُهُمْ: هَؤُلَاءِ أَهْلُ الْأَرْضِ، قَدْ فَرَغْنَا مِنْهُمْ، وَلَنُنَازِلَنَّ أَهْلَ السَّمَاءِ، حَتَّى إِنَّ أَحَدَهُمْ لَيَهُزُّ حَرْبَتَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَتَرْجِعُ مُخَضَّبَةً بِالدَّمِ، فَيَقُولُونَ: قَدْ قَتَلْنَا أَهْلَ السَّمَاءِ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ، إِذْ بَعَثَ اللَّهُ دَوَابَّ كَنَغَفِ الْجَرَادِ، فَتَأْخُذُ بِأَعْنَاقِهِمْ فَيَمُوتُونَ، مَوْتَ الْجَرَادِ، يَرْكَبُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا، فَيُصْبِحُ الْمُسْلِمُونَ لَا يَسْمَعُونَ لَهُمْ حِسًّا، فَيَقُولُونَ: مَنْ رَجُلٌ يَشْرِي نَفْسَهُ، وَيَنْظُرُ مَا فَعَلُوا؟ فَيَنْزِلُ مِنْهُمْ رَجُلٌ قَدْ وَطَّنَ نَفْسَهُ عَلَى أَنْ يَقْتُلُوهُ، فَيَجِدُهُمْ مَوْتَى فَيُنَادِيهِمْ أَلَا أَبْشِرُوا فَقَدْ هَلَكَ عَدُوُّكُمْ، فَيَخْرُجُ النَّاسُ، وَيَخْلُونَ سَبِيلَ مَوَاشِيهِمْ، فَمَا يَكُونُ لَهُمْ رَعْيٌ إِلَّا لُحُومُهُمْ فَتَشْكَرُ عَلَيْهَا، كَأَحْسَنِ مَا شَكِرَتْ مِنْ نَبَاتٍ أَصَابَتْهُ قَطُّ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەئجوج و مەئجوج دەرگایان لەسەر دەکرێتەوەو دەردەچن هەروەکو خوا دەفەرمووێت: ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ٩٦﴾ الأنبياء، واتە: ئەوانیش لە هەموو بەرزاییەکەوە بەپەلە (و بەخێرایی) دێنە خوارەوە. هەموو سەر زەوی دەگرن و پێیدا بڵاودەبنەوە، مسوڵمانان

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٢٢، ومسلم: ١٥٥، والترمذي: ٢٢٣٣.

(٢) حسن صحيح.

خۆیان حەشاردەدەن، تا وای لێدێ لەناو شارو قەڵاو ماڵەکانیاندا دەمێننەوەو ماڵاتەکەشیان لە پاڵ خۆیان دەکەن، تا وای لێدێ کە یەئجوج و مەئجوج کاتێک بەسەر ڕووبارێکدا ڕێدەکەن هەموو ئاوەکەی دەخۆنەوەو هیچی لێ ناهێڵنەوە، جا کاتێک کۆتاییەکەیان بە شوێنیاندا ڕێدەکەن یەکێکیان دەڵێ: بێگومان وا دیارە ئێرە جارێ لە جاران ئاوی لێبووە، هەموو سەر زەوی دەگرن، جا یەکێکیان دەڵێ: ئەوە خەڵکی سەر زەوی (هەموومان دەست بەسەردا گرتن) ئەوجار شەڕ لەگەڵ خەڵکی ئاسمان دەکەین، بەجۆرێک یەکێکیان تیغەکەی ڕادەوەشێنێ بەرەو ئاسمان هەڵیدەدات و کاتێ دەگەڕێتەوە تەماشا دەکات بە خوێن ڕەنگکراوە، ئنجا دەڵێ: خەڵکی ئاسمانیشمان کوشت، جا لەوکاتەدا کە ئەوان لەو حاڵەدان، لەناکاو خوا جانەوەرێک دەنێرێ وەکو کرمی کوللە وایەو گەردن و ملیان دەگرێ و وەکو کوللە دەیانکوژێت، بەجۆرێک دەکەونە سەریەک، ئنجا مسوڵمانان بەیانییەک هەست ڕادەگرن هیچ هەست و خوستیان نایەت، بۆیە دەڵێن: کێ هەیە خۆی فیدا بکات بزانێ یەئجوج و مەئجوج چییان کردوە؟ ئنجا پیاوێک دادەبەزێ کە خۆی ئامادە کردوە کە بیکوژن (خۆی فیدا کردوە) کەچی دەبینێ مردوون، بۆیە بانگی مسوڵمانەکان دەکات کە ئاگاداربن و مژدەتان لێبێ، دوژمنەکەتان لەناوچووە، بۆیە خەڵکی ئەوجار دەچنە دەرێ و ماڵاتەکەیان بەرەڵڵا دەکەن، لەکاتێکدا هیچ نیە کە ماڵاتەکەیان بیخوات جگە لە لاشەی مردووی یەئجوج و مەئجوج نەبێت، ماڵاتەکەش دەیانخوات و بە جوانترین شێوە پێی قەڵەو دەبن بەجۆرێک بە هیچ ڕووەکێکی دیکە پێشتر ئاوا قەڵەو نەبووبن.

٤٠٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ يَأْجُوجَ، وَمَأْجُوجَ يَحْفِرُونَ كُلَّ يَوْمٍ، حَتَّى إِذَا كَادُوا يَرَوْنَ شُعَاعَ الشَّمْسِ، قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمْ: ارْجِعُوا فَسَنَحْفِرُهُ غَدًا، فَيُعِيدُهُ اللَّهُ أَشَدَّ مَا كَانَ، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ مُدَّتُهُمْ، وَأَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَهُمْ عَلَى النَّاسِ، حَفَرُوا، حَتَّى إِذَا كَادُوا يَرَوْنَ شُعَاعَ الشَّمْسِ، قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمْ: ارْجِعُوا، فَسَتَحْفِرُونَهُ غَدًا، إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى، وَاسْتَثْنَوْا، فَيَعُودُونَ إِلَيْهِ، وَهُوَ كَهَيْئَتِهِ حِينَ تَرَكُوهُ، فَيَحْفِرُونَهُ وَيَخْرُجُونَ عَلَى النَّاسِ فَيُنْشِفُونَ الْمَاءَ، وَيَتَحَصَّنُ النَّاسُ مِنْهُمْ فِي حُصُونِهِمْ، فَيَرْمُونَ بِسِهَامِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ، فَتَرْجِعُ عَلَيْهَا الدَّمُ الَّذِي اجْفَظَّ، فَيَقُولُونَ: قَهَرْنَا أَهْلَ الْأَرْضِ، وَعَلَوْنَا أَهْلَ السَّمَاءِ، فَيَبْعَثُ اللَّهُ نَغَفًا فِي أَقْفَائِهِمْ، فَيَقْتُلُهُمْ بِهَا». قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ دَوَابَّ الْأَرْضِ لَتَسْمَنُ، وَتَشْكَرُ شَكَرًا، مِنْ لُحُومِهِمْ»[1].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣١٥٣.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (دەربارەی بەربەستەکە) فەرموویەتی: یەئجوج و مەئجوج هەموو رۆژێ هەوڵ دەدەن بەربەستەکە کون بکەن هەتا ئەوەندەیان نامێنێ کوناودەری بکەن، سەرکارەکەیان دەڵێ: بگەڕێنەوە ئەوەندەی نەماوە سبەینێ کونی دەکەین، بۆ ڕۆژی دواتر خوا ئەو بەربەستە لە جاران مەحکەمتر و قایمتر دەکاتەوە، ئەم حاڵە هەروا بەردەوام دەبێ هەتا ئەو کاتەی خوا دەیەوێ بەرەڵایان بکاتە گیانی ئەو خەڵکەی لەودیو بەربەستەکەوەن، ئەو کاتە سەرکارەکەیان دەڵێ: بگەڕێنەوە ئەوەندەی نەماوە سبەینێ کونی دەکەین ئەگەر خوا بیەوێ و حەز بکات، بۆ سبەینێ کە دێنەوە سەیر دەکەن چۆن بە جێیان هێشتووە وەک خۆی ماوەتەوە، جا بەربەستەکە کون دەکەن و پەلاماری خەڵکەکە دەدەن، ئاوی سەر زەوی دەخۆنەوە، خەڵک لەترسان هەڵدێن، تیر دەنێن بە ئاسمانەوەو تیرەکان خوێناوی دەبن و دەکەونە خوارەوە، ئیتر دەڵێن: بە زەبروزەنگ بە زۆری زۆرداری هەرچی لەسەر زەویدا بوو کپمان کردن و لەناومان بردن، هەرچیش لە ئاسمان بوو بەزاندمان و سەرکەوتین بەسەریاندا، خوا کرمێکیان بۆ دەنێرێ دادەتە ملیان و لەناویان دەبات، سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە هەرچی دەعباو جانەوەری سەر زەوی هەیە لە گۆشتی ئەوانە تێر دەبن و قەڵەو دەبن و چالاک دەبن.

٤٠٨١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: « لَمَّا كَانَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَقِيَ إِبْرَاهِيمَ، وَمُوسَى، وَعِيسَى فَتَذَاكَرُوا السَّاعَةَ، فَبَدَءُوا بِإِبْرَاهِيمَ فَسَأَلُوهُ عَنْهَا، فَلَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ مِنْهَا عِلْمٌ، ثُمَّ سَأَلُوا مُوسَى، فَلَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ مِنْهَا عِلْمٌ، فَرُدَّ الْحَدِيثُ إِلَى عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ، فَقَالَ: قَدْ عُهِدَ إِلَيَّ فِيمَا دُونَ وَجْبَتِهَا، فَأَمَّا وَجْبَتُهَا فَلَا يَعْلَمُهَا إِلَّا اللَّهُ، فَذَكَرَ خُرُوجَ الدَّجَّالِ، قَالَ: فَأَنْزِلُ، فَأَقْتُلُهُ فَيَرْجِعُ النَّاسُ إِلَى بِلَادِهِمْ فَيَسْتَقْبِلُهُمْ يَأْجُوجُ، وَمَأْجُوجُ وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ، فَلَا يَمُرُّونَ بِمَاءٍ إِلَّا شَرِبُوهُ، وَلَا بِشَيْءٍ إِلَّا أَفْسَدُوهُ، فَيَجْأَرُونَ إِلَى اللَّهِ، فَأَدْعُو اللَّهَ أَنْ يُمِيتَهُمْ، فَتَنْتُنُ الْأَرْضُ مِنْ رِيحِهِمْ، فَيَجْأَرُونَ إِلَى اللَّهِ، فَأَدْعُو اللَّهَ، فَيُرْسِلُ السَّمَاءَ بِالْمَاءِ، فَيَحْمِلُهُمْ فَيُلْقِيهِمْ فِي الْبَحْرِ، ثُمَّ تُنْسَفُ الْجِبَالُ، وَتُمَدُّ الْأَرْضُ مَدَّ الْأَدِيمِ، فَعُهِدَ إِلَيَّ مَتَى كَانَ ذَلِكَ، كَانَتِ السَّاعَةُ مِنَ النَّاسِ، كَالْحَامِلِ الَّتِي لَا يَدْرِي أَهْلُهَا مَتَى تَفْجَؤُهُمْ بِوِلَادَتِهَا » قَالَ الْعَوَّامُ: « وَوُجِدَ تَصْدِيقُ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ »[1].

---

(١) ضعيف.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: کاتێک شەوڕەوی بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا، لە ڕێگا تووشی ئیبراهیم و موساو عیسا بوو، جا ماوەیەک بەیەکەوە باسی کۆتایی زەمانیان کرد، لە ئیبراهیمەوە دەستیان پێکرد کە بۆیان باس بکات و پرسیاریان دەربارەی کرد، ئەویش هیچی دەربارەیەوە نەدەزانی، پاشان پرسیاریان لە موسا کرد، ئەویش هیچی دەربارەیەوە پێ نەبوو، ئنجا پرسیارو باسەکە بۆ عیسای کوڕی مەریەم گەڕێنرایەوە، ئەویش فەرمووی: دەربارەی پێش هاتنی کۆتایی زەمان بە ماوەیەکی کەم پێمگوتراوە، بەڵام خودی ڕۆژی کۆتایی منیش نایزانم و تەنها خوا دەیزانێ، جا باسی دەرچوون و پەیدابوونی دەجالی کردو فەرمووی: من دادەبەزم و دەیکوژم، ئنجا خەڵکی دەگەڕێنەوە شارو شوێنی خۆیان یەکسەر یەئجوج و مەئجوج دێنەدەرو لە هەموو بەرزاییەکان هەڵدەڕژێن، بێگومان بەلای هەر ئاوێکدا بڕۆن هەمووی دەخۆنەوە، وە هەرچی بەلایدا تێپەڕن وێرانی دەکەن، ئنجا مسوڵمانان هاناو پەنا بۆ خوا دێنن، منیش داوا لە خوا دەکەم کە لەناویان بەرێت، بۆیە سەرزەوی لەبەر بۆگەنی لاشەکەیان بۆگەن دەبێت، ئەوجاریش پەنا بۆ خوا دێنن (بۆ ئەوەی مسوڵمانان لەو بۆنە ڕزگاریان بکات و) منیش داوا لە خوا دەکەم، جا خوا باران لە ئاسمانەوە دادەبارێنێ و هەموویان دەبات دەیانخاتە دەریاوە، پاشان کێوەکان شیدەکرێنەوەو زەوی بەرین دەبێ وەکو پێستەی دەباغکراو، جا من بەو جۆرەم پێ ڕاگەیەندراوە کە کاتێک ئەوە ڕویدا ئەوە کۆتایی زەمان بەسەر خەڵکدا دێت، هاتنەکەی بەو جۆرەی ئافرەتێکی دووگیانە کە خزم و کەس و کاری نازانن کەی لەناکاو مناڵەکە دێتە دونیاوە. عەوام گوتی: ئەم ئایەتە تەصدیقی ئەم فەرموودەیە دەکات کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ٩٦ ﴾ الأنبياء، واتە: (ژیان درێژەی دەبێت) تا ئەو کاتەی (بەربەستەکەی) یەئجوج و مەئجوج دەکرێتەوە ئەوانیش لە هەموو بەرزاییەکەوە بەپەلە (و بەخێرایی) دێنە خوارەوە.




## بابەت: هاتنی مەهدی

**٤٠٨٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِذْ أَقْبَلَ فِتْيَةٌ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ، فَلَمَّا رَآهُمُ النَّبِيُّ ﷺ، اغْرَوْرَقَتْ عَيْنَاهُ وَتَغَيَّرَ لَوْنُهُ، قَالَ، فَقُلْتُ: مَا نَزَالُ نَرَى فِي وَجْهِكَ شَيْئًا نَكْرَهُهُ، فَقَالَ: «إِنَّا أَهْلُ بَيْتٍ اخْتَارَ اللَّهُ لَنَا الْآخِرَةَ عَلَى الدُّنْيَا، وَإِنَّ أَهْلَ بَيْتِي سَيَلْقَوْنَ بَعْدِي بَلَاءً وَتَشْرِيدًا وَتَطْرِيدًا، حَتَّى يَأْتِيَ قَوْمٌ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَعَهُمْ رَايَاتٌ سُودٌ، فَيَسْأَلُونَ الْخَيْرَ، فَلَا يُعْطَوْنَهُ، فَيُقَاتِلُونَ فَيُنْصَرُونَ، فَيُعْطَوْنَ مَا سَأَلُوا، فَلَا يَقْبَلُونَهُ، حَتَّى يَدْفَعُوهَا إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي فَيَمْلَؤُهَا قِسْطًا، كَمَا مَلَئُوهَا جَوْرًا، فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ، فَلْيَأْتِهِمْ وَلَوْ حَبْوًا عَلَى الثَّلْجِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵاوە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا کە ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین کۆمەڵێک گەنج لە بەنو هاشیم هاتن، جا کاتێک پێغەمبەر ﷺ ئەوانی بینی چاوەکانی پڕفرمێسک بوون و ڕەنگی گۆڕا، گوتی: گوتم: ئێمە بە جۆرێک لە ڕوخسارت دەبینین کە حەزی پێناکەین (چونکە نا ڕەحەت دیارە)، ئەویش فەرمووی: بێگومان خوای گەورە بۆ بنەماڵەی ئێمە قیامەتی بەسەر دونیادا هەڵبژاردووە، وە بێگومان بنەماڵەکەم لەدوای خۆم توشی بەڵاو ناخۆشی و دەرکردن و دورخستنەوە دێن، تا ئەوکاتەی کە کۆمەڵە خەڵکێک دێن لە ڕۆژهەڵاتەوە دێن کە ئاڵاکانیان ڕەشە، ئیتر داوای چاکەو دادپەروەری دەکەن خەڵکیش بە قسەیان ناکەن، بۆیە لەگەڵیان بەشەڕدێن و ئەوە سەردەکەون، ئەوجا ئەوەی داوای دەکەن پێیان دەدەن، بەڵام ئەوان قەبوڵی ناکەن، هەتاکو فەرمانڕەوایی دەدەنە دەست پیاوێک لە بنەماڵەکەی من، ئیتر ئەویش سەرزەوی پڕدەکات لە دادپەروەری هەروەکو چۆن لەو سەردەمەدا پڕدەبێ لە ستەم، جا هەر کەسێک لە ئێوە بەوان گەیشت با بچێتە پاڵیان ئەگەر بە خشکە خشکیش ڕۆیشتوە بەسەر بەفردا.

**٤٠٨٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «يَكُونُ فِي أُمَّتِي الْمَهْدِيُّ إِنْ قُصِرَ فَسَبْعٌ، وَإِلَّا فَتِسْعٌ، فَتَنْعَمُ فِيهِ أُمَّتِي نِعْمَةً، لَمْ يَنْعَمُوا مِثْلَهَا قَطُّ، تُؤْتَى أُكُلَهَا وَلَا تَدَّخِرُ مِنْهُمْ شَيْئًا، وَالْمَالُ يَوْمَئِذٍ كُدُوسٌ، فَيَقُومُ الرَّجُلُ، فَيَقُولُ: يَا مَهْدِيُّ أَعْطِنِي، فَيَقُولُ خُذْ»[٢].

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٢٣٢.




واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مەهدی لە ئوممەتی منە، جا ئەگەر کەم بمێنێتەوە حەوت ساڵ دەمێنێتەوە ئەگەرنا نۆ ساڵ، جا (لە سەردەمی ئەودا) ئوممەتەکەم لە نازو نیعمەتێکدا دەبێ کە هەرگیز لەو نازو نیعمەتەدا نەبوون، خواردنیان بۆ دێ و بۆیان دەستەبەر دەبێ و هیچیشی پاشەکەوت ناکەن (لەبەر زۆری شتەکان) ماڵ و سامان لەو ڕۆژەدا زۆر زۆرە، پیاو هەیە هەڵدەستێ دەچێ دەڵێ: ئەی مەهدی سامانم پێ ببەخشە، ئەویش دەڵێ: هەڵگرە (تا دەتوانی).

٤٠٨٤- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَقْتَتِلُ عِنْدَ كَنْزِكُمْ ثَلَاثَةٌ، كُلُّهُمُ ابْنُ خَلِيفَةٍ، ثُمَّ لَا يَصِيرُ إِلَى وَاحِدٍ مِنْهُمْ، ثُمَّ تَطْلُعُ الرَّايَاتُ السُّودُ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ، فَيَقْتُلُونَكُمْ قَتْلًا لَمْ يُقْتَلْهُ قَوْمٌ» - ثُمَّ ذَكَرَ شَيْئًا لَا أَحْفَظُهُ فَقَالَ - فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَبَايِعُوهُ وَلَوْ حَبْوًا عَلَى الثَّلْجِ، فَإِنَّهُ خَلِيفَةُ اللَّهِ الْمَهْدِيُّ»[١].

واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەلای گەنجینەکەتان (گەنجینەی کەعبە) سێ کەس شەڕدەکەن کە هەر یەکێکیان کوڕی خەلیفەیەکن، پاشان نابێ بە هی هیچ کام لەوان، دواتر کۆمەڵێ ئاڵا ڕەشەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەون، جا بە جۆرێک جەنگتان لەگەڵ دەکەن کە هیچ گەلێک بەوجۆرە شەڕی لەگەڵ نەکراوە، پاشان شتێکی باسکرد کە من بیرم نەماوە، ئنجا فەرمووی: جا هەرکاتێک بینیتانن پەیمانیان پێ بدەن، خۆ ئەگەر بێتو بە گاگۆڵکێ لەسەر بەفر بچن بۆلایان، چونکە بەڕاستی ئەوە مەهدییە کە جێنشینی خوایە.

٤٠٨٥- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمَهْدِيُّ مِنَّا أَهْلَ الْبَيْتِ، يُصْلِحُهُ اللَّهُ فِي لَيْلَةٍ»[٢].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مەهدی لە وەچەو نەوەی ئێمەی ئەهلی بەیتە، خوا لە شەوێکدا ئەیسازێنێ و ئەیصوڵحێنێ بۆ فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتداری.

٤٠٨٦- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أُمِّ سَلَمَةَ فَتَذَاكَرْنَا الْمَهْدِيَّ، فَقَالَتْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْمَهْدِيُّ مِنْ وَلَدِ فَاطِمَةَ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٢٨٤.

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب ﷺ دەڵێ: ئێمە لەلای ئوممو سەلەمە بووین و باسی مەهدیمان کرد، جا ئەویش گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: مەهدی لە نەوەو وەچەی فاتیمەیە.

٤٠٨٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «نَحْنُ وَلَدَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، سَادَةُ أَهْلِ الْجَنَّةِ، أَنَا، وَحَمْزَةُ، وَعَلِيٌّ، وَجَعْفَرٌ، وَالْحَسَنُ، وَالْحُسَيْنُ، وَالْمَهْدِيُّ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئێمە خانەوادەو نەوەی عەبدولموتەڵیبین، من و حەمزەو عەلی و جەعفەرو حەسەن و حوسەین و مەهدی گەورەو سەردارانی خەڵکی بەهەشتین.

٤٠٨٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنَ جَزْءٍ الزُّبَيْدِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَخْرُجُ نَاسٌ مِنَ الْمَشْرِقِ، فَيُوَطِّئُونَ لِلْمَهْدِيِّ» يَعْنِي سُلْطَانَهُ[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی جەزئی زوبەیدیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژهەڵاتەوە کەسانێک سەهەڵدەدەن و پەیدادەبن کە کارئاسانی و ڕێخۆشکەری بۆ مەهدی دەکەن و بەهێزی دەکەن. (ڕاوی گوتی:) مەبەستی لەوەیە کە دەسەڵاتەکەی بەهێز دەکەن.

## بابەت: گۆڕەپانەکانی جەنگ

٤٠٨٩- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ لِي جُبَيْرٌ، انْطَلِقْ بِنَا إِلَى ذِي مِخْمَرٍ، وَكَانَ رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُمَا فَسَأَلَهُ، عَنِ الْهُدْنَةِ، فَقَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «سَتُصَالِحُكُمُ الرُّومُ صُلْحًا آمِنًا، ثُمَّ تَغْزُونَ أَنْتُمْ وَهُمْ عَدُوًّا، فَتَنْتَصِرُونَ، وَتَغْنَمُونَ، وَتَسْلَمُونَ، ثُمَّ تَنْصَرِفُونَ حَتَّى تَنْزِلُوا بِمَرْجٍ ذِي تُلُولٍ، فَيَرْفَعُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الصَّلِيبِ الصَّلِيبَ، فَيَقُولُ: غَلَبَ الصَّلِيبُ، فَيَغْضَبُ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَيَقُومُ إِلَيْهِ فَيَدُقُّهُ، فَعِنْدَ ذَلِكَ تَغْدِرُ الرُّومُ، وَيَجْتَمِعُونَ لِلْمَلْحَمَةِ»[3].

---

(١) موضوع.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٧٦٧ و ٤٢٩٢.

واتە: لە خالیدی کوڕی مەعدانەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە لە جوبەیری کوڕی نوفەیلەوە گێڕاویەتەوەو گوتوویەتی: جوبەیر پێی گوتم: لەگەڵمان وەرە بۆلای «ذو مخمر» کە یەکێک بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، منیش لەگەڵیان ڕۆیشتم، جا پرسیاریان لێکرد دەربارەی ئاگربەست و ئاشتی (لەنێوان مسوڵمانان و گاورەکاندا)، ئەویش گوتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕۆم ئاگربەست و ئاشتیتان لەگەڵ ڕادەگەیەنن ئاگربەستێک کە دەبێتە هۆی ئارامی و ئاسایش، پاشان ئێوەو ئەوان بە هاوبەشی (یان هەر یەکەتان بە جیا) دژی دوژمنەکانتان (لە دەرەوەی خۆتان) دەجەنگن، بەهۆیەوە سەرکەوتوو دەبن و دەستکەوتی جەنگی بەدەست دێنن و بە سەلامەتی ڕزگارتان دەبێت، پاشان دەگەڕێنەوە هەتاکو لە دەشتاییەک و ناوچەیەکی تەپۆلکاوی دادەبەزن، جا یەکێک لە خاچ پەرستەکان خاچەکەی بەرزدەکاتەوە (وەک شانازی کردن بەسەر مسوڵماناندا) و دەڵێ: خاچەکەمان سەرکەوتوو بوو (واتە: خاچ پەرستەکان)، بۆیە یەکێک لە مسوڵمانەکان توڕە دەبێ و لێی دەدات، ئیتر لەمەودوا ڕۆم پەیمان دەشکێنێ و غەدر ئەکاو خۆ ئامادە دەکەن و کۆدەبنەوە بۆ شەڕە گەورەکە.

**٤٠٨٩م- حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الدِّمَشْقِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الْأَوْزَاعِيُّ، عَنْ حَسَّانَ بْنِ عَطِيَّةَ بِإِسْنَادِهِ نَحْوَهُ، وَزَادَ فِيهِ: «فَيَجْتَمِعُونَ لِلْمَلْحَمَةِ، فَيَأْتُونَ حِينَئِذٍ تَحْتَ ثَمَانِينَ غَايَةً، تَحْتَ كُلِّ غَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا»**[1].

لە سەنەدێکی تردا ئەوەشی بۆ زیاد کردوە: جا بۆ شەڕ کۆدەبنەوەو لەوکاتەدا لەژێر هەشتا ئاڵاوە دابەش دەبن و لەژێر هەر ئاڵایەکیش دوازدە هەزار کەس دەبێت.

**٤٠٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وَقَعَتِ الْمَلَاحِمُ، بَعَثَ اللَّهُ بَعْثًا مِنَ الْمَوَالِي، هُمْ أَكْرَمُ الْعَرَبِ فَرَسًا، وَأَجْوَدُهُ سِلَاحًا، يُؤَيِّدُ اللَّهُ بِهِمُ الدِّينَ»**[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکات جەنگەکە بەرپا بوو خوا لەوانەی کە لەکاتی خۆیدا ئازادکراون نێردراوێک دەنێرێ، کە ئەو ئازادکراوانەش لەوکاتەدا لە هەموو عەرەب ئامادەباشترن لەڕووی ئەسپ و چەک و کەل و پەلی جەنگییەوە، خوا دەیانکاتە پشتیوان بۆ ئەم دینە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٧٦٧ و ٤٢٩٢.

(٢) حسن.

٤٠٩١- عَنْ نَافِعِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «سَتُقَاتِلُونَ جَزِيرَةَ الْعَرَبِ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ، ثُمَّ تُقَاتِلُونَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ، ثُمَّ تُقَاتِلُونَ الدَّجَّالَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ» قَالَ جَابِرٌ: فَمَا يَخْرُجُ الدَّجَّالُ حَتَّى تُفْتَحَ الرُّومُ[1].

واتە: نافیعی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو وەققاص ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ئایندەدا جەنگ لەگەڵ جەزیرەی عەرەبدا دەکەن و خوا بەڕووتاندا دەیکاتەوە، پاشان شەڕ لەگەڵ ڕۆمدا دەکەن و خوا بەڕووتاندا دەیکاتەوە، پاشان شەڕ لەگەڵ دەجال دەکەن و خوا بەڕووتاندا دەیکاتەوە. جابیر گوتی: بۆیە دەجال دەرناچێ و دەرناکەوێ تاوەکو ڕۆم ئازاد نەکرێ.

٤٠٩٢- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «الْمَلْحَمَةُ الْكُبْرَى، وَفَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ، وَخُرُوجُ الدَّجَّالِ فِي سَبْعَةِ أَشْهُرٍ»[2].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جەنگە هەرە گەورەکەو ڕزگارکردنی «القسطنطينية»و دەرکەوتنی دەجال لە ماوەی حەوت مانگدا ڕوودەدەن.

٤٠٩٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَ الْمَلْحَمَةِ، وَفَتْحِ الْمَدِينَةِ سِتُّ سِنِينَ، وَيَخْرُجُ الدَّجَّالُ فِي السَّابِعَةِ»[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوسرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نێوانی بەرپابوونی جەنگ و کوشتارە گەورەکەو ڕزگارکردنی شارەکە (القسطنطينية) شەش ساڵە، وە دەجال لە ساڵی حەوتەمدا دێ و دەردەکەوێت.

٤٠٩٤- عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَكُونَ أَدْنَى مَسَالِحِ الْمُسْلِمِينَ بِبَوْلَاءَ» ثُمَّ قَالَ ﷺ: «يَا عَلِيُّ، يَا عَلِيُّ، يَا عَلِيُّ،» قَالَ: بِأَبِي، وَأُمِّي، قَالَ: «إِنَّكُمْ سَتُقَاتِلُونَ بَنِي الْأَصْفَرِ، وَيُقَاتِلُهُمُ الَّذِينَ مِنْ بَعْدِكُمْ، حَتَّى تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ رُوقَةُ الْإِسْلَامِ، أَهْلُ الْحِجَازِ، الَّذِينَ لَا يَخَافُونَ فِي اللَّهِ لَوْمَةَ لَائِمٍ، فَيَفْتَتِحُونَ

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٠٠.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٢٩٥، والترمذي: ٢٢٣٨.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٢٩٦.

الْقُسْطَنْطِينِيَّةَ بِالتَّسْبِيحِ وَالتَّكْبِيرِ، فَيُصِيبُونَ غَنَائِمَ لَمْ يُصِيبُوا مِثْلَهَا، حَتَّى يَقْتَسِمُوا بِالْأَتْرِسَةِ، وَيَأْتِي آتٍ فَيَقُولُ: إِنَّ الْمَسِيحَ قَدْ خَرَجَ فِي بِلَادِكُمْ، أَلَا وَهِيَ كِذْبَةٌ فَالْآخِذُ نَادِمٌ، وَالتَّارِكُ نَادِمٌ»[1].

واته: عەبدوڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عەوف لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قیامەت نایە هەتاکو پاسەوانی مسوڵمانان لە «بولاء» (شوێنێکە) نەبن، پاشان سێجار فەرمووی: ئەی عەلی، عەلی، گوتی: بەڵێ بە داک و باوکەوە فیدات بم، فەرمووی: ئێوە لەگەڵ ڕۆمەکان دەجەنگن وە ئەوانەی دوای ئێوەش لەگەڵیاندا دەجەنگن، هەتاکو باشترین خەڵکی حیجاز بەرەو ڕویان دەچن، ئەوانە لەبەر خاتری خوا لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسن و گوێی پێنادەن، ئیتر بە زیکرو یادی خواو «سبحان الله» و «الله أكبر»ـەوە قوستەنتەنیە ڕزگار دەکەن، دەسکەوتێکی زۆری جەنگیان دەست دەکەوێت، کە هەرگیز لە وێنەی نەبووە، هێندە زۆر دەبێ بە تاس و کوڵاو خودە بەشی دەکەن، لەوکاتەدا یەکێک دێ دەڵێ: دەجال لە شارەکەتاندا سەری هەڵداوە، ئاگاداربن ئەوکەسە درۆ دەکات، ئەوەی بڕوای پێبکات پەشی مانە (چونکە هەواڵکە درۆیە)، ئەوەشی بە هەندی وەرنەگرێ پەشیمانە (چونکە زۆری پێناچێ دەجال دێت).

٤٠٩٥- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَكُونُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ بَنِي الْأَصْفَرِ هُدْنَةٌ، فَيَغْدِرُونَ بِكُمْ، فَيَسِيرُونَ إِلَيْكُمْ فِي ثَمَانِينَ غَايَةً، تَحْتَ كُلِّ غَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا»[2].

واتە: عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەنێوان ئێوەو ڕۆمەکاندا ئاگربەست و ئاشتی دەبەسترێت، ئنجا ئەوان پەیمان دەشکێنن و لەژێر هەشتا ئاڵاو دەستەوە بۆتان دێن کە لەژێر هەر ئاڵایەک دوازدە هەزار کەس هەیە.

---

(١) موضوع.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٧٦، وأبو داود: ٥٠٠٠.

## بابەت: تورک

٤٠٩٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا، نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ، وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا صِغَارَ الْأَعْيُنِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: قیامەت بەرپا نابێ تاوەکو مسوڵمانان جەنگ لەگەڵ قەومێک نەکەن کە نەعل و پێڵاوەکانیان لە موو دروستکراوە، وە قیامەت بەرپا نابێ تاوەکو مسوڵمانان جەنگ لەگەڵ قەومێک نەکەن کە چاویان گچکەیە.

٤٠٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا صِغَارَ الْأَعْيُنِ، ذُلْفَ الْأُنُوفِ، كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ، وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قیامەت بەرپا نابێ تاوەکو مسوڵمانان جەنگ لەگەڵ قەومێکدا نەکەن کە چاوەکانیان بچوکەو لوتەکانیان بچوک و وردیلەیە بەجۆرێک دەڵێی دەم و دەچاویان قەڵغانەو بە سیرمەی زۆر دەورە گیراوە، وە قیامەت بەرپا نابێ تاوەکو جەنگ لەگەڵ قەومێک نەکەن کە نەعلەکانیان لە موو دروستکراوە.

٤٠٩٨- عَنْ عَمْرِو بْنِ تَغْلِبَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ تُقَاتِلُوا قَوْمًا عِرَاضَ الْوُجُوهِ، كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ، وَإِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ تُقَاتِلُوا قَوْمًا يَنْتَعِلُونَ الشَّعَرَ»[٣].

واتە: عەمری کوڕی تەغلیب ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە مسوڵمانان جەنگ لەگەڵ قەومێکدا دەکەن کە ڕوخساریان بەرینە، بەجۆرێک دەڵێی دەم و چاویان قەڵغانەو بە سیرمەی زۆر

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٢٩، ومسلم: ٢٩١٢، وأبو داود: ٤٣٠٤، والترمذي: ٢٢١٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٢٩، ومسلم: ٢٩١٢، وأبو داود: ٤٣٠٤، والترمذي: ٢٢١٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٢٧.




دەورەگیراوە، وە بەڕاستی لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە مسوڵمانان جەنگ لەگەڵ قەومێکدا دەکەن کە موو دەکەنە نەعلەو لەپێی دەکەن.

**٤٠٩٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا صِغَارَ الْأَعْيُنِ، عِرَاضَ الْوُجُوهِ، كَأَنَّ أَعْيُنَهُمْ حَدَقُ الْجَرَادِ، كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ، يَنْتَعِلُونَ الشَّعَرَ، وَيَتَّخِذُونَ الدَّرَقَ، يَرْبُطُونَ خَيْلَهُمْ بِالنَّخْلِ»[1].**

**واتە:** ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی دوایی بەرپا نابێ تاوەکو مسوڵمانان جەنگ لەگەڵ قەومێک نەکەن کە چاویان بچووکەو ڕوخساریان بەرینەو پێچی چاوەکانیان وەکو پێچی چاوی کوللە وایە، ڕوخساریان وەکو ئەوە وایە کە قەڵغانێک بێ و بە سیرمەی زۆر دەورە گیرابێ، موو لە پێ دەکەن و وەکو نەعل بەکاری دێنن، وە مەتاڵەو قەڵغانی لە چەرم دروستکراو بەکاردێنن و ئاژەڵەکانیان بە دارخورماوە دەبەستنەوە.

* * *

---

(١) صحيح.

## بابەت: بە کەم زانینی دونیا

٤١٠٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ الْغِفَارِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ الزَّهَادَةُ فِي الدُّنْيَا بِتَحْرِيمِ الْحَلَالِ، وَلَا فِي إِضَاعَةِ الْمَالِ، وَلَكِنِ الزَّهَادَةُ فِي الدُّنْيَا أَنْ لَا تَكُونَ بِمَا فِي يَدَيْكَ أَوْثَقَ مِنْكَ بِمَا فِي يَدِ اللَّهِ، وَأَنْ تَكُونَ فِي ثَوَابِ الْمُصِيبَةِ، إِذَا أُصِبْتَ بِهَا، أَرْغَبَ مِنْكَ فِيهَا، لَوْ أَنَّهَا أُبْقِيَتْ لَكَ» قَالَ هِشَامٌ: كَانَ أَبُو إِدْرِيسَ الْخَوْلَانِيُّ، يَقُولُ: مِثْلُ هَذَا الْحَدِيثِ فِي الْأَحَادِيثِ، كَمِثْلِ الْإِبْرِيزِ فِي الذَّهَبِ»[1].

واتە: ئەبو زەڕی غیفاریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە کەم زانینی دونیا بریتی نیە لەوەی حەڵاڵ لە خۆت حەرام بکەی وە نە بەوەشە کە ماڵ و سامان بەفیڕۆ بدەی، بەڵکو بە کەم زانینی دونیا بریتیە لەوەی کەوا ئەوەی لەبەردەستی خۆتدایەو حازرو بەردەستە زیاتر جێگای متمانەت نەبێ لەوەی کە لە دەست خوادایە، وە (دونیا بە کەم گرتن) ئەوەیە کە چاوەڕێی پاداشتی بەڵاو کارەساتەکان بکەی کاتێک توشی بەڵاو ناڕەحەتییەک دەبی، وە دڵت پێی خۆشتر بێ لەوەی کە توشت نەبێ (چونکە بەڵاو ناڕەحەتی گوناهو تاوان دەوەرێنێ).

٤١٠١- عَنْ أَبِي خَلَّادٍ ﷺ، وَكَانَتْ، لَهُ صُحْبَةٌ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ قَدْ أُعْطِيَ زُهْدًا فِي الدُّنْيَا، وَقِلَّةَ مَنْطِقٍ، فَاقْتَرِبُوا مِنْهُ، فَإِنَّهُ يُلْقِي الْحِكْمَةَ»[2].

واتە: ئەبو خەللاد ﷺ کە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بووە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێکتان بینی کە لەم دونیایەدا دونیای بە کەم گرتبوو کەم دوێ بوو ئەوە لێی نزیک ببنەوە (گوێی بۆ بگرن)، چونکە خاوەن حیکمەتەو حیکمەت دەگەیەنێ بە کەسانی تر.

٤١٠٢- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا أَنَا عَمِلْتُهُ أَحَبَّنِي اللَّهُ وَأَحَبَّنِي النَّاسُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا فِي أَيْدِي النَّاسِ يُحِبُّكَ النَّاسُ»[3].

---

(١) ضعيف جداً. أخرجه الترمذي: ٢٣٤٠.

(٢) ضعيف.

(٣) حسن لغيره.

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کارو کردەوەیەکم پێ بڵێ کە کاتێک ئەنجاممدا خوا خۆشی بوێم و خەڵکیش خۆشی بوێم، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دونیا بە کەم بگرە ئەوە خوا خۆشی دەوێی، وە ئەو شتەی کە هی خەڵکیشە بە کەمی بزانە (داوایان لێ مەکە) ئەوە خەڵکیش خۆشی دەوێن.

**٤١٠٣- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ سَهْمٍ ﷺ، رَجُلٍ مِنْ قَوْمِهِ، قَالَ: نَزَلْتُ عَلَى أَبِي هَاشِمِ بْنِ عُتْبَةَ، وَهُوَ طَعِينٌ، فَأَتَاهُ مُعَاوِيَةُ يَعُودُهُ، فَبَكَى أَبُو هَاشِمٍ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: مَا يُبْكِيكَ؟ أَيْ خَالِ أَوَجَعٌ يُشْئِزُكَ أَمْ عَلَى الدُّنْيَا، فَقَدْ ذَهَبَ صَفْوُهَا؟ قَالَ: عَلَى كُلٍّ لَا، وَلَكِنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَهِدَ إِلَيَّ عَهْدًا وَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ تَبِعْتُهُ، قَالَ: «إِنَّكَ لَعَلَّكَ تُدْرِكُ أَمْوَالًا تُقْسَمُ بَيْنَ أَقْوَامٍ، وَإِنَّمَا يَكْفِيكَ مِنْ ذَلِكَ خَادِمٌ وَمَرْكَبٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»، فَأَدْرَكْتُ، فَجَمَعْتُ**[1].

واتە: سەمورەی کوڕی سەهمە ﷺ دەڵێ: چوومە لای ئەبو هاشیمی کوڕی عوتبە کە پێکرابوو، جا موعاوییەش هات سەردانی کرد، جا ئەبو هاشیم گریا، موعاوییەش گوتی: بۆ دەگریەی، ئەی خاڵە ئازارەکەت ناڕەحەتی کردووی یان بۆ دونیا دەگری کە بێگومان خۆشییەکانی ڕۆشتوون؟ گوتی: لەو دووانە بۆ هیچیان ناگریم، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتێکی لێ کردم پێمخۆش بوو جێبەجێم کردبا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ لەوانەیە بە ماڵ و سامانێک بگەی کە لەنێوان خەڵکی دابەش دەکرێ، جا بێگومان تۆ لەو ماڵ و سامانە خزمەتکارێک و وڵاخێکی سواریت بەسە لەپێناو خوا بەکاری بێنی، منیش پێی گەیشتم و کۆمکردەوە.

**٤١٠٤- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: اشْتَكَى سَلْمَانُ فَعَادَهُ سَعْدٌ، فَرَآهُ يَبْكِي، فَقَالَ لَهُ سَعْدٌ: مَا يُبْكِيكَ يَا أَخِي؟ أَلَيْسَ قَدْ صَحِبْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَلَيْسَ؟ أَلَيْسَ؟ قَالَ سَلْمَانُ: مَا أَبْكِي وَاحِدَةً مِنَ اثْنَتَيْنِ، مَا أَبْكِي حُبًّا لِلدُّنْيَا، وَلَا كَرَاهِيَةً لِلْآخِرَةِ، وَلَكِنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَهِدَ إِلَيَّ عَهْدًا، فَمَا أُرَانِي إِلَّا قَدْ تَعَدَّيْتُ، قَالَ: وَمَا عَهِدَ إِلَيْكَ؟ قَالَ: عَهِدَ إِلَيَّ: «أَنَّهُ يَكْفِي أَحَدَكُمْ مِثْلُ زَادِ الرَّاكِبِ، وَلَا أُرَانِي إِلَّا قَدْ تَعَدَّيْتُ، وَأَمَّا أَنْتَ يَا سَعْدُ فَاتَّقِ اللَّهَ عِنْدَ حُكْمِكَ إِذَا حَكَمْتَ، وَعِنْدَ قَسْمِكَ إِذَا قَسَمْتَ، وَعِنْدَ هَمِّكَ إِذَا هَمَمْتَ» قَالَ ثَابِتٌ: «فَبَلَغَنِي أَنَّهُ مَا تَرَكَ إِلَّا بِضْعَةً وَعِشْرِينَ دِرْهَمًا، مِنْ نُفَيْقَةٍ كَانَتْ عِنْدَهُ»**[2].

---

(١) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٣٢٧، والنسائي: ٥٣٧٢.

(٢) صحيح.

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: سەلمان نەخۆش کەوت، جا سەعد سەردانی کردو بینی کە دەگریێت، بۆیە سەعد پێی گوت: بۆچی دەگری؟ براکەم مەگەر هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوات ﷺ نەکردوە، ئایا ئەمەو ئەوەت نەکردووە؟ سەلمان گوتی: بۆ ئەوانە ناگریەم، بۆ دونیا بە پەرۆش نیم و ڕقم لە قیامەتیش نیە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتێکی بۆ کردم، وا دەبینم زیادەڕەویم تێدا کردوە، سەعد گوتی: چ پەیمانێکی پێداوی؟ گوتی: وەسیەتی لێکردم کە هەر یەکێک لە ئێوە توێشووی بە ئەندازەی توێشووی سوارێک بەسیەتی، بەڵام وا نابینم ئیللا سنورم بەزاندووە، بەڵام ئەتۆ ئەی سەعد لە خوا بترسە کاتێک بڕیارێک دەدەیت، وە کاتێک شتێک دابەش دەکەیت، وە کاتێک هەم و غەم و گرنگیدانێک هەیە. سابیت گوتی: پێیان ڕاگەیاندم کە کاتێک وەفاتی کرد تەنها بیست و خوردەیەک درهەمی هەبوو وەکو بژێوی ژیان لەلای بوو.

## بابەت: گرنگیدان بە دونیا

٤١٠٥- عَنْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ مِنْ عِنْدِ مَرْوَانَ بِنِصْفِ النَّهَارِ، قُلْتُ: مَا بَعَثَ إِلَيْهِ هَذِهِ السَّاعَةَ إِلَّا لِشَيْءٍ يَسْأَلُ عَنْهُ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: سَأَلَنَا عَنْ أَشْيَاءَ سَمِعْنَاهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ كَانَتِ الدُّنْيَا هَمَّهُ، فَرَّقَ اللَّهُ عَلَيْهِ أَمْرَهُ، وَجَعَلَ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، وَلَمْ يَأْتِهِ مِنَ الدُّنْيَا إِلَّا مَا كُتِبَ لَهُ، وَمَنْ كَانَتِ الْآخِرَةُ نِيَّتَهُ، جَمَعَ اللَّهُ لَهُ أَمْرَهُ، وَجَعَلَ غِنَاهُ فِي قَلْبِهِ، وَأَتَتْهُ الدُّنْيَا وَهِيَ رَاغِمَةٌ»[1].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبانی کوڕی عوسمانی کوڕی عەففان لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە نیوەڕۆدا زەیدی کوڕی سابیت لەلای مەڕوان ڕۆشت، گوتم: بێگومان بەوکاتە کارێکی پێی بووە بۆیە ناردوویەتی بەدوایدا، منیش پرسیارم لێکرد، گوتی: مەڕوان لەو شتانەی کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستومانە پرسیاری لێ کردین، گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێک تەنها گرنگی بە دونیا بدات ئەوە خوا کاروباری لێ پەرش و بڵاو دەکات، وە هەژاری و نەبوونی دونیا دەخاتە نێوان چاوەکانییەوە، وە لە دونیادا تەنها ئەو شتەش بەدەست دێنێ کە بۆی دیاری کراوە، وە هەر کەسێک بە نیەتی ڕۆژی دوایی کار بکات، ئەوە خوا کاروباری بۆ

---

(١) صحيح.

ڕێک دەخات، وە دەوڵەمەندی دەخاتە دڵیەوە، وە دونیاش بە ملکەچیەوە بەدوای دەکەویٚ ئەگەر (دونیا) پێشی ناخۆش بێت.

**٤١٠٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: سَمِعْتُ نَبِيَّكُمْ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ جَعَلَ الْهُمُومَ هَمًّا وَاحِدًا، هَمَّ الْمَعَادِ، كَفَاهُ اللَّهُ هَمَّ دُنْيَاهُ، وَمَنْ تَشَعَّبَتْ بِهِ الْهُمُومُ فِي أَحْوَالِ الدُّنْيَا، لَمْ يُبَالِ اللَّهُ فِي أَيِّ أَوْدِيَتِهِ هَلَكَ»[١].

**واتە:** عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرەکەتانم ﷺ بیستووە دەیفەرموو: هەر کەسێک خەم و نگەرانیەکانی کۆبکاتەوەو تەنها یەک خەمی هەبێ ئەویش خەمی ڕۆژی دوایی بێت، ئەوە خوا لە دونیاش بێنیازی دەکات، وە هەر کەسێک خەمەکانی بڵاوبکاتەوە بەدوای کاروباری دونیاییەوە، ئەوە خوا بەلایەوە گرنگ نیە ئاخۆ ئەو کەسە لە چ شیوێکدا لەناو دەچێت.

**٤١٠٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: وَلَا أَعْلَمُهُ إِلَّا وَقَدْ رَفَعَهُ، قَالَ يَقُولُ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: «يَا ابْنَ آدَمَ تَفَرَّغْ لِعِبَادَتِي، أَمْلَأْ صَدْرَكَ غِنًى، وَأَسُدَّ فَقْرَكَ، وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ، مَلَأْتُ صَدْرَكَ شُغْلًا، وَلَمْ أَسُدَّ فَقْرَكَ»[٢].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: (ڕاوی گوتی:) وا نازانم مەگەر ئەو فەرموودەیەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای پاک و بێگەرد دەفەرمووێت: ئەی نەوەی ئادەم خۆت بۆ پەرستنی من یەکلابکەوە منیش دڵت پڕدەکەم لە دەوڵەمەندی و بێنیازی، وە بەری هەژاریشت بۆ دەگرم، خۆ ئەگەر ئەوە نەکەی ئەوە دڵت پڕ دەکەم لە جەنجاڵی و دەرگای هەژاریشت بەڕوودا داناخەم.

## بابەت: نموونەی دونیا

**٤١٠٨-** عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ الْمُسْتَوْرِدَ، أَخَا بَنِي فِهْرٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَا مَثَلُ الدُّنْيَا فِي الْآخِرَةِ، إِلَّا مَثَلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ إِصْبَعَهُ فِي الْيَمِّ، فَلْيَنْظُرْ بِمَ يَرْجِعُ»[٣].

---

(١) حسن لغيره.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٤٦٦.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٥٨، والترمذي: ٢٣٢٣.

واتە: قەیسی کوڕی ئەبو حازیم دەڵێ: گوێم لە موستەوریدی برای نەوەکانی فیهر ﷺ بوو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی نمونەی دونیا لەچاو قیامەت وەکو یەکێک لە ئێوە وایە کە پەنجەی بخاتە ناو دەریاو بیهێنێتە دەرەوە، جا با تەماشای بکات پەنجەی چەندەی لەو دەریایە لەگەڵ خۆی هێناوە.

**٤١٠٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: اضْطَجَعَ النَّبِيُّ ﷺ، عَلَى حَصِيرٍ فَأَثَّرَ فِي جِلْدِهِ، فَقُلْتُ: بِأَبِي وَأُمِّي، يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ كُنْتَ آذَنْتَنَا فَفَرَشْنَا لَكَ عَلَيْهِ شَيْئًا يَقِيكَ مِنْهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَنَا وَالدُّنْيَا إِنَّمَا أَنَا وَالدُّنْيَا كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ، ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا»[1].**

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسەر حەسیرێک پاڵی دابۆوە، جا شوێنەواری حەسیرەکە بە جەستەیەوە دیار بوو، بۆیە گوتم: بە دایک و باوکەوە بەفیدات بین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئاگادارت بکردینایە کە شتێکمان لەسەر حەسیرەکە ڕابخستایە تاکو جەستەی بپاراستبایە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەگەر دونیا بەلای منەوە چییە؟ بێگومان من و دونیا وەکو سوارێک و سێبەری دارێک واین کە سوارەکە لەژێر سێبەرەکەی پشوویەک دەدات و دەحەسێتەوەو پاشان دەڕواو بەجێی دێڵێت.

**٤١١٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، فَإِذَا هُوَ بِشَاةٍ مَيِّتَةٍ شَائِلَةٍ بِرِجْلِهَا، فَقَالَ: «أَتُرَوْنَ هَذِهِ هَيِّنَةً عَلَى صَاحِبِهَا؟ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَلدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ عَلَى صَاحِبِهَا، وَلَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا قَطْرَةً أَبَدًا»[2].**

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: لە «ذو الحليفة»ـدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، لەناکاو مەڕێکی مردارەوەبووی بینی هەڵاوسا بوو قاچی بەرز ببونەوەو مردارببوو، جا فەرمووی: ئایا دەزانن ئەوە (مەڕەکە) چەند بێنرخە لەلای خاوەنەکەی؟ دەی بێگومان سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە دونیا لەلای خوا لەو مەڕە بێنرخترە لەلایەن خاوەنەکەی، خۆ ئەگەر دونیا تەنها بە ئەندازەی باڵی مێشوولەیەک سەنگ و نرخی هەبوایە لە لای خوا، ئەوە خوا هەرگیز دڵۆپە ئاوێکی نەدەدایە هیچ کافرێک.

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٣٧٧.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٣٢٠.

**٤١١١- عَنْ الْمُسْتَوْرِدُ بْنُ شَدَّادٍ، قَالَ: إِنِّي لَفِي الرَّكْبِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِذْ أَتَى عَلَى سَخْلَةٍ مَنْبُوذَةٍ، قَالَ: فَقَالَ: «أَتُرَوْنَ هَذِهِ هَانَتْ عَلَى أَهْلِهَا» قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مِنْ هَوَانِهَا، أَلْقَوْهَا، أَوْ كَمَا قَالَ: قَالَ: «فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَلدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ عَلَى أَهْلِهَا»(١).**

واتە: موستەوریدی کوڕی شەدداد ﷺ دەڵێ: لە ڕاستیدا لەگەڵ کاروانێک لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم، کاتێک کە بەلای بێچووە بزنێکی فڕێدراودا ڕۆشتین، گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا دەزانن ئەوە (بێچووە فڕێدراوە) سوک و بێنرخە لەلای خاوەنەکەی؟ گوتی: بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر بێنرخی فڕێیانداوە، یان وەکو ئەوەی کە گوتی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەی بێگومان سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە دونیا لەلای خواترە بێنرخترە لەو بێچووە فڕێدراوە لەلایەن خاوەنەکەی.

**٤١١٢- عَنْ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ يَقُولُ: «الدُّنْيَا مَلْعُونَةٌ، مَلْعُونٌ مَا فِيهَا، إِلَّا ذِكْرَ اللَّهِ، وَمَا وَالَاهُ، أَوْ عَالِمًا، أَوْ مُتَعَلِّمًا»(٢).**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دەیفەرموو: دونیا لەعنەت لێکراوە (لەلایەن خواوە) وە ئەوەشی کە تێیدایە لەعنەت لێکراوە، تەنها یادی خوا نەبێ لەگەڵ ئەو شتەی کە لەلای خوا خۆشەویستە، یان زانا یان ئەو کەسەی کە بەدوای زانستەوەیە.

**سەرنج:** مەبەست لە دونیا لێرەدا هەر شتێکە کە مرۆڤ سەرقاڵ بکات لە زیکری خواو دووری بخاتەوە لێی.

**٤١١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ، وَجَنَّةُ الْكَافِرِ»(٣).**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دونیا زیندانی بڕوادارانە و بەهەشتی کافرانە.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٣٢١.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٣٢٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٥٦، والترمذي: ٢٣٢٤.

٤١١٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بِبَعْضِ جَسَدِي، فَقَالَ: «يَا عَبْدَ اللَّهِ كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ، أَوْ كَأَنَّكَ عَابِرُ سَبِيلٍ، وَعُدَّ نَفْسَكَ مِنْ أَهْلِ الْقُبُورِ»[١].

واته: ئیبنو عومەر  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لاشەی گرتم و فەرمووی: ئەی عەبدوڵڵا لە دونیادا وا حیساب بکە کە غەریبەیەکی، یان ڕێبوارو ڕێڕەوییەکی، وە خۆت وەکو خەڵکی ناو گۆڕەکان ئەژمار بکەو ئامادەباشی بۆ بکە.

## بابەت: ئەو کەسانەی کە لەناو خەڵکدا ئاوڕیان لێ نادرێتەوە

٤١١٥- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا أُخْبِرُكَ عَنْ مُلُوكِ الْجَنَّةِ؟» قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: «رَجُلٌ ضَعِيفٌ، مُسْتَضْعِفٌ ذُو طِمْرَيْنِ، لَا يُؤْبَهُ لَهُ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ»[٢].

واته: موعازی کوڕی جەبەل  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەواڵی پاشاکانی بەهەشتت پێ نەدەم؟ گوتم: بەڵێ هەواڵم پێبدە، فەرمووی: پیاوێکی لاواز کە خۆشی لاواز دەکات (و تاقەتی خۆی بە پەرستشی خوا سەرف دەکات) کە خاوەنی دوو پارچە پۆشاکی شڕو کۆنەو کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە، خۆ ئەگەر خوا کارێکی بۆ بکات ئەوە خوا سوێندەکەی ناشکێنێ و بۆی جێبەجێ دەکات.

٤١١٦- عَنْ مَعْبَدِ بْنِ خَالِدٍ ، قَالَ: سَمِعْتُ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ؟ كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَعِّفٍ، أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ؟ كُلُّ عُتُلٍّ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ»[٣].

واته: مەعبەدی کوڕی خالید  دەڵێ: گوێم لە حاریسەی کوڕی وەهەب  بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەواڵی ئەوانەتان پێ نەدەم کە ئەهلی بەهەشتن؟ هەموو ئەوانەی لاوازن زیاتر پشت لە دونیا دەکەن و خۆیان بۆ قیامەت ئەزیەت دەدەن و لاواز کراون، ئایا هەواڵی ئەهلی ئاگرتان پێ نەدەم؟ هەموو ئەوانەی کە لەگەڵ خەڵکدا توندن و مافیان دەخۆن و مافی خەڵک نادەن و خۆ بەزۆرزان و لووت بەرزن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤١٦، والترمذي: ٢٣٣٣.

(٢) حسن لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩١٨، ومسلم: ٢٨٥٣، وأبو داود: ٤٨٠١ بنحوه، والترمذي: ٢٦٠٥.

**٤١١٧- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ أَغْبَطَ النَّاسِ عِنْدِي مُؤْمِنٌ خَفِيفُ الْحَاذِ، ذُو حَظٍّ مِنْ صَلَاةٍ، غَامِضٌ فِي النَّاسِ، لَا يُؤْبَهُ لَهُ، كَانَ رِزْقُهُ كَفَافًا، وَصَبَرَ عَلَيْهِ، عَجِلَتْ مَنِيَّتُهُ، وَقَلَّ تُرَاثُهُ، وَقَلَّتْ بَوَاكِيهِ»[1].**

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەختەوەرترین خەڵکی لەلای من، بڕوادارێکە کە باری سەرشانی سوک بێ و ئەرکی زۆر نەبێت، وە بەشی زۆری هەبێ لە نوێژکردن و لەناو خەڵکدا دیار نەبێ و ئاوڕی لێوە نەدەنەوە، ڕزق و ڕۆزییەکەی بە ئەندازەی ژیانی بێ و مەمرە بژی ژیان بباتە سەرو خۆڕاگرو ئارامگربێ لەسەری، لەپڕ کە بمرێ و میراتی کەم بێ و خەڵکی کەم نەبێ بۆی نەگریەن.

**٤١١٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أُمَامَةَ الْحَارِثِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْبَذَاذَةُ مِنَ الْإِيمَانِ»، قَالَ: الْبَذَاذَةُ الْقَشَافَةُ، يَعْنِي التَّقَشُّفَ[2].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومامەی حاریسیی لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خاکییەتی و سادەیی لە بڕواوەیە. ڕاوی گوتی: «البذاذة» واتە: کەم خەرجی و وازهێنان لە جوانی و ڕازاندنەوە دنیاییەکان (وەکو: جل و پۆشاک بە نمونە).

**٤١١٩- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ ﷺ، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِخِيَارِكُمْ؟»، قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «خِيَارُكُمُ الَّذِينَ إِذَا رُءُوا، ذُكِرَ اللَّهُ ﷻ»[3].**

واتە: ئەسمائی کچی یەزید ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئایا هەواڵی باشترینی خۆتان پێ نەدەم؟ گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان بفەرموو، فەرمووی: باشترینی ئێوە ئەو کەسانەن کە کاتێک دەبینرێن یادو زیکری خوا ﷻ بکرێ (بە بینینیان).

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٣٤٧.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤١٦١.

(٣) حسن بشواهده.

## بابەت: گەورەیی و بەرزی پلەی هەژاران

٤١٢٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: مَرَّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا تَقُولُونَ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟» قَالُوا: رَأْيَكَ فِي هَذَا، نَقُولُ: هَذَا مِنْ أَشْرَافِ النَّاسِ، هَذَا حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ، أَنْ يُخَطَّبَ، وَإِنْ شَفَعَ، أَنْ يُشَفَّعَ، وَإِنْ قَالَ، أَنْ يُسْمَعَ لِقَوْلِهِ، فَسَكَتَ النَّبِيُّ ﷺ، وَمَرَّ رَجُلٌ آخَرُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا تَقُولُونَ فِي هَذَا؟»، قَالُوا: نَقُولُ، وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا مِنْ فُقَرَاءِ الْمُسْلِمِينَ، هَذَا حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ، لَمْ يُنْكَحْ، وَإِنْ شَفَعَ، لَا يُشَفَّعْ، وَإِنْ قَالَ، لَا يُسْمَعْ لِقَوْلِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَهَذَا خَيْرٌ مِنْ مِلْءِ الْأَرْضِ مِثْلَ هَذَا»[1].

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: پیاوێک بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕەتبوو (دەوڵەمەندو پۆشتە بوو)، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەربارەی ئەو پیاوە چی دەڵێن و چۆنی دەناسێنن؟ گوتیان: ڕا هەر ڕای جەنابتە، ئێمە دەڵێین: لە بەڕێزترینی خەڵکییە، ئەو پیاوە شایەنی ئەوەیە کە ئەگەر داوای ژن بکات پێی بدەن و ئەگەر تکای کرد تکای وەربگیرێت، وە ئەگەر قسەی کرد گوێی بۆ بگرێت، ئنجا پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو پیاوێکی دیکە (کە ئەوەیان هەژار بوو) ڕابوورد، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی دەربارەی ئەوەیان چی دەڵێن؟ گوتیان: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێین: ئەوەیان لە هەژارەکانی مسوڵمانانە، جا ئەوە شایەنی ئەوەیە کە ئەگەر داوای ژن بکات پێی نەدرێت، وە ئەگەر تکای کرد تکای وەرنەگیرێت، وە ئەگەر قسەی کرد گوێی بۆ نەگیرێت، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەی بێگومان ئەوەیان بە ئەندازەی پڕی زەوی لەوەی دیکەیان باشترە.

٤١٢١- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ عَبْدَهُ الْمُؤْمِنَ، الْفَقِيرَ، الْمُتَعَفِّفَ، أَبَا الْعِيَالِ»[2].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕاستیدا خوا ئەو بەندانەی خۆشدەوێ کە بڕواداران و هەژارو خۆپارێزن لە حەرام دەست لە کەس پان ناکەنەوەو داوا ناکەن و خاوەنی ماڵ و مناڵن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٩١ و ٦٤٤٧.

(٢) ضعيف.

## بابەت: پلەو پایەی هەژاران

٤١٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَدْخُلُ فُقَرَاءُ الْمُؤْمِنِينَ الْجَنَّةَ قَبْلَ الْأَغْنِيَاءِ بِنِصْفِ يَوْمٍ، خَمْسِمِائَةِ عَامٍ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەژارانی بڕواداران نیو ڕۆژ (کە دەکاتە) پێنج سەد ساڵی (دونیا) پێش دەوڵەمەندەکان دەچنە ناو بەهەشت.

٤١٢٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ، بِمِقْدَارِ خَمْسِمِائَةِ سَنَةٍ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەژارانی کۆچبەران بە ئەندازەی پێنج سەد ساڵ پێش دەوڵەمەندەکانیان دەچنە بەهەشتەوە.

٤١٢٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: اشْتَكَى فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ عَلَيْهِمْ أَغْنِيَاءَهُمْ، فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ الْفُقَرَاءِ أَلَا أُبَشِّرُكُمْ أَنَّ فُقَرَاءَ الْمُؤْمِنِينَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِنِصْفِ يَوْمٍ، خَمْسِمِائَةِ عَامٍ»، ثُمَّ تَلَا مُوسَى هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾﴾ الحج[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: هەژارە کۆچەرەکان سکاڵایان لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ کرد بەرابەر گەورەیی پلەی دەوڵەمەندەکان بەسەریانەوە، ئەویش فەرمووی: ئەی کۆمەڵی هەژاران ئاگاداربن و مژدەتان پێدەدەم کە هەژارانی بڕواداران بە نیو ڕۆژ کە دەکاتە پێنج سەد ساڵی دونیا لەپێش دەوڵەمەندەکانیان دەچنە بەهەشت، پاشان موسا (ڕاوی فەرموودەکە) ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾﴾ الحج، واتە: وە بێگومان ڕۆژێک لای پەروەردگارت وەک هەزار ساڵ وایە لەو ساڵانەی ئێوە دەیژمێرن.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٦٦٦، والترمذي: ٢٣٥١.

(٣) صحيح لغيره.

## بابەت: كۆڕو دانیشتن لەگەڵ هەژاران

٤١٢٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «كَانَ جَعْفَرُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ يُحِبُّ الْمَسَاكِينَ، وَيَجْلِسُ إِلَيْهِمْ، وَيُحَدِّثُهُمْ، وَيُحَدِّثُونَهُ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَكْنِيهِ أَبَا الْمَسَاكِينِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: جەعفەری كوڕی ئەبو تاڵیب خەڵكی هەژاری خۆشدەویست و لەگەڵیان دادەنیشت و قسەی لەگەڵ دەكردن و قسەیان لەگەڵ دەكرد، وە پێغەمبەری خوا ﷺ نازناوی ئەبولمەساكینی (باوكی هەژارانی) پێدابوو.

٤١٢٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: أَحِبُّوا الْمَسَاكِينَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ فِي دُعَائِهِ: «اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مِسْكِينًا، وَأَمِتْنِي مِسْكِينًا، وَاحْشُرْنِي فِي زُمْرَةِ الْمَسَاكِينِ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: هەژارانتان خۆشبوێن چونكە بەڕاستی من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە دوعاكانیدا دەیفەرموو: خوایە وەكو ژیانی هەژارەكان بمژیێنەو بە مردنی هەژارەكان بممرێنە، وە لەگەڵ گروهی هەژارەكان حەشرم بكە.

٤١٢٧- عَنْ خَبَّابٍ ﷺ، فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ ﴾ وَالْعَشِيِّ إِلَى قَوْلِهِ ﴿ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾ الأنعام، قَالَ: جَاءَ الْأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ التَّمِيمِيُّ، وَعُيَيْنَةُ بْنُ حِصْنٍ الْفَزَارِيُّ، فَوَجَدَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَعَ صُهَيْبٍ، وَبِلَالٍ، وَعَمَّارٍ، وَخَبَّابٍ، قَاعِدًا فِي نَاسٍ مِنَ الضُّعَفَاءِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، فَلَمَّا رَأَوْهُمْ حَوْلَ النَّبِيِّ ﷺ حَقَرُوهُمْ، فَأَتَوْهُ فَخَلَوْا بِهِ، وَقَالُوا: إِنَّا نُرِيدُ أَنْ تَجْعَلَ لَنَا مِنْكَ مَجْلِسًا، تَعْرِفُ لَنَا بِهِ الْعَرَبُ فَضْلَنَا، فَإِنَّ وُفُودَ الْعَرَبِ تَأْتِيكَ فَنَسْتَحْيِي أَنْ تَرَانَا الْعَرَبُ مَعَ هَذِهِ الْأَعْبُدِ، فَإِذَا نَحْنُ جِئْنَاكَ، فَأَقِمْهُمْ عَنْكَ، فَإِذَا نَحْنُ فَرَغْنَا، فَاقْعُدْ مَعَهُمْ إِنْ شِئْتَ، قَالَ: «نَعَمْ»، قَالُوا: فَاكْتُبْ لَنَا عَلَيْكَ كِتَابًا، قَالَ: فَدَعَا بِصَحِيفَةٍ، وَدَعَا عَلِيًّا لِيَكْتُبَ، وَنَحْنُ قُعُودٌ فِي نَاحِيَةٍ، فَنَزَلَ جِبْرَائِيلُ ﷺ، فَقَالَ: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾ الأنعام، ثُمَّ ذَكَرَ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ، وَعُيَيْنَةَ بْنَ حِصْنٍ، فَقَالَ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَـٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ

---

(١) ضعيف جداً. أخرجه الترمذي: ٣٧٦٦ مطولًا. وانظر البخاري: ٣٧٠٨ و ٥٤٣٢.

(٢) صحيح لغيره.



بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأنعام، ثُمَّ قَالَ: ﴿ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأنعام، قَالَ: فَدَنَوْنَا مِنْهُ حَتَّى وَضَعْنَا رُكَبَنَا عَلَى رُكْبَتِهِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَجْلِسُ مَعَنَا، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ، قَامَ وَتَرَكَنَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ ﴿٢٨﴾ ﴾ الكهف، وَلَا تُجَالِسِ الْأَشْرَافَ: ﴿ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا ﴿٢٨﴾ ﴾ الكهف، يَعْنِي عُيَيْنَةَ، وَالْأَقْرَعَ ﴿ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الكهف، قَالَ: هَلَاكًا، قَالَ: أَمْرُ عُيَيْنَةَ، وَالْأَقْرَعِ، ثُمَّ ضَرَبَ لَهُمْ مَثَلَ الرَّجُلَيْنِ وَمَثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا قَالَ خَبَّابٌ: «فَكُنَّا نَقْعُدُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَإِذَا بَلَغْنَا السَّاعَةَ الَّتِي يَقُومُ فِيهَا، قُمْنَا وَتَرَكْنَاهُ حَتَّى يَقُومَ»[1].

واتە: خەبباب ﷺ دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ ﴿٥٢﴾ ﴾ الأنعام، واتە: وە ئەوانە دەرنەکەیت کە پەروەردگاریان دەپەرستن (و داوای لێدەکەن) بە بەیانیان، تا دەگاتە: ﴿ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾ الأنعام، واتە: ئەوە لەستەمکاران دەبیت. گوتوویەتی: ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی و عویەینەی کوڕی حیصنی فەزاری هاتن، جا دیتیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ صوهەیب و بیلال و عەممارو خەببابە، لەگەڵ کۆمەڵێک لە هەژارو نەبووەکانی بڕواداران دانیشتووە، جا کاتێک ئەوانەیان لەدەوری پێغەمبەر ﷺ بینی پێیان کەمی بوو بەکەم تەماشایان کردن، جا ئەوان هاتن و گوتیان: ڕاستی ئێمە دەمانهەوێ کۆڕو مەجلیسمان تایبەت بێت، کە عەرەب بەو مەجلیسەوە پلەو پایەمان بەرز بزانن، چونکە وەفدەکانی عەرەب کاتێک سەردانت دەکەن شەرم دەکەین کە عەرەب لەناو ئەو بەندەو کۆیلانەمان ببینێت، جا کاتێک ئێمە هاتین ئەوان لەلای خۆت هەستێنە بڕۆن، جا کە ئێمە لێبووینەوە ئەوە ئەگەر حەزت کرد لەگەڵیان دابنیشە، فەرمووی: بەڵێ باش، گوتیان: کەواتە با نوسراوێکمان لەسەر ئەوە هەبێت، ڕاوی گوتی: پێغەمبەر ﷺ داوای پەڕەیەکی کردو بانگی عەلی کرد کە بینوسێت، لەوکاتەدا ئێمە بۆخۆمان لە گۆشەیەک دانیشتبووین، ئنجا جیبریل ﷺ دابەزی و فەرمووی: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾ الأنعام، واتە: وە ئەوانە دەرنەکەیت کە پەروەردگاریان

---

(١) حسن.

دەپەرستن (و داوای لێدەکەن) بە بەیانیان و ئێوارانداا (ڕەزامەندی) خوایان دەوێ و لێپرسینەوەی هیچ شتێکیان لەسەر تۆ نیە وە لێپرسینەوەی هیچ شتێکی تۆش لەسەر ئەوان نیە جا ئەگەر دەریانکەیت (دور یان خەیتەوە) ئەوە لەستەمکاران دەبیت. پاشان باسی ئەقرەعی کوڕی حابیس و عویەینەی کوڕی حیصنی کردو فەرمووی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾ الأنعام، واتە: وە بەوجۆرە هەندێکیانمان بە هەندێکی تریان تاقی کردەوە بۆ ئەوەی بڵێن ئایا ئەوانە خوا ڕێزو بەهرەی پێ بە خشیوون لەناو ئێمەدا؟ ئایا خوا لە هەموو کەس زاناتر نیە بەوانەی شوکرانە بژێرن؟ پاشان فەرمووی: ﴿ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأنعام، واتە: وە کاتێک ئەوانەی کە بڕوایان هەیە بە ئایەتەکانی ئێمە هاتن بۆ لات ئەوە پێیان بڵێ سڵاوتان لێ بێ پەروەردگارتان بەزەیی و میهرەبانی لەسەر خۆی پێویست کردووە. ڕاوی گوتی: ئێمەش لێی نزیک بووینەوە تاکو چۆکمان خستە سەر چۆکی، وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئێمە دادەنیشت، جا کاتێک ویستبای هەستابایە هەڵدەستاو بەجێی دەهێشتین، ئنجا خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ ﴿٢٨﴾ ﴾ الکهف، واتە: خۆت ڕاگرە لەگەڵ ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو یادی ئەو دەکەن (و دەیپەرستن) بەیانیان و ئێواران کە مەبەستیان ڕەزامەندی خوایە چاوەکانت لەوان لامەدەو وەرمەگێڕە. وە لەگەڵ ئەو کەسانە دامەنیشە کە خۆیان پێ نەجیبزادەترە: ﴿ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا ﴿٢٨﴾ ﴾ الکهف، واتە: جوانی و ڕازاوەیی ژیانی ئەم دونیای دەوێ و بەگوێی کەسێک مەکە کە دڵیان لە یادی خۆمان بێ ئاگا کردوە. (ڕاوی گوتی:) مەبەستی ئایەتەکە عویەینەو ئەقرەع بوو، ﴿ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الکهف، واتە: وە شوێنی هەواو ئارەزووی خۆی کەوتووە هەموو کارەکانی خراپ و لەسنوور دەرچووە. (ڕاوی) گوتی: مەبەستی ئایەتەکە لە فەرمانەکە کارو فەرمانی عویەینەو ئەقرەع بوو، پاشان نمونەی دوو پیاوەکەو نمونەی دونیای بۆ لێکدانەوە، خەبباب گوتی: ئەوجار کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دادەنیشتین هەرکات گەشتباینە ئەو کاتەی کە پێغەمبەر ﷺ تێیدا هەڵدەستا ئێمە هەڵدەستاین و وازمان دێنا تاکو ئەو هەڵبستێت.

٤١٢٨- عَنْ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: «نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِينَا سِتَّةٍ: فِيَّ، وَفِي ابْنِ مَسْعُودٍ، وَصُهَيْبٍ، وَعَمَّارٍ، وَالْمِقْدَادِ، وَبِلَالٍ، قَالَ: قَالَتْ قُرَيْشٌ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّا لَا نَرْضَى أَنْ نَكُونَ أَتْبَاعًا لَهُمْ، فَاطْرُدْهُمْ عَنْكَ، قَالَ: فَدَخَلَ قَلْبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مِنْ ذَلِكَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدْخُلَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ﴿٥٢﴾﴾ الأنعام» الْآيَةَ[1].

واتە: سەعد ﷺ دەڵێ: ئەو ئایەتە لەسەر ئەو شەشەمان دابەزی: من و ئیبنو مەسعودو صوهەیب و عەمارو میقدادو بیلال، گوتی: قورەیش بە پێغەمبەری خوایان ﷺ گوت: ئێمە ڕازی نابین شوێن ئەوانە بکەوین، بۆیە لە دەوری خۆت دووریان بخەوە، جا شتێک کە خوا ویستی لێ بوو ڕۆیشتە ناو دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئنجا خوای ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ﴿٥٢﴾﴾ الأنعام، واتە: وە ئەوانە دەرنەکەیت کە پەروەردگاریان دەپەرستن (و داوای لێدەکەن) بەبەیانیان و ئێواراندا (ڕەزامەندی) خوایان دەوێت.

## بابەت: زۆر کۆکردنەوەی سامان و خۆ خەریک کردن بە دونیاوە

٤١٢٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «وَيْلٌ لِلْمُكْثِرِينَ، إِلَّا مَنْ قَالَ بِالْمَالِ هَكَذَا، وَهَكَذَا، وَهَكَذَا، وَهَكَذَا» أَرْبَعٌ: عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ شِمَالِهِ، وَمِنْ قُدَّامِهِ، وَمِنْ وَرَائِهِ[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وەیل و سزا بۆ ئەو کەسانەی کەوا ماڵ و سامان زۆر وەسەریەک دەنێن مەگەر ئەو کەسانە نەبێ کە بە ماڵ و سامانیان بە هەر چواردەوریان دەبەخشن، لە ڕاستییەوە دەبەخشێ، لە چەپییەوە دەبەخشێ، لە بەردەمییەوە دەبەخشێ، لە دوایەوە دەبەخشێ.

٤١٣٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْأَكْثَرُونَ هُمُ الْأَسْفَلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِلَّا مَنْ قَالَ بِالْمَالِ، هَكَذَا، وَهَكَذَا، وَكَسَبَهُ مِنْ طَيِّبٍ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٤١٣.

(٢) حسن.

(٣) صحيح. انظر البخاري: ٦٤٤٣.

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەروەت و سامان زۆرەکان لە ڕۆژی دواییدا لە خواری خوارەوەن مەگەر ئەوانە نەبێ کە کاری بەخشین بە ماڵەکەیان دەکەن و بە حەڵاڵی بەدەستی دێنن.

٤١٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْأَكْثَرُونَ هُمُ الْأَسْفَلُونَ، إِلَّا مَنْ قَالَ هَكَذَا، وَهَكَذَا، وَهَكَذَا»، ثَلَاثًا[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوانەی ماڵ و سامانی زۆریان کۆکردۆتەوە (لە قیامەتدا) لە پلەی خواری خوارەوەن، تەنها ئەوانە نەبێ کە کاری بەخشینیان پێ کردبێ و بە هەموو لایەکەوە بیانبەخشیبێ، سێ جار ئەوەی فەرموو.

٤١٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «مَا أُحِبُّ أَنَّ أُحُدًا عِنْدِي ذَهَبًا، فَتَأْتِي عَلَيَّ ثَالِثَةٌ وَعِنْدِي مِنْهُ شَيْءٌ، إِلَّا شَيْءٌ أَرْصُدُهُ فِي قَضَاءِ دَيْنٍ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کێوی ئوحود ببێتە زێڕ پێم خۆش نیەو حەزناکەم سێ شەو لەلام بێ و هیچی لێ مابێتەوە، مەگەر ئەوەندە نەبێ کە بیگێڕمەوە تاکو قەرزی (خۆم یان مسوڵمانانی) پێ بدەمەوە.

٤١٣٣- عَنْ عَمْرِو بْنِ غَيْلَانَ الثَّقَفِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ مَنْ آمَنَ بِي وَصَدَّقَنِي، وَعَلِمَ أَنَّ مَا جِئْتُ بِهِ هُوَ الْحَقُّ مِنْ عِنْدِكَ، فَأَقْلِلْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ، وَحَبِّبْ إِلَيْهِ لِقَاءَكَ، وَعَجِّلْ لَهُ الْقَضَاءَ، وَمَنْ لَمْ يُؤْمِنْ بِي، وَلَمْ يُصَدِّقْنِي، وَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ مَا جِئْتُ بِهِ هُوَ الْحَقُّ مِنْ عِنْدِكَ، فَأَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ، وَأَطِلْ عُمُرَهُ»[٣].

واتە: عەمری کوڕی غەیلانی سەقەفیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خودایە هەر کەسێک بڕوای بە من هێناوەو بڕوای هەیە پێم و بە ڕاستی داناوم، وە زانیویەتی کە ئەوەی من هێناومە لەلای تۆ ڕاستەو هەقە، ئەوە ماڵ و سامان و منداڵی کەمی پێ ببەخشە (تاکو توشی بەڵاو ئاژاوە نەبێ بەهۆیانەوە) وە دیداری خۆتی لەلا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٨٩، ومسلم: ٩٩١.

(٣) ضعيف.

خۆشەویست بکەو مردنی نزیک بکە (تاکو بەهۆی تەمەنی درێژەوە توشی بەڵاو کارەسات نەبێت)، وە هەر کەسێک بڕوا بە من ناهێنێ و بەڕاستم دانانێ و نازانێ کە ئەوەی هێناومە ڕاست و هەقەو لەلایەن تۆوەیە، ئەوە ماڵ و منداڵی زۆر بکەو تەمەنی درێژ بکە.

**٤١٣٤- عَنْ نُقَادَةَ الْأَسَدِيِّ ﷺ، قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِلَى رَجُلٍ يَسْتَمْنِحُهُ نَاقَةً، فَرَدَّهُ، ثُمَّ بَعَثَنِي إِلَى رَجُلٍ آخَرَ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ بِنَاقَةٍ، فَلَمَّا أَبْصَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ فِيهَا، وَفِيمَنْ بَعَثَ بِهَا»، قَالَ نُقَادَةُ: فَقُلْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: وَفِيمَنْ جَاءَ بِهَا؟ قَالَ: «وَفِيمَنْ جَاءَ بِهَا»، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَحُلِبَتْ فَدَرَّتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَ فُلَانٍ» لِلْمَانِعِ الْأَوَّلِ «وَاجْعَلْ رِزْقَ فُلَانٍ يَوْمًا بِيَوْمٍ» لِلَّذِي بَعَثَ بِالنَّاقَةِ[١].**

واتە: نوقادەی ئەسەدیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆلای پیاوێک کە وشترێکی پێ بدات، ئەویش ڕەتی کردەوە، پاشان ناردمی بۆلای پیاوێکی تر، ئەویش وشترێکی پێدا، جا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێکەوت فەرمووی: خودایە بەرەکەتداری بکەو ئەوەشی کە ناردوویەتی، نوقادە گوتی: جا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەشی کە هێناویەتی؟ فەرمووی: ئەوەشی کە هێناویەتی، پاشان فەرمانی کرد بیدۆشن و شیری باشی دا، ئەوجار پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خودایە سامانی فڵان زیاتر بکەی، ئەوەی کە وشترەکەی نەدا، وە ڕزق و ڕۆزی فڵانیش ڕۆژ بە ڕۆژ پێی بدەی، بەوەیانی فەرموو کە وشترەکەی بەخشی.

**٤١٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ، وَعَبْدُ الدِّرْهَمِ، وَعَبْدُ الْقَطِيفَةِ، وَعَبْدُ الْخَمِيصَةِ، إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ، وَإِنْ لَمْ يُعْطَ لَمْ يَفِ»[٢].**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەناو بچێ ئەو کەسەی کە کۆیلەی دینارو درهەمە (هەر خەریکی کۆکردنەوەی ماڵ و سامانە)، وە ئەو کەسەشی کە کۆیلەی جل و جۆرو پەڕۆو پرتاڵە (کاری تەنها بۆ پەیداکردنی پۆشاکی ڕازاوەیە)، جا ئەگەر پێیاندا ڕازییەو ئەگەر پێشی نەدرا پەیان ناباتە سەر.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٣٥.

**٤١٣٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ، وَعَبْدُ الدِّرْهَمِ، وَعَبْدُ الْخَمِيصَةِ، تَعِسَ وَانْتَكَسَ، وَإِذَا شِيكَ فَلَا انْتَقَشَ»[١].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەناو بچێ و داوەشێ کۆیلەی پارەو پوڵ و جل و جۆرو پرتاڵ، داوەشێ و سەرشۆڕ بێت، ئەگەر دڕکێکی پێداچوو دڕکەکە نەیەتە دەرەوە.

## بابەت: قەناعەت (بە کەم ڕازی بوون)

**٤١٣٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ»[٢].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەوڵەمەندی بە زۆری سامان و کەلوپەل نیە، بەڵکو ئەو دەوڵەمەندییە بە دەوڵەمەندی ئەژمار دەکرێ کە مرۆڤ دڵ و دەروونی دەوڵەمەند بێت.

**٤١٣٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «قَدْ أَفْلَحَ مَنْ هُدِيَ إِلَى الْإِسْلَامِ، وَرُزِقَ الْكَفَافَ، وَقَنَعَ بِهِ»[٣].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئەو کەسەی کە ڕێنوێنی کراوە بۆ ئیسلام سەرفرازو سەرکەوتووە، وە ئەوەشی کە ڕزق و ڕۆزی بە ئەندازەی پێ ژیان هەیەو مەمرە مەژییەو پێشی ڕازییە.

**٤١٣٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتًا»[٤].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خودایە ڕزق و ڕۆزی ئال و خانەوادەی موحەممەد ﷺ بە ئەندازەی پێویست بێ (زیاد لە پێویست نەبێت).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٣٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٤٦، ومسلم: ١٠٥١، والترمذي: ٢٣٧٣.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٥٤، والترمذي: ٢٣٤٨.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٦٠، ومسلم: ١٠٥٥ وبإثر ٢٩٦٩، والترمذي: ٢٣٦١.





٤١٤٠- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ غَنِيٍّ، وَلَا فَقِيرٍ، إِلَّا وَدَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَّهُ أُتِيَ مِنَ الدُّنْيَا قُوتًا»(١).

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هەموو هەژارو دەوڵەمەندێک لە قیامەتدا خۆزگە دەخوازێ کە لە دونیادا تەنها بەشی ژیان و پێویستی ماڵی دونیای هەبوایە.

٤١٤١- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ مِحْصَنٍ الْأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ مُعَافًى فِي جَسَدِهِ، آمِنًا فِي سِرْبِهِ، عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ، فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا»(٢).

واتە: سەلەمەی کوڕی عوبەیدوڵلای کوڕی میحصەنی ئەنصاریی لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە ئەگەر بە جەستەیەکی ساغ و سەلامەت بەیانی کردەوەو لە شوێن و ڕێگای دڵنیا بوو، خۆراکی ئەو ڕۆژەی هەبوو، وەکو ئەوە وایە هەموو دونیا هی ئەو بێ و بۆی کۆکرابێتەوەو پێی درابێت.

٤١٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «انْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْكُمْ، وَلَا تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ، فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ لَا تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ»، قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: عَلَيْكُمْ(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەماشای ئەوانە بکەن کە لە نازو نیعمەتدا لە خوار خۆتانەوەن و تەماشای ئەوانە مەکەن کە لە سەرووی خۆتانەوەن، چونکە (ئەگەر تەماشای خوار خۆتان بکەن) ئەوە باشترە لەوەی کە نازو نیعمەتەکانی خوا بەکەم بزانن (بەهۆی ئەوەی تەماشای سەرووی خۆتان بکەن).

٤١٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ، وَأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ إِنَّمَا يَنْظُرُ إِلَى أَعْمَالِكُمْ، وَقُلُوبِكُمْ»(٤).

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٣٤٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٩٠ بنحوه، ومسلم: ٢٩٦٣، والترمذي: ٢٥١٣.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٥٦٤.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ڕاستیدا خوا تەماشای شێوەو ڕوخساری ماڵ و سامانتان ناکات، بەڵکو تەنها تەماشای کردەوەو (نییەتی) دڵتان دەکات.

## بابەت: ژیان و گوزەرانی خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ

٤١٤٤- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «إِنْ كُنَّا آلَ مُحَمَّدٍ ﷺ، لَنَمْكُثُ شَهْرًا مَا نُوقِدُ فِيهِ بِنَارٍ، مَا هُوَ إِلَّا التَّمْرُ، وَالْمَاءُ»، إِلَّا أَنَّ ابْنَ نُمَيْرٍ قَالَ: نَلْبَثُ شَهْرًا[1].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: بێگومان ئێمەی خانەوادەی موحەممەد ﷺ بە مانگ ماوینەوەو تێپەڕیوە بەسەرماندا کە ئاگرمان نەکردۆتەوە لەو مانگەدا، تەنها خواردنمان خورماو ئاو بووە. بەڵام ئەوەی هەیە کە ئیبنو نومەیر (لە گێڕانەوەکەیدا) گوتوویەتی: مانگێک دەمایەوە.

٤١٤٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «لَقَدْ كَانَ يَأْتِي عَلَى آلِ مُحَمَّدٍ ﷺ الشَّهْرُ مَا يُرَى فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِهِ الدُّخَانُ»، قُلْتُ: فَمَا كَانَ طَعَامُهُمْ؟ قَالَتْ: «الْأَسْوَدَانِ: التَّمْرُ، وَالْمَاءُ، غَيْرَ أَنَّهُ كَانَ لَنَا جِيرَانٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، جِيرَانُ صِدْقٍ، وَكَانَتْ لَهُمْ رَبَائِبُ، فَكَانُوا يَبْعَثُونَ إِلَيْهِ أَلْبَانَهَا» قَالَ مُحَمَّدٌ: وَكَانُوا تِسْعَةَ أَبْيَاتٍ[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: بێگومان مانگێک هاتووەو تێپەڕیوە بەسەر خانەوادەی پێغەمبەردا ﷺ کە تێیدا دوکەڵی ئاگر نەبینراوە لە هیچ یەکێک لە ماڵەکانی پێغەمبەردا ﷺ، ڕاوی دەڵێ: گوتم: ئەی خواردنیان چی بوو؟ گوتی: دوو شتە ڕەشەکە: خورماو ئاو، ئەوە نەبێ دراوسێیەکمان هەبوو لە ئەنصارەکان کە خێرخواز بوو ماڵاتی دابەستەشی هەبوو، جار هەبوو لە شیری ئەو ماڵاتە بۆی دەناردین. موحەممەد گوتی: وە ماڵەکان (ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ) نۆ دانە بوون.

٤١٤٦- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، يَقُولُ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَلْتَوِي فِي الْيَوْمِ مِنَ الْجُوعِ، مَا يَجِدُ مِنَ الدَّقَلِ، مَا يَمْلَأُ بِهِ بَطْنَهُ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٥٨، ومسلم: ٢٩٧٢، والترمذي: ٢٤٧١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٥٨، ومسلم: ٢٩٧٢، والترمذي: ٢٤٧١.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٧٨.

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بوو دەیگوت: بینیومە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژدا زگی خۆی گوشیوە لە برسان، بەجۆرێک کە خراپترین جۆری خورمای دەستنەدەکەوت سکی پێ تێر بکات.

٤١٤٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ مِرَارًا: «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا أَصْبَحَ عِنْدَ آلِ مُحَمَّدٍ، صَاعُ حَبٍّ، وَلَا صَاعُ تَمْرٍ، وَإِنَّ لَهُ يَوْمَئِذٍ تِسْعَ نِسْوَةٍ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: چەند جارێک گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیفەرموو: سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی ﷺ بەدەستە هەرگیز ڕبەیەک گەنم و ڕبەیەک خورما لە ماڵی موحەممەددا ﷺ بەیانی نەکردۆتەوە، لەکاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ نۆ خێزانی هەبووە.

٤١٤٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَصْبَحَ فِي آلِ مُحَمَّدٍ إِلَّا مُدٌّ مِنْ طَعَامٍ، أَوْ مَا أَصْبَحَ فِي آلِ مُحَمَّدٍ، مُدٌّ مِنْ طَعَامٍ»[2].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جگە لە لوێچێک خواردن نەبێ هیچی تر لە ماڵماندا نەماوەتەوە، یان هەرگیز لە ماڵی موحەممەددا ﷺ لوێچێک خواردن نەماوەتەوە تاکو بەیانی.

٤١٤٩- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ ﷺ، قَالَ: «أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَمَكَثْنَا ثَلَاثَ لَيَالٍ، لَا نَقْدِرُ، أَوْ لَا يَقْدِرُ عَلَى طَعَامٍ»[3].

واتە: سولەیمانی کوڕی صوڕد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆلامان، جا سێ شەو ماینەوە خواردنمان یان خواردنی دەستنەکەوت.

٤١٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا بِطَعَامٍ سُخْنٍ، فَأَكَلَ، فَلَمَّا فَرَغَ، قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ، مَا دَخَلَ بَطْنِي طَعَامٌ سُخْنٌ مُنْذُ كَذَا، وَكَذَا»[4].

---

(١) صحيح. انظر البخاري: ٢٠٦٩.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.

(٤) ضعيف.




واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ڕۆژێکیان خواردنێکی گەرمیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، ئەویش خواردی، جا کاتێک لێ بۆوە فەرمووی: سوپاس بۆ خوا، خواردنی گەرم لەوکاتەو لەوکاتەوە نەچۆتەوە ناو گەدەمەوە.

## بابەت: نوێن و پێخەفی خانەوادەی پێغەمبەری خوا ﷺ

**٤١٥١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «كَانَ ضِجَاعُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَدَمًا حَشْوُهُ لِيفٌ»[١].**

واته: عائیشە ﷺ دەڵێ: ژێرڕاخەرو نوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەرم بوو کە ناواخنەکەی پووشی دارخورما بوو.

**٤١٥٢- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَتَى عَلِيًّا، وَفَاطِمَةَ وَهُمَا فِي خَمِيلٍ لَهُمَا، وَالْخَمِيلُ: الْقَطِيفَةُ الْبَيْضَاءُ مِنَ الصُّوفِ، قَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَهَّزَهُمَا بِهَا، وَوِسَادَةٍ مَحْشُوَّةٍ إِذْخِرًا وَقِرْبَةٍ»[٢].**

واته: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆلای عەلی و فاتیمە لەکاتێکدا کە ئەوان جلێکی خەتداری سپی خوریان لەبەردا بوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دیاری بە فاتیمەی دابوو لەگەڵ پشتییەک کە ناوەکەی گیایەکی بۆنخۆشی تێکرابوو (إذخرا)، لەگەڵ جەوەنەیەک.

**٤١٥٣- عَنْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ عَلَى حَصِيرٍ، قَالَ: فَجَلَسْتُ، فَإِذَا عَلَيْهِ إِزَارٌ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ غَيْرُهُ، وَإِذَا الْحَصِيرُ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِهِ، وَإِذَا أَنَا بِقَبْضَةٍ مِنْ شَعِيرٍ، نَحْوِ الصَّاعِ، وَقَرَظٍ فِي نَاحِيَةٍ فِي الْغُرْفَةِ، وَإِذَا إِهَابٌ مُعَلَّقٌ، فَابْتَدَرَتْ عَيْنَايَ، فَقَالَ: «مَا يُبْكِيكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ؟»، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، وَمَالِي لَا أَبْكِي؟ وَهَذَا الْحَصِيرُ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِكَ، وَهَذِهِ خِزَانَتُكَ لَا أَرَى فِيهَا إِلَّا مَا أَرَى، وَذَلِكَ كِسْرَى، وَقَيْصَرُ فِي الثِّمَارِ وَالْأَنْهَارِ، وَأَنْتَ نَبِيُّ اللَّهِ وَصَفْوَتُهُ، وَهَذِهِ خِزَانَتُكَ، قَالَ: «يَا ابْنَ الْخَطَّابِ أَلَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَنَا الْآخِرَةُ، وَلَهُمُ الدُّنْيَا؟» قُلْتُ: بَلَى[٣].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٥٦، ومسلم: ٢٠٨٢، وأبو داود: ٤١٤٦ و ٤١٤٧، والترمذي: ١٧٦١ و ٢٤٦٩.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٣٣٨٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٦٨، ومسلم: ١٤٧٩، والترمذي: ٣٣١٨ ي قصة طويلة، والترمذي: ٢٤٦١.

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش لەسەر حەسیرێک بوو، گوتی: منیش دانیشتم، (دیتم تەنها) کراسێ یان پەشتەماڵێکی لەبەرکرابوو، جگە لەوە هیچی تری لەبەردا نەبوو، شوێنەواری حەسیرەکەش لەسەر تەنیشتی دیار بوو، منیش بینیم هەندێک جۆی لێبوو نزیکەی ساعێک دەبوو، لەگەڵ جۆرە دەرمانێک کە پێستەی پێ خۆش دەکرێ لە لایەکی ژوورەکە بوو، لەگەڵ پێستێکی خۆشنەکراو کە هەڵواسرابوو، ئیتر چاوەکانم گریانیان هات، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە بۆ دەگریەی کوڕی خەتتاب؟ منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن نەگریەم؟ ئەوە لە حەسیرەکە کەوا شوێنەواری جێهێشتووە لەسەر تەنیشتت، ئەوەش کۆگای ماڵەکەت کە ئەو شتانەی تێدایە کە دەیانبینم، ئەوەش لە حاڵی کیسراو قەیسەر کە خاوەنی ئەو هەموو میوەجات و باخ و ڕووبارەن، جەنابیشت پێغەمبەر ﷺو هەڵبژێردراوی خوای، کەچی ئا ئەوەش شتەکانتە، فەرمووی: ئەی کوڕی خەتتاب ئایا بەوە ڕازی نابی کەوا قیامەت بۆ ئێمە بێ و دونیاش بۆ ئەوان؟ گوتم: بەڵێ ڕازیم.

٤١٥٤- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: «أُهْدِيَت ابْنَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَيَّ، فَمَا كَانَ فِرَاشُنَا لَيْلَةَ أُهْدِيَتْ إِلَّا مَسْكَ كَبْشٍ»[١].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: کچی پێغەمبەری خوا ﷺ درا بە من، جا ئەو شەوەی کە بۆیان هێنام هیچ ڕاخەرێکم نەبوو جگە لە کەوڵ و پێستەی بەرانێک نەبێت.

## بابەت: ژیان و گوزەرانی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ

٤١٥٥- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَأْمُرُ بِالصَّدَقَةِ، فَيَنْطَلِقُ أَحَدُنَا يَتَحَامَلُ حَتَّى يَجِيءَ بِالْمُدِّ، وَإِنَّ لِأَحَدِهِمُ الْيَوْمَ مِائَةَ أَلْفٍ» قَالَ شَقِيقٌ: «كَأَنَّهُ يُعَرِّضُ بِنَفْسِهِ»[٢].

واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەکرد بەوەی کە سەدەقە بکەین و ماڵ ببەخشین، جا هەبوو یەکێکمان دەچوو حەمباڵی دەکرد هەتا مشتێکی (گەنم یان جۆ یان هەر شتێکی داواکراو) پەیدا دەکرد و دەیهێنا، کەچی ئێستا هەمانە

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٧٣ و ٤٦٦٨ و ٤٦٦٩، ومسلم: ١٠١٨، والنسائي: ٢٥٢٩.

کە ئەمڕۆ سەد هەزاری هەیە. شەقیق گوتی: وەکو ئەوە وایە کە مەبەستی خۆی بێ کە دەڵێ: هەمانە سەد هەزاری هەیە.

٤١٥٦- عَنْ خَالِدِ بْنِ عُمَيْرٍ ﷺ، قَالَ: خَطَبَنَا عُتْبَةُ بْنُ غَزْوَانَ، عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَالَ: «لَقَدْ رَأَيْتُنِي سَابِعَ سَبْعَةٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، مَا لَنَا طَعَامٌ نَأْكُلُهُ إِلَّا وَرَقُ الشَّجَرِ، حَتَّى قَرِحَتْ أَشْدَاقُنَا»[1].

واتە: خالیدی کوڕی عومەیر ﷺ دەڵێ: عوتبەی کوڕی غەزوان لەسەر مینبەر وتاری بۆداین و گوتی: من یەکێک بووم لەو حەوتانەی کە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، بینیومەو ئاگادارم کە هیچ خواردنێکمان پێ نەبوو بیخۆین جگە لە گەڵای دار، هەتا وای لێهات لاشەویلگەمان (ئەولاو لای دەممان) بریندار ببوون.

٤١٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ «أَنَّهُمْ أَصَابَهُمْ جُوعٌ وَهُمْ سَبْعَةٌ، قَالَ: فَأَعْطَانِي النَّبِيُّ ﷺ، سَبْعَ تَمَرَاتٍ لِكُلِّ إِنْسَانٍ تَمْرَةٌ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کەوا حەوت کەس بوون و توشی برسێتی بوون، گوتی: جا پێغەمبەر ﷺ حەوت دەنکە خورمای پێدام بۆ هەر نەفەرێک دەنکە خورمایەک.

٤١٥٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ ﴾ التكاثر، قَالَ الزُّبَيْرُ: وَأَيُّ نَعِيمٍ نُسْأَلُ عَنْهُ؟ وَإِنَّمَا هُوَ الْأَسْوَدَانِ: التَّمْرُ، وَالْمَاءُ، قَالَ: «أَمَا إِنَّهُ سَيَكُونُ»[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: کاتێک ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ ﴾ التكاثر، واتە: لە پاشان سوێند بەخوا لەو ڕۆژەدا (لەسەر هەموو نازو نیعمەتێک کە خوا پێی دابوون لە دونیادا) لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکرێت. زوبەیر گوتی: جا لە چ نازو نیعمەتێک لێ پرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێت، خۆ تەنها خورماو ئاوە؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵام ئەو لێپرسینەوەیە هەر دەبێ (یان ئەو نازو نیعمەتەی کە لێ پرسینەوەتان لەسەری لێ دەکرێ لێرە بەدوا دێتە بەردەستان).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٦٧ مطولًا، والترمذي: ٢٥٧٥ دون ذكر لفظ ابن ماجه.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٤١١ و ٥٤٤١م، والترمذي: ٢٤٧٤.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٣٥٦ و ٣٣٥٧.

٤١٥٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ ثَلَاثُمِائَةٍ، نَحْمِلُ أَزْوَادَنَا عَلَى رِقَابِنَا، فَفَنِيَ أَزْوَادُنَا، حَتَّى كَانَ يَكُونُ لِلرَّجُلِ مِنَّا تَمْرَةٌ»، فَقِيلَ: يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ وَأَيْنَ تَقَعُ التَّمْرَةُ مِنَ الرَّجُلِ؟ فَقَالَ: «لَقَدْ وَجَدْنَا فَقْدَهَا حِينَ فَقَدْنَاهَا، وَأَتَيْنَا الْبَحْرَ، فَإِذَا نَحْنُ بِحُوتٍ قَدْ قَذَفَهُ الْبَحْرُ، فَأَكَلْنَا مِنْهُ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ يَوْمًا»[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی ڕەوانە کرد بۆ غەزا کە ژمارەمان سێ سەد کەس بوو، توێشوو خواردنەکەمان بە کۆڵمانەوە بوو، جا خواردنەکەمان بڕاو کۆتایی پێهات تاکو وای لێهات هەر پیاوێک یەک دەنکە خورمای بەردەکەوت، جا پێیان گوت: ئەی باوکی عەبدوڵلا دەنکە خورمایەک بۆ ئێوە دەبێتە چی؟ ئەویش گوتی: کاتێک ئەویش نەما، ئینجا هەستمان بەسوودەکەی کرد، هاتینە سەر دەریا بینیمان نەهەنگێک دەریا هەڵیدابوو بۆ کەناری دەریا، ئنجا هەژدە ڕۆژ لەو نەهەنگەمان خوارد.

## بابەت: خانوو دروستکردن و ڕوخاندنی

٤١٦٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: مَرَّ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ نُعَالِجُ خُصًّا لَنَا، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟» فَقُلْتُ: خُصٌّ لَنَا، وَهَى نَحْنُ نُصْلِحُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أُرَى الْأَمْرَ إِلَّا أَعْجَلَ مِنْ ذَلِكَ»[2].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلاماندا تێپەڕی لەکاتێکدا کە خانوویەکی لە قامیش و پەلکە خورما دروستکراومان هەبوو چاکمان دەکردەوە، ئەویش فەرمووی: ئەوە چییە؟ منیش گوتم: خانووەکەمانە کە خەریکە دەڕوخێت، ئێمەش چاکی دەکەینەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی مردن زۆر نزیکتر دەبینم لە چاککردنەوەی خانووەکە (واتە: چۆن شوێنی نیشتەجێبوونی خۆتان چاک دەکەنەوەو نۆژەنی دەکەنەوە، ئاواش ئامادەسازی ناوگۆڕتان بیر نەچێت).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٨٣، ومسلم: ١٩٣٥، وأبو داود: ٢٤٧٥، والنسائي: ٤٣٥١_٤٣٥٤.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥٢٣٥، والترمذي: ٢٣٣٥.



**٤١٦١-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِقُبَّةٍ عَلَى بَابِ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ: «مَا هَذِهِ؟» قَالُوا: قُبَّةٌ بَنَاهَا فُلَانٌ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ مَالٍ يَكُونُ هَكَذَا، فَهُوَ وَبَالٌ عَلَى صَاحِبِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، فَبَلَغَ الْأَنْصَارِيَّ ذَلِكَ، فَوَضَعَهَا فَمَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بَعْدُ، فَلَمْ يَرَهَا، فَسَأَلَ عَنْهَا، فَأُخْبِرَ أَنَّهُ وَضَعَهَا لِمَا بَلَغَهُ عَنْكَ، فَقَالَ: «يَرْحَمُهُ اللَّهُ، يَرْحَمُهُ اللَّهُ»[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای گومەزێکدا تێپەڕی کە لە بەردەرگای پیاوێکی ئەنصاریدا بوو، ئەویش فەرمووی: ئا ئەوە چییە؟! گوتیان: گومەزێکە فڵان کەس دروستی کردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر ماڵ و سامانێکی لەو شێوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا وە بال و بارە بەسەر خاوەنەکەیەوە، جا ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بە کابرای ئەنصاری گەیشتەوە، بۆیە لایبرد، جا لەدوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ بەوێدا تێپەڕی و گومەزەکەی نەدیت، بۆیە پرسیاری دەربارە کرد، ئنجا پێیان گوت: کاتێک کە فەرمایشتی تۆی پێگەیشت لایبرد، بۆیە فەرمووی: خوا ڕەحمی پێبکات، خوا ڕەحمی پێبکات.

**٤١٦٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «لَقَدْ رَأَيْتُنِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، بَنَيْتُ بَيْتًا يُكِنُّنِي مِنَ الْمَطَرِ، وَيُكِنُّنِي مِنَ الشَّمْسِ، مَا أَعَانَنِي عَلَيْهِ خَلْقٌ لِلَّهِ تَعَالَى»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خانوچکەیەکم دروستکرد، کە لە باران و لە خۆر دەیپاراستم (سێبەری بۆ دەکردم) هیچ کەس لە دروستکراوەکانی خوا یامەتییان نەدام (واتە: بە تەنیا دروستم کرد، بەڵگەشە لەسەر گچکەیی خانووەکە).

**٤١٦٣-** عَنْ حَارِثَةَ بْنِ مُضَرِّبٍ ﷺ، قَالَ: أَتَيْنَا خَبَّابًا نَعُودُهُ، فَقَالَ: لَقَدْ طَالَ سَقْمِي، وَلَوْلَا أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «لَا تَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ» لَتَمَنَّيْتُهُ وَقَالَ: «إِنَّ الْعَبْدَ لَيُؤْجَرُ فِي نَفَقَتِهِ كُلِّهَا، إِلَّا فِي التُّرَابِ»، أَوْ قَالَ: «فِي الْبِنَاءِ»[3].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٥٢٣٧ بنحوه.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣٠٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٧٢، ومسلم: ٢٦٨١/١٢ مختصراً، والترمذي: ٩٧٠ و ٢٤٨٣، والنسائي: ١٨٢٣.

واتە: حاریسەی کوڕی موزڕیب ﷺ دەڵێ: سەردانی خەبابمان کرد، ئەویش گوتی: بەڕاستی نەخۆشییەکەم زۆر درێژەی کێشا، خۆ ئەگەر گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوایە کە دەیفەرموو: خۆزگە بە مردن مەخوازن، ئەوە بێگومان خۆزگەم بە مردن دەخواست، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی بەندە لەسەر هەموو ماڵ خەرجکردنێک پاداشت وەردەگرێ جگە لەو خەرجییە نەبێ کە لە گڵدا خەرج دەکرێ یان فەرمووی: لە خانوودا (واتە: زیادەڕەوی کردن لە دروست کردنی خانودا، نەک خانووی پێویست).

## بابەت: پشت بەستن و دڵنیایی

٤١٦٤- عَنْ أَبِي تَمِيمٍ الْجَيْشَانِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «لَوْ أَنَّكُمْ تَوَكَّلْتُمْ عَلَى اللَّهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ، لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّيْرَ، تَغْدُو خِمَاصًا، وَتَرُوحُ بِطَانًا»[1].

واتە: ئەبو تەمیمی جەیشانیی ﷺ دەڵێ: گوێم لە عومەر بوو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر وەکو پێویست و شایستە ئاوا پشتتان بە خوا بەستبایە ئەوە بەجۆرێک ڕزق و ڕۆزی دەدان هەروەکو ئەو باڵندەیەی کەوا بەیانیان بە سکی خاڵی و برسی دەردەچێ و دواتر بە سکی پڕو تێرەوە دەگەڕێتەوە.

٤١٦٥- عَنْ حَبَّةَ، وَسَوَاءٍ، ابْنَيْ خَالِدٍ ﷺ، قَالَا: دَخَلْنَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَهُوَ يُعَالِجُ شَيْئًا، فَأَعَنَّاهُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: «لَا تَيْأَسَا مِنَ الرِّزْقِ مَا تَهَزَّزَتْ رُءُوسُكُمَا، فَإِنَّ الْإِنْسَانَ تَلِدُهُ أُمُّهُ أَحْمَرَ، لَيْسَ عَلَيْهِ قِشْرٌ، ثُمَّ يَرْزُقُهُ اللَّهُ ﷻ»[2].

واتە: حەببەو سەوائی کوڕانی خالید ﷺ دەگێڕنەوە، دەڵێن: چووینەتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا شتێکی چاک دەکردەوە، ئێمەش یارمەتیماندا، ئەویش فەرمووی: تاکو سەرتان جوڵەی تێدا بێ لە ڕزق و ڕۆزی مەترسن و بێهیوا مەبن، چونکە مرۆڤ بە ڕووت و قوتی لە دایک دەبێت، پارچە گۆشتێکی سوورەو هیچی لەبەردا نیە، پاشان خوای ﷻ ڕزق و ڕۆزی پێدەدات.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٣٤٤.

(٢) ضعيف.

٤١٦٦- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ قَلْبِ ابْنِ آدَمَ بِكُلِّ وَادٍ شُعْبَةً، فَمَنِ اتَّبَعَ قَلْبُهُ الشُّعَبَ كُلَّهَا، لَمْ يُبَالِ اللَّهُ بِأَيِّ وَادٍ أَهْلَكَهُ، وَمَنْ تَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ كَفَاهُ التَّشَعُّبَ»(١).

واتە: عەمری کوڕی عاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دڵی ئادەمیزاد بۆ هەموو شیوێک ڕێگایەک دەگرێتەبەر (واتە: لەناو دڵیدا حەزو ئارەزوو هەیە بۆ هەموو چێژەکانی دونیا وەکو: ماڵ و سامان و دەسەڵات)، جا ئەگەر هەر کەسێک دڵی بۆ ئەو شتانە بچێ و بەدوای خۆشییەکانی دونیادا وێڵ بێت، ئەوە خوا هیچ گرنگییەکی پێنادات ئاخۆ لە چ شیوێکدا بە فەتارەت دەچێت، وە هەر کەسێکیش پشت بە خوا ببەستێ ئەوە هیچ ڕێچکەو کوێرەڕێی دیکەی ناوێت.

٤١٦٧- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «لَا يَمُوتَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ إِلَّا وَهُوَ يُحْسِنُ الظَّنَّ بِاللَّهِ»(٢).

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هیچ یەکێک لە ئێوە با نەمرێ مەگەر بەجۆرێک نەبێ کە گومانی باشی بەرانبەر بە خوا هەبێت.

٤١٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَلَا تَعْجِزْ، فَإِنْ غَلَبَكَ أَمْرٌ، فَقُلْ: قَدَرُ اللَّهِ، وَمَا شَاءَ فَعَلَ، وَإِيَّاكَ وَاللَّوْ، فَإِنَّ اللَّوْ، تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بڕواداری بەهێز لەلای خوا باشترو خۆشەویستترە لە بڕواداری لاواز، لە هەر یەکێکیشیاندا خێرو چاکە هەیە، هەمیشە سووربە لەسەر شتێک کە سودت پێ دەگەیەنێت، وە دەستە پاچەو دەست و پێ سارد مەبە، جا ئەگەر شتێک بەسەرتدا زاڵ بوو، بوو بە ڕێگر، ئەوە بڵێ: ئەو شتە قەدەری خوایەو ئەوە خوا پێی خۆش بوو ئەوەی بڕیاردا، وە خۆت لە وشەی: ئەگەر بپارێزە (مەڵێ: ئەگەر وانەباو ئەگەر وانەبا)، چونکە وشەی: ئەگەر دەرگای کردەوەی شەیتان دەکاتەوە.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٧٧، وأبو داود: ٣١١٣.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٦٤.

## بابەت: دانایی و کارزانی و کارلەجێی

٤١٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْكَلِمَةُ الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ، حَيْثُمَا وَجَدَهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دانایی و زانایی ونبووی مرۆڤی بڕوادارە، جا لە هەر جێگایەک و هەر کاتێک دیتیەوەو پێی گەیشت ئەوە بڕوادار شایەنترە پێی.

٤١٧٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، الصِّحَّةُ، وَالْفَرَاغُ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەعیدی کوڕی ئەبو هیند دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس ﷺ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو نازو نیعمەت هەیە کە خەڵکێکی زۆر لێیان بێ ئاگان و زەرەمەندن تیایاندا: لەشساغی و دەست بەتاڵی.

٤١٧١- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلِّمْنِي، وَأَوْجِزْ، قَالَ: «إِذَا قُمْتَ فِي صَلَاتِكَ فَصَلِّ صَلَاةَ مُوَدِّعٍ، وَلَا تَكَلَّمْ بِكَلَامٍ تَعْتَذِرُ مِنْهُ، وَأَجْمِعِ الْيَأْسَ عَمَّا فِي أَيْدِي النَّاسِ»[3].

واتە: ئەبو ئەیوب ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی کورت و پوختم فێربکە، فەرمووی: هەرکات هەستای نوێژ بکەی ئەوە بەجۆرێک نوێژەکەت بکە وەکو ئەوەی کە کۆتا نوێژکردنت بێت، وە هەرگیز قسەیەک مەکە کە پێویستی بە عوزرو بەهانە هێنانەوە هەبێ (زمانت لە وشەی خراپ بپارێزە)، وە هەمیشە لەو شتەی کە هی خەڵکییە خۆت بێ هیوا بکەو بەتەمای مەبە.

---

(١) ضعيف جداً. أخرجه الترمذي: ٢٦٨٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤١٢، والترمذي: ٢٦٨٧

(٣) حسن لغيره.

٤١٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ الَّذِي يَجْلِسُ يَسْمَعُ الْحِكْمَةَ، ثُمَّ لَا يُحَدِّثُ عَنْ صَاحِبِهِ إِلَّا بِشَرِّ مَا سَمِعَ، كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتَى رَاعِيًا، فَقَالَ: يَا رَاعِي أَجْزِرْنِي شَاةً مِنْ غَنَمِكَ، قَالَ: اذْهَبْ فَخُذْ بِأُذُنِ خَيْرِهَا، فَذَهَبَ فَأَخَذَ بِأُذُنِ كَلْبِ الْغَنَمِ». قَالَ أَبُو الْحَسَنِ بْنُ سَلَمَةَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَقَالَ فِيهِ: بِأُذُنِ خَيْرِهَا شَاةً[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نمونەی ئەو کەسەی کە دادەنیشێ و گوێ بۆ قسەی شیاوو دانایی دەگرێت، پاشان تەنها بەو وشەگەلە قسە لەگەڵ هاوڕێکەی دەکات کە خەراپترینی وشەو قسەیە، ئەوە وەکو ئەو کەسە وایە کە بچێتە لای شوانێک و بڵێت: ئەی کاکەی شوان مەڕێکم بدەیە لە مەڕەکانت سەری ببڕم، ئەویش بڵێت: بچۆ بە دڵی خۆت دانەیەک بگرە، ئەویش بچێ گوێی سەگی مەڕەکان بگرێت. ئەبو حەسەنی کوڕی سەلەمە لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا بە هەمان شێوەی هێناوە، بەڵام گوتوویەتی: (شوانەکە دەڵێ:) گوێی باشترینی مەڕەکان بگرە.

### بابەت: دوورەپەرێزی لە خۆ بە گەورە زانی و بابەت: خۆ بە کەم زانین

٤١٧٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ كِبْرٍ، وَلَا يَدْخُلُ النَّارَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە ئەندازەی یەک دەنکە خەرتەلە خۆ بە زل زانی و لووت بەرزی لە دڵدا بێ ئەوە ناچێتە ناو بەهەشتەوە، وە هەر کەسێک بە ئەندازەی یەک دەنکە خەرتەلە ئیمان لە دڵیدا بێ ناچێتە ناو ئاگرەوە.

٤١٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: «الْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي، وَالْعَظَمَةُ إِزَارِي، مَنْ نَازَعَنِي وَاحِدًا مِنْهُمَا، أَلْقَيْتُهُ فِي جَهَنَّمَ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩١، وأبو داود: ٤٠٩١، والترمذي: ١٩٩٨ و ١٩٩٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٢٠ بمعناه، وأبو داود: ٤٠٩٠.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای پاک و بێگەرد دەفەرمووێت: گەورەیی و شکۆداری و مەزنایەتی بەرگ و پۆشاکی منن، هەر کەسێک لە یەکێک لەوانەدا بەربەرەکانیم بکات ئەوە هەڵیدەدەمە ناو دۆزەخەوە.

٤١٧٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: «الْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي، وَالْعَظَمَةُ إِزَارِي، فَمَنْ نَازَعَنِي وَاحِدًا مِنْهُمَا، أَلْقَيْتُهُ فِي النَّارِ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای پاک و بێگەرد دەفەرمووێت: گەورەیی و شکۆداری و مەزنایەتی بەرگ و پۆشاکی منن، هەر کەسێک لە یەکێک لەوانەدا بەربەرەکانیم بکات ئەوە هەڵیدەدەمە ناو دۆزەخەوە.

٤١٧٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ يَتَوَاضَعُ لِلَّهِ دَرَجَةً، يَرْفَعُهُ اللَّهُ بِهِ دَرَجَةً، وَمَنْ يَتَكَبَّرُ عَلَى اللَّهِ دَرَجَةً، يَضَعُهُ اللَّهُ بِهِ دَرَجَةً، حَتَّى يَجْعَلَهُ فِي أَسْفَلِ السَّافِلِينَ»[2].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لەپێناو خواو لەبەر خاتری خوای پاک و بێگەرد پلەیەک دابەزێ و خۆی بە کەم بگرێ ئەوە خوا پلەیەکی بەرز دەکاتەوە بەهۆی خۆ بە کەم زانینەکەیەوە، وە هەر کەسێک فیزو خۆ بە زل زانی بکات لەسەر سنورەکانی خواوە ئەوە خوا بەهۆیەوە پلەیەک نزمی دەکاتەوە هەتاکو نزمی دەکاتەوە تاکو پلەی خواری خوارەوە.

٤١٧٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «إِنْ كَانَتِ الْأَمَةُ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ لَتَأْخُذُ بِيَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَمَا يَنْزِعُ يَدَهُ مِنْ يَدِهَا حَتَّى تَذْهَبَ بِهِ حَيْثُ شَاءَتْ مِنَ الْمَدِينَةِ، فِي حَاجَتِهَا»[3].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: ئەگەر کەنیزەکێکی خەڵکی مەدینە دەستی پێغەمبەری خوای ﷺ بگرتبایە، ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بەرنەدەدا لە دەستی هەتا ئەو کەسە بە دڵی خۆی بۆ کوێی مەدینە پێی خۆش بوایە دەچوو بەدەم پێویستییەکانیەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح لغيره.

٤١٧٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَعُودُ الْمَرِيضَ، وَيُشَيِّعُ الْجِنَازَةَ، وَيُجِيبُ دَعْوَةَ الْمَمْلُوكِ، وَيَرْكَبُ الْحِمَارَ، وَكَانَ يَوْمَ قُرَيْظَةَ، وَالنَّضِيرِ عَلَى حِمَارٍ، وَيَوْمَ خَيْبَرَ عَلَى حِمَارٍ مَخْطُومٍ بِرَسَنٍ مِنْ لِيفٍ، وَتَحْتَهُ إِكَافٌ مِنْ لِيفٍ»[١].

واته: ئه‌نه‌سی کوڕی مالیک ﷺ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ عاده‌تی وابوو سه‌ردانی نه‌خۆشی ده‌کردو ئاماده‌ی ناشتنی مردوو ده‌بوو به‌ده‌م ده‌عوه‌تی به‌نده‌وه ده‌چوو، سواری گوێدرێژ ده‌بوو، وه له ڕۆژی «بنو قريظة» و «بنو النضير»ـدا له‌سه‌ر گوێدرێژه‌که‌وه سوار ببوو، هه‌روه‌ها ڕۆژی خه‌یبه‌ریش به‌سواری گوێدرێژێکه‌وه بوو که ڕێشمه‌که‌ی و کورتانه‌که‌ی له ڕیشاڵی دارخورماو پوش و په‌ڵاش بوو.

٤١٧٩- عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ خَطَبَهُمْ، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ أَوْحَى إِلَيَّ، أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لَا يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ»[٢].

واته: عیازی کوڕی حیمار ﷺ ده‌گێڕێته‌وه، پێغه‌مبه‌ر ﷺ وتاری بۆ فه‌رموون و فه‌رموویه‌تی: خوای ﷻ وه‌حی بۆ کردووم که‌وا هه‌رده‌م خۆتان به که‌م بگرن تاکو هیچ که‌سێک شانازی به‌سه‌ر هیچ که‌سێکه‌وه نه‌کات.

## بابه‌ت: شه‌رم و حه‌یا

٤١٨٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَشَدَّ حَيَاءً مِنْ عَذْرَاءَ فِي خِدْرِهَا، وَكَانَ إِذَا كَرِهَ شَيْئًا رُئِيَ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ»[٣].

واته: ئه‌بو سه‌عیدی خودریی ﷺ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له‌و گه‌وره کچانه‌ی ناو په‌رده به شه‌رم و شکۆتر بوو، وه کاتێک شتێکی پێ ناخۆش بوایه ئه‌وه ئه‌و پێ ناخۆش بوونه به ڕوخسارییه‌وه ده‌بینرا.

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٠١٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٦٥، وأبو داود: ٤٨٩٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٥٦٢/٤، ومسلم: ٢٣٢٠.

٤١٨١- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِكُلِّ دِينٍ خُلُقًا، وَخُلُقُ الْإِسْلَامِ الْحَيَاءُ»(١).

واته: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هەموو دینێک ڕەفتارو کرداری تایبەت بە خۆی هەیە، وە ڕەفتارو ئاکاری ئیسلامیش بریتیە لە شەرم و حەیا.

٤١٨٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِكُلِّ دِينٍ خُلُقًا، وَإِنَّ خُلُقَ الْإِسْلَامِ الْحَيَاءُ»(٢).

واته: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هەموو دینێک ڕەفتارو کرداری تایبەت بە خۆی هەیە، وە ڕەفتارو ئاکاری ئیسلامیش بریتیە لە شەرم و حەیا.

٤١٨٣- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الْأُولَى: إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ»(٣).

واته: عوقبەی کوڕی عەمری کوڕی ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی کە خەڵکی لە پێغەمبەرانی پێشوو بۆیان ماوەتەوەو پێیان گەیشتووە ئەوەیە: ئەگەر شەرم و حەیات نەبوو ئەوە چی دەکەی بیکە.

٤١٨٤- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْحَيَاءُ مِنَ الْإِيمَانِ، وَالْإِيمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَالْبَذَاءُ مِنَ الْجَفَاءِ، وَالْجَفَاءُ فِي النَّارِ»(٤).

واته: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەرم و شکۆ لە بڕواوەیە وە بڕواداریش لەناو بەهەشتدایە، وە بەدگۆیی و زمانپیسی لە وشکی و دڵڕەقییەوەیەو وشکی و دڵڕەقیش لەناو دۆزەخدایە.

٤١٨٥- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَا كَانَ الْفُحْشُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا شَانَهُ، وَلَا كَانَ الْحَيَاءُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا زَانَهُ»(٥).

---

(١) حسن.

(٢) حسن.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٨٣، وأبو داود: ٤٧٩٧.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٩٧٤.

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان زمانپیسی و بەدگۆیی لە هەر شتێکدا بێ ناشیرینی دەکات، وە حەیاو شەرم و شکۆش لە هەر شتێکدا بێ جوانی دەکات و دەیرازێنێتەوە.

## بابەت: ئارامی و هێمنی

٤١٨٦- عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ كَظَمَ غَيْظًا وَهُوَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُنْفِذَهُ، دَعَاهُ اللَّهُ عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، حَتَّى يُخَيِّرَهُ فِي أَيِّ الْحُورِ شَاءَ»[1].

واتە: سەهلی کوڕی موعازی کوڕی ئەنەس لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک توانای جێبەجێکردنی ڕق و قینی هەبێ بەڵام لەبەر ڕەزامەندی خوا ڕقەکەی بخواتەوەو جێبەجێی نەکات، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا خوا لەناو هەموو دروستکراوەکان و بە بەرچاوی هەموانەوە بانگی دەکات و دەیکاتە سەرپشک بە دڵی خۆی لە حۆرییەکانی بەهەشت هەڵبژێرێت.

٤١٨٧- عَنْ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ ﷺ، قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: أَتَتْكُمْ وُفُودُ عَبْدِ الْقَيْسِ، وَمَا نَرَى أَحَدًا، فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ، إِذْ جَاءُوا فَنَزَلُوا، فَأَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَبَقِيَ الْأَشَجُّ الْعَصَرِيُّ، فَجَاءَ بَعْدُ، فَنَزَلَ مَنْزِلًا فَأَنَاخَ رَاحِلَتَهُ، وَوَضَعَ ثِيَابَهُ جَانِبًا، ثُمَّ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أَشَجُّ إِنَّ فِيكَ لَخَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ، الْحِلْمَ وَالتُّؤَدَةَ»، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَشَيْءٌ جُبِلْتُ عَلَيْهِ، أَمْ شَيْءٌ حَدَثَ لِي؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَلْ شَيْءٌ جُبِلْتَ عَلَيْهِ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: لەکاتێکدا کە ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتبووین فەرمووی: وەفدەکانی عەبدولقەیس هاتوون بۆلاتان، هیچ کەسیان نەدەبینی، جا ئێمە لەم حاڵەتەدا بووین کە هاتن و بارگەیان خست، ئیتر هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەشەجی عەصری مابوو ئەویش دواتر هات و لە شوێنێک بارگەی خست، وشترەکەی یەخدا و پۆشاکەکانی لەلایەکەوە دانا، پاشان هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٧٧٧، والترمذي: ٢٠٢١ و ٢٤٩٣.

(٢) ضعيف جداً.



ئەشەج لەڕاستیدا دوو ئاکار کە لە تۆدا هەن و خوا و پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێن، ئەوانیش: هێمنی و ئارامین، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە سەرەتاوە ئەم سیفەتانەم هەبووە یان دواتر دروست بوون؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵکو شتێکە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵتدا بوونە.

٤١٨٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ لِلْأَشَجِّ الْعَصَرِيِّ: «إِنَّ فِيكَ خَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ: الْحِلْمَ، وَالْحَيَاءَ»[(١)].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە ئەشەجی عەصری فەرمووو: بێگومان دوو سیفەت لە تۆدا هەیە کە خوا خۆشیدەوێن (ئەوانیش:) لەسەرخۆیی و شەرمن.

٤١٨٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ جُرْعَةٍ أَعْظَمُ أَجْرًا عِنْدَ اللَّهِ، مِنْ جُرْعَةِ غَيْظٍ كَظَمَهَا عَبْدٌ ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ»[(٢)].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ قوتدانەوەو خواردنەوەیەک نیە کە لەلای خوا پاداشتی گەورەتر بێ لە قوتدانەوەی تووڕەیی کە بەندەیەک لەبەر خاتری خوا ڕقەکەی دەخواتەوە.

## بابەت: دڵتەنگی و گریان

٤١٩٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي أَرَى مَا لَا تَرَوْنَ، وَأَسْمَعُ مَا لَا تَسْمَعُونَ، إِنَّ السَّمَاءَ أَطَّتْ، وَحَقَّ لَهَا أَنْ تَئِطَّ، مَا فِيهَا مَوْضِعُ أَرْبَعِ أَصَابِعَ إِلَّا وَمَلَكٌ وَاضِعٌ جَبْهَتَهُ سَاجِدًا لِلَّهِ، وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا، وَمَا تَلَذَّذْتُمْ بِالنِّسَاءِ عَلَى الْفُرُشَاتِ، وَلَخَرَجْتُمْ إِلَى الصُّعُدَاتِ، تَجْأَرُونَ إِلَى اللَّهِ، وَاللَّهِ لَوَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ شَجَرَةً تُعْضَدُ»[(٣)].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧/٢٥، والترمذي: ٢٠١١ وعندهما: الحلم والأناة.

(٢) صحيح.

(٣) حسن لغيره. وقوله: «لَوَدِدْتُ...» مدرج، وهو من قول أبي ذر. أخرجه الترمذي: ٢٣١٢.

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن، وە ئەوەی من دەیبیستم ئێوە نایبیستن، لەڕاستیدا ئاسمان پڕیەتی لە دەنگەو دەنگ و چرپە چرپ و هەقی خۆشیەتی دەنگە دەنگی بێت، چونکە بێگومان جێی چوار پەنجەی لێ نیە کە فریشتەیەکی لێ نەبێ کە نێوچاوانی داناوە و لە سوجدە دایە بۆ خوا، سوێند بە خوا ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوەش بیزانن بە بێگومان کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان، وە لەسەر جێگاکانتان هیچ چێژێکتان لە خێزانەکانتان نەدەبردو دەردەچوونە سەر ڕێگاو بانەکان و پەناتان بە خوا دەگرت و هاوارو ناڵەتان بۆلای بەرز دەکردەوە، (ڕاوی دەڵێ:) سوێند بە خوا من خۆزگەم دەخواست کە دارێک بوومایەو بیانبڕیبام.

٤١٩١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوەش بتانزانیبا ئەوە بێگومان کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان.

٤١٩٢- عَنْ أَبِي حَازِمٍ ﷺ، أَنَّ عَامِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ، «أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ بَيْنَ إِسْلَامِهِمْ، وَبَيْنَ أَنْ نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ، يُعَاتِبُهُمُ اللَّهُ بِهَا، إِلَّا أَرْبَعُ سِنِينَ: ﴿وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾﴾ الحديد»[2].

واتە: ئەبو حازیم ﷺ دەگێڕێتەوە لە عامیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ، کە باوکی بۆی گێڕاوەتەوە کەوا نێوانی مسوڵمان بوون و دابەزینی ئەو ئایەتەی کە سەرزەنشتیان دەکات تەنها چوار ساڵ بووە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾﴾ الحديد، واتە: وەک ئەوکەسانە (جولەکەو گاور) نەبن کە لەمەوپێش پەرتووکی ئاسمانیان پێدرا وە ماوەیەکی دوورو درێژیان بەسەردا تێپەڕی ئەمجا دڵیان ڕەق بوو وە زۆربەیان یاخی و لەسنوور دەرچووبوون.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٦٢١، ومسلم: ٢٣٥٩.

(٢) حسن.

٤١٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُكْثِرُوا الضَّحِكَ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ»(١).

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زۆر پێمەکەنن (خوو بە پێکەنینەوە مەگرن)، چونکە لەڕاستیدا پێکەنینی زۆر دڵ دەمرێنێت.

٤١٩٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: «اقْرَأْ عَلَيَّ»، فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ بِسُورَةِ النِّسَاءِ حَتَّى إِذَا بَلَغْتُ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾ النساء، فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ، فَإِذَا عَيْنَاهُ تَذْمَعَانِ»(٢).

واته: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێمی فەرموو: قورئانم بۆ بخوێنە، دەڵێ: منیش قورئانم بەسەردا خوێند لە سوورەتی «النساء» تا گەیشتمە ئەو ئایەتە: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾ النساء، واتە: ئینجا (حاڵی کافران) چۆن بێ کاتێک هێنامان لە هەموو ئومەتێکدا شایەتێک (کە پێغەمبەرەکەیانە) تۆیشمان هێنا (ئەی موحەممەد ﷺ) بەشایەت بەسەر ئا ئەوانەوە. جا تەماشای پێغەمبەرم ﷺ کرد لەوەدەمەدا چاوەکانی فرمێسکیان لێ دەهات.

٤١٩٥- عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي جِنَازَةٍ، فَجَلَسَ عَلَى شَفِيرِ الْقَبْرِ، فَبَكَى، حَتَّى بَلَّ الثَّرَى، ثُمَّ قَالَ: «يَا إِخْوَانِي لِمِثْلِ هَذَا فَأَعِدُّوا»(٣).

واته: بەڕاء ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە ناشتنی جەنازەیەک، ئەویش لەسەر لایەکی گۆڕەکە دانیشت، ئنجا بەجۆرێک گریا هەتا گڵی سەر گۆڕەکەی تەڕکرد، پاشان فەرمووی: برایەکانم بۆ وێنەی ئا ئەوە خۆتان ئامادە بکەن.

٤١٩٦- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ابْكُوا، فَإِنْ لَمْ تَبْكُوا فَتَبَاكَوْا»(٤).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٥٥، ومسلم: ٨٠٠، وأبو داود: ٣٦٦٨، والترمذي: ٣٠٢٤ و ٣٠٢٥.

(٣) حسن.

(٤) ضعيف.

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بگریەن، خۆ ئەگەر گریانتان نەهات ئەوە خۆتان بگریەنن.

**٤١٩٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ عَبْدٍ مُؤْمِنٍ يَخْرُجُ مِنْ عَيْنَيْهِ دُمُوعٌ، وَإِنْ كَانَ مِثْلَ رَأْسِ الذُّبَابِ، مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ، ثُمَّ تُصِيبُ شَيْئًا مِنْ حُرِّ وَجْهِهِ، إِلَّا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ»[1].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هەر بەندەیەکی بڕوادار لە ترسی خوا فرمێسکی لە چاوان بێتە خوار، ئەگەر ئەو فرمێسکە بەقەدەر سەری مێشولەش بێت، پاشان بەر ڕووی ڕوخساری بکەوێ ئەوە خوا لە ئاگری حەرام و قەدەغە دەکات.

## بابەت: کارکردن بە ترسەوە

**٤١٩٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ ۝٦٠ ﴾ المؤمنون، أَهُوَ الَّذِي يَزْنِي، وَيَسْرِقُ، وَيَشْرَبُ الْخَمْرَ؟ قَالَ: «لَا، يَا بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ أَوْ يَا بِنْتَ الصِّدِّيقِ وَلَكِنَّهُ الرَّجُلُ يَصُومُ، وَيَتَصَدَّقُ، وَيُصَلِّي، وَهُوَ يَخَافُ أَنْ لَا يُتَقَبَّلَ مِنْهُ»[2].**

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی ئەو ئایەتە: ﴿ **وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ ۝٦٠** ﴾ المؤمنون، واتە: وە ئەو کەسانەی کە دەیبەخشن (لە زەکات و خێر) لەوەی پێیان بەخشیون لە کاتێکدا دڵیان دەترسێ و(دەلەرزێ). ئایا ئەو کەسەیە کە زینا دەکات و دزی دەکات و عارەق دەخواتەوە؟ فەرمووی: نەخێر ئەی کچی ئەبو بەکر (یان ئەی کچی صدیق)، بەڵکو ئەو پیاوەیە کە ڕۆژوو دەگرێ و زەکات دەدات و نوێژ دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا دەترسێ کەوا لێی وەرنەگیرێت.

**٤١٩٩- عَنْ أَبُو عَبْدِ رَبِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ كَالْوِعَاءِ، إِذَا طَابَ أَسْفَلُهُ، طَابَ أَعْلَاهُ، وَإِذَا فَسَدَ أَسْفَلُهُ، فَسَدَ أَعْلَاهُ»[3].**

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٣١٧٥.

(٣) صحيح.

واتە: ئەوب عەبدی ڕەبی ﷺ دەڵێ: گوێم لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ بوو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بە بێگومان هەر کردەوەیەک وەکو کۆپەڵەو دەفرێ وایە، جا ئەگەر ژێرەوەی پاک بێ ئەوە سەرەوەشی پاک و چاک دەبێ، خۆ ئەگەر ژێرەکەی ناپاک و چەپەڵ بوو ئەوە سەرەکەشی تێک دەدات و ناپاک دەبێ (ئاماژەیە بۆ دەرەوەو ناوەوەی هەر کردەوەیەک یان ئاماژەیە بۆئەوەی کە هەموو کردەوەیەک بەوەیە کە کۆتاییەکەی جوان بێ و «حسن الخاتمة» بێت).

**٤٢٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا صَلَّى فِي الْعَلَانِيَةِ، فَأَحْسَنَ، وَصَلَّى فِي السِّرِّ، فَأَحْسَنَ، قَالَ اللَّهُ ﷻ: هَذَا عَبْدِي حَقًّا»**[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە بێگومان هەر بەندەیەک کاتێک نوێژ بە ئاشکراو بە بەرچاوی خەڵکییەوە دەکات نوێژێکی جوان و ڕێک و پێک بکات و کاتێک بە نادیاریش نوێژ دەکات نوێژێکی جوان و ڕێک و پێک بکات، ئەوە خوای ﷻ دەفەرمووێت: ئا ئەوە بەندەی ڕاستەقینەی منە.

**٤٢٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَارِبُوا، وَسَدِّدُوا، فَإِنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ مِنْكُمْ يُنْجِيهِ عَمَلُهُ»، قَالُوا: وَلَا أَنْتَ؟ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «وَلَا أَنَا، إِلَّا أَنْ يَتَغَمَّدَنِي اللَّهُ بِرَحْمَةٍ مِنْهُ، وَفَضْلٍ»**[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاروکردەوەکانتان بە جوانی و دامەزراوی جێبەجێ بکەن و دووربکەونەوە لە ڕۆچوون و لاگری، چونکە هیچ یەکێکتان تەنها بە کردەوەی خۆی ڕزگاری نابێت، گوتیان: جەنابیشت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: نەخێر منیش ڕزگارم نابێ مەگەر خوا بە سۆزو میهرەبانی و گەورەیی خۆی داماپۆشێت.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٦٣، ومسلم: ٢٨١٦.

## بابەت: ڕوپامایی و ناوو شۆرەت

٤٢٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ اللَّهُ ﷻ: «أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، فَمَنْ عَمِلَ لِي عَمَلًا أَشْرَكَ فِيهِ غَيْرِي، فَأَنَا مِنْهُ بَرِيءٌ، وَهُوَ لِلَّذِي أَشْرَكَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای ﷻ فەرموویەتی: ئەمن زۆر لەوە بێنیازترم کە هاوبەشم هەبێت، جا هەر کەسێک کارو کردەوەیەک بکات جگە لە من بکاتە هاوبەشی کردەوەکەی ئەوە من لێی بەریئم و کردەوەکەش بۆ ئەوەیە کە کردوویەتیە هاوبەش.

٤٢٠٣- عَنْ أَبِي سَعْدِ بْنِ أَبِي فَضَالَةَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، وَكَانَ مِنَ الصَّحَابَةِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا جَمَعَ اللَّهُ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لِيَوْمٍ لَا رَيْبَ فِيهِ، نَادَى مُنَادٍ: مَنْ كَانَ أَشْرَكَ فِي عَمَلٍ عَمِلَهُ لِلَّهِ، فَلْيَطْلُبْ ثَوَابَهُ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ، فَإِنَّ اللَّهَ أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ»[٢].

واتە: ئەبو سەعدی کوڕی ئەبو فەزاڵەی ئەنصاڕیی ﷺ کە یەکێک بووە لە هاوەڵان دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک خوا سەرەتاو کۆتایی کۆکردەوە لە ڕۆژی قیامەتدا کە هیچ شک و گومانێکی تێدا نیە، ئەوە جاڕچییەک جاڕ دەدات (و دەڵێ): هەر کەسێک کردەوەیەکی کردوە کە هاوبەشی بۆ خوا تێدا بڕیارداوە، ئەوە با بچێ داوای پاداشت لە جگە لە خوا بکات، چونکە خوا زۆر لەوە بێنیازترە کە هاوبەشی هەبێت.

٤٢٠٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ، فَقَالَ: «أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِمَا هُوَ أَخْوَفُ عَلَيْكُمْ عِنْدِي مِنَ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ؟» قَالَ: قُلْنَا: بَلَى، فَقَالَ: «الشِّرْكُ الْخَفِيُّ، أَنْ يَقُومَ الرَّجُلُ يُصَلِّي، فَيُزَيِّنُ صَلَاتَهُ، لِمَا يَرَى مِنْ نَظَرِ رَجُلٍ»[٣].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ ناومان، لەوکاتەدا ئێمە باسی مەسیحی دەجالمان دەکرد، ئەویش فەرمووی: ئایا هەواڵی ئەو شتەتان

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٩٨٥.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٣١٥٤.

(٣) حسن.

پێ نەدەم کە لە مەسیحی دەجال زیاتر لێی دەترسم بەسەرتان بێت؟ گوتی: ئێمەش گوتمان: بەڵێ هەواڵمان پێبدە، ئەویش فەرمووی: هاوبەش پەیداکردنی شاراوەو نادیار (ئەویش ئەوەیە کە): پیاو هەستێ بە ئەنجامدانی نوێژێکی جوان و ڕێک و پێک و بۆ بەرچاوی پیاوێک کە چاوی لێیەتی و دەیبینێ.

**٤٢٠٥- عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَتَخَوَّفُ عَلَى أُمَّتِي، الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، أَمَا إِنِّي لَسْتُ أَقُولُ يَعْبُدُونَ شَمْسًا، وَلَا قَمَرًا، وَلَا وَثَنًا، وَلَكِنْ أَعْمَالًا لِغَيْرِ اللَّهِ، وَشَهْوَةً خَفِيَّةً»**[1].

واتە: شەددادی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ترسناکترین شتێک کە لە ئوممەتەکەم لێی دەترسم هاوبەش دانانە بۆ خوا، بەڵام خۆ ئەمن ناڵێم ڕۆژو مانگ و بت دەپەرستن، بەڵکو کارو کردەوە لەبەر خاتری جگە لە خوا ئەنجامدەدەن و شوێن ئارەزووەکان دەکەون بە دزییەوە.

**٤٢٠٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ يُسَمِّعْ يُسَمِّعِ اللَّهُ بِهِ، وَمَنْ يُرَاءِ يُرَاءِ اللَّهُ بِهِ»**[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک بەدوای ناوبانگدا بگەڕێ، خوا ناوی دەزڕێنێ، هەرکەسێک ڕووپامایی بکات، خوا ئاشکرای دەکات.

**٤٢٠٧- عَنْ جُنْدَبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ يُرَاءِ يُرَاءِ اللَّهُ بِهِ، وَمَنْ يُسَمِّعْ يُسَمِّعِ اللَّهُ بِهِ»**[3].

واتە: جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک ڕووپامایی بکات، خوا ئاشکرای دەکات، هەرکەسێک بەدوای ناوبانگدا بگەڕێ، خوا ناوی دەزڕێنێ.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٣٨١ بزيادة «مَنْ لاَ يَرْحَمِ النَّاسَ لاَ يَرْحَمْهُ اللَّهُ».

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٩٩، ومسلم: ٢٩٨٧.

## بابەت: ئیرەیی بردن

٤٢٠٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، فَسَلَّطَهُ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ حِكْمَةً، فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەسوودی دروست نیە تەنها لە دوو شتدا نەبێت: پیاوێک خوا ماڵ و سامانی پێداوەو زاڵی کردوە بەسەریداو لەپێناوی خوا بەهەق سەرفی دەکات، وە پیاوێکیش خوا زانایی و دانایی پێداوەو ئەویش هەقی خۆی پێدەدات و وەکو خۆی جێبەجێی دەکات و خەڵکیتر فێردەکات.

٤٢٠٩- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ، فَهُوَ يَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ، وَآنَاءَ النَّهَارِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ، وَآنَاءَ النَّهَارِ»[٢].

واتە: سالیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەسوودی دروست نیە تەنها لە دوو شتدا نەبێت: پیاوێک بە فەزڵی خوا فێری قورئان خوێندن بووەو شەوو ڕۆژ دەیخوێنێ و کاری پێدەکات، وە پیاوێکیش خوا ماڵ و سامانی پێداوەو شەوو ڕۆژ دەیبەخشێت.

٤٢١٠- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «الْحَسَدُ يَأْكُلُ الْحَسَنَاتِ، كَمَا تَأْكُلُ النَّارُ الْحَطَبَ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ، كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ، وَالصَّلَاةُ نُورُ الْمُؤْمِنِ، وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ مِنَ النَّارِ»[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەسوودی بردن چاکەکانی خاوەنەکەی دەخوات وەکو چۆن ئاگر چڕو چیلکە دەسوتێنێ و دەیخوات، وە بەخشینیش هەڵەو تاوان دەکوژێنێتەوە هەر وەکو چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە، هەروەها نوێژ نوورو ڕووناکی بڕوادارە (لە دونیاو قیامەت) وە ڕۆژوو قەڵغانێکەو پارێزگارییەکە لە ئاگری دۆزەخ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٣، ومسلم: ٨١٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٥٢٩، ومسلم: ٨١٥، والترمذي: ١٩٣٦.

(٣) ضعيف.

## بابەت: ستەم و خەراپەکاری دەرهەق بە دروستکراوانی خوا

٤٢١١- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ ذَنْبٍ أَجْدَرُ أَنْ يُعَجِّلَ اللَّهُ لِصَاحِبِهِ الْعُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا، مَعَ مَا يَدَّخِرُ لَهُ فِي الْآخِرَةِ، مِنَ الْبَغْيِ، وَقَطِيعَةِ الرَّحِمِ»[1].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ گوناه و تاوانێک بە ئەندازەی ستەم و خەراپەکاری و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی شایەنتر نیە بەوەی کە خوا هەر لە دونیاداو زوو بە زوو خاوەنەکەی سزا بدات، لەگەڵ ئەوەی کە سزاو تۆڵەی بۆ قیامەتیش بۆ هەڵدەگیرێت.

٤٢١٢- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَسْرَعُ الْخَيْرِ ثَوَابًا الْبِرُّ، وَصِلَةُ الرَّحِمِ، وَأَسْرَعُ الشَّرِّ عُقُوبَةً، الْبَغْيُ، وَقَطِيعَةُ الرَّحِمِ»[2].

واتە: عائیشەی دایکی بڕواداران ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خێراترین پاداشتی چاکە پاداشتی کەسێکە کە چاکەکار بێ لەگەڵ خەڵکداو پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ بکات، وە خێراترین تۆڵەو سزا بۆ کەسانی ستەمکارو دەستدرێژکارەو ئەوانەشی کە پەیوەندی خزمایەتی دەپچڕێنن.

٤٢١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «حَسْبُ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ، أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مرۆڤ تەنها ئەوەندە خەراپەیەی بەسە کەوا برای مسوڵمانی بە کەم تەماشا بکات.

٤٢١٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا، وَلَا يَبْغِي بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٩٠٢، والترمذي: ٢٥١١.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٨١٨.

(٤) صحيح لغيره.

واته: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە بێگومان خوا وەحی بۆ ناردوومە کەوا خۆ بە کەمگربن و هەرگیز هیچ یەکێکتان ستەم لە یەکێکیتر نەکات.

## بابەت: پارێزکاری و خۆ پاراستن لە حەڵاڵ لەبەر نەکەوتنە ناو حەرام

**٤٢١٥- عَنْ عَطِيَّةَ السَّعْدِيِّ ﷺ، وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَبْلُغُ الْعَبْدُ أَنْ يَكُونَ مِنَ الْمُتَّقِينَ، حَتَّى يَدَعَ مَا لَا بَأْسَ بِهِ، حَذَرًا لِمَا بِهِ الْبَأْسُ»[1].**

واتە: عەتیەی سەعدیی ﷺ یەکێک بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرگیز بەندە ناگاتە ئەو پلە کامڵەی پارێزکاران «المتقین» تاکو واز لە شتێک نەهێنێ کە هیچ کێشەیەکی نیە بۆئەوەی خۆی بپارێزێ و لە ترسی ئەو شتەی کە خراپەو کێشەی تێدایە (واتە: بۆئەوەی توشی خەراپەو بەدکاری نەبێ و پارێزراو بێت، تەنانەت خۆی لە هەندێک شتی حەڵاڵیش دەپارێزێت، تاکو توشی حەرامەکە نەبێت، ئەوەش هەمووی بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا).

**٤٢١٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «كُلُّ مَخْمُومِ الْقَلْبِ، صَدُوقِ اللِّسَانِ»، قَالُوا: صَدُوقُ اللِّسَانِ، نَعْرِفُهُ، فَمَا مَخْمُومُ الْقَلْبِ؟ قَالَ: «هُوَ التَّقِيُّ النَّقِيُّ، لَا إِثْمَ فِيهِ، وَلَا بَغْيَ، وَلَا غِلَّ، وَلَا حَسَدَ»[2].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕ ﷺ دەڵێ: بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوترا: باشترینی خەڵکی کێیە؟ فەرمووی: ئەو کەسەی دڵی پاک و بێگەردەو زمانیشی ڕاستبێژە، گوتیان: «صدوق اللسان» (واتە: ڕاستگۆ) دەزانین، بەڵام «مخموم القلب» چییەو کێیە؟ فەرمووی: ئەو کەسەیە پارێزکارو دڵپاکەو دڵی گوناهی تێدا نیەو ستەم و ڕق و کینەو حەسوودی لەناو دڵیدا بوونی نیە.

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٤٥١.

(٢) صحيح.





٤٢١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أَبَا هُرَيْرَةَ كُنْ وَرِعًا، تَكُنْ أَعْبَدَ النَّاسِ، وَكُنْ قَنِعًا، تَكُنْ أَشْكَرَ النَّاسِ، وَأَحِبَّ لِلنَّاسِ مَا تُحِبُّ لِنَفْسِكَ، تَكُنْ مُؤْمِنًا، وَأَحْسِنْ جِوَارَ مَنْ جَاوَرَكَ، تَكُنْ مُسْلِمًا، وَأَقِلَّ الضَّحِكَ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی ئەبو هورەیرە بە کەم ڕازیبە (تەنها حەڵاڵت بوێ)، ئەوکات دەبیە باشترین خواپەرست، وە بە بەشی خۆت ڕازیبە، دەبیە سوپاسگوزارترین کەس، وە هەرچی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ خەڵکیش پێت خۆش بێت، دەبیتە بڕوادار، وە لەگەڵ ئەو کەسەی کە دراوسێتە باش و چاکەکاربە، دەبیتە مسوڵمان، وە کەمتر پێبکەنە چونکە پێکەنینی زۆر دڵ دەمرێنێت.

٤٢١٨- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا عَقْلَ كَالتَّدْبِيرِ، وَلَا وَرَعَ كَالْكَفِّ، وَلَا حَسَبَ كَحُسْنِ الْخُلُقِ»[٢].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عەقڵ بە تەنها وەکو بیرکردنەوە نابێ لە ئەنجامی کارو بارێک کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات، وە دونیا بە کەم سەیرکردن و دەستبەرداربوونی خۆشییەکانی دونیا وەکو ئەوە نابێ کە دەست لە قەدەغەکراوەکان هەڵبگرێ، وە گەورەیی ڕەچەڵەک و دەوڵەمەندی وەکو گەورەیی ڕەفتارو ئاکاری جوان نابێت.

٤٢١٩- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْحَسَبُ الْمَالُ، وَالْكَرَمُ التَّقْوَى»[٣].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گەورەیی و ڕەسەنایەتی لای خەڵکی دونیایی ماڵ و سامانە، وە گەورەیی و ڕێزو شکۆ لە دیندا پارێزکارییە.

٤٢٢٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَعْرِفُ كَلِمَةً - وَقَالَ عُثْمَانُ: آيَةً - لَوْ أَخَذَ النَّاسُ كُلُّهُمْ بِهَا لَكَفَتْهُمْ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَّةُ آيَةٍ؟ قَالَ: «﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ ﴾ الطلاق»[٤].

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٣٠٥.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٣٢٧١.

(٤) ضعيف.



واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەلیمەیەک دەزانم - وە عوسمان گوتی: ئایەتێک - خۆ ئەگەر خەڵکی دەستی پێوە بگرن و کاری پێبکەن ئەوە بەسیانە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کامە ئایەتەیە؟ فەرمووی: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢﴾ الطلاق، واتە: وە هەرکەسێک خواناس بێت، خوا دەرووی لێ دەکاتەوە.

## بابەت: پیاهەڵدان بە چاکە

**٤٢٢١- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي زُهَيْرٍ الثَّقَفِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالنَّبَاوَةِ، أَوِ الْبَنَاوَةِ، قَالَ: وَالنَّبَاوَةُ مِنَ الطَّائِفِ، قَالَ: «يُوشِكُ أَنْ تَعْرِفُوا أَهْلَ الْجَنَّةِ، مِنْ أَهْلِ النَّارِ»، قَالُوا: بِمَ ذَاكَ؟ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «بِالثَّنَاءِ الْحَسَنِ، وَالثَّنَاءِ السَّيِّئِ، أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ»[1].**

واتە: ئەبو بەکری کوڕی ئەبو زوهەیری سەقەفیی لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە «النباوة» کە شوێنێکە لە تائیف وتاری بۆمان دەفەرموو، جا فەرمووی: زۆر نزیکە بتوانن ئەهلی بەهەشت لە دۆزەخییەکان جیابکەنەوەو بیانناسن؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جا ئەوە بە چی؟ فەرمووی: بە باسکردن و پیاهەڵدانی جوان و باشەو پیاهەڵدانی ناشیرین و خراپ، (چونکە) ئێوە گەواهیدەری خوان بەسەر یەکتریەوە (واتە: ئەگەر کەسێک خەڵکی مسوڵمان و چاکەکار شاهێدی چاکەی بۆ بدەن ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئەهلی بەهەشتە، وە ئەگەر بە خەراپەش شاهێدی بۆ بدەن ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئەهلی دۆزەخە).

**٤٢٢٢- عَنْ كُلْثُومٍ الْخُزَاعِيِّ ﷺ، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ لِي أَنْ أَعْلَمَ إِذَا أَحْسَنْتُ أَنِّي قَدْ أَحْسَنْتُ، وَإِذَا أَسَأْتُ أَنِّي قَدْ أَسَأْتُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَالَ جِيرَانُكَ: قَدْ أَحْسَنْتَ، فَقَدْ أَحْسَنْتَ، وَإِذَا قَالُوا: إِنَّكَ قَدْ أَسَأْتَ، فَقَدْ أَسَأْتَ»[2].**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح.

واتە: کولسومی خوزاعیی ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بزانم کە چاکەیەکم کرد بە چاکە ئەژمار بکرێت؟ وە ئەگەر خەراپەیەکم کرد بە خەراپە ئەژمار بکرێت؟ ئەویش فەرمووی: هەر کاتێک دراوسێکەت گوتی: بەڕاستی چاکەت کردوەو کارەکەت چاکە، ئەوە بێگومان چاکەت کردوە، وە هەرکات گوتیان: بەڕاستی خەراپەت کردوەو خەراپەکاری، ئەوە بێگومان کارێکی خەراپت کردوە یان خەراپەکاریت کردوە.

**٤٢٢٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: كَيْفَ لِي أَنْ أَعْلَمَ إِذَا أَحْسَنْتُ، وَإِذَا أَسَأْتُ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا سَمِعْتَ جِيرَانَكَ يَقُولُونَ: أَنْ قَدْ أَحْسَنْتَ، فَقَدْ أَحْسَنْتَ، وَإِذَا سَمِعْتَهُمْ يَقُولُونَ: قَدْ أَسَأْتَ، فَقَدْ أَسَأْتَ»[1].**

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پیاوێک بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: چۆن بزانم کە چاکەم کردوە یان خەراپە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر گوێت لە دراوسێکانت بوو کە تۆ چاکەت کردوە ئەوە بێگومان چاکەت کردوە (چاکەکاری)، وە ئەگەر گوێت لێیان بوو کە خەراپەت کردوە (بە خەراپە باسیان کردی)، ئەوە دیارە کە خەراپەت کردوە (خەراپەکاری).

**٤٢٢٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَهْلُ الْجَنَّةِ، مَنْ مَلأَ اللَّهُ أُذُنَيْهِ مِنْ ثَنَاءِ النَّاسِ خَيْرًا، وَهُوَ يَسْمَعُ، وَأَهْلُ النَّارِ، مَنْ مَلأَ اللَّهُ أُذُنَيْهِ مِنْ ثَنَاءِ النَّاسِ شَرًّا، وَهُوَ يَسْمَعُ»[2].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی بەهەشت ئەوانەن کە خوا گوێچکەی پڕ بکات لە پیاهەڵدانی باشەی خەڵکی (لە ژیانیدا) ئەویش بیبیستێ، وە خەڵکی دۆزەخ ئەوانەن کەوا خوا گوێچکەی پڕبکات لە باسی کەسەکە بە خەراپەو ئەویش بیبیستێ.

**٤٢٢٥- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ لَهُ: الرَّجُلُ يَعْمَلُ الْعَمَلَ لِلَّهِ، فَيُحِبُّهُ النَّاسُ عَلَيْهِ، قَالَ: «ذَلِكَ عَاجِلُ بُشْرَى الْمُؤْمِنِ»[3].**

---

(١) صحيح.

(٢) حسن.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٤٢.

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە پێغەمبەرم ﷺ گوت: پیاوێک کارو کردەوەیەک لەبەر ڕەزامەندی خوا دەکات کەچی خەڵکیش لەسەر ئەو کارە خۆشیان دەوێ (مەدح و سەنای دەکەن)؟ فەرمووی: ئەو مژدەی خێرایە (پێش قیامەت) بۆ کەسی بڕوادار.

٤٢٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَعْمَلُ الْعَمَلَ فَيُطَّلَعُ عَلَيْهِ، فَيُعْجِبُنِي، قَالَ: «لَكَ أَجْرَانِ، أَجْرُ السِّرِّ، وَأَجْرُ الْعَلَانِيَةِ»[1].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جار هەیە کارێک دەکەم و دواتر خەڵکی پێی دەزانن و ئاشکرا دەبێت، منیش پێمخۆشەو دڵم پێی خۆشە؟ فەرمووی: دووجار پاداشتت هەیە: پاداشتی ئەوەی کە بە نهێنی کردووتەو پاداشتی ئەوەی کە ئاشکرا بووە (کەواتە پەیوەندی بە نیەت و مەبەستی خودی کەسەکەوە هەیە، مادام بۆ ڕەزامەندی خوایە ئەگەر ئاشکراش بێ هەر پاداشتی هەیە).

## بابەت: نیەت لە کردەوەدا

٤٢٢٧- عَن عَلْقَمَةَ بْنَ وَقَّاصٍ يَقُولُ: إِنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، وَهُوَ يَخْطُبُ النَّاسَ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَلِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ، وَإِلَى رَسُولِهِ، فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ، وَإِلَى رَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»[2].

واتە: لە عەلقەمەی کوڕی وەقاصەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە لە عومەری کوڕی خەتتابەوە گێڕاویەتەوە کە وتاری بۆ خەڵکی دەداو گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کردەوە تەنها بە نیەتە، وە هەر کەسێکیش بە گوێرەی نیەتەکەی پاداشت وەردەگرێت، جا هەر کەسێک کۆچکردنەکەی لەبەر ڕەزامەندی خواو یارمەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ بێت، ئەوە کۆچەکەی بۆ ڕەزامەندی خواو لەگەڵ بوونی

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٣٨٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١، ومسلم: ١٩٠٧، وأبو داود: ٢٢٠١، والترمذي: ١٦٤٧، والنسائي: ٧٥ و ٣٤٣٧ و ٣٧٩٤.

پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، وە هەر کەسێک کۆچکردنەکەی بۆ مەبەستێکی دونیایی بێ تاکو لە ڕێگایەوە بە دەستی بێنێ یان بۆ گەیشتن بە زەواجی ئافرەتێک بێ ئەوە کۆچکردنەکەی بە گوێرەی ئەو شتەیەو بە گوێرەی ئەو شتە پاداشت دەدرێتەوە کە لەپێناویدا کۆچی کردوە.

**٤٢٢٨- عَنْ أَبِي كَبْشَةَ الْأَنَّمَارِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ هَذِهِ الْأُمَّةِ، كَمَثَلِ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ، رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا وَعِلْمًا، فَهُوَ يَعْمَلُ بِعِلْمِهِ فِي مَالِهِ، يُنْفِقُهُ فِي حَقِّهِ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ عِلْمًا، وَلَمْ يُؤْتِهِ مَالًا، فَهُوَ يَقُولُ: لَوْ كَانَ لِي مِثْلُ هَذَا عَمِلْتُ فِيهِ مِثْلَ الَّذِي يَعْمَلُ». قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَهُمَا فِي الْأَجْرِ سَوَاءٌ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا، وَلَمْ يُؤْتِهِ عِلْمًا، فَهُوَ يَخْبِطُ فِي مَالِهِ يُنْفِقُهُ فِي غَيْرِ حَقِّهِ، وَرَجُلٌ لَمْ يُؤْتِهِ اللَّهُ عِلْمًا، وَلَا مَالًا، فَهُوَ يَقُولُ: لَوْ كَانَ لِي مِثْلُ هَذَا، عَمِلْتُ فِيهِ مِثْلَ الَّذِي يَعْمَلُ». قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَهُمَا فِي الْوِزْرِ سَوَاءٌ»[1].**

واتە: ئەبو کەبشەی ئەنماریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وێنەو نمونەی ئەو ئوممەتە وەکو وێنە هێنانەوەیە بە چوار کەس: پیاوێک کەوا خوا زانست و سامانی پێداوە، ئەویش بە زانست و زانیارییەکەی ماڵ و سامانەکەی بەکاردێنێ و لە شوێنی خۆیدا دەیبەخشێت، وە پیاوێکیش خوا زانستی پێداوە بەڵام سامانی پێنەداوە، ئەویش دەڵێ: ئەگەر منیش وەکو ئەو کەسە (کەسی یەکەم) ماڵ و سامانم ببوایە هەمان ئەو کارەم پێدەکرد کە ئەو دەیکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو دووانە هەردووکیان لە پاداشتدا وەکو یەکن، وە پیاوێک خوا ماڵ و سامانی پێداوە بەڵام زانستی پێنەداوەو ماڵەکەی لە شتی پڕوپوچدا بەکاردێنی و لە شوێنی خۆیدا سەرفی ناکات، وە پیاوێکیش خوا نە زانست و نە ماڵی پێنەداوە، ئەویش دەڵێ: ئەگەر وەکو ئەو کەسە (کەسی سێهەم) سامانم هەبوایە ئەوە هەر ئەو کارەم پێدەکرد کە ئەو دەیکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو دووانەش هەردووکیان لە تاواندا یەکسانن (چونکە عەزمی جەزم کردوە کە هەمان ڕەفتار دەکات، نەک لەسەر تاوانی کەسی بەرانبەر!!).

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٣٢٥.

٤٢٢٨م- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ الْمَرْوَزِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ قَالَ: أَنْبَأَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ، عَنِ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، ح وحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ مُفَضَّلٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ، عَنِ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ، عَنْ أَبِيهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[١].

واته: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

٤٢٢٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا يُبْعَثُ النَّاسُ عَلَى نِيَّاتِهِمْ»[٢].

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا لەسەر نیەتیان زیندوو دەکرێنەوە (حیساب و لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکرێت).

٤٢٣٠- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى نِيَّاتِهِمْ»[٣].

واته: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا بە گوێرەی نیەتەکانیان لێپێچینەوەو حیسابیان لەگەڵ دەکرێت.

## بابەت: هیوا درێژی و مردن

٤٢٣١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ خَطَّ خَطًّا مُرَبَّعًا، وَخَطًّا وَسَطَ الْخَطِّ الْمُرَبَّعِ وَخُطُوطًا إِلَى جَانِبِ الْخَطِّ الَّذِي وَسَطَ الْخَطِّ الْمُرَبَّعِ، وَخَطًّا خَارِجًا مِنَ الْخَطِّ الْمُرَبَّعِ، فَقَالَ: «أَتَدْرُونَ مَا هَذَا؟» قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «هَذَا الْإِنْسَانُ الْخَطُّ الْأَوْسَطُ، وَهَذِهِ الْخُطُوطُ إِلَى جَنْبِهِ الْأَعْرَاضُ تَنْهَشُهُ - أَوْ تَنْهَسُهُ - مِنْ كُلِّ مَكَانٍ، فَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا أَصَابَهُ هَذَا، وَالْخَطُّ الْمُرَبَّعُ، الْأَجَلُ الْمُحِيطُ، وَالْخَطُّ الْخَارِجُ الْأَمَلُ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٣٢٥.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٨٧٨.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤١٧، والترمذي: ٢٤٥٤.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ چوارگۆشەیەکی کێشا، وە هێڵێکی لە ناوەڕاستی چوارگۆشەکەدا کێشا، وە چەند خەت و هێڵێکی لە ئەولاو لای هێڵی ناو چوارگۆشەکە کێشا، وە هێڵێکیشی لە دەرەوەی چوارگۆشەکە کێشا، ئنجا فەرمووی: ئایا دەزانن ئەوە (نەخشەی چییە)؟ گوتیان: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: خەتی ناوەڕاست مرۆڤ خۆیەتی، ئەو وردە خەتانەی چواردەوری بەڵاو ناخۆشی و ئازارەکانی سەر ڕێگانی کە لە هەر چوار دەوری پەلاماری دەدەن و دەیگرن، جا ئەگەر لە یەکێکیانی ڕزگاری بوو توشی ئەویتر دەبێت، چوارگۆشەکەش ئەجەل و مردنە دەوری مرۆڤەکەی داوە، خەتی دەرەوەی چوار گۆشەکەش هیواو ئاواتەکانییەتی (واتە: هیواو ئاواتەکانی مرۆڤ ئەوەندە زۆرو لەبن نەهاتوون کە لەو تەمەنە کورتەدا قەت بە هەموویان ناگات و لە دەرەوەی تەمەنی ئەودان).

**٤٢٣٢- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَذَا ابْنُ آدَمَ، وَهَذَا أَجَلُهُ عِنْدَ قَفَاهُ»، وَبَسَطَ يَدَهُ أَمَامَهُ، ثُمَّ قَالَ: «وَثَمَّ أَمَلُهُ»[١].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوە مرۆڤەو ئەوەش مردنەکەیەتی کە لە پشتەملیەتی، جا دەستەکانی بۆ پێش خۆی ڕاکێشاو پاشان فەرمووی: وە هیواو ئاواتەکانیشی ئا لەوێن (واتە: مردن نزیکترە لە گەیشتن بەو هەموو هیواو ئاواتانەی کە لە پێشیەوە هەیە).

**٤٢٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «قَلْبُ الشَّيْخِ شَابٌّ فِي حُبِّ اثْنَتَيْنِ: فِي حُبِّ الْحَيَاةِ، وَكَثْرَةِ الْمَالِ»[٢].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دڵی مرۆڤی پیرو بە تەمەن لە خۆشەویستی دوو شتدا گەنجەو پیر نابێت: لە خۆشەویستی بۆ ژیان و مانەوە لە دونیادا، وە لە (حەزکردن و خۆشویستنی) زۆری سەروەت و سامان.

**٤٢٣٤- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَهْرَمُ ابْنُ آدَمَ، وَيَشِبُّ مِنْهُ اثْنَتَانِ: الْحِرْصُ عَلَى الْمَالِ، وَالْحِرْصُ عَلَى الْعُمُرِ»[٣].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤١٨، والترمذي: ٢٣٣٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٢٠، ومسلم: ١٠٤٦، والترمذي: ٢٣٣٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٤٢١، ومسلم: ١٠٤٧، والترمذي: ٢٣٣٩ و ٢٤٥٥.

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئادەمیزاد بەرەو پیری دەچێ و پیر دەبێ لەکاتێکدا کە دوو شت هەیە تێیدا گەنج دەبێتەوە: سووربوون لەسەر بەدەستهێنانی ماڵ و سامان، وە سووربوون لەسەر تەمەنی درێژو زۆر ژیان.

٤٢٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَوْ أَنَّ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَيْنِ مِنْ مَالٍ، لَأَحَبَّ أَنْ يَكُونَ مَعَهُمَا ثَالِثٌ، وَلَا يَمْلَأُ نَفْسَهُ إِلَّا التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئادەمیزاد پڕی دوو شیو ماڵ و سامانی هەبێ ئەوە حەتمەن پێی خۆشە سێهەمیشی (شیوێکی تری) لەگەڵیاندا هەبوایە، لەکاتێکدا کە تەنها گڵ دەتوانێ نەفسی ئینسان پڕبکاتەوە، وە خوا تۆبە لە کەسێک وەردەگرێ کە تۆبە بکات.

٤٢٣٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «أَعْمَارُ أُمَّتِي مَا بَيْنَ السِّتِّينَ، إِلَى السَّبْعِينَ، وَأَقَلُّهُمْ مَنْ يَجُوزُ ذَلِكَ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەمەنی ئوممەتەکەم لەنێوان شەست تاکو حەفتا ساڵدایە، وە کەمتریان هەیە کە لەو تەمەنە تێپەڕێت.

## بابەت: بەردەوامی لەسەر کارو کردەوە

٤٢٣٧- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، قَالَتْ: «وَالَّذِي ذَهَبَ بِنَفْسِهِ ﷺ مَا مَاتَ حَتَّى كَانَ أَكْثَرُ صَلَاتِهِ وَهُوَ جَالِسٌ، وَكَانَ أَحَبَّ الْأَعْمَالِ إِلَيْهِ الْعَمَلُ الصَّالِحُ، الَّذِي يَدُومُ عَلَيْهِ الْعَبْدُ، وَإِنْ كَانَ يَسِيرًا»[3].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەڵێ: سوێند بەو زاتەی گیانی لێ وەرگرتەوە، پێغەمبەر ﷺ نەمرد تاکو وای لێهات کە زۆربەی نوێژەکانی بە دانیشتنەوە دەکرد، وە خۆشەویستترین کردەوەش بەلایەوە ئەو کردەوە چاکەیە بوو کە بەندە لەسەری بەردەوام بوو دەیکرد ئەگەرچی کەم و ئاسانیش بوایە.

---

(١) صحيح.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٣٣١ و ٣٥٥٠.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ١٦٥٤ و ١٦٥٥.

٤٢٣٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَتْ عِنْدِي امْرَأَةٌ، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: «مَنْ هَذِهِ؟» قُلْتُ: فُلَانَةُ، لَا تَنَامُ تَذْكُرُ مِنْ صَلَاتِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَهْ، عَلَيْكُمْ بِمَا تُطِيقُونَ، فَوَاللَّهِ لَا يَمَلُّ اللَّهُ حَتَّى تَمَلُّوا»، قَالَتْ: وَكَانَ أَحَبَّ الدِّينَ إِلَيْهِ الَّذِي يَدُومُ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئافرەتێکم لەلابوو لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ماڵەکەم، ئنجا فەرمووی: ئەوە کێیە؟ گوتم: فڵانە ئافرەتەیە کە ناخەوێ (باسی نوێژکردنەکانی دەکرد)، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێدەنگ! ئەوەتان لەسەرە کە لە تواناتاندایە، خۆ سوێند بە زاتی الله خوا لێتان بێزار نابێ تا خۆتان مل بانەدەن و بێزارنەبن، (عائیشە) گوتی: خۆشەویسترین و پەسەندترین دینداری لای پێغەمبەر ﷺ ئەو کردەوەیە بوو کە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام دەبوو.

٤٢٣٩- عَنْ حَنْظَلَةَ الْكَاتِبِ التَّمِيمِيِّ الْأُسَيِّدِيِّ ﵁، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَّرَنَا الْجَنَّةَ، وَالنَّارَ، حَتَّى كَأَنَّا رَأْيَ الْعَيْنِ، فَقُمْتُ إِلَى أَهْلِي، وَوَلَدِي فَضَحِكْتُ، وَلَعِبْتُ، قَالَ: فَذَكَرْتُ الَّذِي كُنَّا فِيهِ، فَخَرَجْتُ، فَلَقِيتُ أَبَا بَكْرٍ، فَقُلْتُ: نَافَقْتُ، نَافَقْتُ، فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ: إِنَّا لَنَفْعَلُهُ، فَذَهَبَ حَنْظَلَةُ، فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: فَقَالَ: «يَا حَنْظَلَةُ لَوْ كُنْتُمْ كَمَا تَكُونُونَ عِنْدِي، لَصَافَحَتْكُمُ الْمَلَائِكَةُ عَلَى فُرُشِكُمْ، أَوْ عَلَى طُرُقِكُمْ، يَا حَنْظَلَةُ سَاعَةً، وَسَاعَةً»[2].

واتە: حەنزەڵەی کاتیبی تەمیمی ئوسەیدیی ﵁ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، باسی بەهەشت و دۆزەخمان کرد، بەجۆرێک وەکو بە چاو ببینین، ئنجا هەستام چوومەوە لای مناڵ و خێزانم، جا (لەگەڵیان) پێکەنیم و گاڵتەمکرد، گوتی: ئەوجار ئەو حاڵەتەم بەبیرهاتەوە کە تێیدا بووین، بۆیە ڕۆیشتمە دەرەوەو توشی ئەبو بەکر بووم، منیش گوتم: دووڕوو بووم، دووڕوو بووم، ئەبو بەکریش گوتی: ئێمەش گاڵتەو قسەی خۆش دەکەین، ئنجا حەنزەلە چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو باسەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ئەی حەنزەلە جا ئەگەر ئێوە هەمیشە وەکو ئەو کاتەبن کە لەلای منن، ئەوە مەلائیکە لەسەر جێگاکانتان یان لەسەر ڕێگاو بانتان تۆقەیان لەگەڵ دەکردن، ئەی حەنزەلە ساتێک ئاواو ساتێک ئاوا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣، ومسلم: ٧٨٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٥٠، والترمذي: ٢٤٥٢بنحوه و ٢٥١٤.

٤٢٤٠- عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ الْأَعْرَجُ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اكْلَفُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ، فَإِنَّ خَيْرَ الْعَمَلِ أَدْوَمُهُ، وَإِنْ قَلَّ»[١].

واتە: عەبدوڕەحمانی ئەعرەج دەڵێ: گوێم لە ئەبو هوڕەیرە ﷺ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە ئەندازەی تواناتان بە کارو کردەوە هەستن، چونکە لە ڕاستیدا چاکترین کردەوە ئەوەیە کە بەردەوام بێ ئەگەر کەمیش بێت.

٤٢٤١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى رَجُلٍ يُصَلِّي عَلَى صَخْرَةٍ، فَأَتَى نَاحِيَةَ مَكَّةَ، فَمَكَثَ مَلِيًّا، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَوَجَدَ الرَّجُلَ يُصَلِّي عَلَى حَالِهِ، فَقَامَ فَجَمَعَ يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ بِالْقَصْدِ» ثَلَاثًا «فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای پیاوێکدا ڕەتبوو کە لەسەر بەردێک نوێژی دەکرد، جا (پێغەمبەر ﷺ) بۆ لایەکی مەککە چوو ماوەیەکی پێچوو پاشان گەڕایەوە، جا دیتی کابرا بەهەمان شێوەی پێشوو خەریکی نوێژکردنە، بۆیە هەستاو دەستەکانی کۆکردەوەو فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئێوە لەسەرتانە کە ناوەندگیر بن (نە کەمتەرخەم بن نە تێپەڕێن) سێ جار ئەوەی دووبارە کردەوە، چونکە بێگومان خوا لێتان بێزار نابێ تا خۆتان بێزار دەبن و واز دێنن.

## بابەت: گوناه و تاوان

٤٢٤٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنُؤَاخَذُ بِمَا كُنَّا نَعْمَلُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحْسَنَ فِي الْإِسْلَامِ، لَمْ يُؤَاخَذْ بِمَا كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَمَنْ أَسَاءَ، أُخِذَ بِالْأَوَّلِ وَالْآخِرِ»[٣].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لەسەر ئەو کردەوانەی کە لە سەردەمی نەزانیدا کردوومانن سزا دەدرێین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک لە سەردەمی مسوڵمان بوونیداو لەناو ئیسلامدا چاکەکار بێ ئەوە لەسەر

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٩٢١، ومسلم: ١٢٠.

کردەوەی سەردەمی نەفامی سزا وەرناگرێت، وە هەر کەسێک خەراپ و خەراپەکار بێ ئەوە تاوانی ئەوەڵ و ئاخیری لەسەر ئەژمار دەکرێت.

**٤٢٤٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عَائِشَةُ إِيَّاكِ وَمُحَقَّرَاتِ الْأَعْمَالِ، فَإِنَّ لَهَا مِنَ اللَّهِ طَالِبًا»[1].**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: ئەی عائیشە ئاگاداری ئەو وردە کردەوانەبە کە پێتوایە کەم و بێبایەخن، لە ڕاستیدا ئەوانە لەلایەن خواوە حیساب بۆکراون و داوادەکرێنەوە.

**٤٢٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا أَذْنَبَ كَانَتْ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ فِي قَلْبِهِ، فَإِنْ تَابَ وَنَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ، صُقِلَ قَلْبُهُ، فَإِنْ زَادَ، زَادَتْ، فَذَلِكَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَهُ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ المطففين»[2].**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی مرۆڤی بڕوادار کاتێک تاوانێک دەکات پەڵەیەکی ڕەش لە دڵیدا دروست دەبێت، جا ئەگەر تۆبەی کردو وازی هێناو داوای لێخۆشبوونی کرد ئەوە دڵی پاک و ساف دەبێتەوە، خۆ ئەگەر زیاتر تاوانی کرد پەڵەکەش زیاد دەکات، بۆیە ئەوە ئەو مۆرەیە کە خوا لە قورئاندا باسی کردوە: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ المطففين، واتە: نەخێر وانیە بەڵکو ژەنگی ئەو (خراپانەی) کە دەیانکرد پەردەی هێناوە بەسەر دڵیاندا.

**٤٢٤٥- عَنْ ثَوْبَانَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «لَأَعْلَمَنَّ أَقْوَامًا مِنْ أُمَّتِي يَأْتُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِحَسَنَاتٍ أَمْثَالِ جِبَالِ تِهَامَةَ بِيضًا، فَيَجْعَلُهَا اللَّهُ ﷿ هَبَاءً مَنْثُورًا»، قَالَ ثَوْبَانُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ صِفْهُمْ لَنَا، جَلِّهِمْ لَنَا أَنْ لَا نَكُونَ مِنْهُمْ، وَنَحْنُ لَا نَعْلَمُ، قَالَ: «أَمَا إِنَّهُمْ إِخْوَانُكُمْ، وَمِنْ جِلْدَتِكُمْ، وَيَأْخُذُونَ مِنَ اللَّيْلِ كَمَا تَأْخُذُونَ، وَلَكِنَّهُمْ أَقْوَامٌ إِذَا خَلَوْا بِمَحَارِمِ اللَّهِ انْتَهَكُوهَا»[3].**

---

(١) صحيح.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٣٣٤.

(٣) صحيح.

واتە: سەوبان ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئاگادار دەبم و دەزانم کە خەڵکانێک هەیە لە ئوممەتی من لە ڕۆژی قیامەتدا دێن بە ئەندازەی کێوی تیهامە چاکەیان کردوە، خوای ﷻ چاکەکانیان دەکاتە تەپوتۆزی بەربا، سەوبان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان باس بکە بیانناسین، بۆئەوەی ئێمە لەوان نەبین و نەشزانین، فەرموی: ئەوان برای ئێوەن و لە ڕەچەڵەکی خۆتانن، ئەوانیش پەرستش دەکەن وەکو ئێوە شەونوێژ دەکەن، بەڵام ئەوانە کەسانێکن ئەگەر بە تەنیابوون و حەرامیان بۆ هەڵکەوت ئەوە سنوور دەبەزێنن و دەچنە ناو حەرامەوە.

**٤٢٤٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ، مَا أَكْثَرُ مَا يُدْخِلُ الْجَنَّةَ؟ قَالَ: «التَّقْوَى، وَحُسْنُ الْخُلُقِ». وَسُئِلَ مَا أَكْثَرُ مَا يُدْخِلُ النَّارَ؟ قَالَ: «الْأَجْوَفَانِ: الْفَمُ، وَالْفَرْجُ»[1].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا کە ئایا ئەوەی کە زیاتر دەبێتە مایەی چوونە بەهەشت چییە؟ فەرمووی: پارێزکاری و ڕەوشت جوانی، وە دەربارەی ئەوەی کە زیاتر دەبێتە مایەی چوونە دۆزەخ پرسیاری لێکرا، فەرمووی: دوو شتە ناو بۆشەکە: دەم و داوێن.

## بابەت: تەوبەو گەڕانەوە

**٤٢٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ أَحَدِكُمْ مِنْهُ بِضَالَّتِهِ، إِذَا وَجَدَهَا»[2].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوای ﷻ تەوبەو گەڕانەوەی هەر یەکێکتانی زۆر پێ خۆشترە لە ئەندازەی ئەو کەسەی کە شتێکی لێ ون دەبێ و کاتێ دەیبینێتەوە.

**٤٢٤٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَوْ أَخْطَأْتُمْ حَتَّى تَبْلُغَ خَطَايَاكُمُ السَّمَاءَ، ثُمَّ تُبْتُمْ، لَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ»[3].**

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٠٠٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم بإثر: ٢٧٤٣، والترمذي: ٣٥٣٨.

(٣) صحيح لغيره.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەڵەتان کرد بەجۆرێک تا قەبارەی هەڵەکانتان دەگاتە ئاسمان، پاشان تۆبەتان کرد، ئەوە خوا لێتان خۆش دەبێت.

**٤٢٤٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَلَّهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنْ رَجُلٍ أَضَلَّ رَاحِلَتَهُ، بِفَلَاةٍ مِنَ الْأَرْضِ، فَالْتَمَسَهَا، حَتَّى إِذَا أَعْيَا، تَسَجَّى بِثَوْبِهِ، فَبَيْنَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ سَمِعَ وَجْبَةَ الرَّاحِلَةِ حَيْثُ فَقَدَهَا، فَكَشَفَ الثَّوْبَ عَنْ وَجْهِهِ، فَإِذَا هُوَ بِرَاحِلَتِهِ»**[١].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا زۆر خۆشحاڵترە بە تەوبەی بەندەی لەو کەسەی کە لە بیابانێک وڵاخ و بارەکەی لێ ون دەبێ و بەدوایدا دەگەڕێ تاکو نائومێد دەبێت، پۆشاکەکەی بەسەر ڕوخساریدا دەدات، ئیتر لەناکاو لەوکاتەدا کە ئەو لەو حاڵەتە دایە گوێی لە دەنگی پێی وڵاخەکەی دەبێ هەر بەوجۆرەی کە لێی ونبووە دێتەوە، ئنجا پۆشاکەکەی لەسەر دەم و چاوی لادەبات تەماشا دەکات باربنەکەی خۆیەتی.

**٤٢٥٠- عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ، كَمَنْ لَا ذَنْبَ لَهُ»**[٢].

واتە: ئەبو عوبەیدەی کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی تۆبە لە گوناهەکانی دەکات وەکو ئەو کەسە وایە کە گوناهی نەبێت.

**٤٢٥١- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ»**[٣].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو ئادەمیزادێک هەڵە هەر دەکات، وە باشترینی ئەوانەی هەڵە دەکەن ئەو کەسانەن کە تەوبە دەکەن.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) حسن.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٤٩٩.

**٤٢٥٢- عَنِ ابْنِ مَعْقِلٍ ﵀، قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِي عَلَى عَبْدِ اللَّهِ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «النَّدَمُ تَوْبَةٌ»، فَقَالَ لَهُ أَبِي: أَنْتَ سَمِعْتَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «النَّدَمُ تَوْبَةٌ»، قَالَ: نَعَمْ»**[1].

واتە: ئیبنو مەعقیل ﵀ دەڵێ: لەگەڵ باوکمدا چووم بۆلای عەبدوڵڵا، جا گوێم لێبوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەشیمانی (لە هەڵەو تاوان) بریتیە لە تەوبەکردن، جا باوکم بە عەبدوڵڵای گوت: ئەتۆ بۆخۆت گوێت لە پێغەمبەر ﷺ بوو کە دەیفەرموو: پەشیمانی بریتیە لە تەوبەکردن؟ گوتی: بەڵێ.

**٤٢٥٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ لَيَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ، مَا لَمْ يُغَرْغِرْ»**[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە بێگومان خوای ﷻ تۆبەو گەڕانەوەی بەندەکەی وەردەگرێ مادام نەگەیشتبێتە سەرەمەرگ و ئاویلکەدان.

**٤٢٥٤- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرَ أَنَّهُ أَصَابَ مِنَ امْرَأَةٍ قُبْلَةً، فَجَعَلَ يَسْأَلُ عَنْ كَفَّارَتِهَا، فَلَمْ يَقُلْ لَهُ شَيْئًا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ١١٤ ﴾ هود، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِي هَذِهِ؟ فَقَالَ: «هِيَ لِمَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ أُمَّتِي»**[3].

واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو ئەوەی بۆ باسکرد کەوا توشی ماچکردنی ئافرەتێک بووە، بۆیە پرسیاری کەفارەتی ئەوەی لێکرد، پێغەمبەریش ﷺ هیچی پێ نەگوت، ئنجا خوای ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ١١٤ ﴾ هود، واتە: وە نوێژ ئەنجام بدە لەم سەرو ئەوسەری ڕۆژدا (لە بەیانیان و ئێواراندا) و لە بەشێک لە شەودا چونکە بەڕاستی (کردەوە) چاکەکان (کردەوە) خراپەکان

---

(١) صحيح.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٥٣٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٦، ومسلم: ٢٧٦٣/٣٩، والترمذي: ٣١١٤.

لادەبەن و دەیانسڕنەوە ئەوە پەندو ئامۆژگاریە بۆ پەند وەرگران. جا کابرا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا حوکمی ئەو ئایەتە بۆ منیشە؟ فەرمووی: ئەو ئایەتە بۆ هەر کەسێکە لە ئوممەتەکەم کاری پێبکات.

**٤٢٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «أَسْرَفَ رَجُلٌ عَلَى نَفْسِهِ، فَلَمَّا حَضَرَهُ الْمَوْتُ، أَوْصَى بَنِيهِ، فَقَالَ: إِذَا أَنَا مِتُّ فَأَحْرِقُونِي، ثُمَّ اسْحَقُونِي، ثُمَّ ذَرُّونِي فِي الرِّيحِ فِي الْبَحْرِ، فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَدَرَ عَلَيَّ رَبِّي لَيُعَذِّبُنِي عَذَابًا مَا عَذَّبَهُ أَحَدًا». قَالَ: «فَفَعَلُوا بِهِ ذَلِكَ، فَقَالَ لِلْأَرْضِ: أَدِّي مَا أَخَذْتِ، فَإِذَا هُوَ قَائِمٌ، فَقَالَ لَهُ: مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ؟ قَالَ: خَشْيَتُكَ أَوْ مَخَافَتُكَ يَا رَبِّ، فَغَفَرَ لَهُ لِذَلِكَ»**[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لە سەردەمانێکدا) پیاوێک زیادەڕەوی دەکات لە تاواندا، جا کاتێک مردنی لێ نزیک دەبێتەوەو دەگاتە سەرەمەرگ وەسیەت بۆ کوڕەکانی دەکات و دەڵێ: هەر کاتێک من مردم بمسوتێنن پاشان ئێسک و پروسکم بهاڕن و وردی بکەن، پاشان خۆڵەکەم لەسەر دەریا بدەن بەدەم باوە، خۆ سوێند بە زاتی الله ئەگەر پەروەردگارم بیهەوێ دەستی پێم بگات ئەوە سزاو ئازارێکم دەدات کە کەس بەوجۆرە سزاو ئازار نەدرابێت، فەرمووی: جا ئەوەی گوتی بۆیان جێبەجێکرد، ئنجا خوای پەروەردگار بە زەوی فەرموو: ئەوەی وەرتگرتووە لە بەشەکانی جەستەی ئەو ئینسانە بیدەوە، ئیتر کابرا زیندوو بۆوە، جا خوا پێی فەرموو: چی وای لە تۆ کرد ئەو کارە بکەی کە کردت؟ گوتی: ئەی پەروەردگارا لە ترس و سامی تۆ ئەوەم کرد، ئیتر خوا لەبەر ئەوە لێی خۆشبوو.

**٤٢٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «دَخَلَتِ امْرَأَةٌ النَّارَ فِي هِرَّةٍ، رَبَطَتْهَا فَلَا هِيَ أَطْعَمَتْهَا، وَلَا هِيَ أَرْسَلَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الْأَرْضِ، حَتَّى مَاتَتْ» قَالَ الزُّهْرِيُّ: لِئَلَّا يَتَّكِلَ رَجُلٌ وَلَا يَيْأَسَ رَجُلٌ**[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٨١، ومسلم: ٢٧٥٦، والنسائي: ٢٠٧٩.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم بإثر: ٢٧٥٦/٢٥.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتێک ڕۆیشتە ناو دۆزەخەوە لەسەر پشیلەیەک کە بەستبوویەوە، جا نە خواردنی پێدەداو نە لێشی دەگەڕاو بەرهەڵدای بکات پشیلەکە بۆخۆی لە جڕوجانەوەری سەر زەوی خواردن پەیدا بکات، هەتا پشیلەکە (لە برسان و لە تینوان) مرد. زوهری گوتی: تا کەسێ پاڵی لێ نەداتەوەو کەسێکی تریش بێهیوا نەبێت.

**٤٢٥٧- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى، يَقُولُ: يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ مُذْنِبٌ، إِلَّا مَنْ عَافَيْتُ، فَسَلُونِي الْمَغْفِرَةَ فَأَغْفِرَ لَكُمْ، وَمَنْ عَلِمَ مِنْكُمْ أَنِّي ذُو قُدْرَةٍ عَلَى الْمَغْفِرَةِ، فَاسْتَغْفَرَنِي بِقُدْرَتِي غَفَرْتُ لَهُ، وَكُلُّكُمْ ضَالٌّ، إِلَّا مَنْ هَدَيْتُ، فَسَلُونِي الْهُدَى أَهْدِكُمْ، وَكُلُّكُمْ فَقِيرٌ، إِلَّا مَنْ أَغْنَيْتُ، فَسَلُونِي أَرْزُقْكُمْ، وَلَوْ أَنَّ حَيَّكُمْ، وَمَيِّتَكُمْ، وَأَوَّلَكُمْ، وَآخِرَكُمْ، وَرَطْبَكُمْ، وَيَابِسَكُمُ اجْتَمَعُوا، فَكَانُوا عَلَى قَلْبِ أَتْقَى عَبْدٍ مِنْ عِبَادِي، لَمْ يَزِدْ فِي مُلْكِي جَنَاحُ بَعُوضَةٍ، وَلَوِ اجْتَمَعُوا فَكَانُوا عَلَى قَلْبِ أَشْقَى عَبْدٍ مِنْ عِبَادِي، لَمْ يَنْقُصْ مِنْ مُلْكِي جَنَاحُ بَعُوضَةٍ، وَلَوْ أَنَّ حَيَّكُمْ، وَمَيِّتَكُمْ، وَأَوَّلَكُمْ، وَآخِرَكُمْ، وَرَطْبَكُمْ، وَيَابِسَكُمُ اجْتَمَعُوا، فَسَأَلَ كُلُّ سَائِلٍ مِنْهُمْ مَا بَلَغَتْ أُمْنِيَّتُهُ، مَا نَقَصَ مِنْ مُلْكِي، إِلَّا كَمَا لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ مَرَّ بِشَفَةِ الْبَحْرِ، فَغَمَسَ فِيهَا إِبْرَةً، ثُمَّ نَزَعَهَا، ذَلِكَ بِأَنِّي جَوَادٌ مَاجِدٌ، عَطَائِي كَلَامٌ، إِذَا أَرَدْتُ شَيْئًا، فَإِنَّمَا أَقُولُ لَهُ: كُنْ فَيَكُونُ»[1].**

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای خاوەن دەسەڵات دەفەرمووێت: ئەی بەندەکانم ئێوە هەمووتان تاوانبارو سەرپێچیکارن مەگەر ئەوەی کە خۆم پاراستبێتم، بۆیە داوای لێخۆشبوونم لێ بکەن جا لێتان خۆش دەبم، وە هەر کەسێک بزانێ و پێی وابێ کەوا بە بێگومان من توانای لێخۆشبوونم هەیەو داوای لێخۆشبوونم لێبکات ئەوە لێی خۆش دەبم، وە هەمووتان سەرگەردان و سەرلێشێوانن مەگەر ئەوەی کە خۆم ڕێنوێنی بکەم، بۆیە داوای ڕێنوێنیم لێبکەن ڕێتان نیشان دەدەم، وە هەمووتان هەژارن مەگەر کەسێک من بێنیازی بکەم، بۆیە داوای ڕزق و ڕۆزی لە من بکەن ڕزقتان پێ دەدەم، وە ئەگەر مردو و زیندووتان و یەکەم کەستان تا کۆتا کەستان و گەنج و پیرتان هەر هەمووتان کۆببنەوە لەسەر دڵی بە تەقواترین بەندەیەک لە بەندەکانم ئەوە هیچ لە موڵک و دەسەڵاتی من زیاد ناکات بە ئەندازەی باڵە مێشوولەیەکیش، خۆ ئەگەر هەمووتان لەسەر دڵی بەدبەختترین و

---

(١) صحيح ولكن ضعيف بهذا السياق. أخرجه الترمذي: ٢٤٩٥ وهو عند مسلم: ٢٥٧٧ بنحوه.




خراپترین بەندەیەک لە بەندەکانم کۆببنەوە ئەوە بە ئەندازەی باڵە مێشوولەیەکیش لە موڵکی من کەم نابێتەوە، وە ئەگەر زیندو و مردووتان و یەکەم و کۆتا کەستان و گەنج و پیرتان هەمووتان کۆببنەوەو هەر یەکێکتان هەرچی بە خەیاڵیدا دێ داوای بکات (منیش هەموو داواکارییەکانتان پێبدەم) ئەوە هیچ لە موڵکی من کەم نابێتەوە مەگەر وەکو ئەوە وابێ کە یەکێکتان بەلای کەناری دەریایەکدا تێپەڕێ و دەرزییەک بکاتە ناو دەریاکەو پاشان بیهێنێتەوە دەرەوە (دەرزییەکە هیچ لە دەریاکە کەم ناکات و پێوەی دیار نیە)، ئەوەش لەبەر ئەوەیە چونکە من سەخی و بەخشندەو بەرزو شکۆدارم، بەخشینەکانم فەرمانکردنە، هەرکات ویستم شتێک بکەم تەنهاو تەنها پێی دەڵێم ببەو دەبێت.

## بابەت: مردن و خۆ ئامادەکردن بۆ مردن

**٤٢٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَادِمِ اللَّذَّاتِ»، يَعْنِي الْمَوْتَ[١].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زۆر یادی ئەو شتە بکەن کە خۆشییەکان لەناو دەبات و دەیپچڕێنێ، واتە: مردن.

**٤٢٥٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الْمُؤْمِنِينَ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا»، قَالَ: فَأَيُّ الْمُؤْمِنِينَ أَكْيَسُ؟ قَالَ: «أَكْثَرُهُمْ لِلْمَوْتِ ذِكْرًا، وَأَحْسَنُهُمْ لِمَا بَعْدَهُ اسْتِعْدَادًا، أُولَئِكَ الْأَكْيَاسُ»[٢].**

واتە: لە ئیبنو عومەر ﷺ گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم کە پیاوێک لە ئەنصارییەکان هاتە خزمەتی و سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پاشان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین بڕوادار کێیە؟ فەرمووی: ئەوەی کە جوانترین ڕەوشتی هەیە، گوتی: ئەدی ژیرترین بڕوادار کێیە؟ فەرمووی: ئەوەیان کە زۆرترین یادی مردن دەکات و بە جوانترین و باشترین شێوە خۆی بۆ دوای مردن ئامادە دەکات، ئا ئەوانە ژیرترینەکانن.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٣٠٧، والنسائي: ١٨٢٤.

(٢) حسن.

٤٢٦٠- عَنْ أَبِي يَعْلَى شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ، وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ الْمَوْتِ، وَالْعَاجِزُ، مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَهُ هَوَاهَا، ثُمَّ تَمَنَّى عَلَى اللَّهِ»[1].

واتە: ئەبو یەعلا شەددادی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ژیرو ئاقڵ ئەو کەسەیە سەرزەنشتی نەفسی خۆی بکات و جڵەوی بکات، وە کار بۆ دوای مردنی بکات، وە کەمتەرخەم و گەمژەو بێ توانا ئەو کەسەیە کەوا نەفسی دەکاتە شوێنەکەوتەی هەواو ئارەزووەکانی و پاشان بەتەمای سۆزو بەزەیی خوایە.

٤٢٦١- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، دَخَلَ عَلَى شَابٍّ وَهُوَ فِي الْمَوْتِ، فَقَالَ: «كَيْفَ تَجِدُكَ؟» قَالَ: أَرْجُو اللَّهَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَأَخَافُ ذُنُوبِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَجْتَمِعَانِ فِي قَلْبِ عَبْدٍ فِي مِثْلِ هَذَا الْمَوْطِنِ، إِلَّا أَعْطَاهُ اللَّهُ مَا يَرْجُو، وَآمَنَهُ مِمَّا يَخَافُ»[2].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ سەردانی گەنجێکی کرد، لەوکاتەدا لە سەرەمەرگدا بوو، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چۆن خۆت دەبینیتەوە (لەوکاتەدا)؟ گوتی: ئومێدم بە (میهرەبانی و لێخۆشبوونی) خوا هەیەو لە گوناهەکانیشم دەترسم، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو دوو شتە لەوکاتەدا لە دڵی هیچ بەندەیەکدا کۆنابنەوە، ئیللا خوا ئەوەی بەندەکە ئاواتی پێ دەخوازێ پێی دەدات، بەوەشی کە لێی دەترسێ دڵنیایی پێدەدات.

٤٢٦٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «الْمَيِّتُ تَحْضُرُهُ الْمَلَائِكَةُ، فَإِذَا كَانَ الرَّجُلُ صَالِحًا، قَالُوا: اخْرُجِي أَيَّتُهَا النَّفْسُ الطَّيِّبَةُ، كَانَتْ فِي الْجَسَدِ الطَّيِّبِ، اخْرُجِي حَمِيدَةً، وَأَبْشِرِي بِرَوْحٍ وَرَيْحَانٍ، وَرَبٍّ غَيْرِ غَضْبَانَ، فَلَا يَزَالُ يُقَالُ لَهَا ذَلِكَ حَتَّى تَخْرُجَ، ثُمَّ يُعْرَجُ بِهَا إِلَى السَّمَاءِ، فَيُفْتَحُ لَهَا، فَيُقَالُ: مَنْ هَذَا؟ فَيَقُولُونَ: فُلَانٌ، فَيُقَالُ: مَرْحَبًا بِالنَّفْسِ الطَّيِّبَةِ، كَانَتْ فِي الْجَسَدِ الطَّيِّبِ، ادْخُلِي حَمِيدَةً، وَأَبْشِرِي بِرَوْحٍ وَرَيْحَانٍ، وَرَبٍّ غَيْرِ غَضْبَانَ، فَلَا يَزَالُ يُقَالُ لَهَا ذَلِكَ حَتَّى يُنْتَهَى بِهَا إِلَى السَّمَاءِ الَّتِي فِيهَا اللَّهُ ﷻ، وَإِذَا كَانَ الرَّجُلُ السُّوءُ، قَالَ: اخْرُجِي أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْخَبِيثَةُ، كَانَتْ فِي الْجَسَدِ الْخَبِيثِ، اخْرُجِي ذَمِيمَةً، وَأَبْشِرِي بِحَمِيمٍ، وَغَسَّاقٍ، وَآخَرَ مِنْ شَكْلِهِ أَزْوَاجٌ، فَلَا يَزَالُ يُقَالُ لَهَا ذَلِكَ حَتَّى تَخْرُجَ، ثُمَّ يُعْرَجُ بِهَا إِلَى السَّمَاءِ، فَلَا يُفْتَحُ لَهَا، فَيُقَالُ: مَنْ

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٤٥٩.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٩٨٣.

هَذَا؟ فَيُقَالُ: فُلَانٌ، فَيُقَالُ: لَا مَرْحَبًا بِالنَّفْسِ الْخَبِيثَةِ، كَانَتْ فِي الْجَسَدِ الْخَبِيثِ، ارْجِعِي ذَمِيمَةً، فَإِنَّهَا لَا تُفْتَحُ لَكِ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، فَيُرْسَلُ بِهَا مِنَ السَّمَاءِ، ثُمَّ تَصِيرُ إِلَى الْقَبْرِ»[1].

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەسی مردوو (لەکاتی گیانکێشاندا فریشتەکان لای ئامادە دەبن، جا ئەگەر کەسەکە کەسێکی چاک بێ دەڵێن: ئەی ئەو نەفسە پاکەی کە لەناو جەستەیەکی پاکدای وەرە دەرەوە، بە سوپاسگوزارییەوە وەرە دەرەوە، مژدەت لێبێ بە ئاسوودەیی و بۆن و بەرامەی خۆشەوەو بۆ لای پەروەردگارێک کە تووڕە نیە، جا بەردەوام ئەوەی پێدەڵێن تاکو دێتە دەرەوە، پاشان (ڕوحەکەی) بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاسمان، ئنجا دەرگای ئاسمانی بۆ دەکرێتەوەو دەگوترێت: ئەوە کێیە؟ دەڵێن: ئەوە فڵان کەسە، ئنجا دەگوترێت: بەخێربێ ئەو نەفسە پاکە کە لە جەستەیەکی پاکدا بووە، بچۆ ناوی بە سوپاسکراوی و مژدەت لێبێ بە ئاسوودەیی و بۆن و بەرامەی خۆش و پەروەردگارێک کە لێ تووڕە نیە، بەردەوام ئاوای پێ دەگوترێ تاکو دەگاتە ئەو ئاسمانەی کە خوای ﷻی لێیە، خۆ ئەگەر کەسەکە کەسێکی خەراپەکار بێ دەڵێن: دەربچۆ ئەی نەفسی پیس لەناو جەستەیەکی پیسدا، دەربچۆ بە لۆمەو سەرزەنشتکراوی، وە مژدەی گەرمی و ئازارو گەرماوو خواردن و خواردنەوەی کێم و زوخاوی دۆزەخییان و هاوشێوەی ئەو سیفەتانە، جا بەردەوام ئاوای پێ دەگوترێ هەتاکو نەفسی دەردەچێت، پاشان بەرەو ئاسمان بەرز دەکرێتەوە بەڵام دەرگای ئاسمانی بۆ ناکرێتەوە، جا دەگوترێت: ئەوە کێیە؟ دەگوترێت: فڵان کەسە، جا دەگوترێت: بەخێرنەیەت ئەو نەفسە پیسە کە لەناو جەستەیەکی پیسدا بووە، بگەڕێوە بە لۆمەکراوی و ڕیسوایی، چونکە بێگومان دەرگاکانی ئاسمانت بۆ ناکرێتەوە، ئنجا لە ئاسمانەوە بەرەڵا دەکرێ و دەگەڕێتەوە ناو گۆڕەکەی.

٤٢٦٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا كَانَ أَجَلُ أَحَدِكُمْ بِأَرْضٍ أَوْثَبَتْهُ إِلَيْهَا الْحَاجَةُ، فَإِذَا بَلَغَ أَقْصَى أَثَرِهِ، قَبَضَهُ اللَّهُ سُبْحَانَهُ، فَتَقُولُ الْأَرْضُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: رَبِّ هَذَا مَا اسْتَوْدَعْتَنِي»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکات ئەجەل و مردنی کەسێک خوا بیهەوێ بکەوێتە هەر شوێنێک ئەوە کاروبارێکی دەکەوێتە ئەو شوێنەو بۆی دەڕوات، جا هەرکات بە کۆتا قۆناغی شوێن و کارەکەی گەیشت ئەوە خوا ڕووحی لێ وەردەگرێتەوە، ئنجا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو زەوییەی بۆی چووە دەڵێ: پەروەردگارا ئەوە ئەو کەسە بوو کە بە منت سپاردبوو.

**٤٢٦٤- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ، أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ، كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ»، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَرَاهِيَةُ لِقَاءِ اللَّهِ فِي كَرَاهِيَةِ لِقَاءِ الْمَوْتِ، فَكُلُّنَا يَكْرَهُ الْمَوْتَ، قَالَ: «لَا، إِنَّمَا ذَاكَ عِنْدَ مَوْتِهِ، إِذَا بُشِّرَ بِرَحْمَةِ اللَّهِ وَمَغْفِرَتِهِ، أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ، فَأَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَإِذَا بُشِّرَ بِعَذَابِ اللَّهِ، كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ، وَكَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ»[1].**

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک گەیشتن بە دیداری خوای پێ خۆش بێ ئەوە خواش دیداری ئەو کەسەی پێ خۆشە، وە هەر کەس ڕقی لە گەیشتن بە دیداری خوا بێ ئەوە خواش ڕقی لە دیداریەتی، جا بە پێغەمبەر ﷺ گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕق بوونەوە لە دیداری خوا ئەگەر مردن بێ ئەوە هەموومان ڕقمان لە مردنە! فەرمووی: نەخێر، ئەو ڕق لێ بوون و پێ ناخۆش بوونە لەکاتی مردندایە، جا ئەگەر ئەو کەسەی خەریکی مردنە مژدەی ڕەحمەت و میهرەبانی پێ خۆش بوونی خوای پێدرا ئەوە گەیشتن بە خوای پێ خۆشەو خواش دیداری ئەو کەسەی پێ خۆشە، وە ئەو کەسەی لەکاتی مردن ئەگەر مژدەی سزای خوای پێبدرێ حەز بە دیداری خوا ناکات و ڕقی لە مردنەکەیەو پێی ناخۆشە، وە خواش دیداری ئەو کەسەی پێ خۆش نیە.

**٤٢٦٥- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَتَمَنَّى أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لَا بُدَّ مُتَمَنِّيًا الْمَوْتَ، فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي»[2].**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٨٤، والترمذي: ١٠٦٧، والنسائي: ١٨٣٤ و ١٨٣٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٧١، ومسلم: ٢٦٨٠، وأبو داود: ٣١٠٨، والترمذي: ٩٧١، والنسائي: ١٨٢٠_١٨٢٢.

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێکتان لەکاتی ناخۆشی و زەرەرو زیان و بەڵایەکدا کە بەسەری دێ خۆزگە بە مردن نەخوازێت، خۆ ئەگەر تینی بۆ هات و ناچار بوو خۆزگە بخوازێت، ئەوە با بڵێت: خودایە تا ئەوکاتەی ژیان بۆ من باشترە بمژیێنە، وە هەرکات مردن بۆ من باشتر بوو بممرێنە.

## بابەت: گۆڕو لەناوچوونی لاشە

**٤٢٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ شَيْءٌ مِنَ الْإِنْسَانِ إِلَّا يَبْلَى، إِلَّا عَظْمًا وَاحِدًا، وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ، وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»(١).**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هیچ شوێنێکی مرۆڤ (دوای مردن) نامێنێ و لەناودەچێ و دەڕزێ تەنها یەک ئێسقان نەبێ کە پێی دەڵێن: «عَجْبُ الذَّنَب»، وە لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی ئا لەو ئێسقانە دروست دەکرێنەوەو ڕێکدەخرێنەوە.

**٤٢٦٧- عَنْ هَانِئٍ، مَوْلَى عُثْمَانَ ﷺ، قَالَ: كَانَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ إِذَا وَقَفَ عَلَى قَبْرٍ يَبْكِي حَتَّى يَبُلَّ لِحْيَتَهُ، فَقِيلَ لَهُ: تَذْكُرُ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ، وَلَا تَبْكِي، وَتَبْكِي مِنْ هَذَا؟ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ الْقَبْرَ أَوَّلُ مَنَازِلِ الْآخِرَةِ، فَإِنْ نَجَا مِنْهُ، فَمَا بَعْدَهُ أَيْسَرُ مِنْهُ، وَإِنْ لَمْ يَنْجُ مِنْهُ، فَمَا بَعْدَهُ أَشَدُّ مِنْهُ» قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا رَأَيْتُ مَنْظَرًا قَطُّ إِلَّا وَالْقَبْرُ أَفْظَعُ مِنْهُ»(٢).**

واتە: هانیئی خزمەتکاری عوسمان ﷺ دەڵێ: عوسمانی کوڕی عەففان کاتێک کە لەسەر گۆڕێک دەوەستا دەگریا، بە جۆرێک هەتا ڕیشی تەڕ دەبوو، بۆیە پێی گوترا: باسی بەهەشت و دۆزەخ دەکەی ناگریەی، بەڵام بۆ ئەوەیان دەگریەی؟ گوتی: چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان گۆڕ یەکەم مەنزڵ و شوێنی دواڕۆژە، جا ئەگەر (مرۆڤ) لە گۆڕ ڕزگاری بوو، ئەوە ئەوەی لەدوای (ژیانی ناو) گۆڕ دێ ئاسانترە، خۆ ئەگەر ڕزگاری نەبوو لێی، ئەوە دواترەکەی زۆر توندترو ناڕەحەترە، گوتی: هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرگیز هیچ وێنەو دیمەنێکم نەدیتووە ئیللا گۆڕ ترسناکترو سامناکتر بووە (لەو دیمەنانە).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨١٤، ومسلم: ٢٩٥٥.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٣٠٨.




٤٢٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ الْمَيِّتَ يَصِيرُ إِلَى الْقَبْرِ، فَيُجْلَسُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فِي قَبْرِهِ، غَيْرَ فَزِعٍ، وَلَا مَشْعُوفٍ، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ: فِيمَ كُنْتَ؟ فَيَقُولُ: كُنْتُ فِي الْإِسْلَامِ، فَيُقَالُ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ؟ فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، جَاءَنَا بِالْبَيِّنَاتِ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ فَصَدَّقْنَاهُ، فَيُقَالُ لَهُ: هَلْ رَأَيْتَ اللَّهَ؟ فَيَقُولُ: مَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ أَنْ يَرَى اللَّهَ، فَيُفْرَجُ لَهُ فُرْجَةٌ قِبَلَ النَّارِ، فَيَنْظُرُ إِلَيْهَا يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا، فَيُقَالُ لَهُ: انْظُرْ إِلَى مَا وَقَاكَ اللَّهُ، ثُمَّ يُفْرَجُ لَهُ فُرْجَةٌ قِبَلَ الْجَنَّةِ، فَيَنْظُرُ إِلَى زَهْرَتِهَا، وَمَا فِيهَا، فَيُقَالُ لَهُ: هَذَا مَقْعَدُكَ، وَيُقَالُ لَهُ: عَلَى الْيَقِينِ كُنْتَ، وَعَلَيْهِ مُتَّ، وَعَلَيْهِ تُبْعَثُ، إِنْ شَاءَ اللَّهُ، وَيُجْلَسُ الرَّجُلُ السُّوءُ فِي قَبْرِهِ، فَزِعًا مَشْعُوفًا، فَيُقَالُ لَهُ: فِيمَ كُنْتَ؟ فَيَقُولُ: لَا أَدْرِي، فَيُقَالُ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ؟ فَيَقُولُ: سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ قَوْلًا، فَقُلْتُهُ، فَيُفْرَجُ لَهُ قِبَلَ الْجَنَّةِ، فَيَنْظُرُ إِلَى زَهْرَتِهَا وَمَا فِيهَا، فَيُقَالُ لَهُ: انْظُرْ إِلَى مَا صَرَفَ اللَّهُ عَنْكَ، ثُمَّ يُفْرَجُ لَهُ فُرْجَةٌ قِبَلَ النَّارِ، فَيَنْظُرُ إِلَيْهَا، يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا، فَيُقَالُ لَهُ: هَذَا مَقْعَدُكَ، عَلَى الشَّكِّ كُنْتَ، وَعَلَيْهِ مُتَّ، وَعَلَيْهِ تُبْعَثُ، إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مردوو دەچێتە ناو گۆڕەکەی، ئنجا پیاوی چاک و پاک لەناو گۆڕەکەیدا دادەنیشێندرێت، بێ ئەوەی ترس و دڵەڕاوکێ و شۆک بوونی هەبێت، پاشان پێی دەگوترێت: تۆ لەناو چ بەرنامەو دینێکدا بوویت؟ ئەویش دەڵێ: من لەناو ئیسلامدا بووم، جا پێی دەگوترێت: ئەو پیاوە کێیە (مەبەست پێی پێغەمبەرە ﷺ)؟ ئەویش دەڵێ: موحەممەد ﷺ نێردراوی خوایە کە هەموو پەیامەکانی بە ڕوون و ئاشکرایی لەلایەن خواوە بۆ هێناین و ئێمەش بەڕاستمان زانی و بڕوامان پێی کرد، ئنجا پێی دەگوترێت: ئایا خودات بینیوە؟ ئەویش دەڵێ: هیچ کەسێک ناتوانێ و بۆی نیە کە خودا ببینێ، ئنجا دەرچەیەکی بەرەوڕووی ئاگر بۆ دەکرێتەوەو تەماشا دەکات ئاگرەکە یەکتر دەخوات و کڵپە دەکات، بۆیە پێی دەگوترێت: تەماشای ئەو شتەو شوێنە بکە کە خوا تۆی لێ پاراست، پاشان دەرچەیەکی بەرەوڕووی بەهەشت بۆ دەکەنەوەو تەماشای ڕازاوەیی و گەشاوەیی ئەو شتانە دەکات کە لەناو بەهەشتدا هەیە، ئنجا پێی دەڵێن: ئەوە شوێن و مەنزڵی تۆیە، وە پێی دەڵێن: تۆ لەسەر دڵنیایی بوویت و هەر لەسەر ئەو دڵنیاییەشت مردی و لەسەر ئەو دڵنیاییەش زیندوو دەکرێیەوە ئەگەر خوا پێی خۆش بێت، وە پیاوی خەراپ و تاوانبار لەناو گۆڕەکەیدا بە ترس و بیمێکی زۆرەوە دادەنیشێندرێ و پێی

---

(١) صحيح.

دەگوترێت: لەسەر چ بەرنامەو یاسایەک بوویت؟ ئەویش دەڵێ: نازانم، ئنجا پێی دەڵێن: ئەو پیاوە کێیە؟ ئەویش دەڵێ: گوێم لە خەڵکی بوو قسەیەکیان دەربارەی دەکردو منیش دەمگوتەوە، ئنجا بەرەوڕووی بەهەشت دەرچەیەکی بۆ دەکرێتەوەو تەماشای جوانی و ڕازاوەییەکانی ناو بەهەشت دەکات، جا پێی دەڵێن: تەماشای ئەو شوێنە بکە کە خوا ڕووتی لێ وەرگێڕا (بەهۆی تاوانەکانت)، پاشان بەرەو دۆزەخ دەرچەیەکی بۆ دەکرێتەوەو تەماشای دەکات کە هەندێکی هەندێکی دەخوات لە توندی ئاگرەکە خۆی، جا پێی دەڵێن: ئەوە شوێنی مانەوەی تۆیە، تۆ بە گومان بوویت (لە زیندوو بوونەوە) لەسەر ئەو گومانەش مردی و هەر لەسەر ئەو گومانەش زیندوو دەکرێیتەوە ئەگەر خوای باڵادەست پێی خۆش بێت.

**٤٢٦٩- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم، قَالَ: نَزَلَتْ فِي عَذَابِ الْقَبْرِ، يُقَالُ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللَّهُ، وَنَبِيِّي مُحَمَّدٌ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم»[1].**

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم، واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە خوا دامەزراویان دەکات بە وتەی بەڕێ و جێ (کە شایەتومانە). فەرمووی: دەربارەی سزای ناوگۆڕ دابەزیوە، پێی دەڵێن (بە مردوو): پەروەردگارت کێیە؟ ئەویش دەڵێ: پەروەردگارم زاتی الله یە، وە پێغەمبەریشم موحەممەدە ﷺ، دەربارەی ئەوەشیان ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمووێت: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهيم، واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە خوا دامەزراویان دەکات بە وتەی بەڕێ و جێ (کە شایەتومانە) لە ژیانی دونیاو لە ڕۆژی دوایشدا.

**٤٢٧٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا مَاتَ أَحَدُكُمْ عُرِضَ عَلَى مَقْعَدِهِ بِالْغَدَاةِ، وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، يُقَالُ: هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى تُبْعَثَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[2].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٦٩، ومسلم: ٢٨٧١، وأبو داود: ٤٧٥٠، والترمذي: ٣١٢٠، والنسائي: ٢٠٥٦ و ٢٠٥٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٧٩، ومسلم: ٢٨٦٦، والترمذي: ١٠٧٢، والنسائي: ٢٠٧٠_٢٠٧٢.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێکتان کاتێک دەمرێ ئەوە بەیانی و ئێواران شوێنەکەی نیشان دەدرێت، جا ئەگەر ئەهلی بەهەشت بێ ئەوە شوێنەکەی لە بەهەشت نیشان دەدرێت، خۆ ئەگەر ئەهلی دۆزەخ بێ ئەوە شوێنەکەی لە دۆزەخ نیشان دەدرێت، پێی دەڵێن: ئەوە شوێنی تۆیە هەتا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێیتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا.

**٤٢٧١- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ أَبَاهُ كَانَ يُحَدِّثُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّمَا نَسَمَةُ الْمُؤْمِنِ طَائِرٌ يَعْلُقُ فِي شَجَرِ الْجَنَّةِ، حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى جَسَدِهِ يَوْمَ يُبْعَثُ»**[١].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی کەعبی ئەنصاڕیی ﷺ دەگێڕێتەوە، کە باوکی دەیگێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ڕوحی مرۆڤی بڕوادار وەکو باڵندەیەک وایە بەسەر درەختەکانی بەهەشتەوە لە بەروبومی بەهەشت دەخوات تاکو ئەو کاتەی کە زیندوو دەکرێتەوەو دەگەڕێتەوە ناو لاشەکەی.

**٤٢٧٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا دَخَلَ الْمَيِّتُ الْقَبْرَ، مُثِّلَتِ الشَّمْسُ عِنْدَ غُرُوبِهَا، فَيَجْلِسُ يَمْسَحُ عَيْنَيْهِ، وَيَقُولُ: دَعُونِي أُصَلِّي»**[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکات مردوو دەچێتە ناوگۆڕەکەی ئەوە وێنای ئەوکاتەی بۆ دەکرێ و دێتە پێش چاوی کە ڕۆژ لە ئاوابوون دایە، بۆیە دادەنیشێ و دەست بە چاوەکانیدا دێنێ و دەڵێ: لێمگەڕێن با نوێژ بکەم.

## بابەت: زیندوو بوونەوە

**٤٢٧٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ صَاحِبَيِ الصُّورِ بِأَيْدِيهِمَا، أَوْ فِي أَيْدِيهِمَا قَرْنَانِ، يُلَاحِظَانِ النَّظَرَ مَتَى يُؤْمَرَانِ»**[٣].

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ١٦٤٠، والنسائي: ٢٠٧٣.

(٢) حسن.

(٣) منكر. والمحفوظ بلفظ: «صَاحِبُ الْقَرْنِ...».

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو دوو فریشتەیەی کە خاوەنی کەڕەنان (بەرپرسن لە فووکردن پێیدا بۆ کۆتایی هێنانی دونیاو زیندوو بوونەوە) دوو کەڕەنایان بەدەستەوەیەو چاوەڕێن و گوێیان هەڵخستووە ئاخۆ کەی فەرمانیان پێ دەکرێ کە فەرمانەکە جێبەجێ بکەن.

٤٢٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ بِسُوقِ الْمَدِينَةِ، وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسَى عَلَى الْبَشَرِ فَرَفَعَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ يَدَهُ فَلَطَمَهُ، قَالَ: تَقُولُ هَذَا وَفِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾﴾ الزمر، فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَإِذَا أَنَا بِمُوسَى آخِذٌ بِقَائِمَةٍ مِنْ قَوَائِمِ الْعَرْشِ، فَلَا أَدْرِي أَرَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلِي، أَوْ كَانَ مِمَّنِ اسْتَثْنَى اللَّهُ ﷻ، وَمَنْ قَالَ: أَنَا خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى فَقَدْ كَذَبَ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە جولەکەکان لە بازاڕی مەدینە (سوێندی خواردو) گوتی: سوێند بەو زاتەی کە موسای هەڵبژارد بەسەر هەموو مرۆڤدا، بۆیە پیاوێکی ئەنصاڕی دەستی بەرزکردەوەو زللەیەکی لێداو گوتی: ئەوە دەڵێیت (کە موسا هەڵبژێردراوە بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا) لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەناومان دایە؟ ئنجا ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، خوای ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾﴾ الزمر، کاتێک فوو کرا بەکەڕەنادا (بە شەیپوردا) یەکسەر هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان دەمرن مەگەر کەسانێک خوا بیەوێ (نەمرن) پاشان جارێکی تر فوو دەکرێ بەکەڕەنادا جا لە پڕ هەموو ڕاست دەبنەوە چاوەڕوان دەکەن. جا ئەمن یەکەم کەسم کە لەکاتی زیندوو بوونەوەدا سەرم بەرزدەکەمەوە، ئیتر لەوکاتەدا من موسا دەبینم کە دەستی گرتووە بە پایەیەک لە پایەکانی عەرشەوە، جا نازانم کە ئایا ئەو لەپێش مندا سەری بەرزکردۆتەوە یان لەوانەیە کەوا خوای ﷻ لە ئایەتەکەدا هەڵیهاواردوون، وە هەر کەسێکیش بڵێت: من لە یونوسی کوڕی مەتتا (یونوس پێغەمبەر) باشترم ئەوە درۆی کردوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤١١ و ٤٦٠٤، ومسلم: ٢٣٧٣، وأبو داود: ٤٦٧١، والترمذي: ٣٢٤٥.

٤٢٧٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، يَقُولُ: «يَأْخُذُ الْجَبَّارُ سَمَاوَاتِهِ، وَأَرْضِيهِ بِيَدِهِ، وَقَبَضَ يَدَهُ فَجَعَلَ يَقْبِضُهَا، وَيَبْسُطُهَا، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْجَبَّارُ، أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟» قَالَ: وَيَتَمَايَلُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ شِمَالِهِ، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَى الْمِنْبَرِ يَتَحَرَّكُ مِنْ أَسْفَلِ شَيْءٍ مِنْهُ، حَتَّى إِنِّي لَأَقُولُ: أَسَاقِطٌ هُوَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟[1].

واته: عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەسەر مینبەرەکەی دەیفەرموو: خوای بە دەسەڵات ئاسمانەکان و زەوییەکانی بە دەستی دەگرێت، وە پێغەمبەریش ﷺ دەستی دەنوقاندو دەکردەوە (بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی تێبگەیەنێ)، پاشان (خوا) دەفەرمووێ: منم خاوەن دەسەڵاتی بێ کۆتایی، من پادشام، لەکوێن دەسەڵاتدارەکانی دونیا؟ لەکوێن ئەوانەی خۆیان بە زل دەزانی؟ ئیبنو عومەر دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی قسەکردنەکەدا بەلای ڕاست و چەپدا لار دەبۆوە، بەجۆرێک کە تەماشای مینبەرەکەم کرد لەژێرەوە دەجوڵا، بەجۆرێک کە دەمگوت: بە جوڵەی مینبەرەکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەوێتە خوارێ.

٤٢٧٦- عَنِ الْقَاسِمِ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: «حُفَاةً عُرَاةً»، قُلْتُ: وَالنِّسَاءُ؟ قَالَ: «وَالنِّسَاءُ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَمَا يُسْتَحْيَا؟ قَالَ: «يَا عَائِشَةُ الْأَمْرُ أَهَمُّ مِنْ أَنْ يَنْظُرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ»[2].

واته: قاسم ﵀ دەڵێ: عائیشە دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی چۆن کۆدەکرێنەوە (حەشر دەکرێن)؟ فەرمووی: بە پێخواسی و بە ڕووتی، گوتم: ئافرەتانیش؟ فەرمووی: ئافرەتانیش، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەس شەرم ناکات؟ فەرمووی: ئەی عائیشە کاروبارو حیسابی ئەو ڕۆژە زۆر لەوە گرنگترو سامناکترە کە خەڵکی بۆ یەکتر بڕوانن و تەماشای یەکتر بکەن.

٤٢٧٧- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُعْرَضُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَلَاثَ عَرَضَاتٍ: فَأَمَّا عَرْضَتَانِ، فَجِدَالٌ، وَمَعَاذِيرُ، وَأَمَّا الثَّالِثَةُ، فَعِنْدَ ذَلِكَ تَطِيرُ الصُّحُفُ فِي الْأَيْدِي، فَآخِذٌ بِيَمِينِهِ، وَآخِذٌ بِشِمَالِهِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٤١٢، ومسلم: ٢٧٨٨، وانظر أبو داود: ٤٧٣٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٢٧، ومسلم: ٢٨٥٩، والنسائي: ٢٠٨٤.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي بإثر: ٢٤٢٥.

واتە: ئەبو موسای ئەشعەریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا سێ جار خەڵکی ڕووبەڕوو دەکرێن و ڕادەنوێنرێن: جاری یەکەم و دوهەم بۆ بەرگریکردن و دانپێداهێنان و عوزر هێنانەوە، وە بەڵام لە سێهەم جاردا پەڕاوەکانیان بە فەوری وەردەگرنەوە، جا هەیە بە دەستی ڕاستی وەریدەگرێتەوەو هەیشە بە دەستی چەپ.

**٤٢٧٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ﴿ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٦ ﴾ المطففين، قَالَ: «يَقُومُ أَحَدُهُمْ فِي رَشْحِهِ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ»**[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٦ ﴾ المطففين، واتە: ڕۆژێک کە خەڵک لەبەردەم پەروەردگاری جیهانیاندا دەوەستن. فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا یەکێکیان تاکو نیوەی گوێچکەی لە ئارەقی خۆیدا نقوم دەبێت.

**٤٢٧٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۝٤٨ ﴾ إبراهيم، فَأَيْنَ يَكُونُ النَّاسُ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: «عَلَى الصِّرَاطِ»**[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۝٤٨ ﴾ إبراهيم، واتە: لە ڕۆژێکدا کە ئەم زەویە دەگۆڕێ بە زەوی یەکی ترو ئاسمانەکانیش (دەگۆڕێن بە ئاسمانی تر). کە ئایا لەو ڕۆژو کاتەدا خەڵکی لەکوێ دەبن؟ فەرمووی: لەسەر پردی سیرات.

**٤٢٨٠- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَبْدِ بْنِ الْعُتْوَارِيِّ، أَحَدِ بَنِي لَيْثٍ، قَالَ: - وَكَانَ فِي حَجْرِ أَبِي سَعِيدٍ - قَالَ: سَمِعْتُهُ يَعْنِي أَبَا سَعِيدٍ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «يُوضَعُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ جَهَنَّمَ، عَلَى حَسَكٍ كَحَسَكِ السَّعْدَانِ، ثُمَّ يَسْتَجِيزُ النَّاسُ، فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ، وَمَخْدُوجٌ بِهِ، ثُمَّ نَاجٍ، وَمُحْتَبَسٌ بِهِ، وَمَنْكُوسٌ فِيهَا»**[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩٣٨، ومسلم: ٢٨٦٢، والترمذي: ٢٤٢٢ و ٣٣٣٥ و ٣٣٣٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٧٩١، والترمذي: ٣١٢١.

(٣) صحيح.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پردی سیڕات بەسەر پشتی دۆزەخەوە دادەنرێ بەسەر دڕکگەلێکەوە وەکو دڕکی گیای سەعدان، پاشان خەڵکی بەسەریدا تێدەپەڕن، جا هەیانە ڕزگاری دەبێ بە سەلامەتی و هەیانە لە پێستی دادەماڵرێ و لێی دەبێتەوە پاشان ڕزگاری دەبێ، وە هەیشە پێیەوە گیردەخوات و سەرەوبن دەکەوێتە ناویەوە.

٤٢٨١- عَنْ حَفْصَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي لَأَرْجُو أَلَّا يَدْخُلَ النَّارَ أَحَدٌ، إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا، وَالْحُدَيْبِيَةَ»، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَيْسَ قَدْ قَالَ اللَّهُ: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ﴾ مريم، قَالَ: «أَلَمْ تَسْمَعِيهِ يَقُولُ: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾ مريم»[1].

واتە: حەفصە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: من ئومێدم بە خوا هەیە کە ئەوانەی ئامادەی جەنگی بەدرو حودەیبیە بوون هیچ یەکێکیان ناچێتە ناو ئاگرەوە ئەگەر خوای باڵادەست پێی خۆش بێت، گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا خوا نافەرمووێ: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ﴾ مريم، واتە: کەس نیە لە ئێوە نەڕوات و تێنەپەڕێ بەسەر دۆزەخدا (ئەو تێپەڕینە) بڕیارێکی بڕاوەیە لە پەروەردگارتەوە. فەرمووی: ئەدی نابیستی دەشفەرمووێت: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾ مريم، واتە: دواتر ئەوانە ڕزگار دەکەین کە پارێزکارو لەخواترس بوون و ستەمکاران لەسەرچۆک لەناو (دۆزەخ) دا دەهێڵینەوە.

## بابەت: سیفەتەکانی ئوممەتی موحەممەد ﷺ

٤٢٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَرِدُونَ عَلَيَّ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنَ الْوُضُوءِ، سِيمَاءُ أُمَّتِي، لَيْسَ لِأَحَدٍ غَيْرِهَا»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٤٩٦. وانظر أبو داود: ٤٦٥٣، والترمذي: ٣٨٦٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٤٧.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دێنەوە بۆلام بە ڕوخسارێکی سپی و ڕووناکەوەو بە دەست و پەلێکی درەوشاوەوە کە شوێنەواری دەستنوێژە (بەسەر ئەندامەکانی دەستنوێژەوە)، ئەوەش نیشانەی ناسینەوەی ئوممەتی منەو بۆ هیچ ئوممەتێکیتر وا نیە.

**٤٢٨٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي قُبَّةٍ، فَقَالَ: «أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟»، قُلْنَا: بَلَى، قَالَ: «أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟»، قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَذَلِكَ أَنَّ الْجَنَّةَ لَا يَدْخُلُهَا إِلَّا نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَمَا أَنْتُمْ فِي أَهْلِ الشِّرْكِ إِلَّا كَالشَّعَرَةِ الْبَيْضَاءِ، فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الْأَسْوَدِ، أَوْ كَالشَّعَرَةِ السَّوْدَاءِ، فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الْأَحْمَرِ»**[1].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە لە دەوارێکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، جا فەرمووی: ئایا ڕازی دەبن کە ئێوە چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن؟ گوتمان: بەڵێ، فەرمووی: ئایا ڕازی دەبن کە ئێوە سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن؟ گوتمان: بەڵێ، فەرمووی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە بە بێگومان ئومێدم وایە کە ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن، ئەوەش لەبەر ئەوەی چونکە هیچ کەسێک ناچێتە بەهەشتەوە تەنها کەسی مسوڵمان نەبێت، دەی ئێوەش لەچاو ئەوانەی کە هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن وەکو تاڵە موویەکی سپی وان بە پێستەی گایەکی ڕەشەوە یان وەکو تاڵە موویەکی ڕەشبن بە پێستەی گایەکی سوورەوە.

**٤٢٨٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَجِيءُ النَّبِيُّ وَمَعَهُ الرَّجُلَانِ، وَيَجِيءُ النَّبِيُّ وَمَعَهُ الثَّلَاثَةُ، وَأَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ، وَأَقَلُّ، فَيُقَالُ لَهُ: هَلْ بَلَّغْتَ قَوْمَكَ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيُدْعَى قَوْمُهُ، فَيُقَالُ: هَلْ بَلَّغَكُمْ؟ فَيَقُولُونَ: لَا، فَيُقَالُ: مَنْ يَشْهَدُ لَكَ؟ فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌ وَأُمَّتُهُ، فَتُدْعَى أُمَّةُ مُحَمَّدٍ، فَيُقَالُ: هَلْ بَلَّغَ هَذَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، فَيَقُولُ: وَمَا عِلْمُكُمْ بِذَلِكَ؟ فَيَقُولُونَ: أَخْبَرَنَا نَبِيُّنَا بِذَلِكَ أَنَّ الرُّسُلَ قَدْ بَلَّغُوا فَصَدَّقْنَاهُ، قَالَ: فَذَلِكُمْ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴿١٤٣﴾﴾ البقرة»**[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٢٨، ومسلم: ٢٢١، والترمذي: ٢٥٤٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٣٩، والترمذي: ٢٩٦١.

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لە ڕۆژی دواییدا) پێغەمبەر هەیە کە دێ دوو پیاوی لەگەڵدایە، وە پێغەمبەر هەیە سێ کەسی لەگەڵدایە زیاتر لەوە یان کەمتر، جا پێیان دەگوترێت: ئایا پەیامەکەت بە گەلەکەت گەیاندووە؟ ئەویش دەفەرمووێت: بەڵێ، ئنجا گەلەکەی بانگ دەکرێن و پێیان دەگوترێت: ئایا پەیامی پێ گەیاندوون؟ ئەوانیش دەڵێن: نەخێر، ئنجا (بە پێغەمبەرەکە) دەگوترێت: کێت شاهیدە؟ ئەویش دەفەرمووێت: موحەممەد ﷺو ئوممەتەکەی، ئنجا بانگی ئوممەتی موحەممەد ﷺ دەکرێت و پێیان دەگوترێ: ئایا ئەو (پێغەمبەرە) پەیامەکەی گەیاندووە؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، ئنجا دەڵێ: ئێوە چوزانن کە گەیاندویەتی؟ دەڵێن: پێغەمبەرەکەمان ﷺ ئەوەی پێ ڕاگەیاندووین کە هەموو پێغەمبەران پەیامەکەیان گەیاندووە، ئێمە بڕوامان پێ کردوەو بە ڕاستمان زانیوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئا ئەوەیە مانای ئەو ئایەتە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة، واتە: هەروەها کردمانن بە گەلێکی میانەڕەو مامناوەندی (هەڵبژاردە) تا ببنە شاهیدو چاودێر بەسەر خەڵکەوەو (پێغەمبەریش ﷺ) شاهیدو چاودێر بێ بەسەر ئێوەوە.

٤٢٨٥- عَنْ رِفَاعَةَ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: صَدَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا مِنْ عَبْدٍ يُؤْمِنُ، ثُمَّ يُسَدِّدُ، إِلَّا سُلِكَ بِهِ فِي الْجَنَّةِ، وَأَرْجُو أَلَّا يَدْخُلُوهَا حَتَّى تَبَوَّءُوا أَنْتُمْ وَمَنْ صَلَحَ مِنْ ذَرَارِيِّكُمْ مَسَاكِنَ فِي الْجَنَّةِ، وَلَقَدْ وَعَدَنِي رَبِّي ﷻ أَنْ يُدْخِلَ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعِينَ أَلْفًا، بِغَيْرِ حِسَابٍ»[1].

واتە: ریفاعەی جوهەنیی ﷺ دەڵێ: لە سەفەر یان غەزایەک گەڕاینەوە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، ئەویش فەرمووی: سوێند بەو زاتەی کە گیانی موحەممەدی ﷺ بە دەستە هیچ بەندەیەک نیە کە بڕوای هەبێ، پاشان لەسەری بەردەوام و ڕاوەستاو بێ ئیللا بەهۆیەوە دەخرێتە ناو بەهەشتەوە، وە من ئومێدم وایە کە هیچ کەس نەچێتە ناو بەهەشتەوە تاوەکو ئێوەو وەچە چاکەکارەکانتان شوێنی خۆتان نەگرن لەناو بەهەشتدا، وە بە بێگومان خوا ﷻ بەڵێنی پێداوم کە حەفتا هەزار لە ئوممەتەکەم بەبێ لێپێچینەوە بچنە ناو بەهەشتەوە.

---

(١) صحيح.

٤٢٨٦- عَنْ مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ الْأَلْهَانِيُّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ الْبَاهِلِيَّ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «وَعَدَنِي رَبِّي سُبْحَانَهُ أَنْ يُدْخِلَ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعِينَ أَلْفًا، لَا حِسَابَ عَلَيْهِمْ، وَلَا عَذَابَ، مَعَ كُلِّ أَلْفٍ سَبْعُونَ أَلْفًا، وَثَلَاثُ حَثَيَاتٍ مِنْ حَثَيَاتِ رَبِّي ﷻ»[1].

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلیی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوای پاک و بێگەرد بەڵێنی پێداوم کەوا حەفتا هەزار لە ئوممەتەکەم بەبێ لێپێچینەوەو سزا بباتە ناو بەهەشتەوە، وە لەگەڵ هەر هەزارێک حەفتا هەزاری دیکەش، وە سێ مشت لە مشتی خوای پەروەردگاریش ﷻ.

٤٢٨٧- عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نُكْمِلُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ سَبْعِينَ أُمَّةً، نَحْنُ آخِرُهَا وَخَيْرُهَا»[2].

واتە: بەهزی کوڕی حەکیم لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێمە تەواوکەری حەفتا ئوممەتین لە ڕۆژی دواییدا، کە ئێمە کۆتا ئوممەتین و باشترینیانین.

٤٢٨٨- عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّكُمْ وَفَّيْتُمْ سَبْعِينَ أُمَّةً، أَنْتُمْ خَيْرُهَا، وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللَّهِ»[3].

واتە: بەهزی کوڕی حەکیم لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئێوە تەواوکەری حوفتا ئوممەت بوون، ئێوە باشترین و بەڕێزترینیانن لەلای خوا.

٤٢٨٩- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «أَهْلُ الْجَنَّةِ عِشْرُونَ وَمِائَةُ صَفٍّ، ثَمَانُونَ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ، وَأَرْبَعُونَ مِنْ سَائِرِ الْأُمَمِ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٤٣٧.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٠٠١.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٠٠١.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٥٤٦.

واتە: سولەیمانی کوڕی بوڕەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی بەهەشت سەدو بیست ڕیزە، هەشتا ڕیزیان لەم ئوممەتەو چل ڕیزیشیان لە هەموو ئوممەتەکانیتر.

٤٢٩٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «نَحْنُ آخِرُ الْأُمَمِ، وَأَوَّلُ مَنْ يُحَاسَبُ، يُقَالُ: أَيْنَ الْأُمَّةُ الْأُمِّيَّةُ، وَنَبِيُّهَا؟ فَنَحْنُ الْآخِرُونَ الْأَوَّلُونَ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئێمە (لە ڕووی زەمەنەوە) کۆتا ئوممەتین، وە یەکەم ئوممەتین کە حیسابمان لەگەڵ دەکرێت، (لە قیامەت) دەگوترێت: کوا ئەو ئوممەتە ئوممییەو پێغەمبەرەکەی ﷺ؟ جا ئێمە کۆتا ئوممەتین (لەڕووی زەمەنەوە)و یەکەم ئوممەتین (بۆ حیساب و چوونە بەهەشت).

٤٢٩١- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا جَمَعَ اللَّهُ الْخَلَائِقَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أُذِنَ لِأُمَّةِ مُحَمَّدٍ فِي السُّجُودِ، فَيَسْجُدُونَ لَهُ طَوِيلًا، ثُمَّ يُقَالُ: ارْفَعُوا رُءُوسَكُمْ، قَدْ جَعَلْنَا عِدَّتَكُمْ فِدَاءَكُمْ مِنَ النَّارِ»[2].

واتە: ئەبو بوردە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێک کە خوا لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو دروستکراوەکان کۆدەکاتەوە، ئەوە مۆڵەت بە ئوممەتی موحەممەد ﷺ دەدرێ بۆ سوجدە بردن، ئنجا سوجدەیەکی درێژ دەبەن بۆ خوا، پاشان دەگوترێت: سەرتان بەرزبکەنەوە بە ئەندازەی خۆتانمان کردە فیداتان (بۆ ڕزگاربوون لە دۆزەخ).

٤٢٩٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ هَذِهِ الْأُمَّةَ مَرْحُومَةٌ، عَذَابُهَا بِأَيْدِيهَا، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ، دُفِعَ إِلَى كُلِّ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ رَجُلٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَيُقَالُ: هَذَا فِدَاؤُكَ مِنَ النَّارِ»[3].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئەو ئوممەتە خوا بەزەیی پێدا هاتۆتەوەو میهرەبانی لەگەڵیدا کردوە، سزای بە دەستی

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح لغيره.

خۆیەتی، جا کاتێک کە ڕۆژی قیامەت دێ بۆ هەر کەسێک لە مسوڵمانان پیاوێکی لە هاوبەشدانەران پێدەدرێ و پێی دەگوترێت: ئەوە فیدای تۆیە لە ئاگری دۆزەخ.

## بابەت: ئەوەی ئومێد دەکرێ لە ڕەحمەتی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا

**٤٢٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ لِلَّهِ مِائَةَ رَحْمَةٍ، قَسَمَ مِنْهَا رَحْمَةً بَيْنَ جَمِيعِ الْخَلَائِقِ، فَبِهَا يَتَرَاحَمُونَ، وَبِهَا يَتَعَاطَفُونَ، وَبِهَا تَعْطِفُ الْوَحْشُ عَلَى أَوْلَادِهَا، وَأَخَّرَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ رَحْمَةً، يَرْحَمُ بِهَا عِبَادَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»**(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خوا سەد ڕەحمەتی هەیە، لەو سەد ڕەحمەتە یەک دانە ڕەحمەتی دابەشکردوە لەناو هەموو دروستکراوەکانیدا، جا بەو بەشە ڕەحمەتەیە کە سۆزو میهرەبانییان بەرانبەر بە یەکتر هەیە، وە هەر بەو بەشە ڕەحمەتەیە کەوا ئاژەڵ و دڕندەکان سۆزیان هەیە بۆ بێچوەکانیان، وە نەوەدو نۆ بەشەکەیتری دواخستووە (بۆ قیامەت)، لە ڕۆژی قیامەتدا بەو نەوەدو نۆ بەشەوە ڕوحم و بەزەیی دەنوێنێ بۆ بەندەکانی.

**٤٢٩٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَلَقَ اللَّهُ ﷻ، يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ، مِائَةَ رَحْمَةٍ، فَجَعَلَ فِي الْأَرْضِ مِنْهَا رَحْمَةً، فَبِهَا تَعْطِفُ الْوَالِدَةُ عَلَى وَلَدِهَا، وَالْبَهَائِمُ بَعْضُهَا عَلَى بَعْضٍ، وَالطَّيْرُ، وَأَخَّرَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ، أَكْمَلَهَا اللَّهُ بِهَذِهِ الرَّحْمَةِ»**(٢).

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای ﷻ لەو ڕۆژەی ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد سەد ڕەحمەتی دروستکرد، جا یەک دانەی لەو ڕەحمەتانە لەسەر زەوی دانا، جا بەو ڕەحمەتەیە کە دایک سۆزو خۆشەویستی هەیە بۆ ڕۆڵەکەی، وە ئاژەڵان سۆزو بەزەییان هەیە لەگەڵ یەکتر، وە باڵندەکانیش، وە نەوەدو نۆ ڕەحمەتەکەیتری دواخستووە بۆ ڕۆژی قیامەت، جا ئەگەر ڕۆژی دوایی هات ئەوە خوا ڕەحمەتەکەی بەو ڕەحمەتەوە تەواو دەکات.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٠٠٠، ومسلم: ٢٧٥٢، والترمذي: ٣٥٤١ و ٣٥٤٢.

(٢) صحيح.

٤٢٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ، لَمَّا خَلَقَ الْخَلْقَ، كَتَبَ بِيَدِهِ عَلَى نَفْسِهِ: إِنَّ رَحْمَتِي تَغْلِبُ غَضَبِي»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوای ﷻ کاتێک دروستکراوەکانی دروستکرد بۆ خۆی لەسەر خۆی نوسیویەتی: بە بێگومان ڕەحمەت و میهرەبانیم لە سەرووی سزاو تووڕەبوونەکەمەوەیە.

٤٢٩٦- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: مَرَّ بِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَا عَلَى حِمَارٍ، فَقَالَ: «يَا مُعَاذُ هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ؟ وَمَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ؟» قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «فَإِنَّ حَقَّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ، وَلَا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَحَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ، إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ أَنْ لَا يُعَذِّبَهُمْ»[٢].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلامدا تێپەڕی و منیش بە سواری گوێدرێژێک بووم، ئەویش فەرمووی: ئەی موعاز ئایا دەزانی مافی خوا بەسەر بەندەکانییەوە چییە؟ وە مافی بەندەکان بەسەر خوداوە چییە؟ گوتم: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: کەواتە بێگومان مافی خوا بەسەر بەندەکانییەوە ئەوەیە کە بیپەرستن و هیچ هاوبەشێک بۆ خوا بڕیار نەدەن، وە مافی بەندەیە بەسەر خواوە ئەگەر ئەوەیان کرد خوا سزایان نەدات.

٤٢٩٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ غَزَوَاتِهِ، فَمَرَّ بِقَوْمٍ، فَقَالَ: «مَنِ الْقَوْمُ؟» فَقَالُوا: نَحْنُ الْمُسْلِمُونَ، وَامْرَأَةٌ تَحْصِبُ تَنُّورَهَا، وَمَعَهَا ابْنٌ لَهَا، فَإِذَا ارْتَفَعَ، وَهَجُ التَّنُّورِ تَنَحَّتْ بِهِ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، قَالَ: «نَعَمْ»، قَالَتْ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَرْحَمِ الرَّاحِمِينَ؟ قَالَ: «بَلَى»، قَالَتْ: أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَرْحَمَ بِعِبَادِهِ مِنَ الْأُمِّ بِوَلَدِهَا؟ قَالَ: «بَلَى»، قَالَتْ: فَإِنَّ الْأُمَّ لَا تُلْقِي وَلَدَهَا فِي النَّارِ، فَأَكَبَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَبْكِي، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ إِلَيْهَا، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يُعَذِّبُ مِنْ عِبَادِهِ إِلَّا الْمَارِدَ الْمُتَمَرِّدَ، الَّذِي يَتَمَرَّدُ عَلَى اللَّهِ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٩٤، ومسلم: ٢٧٥١، والترمذي: ٣٥٤٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٥٦، ومسلم: ٣٠، وأبو داود: ٥٥٩ مختصراً، والترمذي: ٢٦٤٣.

(٣) موضوع.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: لە یەکێک لە غەزاکان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، جا بەلای هۆزێکدا تێپەڕی و فەرمووی: ئەو هۆزە کێیە؟ گوتیان: ئێمە مسوڵمانین، ئافرەتێکیش (لەوکاتەدا) تەندوری دادەخست و کوڕێکی خۆی لەگەڵدا بوو، جا کاتێک تەندورەکە گڕی گرت و گڕی بەرزبۆوە منداڵەکەی لابرد (و دووری خستەوە)، ئنجا هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو گوتی: تۆ پێغەمبەری خوای ﷺ؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتی: بە باوک و دایکەوە فیدات بم، ئایا خوا بە بەزەییترینی خاوەن بەزەییەکان نیە؟ فەرمووی: بەڵێ بە بەزەییترینە، گوتی: ئایا خوا بۆ بەندەکانی لە دایک بەسۆزو میهرەبانتر نیە بۆ منداڵەکەی؟ فەرمووی: بەڵێ وایە میهرەبانترە، گوتی: دەی دایک هەرگیز منداڵەکەی فڕێناداتە ناو ئاگرەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی لە زەوییەوە بڕی و دەگریا، پاشان سەری بەرزکردەوەو فەرمووی: هەرگیز خوا بەندەکانی سزا نادات مەگەر ئەوانە نەبێ کە لە خوا یاخی دەبن و هەڵدەگەڕێنەوە (هەق نابینن و نابیستن) و ئەوانە لە خوا هەڵدەگەڕێنەوەو نکوڵی و ئینکاری ئەوە دەکەن کە بڵێن: «لا إله إلا الله» (واتە: دان بە یەکتایی خوادا نانێن).

٤٢٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَدْخُلُ النَّارَ إِلَّا شَقِيٌّ»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَنِ الشَّقِيُّ؟ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَعْمَلْ لِلَّهِ بِطَاعَةٍ، وَلَمْ يَتْرُكْ لَهُ مَعْصِيَةً»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەنها ئەو کەسە دەچێتە دۆزەخەوە کە خراپەکار بێ، پرسیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خراپەکار کێیە؟ فەرمووی: ئەو کەسەیە کە کارو کردەوەکانی بەپێی فەرمانی خودا نین و بۆ خودا نین، وە واز لە سەرپێچی و تاوان ناهێنێ لەپێناو ڕەزامەندی خوادا.

٤٢٩٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَرَأَ، أَوْ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ۝٥٦﴾ المدثر، فَقَالَ: قَالَ اللَّهُ ﷻ: «أَنَا أَهْلٌ أَنْ أُتَّقَى، فَلَا يُجْعَلْ مَعِي إِلَهٌ آخَرُ، فَمَنِ اتَّقَى أَنْ يَجْعَلَ مَعِي إِلَهًا آخَرَ، فَأَنَا أَهْلٌ أَنْ أَغْفِرَ لَهُ»[2].

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٣٣٢٨.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ۝٥٦﴾ المدثر، واتە: خوا شیاوی لێ ترسانە، وە شیاوی لێ خۆشبوونە. دواتر فەرمووی: خوای ﷻ فەرموویەتی: تەنها من شایستەی ئەوەم کە پارێزکاریم بۆ بکرێ و هیچ پەرستراوێکی دیکەش لەگەڵ من نەکرێتە هاوبەش، جا هەر کەسێک پارێزکاری کرد لەوەی کە هیچ پەرستراوێکی دیکە لەگەڵ من دابنێ (منی بە تەنها پەرست) ئەوە بێگومان هەر منیش شایستەی ئەوەم کە لێی خۆشبم.

**٤٣٠٠- عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحُبُلِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُصَاحُ بِرَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ، فَيُنْشَرُ لَهُ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ سِجِلًّا، كُلُّ سِجِلٍّ مَدَّ الْبَصَرِ، ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ ﷻ: هَلْ تُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا؟ فَيَقُولُ: لَا، يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: أَظَلَمَتْكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ؟ فَيَقُولُ: لَا، ثُمَّ يَقُولُ: أَلَكَ عُذْرٌ، أَلَكَ حَسَنَةٌ؟ فَيُهَابُ الرَّجُلُ، فَيَقُولُ: لَا، فَيَقُولُ: بَلَى، إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَاتٍ، وَإِنَّهُ لَا ظُلْمَ عَلَيْكَ الْيَوْمَ، فَتُخْرَجُ لَهُ بِطَاقَةٌ فِيهَا: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، قَالَ: فَيَقُولُ: يَا رَبِّ مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ، مَعَ هَذِهِ السِّجِلَّاتِ؟ فَيَقُولُ: إِنَّكَ لَا تُظْلَمُ، فَتُوضَعُ السِّجِلَّاتُ فِي كِفَّةٍ، وَالْبِطَاقَةُ فِي كِفَّةٍ، فَطَاشَتِ السِّجِلَّاتُ، وَثَقُلَتِ الْبِطَاقَةُ». قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى: الْبِطَاقَةُ: الرُّقْعَةُ، وَأَهْلُ مِصْرَ يَقُولُونَ لِلرُّقْعَةِ: بِطَاقَةٌ**[1].

واتە: ئەبو عەبدوڕەحمانی حوبولی ﷺ دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ بوو، دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا بە بەرچاوی هەموو خەڵکەوە بانگی پیاوێک دەکرێ لە ئوممەتەکەم و نەوەدو نۆ پەڕاوی بۆ دەکرێتەوەو بڵاودەکرێن، کە هەر پەڕاوێک بە درێژایی بینایی چاوە، پاشان خوای ﷻ دەفەرمووێ: ئایا لە هیچ شتێکی ئەوانە نکوڵی دەکەی؟ دەڵێ: نەخێر ئەی پەروەردگارا، ئنجا دەفەرمووێت: ئایا ئەو فریشتانەی من کە کردەوەکانی تۆیان نوسیوە هیچ ستەمیان لێ کردووی؟ کابرا دەڵێ: نەخێر، پاشان دەفەرمووێ: ئایا بەرانبەر ئەوە هیچ بیانو و پۆزشێکت هەیە، هیچ چاکەیەکت هەیە؟ ئنجا پیاوەکە سام دەیگرێ و دەڵێ: نەخێر، ئنجا خوا دەفەرمووێ: بەڵێ، لای ئێمە چاکەگەلێکت هەیە، بێگومان چەند چاکەت لای ئێمە هەیە، وە هەرگیز ئەمڕۆش تۆ ستەمت لێ

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٦٣٩.

ناکرێت، ئنجا کارتێک (بیتاقەیەک) دەهێنن کە ئەوەی تێدا تۆمارکراوە: «أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»، کابراش دەڵێ: جا ئەی پەروەردگارا ئەو کارتە بەرانبەر بەو هەموو پەڕاوە دەبێتە چی؟ خوداش دەفەرمووێ: بێگومان تۆ ستەمت لێ ناکرێت، جا پەڕاوەکان هەموویان دەخەنە لایەکی تەرازوو کارتەکەش دەخەنە لایەک، ئیتر پەڕاوەکان بە هەوا دەکەون (لەبەر سووکی وەزنیان بەرابەر کارتەکە)، وە تای تەرازووی کارتەکەش قورس و گران دەبێ (کابرا ڕزگاری دەبێت). موحەممەدی کوڕی یەحیا دەڵێ: «البطاقة»، واتە: پارچە پەڕۆیەکی بچووک، خەڵکی میصر بە ڕوقعە دەڵێن: «بطاقة».

## بابەت: حەوز (ئەستێڵ)

**٤٣٠١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ لِي حَوْضًا مَا بَيْنَ الْكَعْبَةِ، وَبَيْتِ الْمَقْدِسِ أَبْيَضَ، مِثْلَ اللَّبَنِ، آنِيَتُهُ عَدَدُ النُّجُومِ، وَإِنِّي لَأَكْثَرُ الْأَنْبِيَاءِ تَبَعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].**

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ڕاستیدا من حەوزێکم هەیە کە دووری و ماوەکەی نێوانی کەعبەو بەیتولمەقدیسە، ڕەنگی وەکو شیر سپییە، پەرداخ و لیوانەکانی بە ئەندازەی ژمارەی ئەستێرەکانە، وە بەڕاستی ئەمن لەنێوان پێغەمبەراندا زۆرترین شوێنکەوتووم هەیە لە قیامەتدا.

**٤٣٠٢- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ حَوْضِي لَأَبْعَدُ مِنْ أَيْلَةَ إِلَى عَدَنَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَآنِيَتُهُ أَكْثَرُ مِنْ عَدَدِ النُّجُومِ، وَلَهُوَ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لَأَذُودُ عَنْهُ الرِّجَالَ، كَمَا يَذُودُ الرَّجُلُ الْإِبِلَ الْغَرِيبَةَ عَنْ حَوْضِهِ»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَعْرِفُنَا؟ قَالَ: «نَعَمْ، تَرِدُونَ عَلَيَّ غُرًّا مُحَجَّلِينَ، مِنْ أَثَرِ الْوُضُوءِ لَيْسَتْ لِأَحَدٍ غَيْرِكُمْ»[2].**

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە بێگومان حەوزەکەی من ماوەی دوورییەکەی زیاترە لەنێوان ئەیلە (شارێکە لە شام وە ناوی کێوێکیشە لەنێوان مەککەو مەدینە) تاکو عەدەن، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٤٨.

پەرداخ و قاپەکانی لە ژمارەی ئەستێرەکان زیاترن، وە بە دڵنیاییەوە ڕەنگی ئاوەکەی سپیترە لە شیرو شیرینترە لە هەنگوین، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەمن هەندێ پیاو دەردەکەم لەسەر حەوزەکە هەر وەکو چۆن پیاو وشتری بێگانە لەسەر حەوزەکەی دەردەکات، پرسیار کرا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەمانناسیتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، ئێوە دێن بۆلای من کە ڕەنگتان بەهۆی شوێنەواری ئەندامەکانی دەستنوێژ سپی و درەوشاوەیە، ئەوەش بۆ کەسیتر نیە جگە لە ئێوە.

**٤٣٠٣- عَنْ أَبِي سَلَّامٍ الْحَبَشِيِّ ﷺ، قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ فَأَتَيْتُهُ عَلَى بَرِيدٍ، فَلَمَّا قَدِمْتُ عَلَيْهِ، قَالَ: لَقَدْ شَقَقْنَا عَلَيْكَ، يَا أَبَا سَلَّامٍ فِي مَرْكَبِكَ، قَالَ: أَجَلْ، وَاللَّهِ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، قَالَ: وَاللَّهِ، مَا أَرَدْتُ الْمَشَقَّةَ عَلَيْكَ، وَلَكِنْ حَدِيثٌ بَلَغَنِي أَنَّكَ تُحَدِّثُ بِهِ، عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فِي الْحَوْضِ، فَأَحْبَبْتُ أَنْ تُشَافِهَنِي بِهِ، قَالَ: فَقُلْتُ: حَدَّثَنِي ثَوْبَانُ، مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ حَوْضِي مَا بَيْنَ عَدَنَ إِلَى أَيْلَةَ، أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ، وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ، أَكَاوِيبُهُ كَعَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهُ شَرْبَةً لَمْ يَظْمَأْ بَعْدَهَا أَبَدًا، وَأَوَّلُ مَنْ يَرِدُهُ عَلَيَّ فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ، الدُّنْسُ ثِيَابًا، وَالشُّعْثُ رُءُوسًا، الَّذِينَ لَا يَنْكِحُونَ الْمُنَعَّمَاتِ، وَلَا يُفْتَحُ لَهُمُ السُّدَدُ» قَالَ: «فَبَكَى عُمَرُ حَتَّى اخْضَلَّتْ لِحْيَتُهُ»، ثُمَّ قَالَ: «لَكِنِّي قَدْ نَكَحْتُ الْمُنَعَّمَاتِ، وَفُتِحَتْ لِي السُّدَدُ، لَا جَرَمَ أَنِّي لَا أَغْسِلُ ثَوْبِي الَّذِي عَلَى جَسَدِي حَتَّى يَتَّسِخَ، وَلَا أَدْهُنُ رَأْسِي حَتَّى يَشْعَثَ»[١].**

واتە: ئەبو سەلامی حەبەشیی ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بەدوایدا ناردم، منیش بە سوارییەکی ناڕەحەتەوە چووم، جا کاتێک گەیشتمە لای گوتی: ئەی ئەبو سەلام بەڕاستی ئەزیەتماندای بەهۆی وڵاخی سوارییەکەت، گوتی: بەڵێ وایە سوێند بە خوا ئەی پێشەوای بڕواداران، گوتی: سوێند بە خوا من نەمویست ئازارت بدەم و ناڕەحەتیت بخەمەسەر (بەهۆی هاتنت) بەڵام فەرموودەیەکم پێگەیشتووە کە تۆ لە سەوبانی خزمەتکاری پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕیتەوە دەربارەی حەوز، جا پێم خۆشە ڕووبەڕوو دەماودەم لە خۆتی ببیستم، گوتی: سەوبانی خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی گێڕامەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی حەوزەکەم لە قیامەتدا بە ئەندازەی عەدەن و ئەیلە بەرینە، سپیەتییەکەی لە شیر زیاترەو لە

---

(١) صحيح المرفوع منه. أخرجه الترمذي: ٢٤٤٤.

هەنگوین شیرینترە، کوپ و پەرداخەکانی بە ئەندازەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، جا هەر کەسێک یەک جار لێی بخواتەوە هەرگیز تینوو نابێتەوە، وە یەکەم کۆمەڵە کە دێنە لام هەژارەکانی کۆچبەرانن، کە پۆشاکیان چڵکن و کۆنن و سەریان ئاڵۆزو قرژنە، ئەوانەن کە ئافرەتی خۆشگوزەران مارە ناکەن و دەرگایان لەسەر ناکرێتەوە، گوتی: عومەر بە جۆرێک گریا ڕیشی تەڕبوو، پاشان گوتی: بەڵام من ئافرەتی خۆشگوزەرانم مارە کردووەو دەرگای دونیام لەسەر کراوەتەوە، بەڵام قەینا منیش بێگومان پۆشاکەکەم ناشۆم تاکو کۆن و چڵکن دەبێ، وە ڕۆن لە سەرم نادەم تاکو ئاڵۆز بێت.

**٤٣٠٤- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا بَيْنَ نَاحِيَتَيْ حَوْضِي كَمَا بَيْنَ صَنْعَاءَ، وَالْمَدِينَةِ، أَوْ كَمَا بَيْنَ الْمَدِينَةِ، وَعُمَانَ»[١].**

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نێوانی ئەولاو ئەولای حەوزەکەم (لە بەهەشتدا) وەکو نێوانی سەنعاو مەدینە وایە، یان وەکو نێوانی مەدینەو عومانە.

**٤٣٠٥- عَنْ قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: «يُرَى فِيهِ أَبَارِيقُ الذَّهَبِ، وَالْفِضَّةِ كَعَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ»[٢].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەسەر حەوزی کەوسەر بە ئەندازەی ئەستێرەکانی ئاسمان کوپ و گڵاسی ئاڵتوون و زیو دەبینرێت.

**٤٣٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ أَتَى الْمَقْبَرَةَ فَسَلَّمَ عَلَى الْمَقْبَرَةِ، فَقَالَ: «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى بِكُمْ لَاحِقُونَ»، ثُمَّ قَالَ: «لَوَدِدْنَا أَنَّا قَدْ رَأَيْنَا إِخْوَانَنَا»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوَلَسْنَا إِخْوَانَكَ؟ قَالَ: «أَنْتُمْ أَصْحَابِي، وَإِخْوَانِي الَّذِينَ يَأْتُونَ مِنْ بَعْدِي، وَأَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ تَعْرِفُ مَنْ لَمْ يَأْتِ مِنْ أُمَّتِكَ؟ قَالَ: «أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ رَجُلًا لَهُ خَيْلٌ غُرٌّ مُحَجَّلَةٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ خَيْلٍ دُهْمٍ بُهْمٍ، أَلَمْ يَكُنْ يَعْرِفُهَا؟» قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «فَإِنَّهُمْ يَأْتُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ، مِنْ أَثَرِ الْوُضُوءِ»، قَالَ: «أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ»،**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٨٠، ومسلم: ٢٣٠٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٨٠، ومسلم: ٢٣٠٣، والترمذي: ٢٤٤٢.

ثُمَّ قَالَ: «لَيُذَادَنَّ رِجَالٌ عَنْ حَوْضِي، كَمَا يُذَادُ الْبَعِيرُ الضَّالُّ، فَأُنَادِيهِمْ: أَلَا هَلُمُّوا فَيُقَالُ: إِنَّهُمْ قَدْ بَدَّلُوا بَعْدَكَ، وَلَمْ يَزَالُوا يَرْجِعُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ، فَأَقُولُ: أَلَا سُحْقًا، سُحْقًا»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆ گۆڕستانێک، جا لە گۆڕستانەکە سەلامی کردو فەرمووی: سەلامی خواتان لەسەر بێ ماڵ و مەنزڵی گەلی مسوڵمان، وە بێگومان ئێمەش ئەگەر خوا بیهەوێ بە ئێوە دەگەین، پاشان فەرمووی: خۆزگە دەخوازین و پێمان خۆش بوو کە براکانمان بدیتبایە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدی ئێمە برای تۆ نین؟ فەرمووی: ئێوە هاوەڵانی منن، وە براکانم ئەوانەن کە لەمەودوا دێن لەدوای من، وە من پێش ئێوە دەکەوم بۆ سەرحەوز (بۆ پێشوازی و ئامادەکاری بۆتان)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن ئەوانە دەناسیەوە لە ئوممەتەکەت کە هێشتا نەهاتوونە؟ فەرمووی: پێم بڵێن: ئەگەر پیاوێک ئەسپێکی قەشانی (ناوچەوان سپی) دەست و پەل سپی و درەوشاوەی هەبێ لەناو ئەسپگەلێکی ڕەشی تێردا ئایا نایناسێتەوە؟ گوتیان: بەڵێ دەیناسێتەوە، فەرمووی: ئەوان لە ڕۆژی قیامەتدا دێن و لە کاریگەری و شوێنەواری دەستنوێژ ناوچەوان و دەست و پێستیان ڕووناک و سپی و درەوشاوەن، فەرمووی: ئەمن پێشتان دەکەوم بۆ سەرحەوز، پاشان فەرمووی: لە ڕاستیدا هەندێک کەس هەیە کە لە حەوزەکەم دەردەکرێن و ناهێڵن نزیک ببنەوە هەر وەکو چۆن وشتری ونبوو دەردەکرێت، بۆیە منیش بانگیان دەکەم (و دەڵێم): وەرنە پێشەوە، ئنجا دەگوترێت: بێگومان ئەوانە دوای تۆ دینەکەیان گۆڕیوە، وە بەردەوام لەسەر پاژنەپێکانیان بەرەودوا دەگەڕێنەوە، ئنجا منیش دەڵێم: مادام وایە دووری بۆ ئێوە، دووری بۆ ئێوە.

## بابەت: تکاکردن (شەفاعەت)

٤٣٠٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ، فَتَعَجَّلَ كُلُّ نَبِيٍّ دَعْوَتَهُ، وَإِنِّي اخْتَبَأْتُ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لِأُمَّتِي، فَهِيَ نَائِلَةٌ مَنْ مَاتَ مِنْهُمْ، لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٤٩، وأبو داود جزء منه: ٣٢٣٧، والنسائي: ١٥٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٣٠٤، ومسلم: ١٩٨ و ١٩٩، والترمذي: ٣٦٠٢.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو پێغەمبەرێک دوعایەکی هەیە کە بێگومان وەردەگیرێت، جا هەموویان لە دونیادا دوعاکەیان کردوە، بەڵام بەڕاستی من دوعاکەم هەڵگرتووە کە ببێتە تکا بۆ ئوممەتەکەم (لە قیامەتدا)، ئەو دوعایەم و شەفاعەتەم هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە مردوون مادام هاوبەشی بۆ خوا بڕیار نەدابێت.

٤٣٠٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ، وَلَا فَخْرَ، وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ الْأَرْضُ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا فَخْرَ، وَأَنَا أَوَّلُ شَافِعٍ، وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ، وَلَا فَخْرَ، وَلِوَاءُ الْحَمْدِ بِيَدِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا فَخْرَ»[1].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەمن گەورەو بەڕێزترینی هەموو وەچەی ئادەمم وە بە خۆهەڵکێشانم شانازی وا نالێم، وە من یەکەم کەسم کە زەویم بۆ لەت دەبێ (زیندوو دەبمەوە) لە ڕۆژی قیامەتداو خۆهەڵکێشان نیە، وە من یەکەم تکاکارو تکاگیراوەم و خۆهەڵکیشان نیە، وە ئاڵای سوپاس و ستایش لە ڕۆژی قیامەتدا بە دەستی منەو خۆهەڵکێشان نیە.

٤٣٠٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَّا أَهْلُ النَّارِ، الَّذِينَ هُمْ أَهْلُهَا، فَلَا يَمُوتُونَ فِيهَا، وَلَا يَحْيَوْنَ، وَلَكِنْ نَاسٌ أَصَابَتْهُمْ نَارٌ بِذُنُوبِهِمْ، أَوْ بِخَطَايَاهُمْ، فَأَمَاتَتْهُمْ إِمَاتَةً، حَتَّى إِذَا كَانُوا فَحْمًا أُذِنَ لَهُمْ فِي الشَّفَاعَةِ، فَجِيءَ بِهِمْ ضَبَائِرَ ضَبَائِرَ، فَبُثُّوا عَلَى أَنْهَارِ الْجَنَّةِ، فَقِيلَ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ أَفِيضُوا عَلَيْهِمْ، فَيَنْبُتُونَ نَبَاتَ الْحِبَّةِ تَكُونُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ». قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: كَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَدْ كَانَ فِي الْبَادِيَةِ[2].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕاستیدا خەڵکی دۆزەخ ئەوانەن کە شایستەی ئەوێن، نە دەمرن لەناویدا نە ژیان دەکەن، بەڵام خەڵکانێک هەیە کە توشی ئاگر دەبن بەهۆی تاوان و هەڵەکانیانەوە مردنێک دەیانمرێنێ تاکو وەکو خەڵوزیان بەسەردێت، ئنجا مۆڵەتیان بۆ دەدرێ کە شەفاعەتیان بۆ بکرێت، جا کۆمەڵ کۆمەڵ دەیانهێنن و بەسەر ڕووبارەکانی بەهەشتدا بڵاویان دەکەنەوە،

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٣٦١٥ و ٣١٤٨ مطولًا.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٥.

ئنجا دەگوترێت: ئەی خەڵکی بەهەشت ئاویان بەسەردا بڕێژن (لە ئاوی ڕووبارەکانی بەهەشت)، بۆیە وەکو دەنکە پاقلەو تۆمە کە لە قەراخی شیوەکان لافاو دەیانهێنێ سەوز دەبنەوە چەکەرە دەکەنەوە. ڕاوی گوتی: پیاوێک لە خەڵکەکە گوتی: وەکو ئەوە وابوو پێغەمبەر ﷺ لەناو شیوو دۆڵەکان بێ (هێندە بە شارەزایی باسی دەکرد).

٤٣١٠- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ لِأَهْلِ الْكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي»[1].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: تکاو شەفاعەتی من لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ ئەوانەیە کە خاوەنی گوناه و تاوانی گەورەن لە ئوممەتەکەم.

٤٣١١- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خُيِّرْتُ بَيْنَ الشَّفَاعَةِ، وَبَيْنَ أَنْ يَدْخُلَ نِصْفُ أُمَّتِي الْجَنَّةَ، فَاخْتَرْتُ الشَّفَاعَةَ، لِأَنَّهَا أَعَمُّ وَأَكْفَى، أَتُرَوْنَهَا لِلْمُتَّقِينَ؟ لَا، وَلَكِنَّهَا لِلْمُذْنِبِينَ، الْخَطَّائِينَ الْمُتَلَوِّثِينَ»[2].

واتە: ئەبو موسای ئەشعەریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەرپشک کراوم لەنێوان ئەوەی کە شەفاعەت بکەم یان نیوەی ئوممەتەکەم بچێتە بەهەشتەوە، منیش شەفاعەتەکەم هەڵبژارد چونکە گشتگیرترو تێرو تەواوترە، ئایا وا دەبینن شەفاعەت بۆ پارێزکارانە (المتقين)؟! نەخێر، بەڵکو بۆ ئەوانەیە کە تاوانبارو گوناهبارن و پەرێزیان پیسە.

٤٣١٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «يَجْتَمِعُ الْمُؤْمِنُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُلْهَمُونَ، أَوْ يَهُمُّونَ - شَكَّ سَعِيدٌ - فَيَقُولُونَ: لَوْ تَشَفَّعْنَا إِلَى رَبِّنَا فَأَرَاحَنَا مِنْ مَكَانِنَا، فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ: أَنْتَ آدَمُ أَبُو النَّاسِ، خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ، وَأَسْجَدَ لَكَ مَلَائِكَتَهُ، فَاشْفَعْ لَنَا عِنْدَ رَبِّكَ يُرِحْنَا مِنْ مَكَانِنَا هَذَا، فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ، وَيَذْكُرُ وَيَشْكُو إِلَيْهِمْ ذَنْبَهُ الَّذِي أَصَابَ، فَيَسْتَحْيِي مِنْ ذَلِكَ، وَلَكِنِ ائْتُوا نُوحًا، فَإِنَّهُ أَوَّلُ رَسُولٍ بَعَثَهُ اللَّهُ إِلَى أَهْلِ الْأَرْضِ، فَيَأْتُونَهُ، فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ، وَيَذْكُرُ سُؤَالَهُ رَبَّهُ مَا لَيْسَ لَهُ بِهِ عِلْمٌ، وَيَسْتَحْيِي مِنْ ذَلِكَ، وَلَكِنِ ائْتُوا خَلِيلَ الرَّحْمَنِ إِبْرَاهِيمَ، فَيَأْتُونَهُ، فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ، وَلَكِنِ ائْتُوا مُوسَى، عَبْدًا كَلَّمَهُ اللَّهُ وَأَعْطَاهُ التَّوْرَاةَ، فَيَأْتُونَهُ، فَيَقُولُ: لَسْتُ

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٤٣٦.

(٢) صحيح دون قوله: «لِأَنَّهَا».

هُنَاكُمْ، وَيَذْكُرُ قَتْلَهُ النَّفْسَ بِغَيْرِ النَّفْسِ، وَلَكِنِ ائْتُوا عِيسَى عَبْدَ اللَّهِ وَرَسُولَهُ، وَكَلِمَةَ اللَّهِ وَرُوحَهُ، فَيَأْتُونَهُ، فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ، وَلَكِنِ ائْتُوا مُحَمَّدًا، عَبْدًا غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ: فَيَأْتُونِي فَأَنْطَلِقُ - قَالَ: فَذَكَرَ هَذَا الْحَرْفَ عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: فَأَمْشِي بَيْنَ السِّمَاطَيْنِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ - قَالَ: ثُمَّ عَادَ إِلَى حَدِيثِ أَنَسٍ، قَالَ: فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّي فَيُؤْذَنُ لِي، فَإِذَا رَأَيْتُهُ وَقَعْتُ سَاجِدًا، فَيَدَعُنِي مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدَعَنِي، ثُمَّ يُقَالُ: ارْفَعْ يَا مُحَمَّدُ، وَقُلْ تُسْمَعْ، وَسَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَحْمَدُهُ بِتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِيهِ، ثُمَّ أَشْفَعُ، فَيَحُدُّ لِي حَدًّا، فَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ، ثُمَّ أَعُودُ الثَّانِيَةَ، فَإِذَا رَأَيْتُهُ وَقَعْتُ سَاجِدًا، فَيَدَعُنِي مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدَعَنِي، ثُمَّ يُقَالُ لِي: ارْفَعْ مُحَمَّدُ، قُلْ تُسْمَعْ، وَسَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرْفَعُ رَأْسِي، فَأَحْمَدُهُ بِتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِيهِ، ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لِي حَدًّا فَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ، ثُمَّ أَعُودُ الثَّالِثَةَ، فَإِذَا رَأَيْتُ رَبِّي وَقَعْتُ سَاجِدًا، فَيَدَعُنِي مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدَعَنِي، ثُمَّ يُقَالُ: ارْفَعْ مُحَمَّدُ، قُلْ تُسْمَعْ، وَسَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأَحْمَدُهُ، بِتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِيهِ، ثُمَّ أَشْفَعُ، فَيَحُدُّ لِي حَدًّا، فَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ، ثُمَّ أَعُودُ الرَّابِعَةَ، فَأَقُولُ: يَا رَبِّ مَا بَقِيَ إِلَّا مَنْ حَبَسَهُ الْقُرْآنُ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا بڕواداران کۆدەبنەوە کە گرنگی بەو ڕۆژە دەدەن و غەم دایان دەگرێ یان داوای تکا دەکەن -سەعید کە ڕاوی فەرموودەکەیە گومانی هەیە کامیانی فەرمووە-، بۆیە دەڵێن: ئەگەر تکامان بۆ لە خوا بکرێ بۆ ئەوەی هەق و حیسابمان لەو شوێنە کراباو ڕزگارمان بوایە، بۆیە دێنە لای ئادەم و پێیدەڵێن: تۆ باوکی هەموو خەڵکەکەی، خوا بە دەستی خۆی دروستی کردووی، وە خوا وایکرد هەموو فریشتەکانیش سوجدەی ڕێزیان بۆ بردووی، دەی تکامان لای پەروەردگارت بۆ بکە لێرە ڕزگارمان بکات، ئەویش دەفەرمووێت: من ئەو کەسە نیم، ئیتر سکاڵای خۆی دەکات و باسی ئەو سەرپێچییەی خۆی دەکات کە تووشی هات، بۆیە شەرم دەکات تکا بکات و دەفەرمووێت: بچنە لای نوح، چونکە ئەو یەکەم نێردراوە کە خوا بۆ هەموو مرۆڤایەتی سەر زەوی ناردوویەتی، ئیتر دەچنە لای ئەو، ئەویش دەفەرموێت: ئیشی من نیە، باسی ئەو داواکارییەی دەکات کە بە بێ ئاگایی لە پەروەردگاری کردوە، لەبەر ئەوە شەرم دەکات، بەڵام بچنە لای خۆشەویستەکەی خوا کە ئیبراهیمە، ئەوانیش دەچنە لای ئەو، ئەویش دەفەرمووێت: ئیشی من نیە، بەڵام بچنە لای موسا، کە بەندەیەکە

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤ و ٤٤٧٦، ومسلم: ١٩٣، والترمذي: ٢٥٩٣.

خوا قسەی لەگەڵ کردوەو تەوڕاتی بۆ دابەزاندووە، ئەوانیش دەچنە لای ئەو، ئەویش دەفەرمووێت: ئیشی من نیە، باسی ئەو کەسەیان بۆ دەکات کە بە هەڵە لەدەستی کوژراوە، بەڵام بچنە لای عیسا، کە بەندەو پێغەمبەری خوایەو کەلیمەو ڕووحی ئەوە، ئەوانیش دەچنە لای ئەو، ئەویش دەفەرموێت: ئیشی من نیە، بەڵام بچن بۆ لای موحەممەد ﷺ، ئەو بەندەیەکە کە خوا لە گوناهی سەرەتاو کۆتایی خۆشبووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوجار دێنە لای من، منیش دێم بەدەمیانەوەو لە نێوان دوو ڕیزی خەڵکی برواداراەوە دەڕۆم، فەرمووی: ئەوجار داوای مۆڵەت لە پەروەردگارم دەکەم و مۆڵەتم پێدەدرێ، جا کە هەر کە خودا دەبینم یەکسەر دەچمە سوجدە، ئنجا چەندی خوا بیەوێ لە سوجدەدا دەمێنمەوە، پاشان دەگوترێت: سەرت بەرز بکە ئەی موحەممەد ﷺ، چیت دەوێ بیڵێ و بیستراوە، داوا بکەو پێتدەبەخشرێت، تکا بکەو تکات گیرایە، ئنجا منیش سوپاس و ستایشی دەکەم بە جۆرێک کە ئەو کات فێرم دەکات، پاشان تکا دەکەم، ئیتر سنورێکم بۆ دیاری دەکرێ و ئەوانەی بەر تکاکە کەوتوون دەیانباتە بەهەشتەوە، ئەوجار بۆجاری دووهەم دەگەڕێمەوە، کاتێک خوا دەبینم یەکسەر دەچمە سوجدە، ئنجا چەندی خوا پێی خۆشبێ لە سوجدەدا دەمهێڵێتەوە، پاشان پێمدەگوترێت: ئەی موحەممەد ﷺ سەرت بەرز بکەوەو چیت دەوێ بیڵێ بیستراوە، داوا بکە پێتدەبەخشرێت، تکا بکەو تکات گیرایە، منیش سەرم بەرز دەکەمەوەو ستایشی خوا دەکەم کە ئەکات فێرم دەکات، پاشان تکا دەکەم و سنورێک بۆ تکاکەم دادەنرێ و ئەوانیش دەخاتە بەهەشتەوە، ئەوجار بۆ جاری سێهەم دەگەڕێمەوەو کاتێک پەروەردگارم دەبینم دەچمە سوجدەوە، جا لە سوجدەدا دەمهێڵێتەوە ئەوەندەی خوا پێیخۆشبێت، پاشان دەگوترێت: ئەی موحەممەد ﷺ سەرت لە سوجدە بەرز بکەو چیت دەوێ بیڵێ و بیستراوە، داوا بکە پێتدەبەخشرێ و تکا بکە تکات وەرگیراوە، منیش سەرم هەڵدەبڕم و ستایشی خوا دەکەم بەجۆرێک کە خۆی فێرم دەکات، پاشان تکا دەکەم و تکاکەم سنوردار دەکات، ئەوانیش دەخاتە بەهەشتەوە، پاشان جاری چوارەم دەگەڕێمەوەو دەڵێم: ئەی پەروەردگارا تەنها ئەوانە ماون کە قورئان ڕێگری لێیانکردوە (واتە: ئەوانەی لە قورئاندا باسکراوە کە ئەوانە تکاکردن نایانگرێتەوە).

٤٣١٢م- قَالَ: يَقُولُ قَتَادَةُ عَلَى أَثَرِ هَذَا الْحَدِيثِ: وَحَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ شَعِيرَةٍ مِنْ خَيْرٍ، وَيَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ بُرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ، وَيَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ»[١].

ڕاوی دەڵێ: قەتادە لەدوای ئەو فەرموودەیە دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیک بۆی گێڕاینەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی بیگوتبێت: «لا إله إلا الله» و بە ئەندازەی دەنکە جۆیەک ئیمان لە دڵیدابێت، ئەوە لە دۆزەخ دێتە دەرەوە، وە ئەوەی بیگوتبێت: «لا إله إلا الله» و بە ئەندازەی دەنکە گەنمێک ئیمان لە دڵیدابێت، ئەوە لە دۆزەخ دێتە دەرەوە، وە هەر کەسێک بیگوتبێت: «لا إله إلا الله» و بە ئەندازەی گەردێک ئیمان لە دڵیدا بێ لە ئاگر دێتە دەرەوە.

٤٣١٣- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَشْفَعُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَلَاثَةٌ: الْأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الْعُلَمَاءُ، ثُمَّ الشُّهَدَاءُ»[٢].

واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا سێ چین تکاو شەفاعەت دەکەن: پێغەمبەران پاشان زانایان پاشان شەهیدان.

٤٣١٤- عَنِ الطُّفَيْلِ بْنِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ كُنْتُ إِمَامَ النَّبِيِّينَ وَخَطِيبَهُمْ، وَصَاحِبَ شَفَاعَتِهِمْ، غَيْرَ فَخْرٍ»[٣].

واتە: توفەیلی کوڕی ئوبەی کوڕی کەعب لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کە ڕۆژی قیامەت هات ئەوە من پێشەواو دەمڕاست و قسەکەری پێغەمبەرانم، وە خاوەنی شەفاعەتی ئەوانیشم فەخرو شانازی نیە.

٤٣١٥- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَيَخْرُجَنَّ قَوْمٌ مِنَ النَّارِ بِشَفَاعَتِي، يُسَمَّوْنَ الْجَهَنَّمِيِّينَ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) موضوع.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي بإثر: ٣٦١٣.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٦٦، وأبو داود: ٤٧٤٠، والترمذي: ٢٦٠٠.

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: قەومێک لەناو ئاگری دۆزەخ بەهۆی شەفاعەتی من دەهێنرێتە دەرەوە کە پێیان دەڵێن: جەهەننەمییەکان.

**٤٣١٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي الْجَدْعَاءِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ بِشَفَاعَةِ رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي، أَكْثَرُ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ سِوَاكَ؟ قَالَ: «سِوَايَ»، قُلْتُ: أَنْتَ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: أَنَا سَمِعْتُهُ[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو جەدعاء ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە دەیفەرموو: خەڵکانێک بەهۆی شەفاعەتی پیاوێک لە ئوممەتەکەم دەچنە ناو بەهەشتەوە کە لە هۆزی بەنو تەمیم زیاترن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە شەفاعەتی تۆ؟ فەرمووی: جگە لە شەفاعەتی من. (ڕاوی دەڵێ:) گوتم: تۆ بۆ خۆت لە پێغەمبەری خوات ﷺ بیست؟ گوتی: من بۆ خۆم لێم بیست.

**٤٣١٧-** عَنْ سُلَيْمَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ الْأَشْجَعِيَّ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَدْرُونَ مَا خَيَّرَنِي رَبِّيَ اللَّيْلَةَ؟» قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «فَإِنَّهُ خَيَّرَنِي بَيْنَ أَنْ يَدْخُلَ نِصْفُ أُمَّتِي الْجَنَّةَ، وَبَيْنَ الشَّفَاعَةِ، فَاخْتَرْتُ الشَّفَاعَةَ»، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنَا مِنْ أَهْلِهَا، قَالَ: «هِيَ لِكُلِّ مُسْلِمٍ»[2].

واتە: سولەیمی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: گوێم لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیی ﷺ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا دەزانن کە خوا ئەمشەو سەرپشکی کردم لەنێوان چی؟ گوتمان: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: سەرپشک کرام لەنێوان ئەوەی کە نیوەی ئوممەتەکەم بخرێتە بەهەشت وە لەنێوان ئەوەی کە شەفاعەتم پێبدرێت، منیش شەفاعەتەکەم هەڵبژارد، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوامان بۆ لە خوا بکە کە ئێمەش لەوانە بین (کە تکایان بۆ دەکەی)، فەرمووی: ئەو تکایە بۆ هەموو مسوڵمانێکە.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٤٣٨.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٤٤١.

## بابەت: سیفەتەکانی ئاگری دۆزەخ

**٤٣١٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ نَارَكُمْ هَذِهِ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ، وَلَوْلَا أَنَّهَا أُطْفِئَتْ بِالْمَاءِ مَرَّتَيْنِ، مَا انْتَفَعْتُمْ بِهَا، وَإِنَّهَا لَتَدْعُو اللَّهَ ﷻ أَنْ لَا يُعِيدَهَا فِيهَا»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئەو ئاگرەی ئێوە (کە لە دونیادا بەکاری دێنن) بەشێکە لە حەفتا بەشی (گەرمی و کڵپەی) ئاگری دۆزەخ، خۆ ئەگەر دووجار بە ئاو سارد نەکراباوەو گەرمییەکەی کەم نەکراباوە، ئەوە سودتان لێ نەدەبینی (لەبەر گەرمییەکەی کەس نەیدەتوانی لێی نزیک بێتەوە)، وە لە ڕاستیدا خودی ئاگرەکە لە خوا ﷻ دەپاڕێتەوەو داوا دەکات کە نەگەڕێتەوە سەر حاڵەتەکەی پێشووی (لە گەرمی و کڵپە).

**٤٣١٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اشْتَكَتِ النَّارُ إِلَى رَبِّهَا، فَقَالَتْ: يَا رَبِّ أَكَلَ بَعْضِي بَعْضًا، فَجَعَلَ لَهَا نَفَسَيْنِ: نَفَسٌ فِي الشِّتَاءِ، وَنَفَسٌ فِي الصَّيْفِ، فَشِدَّةُ مَا تَجِدُونَ مِنَ الْبَرْدِ مِنْ زَمْهَرِيرِهَا، وَشِدَّةُ مَا تَجِدُونَ مِنَ الْحَرِّ مِنْ سَمُومِهَا»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاگر لەلای پەروەردگاری سکاڵای کردو گوتی: ئەی پەروەردگارا (لە گەرمی و بەتینیدا) بەشێکم بەشەکەی دیکەی خوارد، بۆیە (خوا) مۆڵەتی دوو نەفەسی پێ دەدات: نەفەس و هەناسەدانێک لە زستانداو هەناسەدانێکیش لە هاویندا، جا ئەو ساردییە توندو تیژەی کە دەیبینن لە تەبەقەو بەشە هەرە ساردەکەی زەمهەریرە، وە ئەو گەرمییە توندو بەتینە کە (لە هاویندا) دەیبینن ئەوە لە بەشە گەرمەکەی سەمومە.

**٤٣٢٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ:: «أُوقِدَتِ النَّارُ أَلْفَ سَنَةٍ فَابْيَضَّتْ، ثُمَّ أُوقِدَتْ أَلْفَ سَنَةٍ فَاحْمَرَّتْ، ثُمَّ أُوقِدَتْ أَلْفَ سَنَةٍ فَاسْوَدَّتْ، فَهِيَ سَوْدَاءُ كَاللَّيْلِ الْمُظْلِمِ»[3].

---

(١) ضعيف جداً بهذا التمام، وصحيح دون قوله: «وَإِنَّهَا لَتَدْعُو».

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٧، ومسلم: ٦١٧، والترمذي: ٢٥٤٨.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٥٩١.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئاگری دۆزەخ هەزار ساڵ داگیرسا تاکو ڕەنگی سپی بوو، پاشان هەزار ساڵیتر داگیرسا تاکو ڕەنگی سوور بوو، پاشان هەزار ساڵ داگیرسا تاکو ڕەنگی ڕەش بوو، جا ئێستا ڕەنگی (ئاگری جەهەننەم) ڕەشەو وەکو شەوی تاریک و ئەنگوستەچاوە.

**٤٣٢١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُؤْتَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا مِنَ الْكُفَّارِ، فَيُقَالُ: اغْمِسُوهُ فِي النَّارِ غَمْسَةً، فَيُغْمَسُ فِيهَا، ثُمَّ يُخْرَجُ، ثُمَّ يُقَالُ لَهُ: أَيْ فُلَانُ هَلْ أَصَابَكَ نَعِيمٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لَا، مَا أَصَابَنِي نَعِيمٌ قَطُّ، وَيُؤْتَى بِأَشَدِّ الْمُؤْمِنِينَ ضُرًّا، وَبَلَاءً، فَيُقَالُ: اغْمِسُوهُ غَمْسَةً فِي الْجَنَّةِ، فَيُغْمَسُ فِيهَا غَمْسَةً، فَيُقَالُ لَهُ: أَيْ فُلَانُ هَلْ أَصَابَكَ ضُرٌّ قَطُّ، أَوْ بَلَاءٌ، فَيَقُولُ: مَا أَصَابَنِي قَطُّ ضُرٌّ، وَلَا بَلَاءٌ»[١].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا لە کافرەکان یەکێک دێنن کە خۆشترین ژیانی هەبووە لە دونیاداو لەوپەڕی خۆشگوزەرانیدا بووە، جا دەگوترێت: یەک ساتی کەم بیبەنە ناو ئاگرو لەناویدا نقومی بکەن، ئنجا دەیبەنە ناویەوە، پاشان دەردەهێنرێ و پێی دەگوترێت: ئەی فڵانە کەس هەرگیز توشی خۆشی بوویتە؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر هەرگیز توشی خۆشی نەهاتووم، ئەوجار لە بڕواداران کەسێک دێنن کە توندترین و بە ئازارترین بەڵاو ناخۆشی بینیوە، جا دەگوترێت: ساتێکی کەم بیبەنە ناو خۆشییەکانی بەهەشتەوە، جا ساتێک دەیبەنە بەهەشت و پێی دەگوترێت: ئەی فڵانە کەس هەرگیز توشی ناخۆشی و ناڕەحەتی هاتوویتە؟ ئەویش دەڵێ: هەرگیز ناخۆشی و ئازارو بەڵام توش نەهاتووە.

**٤٣٢٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ الْكَافِرَ لَيَعْظُمُ حَتَّى إِنَّ ضِرْسَهُ لَأَعْظَمُ مِنْ أُحُدٍ، وَفَضِيلَةُ جَسَدِهِ عَلَى ضِرْسِهِ، كَفَضِيلَةِ جَسَدِ أَحَدِكُمْ عَلَى ضِرْسِهِ»[٢].**

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مرۆڤی کافر (لەناو دۆزەخدا) جەستەو قەبارەی بە جۆرێک گەورە دەکرێ کە خرێنەیەکی لە کێوی ئوحود گەورەتر دەبێ، وە گەورەیی جەستەشی لەچاو خرێنەکەی وەکو گەورەیی قەبارەی هەر یەکێکتانە لەچاو خرێنەی خۆی.

---

(١) صحيح. مسلم: ٢٨٠٧.

(٢) صحيح دون قوله: «وَفَضِيلَةُ» وضعيف بهذا التمام.




**٤٣٢٣- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ قَيْسٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ أَبِي بُرْدَةَ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَدَخَلَ عَلَيْنَا الْحَارِثُ بْنُ أُقَيْشٍ، فَحَدَّثَنَا الْحَارِثُ لَيْلَتَئِذٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ بِشَفَاعَتِهِ أَكْثَرُ مِنْ مُضَرَ، وَإِنَّ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يَعْظُمُ لِلنَّارِ حَتَّى يَكُونَ أَحَدَ زَوَايَاهَا»[١].**

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی قەیس ﷺ دەڵێ: شەوێکیان لەلای ئەبو بوڕدە بووم، جا حاریسی کوڕی ئوقەیش هاتە لامان، وە حاریس لەو شەوەدا بۆی گێڕاینەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە بێگومان کەسی وا هەیە لە ئوممەتی من کەوا بەهۆی شەفاعەتەکەیەوە خەڵکانێک دەچنە بەهەشتەوە کە زیاترن لە هۆزی «مضر»، وە بێگومان هەیشە لە ئوممەتی من کە ئەوەندە قەبارەی گەورە دەکرێ بۆ ناو ئاگر (تا سزای زیاتر بچێژێ)، هەتا وای لێدێ دەبێتە لایەکی دۆزەخ (لە گەورەیی قەبارەیدا).**

**٤٣٢٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُرْسَلُ الْبُكَاءُ عَلَى أَهْلِ النَّارِ، فَيَبْكُونَ حَتَّى يَنْقَطِعَ الدُّمُوعُ، ثُمَّ يَبْكُونَ الدَّمَ حَتَّى يَصِيرَ فِي وُجُوهِهِمْ كَهَيْئَةِ الْأُخْدُودِ، لَوْ أُرْسِلَتْ فِيهَا السُّفُنُ لَجَرَتْ»[٢].**

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕێگای گریان بەخەڵکی دۆزەخ دەدرێ و بۆیان دەنێردرێت، بۆیە دەگریەن تاکو فرمێسک لە چاویان وشک دەبێت، پاشان (کە فرمێسک نەما) خوێن لەچاوانیان دێ بە خوێن دەگرییێن، هەتاکو ڕوخساریان وەک خەندەق و چاڵ چاڵ دەبێ و کە ئەگەر کەشتی بچێتە ناوی بەناویدا دەڕوات.**

**٤٣٢٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ آل عمران، وَلَوْ أَنَّ قَطْرَةً مِنَ الزَّقُّومِ قَطَرَتْ فِي الْأَرْضِ، لَأَفْسَدَتْ عَلَى أَهْلِ الدُّنْيَا مَعِيشَتَهُمْ، فَكَيْفَ بِمَنْ لَيْسَ لَهُ طَعَامٌ غَيْرُهُ؟»[٣].**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) ضعيف، وصح مختصراً دون ذكر قوله: «ثُمَّ يَبْكُونَ الدَّمَ» إلى «كَهَيْئَةِ الْأُخْدُودِ».

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٥٨٥.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ آل عمران، ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بترسن لەخوا ترسانێک کە شیاوێتی وە مەمرن مەگەر بە موسوڵمانی نەبێ. (فەرمووی:) ئەگەر یەک دڵۆپە لە بەری داری «الزقّوم» (کە ڕەگی لەناو دۆزەخدایە) بڕژێتە سەر زەوی، ئەوە ژیانی خەڵکی سەر زەوی هەمووی تێک دەدات و لەناوی دەبات، جا دەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێ کە جگە لە بەری ئەو دارە هیچ خواردنێکی دیکەی نیە؟

**٤٣٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «تَأْكُلُ النَّارُ ابْنَ آدَمَ إِلَّا أَثَرَ السُّجُودِ، حَرَّمَ اللَّهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ أَثَرَ السُّجُودِ»**[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئاگری دۆزەخ تەواوی جەستەی ئادەمیزادی دۆزەخی دەخوات جگە لە شوێنەواری سوجدە نەبێت، خوا لەسەر ئاگری حەرام کردوە کە شوێنەواری سوجدە بسوتێنێ.

**٤٣٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُؤْتَى بِالْمَوْتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُوقَفُ عَلَى الصِّرَاطِ، فَيُقَالُ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ فَيَطَّلِعُونَ خَائِفِينَ وَجِلِينَ أَنْ يُخْرَجُوا مِنْ مَكَانِهِمُ الَّذِي هُمْ فِيهِ، ثُمَّ يُقَالُ: يَا أَهْلَ النَّارِ فَيَطَّلِعُونَ مُسْتَبْشِرِينَ فَرِحِينَ أَنْ يُخْرَجُوا مِنْ مَكَانِهِمُ الَّذِي هُمْ فِيهِ، فَيُقَالُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ قَالُوا: نَعَمْ، هَذَا الْمَوْتُ، قَالَ: فَيُؤْمَرُ بِهِ فَيُذْبَحُ عَلَى الصِّرَاطِ، ثُمَّ يُقَالُ لِلْفَرِيقَيْنِ كِلَاهُمَا: خُلُودٌ فِيمَا تَجِدُونَ، لَا مَوْتَ فِيهَا أَبَدًا»**[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا مردن دەهێنرێ و لەسەر پردی سیڕات ڕادەگیرێت، جا دەگوترێت: ئەی خەڵکی بەهەشت (بانگیان دەکەن)، ئەوانیش ئاگادار دەبن و دەیبینن، دەترسێن لەوەی کە لەو شوێنە خۆشەی تێیدان دەربکرێن، پاشان دەگوترێت: ئەی خەڵکی دۆزەخ (بانگیان دەکرێت)، ئەوانیش ئاگادار دەبن و دڵیان خۆشدەبێت، وا دەزانن کە لەو شوێنەی تێیدان دەکرێنە دەرەوە، ئنجا دەگوترێت: ئایا ئەمە (مردن) دەناسن؟ دەڵێن:

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٠٦، ومسلم: ١٨٢ أخرجاء ضمن حديث طويل.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٤٥ طرفاً منه.

بەڵێ، ئەوە مردنە! فەرمووی: ئنجا فەرمان دەکرێ و لەسەر پردی سیڕات سەری (مردن) دەبڕن، پاشان بە هەردوو گروهەکە (بەهەشتی و دۆزەخی) دەگوترێت: ئیتر بە هەتا هەتایی دەمێننەوە لەو شوێنەی خۆتان، هەرگیز مردن نیەو نامرن.

## بابەت: سیفەتەکانی بەهەشت

٤٣٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ اللَّهُ ﷻ: «أَعْدَدْتُ لِعِبَادِيَ الصَّالِحِينَ، مَا لَا عَيْنٌ رَأَتْ، وَلَا أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلَا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ» قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَمِنْ بَلْهَ مَا قَدْ أَطْلَعَكُمُ اللَّهُ عَلَيْهِ، اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة، قَالَ: وَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يَقْرَؤُهَا: «مِنْ قُرَّاتِ أَعْيُنٍ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای ﷻ دەفەرمووێت: بۆ بەندە چاکەکارەکانم شتگەلێکم ئامادە کردوە کە هیچ چاوێک نەیبینیوەو هیچ گوێیەک نەیبیستووەو بە خەیاڵ و دڵی هیچ کەسێکیشدا نەهاتووە، ئەبو هورەیرە گوتی: واز لەوە بێنن کە خوا بۆی باس کردوون لە نیعمەتەکانی بەهەشت، ئەو ئایەتە بخوێننەوە ئەگەر حەزتان کرد: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة، واتە: ئەمجا هیچ کەس نازانێ چی شاراوەتەوە بۆیان لە (بەهەشت دا کە هۆی) گەشبوونی چاوەکانن ئەم پاداشتە (دەدرێنەوە) بە هۆی ئەو کردەوانەی کە کردویانە. ڕاوی گوتی: ئەبو هورەیرە بە «قُرَّاتِ أَعْيُنٍ» دەیخوێندەوە.

٤٣٢٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَشِبْرٌ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الْأَرْضِ وَمَا عَلَيْهَا الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی شوێنی یەک بست لە بەهەشتدا لە تەواوی زەوی و ئەوەیشی لەسەر زەوییە باشترە (باشترە لە دونیاو لەوەشی کە لە دونیادایە).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٤٤، ومسلم: ٢٨٢٤، والترمذي: ٣١٩٧ و ٣٢٩٢.

(٢) حسن لغيره.




٤٣٣٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَوْضِعُ سَوْطٍ فِي الْجَنَّةِ، خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»[1].

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە ئەندازەی شوێنی قەمچییەک لە بەهەشتدا لە دونیاش و ئەوەیشی کە لە دونیا دایە چاکترو بەنرخترە.

٤٣٣١- عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْجَنَّةُ مِائَةُ دَرَجَةٍ، كُلُّ دَرَجَةٍ مِنْهَا مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، وَإِنَّ أَعْلَاهَا الْفِرْدَوْسُ، وَإِنَّ أَوْسَطَهَا الْفِرْدَوْسُ، وَإِنَّ الْعَرْشَ عَلَى الْفِرْدَوْسِ، مِنْهَا تُفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ، فَإِذَا مَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَسَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ»[2].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەهەشت سەد پلەیە هەر پلەیەکی نێوانی ئاسمان و زەوییە، وە بەرزترینیان پلەی فیردەوسە، وە ناوەڕاستەکەیشیان فیردەوسە، وە عەرش لەسەرووی فیردەوسە، ڕووبارەکانی بەهەشت لەوێوە سەرچاوە دەگرن، جا هەرکات داواتان لە خوا کردو لە خوا پاڕانەوە ئەوە داوای فیردەوسی لێبکەن.

٤٣٣٢- عَنْ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ لِأَصْحَابِهِ: «أَلَا مُشَمِّرٌ لِلْجَنَّةِ؟ فَإِنَّ الْجَنَّةَ لَا خَطَرَ لَهَا، هِيَ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ نُورٌ يَتَلَأْلَأُ، وَرَيْحَانَةٌ تَهْتَزُّ، وَقَصْرٌ مَشِيدٌ، وَنَهَرٌ مُطَّرِدٌ، وَفَاكِهَةٌ كَثِيرَةٌ نَضِيجَةٌ، وَزَوْجَةٌ حَسْنَاءُ جَمِيلَةٌ، وَحُلَلٌ كَثِيرَةٌ فِي مَقَامٍ أَبَدًا، فِي حَبْرَةٍ وَنَضْرَةٍ، فِي دَارٍ عَالِيَةٍ سَلِيمَةٍ بَهِيَّةٍ» قَالُوا: نَحْنُ الْمُشَمِّرُونَ لَهَا، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «قُولُوا إِنْ شَاءَ اللَّهُ»، ثُمَّ ذَكَرَ الْجِهَادَ وَحَضَّ عَلَيْهِ[3].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵەکانی فەرموو: ئایە هیچ کەسێک نیە کە قۆڵی هەڵماڵیێ و پەلە بکات بۆ بەدەست هێنانی بەهەشت؟ چونکە بێگومان بەهەشت نمونەو وێنەی نیە، سوێند بە پەروەردگاری کەعبە بەهەشت نورو ڕوناکیەکە کە دەدرەوشێتەوە و ڕیحانەیەکە کە دەشەکێتەوە، قەسرو

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٦٤٨ و ١٦٦٤.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٥٣٠.

(٣) ضعيف.

خانوبەرەیەکە کە دامەزراو و پتەون، وە ڕوبارێکە کە بەردەوام دێت، وە میوەگەلێکی پێگەشتوی زۆری هەیە، وەخێزان و ئافرەتانی زۆرجوان و سەرنج ڕاکێشن، وە زۆر ڕازاوەیە، هەمیشەوە بەردەوام لەنیعمەت و خۆشی و جوانیدا، لە بیناو باڵەخانەی بەرزو خۆش و سەلامەت و جواندا، گوتیان: ئێمە قۆڵی لێ هەڵدەماڵین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڵێن: ئەگەر خوا پێ خۆش بێت، پاشان باسی جیهادو تێکۆشانی کردو خەڵکی لەسەر هاندا.

**٤٣٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوَّلُ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى ضَوْءِ أَشَدِّ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّمَاءِ إِضَاءَةً، لَا يَبُولُونَ، وَلَا يَتَغَوَّطُونَ، وَلَا يَمْتَخِطُونَ، وَلَا يَتْفُلُونَ، أَمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، وَرَشْحُهُمُ الْمِسْكُ، وَمَجَامِرُهُمُ الْأَلُوَّةُ، أَزْوَاجُهُمُ الْحُورُ الْعِينُ، أَخْلَاقُهُمْ عَلَى خُلُقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ آدَمَ، سِتُّونَ ذِرَاعًا»[1].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەم گروهێک کە دەچنە ناو بەهەشتەوە بە وێنەی مانگی چواردە درەوشاوەن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان وەکو ڕووناکی و درەوشاوەیی ڕووناکترین ئەستێرەی ئاسمانن، میزو پیسایی و چڵم و تفیان نیەو نایکەن، شانەیان لە زێڕە، بۆنی عەرەقیان وەکو بۆنی میسکەو بخوردانەکەیان بخوری عودی تێدا دایسێنن، خێزانەکانیان لە حۆریەکانن، ڕەفتارو هەڵسوکەوتیان لەسەر ڕەفتاری یەک کەسە (ڕاجیایی و کێشەو ڕق و کینەیان نیە)، لەسەر شێوەی باوکە گەورەیان ئادەمن، شەست گەزن.

**٤٣٣٣م- حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، مِثْلَ حَدِيثِ ابْنِ فُضَيْلٍ، عَنْ عُمَارَةَ[2].**

واتە: هاوشێوەی فەرموودەکەی ئیبنو فوزەیل لە عەمارەوە گێڕدراوەتەوە.

**٤٣٣٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْكَوْثَرُ نَهَرٌ فِي الْجَنَّةِ، حَافَّتَاهُ مِنْ ذَهَبٍ، مَجْرَاهُ عَلَى الْيَاقُوتِ وَالدُّرِّ، تُرْبَتُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ، وَمَاؤُهُ أَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ، وَأَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ الثَّلْجِ»[3].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٤٥، ومسلم: ٢٨٣٤، والترمذي: ٢٥٣٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٤٥، ومسلم: ٢٨٣٤، والترمذي: ٢٥٣٧.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٣٦١.




واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەوسەر ڕووبارێکە لەناو بەهەشتدا، لێوارو قەراغەکانی لە زێڕن، ڕاڕەوەکەی لە یاقوت و دوڕو گەوهەرە، خاکەکەی لە میسک بۆنخۆشترە، ئاوەکەی لە هەنگوین شیرینترو لە بەفر سپیترە.

**٤٣٣٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ شَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ سَنَةٍ، وَلَا يَقْطَعُهَا، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ۝٣٠﴾ الواقعة»[1].

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕاستیدا لەناو بەهەشت دارێک هەیە کە سوار سەد ساڵ ڕێ دەکات بەژێر سێبەرەکەیدا هەرواش ماوەی سێبەرەکەی نابڕێت، (ئەبو هوڕەیڕە گوتی:) ئەگەر پێتان خۆشە ئەو ئایەتە بخوێنەوە: ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ۝٣٠﴾ الواقعة، واتە: وە سێبەری بەردەوام و درێژکراوە.

**٤٣٣٦-** عَنْ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ ﷺ، أَنَّهُ لَقِيَ أَبَا هُرَيْرَةَ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَسْأَلُ اللَّهَ أَنْ يَجْمَعَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ فِي سُوقِ الْجَنَّةِ، قَالَ سَعِيدٌ: أَوَفِيهَا سُوقٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، أَخْبَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «أَنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ إِذَا دَخَلُوهَا، نَزَلُوا فِيهَا بِفَضْلِ أَعْمَالِهِمْ، فَيُؤْذَنُ لَهُمْ فِي مِقْدَارِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ مِنْ أَيَّامِ الدُّنْيَا، فَيَزُورُونَ اللَّهَ ﷻ، وَيُبْرِزُ لَهُمْ عَرْشَهُ، وَيَتَبَدَّى لَهُمْ فِي رَوْضَةٍ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ، فَتُوضَعُ لَهُمْ مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ، وَمَنَابِرُ مِنْ لُؤْلُؤٍ، وَمَنَابِرُ مِنْ يَاقُوتٍ، وَمَنَابِرُ مِنْ زَبَرْجَدٍ، وَمَنَابِرُ مِنْ ذَهَبٍ، وَمَنَابِرُ مِنْ فِضَّةٍ، وَيَجْلِسُ أَدْنَاهُمْ، وَمَا فِيهِمْ دَنِيءٌ، عَلَى كُثْبَانِ الْمِسْكِ وَالْكَافُورِ، مَا يُرَوْنَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَرَاسِيِّ بِأَفْضَلَ مِنْهُمْ مَجْلِسًا»، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَرَى رَبَّنَا؟ قَالَ: «نَعَمْ، هَلْ تَتَمَارَوْنَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ؟» قُلْنَا: لَا، قَالَ: «كَذَلِكَ لَا تَتَمَارَوْنَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ ﷻ، وَلَا يَبْقَى فِي ذَلِكَ الْمَجْلِسِ أَحَدٌ إِلَّا حَاضَرَهُ اللَّهُ ﷻ مُحَاضَرَةً، حَتَّى إِنَّهُ يَقُولُ لِلرَّجُلِ مِنْكُمْ: أَلَا تَذْكُرُ يَا فُلَانُ يَوْمَ عَمِلْتَ كَذَا وَكَذَا؟ يُذَكِّرُهُ بَعْضَ غَدَرَاتِهِ فِي الدُّنْيَا، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ أَفَلَمْ تَغْفِرْ لِي؟ فَيَقُولُ: بَلَى، فَبِسَعَةِ مَغْفِرَتِي بَلَغْتَ مَنْزِلَتَكَ هَذِهِ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ، غَشِيَتْهُمْ سَحَابَةٌ مِنْ فَوْقِهِمْ، فَأَمْطَرَتْ عَلَيْهِمْ طِيبًا لَمْ يَجِدُوا مِثْلَ رِيحِهِ شَيْئًا قَطُّ، ثُمَّ يَقُولُ: قُومُوا إِلَى مَا أَعْدَدْتُ لَكُمْ مِنَ الْكَرَامَةِ، فَخُذُوا مَا اشْتَهَيْتُمْ، قَالَ: فَنَأْتِي سُوقًا قَدْ حُفَّتْ بِهِ الْمَلَائِكَةُ، فِيهِ مَا لَمْ تَنْظُرِ الْعُيُونُ إِلَى مِثْلِهِ، وَلَمْ تَسْمَعِ الْآذَانُ، وَلَمْ يَخْطُرْ عَلَى الْقُلُوبِ». قَالَ: «فَيُحْمَلُ لَنَا مَا اشْتَهَيْنَا، لَيْسَ يُبَاعُ فِيهِ شَيْءٌ وَلَا يُشْتَرَى، وَفِي ذَلِكَ السُّوقِ يَلْقَى أَهْلُ الْجَنَّةِ بَعْضُهُمْ بَعْضًا، فَيُقْبِلُ الرَّجُلُ ذُو الْمَنْزِلَةِ الْمُرْتَفِعَةِ، فَيَلْقَى مَنْ هُوَ دُونَهُ، وَمَا فِيهِمْ دَنِيءٌ فَيَرُوعُهُ مَا يَرَى عَلَيْهِ مِنَ اللِّبَاسِ،

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٢٥٢، ومسلم: ٢٨٢٦، والترمذي: ٢٥٢٣ و ٣٢٩٢.

فَمَا يَنْقَضِي آخِرُ حَدِيثِهِ حَتَّى يَتَمَثَّلَ لَهُ عَلَيْهِ أَحْسَنُ مِنْهُ، وَذَلِكَ أَنَّهُ لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ أَنْ يَحْزَنَ فِيهَا». قَالَ: «ثُمَّ نَنْصَرِفُ إِلَى مَنَازِلِنَا، فَتَلْقَانَا أَزْوَاجُنَا، فَيَقُلْنَ: مَرْحَبًا وَأَهْلًا، لَقَدْ جِئْتَ وَإِنَّ بِكَ مِنَ الْجَمَالِ وَالطِّيبِ أَفْضَلَ مِمَّا فَارَقْتَنَا عَلَيْهِ، فَنَقُولُ: إِنَّا جَالَسْنَا الْيَوْمَ رَبَّنَا الْجَبَّارَ ﷻ، وَيَحِقُّنَا أَنْ نَنْقَلِبَ بِمِثْلِ مَا انْقَلَبْنَا»[1].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گەشتووە بە ئەبو هورەیرە ﷺ، جا ئەبو هورەیرە گوتی: داوا دەکەم لە خوا منیش و تۆش لە بازاڕی بەهەشت کۆبکاتەوە، سەعید گوتی: بۆچی بەهەشت بازاڕی تێدایە؟ گوتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕاگەیاندم و فەرمووی: کاتێ خەڵکی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە بەپێی زۆرو کەمی کردەوە چاکەکانیان پایەی بەرز یان پایەی نزم وەردەگرن، جا مۆڵەتیان دەدرێ بە ئەندازەی ڕۆژی جومعە لە ڕۆژەکانی دونیادا سەردانی خوای ﷻ دەکەن، عەرشەکەی نیشانیان دەدات، لە باخێ لە باخەکانی بەهەشتدا خوا بەبێ پەردە خۆی نیشان دەدات بۆیان و دەیبینن، مینبەریان بۆ ئامادەکراوە لە نوور، هەندێکیان لەسەر مینبەری نوور دادەنیشن، هەندێکیان لەسەر مینبەری مرواری دادەنیشن، هەندێکیان لەسەر مینبەری یاقوت دادەنیشن، هەندێکی تریان لەسەر مینبەری زوبەرجەد دادەنیشن، هەندێکی تریان لەسەر مینبەری زێڕ دادەنیشن، هەندێکی تریان لەسەر مینبەری زیو دادەنیشن، پلە هەرە نزمەکانیان کە هیچیان پلە نزم نین لەسەر تەپۆڵکەی میسک و کافور دادەنیشن، وا گومان نابەن کە خاوەن مینبەرەکان لەوان چاکتر بن و بە بەشی خۆیان ڕازین. ئەبو هورەیرە ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا پەروەردگارمان دەبینین؟ فەرمووی: بەڵێ، ئایا لە بینینی خۆرو مانگی چواردەدا ناڕەحەت دەبن کاتێ سەیریان دەکەن؟ گوتمان: نەخێر، فەرمووی: دەی بەو شێوەیە بەڕوون و ئاشکرا پەروەردگارتان ﷻ دەبینن و هیچ شک و گومانێکتان نامێنێ، هیچ یەکێ لە ئامادەبووانی ئەو کۆڕو دانیشتنە نیە ئیللا خوای ﷻ گفتوگۆی لەگەڵ دەکات و هەتا بە یەکێ لە ئێوە دەفەرمووێت: ئەی فلانی کوڕی فلان، فلانە ڕۆژ و فلانە ڕۆژت لەبیر دێ چیت دەکرد؟ هەندێ لە بێ پەیمانی و گوناهی خۆی وەبیر دێنێتەوە، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئەی تۆ لێم خۆش نەبووی؟ دەفەرمووێت: بەڵێ بە

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٥٤٨.




ڕەحمەتی بێ سنورو فراوانی خۆم نەبوایە تۆ نەدەگەیشتیتە ئەم پایە بەرزو مەزنە، ئیتر لەسەر ئەو حاڵەتەن لەپڕ پەڵە هەورێ لەسەرەوە دایان دەپۆشێ بۆن بەرامەیەکی وا خۆش دەبارێنێ بەسەریاندا هەرگیز بۆنی وا خۆشیان نەکردبێ، خوای خاوەن شکۆو پاک و بێگەرد دەفەرمووێت: ئادەی هەستن بچن بەدەم ئەو ڕێزو نازو نیعمەتانەوە کە بۆم ئامادەکردوون هەرچی ئارەزوو دەکەن ببەن بۆ خۆتان، جا دەچین بۆ بازاڕێ مەلائیکە لەهەموو لایەکەوە دەورەیان داوە، بازاڕەکە شتی وای تێدایە نە بەچاو بینراوە، نە بەگوێ بیستراوە، نەهاتووە بە هیچ دڵێکدا، جا حەزمان لەچی بێ هەڵی دەگرن بۆمان و دەیبەنەوە بۆناو کۆشک و تەلارەکانمان، کڕین و فرۆشتنی تێدا نیە، خەڵک لەو بازاڕەدا دەگەن بەیەک، گوتی: وا ڕێک دەکەوێ پیاوی خاوەن پایەی بەرز دەگات بە پیاوی لە خۆی خوارتر کە چاویان بەیەک دەکەوێ لەبەر جوانی و کەشخەیی جل و بەرگەکەی تاس دەیباتەوە بەڵام پێش ئەوەی خەیاڵەکەی تەواو ببێ لەبەر ئەوەی دڵی لەخۆی دانەمێنێ تەماشا دەکات جل و بەرگەکەی خۆی لەهی ئەو جوانترە، ئەمەش لەبەرئەوەیە نابێ کەس لە بەهەشتدا خەم و پەژارەی هەبێ، ئنجا دەچینەوە بۆ ماڵەوە هاوسەرەکانمان دێن بە پیریمانەوەو دەڵێن: مەرحەبات لێ بێ و بەخێر بێیتەوە لەجاران جوانتر بووی، ئەویش دەڵێ: ئەمڕۆ لەگەڵ بە پەروەردگارمان ﷻ دانیشتووین، لەبەرئەوە هەقی خۆیەتی جوانتر بووبین چونکە پەروەردگارمان بینیوە.

**٤٣٣٧-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ أَحَدٍ يُدْخِلُهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ، إِلَّا زَوَّجَهُ اللَّهُ ﷻ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ زَوْجَةً، ثِنْتَيْنِ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ، وَسَبْعِينَ مِنْ مِيرَاثِهِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، مَا مِنْهُنَّ وَاحِدَةٌ إِلَّا وَلَهَا قُبُلٌ شَهِيٌّ، وَلَهُ ذَكَرٌ لَا يَنْثَنِي» قَالَ هِشَامُ بْنُ خَالِدٍ: «مِنْ مِيرَاثِهِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ». يَعْنِي رِجَالًا دَخَلُوا النَّارَ، فَوَرِثَ أَهْلُ الْجَنَّةِ نِسَاءَهُمْ، كَمَا وُرِثَتِ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ[1].

---

(١) ضعيف جداً. أخرجه الترمذي: ٢٥٦٣.




واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هەرکەسێک خوای ﷻ بیخاتە بەهەشتەوە ئەوە حەفتاو دوو خێزانی پێ دەبەخشێت، دوودانە لە حۆریەکانی بەهەشت، حەفتا دانەکەیتریش میراتی خەڵکی دۆزەخن بە ئەویان دەبەخشێت، کەهەریەکێک لەو ئافرەتانەو وە هەم ئەم پیاوەش خاوەنی هێزو توانایەکی زۆرەو بێهێز نابن و بێزار نابن. هیشامی کوڕی خالید گوتی: مانای ئەوەیە ئەو پیاوانەی چونە دۆزەخ خەڵکی بەهەشت خێزانەکانیان بە میرات دەگرن، هەروەکو چۆن خێزانی فیرعەون بوو بە میرات.

**٤٣٣٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤْمِنُ إِذَا اشْتَهَى الْوَلَدَ فِي الْجَنَّةِ، كَانَ حَمْلُهُ وَوَضْعُهُ وَسِنُّهُ فِي سَاعَةٍ وَاحِدَةٍ، كَمَا يَشْتَهِي»(١).

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بڕوادار لەناو بەهەشتدا حەزی لە منداڵ بوو، ئەوە دووگیان بوون و مناڵ بوون و تەمەنەکەی (بوون بە سی و سێ ساڵ) لە یەک ساتدا دەبێت، هەر چۆنێک کە حەزی لێبێ و پێی خۆش بێت.

**٤٣٣٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجًا مِنْهَا، وَآخِرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُولًا الْجَنَّةَ، رَجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ حَبْوًا، فَيُقَالُ لَهُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ، فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلْأَى فَيَرْجِعُ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلْأَى، فَيَقُولُ اللَّهُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ، فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلْأَى، فَيَرْجِعُ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلْأَى، فَيَقُولُ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ، فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلْأَى، فَيَرْجِعُ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ إِنَّهَا مَلْأَى، فَيَقُولُ اللَّهُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ، فَإِنَّ لَكَ مِثْلَ الدُّنْيَا، وَعَشَرَةَ أَمْثَالِهَا - أَوْ إِنَّ لَكَ مِثْلَ عَشَرَةِ أَمْثَالِ الدُّنْيَا - فَيَقُولُ: أَتَسْخَرُ بِي - أَوْ أَتَضْحَكُ بِي - وَأَنْتَ الْمَلِكُ؟» قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ، فَكَانَ يُقَالُ: هَذَا أَدْنَى أَهْلِ الْجَنَّةِ مَنْزِلًا(٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان دەزانم کە کۆتا کەس کێیە لە ئاگر دێتە دەرەوەو کۆتا کەسیش کێیە دەچێتە ناو

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٥٦٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٧١، ومسلم: ١٨٦، والترمذي: ٢٥٩٥.

بەهەشتەوە، (ئەو کەسە) پیاوێکە بە خشکە خشک و لەسەر چنگان لە ئاگر دێتە دەرەوە، جا پێی دەگوترێت: برۆ بچۆ ناو بەهەشتەوە، جا ئەویش دێ و کاتێک دەبینێ وا دەهێنرێتە پێش چاوی کە پڕبووەو جێ نەماوە، بۆیە دەگەڕێتەوەو دەڵێ: ئەی پەروەردگارا بینیم پڕبووە، ئنجا خوا دەفەرمووێت: برۆ بچۆ ناو بەهەشتەوە، ئەوجاریش دێ و دیسان دەهێنرێتە پێش چاوی کە پڕبووەو جێ نەماوە، بۆیە دەگەڕێتەوەو دەڵێ: ئەی پەروەردگارا بینیم پڕبووە، ئنجا خوای پاک و بێگەرد دەفەرمووێت: برۆ بچۆ ناو بەهەشتەوە، ئەویش دێتە لای بەهەشت و دیسان وا دەهێنرێتە پێش چاوی کە پڕبووەو جێگا نەماوە، بۆیە دەگەڕێتەوەو دەڵێ: ئەی پەروەردگارا بە دڵنیایی بەهەشت پڕبووە، ئنجا خوا دەفەرمووێت: برۆ بچۆ ناو بەهەشتەوە ئەوە بە ئەندازەی دونیاو دە هێندەی دونیاش بۆ تۆ (یان بەقەدەر دەجاری دونیا بۆ تۆ بێت)، پیاوەکەش دەڵێ: ئایا گاڵتەم پێ دەکەی - یان پێم پێدەکەنی - و تۆش پادشاو خاوەنی هەموو شتێکی؟ ڕاوی گوتی: بێگومان بینیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی تا ددانەکانی دەرکەوتن، جا دەگوترا: ئا ئەوە کەمترین پلەو پایەی خەڵکی بەهەشتە.

٤٣٤٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَأَلَ الْجَنَّةَ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالَتِ الْجَنَّةُ: اللَّهُمَّ أَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَمَنِ اسْتَجَارَ مِنَ النَّارِ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالَتِ النَّارُ: اللَّهُمَّ أَجِرْهُ مِنَ النَّارِ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سێ جار داوای بەهەشت بکات، ئەوە بەهەشت دەڵێ: خودایە بیخەرە بەهەشتەوە، وە هەر کەسێک سێ جار خۆی پەنابدات لە ئاگر (پەنا بە خوا بگرێت) ئەوە ئاگر (دۆزەخ) دەڵێ: خودایە لە ئاگری دۆزەخ پەنای بدە.

٤٣٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا لَهُ مَنْزِلَانِ: مَنْزِلٌ فِي الْجَنَّةِ، وَمَنْزِلٌ فِي النَّارِ، فَإِذَا مَاتَ، فَدَخَلَ النَّارَ، وَرِثَ أَهْلُ الْجَنَّةِ مَنْزِلَهُ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿أُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ١٠﴾ المؤمنون»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٥٧٢، والنسائي: ٥٥٢١.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هەر کەسێک لە ئێوە لە قیامەت دوو شوێنی هەیە: شوێنێک لە بەهەشت و شوێنێکیش لە دۆزەخ، جا کاتێک ئەو کەسە مردو ڕۆیشت بۆ دۆزەخ، ئەوە خەڵکی بەهەشت شوێنەکەی تری لە بەهەشت بە میرات دەگرێت، ئەوەیە مانای ئەو ئایەتەی کە خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێت: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ١٠ ﴾ المؤمنون، واتە: هەر ئەوانەن میراتگران.

وهذا آخر سنن الإمام الحافظ أبي عبد الله محمد بن يزيد القزويني.

## بەرهەمەکانی پرۆژەی پیت

| | |
|---|---|
| ١ صحيح الأدب المفرد | سيروان كاكه أحمد |
| ٢ سـنن الدارمـي | زانا عيسا عبابكر |
| ٣ سـنن النسـائي | عباس محمد أمين |
| ٤ شرح الشمائل النبي ﷺ | سيروان كاكه أحمد<br>محمد أحمد گردەشێخاڵی |
| ٥ سـنن ابـن مـاجـه | محمد أحمد گردەشێخاڵی |



رێکخراوی پیت بۆ پەروەردە و توێژینەوەی زانستی




 Peet - پیت

 ٠٧٥٠٢٣٥٥٣٦٣

 peet.kurd@gmail.com


بۆ هەر ڕەخنە و پێشنیارێک تکایە پەیوەندیمان پێوە بکەن

## نـــاوەڕۆک

